# دەوڵەتی مەغول و تەتار

## لە نێوان بڵاوبوونەوە و تێکشکاندا

نوسینی
دکتور علي محمّد الصلّابي

وەرگێڕانی
ئەبوبەکر ڕەسول محمّد



دار المعرفة
بەیروت

ناوی كتێب: دەوڵەتی مەغۆل و تەتار لە نێوان بڵاوبوونەوەو تێكشكاندا

نووسینی: دكتۆر علی محمد الصّلابی

وەرگێڕانی: ئەبوبەكر ڕەسول محمد

نەخشەسازی ناوەوە: محمد علی احمد

ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز

شوێنی چاپ: بەیروت ـ لوبنان

ژمارەی سپاردن: (٢٤١١)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

نارین

بازاڕی زانست بۆ كتێب و چاپەمەنی

www.nareenco.com

E-mail: nareen_1 @yahoo.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

# دەوڵەتی مەغول و تەتار

## لە نێوان بڵاوبوونەوە و تێکشکاندا

نووسینی
دکتور علي محمّد الصلابي

وەرگێڕانی
ئەبوبەکر ڕەسوڵ محمّد

نارین

دار المعرفة
بەیرووت

**پێشکەش بێ بە:**

هەر موسڵمانێك بۆ سەرخستن و دەسەڵاتداركردنی دینی خودا تێدەكۆشێ.

ئەم كتێبە پێشكەش دەكەم و لە خودای پەروەردگار دەپاڕێمەوە بە ناوە جوانەكانی و سیفەتە بەرزەكانی ئەم كارەم تایبەت بێ بە زاتی پاك و ڕووی پیرۆزی خۆیەوە.

خودای، بەرز دەفەرموێت:

﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ (الكهف:١١٠).

علي محمد محمد الصلابي

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

ان الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا و من سيئآت أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمداً عبده و رسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ (آل عمران:١٠٢).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ (النساء:١).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ (الاحزاب:٧٠-٧١).

خودایە سوپاست دەکەم بەو شێوازەی شایستەی ڕووی پیرۆزە و دەسەڵاتی مەزنت بێ، سوپاس بۆ تۆ تا ڕازی دەبی، سوپاس بۆ تۆ کە ڕازی بووی، سوپاس بۆ تۆ دوای ڕازی بوونت، سوپاسێك بۆ خودا لە زاتی مەزنی بوەشێتەوە، ستایشێك بۆ خودا لەگەڵ کەماڵی بێتەوە، سوپاسێك بۆ خودا زاتی بەرز و مەزنی پێی ڕازییە، پاش ئەمە:

ئەم کتێبە: درێژەپێدەری کتێبە مێژووییەکانمە، کە باس لە سەردەمی پێغەمبەرێتیو خیلافەتی ڕاشیدە و دەوڵەتی ئەمەوی و مێژوونامەی جەنگی خاچپەرستان دەکەن، ئاڵقەیەکی گرنگە دوا بە دوای سەردەمی سلجوقی و زەنگی و صلاح الدین و چوار پەلامارەکەی خاچپەرستان (٤،٥،٦،٧) دێت.

ئەم کتێبە: بە گوێرەی ناونیشانی- سەبارەت بە نەخشە و پیلانی مەغۆلەکان و هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەیان و لە پاشان شکست خواردنیان لاپەڕەکانی خۆی نیشانی خوێنەران دەدات.

لە فەسڵی یەکەمدا: قسە لەسەر پرۆژەی مەغۆلو داگیرکردنی وڵاتانی جیهانی ئیسلام کراوە:

لە باسی یەکەمدا: ئەم چەند بابەتانە توێژراونەوە:

بایەخی لێکۆڵینەوەی مێژووی (مەغۆل)، پێناسەی (مەغۆل)، نیشتمانی ئەسڵی (مەغۆل)، ئەو هۆز و تایەفانەی کۆمەڵگای (مەغۆل)یان پێکهێناوە، ژیانی کۆمەڵایەتیان، ئاینیان، داخوازیەکانی کۆمەڵگای (مەغۆل) پێش هاتنی (جەنگیز خان)، ئاژاوەی نێو کۆمەڵگای (مەغۆل)، هەوڵ و تەقەلاکانی یەکخستنی هۆزەکانی (مەغۆل)، بارودۆخی جیهانی ئیسلامی پێش داگیرکردنی لەلایەن (مەغۆل)ەوە، وەك: خیلافەتی عەبباسی، ئەییوبییەکان لە میسر و شام، بڵاوبوونەوەی تاوانە لە نێو بەرەکانی وەك مەی خواردنەوەو کەنیزەك و گۆرانی و مۆسیقا.

لە باسی دووەمدا: ئەم بابەتانە توێژراونەتەوە:

دەرکەوتنی (جەنگیز خان) لە گۆڕەپانی ڕووداوەکاندا، چۆنیەتی گەشەسەندن و پەروەردەکرانی، (ڕەنج کێشانی دایکی)، هاوسەرگیری (جەنگیز خان)، هەڵبژێردرانی بە (خان)، جەنگەکانی، سەرەتای یەکگرتنی هۆزەکانی (مەغۆل) لە ژێر سەرکردایەتی (جەنگیز خان)دا، دروستبوونی ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل)، چەند هەڵوێستەیەك لە بەرامبەر هۆکارە کاریگەرەکانی سەرکەوتنی نەخشەی (مەغۆل) لە سەردەمی (جەنگیز خان)دا، وەك: کەسایەتی جەنگیز خان، گرنگترین سیفەتەکانی وەك: ئازایەتی و دلاوایی و بەخشندەیی و غیرەت و دڵڕەقی و، دڵسۆزی لە بەرامبەر هاوەڵانی و، سەرناسی و چۆنیەتی سەرکردایەتی کردنی سەرکردەکانی، دەستوری دەوڵەت (یاسا)، دەقە مێژووییەکانی (یاسا)، هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام لە بەرامبەر (یاسا)، بایەخی نوسینەوەی وتەی پاشایانی (مەغۆل)، ڕێکخستنی ئەرکە خزمەتگوزاریەکانی (خان) و سوپای (مەغۆل)، چەند وەسیێتێکی(جەنگیز خان) بۆ سوپاکەی، بەرنامەی چەکداری و ئامادەباشی جەنگ لای (مەغۆل) و، شێوازی جەنگان و پەیوەندی نێو سوپایان، شارەزایی سەرکردە، بەرنامەی شەڕ و چۆنیەتی ڕەفتارو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دوژمنە شکاوەکانی بەرامبەریان، گرنگی دانیان بە شارەزا بوون و ئەزمون و سوود وەرگرتن لە زانایان و دانایان و خاوەنڕایان، گرێدانی کۆنگرەیەکی ساڵانەی مەغۆل (کۆریلتای) و بەشداربوونی شارەزایان و پسپۆڕان تێیدا و ئاڵوگۆڕکردن و هەڵسەنگاندنی بیروڕا و بۆچونەکان و گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلەکان، پاش ئەنجامگیر یش ڕێکەوتن لەسەر ڕاپەڕاندن و جولان بەپێی ئەو بەرنامە سازیە لە لایەن سەرکردەکانی

(مەغۆل)ەوە، داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی مەغۆل و هەندێك لە ئەفسانە و شتە پڕوپوچەکانیان.

لە باسی سێهەمدا: ئەم چەند مەسەلە خراونە بەر باسەوە:

(مەغۆل) و لەنێوبردنی دەوڵەتی (خوارەزم)، کورتە ژیاننامەی سوڵتانەکانی (خوارەزم)، سروشتی تێکهەڵچونەکانی نێوان دەوڵەتی خوارەزمی و خیلافەتی عەبباسی، هۆیەکانی هێرشی (مەغۆل) بۆ سەر دەوڵەتی (خوارەزم)، هێڵی ڕێڕەوی داگیرکاری (مەغۆل) لە وڵاتی (ما وراء النهر- پشت ڕووباری جەیحون)ەوە و درێژبوونەوەی، داگیرکردنی شارەکانی (ئەتراڕ و جەند و بانکۆت و خەجەندە و بوخاراو سەمەرقەند)، زەوتکردنی هەرێمەکانی بەشی ڕۆژئاوای دەوڵەتی (خوارەزم)، مردنی (محمد خوارەزمشا) و، سەرکردایەتیکردنی سوپای (خوارەزم) لە لایەن (جلال الدین مونکەبەرتی)، گەمارۆدانی شاری (خوارەزم) و داگیرکردنی، ئەو شتانەی ڕوویاندا لە خوارەزم ـ بەپێی وەسفی إبن الأثیرـ خۆپڕکێشکردنە نێو (خۆراسان) و، دەستبەسەرداگرتنی (بەلخ) و، داگیرکردنی (نسا) و لەنێوبردنی دانیشتوانەکەی کوشتارگای (مەڕوە)، تۆڵەسەندنەوە لە دانیشتوانی (نەیسابور)، خۆبەدەستەوەدانی (هەڕات)، زەوتکردنی هەرێمی (غەزنە)، کۆتایی هاتنی (جلال الدین مەنکە بەرتی) و کوژرانی، هەڵوێستەیەك لە بەرامبەر گرنگترین هۆکارەکانی لەنێوچوونی دەوڵەتی (خوارەزم):

١ـ شکستخواردنی (خوارەزم)ەکان لە هێنانەدی تەوژمێکی شارستانی.

٢ـ بێزرانی دەوڵەتی (خوارەزم) لە لایەن جەماوەری گەلەوە.

٣ـ کێشەی نێوخۆیی نێو بنەماڵەی حوکمڕانی (خوارەزم).

٤ـ لاوازی سیستەمی جەنگ لای (خوارەزم).

٥ـ خۆشویستنی دنیا و ڕق لێبوونەوەی مەرگ.

٦ـ یەکنەگرتن و ستەمکردن دەرهەق بە بەندەکانی خودا.

٧ـ خۆپەرستی و ڕووخانی مەعنەوی ی (محمد علاء الدین)ی خوارەزمی.

٨ـ کەسایەتی (جلال الدین مەنکە بەرتی).

٩ـ کورتبینی خەلیفە (الناصر لدین الله)ی عەبباسی.

١٠ـ دیارنەبوون و بەشداری پێنەکردنی زانایان.

١١ـ پڕۆژەی مەغۆلی.

ئینجا ئاماژەم بە مردنی (جەنگیز خان) کردووە.

لە فەسڵی دووەمدا: باسوخواسەکان سەبارەت بە ڕووخانی (بەغدا)ن:
لە باسی یەکەمدا: ئەم چەند بابەتانە توێژراونەوە:
جێنشینەکانی (جەنگیز خـان)، دابەشکـردنی مەملەکەتەکـەی، هەڵبـژاردنی (ئۆکتـای) بـە خانی گەورەی مەغۆل، بەردەوامبونی لێشاوی سەربازانی (مەغۆل) بەرەو وڵاتـانی ئیسلامی، گرتنی هەرێمەکانی باکوری (چین)، پەلاماردانی خاکی ئەوروپا، مردنی (ئۆکتـای خـان)، ئـەو چاکسازیانەی لـە سـەردەمی (ئۆکتایخـان) دا ئەنجامـدران، هەڵسوکەوتی لەگـەڵ ژێردەستە موسڵمانەکان، کرانی (کیوکخان) بە خانی گەورەی (مەغۆل)، سیاسـەتی (کیوکخـان) لەگـەڵ مەسـیحیەکان، مردنـی (کیوکخـان)، هەڵبـژێردرانی (مـەنکۆ) بـە خـانی گـەورەی (مـەغۆل)، چاکـسازیە نێوخۆییـەکانی، چـاك کردنــەوەی نێـوانی هــۆز و تایەفــەکانی ئیمپراتۆریــەتی (مـــەغۆل)، داکـــۆکی کردنـــی لـــەپێناو دروســـتکردنی هاوپـــەیمانی نێـــوان (مـــەغۆل) و (مەسیحیەکان)، بە مـەرجێك: (خـانی مـەغۆل) تاکـە (گـەورەی جیهـان) بێـت و دۆسـتەکانی شوێنپێی هەڵبگرن، بەڵام دەبێ دوژمنـەکانی لـە ڕەگوڕیـشەوە دەربهێنـرێن یـان ملکـەچ بـن، هەوڵەکانی (هۆلاکۆ) بۆ لەناوبردنی (ئیسماعیلییە) و هەڵکێشانی ڕەگوڕیشەیان، بەڕێکـەوتنی سـوپاکەی بـەرەو (بەغـدا) و کـەمارۆدانی و کوشـتن و تـالان و بڕۆکردنـی، کـوژرانی خەلیفـە (المستعصم بـالله)، کـاولکردنی شارسـتانیەتی بەغـدا، تەتـەرەکان و لـەنێو بردنـی کتێبخانـە زەخمـەکانی (بەغـدا)، حوکومـەتی هۆلاکـۆ (ئێلخـانی) لـە عێـراق و چـۆنیەتی بـەڕێوەبردنی کاروبارەکانی لە سەردەمی (الجوینی)دا، سەردانی (هۆلاکۆ) لەلایەن میرەکانەوە، ئنجـا بـاس لە هۆکارەکـانی ڕووخـانی خیلافـەتی عەبباسـی کـراوە و هەڵوێستەیان لـە بەرامبـەر کـراوە، گرنگترینی هۆیەکان:

١ــ دیارنەبوونی سەرکردایەتی یەکی لێزان.
٢ــ پشتگوێخستنی فەریزەی (جیهاد) لەلایەن (عەبباسیەکان).
٣ــ لەدەستدانی یەکێتی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا.
٤ــ لاوازی سوپای عەبباسی.
٥ــ لاوازی دەمارگیری بۆ دەوڵەتی (عەباسی).
٦ــ لاوازی نرخی پەیمانەکان.
٧ــ لاوازی هیممەتی میرومەلیکەکانی دەورووبەر.
٨ــ سازشە سیاسیەکان نیشانەی زەبونی دەوڵەتی (عەبباسی)ین.

٩ـ فرە مەڵبەندی لە هێز و بڕیارداندا.

١٠ـ داگیرکرانی سەنگەر و هێڵەکانی پێشەوەی بەرگری.

١١ـ ڕۆڵی مەسیحیەکان لە ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی.

١٢ـ ڕۆلی حوکمڕانانی موسڵمانان لە ڕوخاندنی دەولەتی عەباسی.

١٣ـ دورخستنەوەی کەسانی هەڵکەوتو و دەگمەن.

١٤ـ نەخشەی عەلەویەکان.

١٥ـ خۆشگوزەرانی و کاریگەری لەسەر لەنێوبردنی دەوڵەتی عەبباسی.

١٦ـ گەیشتن بە دوا خاڵی لێکهەڵوەشان و هەرەسهێنان.

١٧ـ هەرەسی بارودۆخی ئابوری.

١٨ـ ململانێی خۆبەخۆ لە (بەغدا).

١٩ـ ناپاکیەکانی شیعە (ابن العلقمي)ی وەزیر.

٢٠ـ ئەزموندیدەیی ئەسپسوارانی تەتار و بە هێزی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی.

ئنجا ئاماژە بە دەرەنجامەکانی ڕوخانی بەغدا دراوە، لەو دەرەنجامانە:

١- نەمانی دەسەڵاتی ئەدەبی و ڕوحی.

٢- پاشکۆبوونی شاری (بەغدا).

٣- هەرەسی زانستەکان و پێگەی زمانی (عەرەبی).

٤- دڵخۆشی و شادومانی مەسیحیەکان.

٥- بوونی (قاهیرە) بە پایتەختی خیلافەت.

٦- بڵاوبوونەوەی (شیعە).

٧- تەقینەوەی کانگەکانی وزەی ئوممەت (قانونی تەحەوی‌و بەربەرەکانێ).

ئەم کارەساتە گەورە و کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونی موسڵمانان بەگشتی، بەتایبەتیش شاعیران، دانرانی چەندین قەسیدە شیعری لاواندنەوە و خەمئامێز لەلایەن شاعیرانەوە، لە وێنەی ئەم قەسیدانە، شیعری (شمس الدين الكوفي الواعظ)ە کە دەڵێ:

عندي لأجل فراقكم آلام     فإلام أعذل فيكم وأُلام

تا دەڵێ:

إن كنت مثلي للأحبة فاقداً     أو في فؤادك لوعة وغرام

قف في ديار الظاعنين و نادهم     يا دار ما صنعت بك الأيام

هەروەها دەڵێ:

والله ما اخترت الفراق وإنما حكمت عليَّ بذلك الأيام

لە فەسڵی سێهەمدا:

باسی دەوڵەتی (مەمالیك)م کردووە: چەکە و بنەچەکەی (مەمالیك)، چۆنیەتی دروستبوونیان، سیستەمی ڕاهێنان و پەروەردە و قۆناغەکانی خوێندنیان، سیستەمی دەرچوون و کۆتایی هێنان بە خوێندن، زمانی (مەمالیك)، چۆنیەتی پەیوەندی مامۆستا و خوێندکارانیان، تێکۆشانیان بۆ تێکشکاندنەوەی هێرشی حەوتەمی خاچپەرستان، وێنەیەك لە ئازایەتی یان، هۆکارەکانی تێکشکانی خاچپەرستان و دەرەنجامەکانی، گرنگترینیان، ئەمانەن:

١- بەرز بوونەوەی پێگەو بەهێزتر بوونی دەسەلاتی (مەمالیك).
٢- دەستەوستان بوونی (فەڕەنسا) لە بەئەنجامگەیاندنی ئامانجەکانی.

ئنجا چوومە سەر باسی: کوژرانی (تورانشا)، لەنێوچوونی دەوڵەتی (ئەییوبی)، چۆنیەتی کوژرانی (تورانشا)، هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی (ئەییوبی)، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١- وەستانی پەیرەو و پرۆگرامی خۆ تازە کردنەوە و چاکسازی.
٢- زوڵم و ستەم.
٣- خۆشگوزەرانی و ڕۆچوون لە هەوەسبازیدا.
٤- پەکخستنی شورا.
٥- کێشەی خۆبەخۆ و خۆخۆری نێو بنەماڵەی (ئەییوبی).
٦- دۆستایەتیکردنی مەسیحیان.
٧- سەرنەکەوتنی (ئەییوبییەکان) لە بەدەستهێنانی بزوتنەوەیەکی شارستانی.
٨- لاوازی حوکومەتی ناوەندی.
٩- لاوازی سیستەمی هەواڵگیری.
١٠- بەشدارنەکردنی زانایانی خودایی لە دەرکردنی بڕیارە سیاسیەکاندا.
١١- مردنی مەلیك (صالح نجم الدين) و نالەبار بوونی جێگرەوەکەی.

ئنجا باسی (شجرة الدر) کراوە: ئەییوبی بووە یان سەر بە (مەمالیك) بووە؟ چۆن دەسەلاتی بە دەستەوە گرت؟ هەڵوێستی خەلیفەی عەبباسی و زانایان لە بەرامبەر

حوکمڕانی (شجرة الدر)، چۆن بوو وارى لە دەسەڵات هێنا و (عزالدين ئايبەكى) بۆ ئەم پۆستە هەڵبژارد؟ چۆنيەتى شوكردنى بە (عزالدين ئايبەك) دواى ئەمە، حوکمى شەريعەتى ئيسلامى لە بەرامبەر حوکمڕانى کاروبارى گشتى ئوممەت لەلايەن ژنەوە، ئەو مەترسيانەى ڕووبەڕووى (عزالدين ئايبەك) بوونەوە، وەك مەترسى (ئەييوبى) و (خاچپەرستى)، هەوڵوتەقەللاى (لويسى نۆهەم) بۆ سود وەرگرتن لە کێشەى خۆبەخۆى موسڵمانان و بەکارهێنانى ئەم هەلە لە بەرژەوەندى خۆيدا، هاموشۆى نوێنەرانى سوڵتان و پاشاکانى ميسر و شام و (لويسى نۆهەم)، هەوڵدانى خەليفەى عەبباسى بۆ ئاشت کردنەوەى (مەماليك)و (ئەييوبيان)، هەڵوێستى (مەماليك) لە بەرامبەر هەڵگەڕانەوەى هۆزە عەرەبيەکانى (ميسر)، ڕاوەستانى (عزالدين ئايبەك) لە بەرامبەر هاوەڵانى خۆى لە دەوڵەتى (مەماليك)، کوژرانى (فارس ئۆکتاى)، دواى ئەمەش کوژرانى (عزالدين ئايبەك) و (شجرة الدر).

ئنجا باسى دەسەڵاتى (علي ابن العز) کراوە، پاش ئەويش حوکمڕانى (سيف الدين قطن)، (قطن) و ڕێکخستنى کاروبارى نێوخۆ.

لە فەسڵى چوارەمدا: باس وخواسمان دەربارەى: جەنگى (عەين جالوت)ى هەميشە لەياد و تێکشکانى (مەغۆل)ە، بەڕێکەوتنى (مەغۆل) بەرەو هەرێمەکانى تردواى گرتنى (بەغدا)، چۆنيەتى داگير کردنى (شام) و (جزيرە) لەلايەن (مەغۆل)ەوە، ڕونکردنەوەى نەخشە و پيلانى (کاميلى ئەييوبى) بۆ ڕووبەڕووبونەوەى (تەتەر)، بەرگرى پاڵەوانانەى (کاميل) و چۆنيەتى شەهيد کرانى، خۆڕاگرى شارى (ميافارقين)ى تێکۆشەر و موجاهيد لە بەرامبەر ئەم هێرشەدا، تێکهەڵچونى توندوتيژى نێوان خەڵکى شار و (تەتەر) لەژێر سەرکردايەتى (کاميلى ئەييوبى)، زۆر خاياندنى ماوەى ئابلۆقەدانى شارى (ميافارقين)، نەمانى ڕزق و ڕۆزى و خواردەمەنى، پەيدا بوونى قاتو قڕى، بڵاوبوونەوەى نەخۆشى، ڕووخانى ديوارەکانى شار بە ئاگر و بەردبارانى مەنجەنيقى (تەتەر)، لەنێو چوونى زۆرينەى دانيشتوانى شار، برسيايەتى و نەخۆشى و ئابلۆقەى دوژمن بە تەواوەتى دەستيان لە بينەقاقاى خەڵکى (ميافارقين) نا، ساڵى٦٥٨ك/١٢٦٠ز دوا سەنگەرى بەرگرى لە (جزيرە) گيرا، (تەتەر) چووە نێو شارى (ميافارقين)ەوە، تەماشايان کرد جگە لە (٧٠) کەسى نيوە زيندوو هەموو دانيشتوانەکەى مردوون، تەتەر (کاميلى ئەييوبى) گرت، هۆلاکۆ زۆر بە توندىو بێ بەزەييانە لەگەڵى جولايەوە، فەرمانيدا گۆشتى بەدەنى کوت کوت لێبکەنەوە و بە دەميەوە بکەن تا دەمرێ، کە مرد سەريان بڕى، سەرەکەيان بەسەر سەرە ڕمدا کرد و لە

وڵات دەیانگێڕا، ئەم کارەساتە لە٦٥٧ك/١٢٥٩ز دا بوو، سەرەکەیان گەیاندە (دیمەشق)، بەسەر دەرگای (فەرادیس- باخچەکان) هەڵیانواسی، هەر بە هەڵواسراوی مابۆوە تا خەڵك هێنایانە خوارەوە و ناشتیان.

سوڵتان (ناصری ئەییوبی) لە شام: دوودڵبوونی لە نێوان بەرەنگار بوونەوە و خۆبەدەستەوە دان دا، ترسی زۆری لێنیشتبوو، چونکە (مەغۆل) بە نامە هەڕەشەیان لێکردبوو ئەگەر خۆ بەدەستەوە نەدا ئەوەی بەسەر بەغدا و خەلیفەیان هێناوە بەسەر شام و سوڵتانەکەیدا دێنن، لە نامەکەیاندا ئەم جۆرە هەڕەشانە نوسرابوون:......(خەلیفە)ی بەغدامان هێنایە بەردەم لێپرسینەوە، پرسیاری هەندێك شتمان لێکرد بە درۆ وەڵامی داینەوە، تووشی پەشیمانی بۆوە، بەڵام ئەمە لای مە دادی نەدا، خەزێنەی بە نرخ و گرانبەهای پەسمەندە کردبوون، دەروونێکی پیسی هەبوو، ماڵی کۆکردبوەوە و بایەخی بە پیاوان و شۆڕە سواران نەدابوو، زۆر ناوی دەهێنراو بەڕێزو مەزن سەیر دەکرا، ئێمە پەنا بە خوا دەگرین لە کامڵی و تێر و تەواوی:

إذا تــمَّ أمــرٌ دنــا نـقـصـه تــوق زوالاً اذا قــيــل تــم

اذا كــنــت في نـعـمـة فـارْعـها فــإن المعـاصي تُـزيـل الـنـعـم

وكـم مـن فـتـى بـات في نـعـمـة فـلـم يـدر بـالـموت حتى هـجـم

هەرکات ئەم نامەیەی منت خوێندەوە، بە خۆت و پیاوانت و ماڵ و سامانت و ئەسپو وڵاخانت بە پەلە وەرنە ژێر فەرمانی سوڵتانی زەمین و شاهەنشای سەر ڕووی زەوی: لە شەڕی چەپاڵە دەدرێ ی و لە خێر و بێری بەهرەمەند دەبی، وەك خودا دەفەرموێ:

﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ ﴾ (النجم: ٣٩-٤١).

پەیامهێنەرەکانمان لای خۆت گل مەدەوە و بەند مەکە، وەك پێشدا ئەم کارەت کردبوو، ﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ﴾، هەواڵمان پێ گەیشتووە کە بازرگانەکانی شام و خەڵکی تریش بەزیون و بەرەو (کاروانسەرا)[1] هەڵاتوون، خۆ ئەگەر بچنە نێو شاخەکانەوە

---

١ ئەمە ناوی مصر بوو لەلای تەتارەکان.

بەسەریاندا دەڕوخێنین، ئەگەر بچنە نێو زەوی یەوە بەناخی زەویاندا دەبەینە خوارەوە، ئەم جەنگە دەروونیە بەشێك بوو لە جەنگی (مەغۆل) لە بەرامبەر دوژمنەکانیاندا، (مەغۆل) درێژەیدا بە هێرشەکانی بۆ سەر هەرێمەکانی تری جیهانی ئیسلام، (حەلەب) گیراو (دیمەشق) خۆی بەدەستەوە دا، مەغۆل دەستی بەسەر تەواوی ولاتی (شام) دا گرت، هەڵسوکەوتیان بەرامبەر موسڵمانان زۆر توندوتیژ بوو، هەر خێرا دەستیان بە ڕووخاندنی قەلا و دیوارەکانی ولات کرد، وەك قەلا و دیوارەکانی (حەلەب، دیمەشق، حیمس، حەما، بەعلەبەگ، بانیاس،.....و هی تریش)، بەم شێوازە ئەوەی داگیرکەرانی خاچپەرست نەیانتوانی بیکەن (مەغۆل)ەکان ئەنجامیاندا، هەر لە سەرەتای لێشاوەکەیان بۆ ڕۆژهەلاتی نزیك پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ ڕەگەزی (مەسیحی نەستوری) بەست، سوڵتان (ناسر) دەستەپاچە و بێ ئیرادەوڕا مایەوە، لە کۆتاییدا بوو بە دیلی (هۆلاکۆ)، پاش بیستنی هەواڵی تێکشکانی (مەغۆل) لە جەنگی (عەین جالوت) (هۆلاکۆ) کوشتی.

لە دەرەنجامەکانی گیرانی ولاتی (شام) لەلایەن (مەغۆل) و هاوپەیمانەکانیانەوە: ترس و بیم باڵی بەسەر تەواوی ولاتدا گرت، خەڵك بەرەو ولاتی (میسر) هەلاتن، سەرکردایەتی ئیسلامی میسر: باوەشی بۆ ئاوارەکانی شەڕی (عێراق و شام) گرتەوە، ئینجا خۆی بۆ جەنگی یەکلاکەرەوەی گەڵ (مەغۆل) سازکرد، سوڵتان (سیف الدین قطز) سەرۆکی سەڵتەنەت بوو، زانی مانەوەی دەوڵەتە لاوەکەی بەندە بە دەرچوونی لەم تاقی کردنەوە گەورەدا، کە خۆی لە هێرشە داگیرکاریەکەی (مەغۆل)دا دەبینێتەوە بۆ سەر تەواوی ولاتانی جیهانی ئیسلام، ئێستا کە ئەم هێرشە سەرسوێی ولاتی (میسری) گرتووە، بڕیاری دا بیسەلمێنێت کە هەڵبژاردەی ڕاستەقینە و بە هەق جێگەی متمانەی میران و فەرماندەکانی (میسر)ە و پیاوی سەردەمی خۆیەتی!، دوای ئەوەی ئەو فەرماندانە کۆك بوون لەسەر لادانی (مەلیك مەنسور و عەلی کوڕی موعین) و دانانی (سیف الدین قطز) لە جێگەیدا و کردنی بە سوڵتانی دەوڵەتی (مەمالیك)، (سیف الدین) دەستی بە ئامادەکردنی بەرەی نێو خۆ کرد، ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە و ئاشتەوایی لەگەڵ نەیاراندا ئەنجامدا، شەریعەتی ئیسلامی کردە دەستووری دەوڵەتەکەی، (شێخ عزالدین بن عبدالسلام)ی وەك ڕێبەرێکی خۆی داناو ڕێنماییەکانی ئەوی وەردەگرتن، بە توندی وەلامی نامەکەی (هۆلاکۆ)ی دایەوە و بڕیاری جەنگی لە دژی (مەغۆل) ڕاگەیاند، گرتنی نامە هێنەرەکانیان و لە گەردن دانیان لە بەرامبەر

دەرگاكانی (قاهیره) و هەڵواسینی سەرەكانیان بەسەر دەرگای (زووەیلە)دا، منداڵێكی نامەهێنی (هۆلاكۆ)ی لای خۆی گلدایەوە و خستیە ڕیزی كۆیلەكانیەوە، بۆ یەكەمین جار بوو لە میسردا سەری مەغۆلەكان هەڵواسرێن، دەستی بە خۆسازدان و ئامادەسازی سوپاكەی و چەك و چۆڵی ئەم جەنگە یەكلاكەرەوە كرد، موسڵمانان لە ژێر سەركردایەتی (سیف الدین قطن)دا سەركەوتنێكی گەورەیان بەسەر (مەغۆل)دا تۆمار كرد، وڵاتی (شام) لە دەسەڵاتی (مەغۆل) پاكسازی كرا، (سیف الدین) كاروبارەكانی حوكمڕانی هەرێمەكانی (شام)ی ڕێكخستەوە، ئینجا بەرەو وڵاتی (میسر) گەڕایەوە، لە ڕێگای گەڕانەوەیدا و لەسەر دەستی (ركن الدین بیبرس) و تاقمە سوارێكی (مەمالیك) ڕەشەكوژ كرا، ئەم كوژرانەی (سیف الدین) لەبەر چەند هۆیەك بوو لەم كتێبەدا باسیان لێوە كراوە، ئینجا باسی گرنگترین هۆكارەكانی بە ئەنجام گەیشتنی ئەم سەركەوتنە مەزنەی (عەین جالوت) كراوە، لە ڕستەی ئەو هۆیانە:

١- سەركردایەتی شارەزا و لێزان.
٢- سیاسەتی مرۆڤی شیاو بۆ شوێنی شیاو.
٣- سوپای بەهێز.
٤- زیندووكردنەوەی گیانی جیهاد.
٥- ئامادەسازی و دەستگرتن بە هۆكارەكان.
٦- شارەزایی لە نەخشە و پیلان داناندا.
٧- دووربینی (سیف الدین قطن) و سەركردایەتیە لێزانەكەی.
٨- تێدابوونی سیفەتەكانی (الطائفة المنصورة: كۆمەڵە سەرخراوەكە).
٩- گرتنەبەری ڕێبازی هەنگاو بە هەنگاو لە پیلانی بەرەنگاربوونەوەدا.
١٠-پشت بەستن بە زانایان و ڕاوێژ پێكردنیان.
١١- دنیا نەویستی.
١٢- كێشمەكێشی نێوخۆیی نێو بنەماڵەی حوكمڕانی (مەغۆل).
١٣- قانونی خودا: لە گرتنی ستەمكاران و زاڵمان.

ئینجا دەرم خستووە: كە هۆكارەكانی سەركەوتنی موسڵمانەكان لە جەنگی (عەین جالوت)دا پێكەوە بەستراونەتەوە، هەر هۆكارێك كاردانەوەی هەبووە بەسەر تەنیشتەكەیدا، ئەم هۆكارانەی باس كراون ژمارەیەكن لە هۆكارەكان و بریتی نین لە هەموو هۆكارەكان، كاتێك لێكۆلەران ئەمدیوئەودیوی لاپەڕەكانی مێژوو دەكەن دەتوانن دەرك بە هۆكاری تریش

بکەن و وانە و پەندی زیاتر لە یاسا گرنگەکانی بایەداربوونی دەوڵەتەکان و ڕووخانیان و سەرکەوتنی گەلان و تێکشکانەکانیان وەربگرین، سیفەتەکانی سەرکردە و سەرکردایەتی سەرکەوتوو و شارەزایانی ڕاپەڕین و هەستانەوە بناسین.

خودای باڵادەست دەفەرمووێت:

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (یوسف: ١١١).

ئینجا هاتووم گرنگترین دەرەنجام و شوێنەوارەکانی سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی (عەین جالوت)م کورت کردوونەتەوە، لە ڕستەی ئەو دەرەنجامانە:

١- ڕزگارکردنی وڵاتی شام لە ژێر دەسەڵاتی (مەغۆل).

٢- یەکگرتنی وڵاتی (شام و میسر).

٣- دامرکانەوەی هێزە نەیارەکانی (مەمالیك).

٤- سەرکەوتنی (ئیسلام) بەسەر (بت پەرستیدا).

٥- ڕووداوێکی یەکلاکەرەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

٦- دروست بوونی گیانێکی تازە لە نێو ئوممەتی ئیسلامدا.

٧- شپرزەکردنی سوپای (مەغۆل) و هومێدبڕاو کردنی.

٨- هەڵوەشانەوەی هاوپەیمانی خاچپەرستان و تەتەر.

٩- لاوازبوونی قەوارەی خاچپەرستان.

١٠-شاری (قاهیرە) پایتەختی (مەمالیك)ە.

١١- لە دایك بوونی دەوڵەتی (مەمالیك)ی تازە لاو.

١٢- ڕۆڵی ڕەمزی (خیلافەتی عەبباسی).

١٣- گەشەپێدانی سوپای (مەمالیك) و نوێکردنەوەی چەك و چۆڵ و بەرنامەی سەربازی.

لە بارنەی ئەم لێکۆڵینەوەدا سروشتی پیلانی هێرشی (مەغۆل) و خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئەو پیلانەم ناساندووە، چۆنیەتی زەوتکردنی جیهانی ئیسلامی و چۆنیەتی هەرەسی شارەکانی: وەك (بوخارا و سەمەرقەند و کابول و بەغدا و هی تریش) لە بەرامبەر سوپای (مەغۆل)دا.

چۆن: دەست درێژی کرایە سەر وڵات و شارەکان، پەردەی شەرەف و ناموس هەڵدرایەوە، سەروەت و سامان دەستی بەسەردا گیرا، هۆکارەکانی سەرکەوتن دیار

نەمابوون، هۆکارەکانی بەزین لە نێو ئوممەتدا لە بەرامبەر نەخشەی داگیرکاری خۆیان زەق کردبۆوە، سوننەتەکان و قانونەکانی خودایی خاتری کەسیان نەگرت و کاری خۆیان کرد، موسڵمانان کەوتنە غەم و پەژارە و داماوی و دەستەپاچەیی و زەبوونیەوە، تا ئەو کاتەی: سەرکردایەتی ئیسلام لە (میسر) زانستی بەرەنگاربوونەوەو بەڕێوەبەرایەتی کردنی ململانێی بە تەواوەتی خستە دڵ و مێشك و زەینی خۆیەوە، تێگەیشت چۆن قەدەری خودا بە قەدەری خودا لادەچێ و ئەم بەڵایەی بەسەر جیهانی ئیسلامدا هاتووە: تەنها بە گرتنە بەری شاڕێگەکانی سوننەتی هەستانەوە و دەست گرتن بە هۆکارەکانی سەرکەوتن ڕادەماڵرێ و لە ئێقەدەکرێتەوە.

ئەم ئەنجامە سەرسوڕهێنەرەی جەنگی (عەین جالوت) لە ئەنجامی ئەوە هاتەدی: کە (سیف الدین قطز) بە پێی نەخشەیەکی ئیسلامی خاوەن پایە و ڕاگرەکانی خۆڕاگری و بەرەنگاری هاتە مەیدانەوە و سەرکەوتنی بە دەست هێنا، تێڕوانینی بۆ بابەتەکە ڕوون بوو، خۆیشیو دوژمنیشی بە تەواوەتی ناسی، لایەنی ئیمان و بیروباوەڕی ڕەچاو کرد، لە شارەزایی سیاسەتدا پێشکەوتوو بوو، هێزە سەربازیەکەی لە هەردوو بواری مادی و مەعنەویدا تێر و تەسەل بوو، (زانایان) و ڕۆڵی ئەوانی فەرامۆش نەکرد، دەیزانی (زانایان) چ پلە و پایەیەکی مەزنیان لە نێو ئوممەتدا هەیە، کاریگەری ڕوحیان هەیە لەسەر جەماوەر، خەڵك گوێڕایەڵیانە ! بۆیە لە خۆی نزیك کردنەوە و ڕێزی لێ نان و دەرگاکانی فێرکردن و ئامۆژگاری و ڕێنمایی بۆ کردنەوە، ئەوانیش ڕۆڵی کاریگەری خۆیان لە خۆسازدانەوەی ئوممەت بۆ هەستانەوە بینی، ئوممەتیان هانداو لە دەورەی (سیف الدین) و پڕۆژە ئیسلامیەکەی کۆببێتەوە. کە خۆی لە بەگژداچوونەوەی (مەغۆل)ی داگیرکەردا دەبینیەوە.

بێگومان مێژووی ئوممەت: سامانێکی فیکرییە و نافەوتێ، خەزنەیەکی زانیارییە و نابڕێت، ڕەسەنایەتی و عیززەتی ئیمان و سەروەریمان پێ دەبەخشێت، خەزێنەی شارستانی ئیسلامی: یارمەتیمان دەدات بۆ دروست کردنی کیانی ئێستامان، ڕۆشن کردنەوەی ئایندەمان، بەردەوام بوونی ژیانی بەڕێزانە و سەربەرزانە لە بانەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا: ئەو کۆمەڵگا ئیسلامیە: ئیمان سەرکردایەتی دەکات، عیبادەت پاکسازی دەکات، هەست و سۆزی بەرز جموجۆڵی وەبەردەخا، یاسا و ڕێساکانی لە هەموو بوارەکانی ئابووریو هونەریو سیاسی حوکمی بەسەردا دەکەن و ئاراستەی دەکەن، بۆیە کاتێك ئاوڕ لە ڕابردوومان دەدەینەوە بۆ ئەوە نیە بەرەو دواوە بکشێینەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی هێز و گوڕی

ڕۆیشتنمانی بۆ بەرەوپێش چوونی پێ زیاتر بکەین، تا ڕابردووی شکۆدارمان بە ئایندەی ڕۆشنمانەوە گرێ بدەین، شکۆمەندی نوێمان بە شکۆمەندی بەرھەمدارمان ببەستینەوە.

چاك دەزانین ڕۆچوون لە ڕابردوودا بە تەنھا، بریتیە لە خەو یان سڕبوون، ڕۆچوون لە ئایندەش بە تەنیا خۆ لە گێلی دان و شێتی یە، ڕۆچوون لە ئەمڕۆش بە تەنیا دەستەوستانی و ڕۆکەوتنە، ئێمە دەمانەوێ وزەی داینەمۆ و وەگەڕخەرمان لە ڕابردوومان وەربگرین، مەشخەڵی ڕێمان لە ئایندەمان بخوازین و پشتیشمان بە پایەکان و بەناگەکانی ئەمڕۆمان ببەستین. باش دەزانین: شکۆمەندی و دەسەڵاتی لەدەست چوو بەس بە خوێندنەوەی فەرموودە و وتار ناگەڕێتەوە، بابای زیندانی کۆت و زنجیرکراو بە باس و خواسی ئازادی و گۆرانی هەڵگوتن بە خۆشیەکانی ئازاد نابێت، باسکردنی سفرەی ڕازاوەی ڕابردوو برسی تێر ناکات، یادکردنەوەی زەمانی هەبوویی و شانازی کردن بەو پارە و سامانەی بە زایە چووە خاوەنەکەی دەوڵەمەند ناکات، پێداهەڵگوتن و شیعر خوێندنەوە بەسەر دەسەڵات و غیززەتی باب و باپیران نابێتە مایەی ڕزگار بوون لە داماوی و ژێر چەپۆکی.

بەڵام ئەوەش دەزانین کە: ئەگەر بابای زیندانی ڕۆژانی ئازادی لەبیر بکات دیارە بە کۆت و بەند قایلە و بە دوای هۆکاری دەروو لێکرانەوە و دنیای ڕوون ناکەوێ، ئەگەر بابای هەژار ڕۆژانی دەوڵەمەندی لە یاد بکات دیارە قەناعەتی بە هەژاری هەیە و بە دوای هۆکاری دەوڵەمەند بووندا ناگەڕێ، هەروەها ئەگەر بابای ژێر چەپۆکی و داماو شکۆمەندی باب و باپیرانی لە زەیندا نەمێنێ دیارە هۆگری داماوی دەبێت و بە دوای بەکارهێنانی هێزدا ناگەڕێ تا خۆی پێ ڕزگار بکات.

ئەگەر بە گەورایەتی و شکۆمەندی ڕابردوومان کیفایەت بکەین و پێمان وابێ وتارێك بە حەمد و سەنایەوە و پەخشانێك بە ستایشیەوە بەشمان دەکات و بەسمانە، ئەوا هەرگیز ئەو شکۆمەندیەمان بۆ ناگەڕێتەوە، ئەگەر لە بیر خۆشمانی بەرینەوە کە ئێمە ڕۆڵەی سەردارانی زەمین و مامۆستایانی دنیا بووین، ئەوا ڕۆژێك لە ڕۆژان دەماری غیرەتمان بۆ گێڕانەوەی ئەو شکۆمەندیە نابزوێت.

کەواتە با: ئەوەندە لە ڕابردوومان وەربگرین کە سوودمان پێ دەگەیەنێت و زەرەرو زیانمان لەسەر لادەبات، ئەوەی دەبێتە مایەی ڕۆکەوتن و سست کردن و سڕکردنمان کۆڵی لێدەین، ئێمە نامانەوێ بۆ ڕۆژگاری ڕابردوو بگەڕێینەوە، ڕۆژگار دێت و دەڕوا بۆ هەمیشە و

ناوەستێت و ناگەڕێتەوە، ئێمەش بۆ ژیانی ڕابردوو ناگەڕێینەوە و، واز لە بەرهەمەکانی ئێستاش ناهێنین، بەلام ئێمە بۆ نموونە بەرزەکان و ڕەوشتە ڕەندەکان دەگەڕێینەوە کە بە تێپەڕینی ڕۆژگار بایەخ و نرخیان لە دەست نادەن، چۆن زێڕ و ئەڵماس کۆن بوون نایانگۆڕن و وەك ئاسن ژەنگاوی نابن، لایەنە مەعنەویەکان وەکو زێڕ و ئەڵماسن لە نێو کانزاکاندا.[1]

ئێمە دەمانەوێ بەرەو ژیانی نێو ئیمان و تەقوا و چاکەکاری و دادپەروەری و بەندایەتی پوخت و پاکی خودا ـ جل جلاله ـ و شەریعەتەکەی بگەڕێینەوە، ئەو شەریعەتەی حوکمڕانی تاك و کۆمەڵ و ئوممەت و دەوڵەت دەکات، دەمانەوێ لە هەموو جۆرە کۆت و بەندێکی شیرکی دیار و نادیار ئازاد بین، وەك خودای بالادەست دەفەرموویت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾﴾ (النور: ٥٥ـ٥٦).

هەستانەوە و ڕاپەڕینی ئوممەت و، بەرەنگار بوونەوەی نەخشەی داگیرکاری پێویستی بە هەموو هێزەکان دەکات بە هەموو جۆرەکانیانەوە: لەبەر ئەمەیە قورئانی پیرۆز بایەخێکی گەورەی بە ڕێنمایی کردنی ئوممەت داوە تا دەست بە هەموو هۆیەکانی هێز و پێزەوە بگرن، بەڵکو خودای بالادەست بە واجبی داناوە لەسەر ئوممەت دەست بە هۆیەکانەوە بگرن، چونکە بە دەسەلات گەیاندنی دین نایەتەدی تەنها لە ڕێی بەکارهێنانی هێزەوە نەبێ بە هەموو واتا تێر و تەواوەکەی، زانایانی زانستی (أصول) دەڵێن: وما لا يتم الواجب إلّا به فهو واجب.[2] واتە: ڕاپەڕاندنی (واجب)ێك پەکی لەسەر شتێك کەوتبێت ئەو شتەش (واجب) دەبێت.

قورئانی پیرۆز لەسەر شانی شوێنکەوتووانی واجب کردووە هێز ئامادە بکەن، خودای بالادەست دەفەرموویت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ

---

١ فصول في الدعوة والإصلاح، ص: ١٤.

٢ فقه النصر والتمكين في القرآن الكريم، ص: ١٢٣.

بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ﴿٦٠﴾ (الانفال: ٦٠).

تەماشا موسڵمانان چەندە حەوجێی پەیداکردنی هۆ و ئامرازەکانی هێزن، لە کاتێکدا رووبەرووی رژێمێکی جیهانی هێزێکی نێودەوڵەتی بوونەتەوە جگە لە زمانی هێز هیچ زمانێکی تر ناناسێ، بۆیە پێویستە ئاسن بە ئاسن بکوتنەوە و بە رەشەبا رووەو با بوەستنەوە و بە تازەترین و چاکترین چەکی نوێ بەرەنگاری دوژمن ببنەوە و کەمتەرخەمی نەکەن و دەستەوستان رۆنەکەون.[1]

سەرکردەکانی (مەمالیك) چەندین چالاکی گەورەیان لە گیانفیدایی و پاڵەوانی پێشکەشی ئوممەت کرد، لە ماوەی حوکمڕانیاندا توانیان مەردانە بەرەنگاری دوو دوژمنی ستەمکار ببنەوە، کە چاوی تەماعیان بڕیبووە خاك و ئاو و نیشتمانی ئیسلامیو وێرانکردنی لە رووی ئاینی و سیاسی و ئابووریەوە، ئەم دوو دوژمنە (مەغۆل) و (خاچپەرست) بوون، بەڵام نەیانتوانی بگەنە هیوا و ئاوات و ئامانجەکانیان، چونکە (مەمالیك) وەك بەربەستێکی بەهێز و مەحکەم لە روویاندا وەستانەوە و خۆیان کردە سوپەر و قەڵغانی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی و پارێزگار و پاسەوانی ئاین و رەوشتی موسڵمانان، جیهاد و تێکۆشانی (مەمالیك) بە گەورەترین کاری نێو دەفتەری کردارەکانیان دادەنرێت، جەنگەکانیان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام چەند لاپەڕەیەکی رۆشن و پرشنگدارن و هەر کاتێك موسڵمانان بیانەوێت عیززەت و شکۆمەندی بگێڕنەوە بۆ خۆیان دەتوانن سودیان لێ وەرگرن و بیانکەنە مەشخەڵی رێی سەرکەوتنیان، بە راستی (مەمالیك) توانیان لێوەشاوەیی و ئازایەتی خۆیان لە گۆڕەپانەکانی سیاسی و سەربازیدا بسەلمێنن، حوکمڕانانی دەوڵەتانی ئیسلامی و گەلەکانیان بە چاوی رێزو خۆشەویستی و گەورەیی تەماشایان دەکردن، هێزە نێودەوڵەتیەکانی بێگانەش بە چاوی ترس و رێزەوە تەماشایان دەکردن، بۆیە لە ترسی تۆڵە و دەست وەشاندنیان نەرمیان دەنواند و داوای ئاشتی یان دەکرد، بەم شێوازە دەوڵەتی (مەمالیك) رێز و گەورەیی خۆی بەسەر دوژمنان و دۆستانیدا سەپاند، لە نێو خۆیاندا پێشبڕکەی دۆستایەتی و ئاشتەوایی و بەستنی پەیوەندیان لەگەڵ دەکرد، (قاهیرە) لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی مێژووی حوکمڕانی (مەمالیك)دا، چالاکیەکی سیاسی گەورەی بە خۆیەوە بینی.[2]

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٢٤.

٢ الحسبة في العصر المملوكي، ص: ٢٦٧.

سەردەمی (مەمالیك) بە چەند وەسفێکی ناڕەوا تۆمەتبارکراوە، گوایە ئەم سەردەمە: سەردەمی داڕوخان و پوکانەوە و دواکەویی و وشکهەڵاتن بووە و زانیاری تیایدا چۆڕ و بڕ بووە، ئەمەو چەندین بوختانی تر و حوکمدانی تر کە لە دەمی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە بڵاوکراونەتەوە، لەگەڵ هەموو ئەم – بوختان–انەشدا حەقیقەتە مێژووییەکان ئاماژە دەکەن کە: گەورەترین بەرهەمی فیکری سەردەمەکانی ئیسلام لە سەردەمی (مەمالیك)ەوە بە ئێمە گەیشتووە، بەڵام (جاستۆن)ی ڕۆژهەڵات ناسی فەڕەنسی بە پلە دووی دادەنێ لە بەرهەمی فیکریدا و دەڵێ: (قاهیرە) لە هیچ سەردەمێکی ڕابردوودا وەکو (بەغدا) و (قورتوبە) مەڵبەندێکی زانستی نەبووە، بەڵام لە سەدەکانی (١٤ و ١٥)ی زایینی/ (٨ و ٩)ی کۆچیدا مەڵبەندێکی سیاسی و ئیداری بوو و بە تایبەتیش مەڵبەندێکی سەرەکی بازرگانی جیهانی بوو، هەرچەندە لەوێدا زەوقی هونەری لە چڵەپۆپەی بەرزیدا بووە، بەڵام لە بواری بەرهەمی فیکریدا لە چینی دووەمدایە،[1] (بڕۆکلمان) وەسفی ئەم بەرهەمە دەکات و دەڵێ: ئەم بەرهەمە فیکریە–ی سەردەمی مەمالیك – هیچ ڕەسەنایەتی و داهێنانێکی تازەی تێدا نییە.[2]

دەبینین ژمارەیەك لێکۆڵەری عەرەب و موسڵمان ڕێك شوێن پێی ئەم ڕۆژهەڵات ناسانەیان گرتووە و بە دەوری سەرسام بوون پێیانەوە حوکمدان و بیروڕایەکانی ئەوانیان کاوێژ کردۆتەوە و لە ڕاستە شەقامی لێکۆڵینەوەی زانستیانە و بابەتیانە لایان داوە، (فیلیب) یەکێکە لەو ڕۆژهەڵات ناسانەی ئەمانە کردوویانەتە ڕێبەری خۆیان: دەبینین حوکمدانەکانی بە تەواوەتی لە بابەتەکان دوورن، بە ڕای (بڕوکلمان)یش سەردەمی (مەمالیك) لە پانیڕا و لە درێژیڕا و سەرتاپا بێ بەشە لە بەرهەمی ڕەسەنی داهێنەر، بە ڕای (جاستون فیلیب)یش سەردەمی (مەمالیك) جگە لە (مقدمة)کەی (ابن خلدون) هیچ بەرهەمێکی فیکری تری تێدا نییە، کە باوەڕ ناکەم یەك کەس لە لێکۆڵەران ئەم قسە بە هەند هەڵگرێ و ماوەی (٣) سەدە بە تاریکی لە قەڵەم بدان: کە دەیان زانای گەورەی تێدا ژیاوە و دەتوانین بە پەنجەی دەستیان بژمێرین و لای گەورە و بچووکی ئوممەت ناسراون، زۆربەی ڕۆژهەڵات ناسان چ بە نەزانی و بێ ئاگایی چ بە داخ و ڕقەوە سەردەمی (مەمالیك)یان بە: چاخی هەرەس و دواکەوتوویی و وشکهەڵاتوو وەسف کردووە و ناساندووە، ئینجا ژمارەیەك مێژوو نووس کە لەسەر شارستانی و ڕۆشنبیری ئێمە حیساب دەکرێن، هاتوون هەمان قسە و قسەلۆکی ئەو

١ القاهرة مدينة الفن والتجارة، مصطفى العبادي، ص: ١٠٦ــ١٠٧.

٢ تأريخ الشعوب الاسلامية، ص: ٣٧١.

ڕۆژهەڵات ناسه داخ له دڵانەیان به: چاخی هەرەس و بێ سەر و بەر و عەیب و عار و لێك هەڵوەشان ناوبردووه، له واقیعدا ئەم بیروڕایه کە زۆریەی ڕۆژهەڵات ناسەکان پشتگیری دەکەن و بۆتە بنێشته شینکەی زۆربەی ڕۆژئاوا پەرستەکانی ڕۆژهەڵاتیش: له ڕوانگەی ئەو بوغز و غەرەزه و داخ و ڕقەی ڕۆژئاواییەکانەوه دەرچووه کە له بەرامبەر (مەمالیك)دا هەیانەو له دڵی ئەواندا پەنگی خواردۆتەوه! ئەو (مەمالیك)ەی خاچپەرستەکانیان تێك شکاندن و له شامیان به دەر نان، وەك ئەوانیش (مەغۆل)ه هاوپەیمانەکانی ئەوانیان تێك شکاندن، شامو حیجاز و شوێنه پیرۆزەکانیان له دەستی نەگریسی ئەوان پاراست و ماوەی (٣) سەدەی تەواو پاسەوانی سنوورەکانی جیهانی ئیسلامیان کرد و سەربەخۆییەکەیان وەك چاوی خۆیان پاراست.[١]

ڕاستیەکانی مێژوو بۆ لێکۆڵەره به ویژدانەکانیان سەلماندووه کە: سەردەمی (مەمالیك) به هیچ جۆرێك سەردەمی داڕوخان و هەرەس نەبووه، بەڵکو شارستانیەتێکی گەوره له هەموو بوارەکانی ژیاندا لەو سەردەمەدا سەری هەڵدا، سەردەمی (مەمالیك) چاخی زێڕینی بیناسازی ئیسلامییه، ئەمه شتێکی ئاشکرا و ڕوونه کە ئیمڕۆ (قاهیره) به شاری (هەزار مناره) ناوی دەرکردووه و شوێنەواره شارستانیەکانی (مەمالیك) هەر له (بیمارستانی مەنصوری، جامعی سوڵتان حەسەن، خانەقای بیبرسی جاشنگیر، مزگەوتی ئەمیربەگ، مزگەوتی غوری، زۆر بینای تریش) شایەتی ئەم بیروڕایەمانن،[٢] ئەوانەی سەردانی (قاهیره)شیان نەکردووه، دەتوانن تەماشای شوێنەواره شارستانیەکانی (مەمالیك) له دیمەشق بکەن، وەك: خوێندنگای (زاهیریه) و (جەقمەقییه)ی هاوسێی و (منارەی بەشی ڕۆژئاوا) له منارەکانی (جامیعی ئەمەوی)ی، دوای سوتانی (جامیعی ئەمەوی) له ساڵی (٨٨٤)ی کۆچی سوڵتان (قایتبای) فەرمانی نۆژەنکردنەوەی (جامیعی ئەمەوی) و دروست کردنی ئەو منارەی دا (له ماوەی چەند مانگێکدا دروست کرا) و به نموونەیەکی جوانی بیناسازی سەردەمی (مەمالیك) تەماشادەکرێ[٣] و، له گۆڕەپانی فیکر و هیزر و کاری زەینیشدا: سەردەمی (مەمالیك): به سەردەمی مەوسوعه گەورەکانی ئەدەب و مێژوو تەفسیر و فیقه و حەدیس و هی تریش به ناوبانگە، له بواری زانستەکانی (ئاین و فیقه و حەدیس)دا مەوسوعەی گەورەمان دێنه بەرچاو وەك: ڕسته کتێبەکانی (ئیمامی نەوەوی،

---

١ العصر المفترى عليه، عصر المماليك البحرية، ص: ١٣.
٢ المصدر نفسه، ص: ١٣.
٣ المصدر نفسه، ص: ١٣.

ئیبن تەیمیە، ئیبن ڕەجەب، ئیبن حەجەر، بەدرلعەینی)، لە بواری (مێژوو)شدا ڕستە کتێبەکانی (یوفینی، بەرزالی، ئیبن کەسیر، ئیبن خەلدون، ئیبن تەغری بەردی، نووەیری) دەبینین.

لە بواری (زانست)یشدا ئەم کتێبە گەورانەمان دێنە بەرچاو: (مسالك الابصار، صبح الاعشى، خطط المقريزي،... هتد)، ئەمانە و هاو وێنەکانیان بە پلەی یەکەم کەلەپووری ئیسلامیان پاراست و دوایش زانستی خۆیان پێوە زیادکرد، لە ڕوانگەی ئەم کتێبانەوە بە ڕاست و دروستی تەواوی وردەکاریەکانی سەردەمی (مەمالیك) بە گشتی و (قاهیرە)ی پایتەختیان دەخوێنینەوە، لێرەدا لایەنێکی تر هەیە لە شارستانی (مەمالیك) کە زۆرینەی خەڵك لێی بێ ئاگان: ئەویش (لایەنی سەربازی)یە، چونکە هەموو ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی (مەمالیك) تۆماریان کرد کە لە گۆڕەپانی بەرەنگار بوونەوەی داگیرکەرانی (مەغۆل)ی ڕۆژهەڵات و (خاچپەرست)ی ڕۆژئاوا لە ماوەی (٤٤) ساڵدا و بەس، واتا لە (٦٥٨ك — ٧٠٢ك)، لە ئەنجامی ئازایەتی و ئیمان و گەشەسەندندا بوو کە بە زاراوی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ: پیشەسازی ئەندازیاری و سەربازی، ئەمە پاڵپشتێکی گەورە بوو لە سەرخستنی موسڵمانان لە ڕزگار کردنی قەڵای (عەکا) لە فەلەستین، کە بە شایەتی خودی ڕۆژئاواییەکان: چی وای کەمتر نەبوو لە گرنگی گرتنی (قوستەنتینیە)، بە شێوەیەکی ئاسایی و سروشتی دەوڵەتی (مەمالیك) درێژەپێدەری دەوڵەتی (ئەییوبی) و مەلیك و سوڵتانەکانی پێش خۆی بوو، دەوڵەتێکی خاوەن شارستانیەتێکی ڕەسەن بوو، حوکمڕانەکانی غەیرە عەرەب بوون، سەرکردایەتی جیهادی ئیسلامیان دەکرد لە ڕووی ئەو مەترسیانەی هەڕەشەیان لە موسڵمانان دەکرد،[1] یەکێك لەو گومان و داڵغەی کاری لەسەر لێکۆڵەران کردووە ئەوەیە کە گوایە: ڕوخانی بەغدا لە لایەن (مەغۆل)ەوە لە ساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز بە خاڵی کۆتایی شارستانیەتی ئیسلامی دادەنرێت، بۆیە نایەن باسی هەموو ئەو دەستکەوت و داهێنراوە زانستیانە بکەن کە لە سەردەمی (مەمالیك)دا بەرهەم هێنراون، ئەمە تەنها بۆچوونێکی هەڵەو واهیمەیەکی بێ بەهایە و پێویستە هەڵوێستەیەکی باشی لە بەرامبەردا بکرێت،[2] بە ئیزنی خودای باڵادەست لە کتێبەکانی داهاتووماندا وەڵامی ئەم بۆچوونە دەدەینەوە و ژیانی زانستی و فیکری سەردەمی (مەمالیك) و ژیاننامەی زانا بە ناوبانگەکانی ڕوون دەکەینەوە.

---

١ المصدر نفسه، ص: ١٤.

٢ المصدر نفسه، ص: ١٥.

ئوممەتی ئیسلام: بەردەوام دڵە گەورەكەی بۆ ژیان لێدەدا، توانای تێپەڕاندنی هەموو مەینەتە گەورەكانی هەیە، مێژوو بە بەڵگەی بەهێزەوە سەلماندوویەتی: هەر كاتێك ئەم ئوممەتە ڕووبەڕووی مەترسی و بەڵا و موسیبەت دەبێتەوە بە ئیمانی مەزنو سەبری جوانەوە هێز و پێزی یەكدەخات و وزە شاراوەكانی دەردەخات و بەرەنگاری پڕۆژە داگیركاریەكان دەبێتەوە تا ئەو كاتەی خودا – جل جلالە – دەرووی خێری لێ دەكاتەوە و شەوی تاریك و ئەنگوستە چاوی بۆ دەكاتە بەیانێكی ڕۆشن و ڕۆژێكی پرشنگدار.

هاوەڵە بەڕێزەكان و فتوحاتی پیرۆزی ئەوانمان بینی – كە ڕۆشناییان بە جیهاندا پەخش كرد، تابیعیەكانیش بە جوانی و ڕێك و پێكی بە ڕێگەی ئەواندا ڕۆیشتن، كاتێكیش لێشاوی هێرشی خاچپەرستان و مەغۆل خۆی بە جیهانی ئیسلامدا كرد، دەوڵەتەكانی (سلجوقی و زەنگی و ئەیوبی و مەمالیك) ڕووبەڕوویان بوونەوە، بێگومان ئیسلام داینەمۆ و جوڵێنەری سەركردەكانی ئەم جیهادە ئیسلامیە بوو وێنەی: (عمادالدین، نورالدین، صلاح الدین، سیف الدین قطز، ركن الدین بیبرس) و هەموو ئەوانەش لەسەر ڕێبازی ئەمان ڕۆیشتن، زمان حاڵی موسڵمانانن لە ڕابردوو و ئێستا و ئایندەدا گوفتاری شاعیرە كە دەڵێ:

انا مسلم انا مسلم ... هذا نشيدي الملهَم
من أعمق الأعماق ... أبعث لحنه يترنم
روحي تردِّدُه وقلبي ... والتجوارح والدَّم
شوقاً وتحناناً ... لأمجاد لنا تتكلم
أنا مسلم انا مسلم ... بالرغم ممن يحقدون
أنا هاهنا بشريعتي ... في موكب الحق المبين[١]

هەروەها گوفتاری ئەم شاعیرە كە دەڵێ:

أظننت دعوتنا تموت بضربة ... خابت ظنونك فهي شر ظنون
بليت سيطُك والعزائمُ لم تزل ... منا كحد الصارم المسلول
تالله ما الطغيان يهزم دعوة ... يوما وفي التاريخ برٌ يميني
ضع في يديَّ القيد ألهب أضلعي ... بالسوط ضع عنقي على السكين
لن تستطع حصار فكري ساعة ... أو نزع ايماني ونور يقيني

---

١ صلاح الأمة في عول الهمة ٦/٥١٦.

فالنور في قلبي وقلبي في يدي ربي وربي ناصري ومعني
سأعيش معتصماً بحبل عقيدتي وأموت مبتسما ليحيا ديني[1]

ئەوانەی توانیان بەرەنگاری پرۆژە داگیرکاریەکان ببنەوە، شار و قەڵا و پەناو پەسیوەکان لە ژێر چەپۆکی ڕەشی (مەغۆل) و (خاچپەرستا) ڕزگار بکەن، ئەوانە ئەو کەس و دەوڵەتانە بوون (پرۆژەی ئیسلامی ڕاست و دروستیان) کردبووە مەشخەڵی خۆیان، ئەوان پیلانە نێو خۆ و بیژۆکەکانیان ناسی و بە وریایی و عەزم ئیرادەی پۆڵاینەوە لە ڕوویاندا وەستانەوە، هەر ئوممەت و نەتەوەیەك دەیەوێ ڕاپەڕێ و خۆی لە تەمی تەپ و تۆزی داگیرکەران ڕزگار بکات، دەبێت تۆماری مێژووی خۆی بخوێنێتەوە تا لە ڕوانگەی ئەم مێژووەیەوە فێری وانەکانی سەرکەوتن و پەند و سوننەتەکانی ژیانی مرۆڤایەتی ببێ و لەسەر بناغەی مێژووی خۆی بینای سەرکەوتن هەڵچنێ و ئێستا و ئایندەی ڕۆشن و گەشاوە بکات.

بێگومان هەر کەسێك (لێکۆڵەر) بێ یان (سەرۆك) بێ یان (شا) بێ و لە هەر پۆستێکدا بێ کاتێك مێژوو دەخوێنێتەوە تەمەنی خەڵکانی پێش خۆی دەخاتە سەر تەمەنی خۆی، چونکە تێگەیشتن لە مێژوو بەرهەمدارە و کار لەسەر گۆڕینی واقیع دەکات و ئایندەش بەرەو لوتکەی سەرکەوتن دەبات، بۆیە ڕاپەڕین و پێشکەوتنی هەر گەلێك بەبێ ڕۆشنبیری و مێژووناسی و ناسینی سوننەت و قانونەکانی خوا و وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاریەکانی مێژوو زۆر مەحاڵە.

ڕاپەڕین و هەستانەوە بە واتا گشتیەکەی پێویستی بە چەکی زمان و قەڵەمە، هیچ پرۆژەیەکی ڕاپەڕین لە مێژوودا بەبێ بەکارهێنانی قەڵەمی بە بڕشت و زمانی ڕاستبێژ سەرکەوتنی بە دەست نەهێناوە، چونکە زمان و قەڵەم دوو ئامرازی سەرەکی بانگەوازی ڕاپەڕینن و بیر و بۆچوونەکان لە ڕێیانەوە بە نێو خەڵکدا پەخش دەبن، هەبوونی کتێبی بەسوود لەم بوارەدا و لە جیهانی گفت و گۆ و ململانێ و داوای مافەکان و ڕەتکردنەوەی جەور و ستەم شتێکی زەروری و پێویستە، هەموو کاتێك بانگەواز و ڕاگەیاندن بیربۆچوون و بیروباوەڕ و ڕۆشنبیری و پەیڕەو و پرۆگرامێکی لە پشتەوەیە و ئەویش پاڵنەری هەر کارێکی سیاسی و سەربازییە کە دوابەدوای ئەمە ئەنجام دەدرێن، چونکە هەر بەرنامەیەکی سیاسی

١ المصدر نفسه، ٦/ ٥٢٨.

فراوانخواز پێویستی بە بیروباوەڕ و ڕۆشنبیری و کلتور هەیە تا بەرەو پێشەوە پاڵی بنێن، پیت شمشێری لێ لە دایك دەبێ، ددان لە زمان دەزێ کتێبەکانیش کەتیبەکان بەرهەم دێنن، بابەتی جەنگە یەك لە دوای یەکەکانی خاچپەرستان: قوتابیانی دەوڵەتی سلجوقی و سەردەمی دەوڵەتی زەنگی و صلاح الدینی ئەیوبی لێ بەرهەم هات. ئەم کتێبە وەڵامی زۆربەی ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە لەسەر ئاستی ناوچەیی و جیهانی دەربارەی ئەم بابەتە پەیدا بوون.

ئەم زەمەنە مێژووەی ئوممەت شایەدێکی دڵنیاکەرە لەسەر ئەوە: کە ئوممەتی ئیسلام هەر کات بیەوێ بە نیەت و نیازی پاکەوە و ئیمانی ڕاست و دروستەوە و پابەندبوونی بەرپرسیارانەوە و زیرەکی هۆشمەندانەوە و وەرگرتنی زانستانەی سوننەت و قانونی شارستانەکانەوە و بیناکردنی دەوڵەتەوە ڕاپەڕین بکات و جووڵە بە خۆی بخات، ئەوا دەتوانێ ڕۆڵی شارستانیانە و سەرکردایەتی دنیا بۆ خۆی بگێڕێتەوەو خەڵك لە بەندایەتی کردنی بەندەکانەوە بۆ بەندایەتی کردنی خودا بێنێتەوە و لە تەنگەبەری دنیا بیانهێنێتەوە نێو فراوانی دنیا و لە جەور و ستەمی دینەکان بیانهێنێتە ژێر سایەی دادپەروەری ئیسلام.

بەم شێوەیە لە سەعات (٨:١٠) هەشت و دە دەقیقەی ئێوارەی یەکشەممە و دوای نوێژی خەوتنان لە (٢٨/ محرم/ ١٤٣٠ کۆچی) بەرامبەر (٢٠٠٩/١/٢٥ زاینی) لە نوسینی ئەم کتێبەم (دولة المغول والتتار بين الانتشار والانكسار) بوومەوە، فەزڵ و چاکە لە پێشدا و ئێستا و دوایەش هەر هی خودایە، لە خودای پاك و بەرز دەپاڕێمەوە ئەم کارەم لێ وەربگرێت و دڵ و زەینی بەندەکانی بۆ بکاتەوە و سوودی لێ ببینن و بە سەخاوەت و بەخشندەیی و چاکەی خۆی بەرەکەتداری بکات، خودای باڵادەست دەفەرموێت:

﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾ (فاطر: ٢).

لە کۆتایی – نووسینی – ئەم کتێبەدا هیچم نەماوە، جگە لە ڕاوەستانم نەبێ بەرامبەر (خالقی گەورەم) و خودای بەخشندەم: بە دڵێکی داچڵەکاو و تۆبەکار دان بە چاکە و بەخششەکانی دادەنێم، تەبەڕڕا لە هێز و هەوڵدانم دەکەم، لە هەموو جووڵە و وەستان و ژیان و مردنم پەنا بۆ ئەو دەبەم، (ألله) دروستکەرمە و چاکەکارە، پەروەردگاری بەخشندەمەو یارمەتیدەرمە، پەرستراوی مەزنمە و سەرخەرمە، ئەگەر – خوا نەکا – وازم لێ

بێنیٚ و بە عەقلیٚ و نەفسی خۆم بسپێریٚ، عەقلم تەپ دەبیٚ و گێل دەبم، دەین و زاکیرەم دەکوژێتەوە، پەنجەکانم وشك هەڵدەگەڕێن، سۆز و عاتیفەم دەپوکێتەوە، هەست و نەستم ڕەق و تەق دەبیٚ، قەڵەمم لە ڕوون کردنەوە شکست دەخوات، ئەی خودایە چ شتێك تۆ ڕازی دەکات بینایم بەرامبەری بەهێز بکە، سینگمی بۆ فراوان بکە، ئەی خودایە: هەر شتێك تۆ ناڕازی دەکات: لێمی دووربخەرەوە، لە نێو دڵ و دەروون و زەینمی دەربکە، خودایە: بە ناوە جوانەکانت و سیفەتە بەرزەکانت لێت دەپاڕێمەوە ئەم کارەم لەبەر خاتری ڕووی پیرۆزت بیٚ، بۆ بەندەکانت بەسوود بیٚ، لەسەر هەر پیتێك نووسیومە پاداشتم بۆ بنووسی و بیخەیتە نێو تا تەرازووی کردەوە جوانەکانمەوە، پاداشتی هەموو ئەو برایانەشم بدەیتەوە هاریکاری تەواوکردنی ئەم هەوڵ و کۆششەیان داوم، خودایە ئەگەر – پشتیوانی – زاتی پاکت نەبوایە ئەم بەرهەمە پەیدا نەدەبوو و، لە نێو خەڵکدا بڵاو نەدەبۆوە، تکایە هەر موسڵمانێك ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە بەندەی هەژاری لە بیرنەچێت و داوای لێبوردن و چاوپۆشی و بەزەیی و ڕەزامەندی بۆ لە پەروەردگار بکات، خودای بەرز دەفەرمووێت:

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾﴾ (النمل: ١٩).

بەم ئایەتە پیرۆزە کۆتایی بەم پێشەکیە دێنم:

﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ (الحشر: ١٠).

((سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا أنت أستغفرك وأتوب إليك)).

هەژاری بەر دەرگای لێخۆش بوون و

ڕەحمەت و ڕەزامەندی خودای پەروەردگار:

علي محمد محمد الصلابي.

خودا لە خۆی و باب و داکی و تەواوی موسڵمانان خۆش بیٚ.

# فەسڵی یەکەم

# پرۆژەی مەغۆل و داگیرکردنی وڵاتانی جیهانی ئیسلام

## باسی یەکەم: ڕەگ و ڕیشە مێژووییەکانی مەغۆل:

### یەکەم: بایەخی لێکۆڵینەوەی مێژووی مەغۆل:

کاتێك مێژوو نووس دەیەوێ لە مێژووی مەغۆل بکۆڵێتەوە تووشی چەندین کۆسپی بێ ڕەزا دەبێ، چونکە ژیاننامەی هۆزە ڕەوەند و خێڵەکی یەکان کەمتر وایە لە ئاستێکدا بوەستێ و ڕێك بکەوێ، هەروەها بە هۆی ئاڵۆزی و پشێوی زۆری ڕووداو و کارەساتەکانی مێژووی ئەو نەتەوەیە مەحاڵە سەرەداوێکی بەنە تەسبیحی ئەم گەلە دەستکەوێ کە هۆزەکانی لە ڕستەیەکدا کۆی کردوونەتەوە، ئەوەی دەبێتە مایەی زیاتر سەر لێشێوانی مێژوونووس و پەکخستن یان سست کردنی لەم کارەیدا زۆری ڕووداو و کارەساتە نێو خۆییەکان و جەنگ و هەرا هەڵایساوەکانی نێوان هۆزەکانی ئەم گەلەن – کە پێویستە مێژوونووس لێیان قووڵ بێتەوە و توێژینەوەیان لەسەر بکات تا دەگاتە دەرەنجامی ئەو هاوپەیمانەی ئەم هۆزانەی لە دواین کاتی بێنە و بەرەو بگرە و بەردەکاندا یەکخستووە و لە چوارچێوەی یەك نەتەوەی (مەغۆل)دا کۆی کردوونەتەوە، زیاد لەمەش کە مێژووی سەرەتای مەغۆل تاریك و لێڵە و بە ئەفسانە و شتی پڕوپوچ تێکەڵە و، هیچ بەڵگەنامە و تۆمارێکی ڕاست و دروستیش دەست ناکەوێت تا مێژوو نووس لەم بوارەدا پشتی پێ ببەستێ.[1]

کۆسپێکی تری بەردەم مێژوونووس و لێکۆڵەر فراوانبوونی ئەو خاك و زەمینەیە هۆزە مەغۆلیەکانی تێدا نیشتەجێ بوون، مێژووی مەغۆل سنوورێکی جوغرافی دیاری کراوی نیە و ڕوویان لە هەر خاکێك کردبێت تخوبەکەی لەبەر دەمیاندا تەخت بووە، بە هۆی سیفەتی ئازایەتی و بەجەرگی لە عادەت بە دەریان توانیویانە: دەشتە کاکی بە کاکیەکان ببڕن و، بە نێو دۆڵ و چیاکاندا تێپەڕن و، بەسەر ڕووبارە گافڕێنەکان و دەریا و زەریا فراوانەکاندا بپەڕنەوە و، خۆیان لە هەموو ئاو و هەوایەکی ساز و ناساز بدەن و، سەبر و تەحەمولی

---

١ المغول للسيد الباز العريني، ص: ٢١.

برسیایەتی و نەخۆشیەکان بکەن و، لە هەڕەشە و مەترسیەکان نەترسێن و لە سەنگەر و قەڵا مەحکەمەکان نەگەڕێنەوە و، بەسەر وڵاتانو گەلانی دوور و نزیکدا زاڵ ببن، ڕوویان لە هەر شوێنێك کردبێت بە لێشاو هێرشیان بردووە و هەرچی سۆز و بەزەییە لە ئاست بەرامبەرەکانیاندا بە کاریان نەهێناوە، چەندین شاری ڕازاوە و گەشاوە لە ماوەی یەك شەودا لە پێخوستو سمکۆڵی و پێی (خۆیان و وڵاخەکانیاندا) وێران بوون و جگە لە شوێنەواری کاول بوون و چەند گرد و دیوارێك کە بە لاشە و کەللە سەری قوربانیەکان دروستیان کردبوون هیچ شتێکی تری بە پاوە نەمابوو.

ئەو هێمنی و مات بوونەی جەنگی داگیرکەرانی مەغۆل لە دوای خۆی دروستی دەکرد، لە ڕاستیدا ئاسایش و هێمنی نەبوو، بەڵکو بریتی بوو لەو نەرمە هەناسانەی هەر کەس و ئوممەتێك لە کاتی سەرەمەرگیدا و پێش لە گۆڕنانی هەڵیان دەکێشیّ، گەلانێك کە لە کوشتو کوشتار و جەنگ و هەرا بێزار ببوون و دەیانەویست سەرلەنویّ لە بەروبوومی شارستانیەت بەهرە وەربگرنەوە.[1]

مێژووی ڕەشی توخمی (مەغۆل)، یان ڕووبەری دوور و فراوانی جیّ تەراتێنی و قەڵەمبازی (مەغۆل)، هۆکارێکی ترە بۆ مێژوونووس و لێکۆڵەران تا لە مێژووی ئەم گەلە پاوانخوازە بکۆڵنەوە، شێوازی سروشتی لێکۆڵینەوە دەربارەیان و هەر ئەنجامگیریەکی لێشیەوە دەردەچێت، بێگومان دەبێتە جێی گرنگی پێدان و بەرهەمی خۆی دەبێت.

وەك زانراوە: (مەغۆل) پەلاماری (ڕوسیا و مەجەڕ و سیلیزیا)ی دا، گۆڕانکاریەکی گەورەشیان لەسەر ئاستی (ئەورووپا) دروستکرد، ئەم گۆڕانکاریە کاردانەوەی خۆی دروست کرد و جەنگ و هێرشی خاچپەرستانی لێکەوتەوە و موسڵمانانو مەسیحیەکانی بەشەڕدان و، دوژمنایەتی نێوان دەسەڵاتی پاپا و ئیمپراتۆریەتی لێکەوتەوە، ئەورووپا و شام وێکڕا لە ڕاست لەنێوبردنی دەسەلاتی (حشیشیة)[2] دامان، بەلام بە لای مەغۆلەکانەوە کارێکی زۆر ئاسان بوو و لەساڵی ١٢٥٦دا سەنگەر و نیشتمانەکەیان بەسەردا تەپاندن.

لە واقیعدا ناوی (مەغۆل) لای ئەورووپیەکان بریتیە لە سەرچاوەی ترس و تۆقاندن، حاڵ بەوە گەیشتبوو لە ڕاست هێرشی چاوەڕوانکراویاندا دەستەپاچە ڕاوەستن و هیچ بەرگریەك نەکەن، خۆ ئەگەر (قطز)ی سوڵتانی (مەمالیك) لە ساڵی ١٢٦٠ی زاینیدا ڕانەپەڕیایە و ئەم

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٤.

٢ حشیشیة ئیسماعیلیة.

داگیرکەرە زلهێزەی شکستخواردوو نەکردبایە، ئەوا تا نێو جەرگەی ئەورووپا نەدەوەستایەوە، هەرچەند هیچ گومانی تێدا نیە بەشێکی زۆری ئەورووپا گەردنکەچیان ببوو، بەڵام ئەو مەترسی و بەڵایەی لە لایەن (مەغۆل)ەوە تووشی (ئاسیا) هات، ئەمە بەسەر ئەورووپادا نەهات، ساڵی ١٢٥٨ز: شاری (بەغدا) کاولکرا و خیلافەتی (عەباسی)ی ڕوخێنرا، ساڵی ١٢٣٤ز ڕەچەڵەکی بنەماڵەی (کین)ی حوکمڕانی (چین) لە بێخ دەرهێنرا و (باشووری چین) و (خوارەزم) و (فارس) و تێکڕای هەرێمە هاوسێکانیان داگیرکران و حوکومەتی (مەغۆل) لە (هیندستان) دامەزرێنرا، ئەمەی گوترا بەشێکی کارەساتەکان بوون و، یەکێکیان بەسە بکرێتە بەڵگە بۆ گرنگی لێکۆڵینەوەی مێژووی مەغۆل.

یەکێك لەو دیاردانەی شایانی گرنگی پێدان بێت: ئەوەیە هەر کاتێك شارستانیەتێك تێك دەدرێ، بزووتنەوەیەکی ژیانەوەی گەورە لە نێو دار و بەردی کەلاوە ڕووخاوەکانی ئەو شارستانیەتە کە هێرش و پەلامارە یەك لەسەر یەکەکان وێرانیان کردووە سەر هەڵدەدا، بۆ نموونە:

–پاش دەست بەسەرداگرتنی (یۆنان) لە لایەن (ڕۆمان)ەوە بزووتنەوەیەکی ژیانەوە لە بواری ئەدەب و هونەر لەو وڵاتەدا سەری هەڵدا.

–پاش دەست بەسەرداگرتنی شوێنەوارەکانی دەوڵەتی (بێزەنتی) لە لایەن عوسمانیەکانەوە لێکۆڵینەوەی خەزێنەکانی زانست زیاتر پێشوازی لێکرا.

–پاش فەتحکرانی (ئیسپانیا) لە لایەن موسڵمانەکانەوە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا تیشکی خۆری زانست و پزیشکی و فەلسەفە و شیعر بەسەر خاکی ئەورووپادا پەخشان بوو.

ئەم نموونانە بەسەر (مەغۆل)یشدا دەچەسپێن، چونکە ڕووخانی (بەغدا) لە ڕۆژگاری ئەواندا سەری کێشا بۆ گواستنەوەی مەڵبەندی توێژینەوە ئینسانیەکان بۆ وڵاتی (میسر)، لە هەمان کاتدا زانایان و ئەدیبان بە هەموو شوێنەکانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوونەوە و بەسەر زانکۆ و قوتابخانەکاندا دابەش بوون، بەم شێوەیە هێز و توانای ئەو قوتابخانانە زیادیان کرد،[1] لەگەڵ ئەمەشدا گوازرانەوەی (مەڵبەندی سەرنج ڕاکێشان لە بەغداوە بۆ (قاهیرە) کارئاسانی بۆ ئەورووپا کرد تا بە سێنایی لە ڕۆشنبیری و زانستی ڕۆژهەڵات بەهرەمەند بێ،[2] بە هاوشانی پێکهەڵشاخانەکان لە سەردەمەکانی جەنگی خاچپەرستیدا.

---

١ المغول، د. السيد الباز العريني، ص: ٢٦.

٢ المصدر نفسه، ص: ٢٦.

لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی (مەغۆل) بە نیسبەت ئاسیا زۆر بە گرنگ دادەنرێت، لە ڕووی چەند پێشکەوتنێك کە لە سەردەمی ئەوانەوە بە خۆیەوە بینی، کە دەکرێت دروست بوونی (یەکێتی ئاسیا) لە پێش هەموویانەوە دابنرێت، بەلام بۆمان نەهاتووە بە واتا و زاراوەی ئیمرۆ تەفسیری بکەین پێی بلێین (یەکێتی سیاسی) یان (یەکێتی هاوڕەگەزی)، حکومەتی (مەغۆل) ئیمپراتۆریەتی گەورەی پێکهێنا و هێمنی و ئارامی تەواوی بۆ دەستەبەر کرد و هەموو ڕێگاکانی هاموشۆی کردنەوە و کاروانچی و ڕێبواران بە دڵنیایی هاموشۆیان پێدا دەکرد، بەلام خوانەکردە تووشیان بە تووشی تەرمی خانێك بووایە ئەوا لە لایەن هەڵگرانی ئەم تەرمەوە ڕووبەڕووی مەرگی حەتمی دەبوونەوە.[١]

یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی (مەغۆل) کە پێی ناسرابوون: (ئازادی ئایینی) بوو، هەندێك لێکۆڵەر هۆی ئەم تایبەتمەندیەیان دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە (مەغۆل)ەکان گوێیان بە ئاین نەداوە، بەلام ئەم قسەیە بناغەی بەهێزی نییە، ڕای پەسەند ئەوەیە کە تایبەتمەندی (ئازادی ئایینی) لای حکومەتی (مەغۆل) لەبەر خاتری سوود وەرگرتنیان بووە لە کەسایەتیو خەڵکانی کارامە و لێوەشاوە بە جیاوازی ئایینیانەوە.[٢]

**دووەم: ناساندنی (مەغۆل):**

(مەغۆل)ەکان لە کۆتایی سەدەی شەشەمی (٦) کۆچی/ دوازدەهەمی (١٢) زاینی لەسەر گۆڕەپانی ڕووداوەکان دەرکەوتن.

ئینجا لە ماوەی هەردوك نیوە سەدەی (یەکەم و دووەمی) سەدەی حەوتەمی (٧) کۆچی/ سێزدەهەمی (١٣) زایینی وەکو زلهێزێکی جیهانیی خاوەن ناوبانگێکی نێودەوڵەتیی سنوور فراوان خۆیان دەرخست و لە بازنەی سنووری وڵاتی ئەسڵی یان واتە (مەنغۆلیا)تێیان پەڕاند، توانیان لە کورتترین ماوەدا – واتە (٣٠) ساڵ – گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهانی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دابمەزرێنن، کە سنوورەکەی لە دوورگەکانی زەریای ئارام لە ڕۆژهەلاتەوە بەرەو نێوجەرگەی ئەورووپا لە ڕۆژئاواوەو، لە سیبریا و دەریای بەلتیق لە باکوورەوە تا سنوورەکانی باکووری نیوە دوورگەی عەرەبی لە وڵاتی شام و فەلەستین لە باشوورەوە درێژ ببۆوە.

مێژوونووسەکانمان بە تایبەتی مێژوونووسە عەرەبەکان – ئەوانەی لە سەردەمی داگیرکاری مەغۆلدا ژیاون – ناوی ئەم داگیرکەرە زلهێزەیان بە (تەتەر) یان (تەتار)

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٦.

٢ المصدر نفسه، ص: ٢٦.

ناوبردووە، مێژوونووسەکانی دوای ئەمانیش ئەمەیان دووبارە کردۆتەوە، زۆربەی مێژوونووس‌و لێکۆڵەرەکانی ئەم سەردەمەش هەر بەم ناوەوە ناویان بردووە، جگە لە مێژوونووسە موسڵمان و عەرەبەکانیش ناموسڵمانەکانیش بە تایبەتی گەڕیدە ئەوروپییە دێرینەکان ناوی (مەغۆل) یان بە (تەتار) ناوبردووە، کە ئەم ناوە (تەتار) هەڵەیە و ناوی (مەغۆل) لە جێی خۆیدایە و ڕاست و دروستە، بەلام مێژوونووسە ڕۆژهەلاتناسە ئەوروپییە گەورەکانی وەك (بریتسکنیدەر و بارسۆڵد – کە هەردووکیان ڕوسین ـ، سیولوی ئەڵمانی، بۆیل ی بەریتانی، هی تریش) جیاوازیان خستۆتە نێوان دوو ناوی (مەغۆل) و (تەتار)، ئەمەی گوتمان (رشید الدين الوزير)ی مێژوونووسی موسڵمان لە نووسینەکانی خۆیدا بە تایبەتی لە کتێبە بە ناوبانگەکەیدا (جامع التواريخ)دا ڕوونی کردۆتەوە.

مێژوونووسە چینیەکانیش بە (مەغۆل) ناویان بردووە، بە تایبەتی لەو کتێبانەیاندا کە وەریانگێڕاونەتە سەر زمانە تازە ئەوروپییەکانی وەك ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و ڕوسی، ڕۆژهەلاتناسەکانیش لەو نووسینەیاندا کە بە زمانی (مەغۆلی) بلاوکراونەتەوە، هەر بە (مەغۆل) ناوی ئەم داگیرکەرەیان هێناوە، ئەمە بە شێوەیەکی سەرەکی لە کتێبە بە ناوبانگەکەی (التاريخ السري للمغول او تاريخ المغول السري – مێژووی نهێنی مەغۆل) زەق بۆتەوە لەسەر ئەم بنەمایە: بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (مەغۆل) شتێکە و (تەتەر)یش شتێکی ترە، دەتوانین پەیوەندیەکی پێناسەییش لە چوارچێوەی ئەم چەند وتانەمان لە نێوان هەردوو ناوەکەدا دروست بکەین:

(تەتەر) بریتی یە لە (مەغۆل)، بەلام (مەغۆل) بریتی نیە لە (تەتار)، لێرەدا (مەغۆل) بنەچەکەیە (تەتار)یش چەکەیە و لقێکە لە (مەغۆل)، لەگەڵ ئەوەشدا (تەتار) هۆزێکی نێو نەتەوەی (مەغۆل) بوون، بەلام نزیکەی سەدەیەك دەوڵەتی سەربەخۆیان هەبووە و حوکمڕانی نەتەوەی (مەغۆل)یان کردووە، بەلام – وەك لەمەودوا و بە ئیزنی خودا باسی لێوە دەکەین ـ (مەغۆل) هات و لە ژێر سەرکردایەتی (جەنگیزخان)دا (تەتار)ەکانی تێکشکاند و پیاوەکانی کوشتن و ژنەکانیانی بۆ خۆبردن و منداڵەکانیشیانی کردنە کۆیلە، بەم شێوەیە دەبینین (تەتار)ەکان لەسەر دەستی (جەنگیزخان)ی سەرۆکی گەورەی (مەغۆل) لەنێو چوون، (مەغۆل)ەکان بوونە خاوەنی دەسەلات و ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیان لە مێژوودا بۆ خۆیان بە ناوی (مەغۆل) نەك (تەتار) دامەزراند.[١]

---

١ سقوط الدولة العباسية، د. سعدالغامدي، ص: ٥٤.

### سێهەم: نیشتمانی ئەسلی (مەغۆڵ):

هۆزەکانی نەتەوەی (مەغۆڵ) لە ناوچەیەکی ناوەڕاستی ئاسیا، لە نێوان دوو ڕووباری (سەیحون و جەیحون) لە بەشی ڕۆژئاواوە تا سنووری چینی شاخاوی لە لای ڕۆژهەڵاتەوە تا دەگا بە ئەوسەری باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەژیان،[١] هەندێك – مێژوونووس – سنووری نیشتمانی (مەغۆڵ)یان لەمە بەرفراوانتر داناوە و دەڵێن: سنووریان بەرەو دەریای (ئەدریاتیکی) درێژبۆتەوە و دەکرێ گردی مەنغۆلیا و زنجیرە چیای (تیان شیان) و چیای (تای) و هەموو ئەو گرد و نشێو و دۆڵانەی دەکەونە نێوان ئەم دوو چیایە و بانی باشوور و دەوروبەری دەریاچەی (بایکاڵ) و کەنارەکانی ئەو ڕووبارانەی کەوتوونەتە ئەو ناوچەوە– بە نیشتمانی (مەغۆڵ) دابنرێن.[٢] شوێنی نیشتەجێی سەرەکی ئەم هۆزانە لە زستاندا ئەو دۆڵ و دەشتە گەرمە سێرانە بوون کە دەکەونە نێون زنجیرەچیاکان و، لەوەڕگایەکی باشیش بوون بۆ تێدا بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان. لە هاوینانیشدا بۆ ماوەی (٢–٣) مانگ دەچوونە کوێستانەکان و لە ئاووهەوای سازگاری ئەو ناوچانە و لەوەڕی تەڕ و تازە بۆ ئاژەڵەکانیان سوودمەند دەبوون.

دووری ئەم ناوچانە لە دەریاکان و لەگەڵ بەرزی زیادیان لە ئاستی دەریا بووەتە هۆکارێك ئاو و هەواکەی (قاری – وشکەڕۆ بێت)، پلەی گەرما لە زۆربەی شوێنی ئەم ناوچانە لە نێوان ٣٨° پلەی سەدی سەروو سفر و ٤٢° پلەی سەدی ژێر سفر دێت و دەچێت، ئەمە سەردەکێشێ بۆ بەستەڵەك بوونی ڕووبار و دەریاچەکان لە ماوەیەکی دوور و درێژی ساڵدا، لەگەڵ ئەمەشدا بایەکی توندی سارد لە (سیبریا)ی بەشی باکووری وڵاتڕا بەسەر ناوچەکانی باشووردا هەڵدەکات.[٣]

ئەم حاڵەتەی گوتمان لە زستاندا بوو، لە هاویندا حاڵەتەکە پێچەوانە دەبێتەوە و بە جۆرێك پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە و ڕەشەبای لماوی بەسەر ئەم ناوچانەدا هەڵدەکات،[٤] ئەم هۆزانە لەسەر ڕاو و شکار و ئاژەڵداری دەژیان و لەبەر کەمی ئاو لە دەشتی (جوبی) دەهاتنو دەڕۆیشتن، ناوی (جوبی) بە واتای (وشکەساڵی و قاقڕ)ی دێت،[٥] پاشان بە

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، إسماعيل الخالدي، ص: ١٩.
٢ المغول للعريني، ص: ٥– ٨. العالم الاسلامي والغزو المغولي، إسماعيل الخالدي، ص: ١٩.
٣ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ١٩.
٤ المصدر نفسه، ص: ٢٠.
٥ المصدر نفسه، ص: ٢٠.

مەبەستی دۆزینەوەی لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانیان بە دۆڵ و نشێو و گردەکاندا دەڕۆیشتن تا دەگەیشتنە سەر چیاکان هەر ساڵێك وشکەساڵی بووایە یان گژوگیا کەم بووایە بەرەو خاك و مەزرای هاوسێکانیان دەڕۆیشتن و لەو شوێنانە بەسەریەکدا دەکەوتنەوە و ژمارەی مەڕ و ماڵات و پاتاڵەکانیان بە زۆری خۆی دەنواند، حاڵەتی ڕەوەندی و کۆچ و کۆچباری بنەمایەکی سروشتی هەیە لە ژیانی ئەواندا.

هەر کات باران نەباری یان لەوەڕگا تووشی ئافەتێك یان کەمی گژوگیا هات، شوانکارە خۆی لە بەرامبەر مەترسی لە دەستدانی ئاژەڵەکەیدا دەبینێتەوە — کە بە سەرچاوەی سەرەکی بژێوی دادەنرێت ـ، دوای ئەم بەڵایە تووشی برسێتی دەبێتەوە، برسیایەتیش پاڵی دەنێ بەرەو دزی کردن و تالان و بڕۆکردنی ئەو هاوسێیانەی بە کاری کشتوکاڵیەوە خەریکن، جەنگ و هەرا و دەست درێژی و داوای تۆڵە لێرەوە دەست پێدەکەن و دروست دەبن.[١]

لەگەڵ ئەمەدا کە ئەم هۆزانە هەموویان یەك بنەچەکەیان هەیە و، بەڵام بەسەر چەندین تیرە و تایەفەدا دابەش بوون و بەردەوامیش نەوە و نەتیجەیان لێ دەکەوتەوەو لێکتر جودا دەبوونەوە و ناوی تازەیان لە خۆیان دەنا و پێیانەوە دەناسران.[٢]

### چوارەم: ئەو هۆزانەی کۆمەڵگای (مەغۆل)یان پێك هێناوە:

لە نیوەی یەکەمی سەدەی دوازدەی (١٢) زایینی/ شەشەمی (٦) کۆچیدا، چەند هۆزێکی خێڵەکی دواکەوتوو لە باکووری (مەنشوریا) و (مەنغۆلیا) و (تورکستان) کۆببوونەوە، کاری ئاژەڵداری و پیشەی ڕاو و شکاریان ڕەچاو کردبوو، بۆ پەیداکردنی لەوەڕی ئاژەڵەکانیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشتن، ئەم هۆزانە لە بواری زمان و زاراوی ئاخاوتنەوە دەکرێنە چەند دەستە: (دەستەی تورکیا، تاقمەکانی (مەنغۆل)ی، تاقمەکانی تەنفوزیە) مێژوونووس زۆر بە ئاستەم دەتوانێ ئەم تاقمانە لێك هەڵاوێرێ: چونکە لە زۆر ڕووەوە پێکەوە بەتسراونەتەوە و لە زۆر شتدا بە یەکتر دەچن: وەك ناو و ناسناوی کەسەکان، داب و نەریت و کلتور، زمان و زاراوە.

### هەندێك لەو تاقم و هۆزانەی کە کۆمەڵگای (مەغۆلی)یان پێك هێناوە، باس دەکەین:

### أـ هۆزە (تورکی)یەکان:

ـ هۆزی تورکش: بە ناوبانگترین هۆزی تورکی ناوچەی ڕۆژاوایە، ناسناوی سەرۆکەکانیان (خان) بوو، تا ساڵی ١٢١کۆچی/ ٧٣٩ زایینی و هێرشی سوپای ئیسلام بە سەرۆکایەتی

---

١ المغول للعريني، ص: ١٣، العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٢٠.

٢ الحياة السياسية في العراق للدكتور القزاز، ص: ٥.

(نصری کوڕی یسار) سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو، دوای ئەمە هاتنە ڕیزی شوێنکەوتووانی دەوڵەتی (هوشامی کوڕی عبدالملك)ی ئەمەوی.

ـ هۆزی قرغیز: ئەو تورکانە بوون کە لە باری سەرەوەی ڕووباری (ینسی) نیشتەجێ بوون، ناسناوی سەرۆکەکانیان (خاقان) بوو، ساڵی ٢٥٠ کۆچی/ ٨٤٠ زایینی بەسەر هۆزی (ئویغور)دا زاڵ بوون لە (مەنغۆلیا) و لە گۆڕەپانی سیاسیدا ناویان دەرکرد، بەڵام لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا هۆزی (خەتا) لە (مەنغۆلیا)یان وەدەرنان و تێکیان شکاندن، ئینجا دەستیان بە پیشەی کشتوکاڵ کرد، پاشان لە سەردەمی (جەنگیزخان)دا و لە ساڵی ١٢١٨ زایینیدا فەرمانبەرداری خۆیان بۆ حکومەتی (مەغۆل) ڕاگەیاند.

ـ هۆزی (ئۆغۆز) (الغزّ) لە زمانی عەرەبیدا:

ئەمیش یەکێکەلە هۆزە تورکیەکان، نەخشی هەڵکەنراوی (ئەرخۆن) لە سەردەمی (٢)هەمی کۆچیدا/ (٨)ی زایینی بە ناوی (تەغزغز) باسی لێوە کردوون، (تەغزغز) بە واتای (دەهۆزەکە) دێ، چونکە ئەم هۆزە لە (١٠) هۆزی بچووك پێکهاتبوو، هۆزی (غوز) لە کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی بەرەو وڵاتانی جیهانی ئیسلامی هات، (سلجوقی)یەکان سەر بە هۆزی (غوز) بوون، ئیمپراتۆریەتیەکی گەورەیان دامەزراندا کە سنوورەکەی لە (تورکستان)ەوە بۆ سەر سنووری (میسر) درێژ ببۆوە.[1]

ـ هۆزی (قارلوق): لە ساڵی ١٤٩ك/ ٧٦٦ز دوای گرتنی دۆڵی ڕووباری (جو) و، پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی (خاقان)ی تورکەکانی ڕۆژئاوا، خۆیان هاویشتە نێو گۆڕەپانی سیاسەتەوە، ناسناوی سەرۆکی ئەم هۆزە تورکە (خاقان) نەبوو بەڵکو (یبغو) بوو، تا سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی بە بێباوەڕی مانەوە، (ابن حوقل) دەڵێ: وڵاتەکەیان لە (فرغانە)ڕا[2] ماوەی مانگە ڕێی ڕێبوارێکی پیادەڕەوە، بە هۆی نزیکیان لە وڵاتانی ئیسلامی، شارستانی ئێرانی کاریگەری لەسەریان هەبووە، هێندەی نەخایاندووە خۆیان بە کشتوکاڵەوە خەریك کردووە، بۆ دواجار لە سەدەی ١٣ز/ ٤ك ئاماژەیان بۆ کراوە.[3]

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٢٤.
٢ فرغانە ٥٠ فەرسەخ لە سەمەرقەندەوە دوورە.
٣ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٢٥.

## ب ـ هۆزە ناتورکیەکان:

(خەتا) یان (قەرەخێتاوی) یان (خێتاوی): ئەمانە ناوی گەلی (خێتای)ین:

ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم هۆزە دەچێتەوە سەر هۆزەکانی (تونفوریە)، ـ هەندێکیش لایان وایە بچنەوە سەر مەغۆل ـ، لەگەڵ تورکەکانی ڕژهەلات دوژمنایەتیان هەبوو، لە سەرەتای سەدەی ٤ك/ ١٠ز هۆزی (خێتای) هێرشێکی جەنگی کردە سەر بەشی ڕۆژهەلات، دەستی بەسەر باکووری (چین) و باکووری (مەنشوریا)دا گرت و دەسەلاتی خۆیان لە باشووری (چین)دا دامەزراند، پاشان قەڵەمڕەوی دەسەلاتیان لەسەر دەریای (نیسی)ی (قەرغیزیا) لە باکوورەوە تا باشوور درێژ بۆوە، لە (خوارەزم)ی خۆرئاوا تا وڵاتی (ئیغور)ی ڕۆژهەلات درێژ بۆوە، شاری (بالاساغن) پایتەختیان بوو، ناسناوی پاشاکەیان (کۆرخان ـ خانی خانان) بوو، کاتێك دەسەلاتیان ڕووخا دەسەلاتی ئەمیر (گچلەك)ی (نایمانی) هاتبووە نێو دەسەلاتی ئەوانەوە، دوا پاشای (قەرەخێتای) داب و نەریت و جل و بەرگی ئیسلامی ڕەچاوکردبوو، بەردەوام دەسەلاتیان لە هەرێمی ئەودیو ڕووبار بەرقەرار بوو، تا ساڵی ٦١٢ك (علاء الدين محمد خوارەزم شا) دەستی بەسەردا گرت، مەملەکەتی (قەرەخێتای) بە هۆی چالاکی میرە موسڵمانەکان لە ڕۆژئاواوەو شاڵاوی (مەغۆل) لە ڕۆژهەلاتڕا ڕوخا.[1]

ـ تەتار: (تەتار: لە سەدەی ٢ك/ ٨ز دوو بەش بوون: یەکەمیان: لە (٩) هۆز پێکهاتبوون. دووەمیان: لە (٣٠) هۆز پێکهاتبوون.

ئەمانە لە باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی (بایکاڵ)ڕا تا ڕووباری (کیرولین) نیشتەجێ ببوون، ئەم هۆزانە دەکرێن بە (٣) بەش:

- تەتاری سپی: ئەم جۆرەیان لە دەرەوەی دیواری چین نشتەجێ ببوون.
- تەتاری ڕەش: ئەم جۆرەیان ڕەوەند بوون، واتا کۆچەری بوون، لە باکووری بیابانی (جوبی) نیشتەجێ ببوون.
- تەتاری دارستان: ئەمانە لە قەراغ بەرزاییەکانی دوو ڕووباری (ئۆنۆن) و (کیرۆلین) دەژیان، لەسەر پیشەی ڕاو و شکار بە ڕێوە دەوچوون، لەگەڵ ئەمەدا (مەغۆل)ەکان لە سەدەی ٧ك/١٣ز شاڵاوە بەناوبانگەکانی خۆیان و کارە داگیرکەرەکانیان لە جیهانی ئیسلامدا ئەنجامدا، بەلام لە هەموو شوێنێك بە (تەتار) ناسرابوون ئەم ناوە لە (خان)ە پێشووەکانی

---

[1] العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٢٥.

پێش (جەنگیزخان) و هۆزی (نایمان)ەوە وەرگیراوە، ڕاستیەکەی ئەمەیە، کە (تەتار) چەند هۆزێکی سەربەخۆ بوون و لە (مەغۆل) جودا بوون، لە حاڵێکدا ناوی (مەغۆل) بەسەر هەموو ئەو هۆزانەدا دادەبڕیێ کە لە ژێر دەسەڵاتی (جەنگیزخان)دا قەراریان گرتبوو، هێندەی نەخایاند وشە و ناوی (تەتار) بەسەر (مەغۆل)دا دابڕا و زاڵ بوو، بە تایبەتی لە بەشەکانی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل)دا، لێرەوە پێویستە ڕاستیەکی گرنگ ڕوون بکەینەوە کە دوو وشەی (مەغۆل) و (تەتار) دوو ناون بۆ دوو هۆز کە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای ناوەڕاست و باکووری ڕۆژاوای چین و لە قەراغ ڕووبارەکانی (ئۆڵدزا، کیرۆلین، ئەرخون، ئونون، عامور) دەژیان.[1]

—هۆزی (کرایت): ئەم هۆزە مەملەکەتێکی گەورەیان دامەزراند، کە دەسەڵاتەکەی لە ڕووباری (ئەرخون)و چیای (کنتاری)ڕا تا دیواری چین درێژ ببۆوە، لە ساڵی٤٠٠ــ٤٠٢ك/ ١٠٠٧ــ١٠٠٩ز لەسەر دەستی ئوسقوفێکی نەستوری — مەسیحی — نیشتەجێ لە (مروە) دەچنە سەر مەزەبی نەستوری ی مەسیحی، لە سەدەی شەشەمی کۆچی/١٢ز سەرۆکەکانیان ناوی مەسیحیان لە خۆ دەنا، بە ناوبانگترین پاشایان (توغرۆڵ) بوو، توانی بە پشتیوانی سەرکردەیەکی مەغۆلی بە ناوی (یوسحای)ی کە دەکاتە بابی جەنگیزخان بەسەر مامیدا زاڵ بێت و لەسەر تەختی حوکمڕانی لابەرێت، هەروەها (توغرول) توانی (تەتار) نابود بکات و بەمەش بووە بەهێزترینی پاشای (مەنغۆلیا)، لە بەرامبەر ئەم سەرکەوتنەدا ئیمپراتۆر (کین) ناسناوی (وانج)ی دا بە (توغرول) و ناوبانگی بە (وانج خان) دەرکرد.[2]

—هۆزی (نایمان): بە ناوەکەیانەوە دیارە ئەمانە (مەغۆل) بن، (نایمان) واتا هەشت، بەڵام ناسناوی کەسەکانیان تورکیە، بۆیە دەکرێت لەسەر تورکی مەغۆلی حیسابیان بۆ بکرێت، هۆزی (نایمان) لە بەشی ڕۆژئاوای نیشتمانی هۆزی (کرایت) نیشتەجێ بوون، نیشتمانیان تا سەر ڕووباری (ئەیتیش) درێژ ببۆوە، ئاینی (شامانی)یان هەبوو، پاشان هاتنە سەر مەزەبی نەستوری مەسیحی.[3]

—هۆزی بەرچقینی مەغۆلی: لە دەوروبەری ڕووبارەکانی (تولا، ئەرنون، کیرۆلین) نیشتەجێ بوون، بنەچەکەی (جەنگیزخان) دەگەڕێتەوە بۆ بنەچەکەی ئەم هۆزە، دوابەدوای

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٢٦.
٢ المصدر نفسه، ص: ٢٧.
٣ المصدر نفسه، ص: ٢٧.

ئەم هۆزە هۆزەکانی تری مەغۆل لە کەنارەکانی ئەم ڕووبارانە و لە نزیك ئەم هۆزە نیشتەجێ بوون،سنووری ئەم هۆزانە لە بەشی ڕۆژهەڵاتڕا بە ڕووباری (کیرۆلین) دەست پێ دەکات و لە ڕۆژاواڕا بە دەریاچەی (بیکاڵ) کۆتایی دێت.[1]

(مەغۆل)ە ڕەسەنەکان – باپیرانی جەنگیزخان – بە حوکمی ئەوەی لە نێوان دەشتو جەنگڵستاندا نیشتەجێ ببوون، خۆیان بە ئاژەڵداری خەریك کردبوو ژیانێکیشیان بە ڕاوو شکارەوە بەند بوو، هەروەها بە حوکمی ئەوەی ڕووباری (سەرداریا) واتە (سەیحون) جیهانی تورکی مەغۆلی و جیهانی ئیسلامی لێك جودا کردبۆوە، مەغۆلە تورکەکان لەسەر دابو نەریتو ئاینەکانی خۆیان مابوونەوە وەك (بتپەرستی، بوزایی، نەستوری)، شارستانیەتی چین گەورەترین کاریگەری لەسەر ئەم هۆزانەی (مەغۆل) دروست کردبوو.[2]

## پێنجەم: ژیانی کۆمەڵایەتی مەغۆل:

سیستەمی کۆمەڵایەتی (مەغۆل) لەسەر بنەمای چینایەتی دامەزرابوو، هۆز بۆ سێ چین دابەش دەبوو:

چینی یەکەم: نەجیب و پیاوماقوڵان: ئەم چینە سێ ناسناویان هەبوو: (بەهادور) واتا ئازاو چەلەنگ، (توبان) واتا پیاو ماقوڵ، (ستسن) واتا دانا و حەکیم.

چینی دووەم: (نوکور) ـ واتا ئازادان ـــ سیستەمی سەربازی و سیاسی (مەنغۆلیا) لە سەردەمی (جەنگبزخان)دا لەسەر شانی ئەم خەڵکانە بەڕێوە دەچوو، ئەم چینە لە خەڵکی جەنگاوەر و شوێنکەوتووانیان پێکهاتبوو.

چینی سێیەم: چینی (عەوام) – گشتی و کۆیلەکان، هەر تاقمە و تیرەیەکی مەغۆل سەرۆکێکی هەبوو، ئەگەر شا بووایە پێیان دەگوت (خان = قان) یان سەرکردە بووایە پێیان دەوت (باکی = بەکی)، سەرۆکی هۆزە جەنگەڵنشینەکان وێنەی (ئۆپرات، مەرکیت) بەم ناسناوانە ناوبانگیان دەرکردبوو.[3]

هەندێك تیرە و تایەفەی بچووك ـ وەك نەریتی هەموو ژیانێکی خەڵکی لە هەر شوێنێك بێت – بە خاتری خۆ بەهێزکردن خۆیان بە هەندێك تیرە و هۆزی لە خۆیان گەورەترەوە دەبەستەوە، چونکە بە خۆیان بە تەنیا نەیاندەتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن، بۆ نموونە:

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٨.

٢ المصدر نفسه، ص: ٢٨.

٣ المصدر نفسه.

هۆزی (جەلائیر) پەیوەندی لەگەڵ باپیرانی (جەنگیزخان) بەستووە، هەروەها هەردووك هۆزی (قەنقران و ئۆیراپت)یش دوای گەردنکەچ بوونیان بۆ (جەنگیزخان) ئەم کارەیان ئەنجامدا.

(ژینگە) کاریگەری زۆر گەورەی هەبوو لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری هۆزەکانی مەغۆل، کەش و هەوای (وشك و برینگ) و گەڕان و سوڕان بە دوای لەوەڕ و بە خێوکردنی مەڕ و ماڵات و گوزەرانێکی درێژخایەن بەم شێوەیە، جۆرە ژیانێکی تایبەتی بۆ ئەم هۆزانە دروست کردبوو.

تورکە مەغۆلەکانی نیشتەجێی جەنگەڵستان بە شێوە ژیانێکی کێویانەی لە دەوروبەری دەریاچەی (بایکاڵ) ڕووباری (عامور) دەژیان، لە دارستاندا ڕاوی گیانلەبەرانیان دەکرد، لە دەریاچە و ڕووبارەکەدا ڕاوە ماسیان دەکرد و بەم شێوەیە بژێوی ژیانیان پەیدا دەکرد.

بەڵام ئەوانەی لە (ئوستوبس) نیشتەجێ بوون ژیانیان لەسەر بەخێوکردنی ئەسپ و ڕەشەوڵاغ و مەڕ و بزن بوو، بۆیە بە ناچاری بە دوای لەوەڕدا دەگەڕان، ئەم شوانکارانە بۆ بە دوا گەڕانی لەوەڕگا و ئاو بۆ ئاژەڵەکانیان بە درێژایی ساڵ لە کۆچ و کۆچ باریدا بوون، خەڵکانیان هەبوون خۆیان فێری ئەسپ سواری و شەڕە شمشێر و تیرەندازی دەکرد بۆ ئەوەی بتوانن لە ماوەیەکی کورتدا لەوەڕگای گونجاو بدۆزنەوەو (بە زەبر و زەنگ دەستی بەسەردا بگرن)، ئەم جموجۆڵە لەسەر یەکانە و سنوور بەزاندنە زۆر جار سەری دەکێشا بۆ نانەوەی شەڕ و هەرا لەگەڵ دراوسێکانیان و ڕاوەدوونانو تاڵان برۆ، بۆیە ئەم شوانکارانەی مەغۆل بە مرۆڤی خاوەن حەوسەلە و تێکۆشەر و ئازا و چالاك و نەترس و پێخۆش بوونی جموجۆڵ و ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکان و زاڵ بوون بەسەر خەڵکانی بەرامبەردا ناسرابوون، هەموو ئەم سیفەتانە وایان لە پیاوانی ئەم هۆزانە کرد ببنە سەربازی چەلەنگ و سوپایەکی ساز و ڕاهێنراویان لێ دروست ببێت و لە کاتی پێویستدا کاری خۆیان پێ ڕاپەڕێنرێت، کاتێك (جەنگیزخان) هاتە سەر حوکم توانی ئەم هۆزانە یەکخات و بە سوود وەرگرتن لە ئەزموونی تفت و تاڵ و نارەحەتیانو جەنگ و هەراکانیان توانی جۆرێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیان بۆ دروست بکات، لەم پێناوەدا دەستوورێکی بۆ ڕێك خستن کە بە (یاسا)[1] ناوی دەرکرد.

---

١ یاسا بریتیە لەو دەستوور و ڕێنماییانەی جەنگیزخان، ئۆیغورییەکان بە ڕێنووسی زمانی خۆیان بۆیان نووسیەوە، لە ڕاستیدا ئەم کتێبە لەسەر خواستی جەنگیزخان نووسراوەوە و، خۆی لە خۆیدا تێکەڵەی داب و نەریت و کلتورە پێشینەکانیانە، مەغۆلەکان پێڕەویان لێ دەکرد و لە کاتی کۆبوونەوەی کۆریلتای واتە کۆبوونەوەی گشتی بۆ دانانی خانی تازە یان سازکردنی سوپاکانیان بۆ هێرش و پەلامار بۆ لای دەگەڕانەوە.

ئەو زۆر داکۆکی دەکرد هۆزە گەردنەکەچە ژێر دەستەکانی یەك دەنگی و یەك ڕەنگیەکیان لە بۆچوون و بڕیارەکانیاندا بۆ دروست ببێت و ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بن، (یاسا): لە پێناوی قەڵاچۆکردنی هۆکارەکانی ئاڵۆزی و پشێوی و بەرقەرارکردنی هێمنایەتی نێوخۆ سزاگەلێکی توندی بۆ سەرپێچی کاران لە خۆ گرتبوو، چەند بەندێکی قانونیشی تێدا بوو پەیوەندیان بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و پەیوەندیەکانی نێوان چینەکانی حوکمڕان و تەواوی گەلەوە هەبوو.

(جەنگیزخان) ئامانجەکانی خۆی پێکان و توانی هۆزەکانی مەغۆل کۆبکاتەوە و سوپایەکی ڕێکخراوی مەزبووتیان لێ دروست بکات و بەپێی چەند نەخشەیەکی تۆکمە و تەواوی سەربازی ئاراستەیان بکات.

خۆراکی مەغۆلەکان: بە شێوەیەکی گشتی بریتی بوو لە گۆشتی گیانلەبەران — بە هەموو جۆرەکانیانەوە — لە ئەسپ و سەگ و گورگ و ڕێوی و جرج و مشك.

خۆراکیان کەم و کورت بوو بە تایبەتی لە زستاندا کە سەرما و سۆڵە تەنگی پێ هەڵدەچنین، بەرنامەیەکی تایبەتیان بۆ پاراستن و پەسمەندەکردنی گۆشت دانابوو، کاتێك گیاندارێك یان ئاژەڵێك مردار دەبۆوە گۆشتە کەیان دەکردە پارچەی تەنك تەنكو لەبەر خۆرەتاو هەڵیان دەواسی تا وشك بێتەوە و بۆگەن نەکات، ئینجا هەڵیان دەگرت و لە زستاندا دەیانخوارد.

پۆشاکیان: سادە بوو و لەگەڵ ئەو ژینگەیە دەهاتەوە کە تێیدا دەژیان، بە زۆری لە خوری و تووکە وشتر چنرابوو، یان هەر پێستی گیانلەبەرانیان لەبەر خۆیان دەکرد، جیاوازیەکی زۆر لە نێوان جل و بەرگی ژنان و جل و بەرگی پیاوانیاندا نەبوو، نەریتی مەغۆلەکان ئاوا بوو: کە لە ماوەی درێژایی زستاندا جل و بەرگی بەریان نەدەگۆڕی، بەڵام هاوینان هەر مانگ جارێك بەرگی خۆیان دەگۆڕی، هەروەها هەرگیز جل و بەرگی خۆیان نەدەشۆرد و تا دەڕزی و شڕ دەبوو لەبەریان دەکرد، بە مەبەستی خۆ پاراستن لە سەرما و شێ، جەستەیان بە پیو چەور دەکرد.[١]

**شەشەم: ئاینی مەغۆل:**

لێکۆڵەری مێژووی هۆزەکانی مەغۆل بە ئەستەم دەتوانێ بگاتە بنەمایەکی ڕاست و دروست سەبارەت بە ئایینیان، هەندێك سەرچاوە شتێکیان باس کردووە بەڵام بەشی لێکۆڵەر ناکات و دادی نادات.

---

١ المغول في التأريخ للدكتور عباد، ص: ٣٣ـ٣٤.

(ابن كثير) دەربارەی بیروباوەڕیان دەڵێ: ئەوان کاتێك (ڕۆژ) هەڵدەهات کڕنووشیان بۆ دەبرد، هیچ — جۆرە خۆراکێکیان — بە حەرام نەدەزانی، ئەوەی دەستیان بکەوتایە لە گیانلەبەر و مردارەوە بوو دەیانخوارد.[١]

وەك (ابن كثير) لە (جوینی) دەگێڕێتەوە: (یاسا)کەیان چەند بڕیار و دەستوورێکی لە خۆ گرتبوو وەك: هەر کەسێك — چ کوڕ چ پیاو، چ کچ چ ژن — زینا بکات دەکوژرێت، کەسێك کاری (نێربازی) بکات دەکوژێت، کێ درۆ بکات دەکوژرێت، کێ جادوو بکا دەکوژرێت، کەسێك میز بکاتە نێو ئاوی وەستاو دەکوژرێت، کێ خۆی لە ئاوی وەستاو نقوم بکات دەکوژرێت، کەسێك خواردن بداتە دیلێك یان خواردن بۆ کەسێك هەڵدا دەکوژرێت، بەڵکو دەبێت خواردنەکە بە دەست هەڵبگرێت و بیداتە دەستی وەرگرەکە، هەر کەس خواردن دەدا بە کەسێکی ئازاد ـ نەك دیل ـ دەبێت لە پێشدا بۆ خۆی لێی بخوات، ئەگەر لای ئەو نەیخوات دەکوژێت، کەسێك گیاندارێك سەرببڕێت وەکو ئەو گیاندارە سەر دەبڕدرێتەوە، بەڵکو پێش ئەمە دەبێت ناو سکی هەڵدڕێت و بە دەستی خۆی دڵی دەربهێنێت.[٢]

یەکێك لە شاکانیان مەنکۆخان (١٢٥١ز/ ١٢٦٠ز) لە گفت و گۆیەکیدا لەگەڵ (ڕویرکی)ی گەریدە، دەڵێ: ئێمەی (مەغۆل) باوەڕمان وایە کە خودایەکی پەرستراوی تاك و تەنها هەیەو، بۆ ئەو دەژین و بۆ ئەو دەمرین و، بە خۆشەویستی ئەو دڵمان ئارام دەگرێت، بەڵام خودا چەند پەنجەیەکی جیاوازی بە دەست بەخشیووە، بە هەمان شێوەش چەند بەرنامەیەکی جیاوازیشی داوەتە خەڵك، کتێبی پیرۆز (ئینجیل)ی داوە بە ئێوە، بەڵام مەسیحیەکان پارێزگاریان لێ نەکردووە، (شماناس)ی داوە بە ئێمە و فەرمانمان بە چ شتێك پێ بکات جێبەجێ دەکەین و بە ئاشتی دەژین.[٣]

(جوینی) دەڵێ: (جەنگیزخان) بۆ دینێکی دیاری کراو گەرمە تەریقەت نەبووە، ڕۆڵەکانی بە ئارەزووی خۆیان ڕوویان لە ئاینەکان کردووە، هەیانە ڕووی لە ئیسلام کردووە، هەشیانە مەسیحیەتی هەڵبژاردووە، تێشیاندایە ڕووی لە بت پەرستی کردووە، جگە لە ئەمانەش لەسەر ئاین و نەریتی باب و باپیرانیان ماونەتەوە.[٤]

---

١ البداية والنهاية لإبن كثير، نقلا عن العالم الاسلام للخالدي، ص: ٣٢.
٢ البداية والنهاية ١٧/١٦١ـ١٦٥.
٣ الحياة السياسية في العراق للدكتور القزاز، ص: ٢٠ـ٢١.
٤ المصدر نفسه، ص: ١٩. العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٣٣.

(ابن فضل الله العمري) دەڵێ: ... ئەوەی لە تێکڕای مەزەبەکانیان دێتە بەرچاو ئەوەیە کە: باوەڕیان بە تاك و تەنهایی خودا هەبووە و پێیان وابوو (أللە) ئاسمانەکان و زەمینی دروست کرووە.[١]

دکتۆر (قەززان) لە پێناسەی ئایینی (شامانی) دەڵێ: ئایینی ڕەسمی (مەغۆل) بە (شامانزم) ناوی دەرکردبوو، خۆی لە پەرستنی دیاردەکانی سروشتدا دەنواند بە تایبەتی پەرستنی (ڕۆژ)، ـــ مەغۆلەکان بە توندی گوێڕایەڵی کاهینەکانیان دەکرد، قسەکانی (مەنکۆخان) بۆ (ڕویدرکی)ی گەڕیدە دەبێتە شایەدی ئەمە، بەڵام ئایین و ڕێنماکانی ئەم ئاینە لە بەرامبەر ئاینەکانی گەلانی تر ـ ئەو گەلانەی مەغۆل هێرشی کردە سەریان — خۆی ڕانەگرت و پوکایەوە، کار بەوە گەیشت مەغۆلەکان لە چین چوونە سەر ئاینی (بوزایی)، لە وڵاتانی ئیسلامیدا چوونە سەر ئاینی (ئیسلام) لە ڕوسیا چوونە سەر ئاینی (مەسیحی).[٢]

(ئەڕنۆڵد) دەنووسێ: (شامانی) ئاینی کۆنی مەغۆل بوو، لەگەڵ ئەوەدا دانیان بە خودایەکی گەورە و تواناداداێنا، بەڵام نوێژیان بۆ ئەو خودایە نەدەکرد، بەڵکو چەند تاقمە پەرستراوێکی پەستیان دەپەرست، بە تایبەتی ئەو پەرستراوە شەڕەنگێزانەیان دەپەرست کە بە بیروباوەڕی خۆیان ئەمانە دەتوانن ئازاریان بدەن، بۆ ڕەواندنەوەی ئازاری ئەم پەرستراوانە قوربانی و خوێنڕێژیان بۆ ئەنجام دەدان، بە هەمان شێوە (ڕوح)ی باپیران و پێشینانیان دەپەرست، چونکە پێیان وابوو ئەمانە دەسەڵات و کاریگەری گەورەیان لەسەر ژیانی خەڵکانی دوای خۆیان — واتا نەوە و وەچەکانیان — هەیە، لە پێناوی سەرکەوتنی (مەغۆل) لە نێوان هێزەکانی ئاسمان و جسمانی خوارەوەدا پشتی خۆیان بە قسیسەکان دەبەست کە بریتی بوون لە: (شامان، جادوباز، پزیشکەکان)، بە بیروباوەڕی ئەوان ئەم (شامان) و (جادووباز) و (پزیشکانە) دارای دەسەڵاتێکی نهێنی و سەرسووڕهێنەرن بۆ سەر ڕەگەزەکانی مردن و ڕووحی مردوان، ئاینی (مەغۆل) لە ڕیزی ئەو ئاینانە نەبوو کە خاوەنی توانایەکی بەهێز بوون و جەماوەر و پشتیوانێکی گەورەیان بە دەورەوە بوو و (لاهوتێکی منظم)یان هەبوو و دارای هێزی قەناعەت پێکردن و پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی ژیری و عەقڵی هەبوو، ئەم ئاینانە خاوەن دامەزراوەی ڕێکخراو بوون بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانی

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٣٣.
٢ المصدر نفسه، ص: ٣٣.

ئایینی، لێرەوە مەغۆڵەکان کاریگەری ئاینی ئەو گەلانەیان کەوتە سەر[١] ــ کە هێرشیان کردبوونە سەر ــ، ئەمە بیروباوەڕی شێوێنراو و خراپ بووی مەغۆل بوو.[٢]

(إسماعيل عبدالعزيز الخالدي)ی لێکۆڵەر پێی وایە:

بیروباوڕی شێوێنراوی مەغۆل — کە مێژوونووسان لێرە و لەوێ ئاماژەی پێ دەدەن — جگە لە پاشماوەی بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست کە لە لایەن هەندێك پێغەمبەرەوە بۆیان هاتووە هیچی تر نییە، ئەم قەناعەتە لەم ئایەتەوە وەردەگیرێت کە خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ (فاطر: ٢٤).

بەڵام لادانی مرۆڤایەتی لە ڕێی ڕاست کە خۆی لە دەست تێوەردانی خەڵکانێکدا بینیوەتەوە وەکو حوکمڕان و سەرۆك، یان زانایان لەو بیروباوەڕ و ئایینەدا: چ بە زیادکردن بێ چ بە لێ کەمکردن بێ — بە فیتی شەیتان یان نەفس و هەوا بە مەبەستی گەیشتن بە ئارەزوویەك یان حەز کردن لە تۆڵە سەندنەوەیەك یان بۆ خۆ دەرخستن — یان .... هەموو ئەم هۆکارانە ئەم بیروباوەڕەیان بە شێوەیەکی شێوێنراو گەیاندۆتە دەست ئێمە، ئەوان — واتا مەغۆلەکان— دان بە خودایەکی تەنها و تاقانەدا دێنن و دەڵێن ئەو خودایە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، بەڵام هەندێك دروست کراوی بۆ دەکەنە هاوەڵ لە پەرستندا، وەك (ڕۆژ، ڕوحەکان) و شتی تریش، ئەوان (کوشتن و زینا و لیواتە و درۆ و سیحر و جادوو و جاسوسی) بە خراپ دادەنێن، کە هەموو ئەمانە لە لایەن خودای پاك و بەرزەوە و لە ڕێی پێغەمبەرە ڕێزەکانیەوە بە حەرام و قەدەغە دانراون، کە دەبینین تۆڵە و سزا لە بەرامبەر هەندێك لەم تاوانانە زۆر توندە، بەڵام ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی شێواندنەکەیە کە بە دەستی خەڵکانی ستەمکار ئەم گۆڕینە کراوە، پێیان وابووە بەم کارەیان و کەم و کوڕیەکەیان پڕ دەکەنەوە یان سوود لە ئەزمونێك وەردەگرن.

پوختەی قسە: (ئوستاد إسماعیل الخالدی) ئەم ڕایەی پەسەند کردووە: کە ئوممەتی (مەغۆل) بیروباوەڕ — و ئاین — ێکی ڕاست و دروستی هەبووە، بەڵام بە تێپەڕینی چەرخی زەمانە شێوێنراوە و پاشانیش زۆر لە فەرمانەکانی وازیان لێ هێنراوە، کە (جەنگیزخان) هاتە سەر حوکم فەرمانی نووسینەوەی بە خەتی (ئۆیغۆری) دەکرد، ئینجا بۆ خۆشی چەند

---

١ الدعوة الى الاسلام، أرنولد، ص: ٢٥١.

٢ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٣٤.

شتێکی پێوە زیاد کرد کە بە بیروباوەڕی خۆی سوود بە ئوممەتەکەی دەگەیەنێت و مەملەکەتەکەی بەهێزتر دەکات.[1]

بەم شێوەیە ئاین و بیروباوەڕە ئاسمانیەکان بە جۆرەها شێوەی گۆڕین و شێواندن و لێ زیادکردن و لێ کەمکردن لە لایەن مرۆڤەکانەوە دەست درێژیان کراوەتەسەر، ئەم دەست درێژیە لە سەرەتاوە کراوەتە سەر ئەو ئاینەی بۆ بابە ئادەم (علیه السلام) تا بە ئاینی (ئیبراهیم و ئیسماعیل) ڕادەگات کە لە لایەن —خەڵکی نیوەدوورگەی عەرەبیەوە— شێوێنراوە، ئاینەکەی (موسا)ش لەسەر دەستی جوولەکە گۆڕدراوە، لە دوایشدا ئاینی عیسا لە لایەن نەصرانیەکانەوە دەستکاری کراوە،[2] قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێندا ئەم ڕاستیەی چەند بارە یات کردۆتەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزە بەسە بیکەینە بەڵگەی ئەم قسەیەمان: خودای بەرز و مەزن دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ١٧١﴾ (النساء: ١٧١).

هەروەها خودای بەرز دەفەرموویێت: ﴿فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ (المائدة: ١٣).

## حەوتەم: کێشمەکێشمەکانی کۆمەڵگای (مەغۆل) لە پێش (جەنگیزخان)دا:

### ١- ئاژاوەی نێو (مەنغۆلیا):

لە ڕاستیدا جگە لە تورکی (ئۆیغۆر و خەتا)ی دانیشتووی باشووری ناوچەی (ئوستوبس) لەگەڵ (مەنغۆلیا)ی ئەسڵی، تەواوی مەنغۆلیا کەوتبووە بارودۆخێکی یەکجار ئاڵۆز و پەشێو، ئەو کات لە نێوان (تەتەرەکان و مەنغۆلەکان و کرایت و نایمان) وڵاتێکی ناسراو بە ناوی شارەکانی (بەلات)، پایەتەختی حکومەت لە ئارادا نەبوو، شارەکانی (ئۆیغۆر) جگە لە چەند سەربازگەیەکی دەورەی ڕەشماڵەکانی سەرۆکەکەیان زیاتر نەبوون، ئەوەی ڕۆشن بێت ئەم سەربازگانە دوای کۆچڕەوی سەرۆك یان (خان) دادەڕمان، لە (ئوستوبس)ی مەغۆلی ڕا تا بە

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٣٥.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣٥.

تەواوی ناوچە دارستانەکان ڕادەگات هیچ لەم سەربازگانەی لێ نەبوون، پەیدابوونی ئەم سەربازگانە بە لە دایك بوونی (جەنگیزخان) هاتنە ئاراوە، لەو ناوچانەدا جگە لە چەند گوندێکی بچکۆلە کە چەند خێزانێکیان تێدا نیشتەجێ ببوون و بە پیشەی شوانکاریەوە سەرگەرم ببوون شتێکی تر نەدەبینرا، جار هەبوو لە ناوچەیەکی گەورەدا تەنها گوندێك دەبینرا، ئەمەی گوتمان نموونەیەکی ئەو ژیان و گوزەرانە باوە بوو لە کاتی سەرەتای لاوێتی (جەنگیزخان) و برایەکانی دا باوبوو، ئەمان کاتێك مامەکانیان بە هەتیوی بەرەڵایان کردن، بە ناچاری ڕوویان کردە ڕاو و فەراهەمهێنانی ژیانێکی کولەمەرگی بۆ خۆیان،[1] ئەوەی ڕاستی بێت لە نێوەڕاستی سەدەی (١٢)ی زاییینیدا پەیوەندی سیاسی و کۆمەڵایەتی (مەغۆل) بە هۆی ئەو ئاڵۆزیو گرژیەی ماوەیەکی زۆری خایاند پارچەپارچە ببوو و لێکهەڵوەشابوو، مەغۆلی (تایجیۆت) و تەواوی مەغۆلەکانی تریش بە هۆی ئاژاوە و هەرای گشتی بێ (خان) بوون، کێشمەکێشی نێوان (تایجیۆت) و (جەنگیزخان) و دوژمنایەتی نێوان (جەنگیزخان) و (جامۆکا) و شەڕ و هەرای نێوان تەواوی تیرە و هۆزە مەغۆلیەکانی تریش لەسەر لەوەڕگا و پوش و پاوان و جێگە و پێگەی سەربازگەکانیان ئەم ئاژاوە و پشێویەیان لەو وڵاتەدا نیشان دەدا، بەڵگە بۆ ئەم هەرا و بگرە و بەردانەی نێوخۆی (مەغۆل): هەوڵ و تەقەلاکانی (جەنگیزخان) دوای مردنی بابی بۆ کۆکردنەوەی هۆز و تایەفە پەرتەوازەکان، هەروەها دروستکردنی هاوسەرگیری مەغۆلەکان لەگەڵ عەشیرەتەکانی تر چ لە ڕێی ڕەزامەندیەوە چ لە ڕێی هەڵگرتنەوە، وەك ئەوەی لە هاوسەرگیری خودی (جەنگیزخان) و باوکیدا ڕوویان داوە هەموو ئەمانە سەریان کێشاوە بۆ شەڕو هەرای زۆر و زەوەند.[2]

## ٢ـ هەوڵەکانی یەکگرتنەوەی هۆزە مەغۆلەکان:

پێش دەرکەوتنی (جەنگیزخان)یش چەند هەوڵ و تەقەلایەك لە پێناوی یەکگرتنەوەی هۆزەکانی (مەغۆلی) دران، بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە بە هەواداچوون، مێژوونووسان دەربارەی (بدانستار)ی باپیرە گەورەی مەغۆلی قسەیان کردووە، (بدانستار) لە فێڵ و تەڵەکەبازیدا ناوبانگی دەرکردبوو، توانی خۆی بکات بە سەرۆکی ئەو هۆزەی کە لە نزیك خانووەکەی ئەو لەسەر کەنارەکانی دەریاچەی (بایکاڵ) هەڵیان دابوو و لە چەند خێزانێك تێپەڕیان نەدەکرد، تا (قەیدۆ)ی کوڕی بوو بە سەرۆکیان، هێندەی نەخایاند ناسناوی (خان)ی خرایە پاڵ، ئەم

---

١ المغول، د. السيد الباز العريني، ص: ٣٨.
٢ المصدر نفسه، ص: ٣٩.

خێزانانـە کاکڵـەی یەکـەمی مەملەکـەتی (مـەغۆل) بـوون، (قەیـدۆ) (٣) کـوڕی هـەبوو، گەورەکەیان باپیرە گەورەی بنەماڵەی (قیات) بوو کە (جەنگیزخان)ی تێدا هەڵکەوت، کوڕە ناوەنجیەکەی (قەیدۆ) باپیرە گەورەی بنەماڵەی (تایجیۆت) بوو، (جەنگیزخان) لە سەرەتای لاوێتیدا ئامادەی هەموو ئەو هەرا و ناکۆکیەی نێوان ئـەم دوو بنەماڵـەی (قیـات و تـایجیۆت) بوو. مەملەکەتی (مەغۆل)ی یەکەم لە سـەردەمی (کایـل) و نـەوەی (قەیـدۆ) و پـاش تونـد و تـۆڵ کردنـی پەیوەنـدی نێـوان (مـەغۆل) و بنەماڵـەی (کـین)ی حـوکمڕانی بـاکووری (چـین) گەیشتە لوتکەی حوکمڕانی، بەڵام ڕق و کینـە لـە نێـوان (کایـل) ی خـانی (مـەغۆل) و (چـای سۆنگ)ی شای (چین) دروست بوو و تا لە ساڵی (١١٣٥)ی زایینیدا ئـاگری جـەنگو هـەرا لـە نێوانیانـدا هەڵایـسا و لـە سـاڵی (١١٣٩)ی زایینیـدا سـوپای چـین تێکـشکا، ئـەم مێـژووە بـە سەرەتای (ڕاپەڕینی مەغۆل) دادەنرێت.

بنەماڵەی (کین): هەرچەندە سەرۆکایەتی (مەنشوریا) و (باکووری چـین)ی دەکـرد، بـەڵام زۆر لە (مەغۆل) دەترسا بە تایبەتی پاش ئـەوەی مەغۆلـەکان دەسـەڵاتیان بەسـەر بـاکووری ڕۆژئـاوای (مـەنغۆلیا)دا کێـشا و (تـەتار)ەکـانی نیـشتەجێی کـەناری باشـووری ڕووبـاری (کیرۆلین)یشیان خستە ژێر ڕکێفی فەرمانڕەوایی خۆیانـەوە، (چان)ی شـای (چـین) هەوڵیـدا ئاگری فیتنە و ئاژاوە لە نێوان (مەغۆل) و (تەتار)دا هەڵایسێنێ، چەند جـەنگ و هەرایـەك لـە نێوانیانـدا ڕوویـدا، (یەسـۆکای)ی نـەوەی (کایـل) و بـاوکی (جـەنگیزخان) سـەرکردەیەکی تەتەرەکانی بە ناوی (تیمۆجین) کوشـت، بـۆ زینـدوو ڕاگرتنـی ئـەم سـەرکەوتنەی منداڵێکی خۆی کە تازە لە دایك ببوو بە ناو ئەو کردەوە و ناوی نا (تیمۆجین)، دوایە بە (جەنگیزخان) ناوی دەرکرد.

ڕۆژگار هات و ڕۆیشت (تەتەر)ەکان بە پشتیوانی سـوپای خۆیـان و پـشتیوانی بنەماڵـەی (کین)ی (چینی) لە هەموو بوارەکانی سەربازی و جـەنگی و شـێوازەکانی سیاسـەت و فێـڵ و تەڵەکەبازیدا بوونـە خـاوەنی دەسـەڵات و سـوڵتانی گـەورەی ناوچـەکە، کـار بـەوە گەیـشت مەملەکەتە تازە پێگەیشتووەکەی (مەغۆل) لێك هەڵوەشێت و (تەتـەر)ەکـان دەسـت بەسـەر ڕۆژهەڵاتی بیابانی (جۆبی)دا بگرن – کە لە پێشدا لـە ژێـر دەسـەڵاتی مەغۆلەکانـدا بـوو –، دوای ئەمە (تەتار) بووە مایەی هەڕەشە بۆ خودی بنەماڵەی (کین): بۆیـە هێنـدەی نەخایانـد بنەماڵەی (کین)ی پاشایەتی (چینی بـاکوور) لـە (تەتـەر)ەکـان هەڵگەڕایـەوە، ئەمـە بـوو بـە هەلێکی باش بە دەست (جەنگیزخان) تا بەسەریاندا سەرکەوێ، لەگـەڵ ئـەوەدا (یەسـۆکای) تەنها سەرۆکی بنەماڵەی (بۆرجقین) بوو لە نێو هۆزی (قیات)دا، بەڵام بە جەنگاوەرێکی ئازاو

سەرکردەیەکی سەرکەوتوو ناوبانگی دەکردبوو، پێشدا ئاماژەمان بە سەرکەوتنی (یەسۆکا)ی کرد بەسەر (تیمۆجین)ی یەك لە سەرکردەکانی (تەتار)دا، ئینجا یارمەتی (توغرۆڵ)ی سەرۆکی هۆزی (کرایت)ی دا لە رۆژئاوادا بۆ گێڕانەوەی کورسی دەسەڵاتی، هەردووکلا پەیمانیان بەست ببنە یەك دەست، دوای ئەمە (جەنگیزخان) سوودی لەم هاوپەیمانیە وەرگرت.[1]

(یەسۆکای بەهادوور) هاوسەرگیری لەگەڵ (هۆئیلۆن) ئەنجامدا کە لە تیرەی (مەرکیت) بوو، (٤) منداڵی لەم هاوسەرە لێکەوتەوە کە گەورەکەیان (تیمۆجین) بوو، ئەوانی دیش (جۆش، قسار، قاچیۆن، لەگەڵ کچێکیش)، لە دوو هاوسەرەکەی تریش (بەکتر و یەلجوتای) لێ کەوتەوە.[2]

**هەشتەم: بارودۆخی جیهانی ئیسلامی پێش داگیرکاریەکەی مەغۆل:**

جیهانی ئیسلام لە قۆناغی سەرەتای هێرشی مەغۆلدا بۆ چەند مەملەکەت و دەوڵەتێکی بچووك بەش بەش ببوو، هەندێکیان لە بواری سەربازی و ئابووریدا بە هێز بوون و هەندێکیشیان بێ هێز بوون، لەگەڵ ئەمەشدا لەگەڵ یەکتر ناکۆك بوون و، پرکێشی یەکتریان دەکرد و، هەر یەك لە راستی خۆی دەیویست وڵاتی خۆی لەسەر حیسابی بەرامبەرەکەی فراوانتر بکات.[3]

ئەم (سەرۆکە) ناکۆکانە بەرژەوەندی خۆیان بەسەر بەرژەوەندیە باڵاکانی موسڵماناندا هەڵدەبژارد، بێ هەواڵ لە فەرموودەی خودای بەرز و مەزن: ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ (الانفال: ٤٦). لە رێ و رەسمی تایبەتی خۆیان و هەڵسوکەوتی گەڵ گەلەکانیان، یان خۆبەخۆی یەکتردا وازیان لە بنەماکانی ئیسلام هێنابوو و لەسەر هێڵە پانەکانی ترازابوون، کەوتبوونە نێو جلێتاوی تاوانە گەورەکانیان و بە خواردنەوەی مەی و کوشتنی کاتەکانیان لە ئاهەنگەکانی سەما و گاڵتە و گەپ و شەڕواڵ پیسی و قسەی پڕوپووچەوە سەرگەرم ببوون، گەورە سەرکردەکانیان لاسایان دەکردنەوە، بەڵکو خەڵکە نزیك و دەوروبەرەکانیشیان ئەم کارە بەدانەیان رەچاو کردبوو، چۆن وانەبێ؟، کە لە کاتێکدا — گوتراوە — خەڵك لەسەر دینی شاکانیانن، لە ئەنجامی وازهێنانیان لە رەوشتە

---

١ المغول للعريني، ص: ٤٢.

٢ المصدر نفسه، ص: ٤٢.

٣ المغول والأوروبيون والصليبيون، محمود عمران، ص: ١٥.

بەرزەکانی ئیسلام گیانی قوربانی دان و خۆشەویستی شەهادەت لە دڵ و دەروونیاندا نەمابوو، هەر ئەم هۆکارەش بووە مایەی بەزین و ڕووخانیان لە بەرامبەر هێرشی (مەغۆل)دا، ئەم هۆکارە بریتی بوو لەو (وَهْن)ەی کە پێغەمبەرمان (ﷺ) ئێمەی لێ ئاگادار کردووەتەوە: کاتێ دەفەرمووێت: ((یوشك ان تتداعی علیکم الأمم کما تتداعی الأکلة علی قصبعتها، قالوا: أمن قلة نحن یومئذ یا رسول الله؟ قال: بل أنتم یومئذ کثیر ولکنکم غثاء کغثاء السیل، ولینزعنّ الله من صدور عدوکم المهابة منکم ولیقذفن في قلوبکم (الوهن) قالو: وما الوهن یا رسول الله؟ قال: حب الدنیا وکراهیة الموت)).[1]

(واتە: خەریکە گەلان هێرشتان بۆ بێنن چۆن برسیەکان هێرش دەبەنە سەر سفرەکەیان، گوتیان: لەو ڕۆژگارەدا بە هۆی کەمیمانەوەیە؟ فەرمووی: بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژگارەدا زۆرن بەڵام وەك کەف و کوڵی سەر ئاوی لافاون، خودا سامی ئێوە لە نێو دڵی دوژمنەکانتان دێنێتە دەر و (وهن)یش دەخاتە نێو دڵی ئێوەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا: (وهن) چیە؟ فەرمووی: خۆشەویستی دنیا و ڕق لێبوونەوەی مەرگ).

بەم شێوەیە ئوممەت پەرتەوازە و پارچە پارچە ببوو، لە هەر هەرێمێك سوڵتانێك و لە هەر تیرەیەك ئەمیرێك هەبوو، ڕەحمەتی خودا لەم بێژەرە بێ کە دەڵێ:

مما یزهدني في أرض أندلس — ألقاب معتصم فیها ومعتضد
ألقاب مملکة في غیر موضعها — کالهر یحکي انتفاخاً صولة الأسد

لە دوا وێستگەدا گەیشتن بە بەڵایەکی سەرتاسەری، خودای بەرز دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ ﴿٢٨﴾﴾ (ابراهیم: ٢٨).

لای ئەوان ژیان و خۆشگوزەرانی لە پێش هەموو شتێکەوە بوو، مرۆڤ بێ نرخ ببوو، سەماخانە و قومارخانەکان ئاوەدان کرابوونەوە، پەرستگاکان ببوونە وێرانە، حوکمڕان و کاربەدەستان کەمیان لێ مابۆوە پابەند بن بە ڕەوشتە بەرزەکانەوە، ڕێشمەی هەوا و هەوەسیان بەردابوو، ڕێزی خەڵکانی دوو ڕوو و بێ باوەڕیان دەگرت، ڕێك ئەم ئایەتە پیرۆزەیان بەسەردا دەچەسپا: خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ

---

[1] سنن أبي داود، عن ثوبان بإسناد صحیح، کتاب الملاحم.

ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ (النحل: ١١٢).

ئەوەی لێرەدا جێباسی ئێمەیە بەشی ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیە، بەڵام بەشی ڕۆژئاوای —واتا مەغریب و ئەندەلوس— ئەوا لەوێشدا ململانێی نێوخۆ لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوەخوازی لە ئارادابوو، بەشی ڕۆژهەڵات بەسەر چەند دەوڵەتی بچووکدا دابەش ببوو، لە وڵاتی (فارس یان ئێران) دەوڵەتی (خوارەزمی) حوکمی دەگێڕا. سنووری دەسەڵاتی لە چیای (ئۆڕاڵ)ی باکوور تا کەنداوی عەرەبی باشوور درێژ ببۆوە، لە چیای (سند)ی ڕۆژهەڵاترا تا سنووری (عێراق) ڕۆژئاوا درێژ ببۆوە، لە عێراقیش: (خەلیفەی عەبباسی) لە بەغدای پایتەختی خیلافەت تەنها سەرکردایەتی مەعنەوی بە دەستەوە مابوو، سەرکردایەتی سەربازی بە دەست نەمابوو، بەڵکو تەنها دەیتوانی لە ڕێگەی میمبەری مزگەوتەکانەوە و لە کاتی نوێژی هەینی و بۆنە و هاتنە پێشەوەی کێشەکاندا بانگەوازی جیهاد بکات و دوعای خێر بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان بکات.[1]

لە میسر و شام: دەوڵەتی ئەیوبی کێشەی تایبەتی خۆی هەبوون لەگەڵ مەملەکەتی (بيت المقدس) و هێرشی خاچپەرستان لە کەنارە دەریاکانی شامدا، ئەوەی زیاتر کێشەکانی ئاڵۆزتر کردن ئەمە بوو: لە کاتی دەرکەوتنی مەترسیەکانی (مەغۆل)دا خاچپەرستەکان لە هێرشی پێنجەمیاندا (لە ساڵی ١٢١٨ی زایینی)دا دەستیان بەسەر بورجی شاری (دمیات)دا گرت، ئەمە سەری کێشا بۆ وەفاتی (مەلیك عادل) و دابەش بوونی بنەماڵەی ئەیوبی بۆ چەند مەملەکەتێك. کە هەرە گرنگەکەیان (میسر) بوو (مەلیك کامیل) لە ٦١٥ــ٦٣٦ك/ ١٢١٨ــ١٢٣٨ز حوکمی تێدا گێڕا، لە (دیمەشق)یش مەلیکی گەورە (عیسا) لە (٦١٥ــ٦٢٤ك/ ١٢١٨ــ١٢٢٧ن) حوکمی تێدا گێڕا.

دەوڵەتی (سلجوقی)ی ڕۆمیش لە ئاسیای بچووکدا و لە کاتی دروست بوونیەوە تا کۆتایی هاتنی بەردەوام لە بەرامبەر جموجۆڵەکانی ئیمپراتۆریەتی (بیزەنتی) وەستابۆوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەترسی هێرشی (خاچپەرستان) لە وڵاتی (شام) و پاشان مەترسی (جیهانی ڕۆژئاوا) دوابەدوای داگیرکرانی (قوستەنتینیە) بە دەست خاچپەرستان لە هێرشی چوارەمی خاچپەرستان لە (١٢٠٤ز خۆی زەق کردبۆوە.[2]

---

١ المغول والأوروبيون والصليبيون، ص: ١٦.

٢ فتح القسطنطينية، ترجمة الدكتور حسن حبشي، ص: ١١٤ وما بعدها.

### ١ـ فیرقەی ئیسماعیلیەی باتینی:

(حەسەن سەبباح) بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی (فیرقەی ئیسماعیلیە) دادەنرێت لە ئێراندا، دەستی کرد بە هێرش کردنە سەر شار و قەڵاکانی دەوروبەری ناوچەی (کوهستان) کە گرنگترینیان قەڵای (مەرگ) بوو و لە ساڵی ٤٨٣ی کۆچی/١٠٩٠ی زاینیدا دەستی بە سەردا گرت و کردی بە پایتەختی مەملەکەتی ئیسماعیلیە، هەر بەمە نەوەستا و بە یاریدەی شوێنکەوتووانی توانی دەست بەسەر تەواوی ناوچەکانی باشووری دەریای (قەزوێن)دا بگرێت،[١] فیرقەی (ئیسماعیلی)ی لە مێژوودا بە خەڵکێکی جەنگاوەر و شەڕانی و توند و تیژ ناسراون، ترس و بیمیان خستۆتە نێو دڵ و هەناوی خەڵکەوە و خراپەیان لە زەویدا بڵاو کردۆتەوە و لە بەرامبەر سوڵتانەکانی دەوڵەتی (سلجوقی) ڕاوەستاونەتەوە و بە هۆیانەوە سەڵتەنەت و خیلافەت وێکڕا ڕاچڵەکاون، دوژمنایەتی توند و تیژی نێوان ئەوان و تێکڕای موسڵمانان سەیر نییە، چونکە دەزگایەکی تۆقێنەریان هەبووە کە لە ڕێکخراوێکی نهێنی و کۆمەڵە لاوێکی ئازای گیان فیدا و پاسەوانی بیروباوەڕی فیرقەکەیان پێکهاتبوو، ئەم گەنجە گیان لەسەر دەستانە هونەری خۆ مەلاسدان و خۆ حەشاردانیان چاک دەزانی، کارەکەیان لەگەڵ سروشتی بانگەوازی فیرقەکەیان واتە (ئیسماعیلی باتینی) دەهاتەوە کە بریتی بوو لە فیرقەیەکی نهێنی تەواو، بە جۆرێك کەم کەس دەیتوانی کەسێکی باتینی لە خەڵکانی تر جیا بکاتەوە، ئەندامانی ڕاهێنەری ئەم دەزگایە لاوانی تازە پێگەیشتوویان هەڵدەبژاردن و لەسەر کاری بەکارهێنانی چەك و تیراندازی و شێوازەکانی جەنگ و ڕێگەکانی ڕەشەکوژی و خوێنڕێژی ڕاهێنانیان پێ دەکردن،[٢] کاتێك حوکمڕانێکی بە توانا لە وڵاتانی ئیسلامی هاوسێدا پەیدا دەبوو، گیانفیداکانی ئەم دەزگایە (بە مەبەستی دەرباز بوون لە مەترسیەکانی) بەرنامەی ڕەشەکوژیان بۆ دادەڕشت و دەیانکوشتن.

یەکەمین ئامانجی ئەم کارەیان ترس و بیم خستنە نێو دڵ و دەروونی هەموو لایەك و بڵاو کردنەوەی فیتنە و ئاژاوە و پشێوی بوو لە نێو ڕیزی دوژمنانی مەزهەبەکەیان، چەندین کەسایەتی گەورە و هەڵکەوتووی دەوڵەتی (سلجوقی) بوونە قوربانی ئەم دەزگا سامناکە، تا کار بەوە گەیشت خەڵکانی چالاکی بواری سیاسی و فیکریان پێوە نەهێشت و بە دواڕۆژی خەفەتباری خۆیان گەیاند، گەورەترین وەزیری سلجوقی و مەزنترین کەسی عاقڵ و بیرمەندی ئەو دەوڵەتەیان کوشت کە خواجە (نیزامولمولك) بوو، ساڵی ٤٨٥ ك/ ١٠٩٢ز یەکێك لە گیان

---

١ المغول في التاريخ للصياد، ص: ٧٧ـ٧٨.
٢ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٥٣.

فیدایانی ئەم دەزگایە لەسەر شێوەی پیاوێکی سۆفی مەشرەب لێی هاتە پێشەوە و بە خەنجەرەکەی ورگی هەڵدڕی و بەسەر ڕووانیدا خست، (نیزامولمولك) یەکەمین کەسایەتی گەورەی جیهانی ئیسلامی بوو بوو بە قوربانی دەستی ئەم مەزەبە خوێن ڕێژە،[١] والی و حوکمڕانی موسڵمانان دژ بەدژی یەکتری کەسانی ئەم فیرقەیەیان دەسەلاتدار دەکرد تا لە دژی یەکتر بەکاریان بێنن، نموونەی ئەمە: کاتێك ململانێی نێوان خەلیفەکانی (عەبباسی) و سوڵتانەکانی (سلجوقی) بەرپا بوو، سوڵتان( مەسعود)ی سلجوقی بەوە تاوانبار دەکرا کە گوایە ئەو ئاماژەی داوەتە تاقمێکی فیدایی باتینی تا خەلیفە (المسترشد) لە کۆڵ بکەنەوە، ئەوە بوو لە ساڵی (٥٢٩ك/١١٣٤ز) کوشتیان و لووت و گوێیان بڕین و بە ڕووتی بەجێیان هێشتبوو،[٢] بە هەمان شێوە لە ساڵی (٥٣٢ك/١١٣٧ز) لە شاری ئیسفەهان خەلیفە (ڕاشید)ی کوڕیشیان کوشت، چونکە جەنگانی گەڵ خەلیفەکانی عەباسی ئامانجێك بوو لەگەڵ بیروباوەڕەکانیان دەهاتەوە، پێشداش (ئوغلمش)ی کاربەدەستی دەوڵەتی (خوارەزمی)یان لە عێراقی عەجەمدا بە ئامازەی خەلیفە (ناصر) ڕەشەکوژ کرد، ململانێی نێوان (ئیسماعیلی)و (خوارەزمی) زیانێکی گەورە و گرانی بۆ هەردووکلا لێکەوتەوە.[٣]

بە هەمان جۆر ئەم فیرقەیە تاوانگەلێکی زۆری دژی هەموو ئەو فیرقە ئیسلامیانە ئەنجامدا کە لە بیروباوەڕدا لەوان جودا بوون، ترس و تۆقاندنیان بڵاوکردەوە، هێندەیان زوڵمو زۆر ئەنجامدا تا کار بەوە گەیشت موسڵمانان ئاواتەخواز بوون لەنێوچن، بۆ پێکانی ئەم ئامانجەیان هانی (مەغۆل)یان دەدا و ڕێگەیان بۆ خۆش دەکرد تا هەڵبکوتێتە سەریان و لە نێویان بەرێت، (ابن طباطبا) دەڵێت (مەلیك ئیمامودین یەحیای کوڕی ئیفتیخاری) بۆی گێڕامەوە و گوتی لە یادمە کە لە (قەزوێن) بووین کاتێك ئێوارە دادەهات هەرچی کەل و پەلی ماڵمان هەبوو لە جلوبەرگ و قوماشو قاپ و قاچاغ و پێخەف دەمانبردە نێو هەورەبانی خانوو و دەمانشاردنەوە، ئەمە لە ترسی چەتە و شەوگەردی بێباوەڕەکان بوو، کە شەوانە ماڵە و ماڵی قەزوێن دەگەڕان، کە بەیانی دەبۆوە کەلوپەلەکانمان دەهێنایەوە دەرەوە، لەبەر ئەمە بوو قەزوێنیەکان چەقۆ و چەکیان زۆر هەڵدەگرت، ئەم بێباوەڕانە ئەمە پیشەیان بوو تا سەردەمی (شمس الدین ی قازی)، ئەو هات و ڕووی لە (قائان) نا و سەربازی ئامادە کردن و قەڵای بێباوەڕەکانی ڕووخاندن.[٤]

---

١ المصدر نفسه، ص: ٥٣.

٢ المصدر نفسه، ص: ٥٤.

٣ المصدر نفسه، ص: ٥٤. نقلا عن سيرة جلال الدين ص: ٥٥.

٤ الفخري في الآداب السلطانية والدولة الاسلامية، ص: ٢٥ـ٢٦.

(جورجانی) باس دەکات کە: (قازی شمس الدین ئەحمەد ئەلکافی قەزوینی) پەیوەندی بە (مەغۆل)ەوە دەکرد، ئەو ئیمامێکی زۆر مەزن بووە، جارێك چووە لای (مەنکۆخان) و داوای لێکرد سنوورێك بۆ ئەم بێباوەڕانە دابنێ و خەڵکی لە خراپەی ئەوانە ڕزگاریان بێت، لە کاتی قسەکانیدا – کە بە حەماسەتەوە و بە توندی وەك موسڵمانێکی دیندار و بە پەرۆشەوەو دەدوا – چەند وشەیەکی وشکی لە زار دەرچوون و (مەنکۆخان)یان تووڕە کرد، کاتێك (قازی شمس الدین) لاوازی و دەستەپاچەیی خستەپاڵ کاریگەرییەکی گەورە کەوتە دڵ و هەناوی (مەنکۆخان)، پێی گوت کە ئەو تا ئێستا نەیتوانیووە ڕەگ و ڕیشەی ئەم فیرقەیە دەربێنێت کە (مەزەبێك)یان بۆ خۆیان دیاری کردووە و پێچەوانەی هەموو ئاینەکانی (نەسارا و موسڵمانان و مەغۆلە)، ئەمەش تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوان (ئیسماعیلیەکان) بە ماڵ و سامان (مەنکۆخان)یان تەفرە داوە و سوودیان لە لاوازی دەوڵەتەکەی ئەو وەرگرتووە و لە چیاکان و قەڵایەکاندا شەوانە پارێز دێننە سەر موسڵمانەکان تا لە نێویان بەرن و شوێنەواریان نەهێڵن، پوختەی قسە ئەوەیە: (فیرقەی ئیسماعیلی) گەورەترین هۆکار بوون بۆ لاوازکردنی موسڵمانان و بانگەوازی ئیسلامی و بانگخوازان و زیادکردنی فیرقە لە نێویاندا و هەرەس پێهێنانیان بە شێوەیەك کە لە بەرامبەری (مەغۆل)دا خۆیان پێ نەگیرێت و بە ئاسانی لە کاتێکی گونجاودا وڵاتیان لێ داگیر بکرێت.[1]

### ٢ـ خیلافەتی عەبباسی:

پێش دەرکەوتنی مەترسی مەغۆل نیشانەکانی لاوازی و زەبوونی لە خیلافەتی عەبباسی دەرکەوتن، ڕەگی ئەم لاوازیە دەگەڕایەوە بۆ ئەو ساتە وەختانەی فارسەکان خزابوونە نێو دەوڵەتەوە و پلەی وەزارەتیان لە خیلافەتی عەبباسی بە دەست هێنابوو کێشەی لە نێو عەرەب و فارسدا دروست کردبوو، ئەم کارە سەری کێشا بۆ هاتنە ناوەوەی ڕەگەزی (تورك) بۆ نێو ناوەندی دەسەڵات، بەم شێوەیە سێ سەرەکی کێبەڕکێی گرتنە دەستی دەسەڵاتیان دەکرد لە بەغدا: عەرەب و فارس و تورك. هەموو ئەم کێبەڕکێیە وای کرد حوکمڕانەکانی (بەنی بوەیە) کە دەوڵەتەکەیان لە باشووری ڕۆژئاوای ئێران بوو چاو ببڕنە دەسەڵاتی بەغداو لە ئاکامدا بەسەر (خەلیفە)دا زاڵبوون، بوەیهیەکان سوڵتەیان کەوتە دەست و ناسناوی (سوڵتان)یان بە کارگێڕەکانی خۆیانەوە لکاند، دەسەڵاتیان لە زوور دەسەڵاتی

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٥٥.

خەلیفەوە بوو، دەیانتوانی بە ئاسانی خیلافەتی عەبباسی هەڵبوەشێننەوە، بەڵام لە ترسی جیهانی ئیسلامی سوننی ئەم هەنگاوەیان نەنا، چونکە ئەم دەوڵەتی (بوەیە) سەر بە فیرقەیەکی شیعە بوو، هەموو ئەمانە کاریگەریەکی گەورەیان خستە سەر هەیبەتی خیلافەتی عەبباسی و سەری کێشا بۆ ئەوە: والی ویلایەتەکان سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیەنن و تەنها بە ناو خۆیان بدەنە پاڵ خیلافەتی عەبباسی لە بەغدا، لێرەڕا پەیوەستە بە هێزەکانی نێوان خیلافەت و ویلایەتەکان پارچە پارچە بوون، فەسادی ئیداری لە نێو خیلافەتدا دروست بوو، سەربەخۆیی ویلایەتەکان وای کرد هەر ویلایەتە هەقی بەسەر خۆیەوە بێت و گوێ نەداتە دەوروبەری، هەر بۆیە دەوڵەتی (سلجوقی) تورك – کە سوننی مەزەب بوون – دەسەڵاتی بوەیهیەکانیان لە بەغدا و دەوروبەری ڕامالی و دەستیان بەسەر (بەغدا)دا گرت، لەگەڵ مانەوەی خیلافەت هەر بە ناو و هەیکەل – ئەم سلجوقیانە ناسناوی (سوڵتان)یان بە حوکمڕانەکانیانەوە لکاند، یەکەم وەجبەی حوکمڕانەکانیان بە (سوڵتانی موعەززەم) ناودەبران، (خەلیفە) لە کۆشکەکەی خۆیدا لە (بەغدا) بەبێ دەسەلاتی و داماوی پاڵی دابۆوە.

دەوڵەتی سلجوقی زەوی و زارەکانی لە نێوان سوڵتان و ئەمیرەکانی خۆیدا دابەش کرد، کاتێکیش سوڵتانە گەورەکانی سلجوقی هەرەسیان هێنا سەرووی فورات و باکووری شام و پاشان باشووریشی چەند دەوڵەتۆچکەیەك بوون کە هیچ کامێکیان لە شارێك بە دەوروبەرەکەیەوە تێپەڕی نەدەکرد، زەنگیەکان کاریان بۆ یەکخستنەوەی ئەم دەوڵەتانە کرد و لەگەڵ دەوڵەتی (فاتمی) لە میسر کەوتنە ململانێوە، هەرێمەکان لە حکومەتی ناوەندی بەغدا واتە خیلافەت جودا بوونەوە، خیلافەت لە بواری سەربازیدا داماو و دەستە پاچە بوو و نەیدەتوانی ڕووبەڕووی هیچ هێرشێکی سەربازی ببێتەوە، مەترسی هێرشی مەغۆلیش مەترسیەکی ئاسایی نەبوو.[1] ئەمە حاڵ و وەزعی خیلافەت بوو پێش هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، هەموو ئەمانەی گوتران نەدەبوونە ڕێگر لە بەرامبەر دەرکەوتنی خەلیفەیەکی بەهێز و بە دەسەڵات و لە ڕێی سوود وەرگرتن لە هەندێك بارودۆخی ڕەخساو تەکانی بە خۆ دابایە و هەندێك چاکسازی ئونجام دابایە، بەڵام ئەم هات و هاوارانە زیاتر بە داد و فوغان و ناڵەناڵی بێ هۆشیەکانی سەرەمەرگ دەچوون.[2]

---

١ المغول والأوروبيون وقضية القدس ص: ١٨.

٢ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٥.

خەلیفە موستەتەسەم (٦٤٠ــ٦٥٦ك/ ١٢٤٢ــ١٢٥٨ز)ی دواهەمین خەلیفەی عەباسی ئەمەی لە تواناادا نەبوو، چونکە ئەو پیاوێکی لاواز بوو و خەڵکانێکی خراپ و هەلپەرستی لە دەورە بوون و، نە خۆی نە ئەوان نەیاندەتوانی بەر بەم مەترسیە سامناکە بگرن.[١]

**٣ـ ئەییوبیەکان لە میسر و شامدا:**

پاش وەفاتی صلاح الدین لە ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣ز) مەملەکەتەکەی لێکهەڵوەشا و بەو ئیعتیبارەی ئەم مەملەکەتە میراتی تایبەتی بنەماڵەکەیەتی لە نێوان ڕۆڵەکانی بنەماڵەی ئەییوبی دابەش کرا و کرایە (١٥) بەش، بە پێی ئەو جەنگانەی خۆبەخۆ دەیانکردن یان لەگەڵ دوژمن دەیانکردن مەملەکەتەکان زۆر دەبوو یان کەم دەبوو، هێندەی نەخایاند هۆکارەکانی ناکۆکی و بەش بەشی نێو بنەماڵە کاڵ بۆوە و کەسایەتیەکی وەك (مەلیك عادل) ئەم هەلەی قۆزتەوە و هەوڵیدا ئەم پەرتەوازەییە لە ژێر باڵی فەرمانی خۆیدا کۆبکاتەوە، بۆیە بەبێ دوو دڵی بڕیاریدا دەسەلاتی خۆی بەسەر میسردا بسەپێنێت و خستیەوە سەر مەملەکەتەکەی شامی ئەییوبی، ئەمەو (٧) ساڵ بەسەر وەفاتی (صلاح الدین)دا تێنەپەڕی بوو (مەلیك عادل) توانی زۆربەی ڕۆڵەکانی بنەماڵەی ئەییوبی یەك بخاتەوە، ئەو گوتبووی: شتێکی ناحەزە بە لامەوە منداڵێك لەگەڵ پیرێك یەکسان بکەم، سەڵتەنەت بە میرات نیە بەڵکو بۆ ئەو کەسەیە زاڵە،[٢] لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا (مەلیك عادل) نەیتوانی بەسەر هەموو ئەو مەملەکەتەدا بالادەست بێ کە صلاح الدین لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو، بەڵکو بەردەوام ئەم دەوڵەتە بۆ (٧) بەش دابەش ببوو، زۆربەیان سەربەخۆ بوون و پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە (میسر)ەوە نەبوو، ئەوانی تریش تەنها بە ناو فەرمانبەرداری ــ دەوڵەتەکەی (مەلیك عادل)ـ بوون، هەر کاتێك دوو لایەنیان شەڕ و تێکهەڵچوون لە نێوانیاندا ڕووی دابایە ئەوا یەکیان پشتی بە لایەنێکی تر واتە دوژمنی سێهەم دەبەست بۆ لێدانی بەرامبەرەکەی، بەڵکو کار بەوە دەگەیشت هەندێکیان پشتیان بە خاچپەرستەکان دەبەست لە دژی خزمە نزیکەکەی خۆی لە بنەماڵەی ئەییوبی،[٣] وێڕای ئەمە وڵاتی شام لە حاڵەتی دابەشبوون و دابڕبوون و ڕق و کینە و بوغز و غەرەزێکی وادابوو کە نە ئێران و نە خۆراسان و نە عێراق بەم شێوەیە نەبوو، زیاد لەمەش ئەم وڵاتە ــ واتە شام ــ بۆ ماوەی یەك سەدە هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی خاچپەرستانی کرایە سەر و هێندەی بەرەنگاری کرد تا

---

١ المغول والأوروبيون والصليبيون، ص: ١٨.

٢ السلوك لمعرفة السلوك ١/١٥٥.

٣ العالم الاسلامي والغزو الصليبي، ص: ٦١.

شپرزە و لاواز بوو، بۆیە کاتێك (مەغۆل) هێرشە وێرانکاریەکەی بۆ سەر وڵاتانی ئیسلامی دەست پێکرد، شتێکی ئاسایی و سروشتی بوو حوکمڕانی ئەم ناوچانە —ی شام— لە یارمەتیدانی برایانی ڕۆژهەڵاتیاندا دەستەپاچە بوەستن، هەموو ئەوەی کردیان لە ئەنجامی ئەوەدا بوو بە گرنگی پێدان چاوەڕێی دەرەنجامی جەنگەکەیان نەدەکرد و پێشبینی ئەو ئەنجامە تاڵەیان نەدەکرد کە لێی دەکەوێتەوە.[1]

هەروەك سلجوقیە ڕۆمیە موسڵمانەکان بەردەوام بەرهەڵستی دەوڵەتی بێزەنتی و پاشانیش هێرشی خاچپەرستانیان دەکرد، سلجوقیەکان یەکەمین هێزی ئیسلامی بوون بەرەنگاری هێرشی یەکەمی خاچپەرستان بوونەوە، هەروەك حوکمڕانانی ئەم دەوڵەتە بەردەوام لەگەڵ خەڵکانی غەیری خۆیان لە سوڵتانە موسڵمانەکان لە کێشەدا بوون، بەم تەماشا خێرایە دەگونجێ چاوەڕێی ڕوودانی جەنگی داهاتوو بکەین کە لە نێوان موسڵمانان لە لایەك و هۆز و تیرە مەغۆلیەکان لە لایەکی ترەوە ڕوودەدات،[2] کێ حەز دەکا زیاتر بچێتە قوڵایی ئەم بابەتەوە با تەماشای ئەم کتێبەی من (دولة السلاجقة وعصر الدولة الزنكية و صلاح الدين والحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة) بکات.

**٤ـ بڵاو بوونەوەی تاوانە گەورەکان لە نێو جیهانی ئیسلامیدا:**

خودای بەرز و مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦﴾ (الإسراء: ١٦). لەو تاوانە گەورانەی لەو سەردەمەدا بڵاو ببوونەوە ئەمانە بوون:

أـ مەی (خمر): خودای بەرز و مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١﴾ (المائدة: ٩٠ـ٩١). — هاوەڵان — گوتیان: ئەی پەروەردگار وازمان هێنا، هەر کەسێك مەی لەلا بوو هێنایە دەر لە ماڵ و ڕشتی و لە کۆڵانەکانی (مەدینە)دا جۆگەلەی بەست،[3] مەی خواردنەوە لە نێو ئەمیر و وەزیر و گەورە پیاوانی دەوڵەت و هەندێك خەڵکی عەوامدا بڵاو

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٦١.

٢ المصدر نفسه، ص: ٦٢.

٣ تفسير ابن كثير لسورة المائدة، الآية ٩٠ـ٩١.

ببۆوە، ئەوانەی لە نێو باڕ و مەیخانەکاندا کاریان دەکرد چ ژن چ پیاو خەڵکانی ناموسڵمان بوون، بەڵکو سەرپەرشتیارەکانیان جوولەکە و مەسیحی بوون، ئەمان پێداگیریان دەکرد ئەم ئافەت و بەڵایە لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا تەشەنە بکات، هەوڵی بڵاو کردنەوەی ئەو شیعرو هۆنراوانەیان دەدا کە زیاتر ئاوازدارن و گۆرانی بە بەژن و باڵا و جوانی و ئەندامە هەست بزوێنەکانی ئافرەت هەڵدەڵێن و گەنجان بە لایاندا کەمەندکێش دەکەن و فێری دڵداری و هەوەسبازیان دەکەن و مەی و شەرابیان لە لا خۆشەویست دەکەن، چونکە دەیانزانی بەم کارەیان لاوانی موسڵمان لەسەر ڕاستەهێڵ لادەبەن و پاڵیان پێوە دەنێن بۆ تێرکردنی هەردووک غەریزەی سك و داوێن و بیر و زەینیان، لە چوارچێوەی ئەمەدا کورت پێ هەڵدێنن‌و بەم شێوە و بە ئاسانترین ڕێگا کۆتایی بە موسڵمانان دێنن و کۆمەڵگاکەیان لە نێو خۆدا دادەتەپێنن، باڕەکان پڕ بوون لە کەنیزەکی چاوبازی سەرنجڕاکێش، کە زۆربەیان بیانی بوون و لە ڕەگەزی هەمەڕەنگ بوون، شاعیران و لاوان بۆ لایان دەهاتن، ئەوانیش زۆر بەبێ شەرمی و بێ ڕێزیەوە بەبێ پەردە خۆیان بۆ ئەوان شاعیران و لاوانە ڕەدەنواند، هەموو ئەو هونەرانەیان بەکاردێنان کە سەرنجی لاوان و جحێڵانیان پێ ڕادەکێشرێت، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ عاشقیان زۆر دەکردن، زۆر شت لە دەورەیان ئامادە کرابوو تا بەم شێوازەی تاوانەیان ڕەفتار بکەن، ئەم کەنیزەکانە ببوونە هۆکار بۆ پەیدابوونی زۆرێك لە تاوان و خراپە.[1]

هەروەها لە پێناو بنبڕکردنی بانگەوازی ئیسلامی و شکاندنی ئیسلام لە دڵ و دەروونی موسڵماناندا هەندێك لە مەسیحیەکان دێرەکانی خۆیان دەکردە خانەی گاڵتەو گەپ و هۆسەو فیکە کێشان، ئەوەی زیاتر یارمەتی ئەم کارەی دەدا: ئەوە بوو کە مەی ئامادە لەو دێرانەدا دانرابوو و پێشکەشی میوانەکانیان دەکرد، ئەم دێرە کەنیسانە لە دەورەوبەری بەغدا و سامەڕا و سەرتاسەری وڵاتانی ئیسلامدا بڵاو ببوونەوە، شاعیران و گەنجان زیاتر بۆ مەی بەلاش و هەلهەلە و چەقەنەکێشان بە لێشاو ڕوویان تێ دەکردن، زۆریان شیعر و گۆرانی بەم دێرانەدا هەڵدەگوت وەك (جام و کاسە و پەرداخی مەی، مەیگێڕەکان‌و ڕاهیبە نێر و مێینەکان) هەروەها تا کار بەوە گەیشتووە چەندین کتێب لەم بارەوە بنووسرێت و بڵاوبکرێتەوە، وەك کتێبی (الدیارات) کە (شباشتی) نووسیویەتی و پڕی کردووە لە شیعرەکانی (ابن المعتز) و چەند شاعیرێکی تر، هەر دێرێك ئاهەنگ و جەژنێکی سازدەدا و

---
[1] العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٦٩.

خەڵك بەم بۆنەوە ڕوویان تێدەکرد، ئەم دێرانە جەژنەکانی مەسیحیان بەکاردێنا بۆ بانگەشەی گەنجانی موسڵمان تا بە سێنایی تاوانە گەورەکان ئەنجام بدەن، یەکێك لەو جەژنانە جەژنی (زایینی — میلاد) بوو، زۆریان مۆم و ئاگر تێدا دادەگیرساند و پێیان دەگوت جەژنی (شعانین) یان جەژنی (زیتونة)، هەروەها لە مانگی (ئۆکتۆبەر)ی هەموو ساڵێکدا و لە گوندی (قوترەبول) کە دەکەوێتە باکووری بەغدا جەژنێکیان لە دێرەکەی ئەو گوندەدا بۆ قدیسە (ئەشمۆنی) ساز دەدا، کە زیاتر بە باڕ و مەیخانە دەچوو، خەڵك لە بەغدا و سامەڕاوە لە ڕێی وشکانیەوە بە سواری وڵاخ و، لە ڕێی دەریایشەوە لە ڕووباری دیجلەوە بە کەشتی بەرەو ئەو جەژنە دەڕۆیشتن، جل و بەرگی هەمەڕەنگیان دەپۆشیو شانازی و فیزیان بەسەر یەکتردا لێدەدا، لە دەوروبەری گۆماو و دێر و باڕەکان و گۆشە و کەنارەکانی ئەم گوندە خێوەت و ڕەشماڵیان هەڵدەدا، گۆرانی بێژو زوڕناژەنەکان دەیانکرد بە هەرا، خەڵکەکەش جامی مەیان بەسەردا دەکرد، شێوەی ئەم جەژنە لە جەژنی (زەندۆرد)ی بەشی ڕۆژهەڵاتی بەغداش ئەنجام دەدرا،[1] لەگەڵ جەژنی مەسیحیەکان کە ئاهەنگی ئابڕووبەرانەو بێ شەرمانەیان تێدا دەگێڕدرا فارسەکانیش فێر بوون جەژنە کۆنینەکانی خۆیان زیندوو بکەنەوە، بەم بۆنانەوە جەژنیان دەگێڕا و مەیان تێدا دەخواردەوە و جۆرە خواردنی وایان تێدا دەخوارد کە بە خەیاڵدا نەدەهات،[2] لە ڕیزی ئەو جەژنە فارسیانە: جەژنی (نەورۆز) لە یەکەم ڕۆژی بەهاردا و جەژنی (میهرەجان = یەڵدا) لە یەکەم شەوی زستاندا، گومانی تێدا نیە ئەوەی باسمان کرد بەرنامەیەکی ئامادەکراو بوو بۆ بڵاو کردنەوەی بێ شەرمی و ڕووتو قوتی لە شارەکانی بەغدا و سامەڕا و تێکڕای شارەکانی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، مەی زۆرو زەوەند بوو و شارەکانی لێ پڕکرابوون و کچە گۆرانی بێژە خۆ پێشکەشکەرەکانیشی لەگەڵ بوون و شیعر و هۆنراوەی واش بڵاو دەکرانەوە کە ڕێك باسی لەش و لار و شوێنە هەست بزوێنەکانی ئافرەتی دەکرد و سەرەنجی لاوانیان بۆ لای هەوەسبازی و تێرکردنی غەریزەی جنسی ڕادەکێشا و، لە ئامانجە سەرەکیەکانیان دوور دەخستنەوە کە بریتی بوون لە واجبی گەیاندن و گەشەپێدانی بانگەوازی ئیسلامی و تێکشکاندنی هەموو ئەو کۆسپانەی کە لە ڕێی ئەم بانگەوازە قیت بوونەوە کە بە پۆل و چینی گەنج و لاوان نەبێ ئەم کارە ئەستەمە بکرێت، فإنا لله وإنا اليه راجعون.[3]

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٦٩.
٢ تاريخ الادب العربي في العصر العباسي الثاني، د. شوقي، ص: ٩٥.
٣ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٠.

ب ـ کەنیزەك و ژن: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ان الدنيا حلوة خضرة وان الله مستخلفكم فيها، فينظر كيف تعلمون، فاتقوا الدنيا والتقوا النساء، فان اول فتنة بني إسرائيل كانت في النساء).[1]

واتە: دنیا شیرین و سەوزە، خودا لە دنیادا کردوونی بە جێ نشین، تەماشا دەکا چۆن ڕەفتار دەکەن، جا خۆ لە دنیا بپارێزن و خۆ لە ژن بپارێزن: چونکە یەکەم ئاژاوەی بەنی ئیسرائیل لەسەر ژن هەڵایسا.

کۆیلە لە کۆمەڵگادا زۆر بوون، لە هەموو شوێنێك هەبوون: لە کۆشکەکان، لە کارگەکان، لە مەزراکان، هەموو جۆرێکیان تێدا بوو: (زنجی، ئەفریقی، حەبەشی، تورکی، سەقەلی، چینی، خۆراسانی، ئەرمەنی، بەربەری)، کۆمەڵگای ئیسلامی لەو سەردەمەدا هەموو ڕەگەز و نەتەوەکانی لە خۆ گرتبوو، موسڵمانان شوێن پێی گەلانی تریان هەڵدەگرت، بەشداری کڕین و فرۆشتنی کۆیلەیان لەگەڵ دەکردن و لەم بابەتەدا لە سنووری شەرعیان تێپەڕاندبوو، لە هەر شارێکی گەورەدا بازاڕێکی تایبەتی یان بۆ بازرگانی کردنی کۆیلەکان دروست کردبوو، چاودێرێکیان لەسەر دامەزراندبوو پێی دەگوترا (قيم الرقيق) واتە هەڵسەنگێنەری کۆیلە، یان نرخ دانەری کۆیلە،[2] هەروەها لەگەڵ ئەوە کە شەریعەتی ئیسلامی خەساندنی ـ مرۆڤی ـ حەرام کردووە، بەڵام خەساندن زۆر بە خێرایی و لەو سەردەمەدا لە نێو جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بۆوە، کۆیلەکان لە دەوروبەری سنووری جیهانی ئیسلامی دەخەسێنران ئینجا دەیانهێنانە ئەم دیو سنوورەوە و بەرەو بازاڕی کۆیلەکانیان دێنان لە بەغدا و شارەکانی تردا، بە بەراورد لەگەڵ ئەمە ژمارەی کەنیزەکەکان لە ماڵەکان و کۆشك و باڵەخانەکاندا زۆر زۆرتر بوون لە کۆیلە خەسیوەکان، زۆربەی پیاوان ئەم کەنیزەکانەیان بەسەر ئەو کچە ئازادانەدا هەڵدەبژارد کە دەیانویست مارەیان بکەن و بەڵام نیاندەناسین، چونکە ئەم کەنیزەکانە لە بازاڕدا و لە ماڵی کۆیلە فرۆشەکاندا ڕادەنوێنرێن و بە ئارەزووی خۆیان تەماشایان دەکەن و لێیان خورد دەبنەوە، بۆیە بە ئەندازەی کەوتنە بەر دڵ و چاو هەڵیان دەبژاردن، لەبەر ئەمە ئەگەر هاوسەرگیریان دەکرد تەنها یەك ژنی ئازادیان دەخواست و بۆ فرەژنی پشتیان بە کڕینی ئەم کەنیزەکانە دەبەست، کڕینی کەنیزەك و هاوسەرگیری لەگەڵیاندا لە خەلیفەکان و ئەمیرەکانەوە دەستی پێکرد و خەڵکانی تریش بە پرتاو شوێنیان

---

[1] مختصر صحيح مسلم، للحافظ المنذري ٢/٣١٠.

[2] تاريخ الادب العربي في العصر العباسي الثاني.

کەوتن و لاسایان دەکردنەوە، بەڵکو دایکی ژمارەیەك خەلیفە کەنیزەك بوون،[1] بە تایبەتی کەنیزەکی تورك و ڕۆمی، ئەمانە خۆیان لە کاروباری حوکمڕانی هەڵدەقورتاند،[2] بە بەردەوام بەیانیان و ئێواران خەڵك دەچوونە بازاڕی کۆیلەکان، دەرگای ماڵی کۆیلە فرۆشان بە بەردەوام لەسەر پشت بوو بۆ پێشوازی کردنی تەماشاچی و کڕیاری کەنیزە شۆخ و شەنگە تازە گەیشتووەکان، ئەم کڕیارانە زۆربەیان دیاری و بەرتیلیان پێ بوو بۆ کەنیزەك و دەڵاڵەکانیان، بۆیە بەمە ئەرکی سەرشانی کڕیاران قورستر دەبوو، کەنیزەکەکان خۆشەویستی زیاتری خۆیان بۆ ئەم جۆرە تەماشاچیانە دەردەخست، ئەگەردەشرۆیشتن خەمباری و پەرۆشی خۆیان بۆ دەردەبڕین، جار هەبوو کەنیزەکەکە بە یەکپارچە کەزی مووی سەری یان پارچە پەڕۆیەکی بەرگی بەری خۆشەویستی خۆی لەگەڵ تەماشاچی دەگۆڕییەوە،[3] زۆر جاریش کۆیلەفرۆش و دەڵاڵەکان لەبەر دەستکەوتنی ماڵ و دیاری و بەرتیل لە هەندێك خەڵکی تەماشاچی بێ ئاگادەبوون کە بۆ گاڵتە و ڕابواردن دەستیان بۆ کەنیزەکەکان درێژ دەکرد، بە تایبەتی ئەگەر خودی کەنیزەکەکان بەمە ڕازی بوونایە.[4]

ج ـ بڵاو بوونەوەی گۆرانی و مۆسیقا:

کەنیزەکەکان لەم کەش و هەوا پڕ لە گۆرانی و مۆسیقا و شیعر و ئاوازەدا کاریگەری گەورەیان دانا لەسەر بڵاوبوونەوەی ڕووت و قوتی و لێك هەڵوەشاندنی ڕەوشتی گەنجەکان و زۆر لە پیرەکان و شاعیرە مەست و سەرخۆشەکان، بە شێوەیەك دڵ و دەروون و مێشك و زەینیان بە گۆرانی و مۆسیقا پڕ کرابوو کە جگە لە گەڕان بە دوای تێرکردنی غەریزە جنسیەکانیان بیر لە هیچ شتێکی تر نەکەنەوە، هەروەك لە سەردەمی خیلافەتی دووەمی عەبباسیدا هەتیوبازی و شیعر هەڵگوتن بە کوڕانی لوسکەڵە و بەکارهێنانیان لە جیاتی کچان لە کاری جنسیدا ببوە شتێکی باو، ئەم تاوانە گەورانە پێشەکی لە نێو سەرکردەکانی سوپاو سوڵتانەکاندا بڵاوببوونەوە، یەکێکیان دەربارەی هەتیوەکەی دەڵێ:

لە دەستدانی ئەم هەتیوەم زۆر لە لا دژوارترە لە لەدەستدانی بەغدا بەڵکو سەرتاپا خاکی عێراق،[5] یەکێکی تریش بەبێ ئەوەی خەجاڵەت بێت و شەرم دایگرێت منداڵی بێ موو و

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٣.

٢ المصدر نفسه، ص: ٧٣.

٣ المصدر نفسه، ص: ٧٤.

٤ المصدر نفسه، ص: ٧٤.

٥ البداية والنهاية ١١/٢٩١، العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٥.

کۆسەی ماچ دەکردن،[١] ئاهەنگ و شەوە ڕەشە بۆ گۆرانی و مۆسیقا و ڕەقس و سەما سازدەکران، کاتێك مەلیك و سوڵتانەکان گەرم دادەهاتن بەخشش و شاباشی وایان پێشکەش دەکرد کە بە خەیاڵدا نەدەهات،[٢] کار بەوە گەیشتبوو دەلاڵ و گەووادو قەحپە و ژنە دامێن فرۆشەکان ماڵەکانیان لە بەغدا و شارەکانی تردا دیار بوون و خەڵکی داوێن پیس سەردانیان دەکردن و پارە و سامان و کات و تەمەنی خۆیان تێدا دەکوشت، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئاین و لە دەسەڵاتیش بترسن! بۆ وانەبێ کە لە کاتێکدا خەڵکان لەسەر ڕێ و ڕەوشتی شاکانیانن،[٣] ئەم داوێن پیسیە بەس لەسەر کەنیزەك و هەتیوان کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو زۆرجار کچ و ژنە ئازادەکانیشی دەگرتەوە، پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: (عفوا نساء الناس تعف نساؤکم = ژنانی خەڵکی بپارێزن ژنەکانتان دەپارێزرێن)، دواهەمین خەلیفەی عەبباسی زۆرینەی کاتەکانی بە گوێگرتن لە گۆرانی بەسەر دەبرد، دەڵێن: نامەیەکی بۆ سوڵتان (بدرالدین لؤلؤ)ی موسڵ نوسیبوو داوای لێ کردبوو تیپێکی باشی گۆرانی بێژ و مۆسیقاژەنی بۆ بنێرێت، لە هەمان کاتدا نوێنەری (هۆلاکۆ)ش دەگاتە لای سوڵتان (بدرالدین)و داوای لێدەکات مەنجەنیق و ئامێرەکانی گەمارۆدانی بۆ بنێرێت، (بدرالدین) گوتی: تەماشای ئەم دوو داواکاریە بکەن، ئینجا تێر بۆ ئیسلام و ئەهلەکەی بگرین.[٤]

ئەمەی تا ئێستا گوتمان ئەم واتایە نادا بە دەستەوە کە: کۆمەڵگای ئیسلامی هەمووی بە تەواوەتی بۆ کۆمەڵگەیەکی خراپ گۆڕابێت و لە ئیسلامەکەی دوور کەوتبێتەوە، بەڵکو کۆمەڵگا: کۆمەڵگایەکی ئیسلامی ڕەسەن بوو، چینی گشتی و عەوام — کە زۆرینەیان پێك دەهێنا — دەستی بە ئیسلامەوە گرتبوو و فەرز و سوننەتەکانی و دروشمەکانی دینی بە تەواوەتی جێبەجێ دەکردن، ئەم چینە خۆشگوزەرانی، مەستانە و سەرخۆشانە و بەدڕەوشتانەی نەدەناسی، بەڵکو تەنگدەستی و بەشمەینەتی و هەژاری بەشی ئەو بوو، زۆر لە چینی سەرووی خۆیان — واتە سەرخۆش و داوێن پیسەکان — تووڕە بوون، ئەم چینی عەوامە باوەڕدار بوون و مزگەوتەکانیان ئاوەدان دەکردنەوە، بانگخوازانی ڕێگای خودا بەردەوام خودا و ڕۆژی دواییان بەبیر خەڵکی دێنایەوە، دەیانگوت کە ڕۆژێك دێت هەموو خەڵك لە بەرامبەر خودا ڕادەنوێنرێن و حەشر و حیسابیان لەگەڵ دەکرێت ئیمانداران و

---

١ البداية والنهاية ٢٩١/١١، العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٥.
٢ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٥.
٣ المصدر نفسه، ص: ٧٥، نقلا عن البداية والنهاية.
٤ الفخري في الآداب السلطانية، ص: ٢٩٠، العالم الاسلامي للخالدي، ص: ٧٦.

چاکەکاران بەرەو بەهەشت دەچن و بێباوەڕان و تاوانبارانیش بەرەو دۆزەخ دەچن، لەم سەردەمەدا چینێکی زاهید و دنیا نەویست دروست بوون، خۆیان دوورەپەرێز گرتبوو و بە ژیانی کولە مەرگی و هەژاری و تەنگدەستی خۆیان ڕاهێنابوو و بە توندی خودا پەرستیان دەکرد، هەرچەندە ناکرێت بڵێین کە چینی گشتی و عەوام خراپەی هەر تێنەکەوتبوو، بەڵام چینە خۆشگوزەرانە خراپەکە سەرکردایەتی ئوممەتی دەکرد و بۆ گەیشتن بە هەوەس و مەرامەکانی خۆی بڵاودەکردەوە جەنگی ڕەوشت و ئاکارجوانی دەکردو بەدڕەوشتی و ئاکارپیسی، ئینجا چینی (سەربان) دەستی بەسەر کاروباری خەڵکیدا گرت و بە مەبەستی گەیشتن بە حوکمڕانی و فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵات، بۆ شەڕی خۆبەخۆ و براکوژی پێشیان کەوت، ئەم هەڵسوکەوتە گەمژانە هێندەی تریان ئوممەتی ئیسلامی لاواز و گەندەڵ کرد و ماڵی ئوممەت لە لاوازیدا بوو بە ماڵی جاڵجاڵۆکە، لە لایەن دوژمنەکانی دەوروبەرەوە کە بۆی لە بۆسەدا بوون هێرشی کرایە سەر و لە ژێر کاریگەری لێدانی ئەواندا بە ئاسانی هەرەسی هێنا،[١] لەمەولا بە ئیزنی خودا لە لاپەڕەکانی داهاتوودا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم بابەتە.

---

١ العالم الاسلامي والغزو المغولي، ص: ٧٦.

## باسی دووەم: دەرکەوتنی جەنگیزخان لەسەر شانۆی ڕووداوەکان:

### یەکەم: پێگەیشتن و پەروەردەکرانی:

بە پێی گێڕانەوەی زۆربەی مێژوونووسان:

(جەنگیزخان) لە ساڵی (١١٥٥زایینی) لە نزیك ڕووباری (ئۆتۆن) لە دایك بووە، بە پێی هەندێك گێڕانەوەی تر لە ساڵی (١١٦٧ی زایینی) لە دایك بووە،(یەسۆکای)ی باوکی لە کاتی لە دایك بوونیدا لە ماڵ نەبوو، بەڵکو لە شەڕی تەتەرەکان بوو، لەو شەڕەدا (تیمۆجین)ی گەورە سەرکردەی تەتەرەکانی کوشت و بە سەرکەوتوویی بەرەو ماڵ گەڕایەوە، تەماشای کرد (یولۆن)ی هاوسەری زاوە و کوڕێکی بووە، کاتێك لەشی منداڵە ساوایەکەی پشکنی پێی وابوو پارچە گۆشتێکی بەستراوی لە شێوەی بەردێکی سوور لە نێو لەپەدەستیدا بینیووە، (یۆسۆکا)ی سەرۆکی مەغۆل کە باوەڕی بە ئەفسانە هەبوو پێی وابوو ئەم ڕووداوە نیشانەیە بۆ ئەو سەرکەوتنەی بەسەر سەرۆکی تەتەرەکانیدا هێناوە: لەبەر ئەمە بۆ زیندوو ڕاگرتنی ئەم سەرکەوتنەی کوڕە ساواکەی بە ناوی ئەو سەرکردەوە کرد، کاتێك (تیمۆجین) تەمەنی بوو بە (٩) ساڵ (یەسۆکای) باوکی لەگەڵ خۆی برد بۆ ماڵە خاڵەکانی، لە ڕێی ئەم گەشتەدا چاویان بە سەرۆك هۆزی (قنقراد) کەوت کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی (مەغۆل)، ئەم سەرۆك هۆزە پێشبینی ئایندەیەکی بەهرەداری بۆ (تیمۆجین) خستەڕوو، بۆیە پێداگیر بوو لەسەر ئەوە (بۆرتە)ی کچی بکاتە هاوسەری، کە ئەویش تەمەنی نەدەگەیشتە (١٠) ساڵ، (یەسۆکای) دوای گەیشتنەوەی هێندەی پێنەچوو لە ساڵی ١١٧٦ی زایینیدا مرد، پڕوپاگەندە بە وڵاتدا بڵاوبۆوە کە گوایە تەتەرەکان ژەهرخواردوویان کردووە.[١]

#### ١ـ خەباتی دایکی جەنگیزخان:

دوای مردنی (یەسۆکای) گوزەرانی خێزانەکەی واتە منداڵەکانی و (یۆلۆن)ی بێوەژن بەرەو خراپی چوو، وەك زانراوە (یەسۆکای) لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیدا لەگەڵ سەرکردایەتی کردنی (قیات)ی هۆزەکەی خۆیدا توانی چەند هۆزێکی تریش بخاتە ژێر چەتری حوکمڕانی خۆیەوە، دوای مردنی هێندەی نەخایاند کینە و حەسادەتی دوژمنەکانی لە دژی — خانەوادەکەی— سەریان هەڵدایەوە، لە نێو ئەم هۆزانەدا هۆزی (تایجۆت) سەرسەختترین دوژمنی (یەسۆکای) و هۆز و بنەماڵەکەی بوون، کاتێك (یەسۆکای) مرد سەرۆکایەتی (تیمۆجین)ی کوڕیان ڕەت کردەوە و گوتیان: قووڵترین بیرە ئاو تووشی وشك بوون دەبێت و پتەوترین گاشەبەردیش تووشی شکان دەبێت، کەواتە بۆ بە تۆوە پەیوەست بین؟!

---

١ المغول للعريني، ص:٤٤.

بێوەژنەکەی (یەسۆکای) دەبوایە بۆ ژیاندنی منداڵەکانی کە هەرە گەورەکەیان ئەو کاتە بچووك بوو بۆ پەیداکردنی بژێوی زەروری بگەڕێت، دەگەڕا بەروبوومی دار و درەختی دەچنین و بەروبوومی گژوگیایەك لە زەویدا سەوز دەبوو بۆی هەڵدەکەندن، بەلام ئەم خانەوادە ئەو وەسفانەی هۆزەکەیان پێیانەوە بە ناوبانگ بوون لە گەرم و گوڕی هێز و چالاکی و دان بە خۆداگرتن لەسەر ناگوزوریەکان و موسیبەتەکان، نائومێدی نەچووە نێو دڵو دەروونی هیچ کامێك لە ئەندامەکانی کە تا ئەو کاتە زۆربەی ڕۆڵەکانی یەسۆکای کەم تەمەن بوون، منداڵەکانی دەچوونە سەر رووباری (ئەنون) و ڕاوی گیانلەبەرە ئاویەکانیان دەکرد و خواردنی ڕۆژانەیان پەیدا دەکرد، (یۆلۆن)ی بێوەژن زۆر پێداگری دەکرد پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزانەکەی بە توند و تۆڵی بمێنێتەوە، کاتێك کێشە و ناخۆشی لە نێوان کوڕەکانی یەسۆکای باب براکان لە لایەك و داك و باب برا لە لایەکی ترەوە سەری هەڵدا سەری کێشا بۆ کوژرانی (بەکتار)ی کوڕی (یەسۆکای) کە لە ژنێکی تری بوو، (یۆلۆن) بە رووی (تیمۆجین و قەسار)ی کوڕی دا هەڵتەقیەوە و پێی گوتن: ئەی پیاوکوژینە! ئەی (تیمۆجین) کە تۆ لە دایك بووی تۆ کوتە گۆشتێکی بەستراوت لە دەست گرتبوو، ئێوە تەنها وەك ئەو پڵەنگەن کە نێچیرەکەی دادڕدادڕ دەکات، وەك شێری تووڕەتان لێهاتووە، تەنها وەك ئەو بازە وان کە خۆی بە حەوزا هەڵواسیووە و لەسەر سێبەرەکەی هەڵدەنیشێتەوە، وەك حوشترتان لێ هاتووە کە لە کاتی تووڕەبوونی بەچکەکانی بە ددانەکانی خۆی دەگەزێ، وەك ئەو گورگەتان لێ هاتووە کە لە گەردەلوولی تاریکاییدا و چەنگ بە خوێن پڕ دەداتە نێچیرەکەی، دوای ئەمە و ئێستا، جگە لە نیسێیەکانی خۆمان کەسمان بە دەستەوە نەماوە، ئەو نەهامەتیەی تووشمان بووە بە دەستی هۆزی (تایجۆت) قابیلی قبووڵ نیە، دەبێت تۆڵەیان لێ بسێنینەوە، (تیمۆجین) و دایکی و براکانی هێرشگەلێکی زۆریان لە لایەن هۆزی (تایجۆت)ەوە کرایە سەر، تەنگیان پێ هەڵچنرا و بەخۆ و سەربازگەکەیانەوە بەرەو شاخی (بروقان کالدون)، تا چیای (کتای) بەڕێکەوتن، ئەم چیایە بە باوەڕی ئەوان خاوەنی پیرۆزی خۆیەتی، بە بیروباوەڕی (تیمۆجین) ئەم چیایە ئەوی لە دەستی دوژمنانی پاراستووە،[1] هەژاری و تەنگ دەستی لە (تیمۆجین) و برایەکانی دانەبڕا، ئەوەی هەیان بوو لە (٩) ئەسپی تێپەڕ نەدەکرد، هێرش بەران لە یەك هەڵمەتدا (٨) ئەسپیان لێ گرتن و تەنها دانە ئەسپێکیان بۆ مایەوە.[2]

---

١ المصدر نفسه، ص: ٤٥.

٢ المصدر نفسه، ص: ٤٦.

**٢ـ (تیمۆجین) دزەکان دەردەکات:**

تیمۆجین سوور بوو لەسەر دەرکردنی چەتەکان لە ناوچەکەدا، هەرگەڕا تا دوای (٤) ڕۆژ گەنجێکی ڕەنگ پیاوانەی بینی بە ناوی (بۆرچۆ)، (بۆرچۆ)هەستی هاوکاری بۆ لای (تیمۆجین) جوڵا و لەگەڵی کەوت بۆ گەڕان بە دوای ئەسپەکاندا، ئەسپەکانیان دۆزیەوە و بردیاننەوە، کاتێك (بۆرچۆ) ئازایەتی (تیمۆجین)ی بۆ دەرکەوت کە چۆن دەزانێ تیراندازی بکات و پاشەکشە بە دوژمنەکانی بکات و لە خۆیان دوور بخاتەوە، بەڵێ پاش بینینی ئەم شەڕە دەستەویەخەیە (بۆرچۆ) پەیوەندی خۆی لەگەڵ (تیمۆجین) توندوتۆڵ کرد، ئەمە سەرەتایەکی خۆش بوو بۆ کارە شکۆدارەکانی داهاتووی (بۆرچۆ) کە ئەنجامیدان، (تیمۆجین) خاوەنی کەسایەتی هێندە بەهێز بوو هەر کەسێکی دیبایە خۆی بەسەردا دەسەپاند، لەم کاتەڕا (بۆرچۆ)ی بۆ لای خۆی کەمەندکێش کرد، ئەویش دەرەنجامی خۆی بە دەرەنجامی (تیمۆجین)ەوە گرێدا، لەمەولا شێوەی ئەم سەرەنجڕاکێشانە دەبینین، کە کاتێك هۆزەکان یەك لە دوای یەك دەهاتنە ژێر باڵی دەسەڵاتی ئەوەوە، تیمۆجین بەهرەی سەرەنجڕاکێشانی پێدرابوو، چونکە کەسێکی لێوەشاوە بوو لە سەرکردایەتی کردن و هەست کردن بە دادپەروەریو نواندنی دڵسۆزی بۆ هاوڕێیانی و دان نان بە ئەنجامدانی ئەو خزمەتانەی کە پێویستە ئەو ئەنجامیان بدا، خۆشەویستی (تیمۆجین) بۆ هاوەڵانی بە پەند و ئامۆژگاری دەهێنرێتەوە، یەکێك لە تەبیعەتی ڕەشماڵ نشینان: خۆشەویستی خەست و خۆڵ بۆ هاوەڵانە کە جگە لە ڕقی داخدار بەرامبەر بە دوژمنان هیچکەی لەگەڵ بەراورد ناکرێت.[1]

وانە و پەند: سەرۆکەکان تا حەقیقەتی کەسایەتیان ساغ دەبێتەوە و لە ڕووداوەکانی زەمانە پەند وەردەگرن و لەسەر نارەحەتیەکان ڕادێن و توانای پشوو درێژی و بارقوڵی پەیدا دەکەن بە بارودۆخی توند و تیژدا تێدەپەڕن، لە گرنگترین سیفەتی سەرکردەی گەلان و نەتەوە و دەوڵەتان: ئازایەتی و بوێری و هەنگاونانە بەرە پێشەوە و کارامەیی و کارزانییە، وێڕای کەسایەتیەکی سەرکەوتوو و زاڵ بوو بەسەر هەموو ئەو کێشانەی بۆی دروست دەکرێن، دانانی بەرژەوەندی گشتی لە سەرووی بەرژەوەندی خودی، هیچ سەرکردەیەك ناتوانێ لەگەڵ داکۆکی کردن لەسەر بەرژەوەندیە خودیەکانی خۆی و تەماعی زۆر و زەوەندی دا، خەڵك بۆ لای خۆی کەمەندکێش بکات.

---

١ المغول للعريني، ص:٤٦.

### ٣ـ هاوسەرگیری تیمۆجین و بەخشینی سوێندی لایەنگیری بە سەرۆکی کرایت:

تیمۆجین – دوای ئەنجامدانی چەند کارێك – بیری لە هاوسەرگیری کردەوە، هاتەوە یادی کە بابی کچی سەرۆك هۆزی (قنقرات)ی دانیشتووی سەر ڕووباری (کیرۆلین)ی بۆ خواستووە، بۆیە بەرەو ئەوێ بەڕێکەوت و بەم خوازبێنییەی دڵ و دەروونی خەزووری زیاتر خۆشکرد، بە تایبەتی کە بینی بە زاوایەکی بەهێز و پتەوی وەك (تیمۆجین) زیاتر پشت ئەستوور دەبێت، دوای ئەنجامدانی هاوسەرگیریەکە هێندەی نەخایاند (تیمۆجین) بە خۆی و هاوسەری و تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی بۆ سەر سەرچاوەی ڕووباری (کیرۆلین) ڕۆیشتن و لەوێ نیشتەجێ بوون، (تیمۆجین) دوای دەرباز بوونی لە پیلانەکانی هۆزی (تایجۆت) قەڵەمڕەوی حوکمی بەرەو فراوانی و بەهێزی دەچوو و تەواوی تیرە و تایەفەکان حیسابیان بۆ دەکرد، ئیدی بوو بەو پیاوە بەهێزەی کە دەیتوانی لە نێو بارودۆخی سیاسیدا بەشدار بێت و ڕۆڵی کاریگەری خۆی بنوێنێت و چووە ڕیزی ئەو سەرکردانەی کە کێشەیان لەسەر حوکم گێڕانی ڕۆژهەلاتی مەنغۆلیا دەکرد، تیمۆجین چونکە پیاوێکی چالاك و هۆشیار بوو حەزکردن لە سەڵتەنەت لە دڵ و دەروونیدا خرۆشا، بیری لەوە کردەوە کە دەبێ بۆ پێکانی ئەم ئامانجەی مەڵبەندێکی بەهێز بەکاربێنێ، بە جۆرێك چەند پەیمانێك لەگەڵ تیرەکانی دەرەوەی هۆزەکەی گرێ بدا، چۆن (یەسۆکای) بابی کاتی خۆی پێگەی سیاسی سەرۆکی (کرایت)ی بەهێز کردو بوو بە گەورەترین سەرۆکی (ئۆستوبس) ئەویش ڕێگەی بابی بگرێتە بەر و لە ڕێگای سەرۆکێکی بەهێزەوە پایەکانی حوکمڕانی خۆی داکوتێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بەرەو لای (توغرول) سەرۆکی کرایت بەڕێکەوت لەسەر ڕووباری (تولا)، پەیمانی دایە کە دەبێتە یەکێك لە لایەنگر و شوێنکەوتووەکانی ئینجا دەستی بە قسە کرد و گوتی: (پێشدا پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوان جەنابت و باوکمدا توند و تۆڵ بوو، ئێستاش – کە بابم نەماوە – تۆ لە جێگەی باوکمی)، توغرول بەم پەیمانەی (تیمۆجین) زۆر دڵخۆش بوو، بەڵێنی پێدا کە بۆ گێڕانەوەی سەر لەنوێی تەواوی سەرۆك هۆز و تیرەکان بۆ ژێر باڵی سەرکردایەتی ئەو – کە بە مردنی باوکی بە سەرکردایەتی تیمۆجین قایل نەبوون – هاوکاری تەواوی بکات، بەم هەنگاوەی ڕۆژ بە ڕۆژ کاروباری دەسەڵاتی (تیمۆجین) گەورەتر دەبوو، ناوبانگی تەواوی دەرکرد، خەڵکی لە تەواوی تیرە و تایەفەکان دەهاتن و دۆستایەتیان لەگەڵ دەبەست، (جیلمی) ئەو کەسە بوو (یەسۆکای) بابی کردبوویە نۆکەری (تیمۆجین) دڵسۆزترین هاوڕێی بوو، جیلمی و بۆرچۆ دوو دڵسۆز و برادەری گیانی بە گیانی (تیمۆجین)

بوون، بە هۆی ئامۆژگاریەکانی توغرولی شای (کرایت) سەرکردەیەکی تری مەغۆل بە ناوی (جامۆکا) کە سەرۆك هۆزی (جاجیرات) بوو بوو بە هاوڕێی (تیمۆجین)، خۆشەویستیەکی وا لە نێوانیاندا دروست ببوو هەر دەتگوت جووتەبران، بەلام هێندەی نەخایاند کێشە لە نێوانیاندا سەری هەلدا، هاوپەیمانی هەلوەشایەوە، هەر کەسەیان خەلکانێکی لەگەل کەوت، پێشبینیەکان وایان نیشان دەدا کە سەرۆکایەتی گەل لە ئایندەدا بۆ (تیمۆجین) دەبێ، بۆیە زۆرینەی تیرە و هۆزەکان هاتنە لای ئەو، لە نێو ئەو کەسایەتیانەدا (٤) سەرکردەی (مەغۆل) دەبینران کە خوێنی پاشایەتی لە دەمارەکانیاندا دەگەڕا، دوای ئەوەی لە جامۆکا جودا بوونەوە بوونە لایەنگری تیمۆجین.[1]

## دووەم: هەڵبژاردنی (تیمۆجین) بۆ کرانی بە (خان)ی مەغۆل:

چوار سەرکردەکانی مەغۆل – کە لایەنگیری تیمۆجین بوون – بەو پێو و دانگەی نوێنەرایەتی کۆنترین خێزانی پاشایەتی و ڕەسەنترین ڕەچەلەکی مەغۆل دەکەن، کۆبوونەوەو دەستیان بە تەگبیر و ڕا و ڕاوێژکردن کرد، دەرەنجام بڕیاریاندا (تیمۆجین هەلبژێرنو بیکەنە (خان)ی مەغۆل وەك زانراوە (تیمۆجین)یش هەر لەم ڕەچەلەکە بوو بەلام وەك ماف کەس لە (تای) کوڕی (قوتولا)ی دواهەمین (حاقان)ی مەغۆل بۆ ئەم پۆستە لە پێشتر نەبوو، لەگەل ئەمەشدا دۆستایەتی و دلسۆزی و پشتیوانی ئەم چوار سەرکردەیە بۆ (تیمۆجین) – بە پێی گێڕانەوەکان – لەم لێدوانەی ئەواندا ڕووبەڕووی (خان)ی تازە دەردەکەوێ، (بڕیارماندا بە (خان) بانگت بکەین، لەمەولا ئێمە لە پێشەوەی بەرەکانی جەنگ دەبین لە دژی دوژمنە زۆر و بێ حیسابەکانمان، ئەوەی دەستمان دەکەوێ لەو جەنگانەدا لە ژنانی جوان و کچانی شۆخ و شەنگ و ئەسپ و ولاخی ڕەسەن پێشکەشی تۆی دەکەین، هەر نێچیرێك ڕاوی بکەین دەیدەین بە تۆ، ئەگەر لە کاتی جەنگدا سەرپێچی فەرمانی تۆمان کرد یان لە کاتی ئاشتیدا شەڕمان بۆ سازدای، ئەو کاتە تۆ ئێمە و هاوسەرەکانمان لێك جودا بکەوە، مال و سامان و کەلوپەلەکەمان لێ زەوت بکە، دەنگمان لێ وەرگرە و بەرەلامان بکە)، هەموویان بەم بڕیارەوە پابەند بوون، (تیمۆجین)یان بە (خان)ی مەغۆل هەلبژارد، ناویان لێنا (جەنگیزخان)، لە ڕاستیدا هەلبژاردنی (تیمۆجین) لە لایەن (٤) سەرکردەکەی بنەمالەی پاشایەتی مەغۆل کە (تا)ی کوڕی (قوتولا)ی شازادەشی تێدا ئامادەبوو تەنها بە مەبەستی یەککرتنەوەی تیرە و هۆزە پەرتەوازەکانی مەغۆل و

---

[1] المصدر نفسه، ص: ٤٦.

گێڕانەوەی سەروەری بۆ بنەماڵەی (قیات) و چاوەڕێ کردنی قۆستنەوەی هەلێکی لە بار بوو بۆ تۆڵە سەندنەوە لە تەتەرەکان، کە ئەمە تەنها بە یەکێکی وەکو (تیمۆجین) و خزمە نزیکەکانی ئەنجام دەدرێت، تەماشایان کرد تیمۆجین لە هەموو هەڵمەتەکانی جەنگ و ڕاودا پێشەنگە، هۆشیارە و کاروبارەکان ڕێك دەخات و سیفەتی پابەندی بە ڕەوشتەکانیەوە دیارە،[1] خوخدە و ڕەوشتەکانی سەرکردەیی وەکو (فێڵ و تەڵەکەبازیو زیرەکی، ئەمەکداری لە بەرامبەر هاوەڵە دڵسۆزەکانی، ئەنجامدانی ڕاوێژو پرس و ڕا لەگەڵ سەرکردە و جێگرەکانی) لە کەسایەتی (جەنگیزخان) ڕەنگیان دابۆوە.

**ا- جەنگەکانی جەنگیزخان و سەرەتای یەکگرتنەوەی هۆزەکان لە ژێر سەرکردایەتیەکەیدا:**

جەنگیزخان کاروبارە بنەڕەتیەکانی جەنگی و مەدەنی بەسەر پشتیوانە هەرە دڵسۆزەکانی و خزمە هەرە نزیکەکانیدا دابەشکرد، بە ناوبانگترین تیراندازی کردە پاسەوانی تایبەتی خۆی، خەڵکانێکیکردە سەرپەرشتیاری دابین کردنی ئازوقە و خۆراك و ئاو و سازکردنی عەرەبانەکان، هەندێکیشی کردنە پاسەوانی پاوان و لەوەڕگاکان، کارمەندانێکیشی کردە چاودێریکەر و سەرپەرشتیاری خزمەتکارەکان و ڕاهێنانی ئەسپەکان و گەیاندنی فەرمانەکانی حوکمەت و پارێزگاری کردنی ڕژێم و بەرقەرار کردنی ئاسایش لە کاتی بەستنی کۆبوونەوەی پیاوماقوڵانی تیرەکان (قۆریلتای)، (جەنگیزخان) لەم بارودۆخەشدا (بۆرچۆ و جیلمی) جووتە دڵسۆزی لەبیر نەکرد، لێی دەگێڕنەوە کە پێی گوتوون: من لە بیرم ناچێتەوە کە کاتێك ئێوە هاوەڵم بوون هاوەڵی ترم نەبوون، بۆیە دەتانکەمە سەروەری هەموو ئەو خەڵکەی لەبەر دەستمدایە، ئینجا ڕووی کردە ڕەعیەتەکەی و گوتی: ئێوە هەمووتان وازتان لە (جامۆکا) هێنا و لایەنگیری منتان هەڵبژارد، کەواتە ئێوە هەمووتان ئەی هاوەڵە پێشینەکانم باشترین و هاوەڵی منن لە ئێستا و ئایندەدا،[2] پاش ئەمە جەنگیزخان پەیامنێری خۆی بۆ لای سەرۆك هۆزە بەهێزەکانی دەوروبەری بەڕێکردن، هەواڵی دانی کە لە لایەن هەموو ئەو هۆزانەی لەگەڵیدان بە سەرۆك (خان) دانراوە، یەکەمین سەرۆك هۆز کە بانگەشەی کرد (توغرۆڵ خان)ی هاوڕێی بابی بوو (لە ڕێی گرێبەستی برایەتی)یەوە[3] و

---

١ المصدر نفسه، ص: ٤٩.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣٩.

٣ یەکێك لە دابەکانی پیاو ماقوڵانی مەغۆل هەڵبژاردنی برادەری باش بوو، ئەم برادەرە وەکو برا تەماشا دەکرا و ناوی ئاندای بەسەردا دەبرا، ئاندا بەم واتایەدێ کە ئەم جووتە برایە وەك یەك کەسیان لێ دێ و یەکیان خۆی بە قوربانی ئەوی تر دەکات.

(جامۆکا)ی هاوڕێی خۆی بوون، (توغرۆڵ) وەڵامی بانگەشەکەی بە ئەرێ دایەوە و پشتیوانی خۆی بۆ ڕاگەیاند، بەڵام (جامۆکا) بە گاڵتەپێکردن و توڕەییەوە وەڵامی بانگەشەکەی دایەوە، (جامۆکا) و تەواوی دوژمنەکانی ئێرەییان بە هێز و دەسەڵاتی جەنگیزخان دەبرد، هەر بۆیەشە بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتبایە و گەرمێن و کوێستانی بە ئاژەڵەکانی بکردایە بە ڕێکخستنی هێزی سەربازیەوە دەڕۆیشت، هێزەکەی دەکردە (٤) بەش: هێزی پێشەنگ، هێزی ڕاست و چەپ، هێزی پاشەکی، ئاژەڵ و عەرەبانەی خێزانەکانیش لە نێوەڕاستدا دەڕۆیشتن.[١]

## أ- جەنگی عەرەبانەکان:

جارێك (جەنگیزخان) بەم شێوەیەی باسمان کرد کاروانی بەڕێکرد چاودێرەکانی پێش هێزی پێشەنگ هەواڵیاندا کە تەپ و تۆزێکی چڕوپڕ لە ئاسۆوە بەرەو بەرەوە بەدی دەکرێت، کاتێك پێی گەیشتن دەرکەوت کە هۆزی (تیدجۆن)ە و ژمارەیان (٣) هەزار کەسە و (تارجۆتای) سەرکردەیانە، (جەنگیزخان) بڕیاریدا دەبێت یەکسەر جەنگیان لەگەڵ بکرێت، هێزە جەنگاوەرەکانی تەنها ئەسپسوار بوون لەسەر دوو شێوە:

١- سواری هێرشبەر (الخیالة الثقیلة): پیاوەکانی ئەم هێزە زرێیئاسنینیان پۆشیبوو و کڵاوخودی پۆڵاینیان لەسەر کردبوو، دێوجامە (پێستەی خۆشکراو)ی ئەستووریشیان لەبەر وڵاخەکانیان کردبوو، چەکی ڕمبو قەلغانیان هەڵگرتبوو.

٢- سوارەی تیرهاوێژ (خیالة الخفیفة): پیاوەکان و ئەسپەکانیان تەنها دێوجامەیان پۆشیبوو، ئەسپەکانیان ئەسپی کێبەرکێ بوون، چەکەکانیان تیر و کەوان بوون، چەك و چۆڵی دوژمنیش هاوشێوەی چەکەکانی (جەنگیزخان) بوون.

(جەنگیزخان) پیاوەکانی دابەش کردن بۆ چەند سریەیەك، هەر سریەیەك لە (١٠٠٠) جەنگاوەر پێکهاتبوو و بەسەر (١٠) ڕیزی ڕێکوپێکی (١٠٠) جەنگاوەریدا دابەشی کردبوون، بەڵام (تارتۆجای) سریەکانی خۆی بەم شێوەیە ڕێکخستن: هەر سریەیەك لە (٥٠٠) جەنگاوەر پێکهاتبوو و بەسەر (٥) سریەدا ڕیزی ڕێك و پێکی (١٠٠) جەنگاوەریدا دابەشی کردبوون، دوو ڕیزی یەکەمی هێزی سوارەی هێرشبەر بوون، ڕیزی دوایەش هێزی سوارەی تیرهاوێژ بوون.[٢]

(جەنگیزخان) هێزی دەستە ڕاستی خستە نێو جەنگەڵستانێکی چڕ و پڕ و نەدیو لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا، هەموو ئەو عارەبانانەی ژنەکانیان و کەلوپەلەکانیانی هەڵگرتبوون

---

١ الغزوا المغولي لديار الاسلام، الفريق الركن، د. محمد فتحي امين، ص: ٣٩.

٢ المصدر نفسه، ص: ٤٠.

کۆکردەوە و چوارگۆشەیەکی گەورەی لێ دروست کردن و ژن و منداڵەکانیشیان لە نێوانیاندا بەجێ هێشتن و پاراستنیشی خستە ئەستۆی مێردمنداڵەکانی هۆز و تیر و کەوانیشی پێدان، هێزی دەستە چەپی خستە باری عەرەبانەکان، ئەو بە پێچەوانەی نەخشەی دوژمن هێزی سوارەی تێرهاوێژ لە باری پێسەوەی جەنگەکەدا دانا و هێزی سوارەی هێرشبەریشی لە باری دواوە دانا.[1]

هێزی سوارەی هێرشبەری (تایجۆتا) هێرشی کردە سەر هێزی سوارەی تیرهاوێژی (جەنگیزخان) و ئەوانیش بە لێزمەی تیرباران ڕووبەڕوویان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لە گۆڕەپانی جەنگدا لێ کوشتن، ئەم هێزە نەیتوانی کەلێن بخاتە نێو ڕزەکانی سوپای (جەنگیزخان)ەوە، چونکە لە (١٠) ڕیزی ئەستوور پێکهاتبوو، هەرچەندە هێزی سوارەی تیرهاوێژیان هەوڵیدا ئەم شکستە هەستێنێتەوە و بە پرتاو بەسەر لاشە کەڵەکە بووەکانی هێزی سوارەی هێرشبەریان بازیاندا و دەستە و یەخەی هێزەکانی (جەنگیزخان) بوونەوە، بەڵام لەو کاتەدا (جەنگیزخان) هێزی سوارەی هێرشبەری لێ بەرەڵا کردن و بە گژیاندا چوونەوە، بە تیر و ڕمەکانیان کارێکیان پێکردن با بە دەواری ڕەشی نەکردبێت و شکستیان دەرخواد دان، ئەم جەنگە ناوی لێ نرا (جەنگی عەرەبانەکان).[2]

ئەم جەنگە شەڕێکی ڕەش بوو بە درێژایی ئەو ڕۆژە تا تاریکایی شەو درێژەی کێشا، (جەنگیزخان) تێیدا سەرکەوت و وەك (یەکەمین سەرکەوتن) بۆی تۆمار کرا، (٥ـــ٦) هەزار کەسی لە دوژمن کوشت، (٧٠) سەرۆکی لێ دیل کردن و بە زنجیری شمشێرەکانی خۆیان کۆت و بەندیان کردن و لەبەر لاقی (جەنگیزخان) فڕێیان دان، شیر و کالانی شیرەکانیان بە ملدا کردبوون، دەڵێن: (جەنگیزخان) فەرمانی دا ئەم (٧٠) کەسە بە زیندوویی بخرێنە ناو مەنجەڵە ئاوی کوڵاوەوە و بەم شێوەیە بکوژرێن.[3]

بەم شێوەیە بە ترساندن و تۆقاندن هاتە نێو گۆڕەپانی جەنگی دوژمنەکانیەوە، بەڵکو ترس و تۆقاندن بوو بە یەکێك لەو هۆکارانەی حکومەتەکەی لە کاتی تێکهەڵچوونەکاندا بەکاری دەهێنا، بە تایبەتی لە بەرامبەر ئەو هۆز و نەتەوانەی هاوپەیمانەتیان لە دژی حکومەتەکەی دەبەست.[4]

---

١ المصدر نفسە، ص: ٤١.

٢ چونکە جەنگیزخان عەرەبانەکانی بۆ پاراستنی هێزی دەستە چەپی — کە دیار بوو — بەکارهێنا.

٣ المصدر نفسە، ص: ٤١.

٤ المغول للعریني، ص:٥٠.

### ب ـ ململانێی هاوپەیمانێتیەکان:

بەرژەوەندی (جەنگیزخان) وای دەخواست کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ (توغرولخان) ببەستێت و بە جووتە کۆتایی بە (تەتەرەکان)ی دوژمنی هەردووکلا بێنن، لە جەنگێکدا کە ئەنجامیان دا توانیان ئامانج بپێکن و تەتەرەکان بە گشتی و هۆزی (مەرکیت) و لایەکیش لە هۆزی (نایمان) بە تایبەتی لە نێو بەرن، وەك زانراوە کێشمەکێشمی نێوان (تایانك خان)ی پاشایان و (بویۆرۆف)ی برای بووە مایەی لاواز بوونی ئەم هۆزەی (نایمان) کە پاشانیش کەوتە بەر هێرشی (جەنگیزخان) و (توغرۆڵ خان)، ئەوەی زیاتر ڕێگای بۆ ئەم هێرشە خۆشتر کرد: هەرا و ئاژاوەکانی سەر گۆڕەپانی مەنغۆلیا بوون کە لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٢)ی زایینی و بە فیتی سیاسەتی حکومەتی چینی و هەندێك هۆکاری نێوخۆی ئەو وڵاتە ڕوویان دا، شیاوی باسە بنەماڵەی (کین)ی حکومڕانی چینی باکوور بەو سیاسەتە ڕەفتاری دەکرد کە چەندین بنەماڵەی تری حکومڕانی ئەو وڵاتە پێی بەڕێوە دەچوون لە ئاژاوە نانەوەی نێوان هۆزەکان و سەرکردەکانیان، پاشای چین بە گەرمی داوای لە (کرایت) و (مەغۆل) دەکرد ببنە هاوپەیمانی، لە ساڵی ١١٩٤ی زاینیدا دەرەنجامی جەنگ بە بەرژەوەندی هاوپەیمانەکان بڕیاری لەسەر درا، وەکو پاداشت شای کرایت ناسناوی (وانج)ی پێدرا، کوڕەکەشی لە ڕیزی سوپادا بەرز کرایەوە و پلەی (سنجون)ی پێدرا، بە هەمان شێوە (جەنگیزخان)یش ناسناوێکی ڕێزلێنانی پێدرا، بەڵام هیچ ناسناوێکی تری جگە لە ناسناوی ئەسڵی خۆی لە پایە بەرزیدا پێوە نەلکاوە، لە لایەکی ترەوە هەموو ئەو هۆزانەی ببوونە جێی هەڕەشە و مەترسی لە لایەن (جەنگیزخان)ەوە: (جاسیرات و مەرکیت و تایجیۆت و قەنقرات و تەتار) پێکەوە هاوپەیمانێتیەکیان پێکهێنا، (تۆکتا)ی شای (مەرکێت) و (جامۆکا)ی شای (جاسیرات) لە نێو شایەکاندا دیار بوون، ساڵی ١٢٠١ی زایینی ڕێککەوتن لەسەر دانانی (جامۆکا کرۆخان) بە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی هۆزە تورکیە مەغۆلەکان، هێندەی نەخایاند ئەو سوپایەی جامۆکا کۆی کردبۆوە لە ساڵی ١٢٠١ـ ١٢٠٢ تێکشکا، بەڵام دوای ئەمە توانی (سنجون) و (توغرولخان)ی بابی لە هاوپەیمانێتی (جەنگیزخان) پاشگەز بکاتەوە و سەرنجیان بە لای خۆیدا ڕاکێشی.[1]

### ج ـ جەنگی (جەنگیزخان) لەگەڵ شای (کرایت):

ساڵی ٥٩٩ك/١٢٠٣ز (وانج خان)ی سەر بە هۆزی (کرایت یان کرێت یان قاریات)ی مەسیحی سەرۆکی هۆزە تورکە ڕۆژهەڵات نشینەکان بوو، هەرچەندە (جەنگیزخان) سەر بە

---

١ المصدر نفسه، ص: ٥١.

هۆزەکەی ئەو نەبوو بەڵام هەر لە تەمەنی منداڵییەوە پشتیوان و پابەندی – بڕیارەکانی – بوو، سەرۆکای تیرە و تایەفەکانی (کرایت)ی هاوپەیمانی جەنگیزخان بە هۆی سەرکەوتنەکانیەوە ڕق و کینەیان لە بەرامبەر جەنگیزخان کەوتە دڵ و دەروونەوە، لە لای (وانج خان) بەخراپە باسیان لێوە دەکرد، تا کار بەوە گەیشت (وانج خان) بە ناپاکی و خیانەت جەنگیزخانی تاوانبار کرد و بڕیاری گرتنی دا، ئەمە و لە پیلانێکی دووجەمسەریدا ویستیان بە سەرکردایەتی توکتاکبەگی کوڕی (توغرولبەك -وانج خان) و (جامۆکا)ی دوژمنی سەرسەختیەوە جەنگیز خان بکوژن، ئێوارە وەختەی ڕۆژێك، کاتێك جەنگیز خان بە خۆی و (٦) هەزار جەنگاوەر و خاو و خێزانەکانیانەوە لە ناوچەیەکدا هەڵیاندابوو، هێزە گەڕۆکە چاودێرەکان هەواڵیان بە جەنگیزخان دا: کە هۆزەکانی (کرایت) خۆ کۆدەکەنەوە و خەریکە لەسەر بارگەکەیان نزیك دەبنەوە و پێ دەچێت شەو هێرشیان بکەنە سەر، (جەنگیزخان) بڕیاریدا هەرچۆنێك بێت و بەهەر فێڵێك بێت خۆ لە دەستی دوژمن قوتار بکات، چونکە لە هەردوو بواری هێز و خێراییەوە لە دوژمنەکەی لاوازترە و خاو و خێزانیشیان لەگەڵدان کە سواری عەرەبانەکانن و گاجوت و ئەسپ ڕایاندەکێشن، لەم کاتەدا دوو نۆکەری (وانج خان) هاتنە ڕیزی سوپای جەنگیز خانەوە و هەواڵی نەخشەی وانج خانیان پێدا کە دەیەوێ دەست گیری بکات،[1] (جەنگیز خان) نەخشەیەکی داڕشت و داوای لە سەرکردەکانی کرد خاڵ بە خاڵ و بەو پەڕی وریایی و هێمنی و ڕێکوپێکی یەوە جێبەجێی بکەن، نەخشەکەی بەم شێوەیە بوو:

أ– کشاندنەوەی ئاژەڵەکان و ژن و منداڵ و خێزانەکان بەسواری عەرەبانە سوکەکان کە ئەسپ ڕایان دەکێشن بەرەو دواوە و بۆ شوێنێکی نەدیو کە ١٢کم لە سەربارگەکەیان دوور بێت.

ب– چۆڵکردنی خێوەت و ڕەشماڵەکان و داگیرساندنی چرا تێیاندا و بەجێهێشتنی گاجووتەکان بە عەرەبانەکانیانەوە بە شێوەیەك وا بزانن سەربازگەکە ئاوەدانە.

ج– (جەنگیزخان) کۆمەڵێکی گەلی لە بەرەبەیانی ئەو شەوەدا ڕێگای کشانەوەی ئاژەڵ و خێزانەکان شوێنەون دەکەن، هۆزەکانی کرایت سەربەژێر هێرشیان کردە سەر سەربازگەکەی (جەنگیزخان)، کاتێك دیتیان سەربازگەکە چۆڵە و کەل و پەلەکانیان هەر لەوێدان، پێیان وابوو (جەنگیزخان) بە خۆی و سەربازەکانی و خاو و خێزانەکانیانەوە لە ترسان هەڵاتوون، بۆیە لە هێرشەکەیاندا خاوبوونەوە و بە دوایان نەکەوتن.

---

١ الغزو المغولي لديار الاسلام، ص:٤٢.

(جەنگیزخان) لە پاش گردێکی پشت سەربازگەکەوە کە ڕووبارێکی بچووکیان لە نێواندا بوو بە خۆی و سەربازەکانیەوە خۆی حەشار دابوو، چاودێری کردنی ناوچەی شەڕیشی بە پاسەوانە گەڕۆکەکانی سپاردبوو، کاتێك هێزی سوارەی تیرهاوێژی (کرایت) کە پێش هێزی سوارەی هێرشبەریان کەوتبوو پێشڕەوی کرد، جەنگیزخان و سوپاکەی لە پرتاو هێرشیان بۆ بردن و، بەبێ ئەوەی بێڵن هێزە هێرشبەرەکەی کرایت پێ بزانێت هێزی تیرهاوێژیان لەنێو برد، پاش ماوەیەك (وانجخان) و سەرکردەکانی – کە سەرکردایەتی هێزی سوارەی هێرشبەریان دەکرد بەمەیان زانی، کاتی جەنگی یەکلاکەرەوە نزیك بۆوە، (جەنگیزخان) نەخشەی خۆی بەم شێوەیە دارشت:

أ– هێرشکردنە سەر دوژمن پێش ئەوەی دوژمن هێرش بێنێ.

ب– ئەنجام نەدانی هێرشی بەرەیی: چونکە دوژمنەکانی لە ئەو بەهێزترن.

ج– سوود وەرگرتن لە زەوی بە گوێرەی بۆ لوان، تا لەم کاتەدا بە تێکەڵ و پێکەڵی بتوانن کەم و کوڕی ژمارەیان لە دوژمن بشارنەوە، هێزی سوارەی هێرشبەری دوژمن هێرشی کرد و خۆی بە نێو سوپاکەی (جەنگیزخان)دا کرد، (جەنگیزخان) بانگی (جلدار)ی ئالاهەڵگری هۆزی کرد – کە یەکێك بوو لە سەرکردە هەرە ئازاکانی – گەمارۆدانی باڵی چەپی سوپای دوژمن و داگیرکردنی گردی (جویتای) هەڵکەوتوو لە پشت ئەم باڵە سەربازی خستە ئەستۆ، ئەگەرچی سوپای (کرایت) لە ئۆجی هێرشەکەیاندا بوون بەڵام (جلدار) توانی لە یەکەم تەکانیدا سوپاکە ناچار بکات کەمێك بەرەو دواوە پاشەکشە بکات، جەنگ تا تاریکایی شەو درێژەی کێشا، جەنگیزخان، دەیزانی لە ڕۆژی دووەمدا بەم هێزە کەمەیەوە ناتوانێ لە بەرامبەر هێزە بەهێزەکەی دوژمنیدا ڕاوەستێت هێرشێکی توند و تیژی کردە سەر دوژمن و کەلێنێکی گەورەی لە مەیداندا دروست کرد و خۆی بەرەو ڕۆژهەڵات کێشایەوە.

دوا بە دوای پاشەکشەکردنی (جەنگیزخان) (جوبی) بەسەر دوو سەربازگەکەی ناحەز لە بەرامبەر یەکتردا دابەش بوو:

أ– سەربازگەی (وانج خان) و هەموو ئەوانەی هاتنە پاڵی دوای سەرکەوتنی بەسەر (جەنگیزخان)دا.

ب– سەربازگەی (جەنگیزخان) و هەموو ئەوانەش هاتنە لای تا پشتیوانی بکەن.

(جەنگیزخان) بڕیاری دا دوژمنەکەی لە نێو بەرێ، هێرشێکی بەهێزی سازکرد، لە نەخافڵ بەرەو سەربازگەی (وانج خان) پێشڕەوی کرد، پێش هەڵتۆقانی بە ڕووی دوژمندا (تابووری پێنجەم)ی خستە گەڕ تا بە تەواوەتی لە – چەند و چۆنی – دوژمن حاڵی بێ، بۆ ئەم

مەبەستە یەك لە سەرکردەکانی خۆی بە ناوی (پەنابەر) نارده لایان، ئاڵایەکی (جەنگیزخان)ی هەڵگرتبوو و ڕایگەیاند کە بۆیە بەم شێوازە هاتووە تا لە دەست ڕەفتاری بەدی (جەنگیزخان) قوتاری بێ، کاتێك گەیشتە سەربازگەی (وانج خان)، وانجخان متمانەی پێ نەکرد، بۆیە بە مەبەستی وەرگرتنی زانیاری و ساغکردنەوەی هەواڵەکان ژمارەیەك لە سەربازەکانی خۆی لەگەڵ ناردنە سەر لوتکەکانی دەورەبەر و موسەیتەر بەسەر سەربازگەی خۆی و هاوسێکانی، نوێنەرەکەی (جەنگیزخان) دەیەویست نیشانەیەك داکوتێ و سەربازگەکەی دوژمن ئاشکرا بکات، کاتێك ئەمەی بۆ نەکرا، فێڵێکی داهێنا و بە پەلە جێبەجێی کرد، چووە سەر لوتکەیەك‌و ئاڵاکەی هەڵگرتبوو لەسەر ئەوێی چەقاند، ئینجا هاتەوە لە وڵاخەکەی دابەزی و بەپێ دەڕۆیشت، سمی وڵاخەکەی بە دەستەوە گرت، پرسیاری لێکرا، بۆ وا دەکەی؟ گوتی: بەردێك چۆتە نێو سمی وڵاخەکەوە، بە بیانووی دەرهێنانی بەردەکە خۆی و سەربازەکانی خافڵاندن، پێشەنگی سەربازەکانی جەنگیزخان گەیشتنە سەریان تەواوی ئەم پیاوانەی (وانجخان)یان بە خێزانەکانیانەوە پەلبەست کردن، بۆیە (وانج خان) ئەنجامی هەواڵگریەکەی پێ نەگەیشت،[١] بەڵکو سوارەکانی جەنگیزخان هێرشیان هێنا و شمشێر کەوتە سەر گەردنی پیاوەکانی.[٢]

(وانج خان) و (توکتابەگ)ی کوڕی بریندار بوون و هەڵاتن، هۆز تاڵان و بڕۆ کرا و ژنەکان دەستگیر کران و (جامۆکا) کەوتە بەردەستی (جەنگیزخان)، فەرمانی دا بەنی ئاوریشم بکەنە گەردنی تا دەخنکێت،[٣] تەواوی دەمار و ئەندامەکانی لەشیان لێ کردنەوە،[٤] هەروەها (وانجخان) و کوڕەکەشی دوای هەڵاتنیان لە لایەن شوێنکەوتووەکانیانەوە بە مەرەدی کوشتن گەیشتن، سەری باوك لە نێو قاپێکی زیودا بە دیاری بۆ (جەنگیزخان) نێردرا،[٥] بەم شێوەیە تیرەی (قاریات) لەنێو برا و تەفر و تونا کران، ئینجا هەرچی تیرە و هۆزی بێ هێز و بەهێز هەبوو بە جیاوازی ئاین‌و مەزهەبەکانیانەوە و بە هەموو شوێنەواری شارستانیان و پوختەی زانستەکانەوە بوونە گەردنکەچ و دڵسۆزی سەرۆکی نوێی ئاسیا، دوابەدوای ئەم سەرکەوتن — ە پاداشتی ئەم دوو کۆیلەی (وانجخان)ی دایەوە کە هەواڵی هێرشی

١ الغزو المغولي لديار الاسلام، ص:٤٥.
٢ المصدر نفسه، ص: ٤٥.
٣ المغول للعريني، ص:٥٢.
٤ الغزو المغولي لديار الاسلام، ص:٤٥.
٥ المصدر نفسه، ص: ٤٥.

چاوەڕوانکراو و نەخشە بۆکێشراوی (وانج خان)یان بۆ هێنابوو ــ، ئازادی کردن و پلە و پایەی (ترخانی = ئازاد)ی پێ بەخشین و بە جۆرێك: ئەرکەکانی دەوڵەتیان لەسەر شان نامێنێ، هەرچی بە تاڵانی دەگرن لە جەنگەکاندا بە تەواوەتی دەبێتەماڵی خۆیان، شا هیچیان لێ ناسێنێت، بەبێ وەرگرتنی ئیزن و ڕێگەپێدان دەتوانن سەردانی سەرۆك بکەن، هەر یەکەیان تا (٩) تاوانی بەسەردا تێنەپەڕێ سزا نادرێت.[١]

(تاتانجۆ)ی کاتیبی شای (نایمان) کە بە ڕەچەڵەك (ئۆیغۆر) بوو، لە لایەن هێزەکانی جەنگیزخانەوە — لەم جەنگەدا — دەستگیر کرا، (جەنگیزخان) کردیە کاربەدەستی خۆی و بڕیاری دا زمانی (ئۆیغۆر)ی بەکاربێنێ، (تاتانجۆ) بڕیاری دا ڕۆڵەکانی جەنگیزخان و چینی باڵا فێری گفت و گۆ و نووسینی زمانی (ئۆیغۆر)ی بکات، شایانی باسە ئۆیغۆرەکان کاریگەری بەهێزیان لەسەر (ئەکۆتای) کوڕی (جەنگیزخان) و جێنشینی حکومڕانیەکەی هەبوو.[٢]

## سێهەم: دوو مەملەکەتی (نەیمان) و گەردنکەچیان بۆ حوکمڕانی (جەنگیزخان):

(نەیمانیەکان) یەکێك بوون لەو ئیمپراتۆریەتە زلهێزانەی وەك هێزێکی جیهانی و خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان کە زۆربەی زۆری خاکی کیشوەری ئاسیا و بەشێکی گەورەی ئەورووپای لە خۆ گرتبوو دەرکەوتبوون، ئەوانیش وەك تەواوی هۆزەکانی تر ڕووبەڕووی (جەنگیزخان) بوونەوە لە کاتی سەرهەڵدانیدا، نەیمانەکان لە ڕەچەڵەکدا دەگەڕێنەوە سەر ڕەگەزی (تورك)، سنووری وڵاتەکەیان لە کۆندا بەم شێوەیە مەزەندە دەکرێت: لە باکوورەوە هۆزەکانی (قەرقیز) و لە باشوورەوە هۆزەکانی (ئۆیغۆر)، لە ڕۆژهەڵاتەوە هۆزەکانی (کرایت)و (مەرکیت) و لە ڕۆژئاواوە (قەرەختاتی) هاوسنووریان بوون، شاکانیان یان خانەکانیان پێیان دەگوترا: (کوتچلۆك خان)، کە بە واتای (گەورە، بەهێز، سەردار... هتد) دێت هەروەك (رشید الدین) ئاوا دەڵێ لە ڕێبازی ژیانیان و ڕژێمی کۆمەڵایەتیان و دابو نەریتو کلتوریاندا هاوشێوەی هۆزە هاوسێکانیان بوون وەك مەغۆل و تیرە خێڵکیەکانی تر.[٣]

دەوڵەتی (نەیمان) گەورترین دەوڵەتی نێوەڕاستی ئاسیا بوو فراوانترین خاکی بە دەستەوە بوو یەك پاشا حکومڕانی دەکرد، بەڵام لەو کاتەدا (جەنگیزخان) وەك سەرۆك

---

١ المصدر نفسه، ص: ٤٥.

٢ المغول للعريني، ص:٥٣.

٣ سقوط الدولة العباسية، للقحطاني، ص: ٧٣.

هۆزەکانی (مەغۆل) دەرکەوت، دەبینین ئەم دەوڵەتە دوو کەرت بووە، کەرتی ڕۆژهەلات و کەرتی ڕۆژئاوا، هەر کەرتە و برایەك حکومڕانی بوو، (بویروخان) حکومڕانی کەرتی ڕۆژهەلات بوو، (بیبوقاتایانگ)یش حکومڕانی کەرتی ڕۆژئاوا بوو، بە تەماشا لە سنووری ڕۆژهەلاتی مەملەکەتی (نایمان) و هاوسنووریان لەگەڵ هۆزەکانی (کرایت) و (مەرکیت)، لە ئەنجامی کارەساتی جەنگی (ۆرکۆ) و کوژرانی (تۆنك خان) سنوورەکانی نایمان لە ڕووی ئاوارە و هەلاتووەکانی ئەم دوو هۆزە لە ترسی زەبری جەنگیزخان ئاوەلا بوو، لە ئەنجامی ئەمەدا سەر لە نوێ ململانێی نێوان (جەنگیزخان) لە لایەك و دوو شاکەی (نەیمان) لە لایەکی ترەوە سەری هەڵدایەوە، دەرەنجامی ئەم ململانێیە خوێناویە درێژخایەنە بە لەنێوچوونی هەردووك دەوڵەتی (نەیمانی) و پێچرانەوەی دەسەلاتیان کۆتایی هات لە ناوەندی کیشوەری ئاسیادا، هەردووك (شا)ی برا بە دوای یەکدا کوژران، ئیمپراتۆریەتە لاوەکەی جەنگیزخان بە یەکجا خوێن و خۆراکی ئەم دوو دەوڵەتەی هەڵمژی و خاك و ئاوی وڵاتەکەشیانی هەڵلوشی تا ببێتە پارچەیەکی نەپچڕاو لە خاکی دەوڵەتی مەغۆل.

مانگی ڕەجەبی ٦٠٢ك بەرامبەر مارسی ١٢٠٦ز (جەنگیزخان) کۆبوونەوەیەکی گشتی ڕێکخست، لەم کۆبوونەوەیەدا: (جەنگیزخان) کرا بە (خانی گەورە)ی تەواوی دەوارنشینەکانی مەنغۆلیا و وڵاتە هاوسێکانی ئەو وڵاتە، (جەنگیزخان) نەخشەیەکی تازەی بۆ داگیرکردنی وڵاتان دارشت و بڕیاریاندا لە سنووری مەنغۆلیا دەربچێت، لەم کۆبوونەوەیەدا قانونە بە ناوبانگەکەی خۆی بلاوکردەوە، کە لە مێژوودا بە (یاسا) ناسراوە.[١]

## چوارەم: دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی (مەغۆلی):

هەوڵەکانی جەنگیزخان بەس لە یەکخستنی هۆز و تیرەکانی (مەغۆل)دا ڕانەوەستان، بەڵکو ئەم یەکگرتنە بووە خاڵێکی وەرچەرخان بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتیەکی گەورە کە زۆرترین ناوچەکانی جیهانی ئەوکات لە خۆ بگرێت، بۆ ئەم مەبەستەی و پێکانی ئەم ئامانجەی دەبووایە لە هەموو لایەکاندا پەلی خۆی بهاوێژێت و ڕووبەڕووی نەتەوە جۆراوجۆرەکان و کلتوور و ڕۆشنبیریەکانیان ببێتەوە، لەم پێناوەدا بە پێڕەوکردنی چەند کردەوەیەکی سەربازی چڕ و پڕ و ئاڵۆز وتوند و تیژ دەستی بە کارەکانی کرد، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

١ سقوط الدولة العباسية، للقحطاني، ص: ٧٦.

**١ـ بەرەی چینی:**

ـ کردە سەربازیەکانی دژی وڵاتی چینی باکوور:

أ ـ مەملەکەتی (تانغوت):

(جەنگیزخان) سەرەتا هێرشی کردە سەر مەملەکەتی (تانغوت) یان مەملەکەتی (سی ـهیا) لە (تبت)، (تانغوت) بێ هێزترینی ئەو (٣) مەملەکەتانە بوو کە حکومڕانی چینیان دەکرد لەو کاتەدا، چونکە هەر کاتێك توانی ئەو وڵاتە داگیر بکات ئەوا دەتوانێ لەم ڕێگایەوە حوکمی خۆی بەسەر (تورکستان)دا بسەپێنێ و لە لای ڕۆژئاوادا گەمارۆی مەملەکەتی (کین)ی دوژمنە لە مێژینەکەی (مەغۆل) بدات.

(جەنگیزخان) لە ساڵانی (٦٠٢ك/ ١٢٠٥ز، ٦٠٤ك/ ١٢٠٧ز، ٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز) سێ جار پەلاماری ئەو وڵاتەیدا و تەواوی خاکەکەی ڕامالّی، بەڵام نەیتوانی بچێتە نێو (ننج – هسیا)ی پایتەختەوە، ماوەیەکی زۆر ئابلۆقەی دا، تا سەرۆکەکەی – بە ئاشتی – لە ساڵی ٦٠٦ك/١٢٠٩ز بە سەرکردایەتی حوکمڕانی (مەغۆل) بەسەر وڵاتەکەیدا و دانی سەرانە بە جەنگیزخان قایل بوو،[١] بەم شێوازە (جەنگیزخان) بوو بە سەرگەورەی مەملەکەتی (تانغۆت) واتە هەرێمی (کانسۆی چینی) ئێستا و دەشتەکانی (ئۆردۆس و ئەڵدشان) کە بە پشتێنەی سنووری چین دادەنرێن، سەرۆکی مەغۆلی پێویستی بە جێ پێیەك هەبوو لە وڵاتی چین تا لاقی خۆی تێدا بچەقێنێت و لەوێڕا پەلاماری مەملەکەتی (کین) بدات کە هەندێك تیرە و تایەفەی (تورك و مەغۆلی)ی لەگەڵ خۆداون.[٢]

ب ـ مەملەکەتی (کین) = مەملەکەتی زێڕ:

(جەنگیزخان) بە حوکمی بەهێز بوونی مەملەکەتی (کین) لە پەلامارەکانیدا بۆ سەر ئەو مەملەکەتە ڕووبەڕووی چەند لەمپەرێکی گەورە بووەوە کە لە داگیرکردنی (تانغۆت)دا بوونیان نەبوو، ئەم لەمپەرانە بریتی بوون لە ژمارەیەکی زۆر قەڵای مەحکەم کە لە سنووری خۆرهەڵاتی ئەو مەملەکەتەوە تا سنووری خۆرئاوای دروست کرابوون و لەگەڵ دیواری گەورەی چین هێڵێکی بەرگری بەردەوامیان بۆ پاراستن و پاسەوانی کردنی مەملەکەتی زێڕ (کین) پێکهێنابوو، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە سوپای (جەنگیزخان) تا ئەو کاتە بەم جۆرە جەنگە ـ جەنگی گەمارۆدانی قەڵا ـ ڕانەهاتبوو.

---

١ جنگیرخان قاهر العالم، ص: ٢٣٨، حروب المغول، د. حطیطة، ص: ٢١.

٢ حروب المغول، د. حطیط، ص: ٢١.

(جەنگیزخان) دوای تێڕامانی بارودۆخەکە، بە باشی زانی هاوپەیمانیەك لەگەڵ تیرەو تایەفەکانی (ئۆنغۆت)ی دانیشتووی باکووری (چین) مەنغۆلیای ئێستا ئەنجام دا، دوای پێدانی کچێکی خۆی بە شاکەیان توانی ئامانجەکەی بپێکێت و هاوپەیمانیەك لەگەڵ شای (ئۆنغۆت)ی تازە زاوای ئەنجام بدا، (جەنگیزخان) دەیزانی شای (ئۆنغۆت) جێگەیەکی گرنگو ستراتیجی بە دەستەوەیە و بەم هاوپەیمانیەی لەگەڵ ئەو پاسەوانی کردنی سنوورەکانی چین دەستەبەر دەبێت و وەك چاودێرێکی جێ متمانە لە پشت دیواری گەورەی چین رادەوەستێت، جەنگیزخان بە تەواوکردنی ئەم هاوپەیمانییە بۆی دەرکەوت کاری تەواوە و هەموو گرێ کوێرەکانی رێی داگیرکردنی مەملەکەتی (کین)ی بەبێ ماندووبوون کردوونەتەوە، بۆیە سنووری ئیمپراتۆریەتیەکەی (مەغۆل)ی بە هێڵەکانی پێشەوە و سەنگەرەکانی تەماسی دوژمن بەستەوە.[١]

جەنگیزخان رێگا چارەی جۆراوجۆری بە دەستەوە بوون بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی و بە گوێرەی پێویست ئاڵوگۆڕی لە نێوانیاندا دەکرد، ئەگەر ئامانجەکەی بە هێزی سەربازی نەپێکابایە چارەسەری سیاسی و تەڵەکەبازی بەکاردێنا، لە ساڵی ٦٠٧ك/١٢١١ز بە مەبەستی پەلاماردانی (پەکین) سەربازگەیەکی گەورەی لەسەر کەنارەکانی رووباری (کیرۆلین) لە مەنغۆلیای خۆرهەلات کۆکردەوە و ئینجا پێشڕەوی کرد بە نێو سەنگەرەکانی تورك و ئەنغۆتدا تێپەڕی بەبێ ئەوە هیچ گرفتێك و بەربەستێکی بێتە پێشەوە، سوپا گەیشتە باکووری (چین)، دەچووە نێو هەر ئاوەدانیەك دەیرووخاند، بەڵام بە هۆی نەبوونی شارەزایی لە بواری ئەندازەدا نەیتوانی شارە گەورەکان — کە بە قەڵا دەورەیان درابوو — داگیر بکات، جەنگیزخان و سوپاکەی ماوەی یەك ساڵ ٦٠٨ـ٦٠٩ك/ ١٢١١ــ١٢١١ز لە بەرامبەر قەڵاکانی دیواری چین مایەوە و جگە لە چەند مەڵبەندێکی کەم بایەخ هیچ شوێنێکی گرنگی بۆ داگیر نەکرا، هەڵبەتە گرد و تەپۆلکەکان و زنجیرەی چیا و چەقەنەکانی ناوچەکەو تێپەڕ بوونی دیوارەکەی (چین) بە نێویاندا لە کەنداوی (بتشیلی)یەوە تا رووباری (زەرد) و لەوێشەوە تا باکوور لە (پەکین و تاتونج) لە باکووری (شان سی) ببوو بە بەربەستێکی بەهێز لە رووی پێشڕەوی کردنی (جەنگیزخان) و سوپاکەیدا، بۆیە سەر سوپای مەغۆل بە چەند سەرکەوتنێکی کەمی یەکلا نەکەرەوە وازی هێنا، وەك ئەو سەرکەوتنەی لە ساڵی ٦٠٧ك/ شوبات و ئازاری ١٢١١ز لە جەنگی چیای (بی — هو)ی هەڵکەوتو لە نێوان (پەکین) و (کالجان) بە دەستی هێنا.

---

١ جنگیزخان قاهر العالم، ص: ٢٤٠، حروب المغول، ص: ٢٤٠.

کاتێك لە ڕەبیعی یەکەمی ٦٠٨ك/١٢١٢ز یەکێك لە فەرمانـدەکانی (خەتای)[1]ی سەر بە دەوڵـەتی (کین) شۆڕشـی کـرد و پـشتیوانی خـۆی بـۆ سـەرۆکی (مـەغۆل) ئاشـکرا کـرد، (جەنگیزخان) ئەم هەلە زێڕینەی قۆستەوە و پشتگیری ئـەم فەرمانـدە شۆڕشـگێڕەی کـرد و سەرکردە (جینی) – کە یەکێك بـوو لـە یاریدەدەرەکانی – بـەرەو هـەرێمی (لیاوـ یـانج)ی باشووری (مەنشوریا) بەڕێکرد، بەڵام هێزە مەغۆلیەکە لە بەرامبـەر دیوارەکـانی (لیاـ یـانج) شکستی خوارد، بۆیە (جینـی) بـە مەبەسـتی خـۆ ڕێکخـستنەوەی هێزەکـەی بـۆ ناوچـەکەی هاوسێ کشاندەوە، ئینجا کتوپڕ بەسـەر شـاری دادا و داگیری کـرد و ڕایگەیانـد کـە لەمـەولا (یی–لو–لیو) شای گەلی (خەتای)ی ژێر دەسەڵاتی (مەغۆل)ە.[2]

لـە سـاڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز) (جـەنگیزخان) بـە مەبەسـتی گرتنـی ڕێگـای سـتراتیژی نێـوان (کالجان–پەکین) بـۆ جـاری دووەم بـەرەو چـین بـەڕێ کەوتـەوە، پێشەکی دەسـتی بەسـەر (هەسوان–هوا)دا گرت، کە یەکەمین شـاری بـە قـەڵا دەورە دراوی سـەر ڕێگاکـە بـوو، ئینجـا شارەکانی (ئور–ئان) و (هوای–لای) داگیر کرد و بە ڕێـڕەوە تاریـك (تونێـل)ەکـەی (تـشو–یونج–کـوان–نـان–کـو)ی باشـووری خۆرئـاوای (هـوای–لای) تێپـەڕی، کـە چـەند قەڵایـەکی مەحکەم بەسەر ناوچەکەیاندا دەڕوانی و دیوارە گەورەکەی (چین)یش لەوێڕا بەرەو (پـەکین) لێژ دەبۆوە، ئینجا (جـەنگیزخان) خـۆی گەیانـدە ناوەنـدی دەشـتایی خۆرهـەڵاتی (چـین)ی گەورە کە لە (پـەکین)ەوە تـا (نـان–کـنج) درێـژ دەبـۆوە، بـەم شـێوە دەسـتی بەسـەر ئـەو ڕێگایانە داگرت کـە دەچـوونە نێـو خـاکی (چـین)ەوە، لـە ناوچـەی بـاکووری خۆرهەڵاتیـشدا دەستی بەسەر قەڵای (کویی–کو)دا گرت کە بەسەر ڕێڕەوی سەرەکی نێـوان (شـانغ–تـی) و (پەکین)ی باکووری خۆرئاوای وڵاتی دا دەڕوانی.

هەروەها دەستی بەسەر (تا–ئونغ)دا گرت کـە بـە حەشـارگەیەکی گـرنگ دادەنـرا لەسـەر هێڵی دیواری (چین) و بەسەر هەرێمی (شان–سی)یشیدا دەڕوانی.

لـە ڕەبیعـی دووەمـی/٦١٠ك/ئـاب، ئـەیلولی ١٢١٣ز (وی–شـاو)ی شـای (چـین) لـە لایـەن فەرماندەیەکی ئەو وڵاتەوە کوژرا و بارودۆخ بەرەو ئاڵۆزی و پشێوی چوو، (جەنگیزخان) ئەم هەلەی قۆستەوە و لە (٣) قۆڵـەوە هێرشـێکی بـەرفراوانی کـردە سـەر ناوەنـدی مەملەکـەتی (چین):

---

١ خەتای: هۆزێکی بە ڕەگەز مەغۆلیە، ماوەی ٢ سەدەی تەواو دەسەڵاتی بەسەر پەکیندا هەبووە، پاشان لـە لایـەن پاشاکانی پەکین پەکینیان لێ سەنراوەتەوە، لە پێنـاوی تۆڵـە سـەندنەوە لـە پاشـاکانی پـەکین هـەلی خزمایـەتیان قۆستەوە و خێرا لەگەڵ مەغۆلەکان تێکەڵ بوونەوە.

٢ حروب المغول، د. أحمد حطيط، ص: ٣٦.

–قۆڵی ناوەڕاست: (جەنگیزخان) بۆ خۆی سەرکردایەتی ئەم باڵەی کرد و (تۆلۆی) کوڕیشی لەگەڵ بوو، لە دەشتی گەورەی چینی خۆرهەڵات پاشەکشەی کرد و بەرەو ناوەندی چین پێشڕەوی کرد، پێشەکی خۆی لە هێرشی سەر (پەکین) بوارد و بەرەو باشوور بایدایەوە، دەستی بە تاڵان و بڕۆی یەك لەسەر یەکی شارەکان کرد، لە شاری (باو–تۆنج)ی باشوورەوە دەستی پێکرد تا (پەکین)ی باکوور، ئینجا لە (پەکین)ڕا ماوەی (٣٠٠) میل تا خوارووی وڵات ڕۆیشت و تا سەر شاری (هو–بای) هەڵکەوتوو لەسەر ڕووباری (زەرد) نەگیرسایەوە، لەبەر زۆری ئاوەکە و تیژڕەوی شەپۆلەکان نەیانتوانی لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، بۆیە (جەنگیزخان) بە خۆی و سوپاکەی ڕووی کردە ناوچەی باشووری خۆرهەڵاتو خۆی گەیاندە دەشتی بە پیتی (شانتونج) و، شاری (تسی–تان)ی داگیر کرد و ئینجا بەرەو بەرزاییەکانی (تای–شان) هەڵکشا و، بەرەو خۆرهەڵات ڕۆیشت و، دەستی بەسەر شاری (لان–شان)ی سەر سنووری (شانتونج)دا گرت، ئینجا قەڵا چینیەکانی یەك بە دوای یەك گرت،[1] جگە لە هەندێك قەڵای مەحکەم کە نەیتوانی خۆی باوێژێتە ناویان، ئینجا پاش تاڵانکردنی ناوچەکانی دەشتی چینی خۆرهەڵات بەرەو لای دیواری گەورەی چین گەڕایەوە.[2]

–قۆڵی ڕاست: (جوجی و جغتای و ئۆکتای) کوڕانی جەنگیزخان سەرکردایەتی ئەم باڵەیان کرد، لە ڕێگای (بوا–تینج) و (شانتو) بەرەو (هو–بای)ی کەرتی خۆرئاوا بەڕێکەوت، لە (هوای–کنج)ی هەرێمی (هانون)ی باکووری ڕووباری (زەرد) نزیك بۆوە، بەسەر دواهەمین گردۆلکەی (تای–هانج)دا تێپەڕی و پاشان بەرەو هەرێمی (شان–سی) سەرکەوت، ئینجا ڕووی کردە دەریاچەی ڕووباری (فن) کە هەرێمی ناوبراو بە درێژایی هاتنە خوارەوەی لە سەرچاوەکەیەوە، لە باکوورەوە بۆ باشوور دەکا بە دوو کەرتەوە، دەستی بەسەر شار و ئاوەدانیەکانی سەر کەنارەکانی ڕووبارەکە و دەوروبەریدا گرت، کە خۆیان لەم شارانەدا دەبینیەوە: (بای–بانج، فن–تشی، هسن–تشو)، هەروەها دەستی بەسەر (تای–یوان)ی پایتەختی هەرێمی (شان–سی)دا گرت و پاشان لە ڕێگای (تای–تشو) و (تاتونج)ڕا بەرەو لای دیواری گەورەی چین گەڕایەوە.

–قۆڵی چەپ: (قاسار)ی برای (جەنگیزخان) سەرکردایەتی ئەم باڵەی کرد، لە ئاقار شاری (پەکین)ڕا و لە باکووریڕا بە ڕێگای قەراغ دەریادا بەڕێکەوت، ناوچەی هەڵکەوتووی

---

١ المصدر نفسه، ص: ٣٦.

٢ المصدر نفسه، ص: ٢٦.

نێوان (شان–های کوان) و (جیهول–شانکتی) خستە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خۆیەوە، ئینجا بە مەبەستی داگیرکردنی (مەنشوریای سەرو) بەرەو هەرێمی ڕووباری (نوتی و سنجاری) تا دەگا بە ڕووباری (ئامور) بەڕێکەوت.

لە ساڵی ٦١١ک/١٢١٤ز جەنگیزخان دەستپێشخەری ئیمپراتۆری چینی بۆ خستنەڕووی ئاشتی بە هەل وەرگرت، بە پێی ئەم ئاشتیە: (جەنگیزخان) تەواوی ئەو شار و ناوچانەی داگیری کردوون چ لە نێو بازنەی دیواری (چین) دابن چ لە دەرەوەیدا دەیانخاتە نێو چوارچێوەی دەوڵەتەکەی خۆیەوە، (جەنگیزخان) ڕایگەیاند پێشنیارەکەی ئیمپراتۆری چینی قبوڵە، بەڵام هێشتا سەرۆکی (مەغۆل) لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ (مەنغۆلیا) لە ڕێڕەوی (تشو–یونج–کوان)دا لە سنووری دیواری چین تێنەپەڕی بوو، ئیمپراتۆر لە پێشنیارەکەی خۆی پاشگەز بۆوە و دەستی بە نۆژەنکردنەوە و قایم کردنەوەی قەڵا و حەشارگەکانی کردو پایتەختی دەسەڵاتی بۆ شاری (کای فۆنج)ی باشووری وڵات گواستەوە، تا لە گۆڕەپانی جەنگ نزیك بێتەوە و (پەکین)یشی خستە ئەستۆی کورەکەی خۆی، (جەنگیزخان) کە بەمەی زانی سوپاکەی بادایەوە و بە پەلە بەرەو (چین) گەڕایەوە، لە جەنگێکی دەستەویەخە و یەکلاکەرەوەدا لەگەڵ سوپای (چین) تێك هەڵشاخا و دەرەنجام لە ساڵی ٦١٢ک/١٢١٥ز (پەکین)ی پایتەخت کەوتە ژێر دەسەڵاتی (مەغۆل).[1]

## پێنجەم: ڕاگرەکانی پرۆسەی - داگیرکاری – مەغۆل لە سەردەمی ( جەنگیزخان )دا:

جەنگیزخان لە پێناو خزمەتکردنی ئامانجەکانی (مەغۆل) لە فراوانخوازی و دەسەڵات و دەست گرتن بەسەر تەختی سەرکردایەتی جیهاندا لە چواچێوەی نەخشەیەکی داڕێژراودا جموجۆڵی دەکرد، لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەمدا گرنگترین ڕاگرەکانی پرۆسەی ئەو داگیرکاریەم تێبینی کردوون، لە نێوانیاندا:

**١ـ کەسایەتی جەنگیزخان:** کەسایەتی جەنگیزخان لە سەرکردایەتی کردن ـ ی سوپا ـ دا پلەی یەکەمی بۆ دادەنرێت، هەمیشە شانسی سەرکەوتنی سەربازی هەبووە لە بەرامبەر هەر کەس و گەلێکدا ڕووبەڕووی خۆی و گەلەکەی بووبێتەوە، لە سەدەی (١٣)ی زایینیدا بە هەوڵ و تەقەلای خۆی خۆی کردە سەرکردەی نیوەی جیهانی ئەوکات، ترس و بیمێکی سامناکی خستە ناخی ژمارەیەك نەوەی مرۆڤایەتیەوە، ناوی (تیمۆجین) بوو کە بە واتای

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٨.

(پیاوی پۆڵا) دێت، مێژوو بە (جەنگیزخان)ی ناو بردووە، ئەم پیاوە مەغۆلیە هەڵکەتوو بوو لە:

- ڕێکخستن و دامەزراندنی سوپا.
- ستراتیژیەت.
- تاکتیك و تەڵەکەبای.
- نەخشە دانان.
- سەرناسی.
- هەڵبژاردنی یاریدەدەر.
- دۆزینەوەی خاڵە لاوازەکانی خەڵك و ڕام کردنیان لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی خۆیدا.

ئەم سیفەتانە بۆ هەموو کەسێکی سەربازی و مەدەنی وەکو یەك پێویستن، مرۆڤی ژیر دەیەوێت زانیاری بە دەست بخات لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێت، چونکە زانیاری هێز و پێزە، مەشخەڵە و تاریکایی نەفامی و سەرپێچی ڕادەماڵێت،[1] ڕێ نیشاندەری ناسینی ڕاستیەکان و نهێنیەکانی مێژوو و، سەقامگیری دەوڵەت و فراوانبوونی شارستانیەکانە.

جەنگیزخان: پیاوێکی کەڵەگەتی بالآبەرزی دامەزراو بوو لە پێکهاتەی جەستەیدا، سەرسۆماتە بوو و جگە لە کەمێك مووی ڕەنگ خۆڵەمێشی هیچ مووی بە سەرەوە نەبوو، چاوەکانی وەك چاوی پشیلە بوون، لە گفتوگۆدا جگە لە بەکارهێنانی چەند دەستەواژەیەکی چینی بە غەیری زمانی مەغۆلی نەدەدوا، نە لە ژیانی تایبەتی دا نە لە ژیانی گشتیدا، زۆر بە کەمی لە ژیانی تایبەتی خۆیدا لە ڕەفتارەکانیدا تێی دەپەڕاند، هەر بۆیەشە خودی خۆی تا کۆتایی هاتنی دەستەبەری پاراستنی چالآکیەکانی عەقڵ و جەستەی خۆی بوو.

لێکۆڵەرەوان دەڵێن: جەنگیزخان لە ژیانیدا بە پیاوێکی داوێنپیسی نەناسراوە و لە جلێتاوی زێدەڕۆیی جنسیدا ڕۆنەچووە، یاری بە لەزەت و پەسندکراو بە لای ئەوەوە یاری (بۆلۆ) و گەشتی (ڕاو) بووە، لە هەردووك بوارەکەشدا شارەزا بووە، دەربارەی خواردنەوەی مەی، لەگەڵ خزمەکانی خۆی دەیخواردەوە، بەڵام (جەنگیزخان) بە پێچەوانەی (ئۆغۆدای) کوڕی و جێنشینی! ڕێگەی نەداوە خواردنەوە بەسەریدا زاڵ بێت و مەست بێت، بۆیە - ڕای خۆی دەربارەی ئەم عادەتە دەربڕیووە و گوتویەتی: ئەگەر مرۆڤ نەیدەتوانی واز لە مەی

---

[1] جنكيزخان، العقيد محمد أسدالله صفا، ص:٢٣.

بێنێ با له مانگێکدا تەنها (٣) جار بیخواتەوه، ئەگەر زیاتری خواردەوه ئەوا تاوانی گەوره دەرهەق به نەفسی خۆی دەکات، ئەگەر له مانگدا تەنها دووجار بخواتەوه ئەوه باشتره، ئەگەر (١) جار بیخواتەوه ئەوه زۆر باشتره، خۆ ئەگەر هەر نەیخواتەوه ئەوا کارێکی وا گەورەی ئەنجام داوه که پێویسته ڕێزی بگیرێت و ستایشی بکرێت.[1]

١ـ ئازایەتی (جەنگیزخان): (جەنگیزخان) به ئازایەتیەکی له ڕاده بەدەر ناسرابوو، ئەو ڕێزی ئازایەتی دۆستان و دوژمنانی خۆی وەکو یەك دەگرت، له ڕێگای گەیشتنی به تەختی دەسەڵات له دژی خەڵکانێك ڕاوەستا که به ئازایەتی له عادەت به دەر ناسرابوون، لەو نموونانەی که به ئازایەتی خەڵك سەرسام بووه:

له ساڵی ١٢٢١ز و له لای ڕووباری (سند) دوای سەرکەوتنی بەسەر (جلال الدین)ی سوڵتانی دەوڵەتی (خوارەزم)، سەرسام بوونی خۆی له بەرامبەر ئازایەتی ئەو دوژمنه لاوەی دەربڕی، لەگەڵ ئەوەدا داخ و پەژارەی خۆی بۆ دەرباز بوونی (جلال الدین) دەربڕی کاتێك به سواری وڵاخەکەی به نێو ڕووباردا خۆی هەڵدا و ئەویش هێرشی کرده سەر و یەك به خۆ هاواری کرد: ژنان پێویسته ڕۆڵەی ئاوایان لێ بێت، وای دادەنا که (جلال الدین) له ئازایەتی و هەڵمەت بردندا برای داکی و بابیەتی.[2]

(بالاخراجا) سەرکردەیەکی دیلکراو بوو له لای (جەنگیزخان) ڕۆژێك له جەنگیزخان دەپرسێت: خەڵك پێیان وایه تۆ پاڵەوانێکی گەورەی به دەسەڵاتی، بەڵگه بۆ ئەمه چیه؟ جەنگیزخان وەڵامی دایەوه:

که منداڵ بووم ڕۆژێکیان به سواری ئەسپەکەم له دەشتێکی کاکی به کاکی دەڕۆیشتم (٦) کەس – که له لای ئەستێره ئاوێکەوه بۆ کوشتنم خۆیان لێ مەڵاس دابووم – بەرەو ڕووم هاتن، منیش به شیرەکەمەوه به نێو لێزمەی تیرەکانیانەوه هێرشم کردنه سەر و هەر هەموویانم کوشتن، به ڕێگای خۆمدا ڕۆیشتم بەبێ ئەوەی هیچم بەسەر بێ، کاتێك به هەمان ڕێدا گەڕامەوه تەماشام کرد ئەسپەکانیان لەوێ ماون، منیش گرتمن و بۆ خۆم بردنەوه.

جەنگیزخان ئەم بەسەرهاتەی خۆی له وەڵامی (بالاخراجا)دا دایەوه، وەك بەڵگەیەك لەسەر ئازایەتی و دەستەوکەریەکەی، گرنگتر لەمه به گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەی خۆی

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٦.
٢ المصدر نفسه، ص: ٢٧.

جەخت لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆی دەکاتەوە کە گوایە لە ئاسمانەوە پارێزگاری لێ دەکرێت و بە گوتەی خۆی: (ئاسمان بڕیاری داوە بە کوشتن نامری) ئەویش هەموو دوژمنەکانی کوشتن و دەستی بەسەر ئەسپەکانیاندا گرت.[1]

٢ـ دڵاوایی و بەخشندەیی: بە پیاوێکی سەخی و دڵاوا ناسرابوو، هەرکات سەرکردەی سوپاکانی چالاکیەکیان ئەنجام دابێت و ئازایەتیەکیان نواندبێت خێرا خەلاتی کردوون، (جوینی) دەربارەی ئەم سیفەتەی دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك جوتیارێکی چینی (٣) کاڵەکی - بە دیاری - بۆ دێنێ، لەو کاتەدا هیچ کام لە خەزێنەدارەکانی لە لا نابن، بە (خاتوون)ی هاوسەری دەڵێ: ئەو دوو گوارەی گوێت دانێ و پێشکەشیان بکە بەو جوتیارە، ئەم جووتە گوارە دوو مرواری بە نرخیان تێکرابوون، هاوسەرەکەی دڵی نەهات داینێ و وتی: تا بەیانی بیهێڵەوە - و پارەی بدەیە - چونکە ئەو نازانێ ئەم - گوارانە - چ شتێکی بە نرخن، جەنگیزخان وتی: جووتە گوارەکەی بدەیە، شەو دەهێنرێتەوە لای خۆت، ناکرێت ئەم پیاوە بە دڵەڕاوکێ - و دەستی خالی - لای ئێمە بڕوات، کێ دەڵێ بڕوات و دوای ئەمە هیچی دەست دەکەوێت! ، ئەم جووتە گوارەش هەر کەسێك بیانکڕێت دوایە بۆ لای تۆیان دێنێتەوە، (خاتوون) گوارەکانی دانان و دانیە دەستی جوتیارەکە، کە وەری گرتن هۆش و عەقڵی لە لا نەما، نەیدەزانی بایی چەندن، بردنیە بازاڕ و بازرگانێگ بە هەزار دینار لێی کڕی، بازرگانەکەش بۆ لای پاشای هێنا و ئەویش دانیەوە بە (خاتوون)ی هاوسەری.[2]

ڕۆژێك بە بازاڕدا گوزەری دەکرد، لای بەقاڵێك ترێیەکی بینی و بە ڕەنگەکەی سەرسام بوو، حەزی چووە سەر و بە دەرگەوانەکەی گوت: کە بە (بالس)ێك بۆی بکڕێت، دەرگاوانە کە بە چارەکە (بالس)ێك بۆی کڕی، کاتێك خستیە پێش دەستی، هێندەی تر سەری سوڕما و گوتی: ئەم هەموو ترێیە بایی (بالس)ێکە؟! دەرگاوان باقیەکەی نیشان دا و گوتی: ئەمەندەش لە پارەکە ماوەتەوە، (جەنگیزخان) توڕە بووو گوتی: کەی کڕیارێکی وەکو منی دەست دەکەوێت؟ (١) بالسی بە تەواوەتی بدەنێ.[3]

هەروەها پیاوێك هەنارێکی بە دیاری بۆ هێنا، ئەویش شکاندی و دەنکەکانی بە یەکسانی بەسەر ئامادەبوواندا دابەش کرد، ئینجا فەرمانی دا بە ژمارەی دەنکەکانی ئەم هەنارە (بالس) بدرێت بە خاوەنەکەی، (جوینی) لە کاتی گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەدا دەڵێ:

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٧.

٢ البداية والنهاية ١٧/١٦٧.

٣ المصدر نفسه ١٧/١٦٧.

فلذلك تزدحم الوفود ببابه       مثل إزدحام الحب والرمان

واتە: لەبەر ئەم – سەخاوەتەی بوو – میوان وەك كەڵەكەبوونی دانەی هەنار لەبەر دەرگاكەی كەڵەكە دەبوون.

٣ـ دەمار و غیرەت: لەم سیفەتەشدا زۆری تێپەڕاندبوو، هەرچ شتێكی بە موڵكی خۆی دانابایە خەتێكی سووری غیرەی بە دەرەوەدا دەكێشا، دوا بە دوای داگیركردنی (جۆرخند) لە ساڵی ١٢٢١ز (جۆشی و جوغتای و ئۆغدای) كوڕی تەواوی تاڵانەكانیان بەسەر خۆیاندا دابەش كرد و بەشی بابیان دانەنا، كاتێك بەرەو بارەگای (ئیمپراتۆر) گەڕانەوە تەماشایان كرد بابیان تورەیە و چاوی سوور بوون و كەف دەچێنێ، نەیانوێرا لێی نزیك ببنەوە ئەویش پێشوازی لێ نەكردن و ڕووی لێ وەرگێڕان، پاش ماوەیەكی زۆر هەر سێ ڕاوێژكار (موخالی و بۆرکۆجی و شیكی) پێیان باش بوو دەربارەی ئەم مەسەلە قسە لەگەڵ (جەنگیزخان) بكەن، چوونە لای و دەربارەی ئەم هەڵوێستەی گازندەیان كرد و گوتیان: كوڕەكانت ئێمەیان بەسەر (خوارەزم)دا سەرخست، هەرچی لە شاردایە موڵكی تۆیە، ئێمە لەم جەنگەدا بە یاریدەی ئاسمان و زەوی سەركەوتین، مەمانان سەركردەی سوپاكەتین، لە خۆشی – ئەم سەركەوتنە – گەش بووینەوە، بۆچی ئێستا تۆ وا تورەی؟ ئێستا كوڕەكانت دانیان بە هەڵەی خۆیان داهێناوە و ترسی زۆریان لێ نیشتووە، بۆ ئایندەش بە ئاگاهاتوونەوە و جارێكی تر ئەم ناماقووڵیە ناكەنەوە، دە ڕێگەیان پێ بدە بێنە بەر دەست، ـ بەم قسانە – تورەیی جەنگیزخان دامركایەوە و قایل بوو كوڕەكانی بێنە خزمەتی، بەڵام كاتێك بینینی وەك پێشدا ڕقی هەستایەوە، هەرسێ میرەكە لە شەرمان و لە ترسان ئارەقیان لە بەدەنیان دەتكا، لەو كاتەدا (٣) كەس لە پاسەوانانی تایبەت كەوتنە نێو بژیوانیەوە و گوتیان: كوڕەكانت وێنەی بێچوە دالاشن كە تازە فێری ڕاو دەبن، ئەمە یەكەمین جاریانە ئەگەر تۆ بە ئارامی ڕەفتاریان لەگەڵ بنوێنی ئەوا لە ئایندەدا سۆزیان بۆ لای تۆ دەجووڵێت، ئێستا لێرەولەوێ لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرئاوا دوژمنگەلێكی زۆرمان هەن، بۆ جەنگی ئەوانەمان بنێرە، وەكو سەگە دڕەكانی (تبتی) هێرشیان دەكەینە سەر، ئەگەر ئاسمان یاریدەمان بێ و سەركەوتین ئەوا هەرچی زێڕ و زیو و ئاوریشمە بۆ تۆی دەهێنینەوە، لە بەشی خۆرئاوا (خەلیفە)یەك لە (بەغدا) هەیە بماننێرە تا شەڕی لەگەڵدا بكەین، تورەیی جەنگیزخان بە تەواوەتی دامركایەوە و لە كوڕەكانی خۆش بوو.[١]

---

١ جنكيزخان، ص: ٢٨.

٤ـ دڵڕەقی و دڕندەیی: جەنگیزخان چەندین قەسابخانەی خوێناوی بۆ مرۆڤەکان دروست کردن و ژمارەیەکی زۆر کاری دڕندانەی دەرهەق بە مرۆڤایەتی ئەنجامدان، ئەم جۆرە کارەی ئەو لە کۆمەڵگای (مەغۆل)ی ئەو سەردەمەدا نامۆ نەبوو، کتێبی (بیلیك) واتە وتە جێماوەکانی جەنگیزخان: زیاتر ڕووناکی دەخاتە سەر ئەم ڕێڕەوەی جەنگیزخان، لەسەر زمانی ئەو دەڵێ: گەورەترین خۆشی مرۆڤ تێکشکانی دوژمنەکانیەتی، ئەو کاتەیە کە بۆ خۆی بە پالْ پێش خۆیان دەدات و دەریان دەکات و ماڵ و سامانیان لێ زەوت دەکات و سواری ئەسپەکانیان دەبێت و ژن و کچەکانیان لە ئامێز دەگرێت.

جەنگیزخان بەم هەست و نەستەی داب و نەریت و کلتوری ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی لەو سەردەمەدا و ژینگەکەی دەردەبڕێت و وێنای دەکات.[١]

دڵسۆزی بۆ هاوەڵانی: جەنگیزخان هاوڕێیەکی دڵسۆز و گیانی بە گیانی ئەو کەسانە بوو کە بە دڵسۆزی لە خزمەتیدا بوون، هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەرکردەکانی سوپاکەی باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم قسەمان، ئەو ئامۆژگاری بە نرخی پێشکەش دەکردن، وێنەی ئەمە: وەسێتی جەنگیزخانە بۆ (سۆبۆدای) کاتێك لە ساڵی ١٢١٦ز بۆ پەلاماردانی (مەرکیت)ی نارد، تێیدا هاتووە: پێویستە بۆ گەیشتن بە ئامانجت بە تەنگەبەری گەرووی چیا سەرکەشەکاندا تێپەڕی و لە ڕووبار و چۆمە گافرێنەکاندا بپەڕیەوە، هەرچەندە ڕێگەت دوور بێت، دەبێ بۆ مودارای سوپاکەت هەوڵدەی و پشوویان پێ بدەی و ئاگات لە خورد و خۆراك بێت و پاشەکەوت فەرامۆش نەکەیت و وڵاخ و ئەسپەکان ماندوو و مجرۆ نەکەی، با ڕێشمە و لغاو و پالْو و زینیان هێندە ڕێکوپێك بێت بن کلك و ئەستۆیان بریندار نەکات: نەبادا بگەنە دوژمن و دەرەقەتیان نەیەن، ئەگەر سەربازێك یان سەرکردەیەك سەرپێچی کرد و من دەمناسی بۆ لای منی بنێرە، دەنا بۆ خۆت سزای بدە.

(جۆشی) کوڕی جەنگیزخان کە مێرد منداڵ بوو بە سیفەتی سەرکردەی باڵا لە نێو سوپاکەدا بوو، ڕووی ئەم قسانەی لە ئەویش بووە بە تایبەتی کە لە بواری ڕاودا دەستی باڵای هەبوو، بەڵام هیچ گومانی تێدا نەبووە کە (سۆبۆدای) سەرکردەی کردەیی پەلامارەکە بووە، چونکە جەنەڕاڵێکی شارەزا و بە ئەزموون و سەرکردەیەکی گەورە بوو، جەنگیزخان سەرکردەکانی سوپای بۆ سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانجەکان هەڵدەنان و دوایەش ستایشی دەکردن و پێی هەڵدەگوتن، لە هاوینی ١٢٢٠ تا زستانی ١٢٢٢ (سۆبۆدای) لەگەڵ (جیبە)ی

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٨.

هاوڕێی سەرکردایەتی هێرشێکی گەورەی کرد بۆ سەر (خۆرئاوای ئێران و جۆرجیا و قەوقاز و ڕوسیای خواروو و بولغاریای گەورە) و سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنەری بە دەست هێنا، لە ساڵی ۱۲۲۳ز دا جەنگیزخان لە نێو ئاپۆڕای خەڵکیدا و بەم بۆنەیەوە ئاوا ستایشی سۆبۆدای کرد: (بە ڕاستی سۆبۆدای بەسەر قەلغانەکەیەوە خەوی لێدەکەوت و دەیکردە سەرینی خۆی، لە چەندین جەنگی خوێناویدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، چەندین جار ژیان و گیانی خۆی بۆ سەر بڵندیو سەرفرازی بنەماڵەکەمان خستە مەترسیەوە، ئێمە زۆر لە ئەو ڕازین).

هەروەها دوای تێپەڕینی ساڵانێکی زۆر بەسەر ئەم مێژووەدا ستایشی (مۆخالی)ی سەرکردەی دەکرد، مۆخال ئەو کەسە بوو کە سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنەر و دەستکەوتێکی مەزنی لە (چین) تۆمار کردبوو،[1] بە سینگێکی فراوانو هۆشێکی گەورەوە پێشوازی لەو شتانە دەکرد کە چاوەڕێی نەدەکرد ڕوویدەن، وەکو شکاندنی سەرکردەیەکی لە هێرشەکەیدا، بۆ نموونە: جارێك لە دۆڵی (بێروان)ی (ئەفغانستان) گۆڕەپانی جەنگی بەسەر کردەوە، تەماشای کرد (شیکی کۆتکۆ)ی زڕکوڕی سەرکردەی سوپاکە لەسەر دەستی (جلال الدین)ی (خوارەزمی)یەوە شکستی خواردووە، ئەو یەکسەر دەستی نەکرد بە بۆڵەبۆڵ و سەر شکاندنەوەی سەرسوپا، بەڵکو ڕەخنەی گرت لە هەڵبژاردنی مەیدانی جەنگ لە لایەن سەرکردەی سوپاکەوە، ئینجا ڕووی کردە دەوروبەری و گوتی: (شیکی کوتکۆ) هەمیشە باری بە سەرکەوتنەوە گرتووە، هەتا ئێستا تاڵاوی تێکشکانی قوت نەداوە، ئەمڕۆکە ئەو تاڵاوەی چەشتووە: کەواتە لەمەولا زۆر وریاتر و چالاك و چاپوکتر دەبێت، — نەك لە بەرامبەر دوژمنانی بەڵکو ئاگای لە سەرپێچی سەرکردەکانی ژێر دەستیشی دەبێت و لە سزادانیاندا بازنادات بەسەریاندا و جاروبارێش بە ئارامی و نەرم و نیانیانی سەرپێچیەکان چارەسەر دەکات.

ساڵی ۱۲۲۰ز (سۆبۆدای و جیبە و تۆکۆشار)ی (۳) سەرسوپای دەنێرێتە (ئەفغانستان) تا (سوڵتانی خوارەزم) لەو وڵاتە دەرکات، فەرمانی پێ کردن: بەس مولك و سامانی (سوڵتان) داگیر بکەن و دەست درێژی نەکەنە سەر خەڵکانی تر و ماڵەکانیان، (سۆبۆدای و جیبە) پابەندی فەرمانەکە بوون و لە قسەی دەرنەچوون، بەڵام (تۆکۆشار) ڕێگەی بە سەربازەکانیدا لە بەشێکی هەرێمەکەدا تاڵان و بڕۆبکەن، کاتێك (جەنگیزخان) ئەم هەواڵەی پێ گەیشت، سەرەتا بڕیاریدا (تۆکۆشار) بکوژێت، بەڵام دوای بیرکردنەوە لەم بڕیارە

[1] المصدر نفسه، ص: ۳۰.

پەژێوان بۆوە، وەك سزایەك گازاندەیەكی توند و تیژی ئاراستە كرد و سەركردەیەكی تری بۆ لا نارد تا لە سەركردایەتی كردنی سوپاكەدا شەریكی بێت.[1]

بەم شێوەیە: جەنگیزخان متمانەی تەواوی بە سەركردەكانی هەبوو و دانی بە سەروەریو سەركەوتنەكانی ئەواندا دەنا و، خۆی لە غیرە و حەسوودی دەپاراست و توانیبووی بەسەر تورەبوونی دەروونیدا زاڵ بێت، وەك مێژوو پێمان دەڵێ حەسوودی و ئێرەیی گەورەترین زیانی گورچوبڕی لە پەیوەندی نێوان (ئەسكەندەری مەكدۆنی) و سەرانی سوپاكەی و (ناپلیۆن پۆناپارت) و جەنەڕاڵەكانی داوە، جەنگیزخان بەم هەڵسوكەوتانەی توانی وەفادارییەكی بێ سنووری خەڵك بۆ خۆی و بنەماڵەكەی بەرهەم بێنێ، خەڵكی گەلی وادار كرد خۆشەویستی و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریەكی باشی بۆ بنوێنن و هەر هەموویان بە دڵ و دەروونێكی بێ غەل و غەش و عەزم و جەزمێكی نەپساوەوە فەرمان و ڕێنماییەكانی جێبەجێ بكەن، بۆیە زۆر بە كەمی دەبینین نەیانتوانی بێ بەسەر كۆسپەكاندا زاڵ نەبووبن و ناڕەحەتی و بەربەستەكانیان تێنەپەڕاندبن و نەشكاندبن.[2]

٥ـ سەرناسی (ناسینی پیاوان) و سەركردایەتی كردنی سەركردەكان: جەنگیزخان دەستێكی باڵای هەبوو لە سەرناسی و ناسینی پیاوان و توانایەكی گەورەشی هەبوو لە سەركردایەتی كردنی سەركردەكاندا، هەر لەبەر ئەمەشە گەلێك سەركردەی گەورە و مەزن لە نێو ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل)دا هەڵكەوتن و ئەمانە لە پەنا پیاوێكی وەكو (جەنگیزخان)دا بە نەخشە و پلانی خۆیان و لەسەر بەرپرسیارێتی خۆیان چەندین جەنگی گەورەیان بەرپاكردن، لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی (جەنگیزخان)دا پشكی گەورەیان هەبوو لە نەخشە داڕشتن و جێ بەجێكردنیدا، هەرچی چالاكی و جموجوڵی سەرەكی لە ژیانی ئەودا كرابێ بڕیاری تایبەتی جەنگیزخانی بۆ دەرچووە و پشكی شێر لە هەموو سەركەوتنەكانی مەغۆلی ڕەوەند بەر ئەو كەوتووە، تا كار بەوە گەیشت ناوی بە سەركردەیەكی سەركەوتوو دەنگی دایەوە.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی جەنگەكانی ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل)دا بخشێنین دەبینین: لە ساڵی ١٢٢١ز تا پایزی ساڵی ١٢٢٢ز كاتێك جەنەڕاڵە هەرە مەزنەكانی جەنگیزخان لە خۆی دوور بوون، (موخالی) لە چین بوو و (سۆبۆدای و جیبە) لە ڕووسیا و ئەورووپای خۆرهەلات بوون، لەم كاتەدا (جەنگیزخان) بەس بە داگیركردنی (خوارەزم و خۆراسان) ڕانەوەستا

١ المصدر نفسه، ص: ٣١.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣١.

بەڵکو پاش ئەم سەرکەوتنەی سەرکەوتووانە بە زنجیرە چیا ترسناکەکانی (ئەفغانستان)یشدا تێپەڕی و بۆ جارێکیش سوپاکەی ڕووبەڕووی هیچ جۆرە مەترسیەك نەبۆوە.

دوای مەرگیشی مەغۆلەکان بە سەرکردایەتی بە ناوبانگترین جەنەڕاڵی و کوڕەکانیو نەوەکانیشی هیچ دەستکەوت و سەرکەوتنێکی وێنەی دەستکەوت و سەرکەوتنەکانی جەنگیزخانیان بە دەست نەهێناوە.

(جەنگیزخان) توانی کۆمەڵە سەرکردەیەکی وا دروست بکات کە جێگەی تێڕامان بنو خەڵك پێیان سەرسام بێت، (یلوی تشی سی) یەکێك بوو لەو سەرکردە حەکیمانەی ئەو کە کاروباری چینی خستبووە ژێر دەست، سەرکردەکانی دەورەشی وەك کۆمەڵە ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی دەوڵەتەکەی بوون وەك: (بۆکۆرجی، موخالی، سۆبۆدای، جیبە، سامۆخا و کەسانی تریش)، ئەمەی گوتمان بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە: (جەنگیزخان) بەس خودی خۆی کەسایەتیەکی گەورەی تاقانە نەبووە، بەڵکو دووربینی ئەو و خەڵك ناسیەکەیو هەڵبژاردنی کەسانی کارزان و لێوەشاوە لە دەورەی خۆی زانایی و دانایی و هەڵکەوتوویی ئەو نیشان دەدەن.[1]

هەڵبژاردن و دیاریکردنی جێنشینی خۆی لە حاڵی حەیاتیدا بەڵگەیەکی تەواوە بۆ ئەو: کە سەرناس و دانا و بیرفراوان و زەین تیژ بووە، فریوی نەخوارد بە (تولوی) کە لە بواری سەربازیدا بە ناوبانگ بوو، فریوی نەخوارد بە (جغتای) کە پیاوێکی ئازا و تۆڵەسێن بوو، بەڵکو گرنگی بە (ئۆکتای) دا کە سەرکردەیەکی سەرنج ڕاکێش و خۆشەویست و لەبەر دڵ بوو و کەسێکی کراوە و دەم بە پێکەنین و سەخی و دڵاوا بوو، بە تێبینی کردن لەوە کە: (جەنگیزخان) سەرکردەیەکی ئیرادە بەهێزی وا بوو هیچ کام لە کوڕەکانی ئەم سیفەتەیان لێ بە میرات نەگرتبوو، کەواتە پێویست بوو هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لە دوای مردنی بەشداری لە بەڕێوەبردنی مەملەکەتدا بکەن، چونکە بە پیاوێکی ئیرادە بەهێز و بیر سەلامەتو ڕەوشت ڕازاوە و خەڵك پەسند نەبێت یەکێتی ئیمپراتۆریەت ناپارێزرێت.[2]

٧ـ پیاوی دەوڵەت و سیاسەت: جەنگیزخان بەس پاڵەوان و پیاوی گۆڕەپانی جەنگ نەبوو، بەڵکو لە پەنا ئەمەشدا پیاوی دەوڵەت و سیاسەتیش بوو، عەزم و ئیرادەی بەهێز و دەسەڵاتی چەند سیفەتێکی بەرچاوبوون لە کەسایەتی ئەودا و نەیاندەهێشت بچەمێتەوە و

١ المصدر نفسه، ص: ٣٢.
٢ المغول للعريني، ص: ١٥٥.

لە سنووری توانای خۆی دەربچێت، هەمیشە پێداگیری دەکرد نەخشە و پرۆسەکانی لە سنووری توانای خۆیدابن و لێیان تێپەڕ نەکات، بۆیە هەرگیز تووشی شکست خواردن و کارەسات نەبووە و ئیمپراتۆریەتێکی گەورە و فراوانو بەهێزترین سوپای سەردەمی خۆی بۆ کوڕەکانی بەجێ هێشت.

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان (جەنگیزخان) و هەندێك سەرکردەی مێژووی مرۆڤایەتی بکەین جیاوازیەکی گەورە لە نێوانیاندا بەدی دەکەین، بۆ وێنە: (ناپلیۆن بۆناپارت) بە ناوبانگترین سەرکردەی ئەورووپی بوو، ئەو لە بەرامبەر بەرەنگاری شارێکی بچووکی وەکو (عەکا) ی فەلەستیندا – تێکشکا و پاشەکشەی کرد، لە (میسر) سوپایەکی تەواوی خۆی واز لێ هێنا، لە ئیسپانیا کارێکی نەفامانەی ئەنجامدا، لە ڕووسیا سوپایەکی گەورەی لە نێو (بەفر)دا بەجێ هێشت، لە کۆتاییدا و لە (مەیدانی واترلو) شکستی هەرە گەورەی خوارد و لە لای سەرسەختترین دوژمنی خۆی و لە زیندانی دوورگەیەك دا و بە دیلکراوی مرد، بە بەر چاو و گوێی خۆیەوە ئیمپراتۆریەتەکەی ڕوخێنرا، دەستوورەکەی درێنرا و ڕۆڵەکانی لە میراتی ئەو بێ بەش کران.

ئەگەر ئاوڕێکیش لە (ئەسکەندەری گەورە) بدەینەوە، دەبینین ئەو پاڵەوانە لاوەی بە هەڵکەوتوویی و شایستەی خۆی لە سەردەمی خۆیدا جیهانی داگیر کرد، هەر یەکسەر لە دوای مردنی جەنەڕاڵەکانی لەسەر میراتی بەجێماوی دەکەونە شەڕ و ڕۆڵە شیرەخۆرەکەشی ناچاری هەڵاتن دەکەن تا لەگەڵ دایکی خۆی و نەنکی (دایکی بابی)دا بە کوشت بچێت.

بەڵام جەنگیزخان: وای لە خۆی کردبوو ببێتە تاکە سەرۆك و سەروەری زەمین لە کۆریاوە تا ئەرمینیا و لە (تبت)ی سەربانی جیهانەوە تا (فۆلغا)، کوڕەکەشی دوای مردنی بەبێ بێنە و بەرە و بگرە و بەردە جێگای گرتەوە و پاشانیش (قەبلایخان)ی نەوەی حکومڕانی نیوەی جیهانی ئەو کاتی کرد.[1]

**٢ـــ دەستووری دەوڵەت ( یاسا ):** هەرچەندە هۆزی (مەغۆل) پێش دەرکەوتنی (جەنگیزخان) ژیانێکی سەرەتایی و سادە و ساکاریان هەبوو، بەڵام ژیانی کۆمەڵایەتیان وای دەخواست کۆمەڵێك داب و نەریت و کلتووری خۆیان هەبێت، بەڵام چونکە خوێندەوار نەبوون نەیان نوسیبۆوە. کاتێك جەنگیزخان – وەك سەرۆك – دەرکەوت، چاوی بەم کلتوورەدا خشاندووە و هەندێکی لێ فرێدا و زۆربەشی پەسند کرد و هەندێك حوکم و بنەمای بۆ زیاد

---

١ جنكيزخان، ص: ٣٣، ٣٥.

کرد و مۆرێکی ڕەسمی دەوڵەتی پێوە نووساند، فەرمانی دا منداڵانی (مەغۆل) فێری ڕێنووسی (ئۆیغۆری) ببن و ئەم کلتور و حوکمانەش بە هەمان ڕێنووس بنووسرێنەوەو بخرێنە دوو توێی کتێبەوە و لە خەزێنەی میرانی مەغۆل پارێزگاری لێ بکرێت.[1]

هەر یەکێك لە برگە قانونەکانی ئەم کتێبەی ناونا (یاسا)، وشەکە مەغۆلیە و بە واتای (حوکم، بنەما، قانون) دێت و لە کتێبە عەرەبی و فارسیەکاندا بە شێوەی جۆراوجۆر دەنووسرێت وەکو: (یاسا، یاسە، یسامە، یاسامە، یسمە)، هەروەها ئەم ناوە بەسەر ئەو بڕیارانەشدا دەچەسپێت کە شا یان میر دەری دەکات، زۆربەی قانونو برگە دیارەکانی کتێبی یاسا پەیوەندیان بە سزادان و کوشتنی کەسی تاوانبارەوە هەیە، بۆیە مردن یان کوشتن بۆتە یەکێك لە واتاکانی وشەی (یاسا).[2]

بەڵام تێکڕای حوکمە نووسراوەکانی نێو ئەو کتێبە — کە جەنگیزخان بڕیاری لەسەر داون — پێیان دەگوترێت (کتێبی یاسای گەورە).[3]

بە بیروباوەڕی (جەنگیزخان): ڕێنماییەکانی (یاسا) بۆ هەموو کات و شوێنێك دەگونجێن، بۆیە بەبێ هەڵاواردن بەسەر هەموو لایەکیدا دەسەپاندن هەتا خۆیشی و ئەندامانی بنەماڵەکەشی لەگەڵ دابێت.[4]

ڕاهیبی مێژوونووس (لیلانۆ کاربینی) سەبارەت بەمە دەڵێت: ئەو حوکمانەی کتێبی (یاسا)ی بە زۆر خستنە بواری جێبەجێ کردنەوە، هەر ئەم شێوە جێبەجێ کردنەش بوو (مەغۆل)ی وادار کرد لە هەموو گەلانی جیهان زیاتر گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری سەرۆکەکانی بێت، بە ڕادەیەك ملکەچی (مەغۆل) بۆ سەرۆکەکانی لە سەرووی ملکەچی ڕاهیبەکان بوو بۆ میرانی کەنیسە، ــ جێبەجێ کردنی — یاسا یەکەمین هەنگاوی (جەنگیزخان) بوو بۆ نەهێشتنی کێشمەکێشم و تاقم تاقمێنە و هەموو ئەو هۆکارانەی زیان بە یەکێتی — گەلی مەغۆل — دەگەیەنن،[5] (خانی مەزنی مەغۆل) پێی وابوو یەککگرتن و یەکخستنی تیرە و تایەفەکانی مەغۆل — کە هەموویان بە خوێنی سەری یەکتر تینوون — لە ڕێگەی دانانی قانونی نەبێت ئەنجام نادرێت، دەبێت لە دەورەی ئەم (قانوونە) کۆببنەوە و گەردنکەچی

---

١ المغول في التاريخ، ص: ٣٢٨، تاريخ المغول عباس اقبال، ص: ١١٣.
٢ المصدر نفسه، ص: ٣٢٨، الدولة العربية الاسلامية، ص: ٤٧٣.
٣ المصدر نفسه، ص: ٣٩.
٤ جنكيزخان، ص: ١٠٤.
٥ المصدر نفسه، ص: ١٠٤.

بڕیارەکانی بن، دەبێت مادەکانی ئەم قانونە سزای هێندە توند و تیژ لە خۆ بگرێت کە بە هیچ شێوەیەك بەزەیی و سۆزی بۆ تاوانباران تێدا نەبێت، چونکە ئەگەر ئەم خەڵکە وازیان لێ بێنرێت ئەوا کێشە کۆنینەکانیان دەژێننەوە و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ سەر هەمان ئاژاوە و پشێوی کە کۆن تێیدا بوون لە یەکتر کوشتن و یەکتر هاڕین لە پێناوی پوش و پاوان و تاڵان و برۆدا. بەڵام (یاسا) لە لایەکەوە دوژمنایەتی و کێشەکانی نێو (مەغۆلەکان)ی کۆتایی پێ هێنا و لە لایەکی تریشەوە ئەم خەڵکەی کە تا دوێنێ وەك چەند ڕانە گورگێکی هار و چەنگ بە خوێن بوون و هیچ زەبت و ڕەبتێکیان بە یەکترەوە نەبوو، ئەوا ئیمڕۆ لەو حاڵەوە سوپایەکی ڕێکوپێکی سازوبازی لێ دروست کردوون و فێری کردوون چۆن نەخشەکانی خۆیان بەوپەڕی وردەکاری و دامەزراوییەوە ڕەسم کێش بکەن، گەردەلول ئاسا چۆن ڕەوە کوللە بەسەر کشتوکاڵ دادەدات و هەموو بەرهەمەکەی دەخوات بەسەر نەتەوە پێشکەوتووەکاندا بدەن و هەڵیان لوشن.[1]

(مەغۆلەکان) لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا دەبوو بۆ دەقەکانی یاسا گەڕابانایەوە و بە پێی ڕێنماکانی کاریان کردبایە:

- کاتێك خانی نوێ لەسەر تەختی دەسەڵات دادەنیشت.
- کاتێك کۆنگرەیەکی گشتی بە ئامادەبوونی میر و سەرکردەکان دەبەسترا بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر سیاسەتی گشتی دەوڵەت.
- لە حاڵەتی پرچەککردن و سازکردنی سوپا بۆ جەنگ.[2]

(جەنگیزخان) — بەم شێوەیە — لە پێناوی بەستنەوەی هەرێمەکان بە یەکترەوە لە ژێر حکومەتێکی یەککرتوودا کۆمەڵە قانوونێکی بە ناوی (یاسا)وە دەرکردن کە لە قانونەکانی عورف و عادەت و داب و نەریتی (ئوستوبس) وەرگیرابوون.

(یاسا) بە درێژایی حکومڕانی جەنگیزخان بەش بەش دەردەچوو، ماف و ئیمتیازاتی سەرۆك هۆزەکان و مەرجەکانی خزمەتی سەربازی و تەواوی خزمەتەکانی تر و بنەماکانی سیستەمی باج و سەرانە و سزادان و بازرگانی و مەدەنی و بڕیارەکانی پەیوەند بە (خان)ی تێدا دیاری کرابوون، بە دەربڕینێکی تر دەکرێت بڵێین: ئەم قانونە پەیوەندی نێوان حاکم و

---

١ المغول، د. فؤاد عبدالمعطي، ص:٣٣٩.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣٣٨.

مەحکوم و پەیوەندی نێوان خەڵك بە یەکترەوە و تاك و کۆمەڵ لەگەڵ یەکتری ڕێکخستبوو، حوکمەکانی یاسا لەم (٣) کاروبارەدا کورت هەڵدێن:

*ـ گەردنکەچی بۆ جەنگیزخان.

*ـ یەککگرتن لە یەك هۆزدا، واتە ڕێکخستن و یەکخستنی (٥٠) تیرە و تایەفەی (مەغۆل) لە یەك پرۆسەدا.

*ـ سزای توند و تیژ بۆ هەموو تاوانبارێك.[١]

أـ چەند دەقێکی مێژوویی دەربارەی (یاسا):

(مەقریزی) دەربارەی (یاسا) بەم شێوەیە بۆمان دەدوێ:

کاتێك (جەنگیزخان) لە وڵاتی خۆرهەڵاتدا بەسەر (ئۆنك خان)دا سەرکەوت بوو بە گەورە حکومڕانی و (تەتار) و دەوڵەتی دامەزراند: ژمارەیەك بڕیار و سزای دەرکردن و لە نێو دوو توێی کتێبێکدا نووسینیەوە و چەسپاندنی و ناوی لێنا (یاسا)، هەندێك خەڵك بە (یسق) ناوی دێنن، بەڵام لە ئەسڵدا (یاسە)ی پێ دەگوترێت، کاتێك (یاسا)ی بە تەواوەتی دانا بە شێوەی هەڵکەندن لەسەر ڕووپەڕی چەند تەختە پۆلایەك نووسیەوە و بە ڕەسمی کردیە دەستووری نەتەوەکەی، پاش مردنی (جەنگیزخان)یش تا خودا بە تەواوەتی دوا بڕاوی کردن بەم — دەستکردە — وە پابەند بوون.

ڕاستیەکەی (جەنگیزخان) هیچ کامێك لە ئاینەکانی خەڵکی زەوی پەیڕەو نەدەکرد، ئەگەر دەنگوباسەکانی ئەوت پێ گەیشتبن و خوێندبتنەوە چاك دەزانی کە: (یاسا) بە لای جەنگیزخانەوە حوکمی یەکلاکەرەوە بووە و لە دوای خۆشیەوە هەروا بووە و کەسیان لێی لانەداوە،[٢] هەروەها دەڵێ (أبو هاشم أحمد بن البرهان) ڕەحمەتی خوای لێ بێت: کە خوداپەرستێکی پاك و بانگخوازێکی چاك بوو هەواڵی دامێ: کە یەکێك لە نوسخەکانی (یاسە)ی لە (خەزانە)ی خوێندنگای (مستنصرية)ی (بەغدا)ی چاوپێکەوتووە، هەندێك لە بڕیارەکانی (جەنگیزخان) کە لە (یاسە)دا کردبوونیە قانون ئەمانە بوون:

—هەر کەس زینا بکات دەکوژرێت، جیاوازی لە هاوسەردار و بێ هاوسەردا نیە.

—هەر کەسێك هەتیوبازی بکات، درۆ بکات، سیحربازی بکات، جاسوسی بکات بەسەر یەکێکەوە، یان لەسەر یەکێك لە دوو شەڕکەر بکاتەوە دەکوژرێت.

---

١ المصدر نفسه، ص: ٣٣٩.

٢ الخطط للمقريزي، مجلد٣، جزء١، ص١٤٦ـ١٤٧.

–هەر کەسێك لە نێو ئاودا میز بکات، یان میز بە خۆڵەمێشدا بکات دەکوژرێت.
–هەر کەسێك (٣) جار لەسەر یەك کاڵایەکی پێ بدرێت و زەرەری لێ بکات دەکوژرێت.
–هەر کەسێك بەبێ پرس خواردن بدا بە دیلێك یان پۆشاکی بداتێ دەکوژرێت.
–هەر کەسێك کۆیلەیەکی هەڵاتوو یان دیلێکی ڕاکردوو ببینێ و بۆ خاوەنەکەی نەگێڕێتەوە دەکوژرێت.
–ئاژەڵ: چوارپەلی دەبەسترێت و سکی ئاوەڵا دەکرێت و دڵ و جگەری دەردەهێنرێت، ئینجا گۆشتەکەی دەخورێت، هەر کەسێك ئاژەڵەکەی خۆی وەکو موسڵمانان سەر ببڕێت دەکوژرێت.
–ئەگەر جەنگاوەرێك لە مەیدانی جەنگدا و لە کاتی هەڵمەت بردندا یان ڕاکردندا بارەکەی یان کەوانەکەی یان هەر شتێکی تری لێ بکەوێت و کەسێکیش لە دواوەی بێت و کەلوپەلەکەی بۆ هەڵنەگرێتەوە و نەیداتەوە خاوەنەکەی دەبێت بکوژرێت.
–بە مەرج گیراوە: نابێت هیچ ئەرکێك لەسەر ڕۆڵەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب – سادات – دابنرێت و باج و خەراجیان لێ بسەنرێت، هەروەها: (هەژاران و قورئانخوێنان و زانایان و پزیشکان و عابیدان و زاهیدان و بانگدەران و مردووشۆران و خاوەنانی پیشەی زانست)یش باج و سەرانەیان لەسەر نیە.
–بە مەرج گیراوە: هەموو میللەتێك بە گەورە دابنرێت و نابێ دەمارگیری لە نێوانیاندا هەبێت، ئەم کارە مرۆڤ لە خودا نزیك دەکاتەوە.
–هەر کەسێك خواردنێك دەدات بە کەسێکی تر دەبێت پێشدا خۆی لێی بخوات، ئەگەرچی ئەو کەسە ئەمیریش بێت، هەر کەسێك خواردنێك بە بەرچاوی کەسێکی ترەوە بخوات دەبێت لەگەڵی بەش بکات، نابێت دوو هاوڕێ یەکیان تێر بێت و ئەوی تریان برسی بێت و یەکیان ئاو و سفرەی هەبێت و هاوڕێکەی نەکاتە برابەش، هەر کەسێك بە پەنا کۆمەڵێکدا ڕەت بێت و ببینێ خواردن دەخۆن بۆی هەیە بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت دانیشێت و تێر بخوات و کەسیش بۆی نیە ڕێگەی پێ بگرێت.
–نابێت کەس – لەوان – دەست بخاتە نێو ئاوەوە، بەڵکو دەبێت شتێك بۆ هەڵێنجانی ئاو بەکاربێنێت، شۆرینی جل و بەرگ قەدەغەیە و تا دەڕزێت دەبێ لەبەریاندا بێت.
–قەدەغەیە بە هەر شتێك بڵێن (پیسە)، چونکە هەموو شتێك خاوێنە، پیس و پاکیان لێك هەڵنەواردووە.

–نابێ دەمارگیری بۆ هیچ کامێك لە مەزەبەکان بنوێنرێت، گەورەکردنی وشە و دانانی ناسناو قەدەغەیە، سوڵتان و خەڵکانی تریش تەنها بە ناوەکانی خۆیانەوە بانگ دەکرێن.

–جەنگیزخان – لەسەر جێنشینەکەی دوای خۆی واجب دەکات: هەر کاتێك ویستی بەرەو جەنگ بڕوات دەبێت سەربازەکان و چەك و چۆڵ و کەلوپەلەکانیان بخرێنە ڕوو و تەماشا بکرێن، دەبێت بچووکترین شت وەکو (دەرزی و داو)یش تەماشا بکرێت، هەر کەسێك کەمتەرخەمی بکات لە نیشاندانی پێداویستیەکانی سەفەری ئەوا لە لایەن جێنشینی جەنگیزخانەوە سزا دەدرێت.

–لەسەر هاوسەرانی سەربازەکانی بەڕێکراو بۆ جەنگ واجبە کاری پیاوەکانیان لە پەیداکردنی بژێوی ژیانیان بێکاریەکانی دەوڵەت ڕاپەڕێنن.

–هەر کاتێك سەربازەکانی سوپا لە جەنگ گەڕانەوە دەبێ زەحمەت بکێشن و هەندێك هاوکاری بۆ سوڵتان بێنن و لە دەورەی کۆ ببنەوە.

–دەبێ هەموو سەرە ساڵێك کچە شوونەکردووەکانیان لە بەرامبەر سوڵتان ڕانوێنن، تا بە ئارەزووی خۆی بۆ خۆی و کوڕەکانی لێیان هەڵبژێرێت.

–سەردەستە و سەرکردەی بۆ سەربازەکانی دادەنان: سەرکردەی هەزار کەس و دووسەد کەس و چەند دە کەسی دانابوون.

–ئەگەر گەورەترین سەرکردە تاوانی ئەنجام دا، ئەوا سوڵتان: خوێڕی ترین کەسی لای خۆی بە مەبەستی سزادانی بۆ لا دەنێرێت، دەبێت لەبەر دەستی ئەو کەسەدا بە داماوی و گەردنکەچی لەسەر زەوی بکەوێت و سوڵتان چی بۆ دانابێت دەبێ جێبەجێی بکات ئەگەر خۆ کوشتنیش بێت.

–نابێت میرەکان جگە لە سوڵتان هاموشۆی کەسێکی تر بکەن، هەر کەس لەوان وا بکات دەکوژرێت، هەر کەسێکیش بەبێ مۆڵەتی سوڵتان لەو جێگایەی بۆی دانراوە بۆ شوێنێکی بچێت دەکوژرێت.

–دانانی پۆستەچی لە نێو مەملەکەتدا تا سوڵتان هەواڵی مەملەکەتەکەی بزانێت.

–جەنگیزخان حوکمی (یاسا)ی بۆ (جەغتای) کوڕی بەجێهێشت، کە ئەویش مرد ڕۆڵەکانی و شوێنکەوتووانی پابەندی ئەم حوکمە بوون، وەکو چۆن موسڵمانانی هەوڵ

پابەندی (قورئان) بوون، ئەوانیش ئەم حوکمەیان کردبووە (دین) و نەزانراوە کەسێك لەوان سەرپێچی کردبێت.[1]

ب ـ نووسراوی مێژوونووسی فارسی (جوینی) سەربارەت بە (یاسا):

مێژوونووسی فارسی عطا الملك الجوینی ٦٨١ك زیاتر لە سەدە و نیوێك پێش مەقریزی ٨٤٥ك بە دوور و درێژی لەسەر (یاسە)ی نووسیوە کە مەقریزی هێندەی نەنووسیووە، بەڵام: لە راستیدا نووسینەکەی (مەقریزی) بریتیە لە پوختەی نووسینەکەی (جوینی)، بەڵام (جوینی) زیاتری قسە لەسەر بایەخدان بە پێشبڕکەی ڕاوو نێچیرەوانی کردووە کە کاریگەریەکی مەزن و بەرچاوی هەبووە لەسەر ژیانی سەربازی هۆزی مەغۆل،[2] ئەوان زۆر گرنگیان بە نێچیرەوانی و ڕاووشکار دەدا و، دوای کۆتایی هاتنی هەر جەنگێك دەستیان بەم کارە دەکردەوە، لە دڵ و دەروونی ئەواندا نێچیرەوانی یاری و گەمەیەکی خۆشەویست بوو، لەگەڵ ئەمەشدا کردبوویانە ئامرازێکی ئامادەسازی خۆیان بۆ هەر کاتێك پێویست بوایە و بەرەو هەڵگرتنی چەك و گۆڕەپانی جەنگ بانگ کرابانایە، ئەوان لە کاتی شکاردا خۆیان بۆ کاتی جەنگ ڕادەهێنا و، دەستە دەستە خۆیان ڕیزدەکرد چۆن لە گۆڕەپانی جەنگدا ڕیز دەبن و تەواوی چەك و چۆڵی پێویستیشیان لەم مەشقەدا بەکاردەهێنا، لەگەڵ ئەمەشدا پێویست بوو لەسەریان هەواڵی دوژمنیان بزانن و جاسوسیان لەسەر بکەن.

(بارتولد) دەڵێ: هێرشی بە کۆمەڵی سەر نێچیر لە گۆڕەپانێکی بەرفراواندا کە تەواوی فەرمانەکانی تایبەت بە سیستەمی جەنگی بەوپەڕی وردەکاریەوە تێدا ڕەچاو دەکرێت لە کاتی جەنگدا، یەکێکە لە هۆکارە هەرە بە نرخەکانی کارکردن لەسەر پاراستنی حکومەت و مەشق پێکردنی سەربازان و تاقی کردنەوەیان.[3]

میرە گەورەکان – کە خاو و خێزانەکانیان هامڕابوون و خواردن و خواردنەوەی زۆرو هەمەڕەنگیان لە خزمەتدا بوو – ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ڕاو و شکارەکانیان دەکرد، کێبەڕکێی ڕاو لە مانگێکەوە تا سێ مانگ درێژەی دەکێشا، دەبوایە سەربازانی بەشداربوو بەوپەڕی وریایی و لەسەر هەست بەسەر نێچیرەکەدادەن و، چۆن چاوەچاوی دوژمن دەکەن بڕواننە گیاندارە کێویەکان، گریمان ئەگەر سەربازێك ئامانجی نەپێکابایە و نێچیرەکەی

---

١ المغول، د. الصیاد، ص: ٣٢٤.

٢ تاریخ جهانکشای للجوینی ١/١٩ـ٢١، المغول، د. الصیاد، ص: ٣٤٢.

٣ دائرة المعارف الاسلامیة، الترجمة العربیة ج٧، العدد الرابع ص١٣٧، مادة جهانکیزخان، المغول، د. الصیاد، ص: ٣٤٣.

نەکوشتبایە ئەوا ڕووبەڕووی سزای گۆچانکاری دەبۆوە و، زۆرجار لێدانەکە سەری دەکێشا بۆ کوشتن، ئەوان بە هیچ شێوەیەك دوو دڵ نەبوون لە سەپاندنی سزا بەسەر هەر کەسێکدا کە کەمتەرخەمی دەکات، ئەگەرچی کەمتەرخەمیەکە یان تاوانەکە سادە و ساکاریش بوایە.

پاش تەواوبوونی ڕاو و شکارەکە نوێنەرەکان دەهاتنە لای (خان) و سەرو ڕاپۆرتێکی دوورو درێژیان سەبارەت بە ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی ڕاوەکەیان دەخستە پێ دەستی، کە تا ڕادەیەکی باش ئەم ڕاوە بە موناوەرەی سەربازی ئەم سەردەمە دەچوو، هەموو ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە بوو سەربازەکان لایەنی جەنگیان لە بیر نەچێتەوە و لە ڕاویشدا فەرامۆشی نەکەن، لە لایەکی تریشەوە بەم کارەیان گیانلەبەرێکی زۆریان دەکوشتن و گۆشتێکی زۆریان بۆ هێزی سەربازی سوپاکانی مەغول پەیدا دەکرد، کاتێك گیانلەبەرێکی زۆریان دەکوشتو سکی خۆیان لێ تێر دەکرد و ئەوەی تریشیان هەڵدەگرت و تارمایی برسێتی ڕۆژانی داهاتووی چاوەڕوانکراویان پێ دەڕەواندەوە،[١] مەغۆلەکان نێچیرەوانیان بە بەشێکی سەرەکی ژیانی خۆیان دادەنا و پێیان وابوو نابێت ئەم پیشە لە ئەوان جودا ببێتەوە، هەر لە تەمەنی منداڵیرا خۆیان لەسەر ڕادەهێنا و خوویان پێوە دەگرت، دەگێڕنەوە ڕۆژێك (جەنگیزخان) ــ لە تەمەنی مێردمنداڵیدا ــ کە دەیەویست بەرازێکی وشکانی ڕاو بکات، لەسەر ئەسپەکەی بەردەبێتەوە و دەکەوێتە سەر زەوی، لە شانسی خۆی بەرازەکە هێرشی بۆ ناهێنێت، کاهینێك – کە لەوێ دەبێت – پێی دەڵێ: ئەم بەرەوە بوونەت هۆشدارکردنەوەی تۆی تێدایە، بە ڕاستی تۆ کارێکی شەرەنگێزیت کرد کە ویستت گیانلەبەرێکی – بەستەزمان – بکوژیت، ئەگەر ڕەحمەتی ئاسمان نەبووایە بەرازەکە بەر شفرەی دەدای و هەڵی دەدای و دەیکوشتی، جەنگیزخان ڕەدی دایەوە و گوتی: خودی خۆم هەستم بەمە کرد، دەشزانم ئامۆژگاریەکەت بۆ من خێری لە خۆ گرتووە، بەڵام ئێمەی مەغۆل هەر لە منداڵیرا خوومان بە ڕاو و شکارەوە گرتووە، ئێمە ناتوانین هەروا بە ئاسانی داب و نەریتەکانمان بگۆڕین.[٢] مەغۆلەکان چەند دەستوور و ڕێسایەکیان لە کاتی ڕاو و شکاردا پەیڕەو دەکردو، بەوپەڕی وردەکاریەوە جێبەجێیان دەکردن.[٣]

ج ــ لە ڕەوشتەکانی مەغۆل: (جەنگیزخان) لە (یاسا)دا نووسیویەتی: کە ئەو بە تایبەتی ڕقی لە دزی و داوێن پیسی دەبێتەوە و هەر کەسێك یەکێك لەم دوو تاوانە ئەنجام بدات

١ المصدر نفسه، ص: ٣٤٣.
٢ المصدر نفسه، ص: ٣٤٤.
٣ المصدر نفسه، ص: ٣٤٤.

دەبێت بکوژرێت، هەروەها بە ڕاشکاوی گوتوویەتی کە ئەو لەم حاڵەتانەدا زۆر تووڕە دەبێ: کاتێك بزانێ ڕۆڵەیەك گوێڕایەڵی باوك و دایکی ناکات، برایەکی بچووك پێچەوانەی فەرمانی براگەورەکەی دەجوڵێتەوە، مێردێك دڵی لە ژنەکەی پیس دەکات، یان ژنێك لە قسەی مێردەکەی دەردەچێت، دەوڵەمەندێك یارمەتی هەژارێك نادات، یان ژێردەستەکان ڕێز لە گەورەکانیان ناگرن، هەروەها نەهی لە شوێنکەوتووانی کردووە خۆیان لە مەی خواردنەوە شەلاڵ بکەن و گوتوویەتی: پیاوی مەست و سەرخۆش وەکو کەسێکە بە تەپڵی سەری کێشرابێت و ژیری و شایستەیی لە دەست دابێ، کەواتە لە مانگێکدا زیاتر لە (٣) جار مەی مەخۆنەوە، چاکتر وایە هەر نەیخۆنەوە، بەڵام کێ دەتوانێ بە یەکجاری وازی لێ بێنێ؟[١]

د- هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلامی لە بەرامبەر (یاسا)دا:

کاتێك لە دەقەکانی یاسا خور دەبینەوە دەبینین هەندێکیان لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز تێك دەکەنەوە، بەڵام زۆربەی دەقەکان پێچەوانەنی، شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنەماکانی: ڕێزدانان بۆ مافەکانی تاك و ڕێگرتن لە خۆسەپاندن و سەرکەشی و بانگەشە بۆ کرد و کۆشش ڕاوەستاوە، تا خەڵك سوود لە ئەزموونی خۆیان وەربگرن و بەرهەمی کاری خۆیان هەڵبگرنەوە، بەڵام (یاسا) لەسەر بنەماکانی: زوڵم و زۆر و هەڵوەشاندنەوەی کەسایەتی تاك و قۆرغ کردنی ئازادیەکانی و کۆت و بەند کردنی بە کۆت و زنجیری کۆیلەیی ڕاوەستاوە.

لە کاتێکدا مەغۆلەکان بە دەقی (یاسا) (درۆ) بە تاوان دادەنێن، بەڵام ئەوان بۆ خۆیان حەلاڵ کردووە، بە تایبەتی لە کاتەکانی جەنگدا بە فێڵ و دوو ڕوویی و تەڵەکەبازی هەوڵیان داوە پەرتەوازەیی بخەنە نێون دوژمنەکانی بەرامبەریانەوە، هەر بەمە ڕانەوەستان بەڵکو کاتێك بە هەلیان زانیوە پەیماننامەکانیان هەڵوەشاندونەوەو سواری ئەسپی سەرکەش و غەدر و تۆڵە بوون و دەستیان لە دوژمن وەشاندووە، بۆ وێنە نەتەوەی تورك — ئەوەندەی لە (مەغۆل) نزیکن لە هیچ نەتەوەیەکی تر نزیك نین، بەڵکو (تورك) ژمارەیەك کەتیبەی سەربازیان لە ڕیزی سوپای مەغۆلدا هەبوو، داب و نەریت و کلتوری ڕەوەندیانە لە ئاسیای نێوەڕاستدا زیاتر تورك لە مەغۆل نزیك دەکاتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا مەغۆلەکان هەوڵیان نەدا تورکەکان لەگەڵ خۆیان پێك بکەن و بەشداریان پێ بکەن لە پرۆسەی داگیرکردنیاندا، ئەو گفت و گۆیانەش جاروبارە لەگەڵ تورکەکان ئەنجامیان دەدا تەنها

---

١ المصدر نفسه، ص: ٣٤٤.

بەشێك بوو لە گەمە و فێڵی جەنگی ـ کە خوویان ــ پێوە گرتبوو ــ، بە درۆ دووپاتەکانی خۆیان لەسەر (پەیوەندی ڕاستگۆیانە)یان دەیانەویست زیاتر بیانخافڵێنن و پەرتەوازەیی زیاتر بخەنە نێوان دوژمنەکانیان و پاشانیش یەکە یەکە بەسەریاندادەن و قەڵاچۆیان بکەن.

چاك دەزانین کە جەنگیزخان نیازپاکی و ڕاستۆکیی خۆی لە بەرامبەر دایکی (سوڵتان محمدی خوارەزم شا) دەبڕی و بە هۆی ئەو توند و تیژییەی لە نێوان ئەو و کوڕەکەیدا بوو لە لای خۆی گلی دایەوە، چونکە دەیزانی ئەم ژنە ژمارەیەك کەتیبەی لە ژێر دەستدایە و بەریدا دەست دەخاتە نێو شەڕەکەوە، لە ئەنجامدا کردیە دیل و دووری خستەوە، پاشان لە خاکی غەریبی بە داماوی سەری نایەوە و مرد.[١]

(هۆلاکۆ)ی نەوەی (جەنگیزخان)یش لە خۆرئاوای ئاسیادا هەمان ڕۆڵی باپیری دووبارە کردەوە، لە کاتێکدا کە گفتوگۆی ئاشتی – لەگەڵ (ئیسماعیلیە) و (خەلیفەی عەبباسی) ئەنجام دەدا هێندەی پێنەچوو هێرشی کردنە سەر و هەموویانی ڕیشەکێش کردن و لە نێو بردن.

هـ ــ لەنێوچوونی تاك لە پێناوی کۆمەڵدا:

کاتێك (مەغۆلەکان) بانگەشەی هاریکاری دەکەن، مەبەستیان ئەوەیە کە تاك ببێتە قوربانی کۆمەڵگا و تێکڕای مافەکانی کەسی خۆی و ئازادیەکانی لێ زەوت بکرێن، دەقەکانی (یاسا) ڕادەگەیەنن: کە هیچ کەس ناتوانێ ببێتە خاوەنی شتێك کە کەسێکی تر چاوی پێ بکەوێت، بەڵکو پێویستە لەسەری بیکاتە برابەش و، ئەگەر خواردن بێت دەبێت لەگەڵی بخوات و دروست نییە کەسێك خۆی تێر بکات و هاوەڵەکەشی هیچ نەخوات، بەڵکو دەبێت خواردنەکە بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەش بکرێت. کەسێك بە پەنا کەسایێکدا ڕەت بێت و ببینێ خەریکی خواردن و خواردنەوە ن، بۆی هەیە بەبێ مۆڵەت لێوەرگرتن دانیشێت و دەست بکا بە خواردن و خواردنەوە و، کەسیش بۆی نیە ڕێگەی لێ بگرێت، وێنەی ئەم دەقە نابەجێیانە ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە کۆمەڵگای مەغۆل کۆمەڵگایەکی ڕیزپەڕ و شاز بووە لەم تەرزە هاریکاریەدا، کە مرۆڤ لە بەرهەمی کار و کرد و کۆششی خۆی بێبەش دەکات.[٢]

وــ بەرەڵدایی – ئیباحیەت: (یاسا) بانگەشەی بەرەڵدایی دەکات، کاتێك خەڵکی (تەتار) وادار دەکات لە سەرەتای هەموو ساڵێکدا کیژە شونەکردووەکانیان لە پێشانگایەکدا

---

١ المصدر نفسه، ص: ٣٤٦.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣٤٦.

ڕانوێنن تا سوڵتان و کوڕەکانی شۆخ و شەنگەکانیان بۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئەم یاسایە بونیادی خێزان — کە ئارامگای کۆمەڵگەیە — لێك هەڵدەوەشێنێت.[١]

ز- خواردنی شتە حەرامەکان: کاتێك موسڵمانانی شارەزای داب و نەریتی مەغۆلەکان دەبێت بەدەنی وێك دێت و بێزی لێیان هەڵدەستێ، ئەوان ئامادەن هەر شتێك ئیسلام خواردنی حەرام کردووە بیخۆن، تا حاڵێك خۆیان لە خواردنی گیانلەبەرە پیسەکانیش نابوێرن، ئەوان ڕقیان لە چوونە حەمام و خۆ شۆرین دەبۆوە، قەدەغە بوو دەستەکانیان بخەنە نێو ئاوی ڕووبارەوە و جلەکانیان بشۆرن، بۆیە لە جلەکانی بەریان دەگەڕان و دایان نەدەنان تا نەڕزیبان، هەر کەسێکیش لەم ڕێنما و بەندە یاسایانە دەرچێت حیسابی تاوانبارو دەرچوو لە قانونی بۆ دەکرا و سزای کوشتنی بەسەردا دەدرا، هەروەها سەربڕینی ئاژەڵ لە گەردنیڕا یەکێك بوو لەو تاوانانەی کە چاوپۆشی لێ نەدەکرا، کار بەوە گەیشتبوو سەربڕینی ئاژەڵیان بە دەستووری شەریعەتی ئیسلام لەسەر موسڵمانانیش قەدەغە کردبوو، یاسای کوشتنی ئاژەڵ لای ئەوان ڕێبازێکی دڕندانە و بێ وێژدانانەیە و لەسەر بنەمای سزادانی گیانلەبەرەکە وەستاوە و هیچ بەزەییەکی لە بەرامبەردا نانوێنن، پێشدا سکی ئاژەڵەکە هەڵدەدڕن و ئینجا دەستیان دەخەنە نێو هەناویەوە، کە دڵان دەرهێنا لێی دەگەڕێن تا مردار دەبێتەوە.[٢]

ح - پاشماوەی کاریگەری (یاسا) لەسەر موسڵمانانی (مەغۆل):

(قلشقندی) دەڵێ: ئینجا (جەنگیزخان) لەسەر چ پەیڕەوێك بوو و گەردنی بۆ چ شتێك کەچ دەکرد، بە هەمان شێوە دوای خۆیشی شوێنکەوتووانی هەمان بەرنامەی ئەویان بەڕێوە دەبرد، کە بریتی بوو لە پەیڕەو و پرۆگرامی (یاسا)، (یاسا)ش لە چەند بەندێکی قانونی پێکهاتبوو کە لە لایەن خودی جەنگیزخان و بە زەین و بیری ئەو داڕژابوو، چەند حوکم و سزایەکی تێدا دیاری کرابوون کە جگە لە کەمێکیان نەبێت دەنا زۆربەیان لەگەڵ حوکمەکانی شەریعەتی (محمدی) پێچەوانەیە، ئەم کتێبەی ناونا (یاسای گەورە) و نووسیەوە و فەرمانیدا لە خەزێنەی (کەلەپور)دا هەڵگیرێت و پارێزگاری لێ بکرێت، منداڵانی بنەماڵەکەشی فێر ببن بیخوێننەوە و ...

---

١ العرب والتتار، ص: ٣٢-٣٣، المغول للصیاد، ص:٣٤٦.
٢ تأریخ الادب في ایران، الترجمة العربیة، ص: ٥٦١.

هەروەها جگە لەم فەرمانانەش چەند فەرمانی تری دان و کتێبەکەی ڕێکخست و تا ئێستاش پەیڕەوی لێ دەکەن، لەوانەیە سوڵتانی وایان هەبێت کە موسڵمانانیش بووە بەڵام هەر پەیڕەوی لێ دەکات.[١]

ئەمەی (قلقشندی) ڕایگەیاند بۆ ئەوە بوو ڕاستیەکانی مێژوو بە تەواوەتی بەراورد بکات، سوڵتانێکی وەك (بەرەکە) کە خانی هۆزی (ذەهەبیە)ی (قیجاق) بوو بۆ خۆی بە تەنیا موسڵمان نەبوو، بەڵکو خێزانەکانی و پیاوانی دەوروبەری و شوێنکەوتووانی هەموو موسڵمان ببوون، هەموو ئەمیرێك مەلایەك و بانگدەرێکی لەگەڵ بوو، قوتابخانەی قورئان خوێندن و لەبەرکردن زۆر بوون، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا: ئەم موسڵمانە مەغۆلانە بەردەوام بوون لەسەر داب و نەریتەکانی (تەتەر) و کلتورە پەیڕەولێکراوەکانی نێو مەنغۆلیا کە (یاسا) لە خۆی گرتبوون، یەکێك لەو نەریتانەی کە لەگەڵ نەریتەکانی ئیسلامدا پێچەوانەیە: بەکارنەهێنانی ئاوی ڕووبار بۆ شوشتن و خۆشتن، کاتێك سوڵتان (زاهیر بیبرس) نوێنەرەکانی خۆی بۆ لای دەوڵەتی (برکة) دەنارد، لە پێناوی بەهێزکردنی پەیوەندی دوو لایانەدا — ئەو نوێنەرانە پێیان دەگوترا کە لەبەر خاتری ئەو نۆموسڵمانانە پۆشاکەکانیان لە نێو ڕووباری (ئوردو)دا نەشۆن، بۆیە کە ناچار دەبوون جلەکانیان بشۆن ئەوا بە دزی ئەم کارەیان دەکرد.[٢]

ئەو مەغۆلانەش کە هاتوونەتە (میسر) و تێیدا ژیاون، شارستانی ئیسلام کاری لەسەر کردوون، بەڵام تا ئێستاش لە هەندێ کاروبارییاندا پەیڕەوی لە دەقەکانی (یاسا) دەکەن،[٣] ئەمانە لە نێو وڵاتی ئیسلامدا گەورە بوون و قورئانیان فێرکراوە و حوکمەکانی شەریعەتی (محمدی)یان ناسیووە، پاش ئەمەش هەق و ناهەقیان پێکەوە کۆکردۆتەوە چاکیان لە پەنا خەراپ داناوە.[٤]

واقیعەن دەقەکانی (یاسا) لە لایەن مەغۆلەوە جێگەی ڕێز و پیرۆزی بوون، موسڵمانان چۆن قورئان بە گەورە و پیرۆز دەزانن، ئەوانیش بە هەمان شێوە (یاسا) بە پیرۆز دەزانن، بە جۆرێك کەس لەوان بە (سوڵتان)یشەوە ناوێرێت پێچەوانەی حوکمەکانی بجوڵێتەوە، هەر

---

١ صبح الأعشى ٤/٣١٠–٣١١، المغول للصياد، ص: ٣٤٧.

٢ المغول للصياد، ص: ٣٤٨.

٣ المصدر نفسه، ص:٣٤٨.

٤ المصدر نفسه، ص:٣٤٩.

کەسێکیش – ئەگەرچی پایەبەرزیش – بێت و لە حوکمی (یاسا) دەرچێت ڕووبەڕووی سوکایەتی پێکردن و سزای توند دەبێتەوە.[١]

ط ـ تەیموری لەنگ (یاسا) پەیڕەو دەکات:

حوکمەکانی (یاسا) لە ئێراندا تا دوای ڕووخانی دەوڵەتی (ئیلخانی)یش لە لایەن هۆزو تیرە تورکەکانەوە بایەخیان پێ دەدرا، (تەیموریەکان) لە بەڕێوەبردنی وڵات و کاروباری سیاسەت و بۆنەکانی ژن و ژنخوازی و زۆربەی ئاهەنگەکانیاندا پەیڕەویان لە (یاسا) دەکرد، (ئیبن عەرەب شا) دەڵێ: (تیمورلنگ) باوەڕی بە بنەماکانی (جەنگیزخانی) بوو، .... هەروەها (جفتای) و خەڵکی (دست) و (خەتا) و (تورکستان) هەموو ئەمانە قانونەکانی (یاسا)ی جەنگیزخانیان – لەعنەتی خوای لەسەر بێت – دەخستە پێش بنەماکانی ئیسلام، لەم ڕووەوە مامۆستایان و سەروەرانی من (حافظ الدین البزازي – رحمه الله – و علاء الدین محمد البخاري – أبقاه الله –) و غەیری ئەمانیش لە زانایانی ناودار و پێشەوایانی ئیسلام فتوای (کافر) بوونی (تەیمور) و هەموو ئەوانەش (یاسا) ی (جەنگیزخان) دەخەنە پێش شەریعەتی ئیسلامیان داوە، گوتراوە: کە (شاهروخ) تەورات و (یاسا)ی (جەنگیزخان)ی هەڵوەشاندوونەوە و فەرمانی داوە سیاسەتیان بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامی بێت، من پێم وا نیە ئەمە ڕاست بێت، چونکە (یاسا) لە لای ئەوان بۆتە شەریعەتێکی قابیل و بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست.[٢]

ی ـ تۆمارکردنی وتەکانی پاشایانی مەغۆل:

مەغۆلەکان فێرببوون: وتەی شاکانیان بنووسنەوە و دوای مردنیان هەڵیان واسن، بەڵام ئەوان لە نووسینەوەی هەموو وتەکانی شادا ئازاد نەبوون، بەڵکو بەس دەیانتوانی ئەو وتانە بنووسنەوە کە خودی (خان) ڕێگەی نوسینەوەی دابایە، خەڵکی عەوامی مەغۆل ڕێزی زۆر بۆ ئەم وتانە دادەنێن، ئەم وتانە ناوی (بیلیك)یان لێنراوە کە بە واتای (حیکمەت و پەند) دێت، پەندەکانی (جەنگیزخان) کۆکراونەتەوە و بوونەتە سەرچاوەی هەموو تیرە و تایەفەکانی مەغۆل و ئەوان ئەم پەندانە دەکەنە بەڵگەی قسەکانیان و لە هەموو پرسەکانی بوارەکانی ژیانیاندا چۆن دەگەڕێنەوە سەر حوکمەکانی (یاسا) ئاواش دەگەڕێنەوە سەر ئەو پەندانەی لەسەر زمانی جەنگیزخانەوە نووسراونەتەوە، هەندێك لەو پەندانە:

---

١ المصدر نفسه، ص:٣٤٩.

٢ المصدر نفسه، ص:٣٥٠.

-با کەستان لەسەر دنیا ئازاری کەستان نەدا، ئەگەر یەکێکتان هەستی کرد ئازاری لە لایەن کەسێکتانەوە پێ گەییوە با پەلە بکات ئازارەکە نەهێڵێ، تا لە شەڕی دوژمنانتان پارێزراو بن.

-هەر کەسێك ماڵی خۆی بە چاکی بەڕێوە بەرێ، دەتوانێ مەملەکەتیش بەڕێوەبەرێ.

-کەسێك بتوانێت (١٠) کەس بەڕێوەبەرێت و بە باشی پێشڕەویان بکات، ئەوا پێشڕەوی کردنی سوپایەکی گەورەشی لە لا ئاسان دەبێت.

-هەر کەسێك دەسەلاتی بەسەر پاك و خاوێنی ماڵەکەی خۆیدا بشکێت، ئەوا دەتوانێ حوکومەتەکەشی لە دز و جەردە و خەڵکی شەقاوە بپارێزێت.[1]

### ٣ـ ڕێکخستنی ئەرکەکانی خزمەتکردنی (خان):

دوای ئەوەی (جەنگیزخان) لە یەکگرتنی هۆزەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئینجا بۆ ڕێکخستنی وڵات دەستی بە دانانی ڕژێمێك کرد، ئەم ڕژێمە کۆمەڵێك ئەرکی دیاری کردن و هەر ئەرکەش لە لایەن کەسێك یان چەند کەسێکەوە سەرپەرشتی دەکرا، خۆ ئەگەر هەندێك لە ئەرکەکان گرنگ بوونایە ئەوا یەکێك لە خزمە نزیکەکانی (خان) سەرپەرشتی دەکرد، ئەرکەکان بەم شێوەیە بوون:

أ- (٤) کەس سەرپەرشتی هەڵگرتنی تیر و کەوانەکان دەکەن.

ب- (٣) کەس سەرپەرشتی خواردن و خواردنەوە دەکەن.

ت- یەك کەس سەرپەرشتی ئامادەکردنی پوش و پاوان دەکات بۆ مەڕ و ماڵات، (٣) کەسیش سەرپەرشتی پاسەوانی کردنی ئەو پوش و پاوانانە دەکەن.

ج- یەك کەس سەرپەرشتی ئامادەکردنی عەرەبانە سەربازیەکان و ئامراز و هۆکارەکانی هەڵگرتن و گواستنەوە دەکات.[2]

ح- یەك کەس سەرپەرشتی کارمەندان و خزمەتگوزارانی نێو کۆشکی (خان) دەکات.

د- (٤) کەس بە نۆبە سەرپەرشتی پاسەوانی کردن و هەڵگرتنی شمشێران دەکەن.

ذ- (٢) کەس سەرپەرشتی کاروباری پارێزگاری کردنی ئەسپەکان دەکەن.

س- (٤) کەس نامەکانی (خان) دەگەیەنن.

---

١ المصدر نفسه، ص:٣٥١، تأريخ العراق بين الاحتلالين ١/١٣١ـ١٣٣.

٢ المغول والاوروبيون والصليبيون وقضية القدس، ص: ٣٩.

ش- (٢) کەس لە پیاو ماقوڵان لە کاتی کۆبوونەوە گشتیەکانی (مەغۆل)دا ئەرکی پاراستنی بارودۆخ و قانون دەگرنە ئەستۆی خۆیان.[1]

پاسەوانانی (خان) پایەیەکی مەزنیان هەبوو لە دەوڵەتدا، هەر یەك لەو پاسەوانانە پلە و پایەی لەسەرکردەی هەزار سەرباز بەرزتر بوو، هەڵبژاردنیان بەوپەڕی بایەخ پێدان و وردەکاریەوە ئەنجام دەدرا، دوو تاقم سەرپەرشتی کاروباری پاسەوانی کردنیان دەکرد، یەکێکیان لە ڕۆژدا و ئەوی تریان لە شەودا، ژمارەی پاسەوانەکان گەیشتبووە (١٠) هەزار کەس کە بە ئازایەتی و بەهێزی ناسرابوون، لە کۆی هەموویاندا (١٠٠٠) کەسیان لێ هەڵدەبژێردرا و هەر یەکێکیان پێی دەگوترا (بەهادور) – واتە پاڵەوانی ئازا –، ئەم هەزار کەسە هەمیشە لە دەوروبەری (خان) دەبوون و خزمەتی ئەویان دەکرد و لەگەڵ (خان) نەبووایە بۆ جەنگ دەرنەدەچوون و جگە لە خودی (خان) فەرمانیان لە کەسی تر وەرنەدەگرت، وێڕای (خانی گەورە) و پاسەوانەکانی، ئینجا چینی (میران) بە دوای ئەواندا دەهات، ئەم چینە لە باج و خەراج بەخشرابوون، مافی دەست بەسەرداگرتنی تاڵانیەکانی کاتی جەنگیان هەبوو و بێ وەرگرتنی مۆڵەت دەچوونە کۆشکی (خان) و، (خان)یش ڕێزی تەواوی لێ دەنان و بە دەستی خۆی خواردنەوەی دەخستە بەر دەستیان.[2]

هەر هەموو مەغۆلەکان حیسابی سەربازی نێو سوپایان لەگەڵ دەکرا، دەبوایە لە کاتی پێویستدا هەموویان چەك هەڵبگرن، بۆیە هەر مەغۆلیەك لە کاتی ئاشتیدا شوانی مەڕ و ماڵات بوو و لە کاتی جەنگ و هەراشدا سەربازێکی چەك لە شان بوو، دەبووایە هەموویان مەشق و ڕاهێنان لەسەر ئەو چەکانە بکەن کە لە کاتی جەنگدا بەکاریان دێنن، (مەغۆلەکان) بەوە ناسرابوون کە بە شێوازی سەرکوێرانە و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری سەرکردەکانیان دەکەنو بە ناپاکی و خیانەت و پەیمان شکاندن لە بەرامبەر دوژمنەکانیاندا ڕەفتار دەکەنو شەڕیان لەگەڵ هەر نەتەوەیەك کردبایە بێ بەزەییانە و دڵڕەقانە هێرشیان دەبردو جیاوازیان لە نێوان جەنگاوەران و ژن و منداڵو پیر و پەککەوتە و نەخۆشاندا نەدەکرد، بۆیە لە مێژوودا جەنگەکانی مەغۆل بە (دڵڕەقی و ڕوخاندن و لە نێوبردن) ناویان دەرکردووە.[3]

(جەنگیزخان) توانی سرنجی سوپاکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشێت و ڕێزی تەواوی لێ بگرن، بە سەرۆکی هەرە مەزنی خۆیانیان دادەنا، فەرمانەکانی ئەویان بە پیرۆز دادەنا، گوێڕایەڵ و

---

١ المصدر نفسه، ص:٣٩.

٢ المصدر نفسه، ص:٣٩.

٣ المصدر نفسه، ص:٣٩.

فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بوون، لە بەرزکردنەوەیدا گەیاندبوویانە پلەی خوایەتی و پەرستن، کەسیان توانای سەرپێچی کردنی (خانی گەورە)ی نەبوو، زیرەکی و لێوەشاوەیی و فێڵبازی (جەنگیزخان) لەو (ڕژێمە سەربازیەدا) ڕەنگی دابۆوە کە بە دەستی خۆی ڕێکی خستبوو.[1]

أ- ڕێکخستنی سوپای (مەغۆل):

(جەنگیزخان) سوپای (مەغۆل)ی بە شێوەی پلەپلە دروست کردبوو و بەسەر چەند یەکەیەکی سەربازیدا دابەشیبوون:

- توکان (تومان): لە (١٠) هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو، بە سەرکردەکەی دەگوترا (نویان) یان (نوین).
- ئەستێرە: لە (٥٠) کەسی جەنگاوەر پێکهاتبوو و بە فەرماندەکەی دەگوترا: (یوزباشی).
- پێشەنگ: لە (٥٠) کەسی جەنگاوەر پێکهاتبوو بە فەرماندەکەی دەگوترا: (ئونباشی).
- کۆمەڵ (تاقم): لە (١٠) کەسی جەنگاوەر پێکهاتبوو، ئەمەیان بچووکترین یەکەی سەربازی بوو و سەربازەکانی پێکەوە و بە یەکسانی دەجەنگان و دەژیان و دەکوژران.[2]

هەر یەکێك لەم یەکە سەربازیانە ئەسپ سوار بوون و ئەسپەکانیان یەك ڕەنگ بوون و هەر جەنگاوەرێکیش بێ لە ئەسپەکەی ژێر خۆی (٥) ئەسپی یەدەگی بۆ ئامادە کرابوو، وەك دەبینین (ئەسپ) چەکی هەرە سەرەکی سوپای مەغۆل بووە جگە لە چەك و چۆڵی قورسی هەندەسی و مەدفەعی بە ئەسپ و عەرەبانە هەڵدەگیران و ڕادەکێشران، تەواوی یەکە سەربازیەکانیان لە هێزی ئەسپ سوار پێکهاتبوون و هێزی پیادە لە نێوانیاندا بەدی نەدەکرا، ئەم سوپا ئەسپ سوارانەی مەغۆل بریتی بوون لە (٣) جۆر:

– سریەکانی گیانفیدایی: ئەرکەکەی بریتی بوو لە دەست پێکردنی جەنگ و هەڵشاخان بە ڕووی دوژمندا.

– سریەکانی بریسو: ئەمەیان هێزی ئەسپ سواری قورس بوو، ئەرکەکەی: خۆکردن بە نێو ڕیزەکانی دوژمن و بەدەست هێنانی سەرکەوتن بوو.

---

١ قضايا العالم الاسلامي ومشكلاته السياسية للنبراوي، ص: ٧٢.

٢ الغزو المغولي لديار الاسلام، ص: ٨٦.

—سریە سوکەکان: ئەمەشیان هێزی ئەسپ سواری سوك بوو، ئەرکەکەی: بەرگری کردن‌و پارێزگاری کردنی دو باڵاکەی تری سوپاکەیان بوو لە نێو گۆڕەپانی جەنگدا.

چەك و چۆڵی هێزی (بریسو- ئەسپ سواری قورس) بریتی بوو لە: شمشێرو تیرو کەوان‌و تەشوێ.

کەلوپەلەکانی تریان بریتی بون لە: (زرێی پێستی (دێوجامە) ــ بۆ پاراستنی خۆیان و ئەسپەکانیان ــ، کڵاوخودەی پۆڵا — بۆ پاراستنی سەر و گەردن ــ، تیردانێکی دژی شێ — بۆ هەڵگرتنی تیرە یەدەگەکانی، لەگەڵ کارتیخێك — بۆ تیژکردنی سەرەتیرەکان، ژێی یەدەگ — بۆ کەوانەکان ــ) جگە لەمانەش هەر یەکێك لە سەربازەکان دەبوایە ئەم شتانەشی پێ بوایە: {(گوریسێکی گشت): بۆ ڕاکێشانی ئامرازەکانی گەمارۆدان یان ڕاکێشانی ئەو عەرەبانانەی لە نێو قوڕدا دەچەقین یان وەردەگەڕان یان لە ڕۆیشتن پەکیان دەکەوت، هەروەها (قاپ)ێك بۆ تێدا کوڵانی شیر، (جانتایەك) یان (توێشە بەرەیەك) بۆ هەڵگرتنی خۆراکی یەدەك لە گۆشتی وشك کراوەو نان و شیری وشك، ــ ئەم شیرە وشکەی دەخستە نێو قاپەکەوە و ئاوی بەسەردا دەکرد و تێکی دەدا و وەك شیری تازە دەیخواردەوە ــ، (کوندەیەکی) بچووك بۆ ئاو}.

چەك و چۆڵی سریەکانی گیانفیداو سریە سوکەکان (ئەسپڕەوی سوك) بریتی بوو لە: (ڕمب‌و کەوان) تێکڕای ئامرازو کەلوپەلەکانی تریشیان وەکو کەلوپەلەکانی هێزی (ئەسپەڕوی قورس) بەڵام تیپی پاسەوان بە جودا لە هەرسێ یەکە سەربازیەکە (قەلغان)یشیان هەڵدەگرت تا خۆیان لە شمشێری دوژمنا بپارێزن.

شایانی باسە هەر سەربازێك بێ لەو ئەسپەی سواری بووە ٤ــ٥ ئەسپی تریشی هەبوو، سوپا بە جوانترین شێواز نەخشەی هێرشەکەی جێبەجێ دەکردو لە نەخافڵ هەڵی دەکوتایە سەر دوژمن، (جەنگیزخان) بەسەر هەموو کارەکانی خۆی ڕادەگەیشت، بەم شێوەیە:

پۆلە جەنگاوەرێکی لە پشتەوە دادەنا بۆ پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیەکانی مەملەکەت، پۆلێکی تری تەرخان دەکرد بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمە تازە داگیر کراوەکان.

دەزگایەکی سیخوڕی تایبەت بە خۆی لای خۆی دەهێشتەوە، (تابور پێنجەم)یشی لە نێو دەوڵەتە دراوسێکانیدا دروست کردبوو، لەم بوارەدا پشتی بە (دیاری‌و بەڵێن‌و هاوسەرگیری) بەستبوو، لە کۆتاییدا بە سەرکردایەتی (جی نویان)ی یاریدەدەری‌و لە ژێر چاودێری (ئیمپراتۆری چین)دا سوپایەکی بۆ شەڕی بنەماڵەی (سونج) ئامادە کرد، (جەنگیزخان)

توانی بە تەواوەتی (ئیمپراتۆری چین) بناسێت‌و شێوازی نەخشەو پلانەکانیان بزانێت‌و نهێنی قەڵاکانیان‌و خاڵە بەهێزەکانیان‌و سەرچاوە ئابووریەکانیان کەشف بکات.[١]

ب ـ ژمارەیەك وەسێتی جەنگیزخان بۆ سوپاکەی:

–نابێ سەرکردەی تومان (نویان) پەیوەندی بە (نویان)ێکی ترەوە هەبێت‌و فەرمانی ئەو بۆ خەڵکانی تر نایخوات.

–نابێ هیچ سەربازێك لە ئامادەکردن‌و هەڵگرتنی کەلوپەلەکانی خۆیدا وەك داوو دەرزی بۆ جلەکانی کەمتەرخەم بێت، هەر کەسێك سەرپێچی بکات بە توندترین شێوە سزا دەدرێت.

–هەر ڕۆڵەیەك گوێڕایەڵی باوکی نەبێت‌و هەر برایەك فەرمانبەرداری کاکی نەبێت‌و هەر ژنێك لە فەرمانی شووەکەی دەرچێت بە توندی سزا دەدرێت.

–پێویستە لە جێبەجێ کردن‌و دەرکردنی فەرمان‌و بڕیارەکاندا ڕەچاوی پلەبەندی بکرێت، تاك جگە لە ئەرك‌و فەرمانی خۆی شتێکی تر جێبەجێ ناکات، بەم شێوەیە لە خوارەوە تا سەرەوە هەر کەسە کاری تایبەتی خۆی هەیە.

–هەر کەسێك دزی یان ڕێگری یان هەر تاوانێك بکات بە توندی سزای دەدرێت.

–کەسێك ژیرو ئازا بێت سەرکردایەتی کردنی دەخرێتە ئەستۆ، تێکڕای خەڵکیش دەکرێنە سەرباز، بەڵام تاکە لاوازو پەککەوتەکان دەکرێنە شوان، کارەکان بەم شێوەیە دابەش دەکرێن.

–تێکڕای سەرکردەکان لە نزمترین پلە تا بەرزترین پلە لە ساڵێکدا جارێك (جەنگیزخان) دەبینن: تا فەرمانی لێوەربگرن و گوێ لە ئامۆژگاریەکانی بگرن، گوتی: هەر کەسێك ئەمە بکات دەتوانی، سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە بکات.[٢]

ج ـ چەکداری و ئامادەسازی:

ئەسپ لە سوپای (مەغۆل)دا چەکی سەرەکی بوو، جەنگاوەر بە شمشێرێك‌و ڕمبێك‌و دوو تیروکەوان چەکدار بوو، تیروکەوانێکیان لەسەر ئەسپەکەیڕا تیراندازی پێ دەکرد، بە ئەوی تریشیان لە کاتی ئاساییداو بەوپەڕی وردەکاریەوە سێرەی پێ لە دوژمن دەگرت، (٣) تورەکەشی پێ بوون کە پڕ بوون لە تیری جۆراوجۆرو ئامرازی سەنگەرلێدان‌و خۆراکی یەدەك، هەمبانەیەکیشی بە کلکی ئەسپەکەی هەڵدەواسی‌و هەموو کەلوپەلەکانی خۆی

---

١ المصدر نفسه، ص:٨٦، ٨٧.

٢ المصدر نفسه، ص:٨٨.

تێدەهاویشت و یارمەتیدەرێکی باشی ئەسپەکەشی بوو لە پەڕینەوەی چۆم و جۆبار و ڕووبارەکانداو، جەنگاوەر بە کەوڵی گیانلەبەرێك خۆی زرێپۆش دەکرد.[1]

بەڵام سەرکردەکان: جگە لە هەڵگرتنی چەکەکانیان هەریەکەیان لولەکێکی درێژی پێ بوو کە لە پێستەی تەنك دروست کرابوو و ئەمسەرو ئەوسەری پوزەوانەی بۆ دروست کرابوو سەروپەتیان تێ هەڵکێشرابوو جلو بەرگو چەك و کەلوپەلەکانی خۆیان تێ دەهاویشت و چاك دەیانهاخنی و ئینجا بە بەنەکە توند دەیانبەست، پاشانیش تەواوی کەلوپەلەکانیان و کورتان و زینی ئەسپەکانیان دەخستە نێو هەمبانەیەکەوەو بە پەنا کلکی ئەسپەکەدا هەڵیاندەواسی، یەکێك لە سەربازەکان دەچووە نێو چۆمەکەوەو دەستی بە ڕێشمەی ئەسپەکەیەوە دەگرت و بە مەلە پێشی دەکەوت و ڕای دەکێشا، جاری واش هەبوو بۆ پەڕینەوەی ڕووبارەکە سوودیان لە سەڵبە وەردەگرت ئینجا دەبوایە ئەسپەکانی تریش بەڕیز بە دوای ئەم ئەسپەدا بڕۆیشتبانایە، بەڵام تەواوی جەنگاوەرەکانی تریش هەریەکەیان کوندەیەك یان جەوەندەیەکی چاکی هەبوو هەموو کەلوپەلەکانی خۆی تێ دەکردو سەرەکەی بە توندی دەبەست و ئینجا بۆ پەڕینەوەی لە ڕووبارو چۆمەکە بە کلکی ئەسپەکەیدا هەڵدەواسی، بە هەمان شێوە سەربازەکان لە ڕۆیشتنی دەشتە بێ ئاوەکاندا ئەم (کوندە) یان (جەوەندە)یان پڕ دەکرد لە ئاو.[2]

س ـ شێوازەکانی جەنگ:

سوپای مەغۆل بە سەرکردایەتی جەنگیزخان لە بەرەیەکی فراواندا لە (٣) قۆڵی سەرەکیەوە پێشڕەوی دەکرد: باڵی ڕاست و باڵی چەپ و باڵی نێوەڕاست، باڵی ڕاست و باڵی چەپ لە ڕاست یەك و بە تەریبی دەڕۆیشتن، باڵی نێوەڕاست لە نێوەندی هەردووکلاڕا کەمێك پێش دەکەوت، بە جۆرێك ڕێگەی هەبوو یارمەتی هەر لایەکیان بدات بەبێ ئەوەی خۆی تووشی هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دوژمن بکات، لە هەمان کاتدا هەردووك باڵەکە ڕێگەیان هەبوو لە دواوەڕا تۆقی دواوەی دوژمن بدەن ئەگەر باڵی نێوەڕاست تووشی هێرش ببووایەوە. جەنگیزخان پشتی بە چەکدارکردنی گەل بەست لە دامەزراندنی سوپاکەیدا، پشتی بە جەنگی پارتیزانی بەستووە لە نەخشە سەربازیەکانیدا، دووری نێون هەرسێ باڵەکە لە ماوەی ڕۆژە ڕێیەك تێپەڕی نەدەکرد، (جەنگیزخان) بە شەوو ڕۆژ پێشڕەوی بە سوپاکەی

---

١ المصدر نفسه، ص:٨٨.

٢ المصدر نفسه، ص:٨٨.

دەکرد، لە کاتی هێرش کردنیدا بۆ سەر (پۆلۆنیا) ماوەی ١١٣٠کم ی لە (١٥٠) ڕۆژدا بڕی، لە کاتی هێرش کردنیدا بۆ سەر (هەنگاریا) ماوەی (٤٥٠کم)ی لە (٣) ڕۆژدا بڕی، چەند ڕۆژێکی کەم پێش گەیشتنیبە شوێنی مەبەست بەس بە شەو دەڕۆیشت و ئەوپەڕی نهێنی بەکاردێنا، کە دەشگەیشت لە سپێدەی بەیانیدا زنجیرە هێرشێکی توندی دەست پێدەکرد، لە کاتی جەنگدا نیشانەکانی گۆڕەپانی بەکاردێنان، ڕۆژانە ئاڵای هەڵدەدانو شەوانەش چراو ئاگرۆچکەی بەکاردێنان، لە جگەنگەکانیدا هەموو پیلانەکانی هەڵخەڵەتاندنو هەڵمەتی کوتوپڕانەی بەکارهێناون، پێش ڕاگەیاندنی جەنگ ئاشتی لەگەڵ دوژمن ئەنجام دەدا ئینجا هەوڵی دەدا پەرتەوازەیی لە نێو ئەو دەوڵەتەدا دروست بکاتو لە ناوەوەدا شلو پلی بکات، ژمارەیەك لە سیخوڕو بە کرێگیراوانی دەناردنو جەنگی پڕوپاگەندەیان دەکردو دەروونی خەڵکیان تێکدەدا، پاش ئەمە کتوپڕ بەسەری دادەدانو وڵاتی لێ وێران دەکردنو دانیشتوانەکەشی قڕ دەکرد، لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی (بتپەرستی خوێنڕێژ)بوو، بەڵام لەو نێوەدا سەرۆك و سەرکردەیەکی باڵادەستیش بوو، ئەو توانی (بەهێزترین سوپا) پێك بێنێو باڵادەسترین ئیمپراتۆریەت لە ماوەی مێژووی سەدەکانی نێوەڕاستدا دامەزرێنێ.[1]

ش ـ گەیاندنەکان لە سوپای (مەغۆل)دا:

(جەنگیزخان) زۆری بایەخ بە گەیاندن داوە گەیاندن لە سوپای (مەغۆل)دا بەم شێوەیە بووە:

–گەیاندن لە نێو یەکە سەربازیەکاندا: بە دوو شێواز ڕادەپەڕێنران:

–یەکەم: نیشانە هەواڵ= بەرقییە: ئامـاژە هەواڵ: ڕۆژانە بە هۆی ئەو (بەیداخ)ەوە ئەنجام دەدرا کە لە لایەن ئاڵا هەڵگری سەرکردەی (تومان)ەوە ئاماژەی پێ دەکرا، شەوانە فانۆسی سووریان بەکاردەهێنا، یەك ئاماژە بە ئاڵاکەیان فانۆسەکە بەس بوو بۆ پێشڕەوی کردنی داواکراو لە لایەنی سوپاکەوە.

–دووەم: گەیاندن لە نێوان بارەگای سوپای نێو بەرەی جەنگو ئەنجومەنی باڵای جەنگ لە (قەرەقۆرم)ی پایتەخت: ئەم شێوازە بە هۆی فەرماندەی (هێڵی گەیاندن)ەوە ئەنجام دەدرا، بەم شێوەیە:

ڕێگای نێوان بەرەی جەنگ و پایتەخت بۆ چەند هەرێمێك دابەش دەبوو، گەورەترین شار مەڵبەندی هەرێمەکە بوو، (دارۆجا) یان (فەرماندەی هێڵی گەیاندن) فەرماندەی مەڵبەندی

---

١ الغزو المغولي لديار الاسلام، ص: ٩٠.

گەیاندن بوو، مەغۆل پێی دەڵێن (یام)، لە مەڵبەندی هەر هەرێمێکدا (فەرماندەیەکی گەیاندن) هەبوو، کاتبێکیش هەبوو کاتی گەیشتنو ڕۆیشتنی هاتوچۆکەرانو ئەو جەنگاوەرانەی دەنووسی کە بۆ جەنگ دەڕۆیشتن، یان لەوێڕا دەهاتنەوە، ژمارەیەك پاسەوانیش پارێزگاری یان لە مەڵبەندەکە دەکرد، ژمارەیەك ئەسپی تیژڕەو بە زینکراویو بۆ جوڵانو کاری گەیاندن ئامادەکرابوون، ئەو پیاوانەی کاری پۆستەو گەیاندنیان پێ سپێردرابوو دەبوایە لە ڕۆژێکدا ماوەی (٨٠ــ١٠٠کم)یان ببڕیبایە، (٣٠٠) هەزار ئەسپ بۆ درێژەپێدانی گەیاندن تایبەت کرابوون.[١]

ع ـ سەرکردایەتی:

خودی (جەنگیزخان) سەرکردەی —سوپاکانی — لە نێو پاسەوانە تایبەتیەکانی خۆی دیاری دەکردن، بەم شێوازە سەرکردایەتی کردنی هێزە سەربازیەکانی لە نێو پانتایی ئیمپراتۆریەتەکەیدا خستە بەردەستی کەسانێك خودی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەیانناسێت و پێشدا لە گۆڕەپانی واقیعدا جەڕباندوونی، چاکترین بەڵگە بۆ باڵادەستی جەنگیزخان لەسەر باش هەڵبژاردنی سەرکردەکانی هەموو ئەوکارو چالاکیە زیندوو شکۆدارانەن کە ئەم سەرکردایەتیە بۆ (مەغۆل)ی بەرهەم هێناوە،[٢] جەنگیزخان گوتبووی: (هەر کەسێك بتوانێت ماڵەکەی خۆی بە چاکی بەڕێوە بەرێ، دەتوانێ مەملەکەتیش بەڕێوەبەرێ)، (هەر کەسێك بتوانێ بەڕێوەبەرایەتی کردنی (١٠) کەس هەڵسوڕێنێ، سەرکردایەتی کردنی سوپایەکی گەورەشی لە لا ئاسان دەبێ).[٣]

سەرکردەکانی مەغۆل تەنها ڕاپەڕێنەرێکی لێهاتووی خواستەکانی (ئیمپراتۆر) بوونو بەس،[٤] یەکە سەربازیەکانی بە پێی خواستەکانی باروودۆخ لێکهەڵدەوەشاندەوەو کۆی دەکردنەوەو سەرلەنوێ ڕێکی دەخستنەوە، خودی خۆی بەدواداچوونی جیددی هەبوو بۆ ئەو دەرەنجامە شکستیانەی جارو بارە لەلایەن هێزەکانیەوە توشی دەبوون، (تۆلۆ)ی کوڕە بچووکی (جەنگیزخانو وەزیری دەستەڕاستی لە کاروباری سەربازیدا، ناسناوی ( (نوین)ی گەورە)ی لێنرا، (تموغا) و (بلغوتای)ی هەردووك برا بچووکی (جەنگیزخان)یش ناسناوی (نوین)یان لێنرا، جگە لە نەوەی (جوجی قسر) هیچ کامێك لە نەوەی براکانی (جەنگیزخان)

---

١ المصدر نفسه، ص:٩١.
٢ المصدر نفسه، ص:٩١.
٣ المصدر نفسه، ص:٩٢.
٤ المصدر نفسه، ص:٩١.

لــــه مـــافی (ئیمـــارەت=فەرمانـــدەیی) بەهرەمەنـــد نـــەبوون، بـــەڵکو وەك چـــینی (ئوروستوقراتی=پیاوماقوڵ) تەماشایان دەکرا، ئەندامانی سەربازی ئەم چینە ناسناوی (تەرەخان)یان لێنرابوو، هەڵگرانی ناسناوی (تەرەخان) بەهرەمەند بوون لە: (لە بەخشینی باج و خەراج بەخشرابوون، مافی خاوەندارێتی ئەو تالانی و دەستکەوتانەیان هەیە کە لە جەنگو ڕاودا دەیگرن، هەر کاتێك بیانەوێت دەتوانن – بەبێ پرس – بچنە کۆشکی خان)، جگە لە تاوانی برگە (٩) – ی یاسا – کە تایبەتە بەو تاوانانەی سزاکەیان کوشتنە لە هیچ تاوانێکی تر لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت، لەسەر سفرەکانی خواردن لە باری سەرەوە دادەنیشن، کاسەیەك مەی – لە لایەن خانەوە – پێشکەش بە هەریەکەیان دەکرێت).

لە سەردەمی (جەنگیزخان)دا (٣) سەرکردەی (تومان) هەبوون:

یەکەم: (موقالی): سەرکردەی باڵی چەپ (بەرەی ڕۆژهەڵات) بوو.

دووەمیان (بۆکۆرجی): سەرکردەی باڵی ڕاست (بەرەی ڕۆژئاوا) بوو.

سێهەمیان (ئەنایا): سەرکردەی باڵی نێوەڕاست بوو.

ئەمیران (نوید) باڵاترین چینی وڵات (ئۆرستوقراتی) بوون، بەڵام (گەل) بە گشتی (خەڵکی ساکارو ڕەش‌و ڕووت) تەنها ئامرازی بەردەستی یاریدەدەرانی (جەنگیزخان) بوون‌و بەس.[١]

## ٤ـ شێوازەکانی جەنگیان و ڕەفتاریان لە بەرامبەر شکستخواردوان:

(مەغۆلەکان) پێش هێرشکردنیان بۆ سەر هەرێمێك نەخشەیەکی جەنگی یان بۆ پێشنیار دەکرد، هەر کە نەخشەکە ساز دەکراو بڕیاری جەنگ دەدرا: سیخوڕەکانیان بەنێو هەرێمەکەدا بڵاو دەکردنەوە، هەواڵیان لێرەو لەوێ کۆدەکردنەوەو بارودۆخی سوپا – ی هەرێمەکەیان – هەڵدەسەنگاندو قەڵای شارەکانیان تاقی دەکردەوە، پاشان بۆ وڵاتی خۆیان دەڕۆیشتنەوەو، تەواوی زانیاریەکانیان دەخستە بەردەم سەرکردەکانی سوپا پاشان (خان) چەند نوێنەرێکی خۆی بۆ لای حوکمڕانی ئەو هەرێمو دانیشتوانی شارەکان دەناردو داوای گەردنکەچی و خۆ بەدەستەوەدانی لێ دەکردن، کردەوە سامناکو تۆقێنەرەکانی مەغۆل یەکسەر کاری لەسەر هەناوو دەروونی دانیشتوانی ئەو هەرێمە دەکرد کە مەغۆلەکان بڕیاری هێرشکردنە سەریان بۆ دەدا، لەگەڵ گەیشتنی ئاگاداری پەلاماردان دڵ و دەرونیان پڕدەبوو لە ترس‌و بیم‌و واقیان دەوڕما، پێیان دەگوتن: (ئەگەر خێرا خۆ بەدەستەوە نەدەن‌و ملتان بۆ ئێمە کەچ نەکەن، ئێمە نازانین قەزاو قەدەر چتان بەسەر دێنێ! هەر خودا بە تەنیاو بۆ

---

[١] الغزو المغولي لديار الاسلام، ص: ٩٣.

خۆی دەزانێ چ بەڵایەکتان بەسەردێ)[١] ئەگەر خۆ بەدەستەوەدانیان ڕەت کردبایەوەو بەرەنگاربوونەوەیان هەڵبژاردبایە، ئەوا مەغۆلەکان پێشڕەویان دەکرد تا دەگەیشتنە بەر دەرگاکانی شار، بۆ دواهەمین جار بانگی خەڵکیان دەکردو داوایان لێدەکردن خۆ بەدەستەوە بدەن، ئەگەر سەرۆك و بڕیار بەدەستەکانیان بە دیاری بە نرخەوە پێشوازیان لێکردبانایەو بڕیاری خزمەتکردنی سوپای مەغۆلیان دابایە، ئەوا بەر ئازار و ئەشکەنجەی مەغۆلەکان نەدەکەوتن و بە ناردنی حکومڕانێك بۆ سەریان کۆڵیان لێ دەدان، (خان) بڕیارێکی ڕەسمی بۆ ئەو حکومڕانەی دەردەکرد، بەم بڕیارە سام و هەیبەتێك بۆ حکومڕانەکە دروست دەبوو خەڵك بە تەواوەتی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری دەبوون، خۆ بەدەستەوەدان لەم حاڵەتەدا واتای شوێنکەوتنی ڕەهاو بێ مەرجی لێ دەفامرێتەوەو[٢] دەبێ دەیەکی داهاتی هەرێم و شارەکانیش بدرێتە دەست حکومڕانی مەغۆل لە هەرێمەکەدا.

بەڵام ئەگەر دانیشتوانەکە ڕێگەی سەرپێچیان هەڵبژاردبایەو بڕیاری بەرگریکردنیان دابایە،ئەوا مەغۆلەکان لە گەمارۆدانی شارەکەدا تەنها زیانێکی کەمیان لێ دەکەوت، ئەوان لەم حاڵەتەدا – ئاشتیان لەگەڵ نەدەکردن، بەڵکو بەردەوام جەنگیان لەگەڵ دەکردن، تا بە ناچاری خۆیان بە دەستەوە دەدا، ئینجا (خان) فەرمانێکی ڕەسمی بۆ کوشتنی هەموو خەڵکەکە دەردەکردو جیاوازی بە گەورەو بچووك و ژن و پیاو نەدەکرد، بەم شێوەیە فەرمانی دەدا شارەکە بڕوخێنرێت و خەڵکەکەش کۆکوژ بکرێت، داب و نەریتیان بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکەی خان بەم شێوازە بوو:

مەغۆلەکان بانگی دانیشتوان دەکەن بێنە گۆڕەپانی دەرەوەی شار، لە سنعەتکەرو پیشەوەرەکان دەگەڕان و پاشان بۆ (تورکستان و مەنغۆلیا) یان بەرێدەکردن، خەڵکانی بە قەدو قیافەو بەهێزیان لێ هەڵدەبژاردن و هێزێکی غەیرەنیزامییان لێ دروست کردن و ناویان لێ دەنا هێزی (حەشر)، ئینجا ئەوەی دەمایەوە بە شمشێر سەریان دەبڕین.

بەڵام ئەگەر خەڵکی شار لەگەڵ ناچاربوونیشیان هەر بەرەنگارییان کردبایەو خۆیان بە دەستەوە نەدابایەو ماوەیەکی دوورودرێژیش گەمارۆیان لەسەر بووایە، ئەوا مەغۆلەکان هێرشێکی خەستیان دەکردنەسەرو بە زۆرەملێ دەستیان بەسەردادەگرت، ئەگەر دوژمنەکانیان لە دەرەوەی شار بەرەنگاریان ببونایەوە ئەوا شەوو ڕۆژ لە چوار لاوە

---

١ تأريخ جهانكشاي ١٨/١ للجويني، المغول للصياد ص: ٣٦٤.
٢ المصدر نفسه، ص:٣٦٥.

بەبەردەوامی پەلاماریان دەدان تا بە تەواوەتی شپرزەیان دەکردن و هێزو پێزیان پێوە نەدەهێشتن، دەرەنجام یان خۆیان بە دەستەوە دەدا یان هەڵدەهاتن، دوای کۆتایی جەنگەکە (خان) بە عەدالەت تالانیو دەستکەوتەکەی بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش دەکرد، لە ولاخە بەرزەکەی خۆی دادەبەزیو پێشکەشی کەسێکی دەکرد کە زۆری پێویستی پێیە.[١]

شێوازی پەلاماری مەغۆل بۆ سەر تەواوی شارستانیەکانی (چینو خۆرهەڵاتی ئاسیاو پاشانیش ڕوسیا) یەك شێوازی لەسەر یەك بوو، خۆیان بە هەر وڵاتێکدا کردبایە دێهاتیەکانیان دەگرتنو خرپیان دەکردنەوەو پێش خۆیان دەدانو لە گەمارۆدانی شارەکانیاندا وەك قەڵغان بەکاریان دێنان، ئەم ڕەفتارەیان لێ ببووە خویەکی بەردەوامو ئەم خەڵکە ڕەشو ڕووتەیان دەکردە پێشەنگی سوپا: تا لێزمەی تیری دوژمن بەر ئەوان بکەوێتو ڕێگەی چوونە پێشی سوپاش خۆشکەن، جاروبارە بە مەبەستی ئەوە کە خۆیان بە زۆر نیشان بدەن لەبەر چاوی دوژمن ئاڵایان بەسەردا دابەش دەکردن، گوتراوە: ژمارەی مەغۆلەکان لە گەمارۆدانی شاری (جەخەند) تەنها (٢٠) هەزار کەس بووە، بەڵام ژمارەی ئەو دیلانەی پێش خۆیان دابوون (٥٠) هەزار کەس بوون.[٢]

هەروەها دەبوایە ئەم دیلانە سەنگەر و خەندەکیان بۆ لێدابانەیەو، ئامرازی گەمارۆدانی شاریان بۆ دامەزراندبانایە، ئەوەی بە لای مەغۆلەکانە زۆر گرنگ بوو: لە کاتی جەنگە قورسەکاندا ئەو دیلانەیان دەخستنە باری پێشەوەی هێرشەکەو ڕووبەڕووی مەترسی گەورەیان دەکردنەوە، ڕێگەی هەڵاتن و پاشەکشەیان نەبوو: مەغۆلەکان لە پێشەوەڕا سەیریان دەکرد، کاتێك دەیانبینی هێزی دوژمن شپرزە بووە، ئینجا خۆیان بە مەیداندا دەکردو هەڵمەتیان بۆ دەبردن.[٣]

(ابن الأثیر)ی مێژوونووسی ناسراو ئەمە بەم شێوەیە باس دەکات: ئەگەر جەنگی شارێکیان کردبایە دابو نەریتیان ئاوابوو: دیلە موسڵمانەکانیان پێش خۆدەدانو شەڕیان پێ دەکردن، ئەگەر بکشابانایەوە دەیانکوشتن، ئەم هەژارو داماوانە بەزۆرەملێ شەڕیان پێ دەکردن، وەك دەربارەی (ئەسپی سوور) گوتراوە: ئەگەر بۆ پێشەوە بڕوات سەردەبڕدرێت،

---

١ المصدر نفسە، ص:٣٦٥.
٢ المصدر نفسە، ص:٣٦٥، دائرة المعارف الاسلامیة ص:١٣٧.
٣ المغول للصید ص:٣٦٧.

ئەگەر بێتە دواوە ورگی دەدڕێت، مەغۆلەکانیش لە دوای دیلە موسڵمانەکانەوە دەجەنگان، ئەوەی لە بەرەی ئەوان دەکوژرا موسڵمان بوون و خۆشیان هیچیان لێ بەسەر نەدەهات.[1]

هەروەها مەغۆلەکان لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی تەفرەدان و خافڵاندندا دەستێکی بالایان هەبوو، کاتێك گەمارۆی شارێکیان دابایە و دوای درێژەکێشانی گەمارۆکە هیچیان دەست نەکەوتبایە، وایان دەخستەڕوو کە گەمارۆکەیان هەڵگرتووە و لەو ڕێیەی پێیدا هاتبوون بۆ دواوە دەگەڕانەوە، تا دانیشتوانی شار دڵنیا دەبوون دوژمن ڕۆیشتووە و چەکیان دادەنا، ئینجا مەغۆلەکان کتوپڕ لە نەخافڵ بەسەریاندا دەدان و پێش ئەوەی خۆ بۆ شەڕ ساز بکەنەوە هەموویان کۆکوژ دەکردن و یەکسەر دەستیان بەسەر شاردا دەگرت.[2]

### ٥ـ گرنگیدان بە ئەزموونەکان:

هەرچەندە (جەنگیزخان) لە سیاسەتیدا بە ڕەقی و کەللەشەقی ناوی دەرکردبوو، بەلام لە سوود وەرگرتنی ئەزموونی گەلانی پێشکەوتوو خاوەن شارستانیەکان بێ ئاگا نەبوو، بۆیە لە هەموو بوارەکان بە گشتی و بواری کاروباری بەڕێوەبردن و هەوالگری و چالاکی سەربازی و دیپلۆماسیدا پشتی بە خەڵکانی شارەزاو پسپۆڕو مامۆستاو ئەزموندیدە دەبەست، وەك زانراوە: ڕێکخستنی کاروباری شارو شارستانیەت لە سەرەتای حکومڕانیدا بە لای جەنگیزخانەوە کارێکی ئەستەم و قورس بوو، چونکە تا ئەوکاتە مەغۆلەکان نەگەیشتبوونە ئەو پلە بەرزە شارستانیەتەی کە نەتەوە ژێر دەستەکانیان پێی گەیشتبوون وەکو نەتەوەی (کرایت و نەیمان)، لەبەر ئەمە (جەنگیزخان) دوابەدوای یەکگرتنی مەنغۆلیا زۆری پێویست بە ئەزموونی ئەو خەڵکانە بوو کە تازە کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتەکەیەوە، یەکەمین کەسانێك کە هەڵگری نامەی شارستانی بوون لە وڵاتی (مەغۆل)دا بازرگانە موسڵمانەکان بوون، بەڵکو دڵسۆزترینی کەسی تیمۆجین (جەنگیزخان) لە ڕۆژانی تاریکی ئەنگوستە چاوی سەرەتای دەرکەوتنیدا بریتی بوو لە (٣) موسڵمان بە ناوی: (جەعفەر خۆجە، حەسەن، دانیشمەند حاجب)، لە کاتی هێرشکردنی بۆ سەر دەوڵەتی (خوارەزمشا) سوودێکی زۆری لە (حەسەن و دانیشمەند) کردو، پێشەکی ئەم دوانە بە ناوی (خان)ەوە سەردانی وڵاتەیان کردو گفتوگۆیان لەگەڵ دانیشتوانە ڕەسەنەکەیدا کرد، کاتێکیش ویستی پەلاماری (چینی باکوور) بدات (جەعفەر)ی بە نوێنەر ناردە لای (ئاڵتونخان)، هێندەی نەخایاند بارودۆخی ئەو

---

١ المصدر نفسه، ص:٣٦٧.

٢ المصدر نفسه، ص:٣٦٧.

وڵاتە و وەسفی ئەو ڕێگاو بانەکانی چوونە ئەو وڵاتەی بۆ هێنایەوە، (جەنگیزخان) سوودێکی چاکی لە زانیاریەکانی (جەعفەر) وەرگرت لە سەرکەوتنیدا بەسەر (ئاڵتوون خان).

(جەنگیزخان) چەند ڕاوێژکارێکی لە نێو ڕیزی ڕەگەزە جۆراوجۆرەکانی غەیرە مەغۆل بۆ خۆی هەڵبژاردبوون لەو ڕاوێژکارانە: (محمود یلواج) موسڵمان بوو، (تا–تا–تونجا) ئۆیغۆری بوو، (لی لیو تشوسای) چینی بوو، ئەمەیان خزمەتی دواهەمین شای (نەیمان)ی کردو ڕۆڵەکانی (جەنگیزخان)ی فێری نووسینی (ئۆیغۆری) کرد، ڕاست وایە کە (محمود یلواج) ئەو کەسە بێ کە بە (محمود خوارەزمی) ناسراوەو یەکێك بوو لەو (٣) نوێنەرانەی (جەنگیزخان) کە لە ساڵی ١٢١٨ز بۆ لای (محمد خوارەزمشا)ی ناردبوون، محمود لەو کاتەوە بە بەردەوامی ڕاوێژکاری (جەنگیزخان) بووەو، پاش داگیرکردنی وڵاتی (ماوراء النهر = پشت ڕوباری سەیحون) لە لایەن (مەغۆل)ەوە (محمود) لە لایەن (جەنگیزخان)ەوە بە حکومڕانی ئەو وڵاتە دادەمەزرێنرێ‌و، ئەویش بە جوانترین شێواز بەڕێوەی دەبات.

(لی لیو تشوسای)ی خێتایی چینی یش: خەڵکی چینی باکور بووە، باوکی پۆستی وەزارەتی بۆ بنەماڵەی (کین) لە (چین)دا بەڕێوەبردووە، (لی لیو تشوسای) پیاوێکی ڕۆشنبیرو خوێندەوار بوو – پاشان بە دوورو درێژی باسی دەکەین – بە جۆرێك (جەنگیزخان) زۆر سوودی لە بیروڕا و ئەزموون‌و شارەزاییەکانی ئەو وەرگرتووە لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکەیدا، بێگومان (جەنگیزخان) دیواری ئیدارەی دەوڵەتی مەغۆلی لەسەر بنەمای ئەو ئەزموون‌و بیروڕاو زانیاریانە دانا کە لە ڕاوێژکارو پسپۆڕە بیانیەکانی وەردەگرت، بە تایبەتی شارستانی چینی‌و ئۆیغۆری‌و[1] هی تریش.

### ٦ـ داناپەك لە چین:

(لی لیو تشوسای) ڕۆڵێکی گرنگ‌و گرانی لە دامەزراندنی (ئیمپراتۆریەتی مەغۆل)دا گێڕا، (جەنگیزخان) لە یەکەم چاوپێکەوتنیدا پێی سەرسام دەبێ، ئەو یەکەمین فەیلەسوفی چینی بوو چووە ڕیزی سوپای (مەغۆل)ەوەو بەردەوام لە زانستەکانی فەلسەفەو پزیشکی‌و گەردوونناسی دەکۆڵیەوە، جارێك سەرکردەیەکی ناسراو گاڵتە بە کارەکانی دەکات‌و دەڵێ چۆن چینیەکی قوچی ڕیش درێژ کەوان دروست بکات؟! ئینجا پێی دەڵێ: سوودی بوونی – پیاوێکی وەك تۆ – چیە لە نێو جەنگاوەراندا؟ چینی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: دروستکردنی کەوانی چاك پێویستی بە دارتاشێك هەیە، بەڵام بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریەت پێویستی بە

---

١ المغول للعريني ص: ١٥٢.

مرۆڤی خاوەن حیکمەت هەیە، (جەنگیزخان) لە کاتی جەنگە زۆر دوورو درێژەکانیدا لەگەڵ خۆی دەگێڕاو ڕێزی تەواوی لێدەنا، کاتێك مەغۆڵەکان - دوای کۆتایی جەنگ - دەستکەوتو تالانیان کۆدەکردەوە ئەم (حەکیمە) کتێبو خشتەی گەردووناسیو گژوگیای پزیشکی کۆدەکردنەوە، هەموو کەرەتێك نەخشەی جوغرافی هێرشەکانو جەنگەکانو شوێنەکانی تۆمار دەکرد، جارێکیان شەپۆلێکی دەردوبەلا خۆ بە نێو ڕەشە سوپای مەغۆلدا دەکات، لەو کاتەدا بە هەلی وەرگرت تۆڵەی خۆی لەو سەرکردانە بکاتەوە کە گاڵتەیان بە خۆیو کتێبەکانی دەکرد، هەستا ئاوێکی بە گەروودا کردن کە لە گیاکان دروستی کردبوو خودا بە هۆیەوە شیفای دان.

(جەنگیزخان) لەبەر زانیاریو دڵ پاکیەکەی ڕێزی لێ دەگرت، ئەم (حەکیمە) هەر هەلێکی بۆ هەڵکەوتایە بۆ ڕاوەستانی کوشتارو خوێنڕێژی لە لایەن سوپای مەغۆلەوە درێغی تێدا نەدەکردو بە شێوازی حەکیمانەی خۆی هەوڵی بۆ دەدا، گێڕانەوەیەك دەڵێ جارێك (جەنگیزخان) لە کەلێنە شاخەکانی (هیمالایای خوارو) گیاندارێکی لەسەر شێوەی (ئەیل) دەبینێ: بەلام ڕەنگی سەوزەو تەنها یەك شاخی بەسەرەوەیە، لەم کاتەدا بانگی (حەکیم) دەکاتو پرسیاری ئەم گیاندارەی لێدەکات، ئەویش بە ڕێزەوەو بە دەنگێکی نزمەوە دەڵێ: ئەم - گیاندارە - (کیو-توان)ە، زمانی هەموو نەتەوەکانی سەر زەمین دەزانێ، هەموو مرۆڤەکانی خۆش دەوێن، بە کوشتو کوشتار ناڕەحەتە، دەرکەوتنی ئەم گیاندارە لەبەر چاوی جەنابت، هۆشداریەکە بۆ تۆ ئەی (خان)ی مەزن، بانگەشەت دەکا تا واز لەم ڕێباز-ی کوشتو کوشتار-ە بێنی.[1]

باوەڕپێکراوترینو پڕ وردەکاریترین سەرچاوە - لە بواری مێژووی مەغۆلەکاندا - کتێبو نووسراوە جێماوەکانی (لی لیو تشوسای) حەکیمی چینین کە پشتیان پێ ببەسترێت، بەڵگە نەویستە کاریگەری شارستانی چینی لەسەر (جەنگیزخان)و سنووردارکردنی خوێنڕێژی سوپای مەغۆلو ڕزگارکردنی کتێبو کەلەپووری شارستانی لە سوتاندنو تالانی مەغۆلەکانو توێژینەوەی گیادەرمانیەکان لە کاری پزیشکیداو بەکارهێنانیان لە قەلاچۆکردنی ئەو میکرۆبانەی بە هۆی زۆری لاشەی کوژراوان پەیدادەبوون، لە ڕێگەی ئەم حەکیمە چینیەوە بووە، لەگەڵ ئەوەدا (لی لیو تشوسای) دڵسۆزی زۆری بۆ دەوڵەتی (مەغۆل) بە گشتیو بنەماڵەی (جەنگیزخان) هەبوو، بەلام کاتێك شارێك یان هەرێمێکی دەبینی دەورەدراوەو

---

١ جنكيزخان ص: ٣١٩.

خەریکە خەڵکەکەی ڕووبەڕووی کوشتوبڕی مەغۆلەکان ببنەوە، لەو کاتانەدا هەستو سۆزی دەخرۆشاو خۆی پێ ڕانەدەوەستاو داوای دەکرد بەزەییان بەرامبەر بنوێنرێ.

(ئۆکتای) کوڕی (جەنگیزخان) بەم وتەیەی — لە بەرامبەر ئەودا — ئاماژەیەك بەم هەستەی حەکیم دەداتو دەڵێ: (ئەوە چییە بەردەوام بۆ ئەو خەڵکە دەگریەی؟!) وێڕای ئەمانەش زیرەکیو دانایی حەکیم لە نێوبژیوانیدا بایەخی خۆی هەبوو لە ڕاگرتنی هەندێك کارو پیلاندا کە وەستانیان زۆر زەحمەت بوو، (حەکیم) بە تێبینی کردنی ئەوە کە ئەو لە ڕەچەڵەکدا مەغۆلییەو بە فەرهەنگی شارستانی چینی گۆشکراوەو پەروەردەبووە: کەواتە زۆر ئاساییە وەك کەسێکی نێوبژیوان لە نێوان ڕەگەزو نەتەوە شکستخواردووەکانو مەغۆلە خۆسەپێنەکان ڕاست بێتەوە، ئەو نەوەك گوێی لە قسەکانی نەگیرێ ڕاستەوخۆ لە لای مەغۆلەکان بەرگری لە کێشەی مرۆڤایەتی نەدەکرد، بەڵکو دەیەویست بۆیان بسەلمێنێ کە بەزەیی نواندن یەکێکە لە داخوازییە سەرەکییەکانی سیاسەتی ساغو سەلیمو بە ڕێکوپێکی ئامانجی خۆی دەپێکێ، ئەو کارە دڕندانەش مەغۆلەکان دەرهەقی بەرامبەرەکانیاندا ئەنجامیان دەدان سەرچاوەکەی نەزانیو نەفامییە کە پێیەوە بە ناوبانگن.

لە دواهەمین هێرشی (جەنگیزخان) بۆ سەر (کانسۆ) سەرکردەیەکی مەغۆلی ئاماژەی دا کە ئەم ڕەعیەتە چینیە نوێیانە هیچ خێرو بێرێکیان پێوە نیە، چونکە لە شەڕ نازانن‌و بەکارهێنانیان لە جەنگدا کارێکی نەگونجاوە، بۆیە چاك وایە ئەم دانیشتوانە لە ڕەگو ڕیشە دەرهێنرێن‌و قڕانیان تێ بخرێت، کە ژمارەیان خۆ لە (١٠) ملیۆن کەس دەداو لایەکی زەمینیشمان بۆ دەگەڕێتەوەو دەیکەینە پاوان‌و لەوەڕگای ڕەوە ئەسپەکانی سوپا، (جەنگیزخان) ڕێزی لە دڵسۆزی نواندنی ئەم سەرکردە سەربازییە گرت، بەڵام (حەکیمی چینی) کە تا ئێستا تۆزقاڵێك گومانیان لە دڵسۆزی ئەودا نیە یەکسەر هەستایە سەرپێو بیروڕای خۆی بۆ مەغۆلەکان دەربڕیو ڕایگەیاندن: کە بەروبوومی ئەو زەوییە بە پیتە کشتوکاڵیانە سودەکەی بۆ (مەغۆل) دەگەڕێتەوەو، دەشکرێت، ئەم ڕەعیەتە نوێیە سودی چاکیان لێ وەربگیردرێت، ئینجا چووە نێو وردەکارییەکانەوە کە: ئەندازەی باجو خەراجی سەر زەوییو زارەکانیان‌و گومرگی بەرو بازاڕو بازرگانەکانیان خۆی لە (٥٠٠) هەزار ئۆقیە زیوو و (٨٠) هەزار پۆشاکی ئاوریشم‌و (٤٠٠) هەزار جەواڵ دانەوێڵە دەدات، بەم شێوەیە جڵەوی جەنگەکەی بە لای خۆیدا ڕاکێشاو (جەنگیزخان) پەیمانیدا بە ئەندازەی ئەم بڕە باجەی ئەو داینا ڕەفتار بکات.[1]

---

١ المغول للعريني ص: ١٥٢.

ئەو ڕێزو قەدر دانانو سوود وەرگرتنەی لە لایەن (جەنگیزخان)ەوە باسی لێوە دەکرێت لە بەرامبەر خەڵکانی شارستان نشینو ڕۆشنبیرو زانایانو ئەزموندیدان، بە هەمان شێوە لە سەردەمی (ئۆغۆدای)ی کوڕی (جەنگیزخان)و جێگرەوەکەشی باسی لێوە دەکرێت، ئەم حەکیمە چینیە بە تەنیا ئیمپراتۆریەتی بەڕێوەدەبرد، توانی کاروباری (جێبەجێ کردنی سزاکان) لە ژێر دەستی سەرکردە دڵڕەقەکانی (مەغۆل) بێنێتە دەرو بیخاتە بەر دەستی ئەو قازیانەی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارەی دامەزراندبوون، بە هەمان شێوە کۆمەڵە کارمەندێکی پسپۆڕی بۆ وەرگرتنی باجو خەڕاج لەسەر خەزێنەی دەوڵەت دامەزراندبوون، ئازایەتیو زانایيو زیرەکی بیر تیژیەکەی سەرنجی سەرکردەکانی مەغۆلی بە لای خۆیدا کەمەندکێش دەکردو زۆری پێ سەرسام بوون، ئەو دەیزانی چۆن کاریگەرییان لەسەردانێ، بۆ وێنە: (خاقان ئۆغۆدای) زۆری مەی دەخواردەوەو پێوەی گیرۆدە ببوو، (حەکیم) زۆری حەز دەکرد ئەم خاقانە تەمەنێکی زۆری هەبێتو ماوەیەکی زۆر لە ژیاندا بمێنێتەوە، کاتێك بینی ئۆغۆدای لە زەلکاوی مەیدا نقوم بووەو ئامۆژگاریەکانیشی هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنن، ڕۆژێك پەرداخێکی لە ئاسن دروست کراوی بۆ هێنا کە مەی تێدا هەڵگیرابووو لێواری پەرداخەکەش بە کاریگەری مەیەکە خۆرکەی لێدرابوو، پەرداخەکەی دایە دەستو دەیگوت:ئەگەر مەی بەم شێوەیە کاریگەری لەسەر ئاسن هەبێت، خۆت دەکەمە حەکەم: دەبێ کاریگەری چۆنو چەند بێ لەسەر گەدەو ریخوڵەکانت؟!، (ئۆغۆدای) بەم بەڵگە بەهێزە وازی لە خواردنەوەی (مەی) هێنا.

جارێك (ئۆغۆدای) لە بەرامبەر کارێکی (وەزیر= کەحیم)ە چینیەکە پەست دەبێتو فەرمان دەدا بخرێتە نێو زیندانەوە، پاش ماوەیەك لە بڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوەو فەرمان دەدا ئازاد بکرێت، بەڵام (حەکیم) حەز ناکات بێتە دەرەوە، (ئۆغۆدای) پرسیاری لێ دەکات کە بە چ هۆیەك نایەیتە دەرەوەو نایەیتەوە بۆ کۆشکی دەسەڵات؟: وەڵامی دەداتەوە: تۆ منت کرد بە وەزیری خۆتو خۆشت زیندانت کردم، کەواتە من تاوانبارم، تۆ ئێستا ئازادت کردوم، کەواتە من ئازادمو ڕا هی خۆمە، بۆ تۆ ئاسانە من بکەیتە گەمەی دەستی خۆت، بەڵام پاش ئەمە چۆن دەتوانم کاروباری ئیمپراتۆریەت هەڵسوڕێنم؟!، پاش ئەمەو گێڕدرایەوە سەر کاری پێشووی خۆی – واتە وەزارەت ـ، هەندێك لە سەرکردەکانی مەغۆل تۆمەتی گەندەڵیان دەخستە پاڵو دەیانگوت لە سەردەمی (جەنگیزخان)و (ئوغۆدای)داو پاش کارەکانی سامانێکی زۆر بۆ خۆی پاشقول دەدات، بۆیە دوای مردنی چوون ماڵەکەیان

پشکنی، جگە لە چەند پارچە ئامێرێکی کۆنینەی مۆسیقاو چەند کتێبێکی خەتیو چەند نەخشەو خشتەو بەردێك کە نووسینیان لەسەر هەڵکەندرابوو هیچ شتێکی تریان نەدۆزیەوە.[١]

**٧ـ (کۆریلتای)= ئەنجومەنی گشتیو پایەکانی دەوڵەت:**

ساڵی جارێك ئەنجومەنی گشتی مەغۆل (کۆریلتای) کۆنگرەی خۆی دەبەست، ئەو شوێنەی بۆ دواهەمین جار لە ژیانی (جەنگیزخان)دا بۆ کۆنگرەکە ئامادەکرا شوێنێکی بەرفراوان بە ئەندازەی ٤٠ کم بوو، فراوانی شوێنەکە تا بڵێی خەیاڵی بوو، بە بیروبۆچوونی مەغۆلەکان: گیا لەسەر لێواری ڕووبارەوە زەوی داپۆشیوە، لەوەڕفرەیەو نێچیر زۆرە، کات سەرەتای بەهارە، ئەو مانگەیە کە بۆ کۆنگرەی (کۆریلتای) پەسندکراوە، سەرکردەکانی سوپا لە کاتی دیاری کراودا دێنو دەگەنەجێ، چ کەسیان دواناکەون، جگە لە (سۆبۆدای) کە ئەو لە (ئەورووپا)ڕا دێت، (جەنەڕاڵو خانو شاو نوێنەر)ەکان لە ئەمسەرەوسەری مەملەکەتەوە بەرێکەوتنو گەیشتنەجێ، ڕێیەکی زۆریان بڕی تا گەیشتنە کۆنگرەی پیاوماقوڵانی ئیمپراتۆریەت، ژمارەیەکی زۆر لە کەسو کارو دەستو پێوەندی خۆشیان لەگەڵ هاتن.

لە (چین)ڕا: عەرەبانە نەفەرهەڵگرەکان مانگا ڕایدەکێشانو بە ئاوریشم داپۆشرابوونو ئاڵایان لەسەر دەشەکانەوە.

لە چیاکانی تبت (یاك)ڕا: ئەو عەرەبانانەی سەرکردە سەربازیەکانیان هەڵدەگرتن، تەپڵەکی زێڕکفتو کەتانچن مبرنق یان بۆ کرابوو، وڵاخە بەرزەی (تبت) ڕایان دەکێشان کە خاوەنی شاخی پانو کلکی ئاوریشمی سپی بوون، گەورەبوونو لە لای مەغۆل گرانبەها بوون، بۆ هەڵگرتنی ئاڵاو بەیداخەکانیان بە کاریان دێنان.

لە (خۆراسان)ڕا: سەرپەرشتیاری سەرکردەی جەنگەکان هاتو بە خۆو بە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاخە بەرزەی سپیەوە گەیشتەجێ.

لە نێو بەفری کوێستانەکانڕا: (جەغتا) هاتە خوارو (١٠٠) هەزار سەر ئەسپی پێش خۆی داونو بە دیاری بۆ (جەنگیزخان)ی باوکی هێناون.

هەر هەموویان پۆشاکی زێڕو ئاوریشمیان لەبەر کردووەو فەروەی سمۆرەیان لە سەرو گەردنی خۆیان پێچاوە، بۆ پاراستنی ئەم پۆشاکە بە نرخەیان کەوڵی گورکیشیان بەسەردا لەبەر دەکرد، ئەسپەکانیشیان لە جیاتی لەبەرکردنی کەوڵ کە بە گۆڕانی ئاوهەواو هەتاو

---

١ جنكيزخان ص: ٣٢٠.

ڕەنگی تێك دەچوو بە زرێی زەنگوڵەدار زرێپۆشکرابوون و ڕازێنرابوونەوە، زینەکانیشیان زیوکفت کرابوون و تیشکی زێڕو زیو لەو نێوەدا ئاوی چاوانی دەبرد، هەر هەموویان لە نێو خێوەتێکی سپیدا کە جێی (٢٠٠٠) دوو هەزار کەس دەبۆوە کۆدەبوونەوە، خێوەتەکە دەرگایەکی تایبەت بە خانی هەبوو جگە لە ئەو کەسی تر بۆی نەبوو هاموشۆی پێدا بکات، وەکو تەواوی بۆنەکانی تر سەربازان و پاسەوانان لەوپەڕی ئامادەییدان و سەرو قەڵغانیان هەڵگرتبوو و بە شێوەیەك کەس نەیدەتوانی سنووری مەترسی پڕ سام و هەیبەتی ئەوان ببەزێنێت و خۆی بکاتە قوربانی و لە بارەگای (جەنگیزخان) نزیك بێتەوە، خەڵك چاکترین کەلوپەلی تالآنی خۆیان لە ئەسپ و ژن و چەك و چەکە کانزای بە نرخیان دەهێنان و دەیانکردنە دەستدیاری خۆیان بۆ خانی مەزن و دەیانخستە سەر خەزێنەکانی (نیوەی جیهان)ی ئەوکات، مێژوونووسێکی مەغۆلی دەڵێت: تا ئەو کاتە مەغۆل گەورەیی و شانازی لە شێوەی بە خۆوە نەدیبوو، ئێستا: ئەمیرانی ئیمپراتۆریەت لە جیاتی شیری ماین شیلەی هەنگوین و مەی سپی گرانبەهای فارس دەخۆنەوە، جەنگیزخان زۆری حەز لە مەی شیراز بوو،[1] ئێستا جەنگیزخان لەسەر تەختە زێڕەکەی سوڵتان محمدی خوارەزمی دادەنیشێ کە لە (سەمەرقەند)ڕا هێناویانەو تاج و گۆچانی سوڵتانی کۆچکردووشی لە لایە، (جەنگیزخان)یەکەم کۆبوونەوەی دەست پێکردو داوای لە ئامادەبووان کرد پوختە ڕاپۆرتی هێرش و پەلامارەکانی (٣) ساڵی ڕابردوویان پێشکەش بکەن، تا ئەو شوێنەی گوتی: وەك دەبینین بە هۆی جێبەجێکردنی (یاسا)وە چ پێشکەوتنێکی گەورە هاتۆتەدی و، چ دەسەڵاتێکی مەزن و باڵادەستمان دەستکەوتووە، کەواتە پێویستە هەموو لایەك فەرمانبەرداری قانونەکان بن.[2]

جەنگیزخان بە هەموو ئەمانە دڵخۆش نەبوو، بەڵکو گرنگترین شتێك بە بیروبۆچوونی ئەو کە پێویست بێ بێتەدی گەردنکەچی و خۆ بەدەستەوەدان بوو بۆ دەستووری ئیمپراتۆریەتی مەغۆل (یاسا)، ئەو ئیمڕۆ بە پێویستی نازانی ئامۆژگاری سەربازانی سوپاو سەرکردەکانیان بکات، چونکە ئەوان ئێستا دەتوانن لەسەر بەرپرسیارێتی خۆیان بڕیاری جەنگ بدەن و پەلامارەکانیان ئەنجام بدەن، ئەو بە ڕوونی تێبینی ئەو مەترسیە گەورەی دەکرد کە لە ئەنجامی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوانیاندا دێتەدی، بۆیە ڕووی کردە هەرسێ کوڕەکانی گوتی:

---

١ جنكيزخان ص: ٣٢٨.

٢ المصدر نفسه، ص:٣٢٨.

هەرگیز ڕێگە نەدەن ناحەزی لە نێوانتاندا دروست ببێ!، ماوەی مانگێك ئاهەنگ گێڕدران‌و سفرەکانیان بە خواردن‌و خواردنەوەی جۆراوجۆر ڕازاندنەوە، ئینجا بڵاوە کێنە بە کۆمەڵ دەکرێت، (جەغتای) بەرەو هەرێمی شاخاوی خۆی بەڕێکەوت، ئەوانی تریش هەموویان لە ڕێی گەڕانەوەیاندا ڕوویان لە (کەڕاکوم)-ی پایتەخت-کرد، (جەنگیزخان) دەڕوات‌و (سۆبۆدای) لە تەنیشتیەوەیەتی‌و باسی پاڵەوانیەتیەکانی خۆی لە جیهانی خۆرئاوادا بۆ باوکی دەگێڕێتەوە، پاش ئەمە (جەنگیزخان) خۆی بۆ قایمترکردنی پایەکانی ئیمپراتۆریەتە زلەکەی تەرخان کرد، کە لە (کۆریا)وە تا (کەنداوی عەرەب) درێژ ببۆوە، بەم شێوەیە بە چاودێری (یلوی شوتسی)ی حەکیمی چینی کاروباری بەڕێوەبردن‌و حکومڕانی بە شێوەیەکی پڕ وردەکاری‌و تێرو تەواو ڕێکخرا، ئەوەی زۆر جێگای سەرنج‌و تێڕامانە لە پێکهاتەی ئەم ئیمپراتۆریەتەدا مەسەلەی فرە ئاینییە، (جەنگیزخان) ڕاوێژکارێکی زۆری لە ئاینە هەمەڕەنگەکان: (بتپەرست، مەسیحی، بوزی، موسڵمان) لە دەورەی خۆی دانابوون‌و پرس‌و ڕای پێدەکردن.[١]

## ٨ـ ستراتیژیەتی مەغۆل:

بە حوکمی ئەوە مەغۆلەکان دراوسێی شارستانی چینی بوون: بۆیە ناکرێ کاریگەری بە هێزی ڕۆشنبیری چینی لەسەر کۆمەڵگای مەغۆل فەرامۆش بکرێت، زۆر لەوانەیە (جەنگیزخان) لە بواری جەنگدا بیروڕای سەربازی چینی کاریگەری لەسەر ئەو دانابێ، ئەمەش بۆ ئەو هۆکارە دەگەڕێتەوە کە کاتێك (جەنگیزخان) لە ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی (کین)ی چینی - کە بە ئیمپراتۆریەتی (زێڕین) ناوی دەرکردبوو - سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ژمارەیەکی زۆری زاناو سەربازو پیشەوەرو هونەرمەندانی چینی هێنان‌و بە زۆرەملێ خستنیە خزمەت ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی، مەغۆلەکان پێش سنوور بەزاندنی دیواری گەورەی (چین)یش لە لایەن بازرگان‌و دورخراوە سیاسیەکان‌و سەربازە هەڵاتووەکانی چین لە چنگ سنوور پارێزانەوە کاریان لەسەر کرابوو، ڕازی ئەم سەرکەوتنە سەیرەی مەغۆل لە سەرکردایەتی کردنی سوپادا دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی تەواوی ئەوان لە سروشتی جەنگ، بەوپەڕی زرنگی‌و فێڵبازیانەوە جەنگیان دەکردو دەرفەتیان بە دوژمن نەدەداو دەستی خۆیان دەوەشاندو سەرکەوتنەکانی خۆیان بەبێ نەرمی نواندن‌و ئاشتی دەپاراست‌و، لە هەمان کاتیشدا هەوڵیان دەدا ترس‌و بیم لە دڵ‌و دەروونی دوژمنەکانیاندا دابمرکێننەوەو بە

---

١ المغول ص: ٣٥٩ للصیاد.

هێمنایەتی درۆزنانەی بارودۆخەکە بیانخاڵەتێننو لە شەوە تاریکێکی ئەنگوستەچاودا وەکو بریسو خۆ بە شارو ماڵی دوژمنە خەوتووەکانیاندا دابکەنو قڕانیان تێ بخەن، مەغۆلەکان نەخشەکانی جەنگیان بەوپەڕی وردەکاریو بایەخ پێدانەوە لە کۆنگرەی گشتیان (کۆریلتای) کە بە ئەنجومەنێکی جەنگ دەچوو — ئامادە دەکردن، ـ پێش دەست پێکردنی هەر جەنگێك — ژمارەیەك سیخوڕو بەکرێگیراویان بە مەبەستی هێنانەوەی زانیاری تەواو لەسەر کاروباری سەربازیو سیاسیو ئابووریو جوغرافی دەناردنە نێو خاکی دوژمن، بەوپەڕی زرنگیو وریاییو نهێنی تاکتیکەکانی خۆیان لە دژی دوژمن بەکاردێنان، کە بە زاراوی ئیمڕۆ (تابووری پێنجەم)ی پێ دەگوترێت، دەست پێ دەکرد، لە چینو ئەورووپای خۆرهەڵات دا سیاسەتی (ترسو تۆقاندن) یان بەکارهێنا، لە فارس (ئێران)و وڵاتی (پشت ڕوباری جەیحون—) بڵاویان کردبۆوە کە ئەوان خەشمو قینی خوای گەورە — لە سەرزەویدا ـــ، پاش دانرانی نەخشەی جەنگەکە، سەرکردەکانی گۆڕەپانی جەنگیان دەستیان واڵادەکرا بۆ بەکارهێنانی بەهرەو زانیاریەکانی خۆیان، هەموو ساڵێك سەرەتای وەرزی دروێنەو کۆکردنەوەی خەڵەو خەرمان کە هێشتا جوتیارانو سەپانان لە نێو تەپوتۆزی کارو پیشەی خۆیاندا نوقوم دەبوون، هێرشی مەغۆلەکان بۆ جێبە جێکردنی ستراتیژیەتی گشتی یان دەستی پێ دەکردو، وەك ڕەوەی کوللە زەرد بەسەریاندا دا دەدانو ئەوەی پێویستیان بوایە لە دانە وێڵە بۆ خۆیان دەبردو بەرماوەکەشیان لە نێو دەبرد.

نوسەرێکی ئەورووپایی شێوازی جەنگو کوشتاری مەغۆلەکان بەو شێوەیەی بەسەر ئەورپایاندا هێناوە وەسف دەکاتو دەڵێ:

ئیمڕۆ ئەورووپا دەرك بە واتای جەنگی مەغۆلو لایەنەکانی دەکات، بەپێی ڕێنماییەکانی (جەنگیزخان) دەبێ دوای وەشاندنی گورزی یەکەم ترسو بیمو دڵەڕاوکێ باڵی ڕەش بەسەر سەرتاسەری وڵاتەکەدا بکێشێ، چۆن کارەساتێکی سروشتی — وەك بومەلەرزە — زەویو ئەوەی لەسەریەتی دەیلەرزێنێو خاكو تۆزی بە هەوادا دەداو دەستەوسانی بەسەر خەڵکەکەیدا دێنێ، دەبێ ئاواش — بە گورزی یەکەم — خاکی ئەو وڵاتە ڕاتەکێنێتو خەڵکەکەشی شل دەبێتو بە واق وڕماوی دامێنێ، هەستێکی وا لە ناخیان دروست ببێت کە هەر بەرگریکردنیان جگە لە شێتی چی تر نیە، ئەوانە شەیتانی کوڕی شەیتانن، خودا — ئەمانی وەك خەشمو قینو نەفرەتی خۆی بۆ سەر ئەوانە ناردووە.[١]

---

١ جنكيزخان ص: ١٦٨.

جەنگیزخان بە شێوەیەکی دراماتیکی خۆی پیشانی جیهاندا، پەردەی لەسەر نرخو بایەخی عەسکەرتاریەتی تێکەڵە لە (ئامادەسازیو ڕاگەیاندنو زەبتو ڕەبتو جوڵانو گورزەوەشاندن) هەڵدایەوە، جەنگەکانی (جەنگیزخان) چۆن لە سەردەمی خۆیدا وانەو پەندیان لێ وەردەگیران، ئیمڕۆش لە نێوەڕۆکیاندا شیاوی سوود لێ وەرگرتنن، بۆیە دانەرانی بیردۆزی جەنگی میکانیکی تازەو بانگەشەکەرانی جەنگی تانکو زرێپۆشی وەکو (جەنەراڵ فۆللەرو سیرلیدل هارتو هی تریش) پەنایان بۆ جەنگەکانی (جەنگیزخان) بردووە تا سوود لە ڕێنماییەکانی ببینن.[1]

چاکترینو بەپێزترین پەند کە لە ستراتیژیەتی مەغۆلیو دەستکەوتە سەربازیەکانیەوە فێری دەبین خۆ لە واقیعێکدا دەنوێنێ: کە ئەگەر سوپا خاوەن قەوارەیەکی ڕاهێنراوی یەك ڕەنگ نەبوبێتو لەسەر تێگەیشتنێکی گشتگیری فراوان گۆش نەکرابێتو بە یەکڕیزیو پێکەوە جۆش دراوی تاکەکانی — هەر لە سەرکردەی باڵاوە تا سەربازێکی بێ پلە — بەرەو ئامانجەکانی ئاڕاستە نەکرابێت، ئەوا ئەو سوپایە نەدەتوانێ بجەنگێ نەدەتوانی سەرکەوتن بە دەست بێنێ.[2]

نەخشەی ستراتیژی مەغۆل بەوە لە نەخشەکانی تر — جودا دەکرێتەوە: لەسەر دامەزراوەی سەربازی چەقی بەستبوو، ناوو ناوبانگی دەرکردبوو، بە چالاکیە عەسکەرتاریەتەکانو هێرشە خێراو لەنکاوو کتوپڕەکانو بەکارهێنانی فرتو فێڵو هەڵخەڵەتاندنو گەردن پێکەچکردنی هەموو کۆمەڵگا بۆ مەبەستە تایبەتیەکانیو خستنەگەڕی وزەیەکی زۆر لە توندوتۆڵکردنی بارودۆخو پابەندبوون بە قانونەکانی یاسا—و کێشانی شەونخونی بۆ جێبەجێکردنی هێزی سەربازی مەغۆل لەم کاروبارانەی خوارەوەدا دەستی باڵای هەبوو:

—دەستەبەرکردنی ڕاگەیاندنی ستراتیژی پێویست بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی تەفرەدانو هەڵخەڵەتاندنو سەر لێ تێکدان، بە مەبەستی پەرتەوازە پێکردنی دوژمن.

—بەرفراوانکردنی بازنەی ناکۆکیە نێوخۆییەکانی دوژمن.

—هەلخواستن لە خێراییو وزەی پێویست لە کاتی پەلامارو گورز وەشاندندا.

—چەکدارکردنی خەڵکە شکستخواردووەکەو بەکارهێنانیان لە سوپادا بە مەبەستی قەرەبووکردنەوەی ئەو وزە مرۆییەی لە هێزەکانیاندا کەوتووەو پەردەپۆشکردنی زیانەکەیان.

---

١ المصدر نفسه، ص:١٦٩.

٢ المصدر نفسه، ص:١٧١.

–داگیرکردنی شارەکان پێش ئەوەی هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکی جیددیان تێدا ڕوویدا.

–یەك ڕیزیەکی ڕاست و دروست و لە هەمان کاتیشدا ئاگا لە یەکبوونی مەفرەزە لێکدوورەکان.

هەموو ئەم سیفەتانە سەردەکێشێ بۆ پاراستنی وزە مرۆییە سنوردارکراوەکەو پاشانیش سەرکەوتنی، سەرکەوتنی سەربازی مەغۆلەکان لەسەر یەك ئاست بەدی نەهات بەڵکو لەسەر ئاستی بەکارهێنانی هەموو لایەنە شیاوو لێوەشاوەکان بە لایەنە نامەغۆلەکانیشەوە هاتەدی، چینیەکان چاکترین ئەندازیاریان لێ بەرهەم دەهات، تورکەکان خێراترین ئەسپیان ڕادەهێنان، موسڵمانەکان زۆرترین پاڵەوانیان لێ دەردەچوون، بەڵام مەغۆلەکان هەموو تواناو دەسەڵات و تایبەتمەندی مادی و ڕوحی و ڕەوانی خۆیان لە چەکدارکردنی نەتەوەیی و دروستکردنی هێزێکی سەربازی ئامادەساز بۆ جەنگ تەرخان دەکرد، مەغۆلەکان خۆیان لە تیرە و تایەفەگەری گواستەوە بۆ دەوڵەتێکی زلهێزی سەربازی هەمەڕەنگ و فرەڕەگەز، سوپا بەهێزەکەیان بە گورجوگۆڵی و لەسەر هەستی و بازنەدان بەسەر دوژمندا تۆکمەکردو پاراستیان، تۆڕەکانی پۆستەو گەیاندنیان و وێستگە زۆرەکانی ئەم تۆڕە لە هەموو هەرێمەکاندا، ڕێیان بۆ گەیشتنی وەڵامی خێراو بە پەلە خۆشتر دەکرد سەبارەت بە هەواڵی هەر کەس و خەڵکانێك دەست درێژیان بۆ سەر سنوورە دوورو درێژەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتە کردبایە، ستراتیژیەتی مەغۆل سەرچاوەکەی خۆماڵی بوو، بە گوێرەی توانای تەکتیکی و دەسەڵاتی ستراتیژی بۆ لواویان ڕاست دەبۆوەو گەشەی دەسەند.[1]

### ٩ـ داب و نەریت و کلتوری کۆمەڵایەتی:

مەغۆلەکان خاوەنی داب و نەریت و کلتوری کۆمەڵایەتی تایبەتی خۆیان بوون و جەنگیزخان و ڕۆڵەکانیشی لە دوای خۆی پێڕەویان لێ دەکردن، نەریتەکانی ئەم گەلە نامۆو ناوازە زۆرو بۆرن، ئێمە ئاماژە بەو نەریتە هەرە گرنگانەیان دەکەین کە لەسەردەمی جەنگیزخاندا بەشێکی پرۆسەی ستراتیژیەتی مەغۆلیان پێکهێنابوو:

وەك زانراوە مەغۆلەکان وەکو هەموو هۆزە ڕەوەندی و کۆچەریەکانی تر، لە نێو تاوڵ و ڕەشماڵدا نیشتەجێ دەبوون، بە شوێنی نیشتەجێبوونی گەرمێن و کوێستانی – زستان و هاوینی خۆیان دەگوت (یورس) یان (ئوردو)، بەپێی ئەم داب و نەریتەیان چەند شوێنێکیان

---

١ جنكيزخان ص: ١٧٤، ١٧٥.

بۆ نیشتەجێبوونی وەرزی هاوینیان دیاری دەکردن‌و پێیان دەگوترا (بێلاق)، بە هەمان شێوە بە شوێنی نیشتەجێبوونی زستانیشیان دەگوت (قیشلاق)، ئەمەو تا داگیرکردنی شارە گەورەکان‌و نیشتەجێبوونی ناچارییان لە کۆشکی پایتەختی هەرێمە داگیرکراوەکاندا، هەر لەسەر ئەم کلتورەیان دەڕۆیشتن، کاتێك لە گەرمێن (زستانە هەوار) یان کوێستان (هاوینە هەوار) یان هەڵدەدا، ژمارەی تاوڵ‌و ڕەشماڵەکانیان هێند زۆر بوون ناوچەیەکی بەرفراوانیان داگیردەکردو خۆیان بە شارێکی گەورە نیشان دەدا، ئەو خەڵکانەی تاوڵەکانیان لە دەورەی تاوڵی خان هەڵدەدا بریتی بوون لە: هەموو چینەکانی خەڵك لە: (سەرکردەکانی سوپا، سەرپەرشتیارانی قەزاوەت، کاتبەکان، پیشەوەران، بازرگانان، هی تریش)، پیشەوەرو سنعەتگەرەکان کەلوپەل‌و ئامرازە پێویستەکانیان بەرهەم دێنان‌و بازاڕی کڕین‌و فرۆشتنیان لەو شارە گەڕۆکانەدا گەرم دادەهێنا، بەپێی داب‌و کلتوری خۆیان: هەر کاتێك کارێکی گەورەو گرنگیان بۆ دەهاتەپێش، وەك دانانی شایەکی نوێ یان ئەنجامدانی پەلامارێکی سەربازی، لە ڕێگەی (ئیلینجیان) واتە (نوێنەرەکانیانەوە) بانگهێشتی میرو سەرکردەکانیان‌و کەسە نزیکەکانیان دەکردو لەسەر بەڕەی گفتوگۆو کۆبوونەوەی گشتی خۆیان ڕاوێژیان دەربارەی ئەم مەسەلە گرنگانە دەکردو بڕیاریان لەسەر دەدا، ئەم کۆڕو کۆبوونەوانە بە زمانی مەغۆلی پێی دەگوترا: (کۆریلتای)، بەڵام دەربارەی کلتوری (هاوسەرگیری)یان:

(خان) بە ئارەزووی خۆی حەزی لە چ ژنێك بووایە دەیکردە هاوسەری خۆی، ئەو پێڕەوی لە ڕێبازی فرەژنی دەکرد، وا باو بوو کە هەر کاتێك بەسەر شایەك یان میرێکدا زاڵبایە یان هاوپەیمانی یان یەکێتیەکی لەگەڵ سازدابایە، ئەوا – خان – هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی یان خوشکەکەی یان دایکی ئەنجام دەدا، ئەگەر بەسەریدا زاڵبایەو – شای – بکوشتایە: ئەوا هاوسەرگیری لەگەڵ ژنەکەی ئەنجام دەدا، جەنگیزخان ئەم کلتورەی پێڕەو دەکرد، گوتراوە: زیاتر لە (٥٠٠) هاوسەری هەبووە، هەروەها لە نێو مەغۆلەکاندا پیاو کام هاوسەرەی لە هەموو هاوسەرەکانی تری خۆشتر بویستایە، ئەوا ڕۆڵەکانی ئەو هاوسەرەی لە پێش ڕۆڵەی باقی هاوسەرەکانی تریەوە دادەناو حیسابی زیاتری بۆ دەکردن، وا باو بوو: دوای مردنی (خان) تەواوی هاوسەرەکانی دەخرانە بەردەستی کوڕە گەورەکەی، ئەو دەیتوانی حەزی لە کامەیان بێ – جگە لە دایکی خۆی – بیکاتە هاوسەری خۆی، هەروەها بۆی هەبوو بە شوویشیان بداتو دەشی توانی ئازادیشیان بکات،[1] تەواوی ڕۆڵەو خزمو کەس‌و

---

[1] المغول للصیاد ص: ٣٥٢.

کارە نزیکەکانی (خان) یان ( میر) پێیان دەگوترا (ئۆروغ) واتە (عەشیرەت) یان (پشت)، بەڵام دارو دەستەو ڕەعیەتی (خان)و تەواوی ژێردەستەکانی پێیان دەگوترا (ئولوس).[1]

**١٠ـ ئەفسانەو خورافە لە نێو مەغۆڵەکاندا:**

بە بیروباوەڕی مەغۆل شەیتانەکان کاریگەری گەورە لەسەر ژیان دادەنێن، زۆر لە سیحرو جادو دەترسان، (یاسا) سزاگەلێکی توندی لە خۆگرتبوو لە دژی هەر کەسێك تۆمەتبار دەکرێت بە ئەنجامدانی جادوو لە ڕێی ئەم کارەوە زیان بە خەڵك دەگەیەنێ، پێیان وابوو (کاهینە بوزیەکان) بە تەنیا ئەوان دەتوانن سیحرو جادوو هەڵوەشێننەوەو زیانەکانی بڕەوێننەوە، هەر یەکێك لەم – کاهین – انە پێی دەگوترا: (بەخش)، سیحربازیش پێی دەگوترا (قام)، ئەم کاهینانە – پڕوپاگەندەیان دەکردو دەیانگوت: کە ئەوان دەتوانن شەیتانەکان دەستەمۆ بکەنو خاوەن ڕۆحە شەڕەنگێزەکان هۆگریانن‌و بە فەرمانی ئەوان لەگەڵ شەیتانەکانو ڕۆحەکان هەواڵە نادیارەکان (غەیب) ڕاگەیەنن، لە کاتی هەورەتریشقەو بریسودا دەتگوت پۆلە باڵندە لەسەر سەریان وەستاوەو بێ دەنگ ڕادەوەستانو لە جێی خۆیان دەحەپەسان، ئەگەر وا ڕێکەوتبایە کەسێك بریسوی لێدرابایەو نەمردبایە، ئەوا لە لایەن ئەندامانی خێزانەکەیو هۆزەکەیەوە یەکسەر دەردەکراو تا تێپەڕینی (٣) ساڵ نەیاندەهێشت بێتەوە ژێر ڕەشماڵ، سەیرتر لەمە ئەوە بوو: کە ئەوان پێیان وابوو ئەگەر کەسێك لە وەرزی بەهارو هاویندا لە نێو ئاودا دانیشێ، یان دەستی بە ئاوی ڕووبار بشواتو ئاو بکاتە نێو قاپی زێڕو زیوەوە، یان بە پۆشاکێکی شۆراوەوە بچێتە دەشتو دەر، ئەوا لە ئەنجامی ئەمانەدا هەورەتریشقەو بریسو زۆر دەبێ، مەغۆلەکان ئەوەندەی لەمە دەترسان لە هیچ شتێکی تر هێندە نەدەترسان، بۆیەو بۆ خۆدوورخستنەوە لە هەموو ئەم مەترسیە سامناکانە: (یاسا) سزای زۆر توندوتیژی لە دژی ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانە – بە حیسابی ئەوان – ی دەرکردوون، کە دەبێ یەکسەر جێبەجێ بکرێن.

بەم شێوەیە مەغۆلەکان – بە دەربڕینی خۆیان : زیاتر لە هەموو هێزێك لە هێزی ئاسمانی هەمیشەیی دەترسان، هەورەکانو بریسوو هەورە تریشقەو گەردەلوولی بەفراوی لە ئاسمانەوە دێن، بە هەمان شێوە گەرمای بەهاریش لە ئاسمانەوە دێتو بارانو ژیان بە ڕووەكو گژوگیا دەبەخشێت.

---

[1] المصدر نفسه، ص: ٣٥٢.

هەندێك جار (جەنگیزخان) بە تەنیا دەچووە سەر لوتكە شاخێك‌و لە بەرامبەر ئەم هێزو دەسەڵاتە نهێنییەی نێو ئاسماندا سەری دادەنەواندو بە كەفو كوڵ دەپاڕایەوەو دەیگوت: (ڕۆحەكانی چینی ئاسمانە بەرزەكانم بۆ بنێرە تا قسەكانم بە ڕاست دانێن، بەڵام لەسەر زەویدا پیاوانێكم بۆ بنێرە تا پشتگیریم بكەن‌و یاریدەم بكەن).[١]

هەروەها هەندێك كەسیان پێیان وابوو بارینی بەفرو باران تەنها دەبێت لە ڕێی بەكارهێنانی ئەو ورتەورت‌و قسە پڕوپوچ‌و بێ واتاو نیشانانەوە بێت كە سیحربازەكان پەنایان بۆ دەبەن.

زۆر دڵڕەقانە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ نەخۆشەكانیان دەكرد، وا باوبوو كاتێك یەكێكیان نەخۆش دەبوو، لەسەر جێگەی خەوی بەجێیان دەهێشت‌و نیشانەیەكیان لەسەرماڵەكەی دەدا تا بزانرێت نەخۆشی لێیەو كەس بۆی نیە بچێتە ناوەوە، پێیان وابوو نابێ جگە لە خزمەتكارەكەی كەس سەردانی نەخۆش بكات، نوكە ڕمبێك لەسەر خێوەتەكەی دەدراو پارچە خوریەكی ڕەشیان تێوە دەهاڵاند، بەم نیشانەیە كەسی نامۆ نەیدەوێرا لەو خێوەتە نزیك بێتەوە، كاتێكیش نەخۆشیەكەی تینی بۆدێنا هەموو كەسانی دەوروبەری بەجێیان دەهێشت، چونكە كەسێك ئامادەی گیانكێشانی بێ دوایە بۆی نیە بچێتە نێو كۆشكی ئیمپراتۆرەوە یان نێوخێوەتی هیچ سەركردەیەكی گەورەی ترەوە تا مانگی نوێ هەڵدێتەوە، ئەوان بەم ڕەفتارەیان نەخۆشیان وەك پاتاڵێكی پیس‌و بۆگەن سەیردەكەن،[٢]

بەم شێوەیە ئەفسانەو خوڕافەی زۆر بە شێوەیەكی بێ ڕەزاو سەیر لە نێو هۆزو تیرەو تایەفەكانی مەغۆل بڵاو ببونەوەو تەشەنەیان سەندبوو، زۆر لە مێژوونووس‌و گەڕیدەكان باسیان لەمە كردووە.[٣]

مەغۆلەكان پاداشتی ئەو كەسانەیان دەدایەوە كە خزمەتی چاكیان دەكردن، یان لە كاتی مەینەتباری‌و تەنگەدەستی‌و ناڕەحەتیدا دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەكردن، ئەوان بەرامبەر بەم چاكانە پێزان بوون، زۆر گرنگیان بەم جۆرە كەسانە دەداو ڕێزو سۆزیان بۆ دەردەبڕین، ئەم سۆزلێنان‌و ڕێز لێگرتنە بەزمانی مەغۆلی (سیورغامش)ی پێ دەگوترا، زەوی‌و زاری كشتوكاڵی‌و موڵكو ماڵیان لەقەبەڵ دەكردن تابۆخۆیان بەرو بوومەكەی بخۆن، ئنجا ئەو زەوی‌و زارو موڵكو ماڵەیان دەكردە ماڵە میراتی خۆیان‌و دەیاندا بە نەوەو وەچەی

---

١ المصدر نفسه، ص: ٣٥٥.

٢ المصدر نفسه، ص: ٣٥٦.

٣ المصدر نفسه، ص: ٣٥٦.

ئەو کەسانە، میرات لەزمانی مەغۆلیدا (سیورغال)ی پێ دەگوترا، جارو بارە لەوحەی زێڕین یان زێوین یان تەختەداریان دەدا بەو کەسانە کە بە (مەدالیا)ی (سەردەمی نوێ) دەچوون، قەبارەی لەوحەکە بە ئەندازەی لە پەدەست گەورەبووو ناوی (ألله) یان ناوی (خان) یان وێنەی (شێر)ی لە سەر هەڵکەنرابوو کە ئەمەی دوایەیان هەرە بەنرخو بەرزەکەیان بوو، بەڵام کاتێك (خان) گومانی – خراپی – لە بەرامبەر یەکێك لە شوێنکەوتوەکانی بۆ دروست ببوایە، ئەوا حەواڵەی دادگای دەکرد تا دادگایی بکەن،[1]

پێیان وابوو: دروست نیە جگە لە یەك حوکمڕان لە سەر زەویدا حوکمڕانی تر هەبن و کێشمە کێشمی دەسەڵاتی لەگەڵ بکەن، بەبیروباوەڕی ئەوان: (یەك خودا لە ئاسمانەو یەك حوکمڕانیش لە سەرزەوی هەیە)، پێیان وابوو سەرپێچی کردنی (جەنگیزخان)و دەرچوون لە فەرمانبەرداری ئەو تاوانێکی گەورەیەو قابیلی لێخۆشبوون و چاوپۆشی – لێکردن نیە، چونکە بەبیرو باوەڕی ئەوان فەرمانو بڕیارەکانی (جەنگیزخان) لە ئاسمانڕادێن، سەرپێچی خانیش بریتیە لە سەرپێچی کردنی خودا، ئەندامانی خێزانەکەشی بەهەمان شێوە بەپیرۆز تەماشا دەکران، ئەگەر دەستدرێژی بکرێتە سەر یەکێك لەوان یان ئازارێکی توش ببێت ئەوا دنیا بۆیان دەخرۆشیو هەڵدەستیو دادەنیشی، ڕوخێنرانی شاری (نەیسابور)و سەرو ژوور پێکرانی بە هۆی کوژرانی (توغاجار)ی زاوای (جەنگیزخان)ەوە بوو، تەختکرانی (بامیان) لەگەڵ زەوی لە ئەنجامی کوژرانی (موتوجن)ی کوڕی (جەغتای)ی نەوەی (جەنگیزخان)ەوە بوو، ئەم بەڵگانە پشتگیری ئەم ڕاستیە دەکەن.[2]

مەغۆلەکان لەسەرەتای کاروباریاندا هیچیان لە کۆشکی فەرمانڕەوایو پایتەختو شارو خانوبەرەو شەقام نەدەزانی: لەبەر ئەمە هیچ بەرنامەو ڕێوڕەسمێکی دیاری کراویان نەبوو بۆ تاج لەسەر سەردانانو پێشوازی ڕەسمیو ئەنجومەنی پاشایەتی، بەڵکو ڕێوڕەسمی ئەم بۆنە دەوڵەتیانە بە سادەو ساکار بەڕێدەکران.

دوای مردنی (جەنگیزخان) کاتێك گەورە پیاوانی هۆزی مەغۆل ویستیان تاجی شاهانە لەسەر سەری (ئۆکتای خان)ی کوڕی جەنگیزخان بکەنو بیکەنە (خان) بەسەر خۆیانەوە، سەرەتا ڕۆژی ئەم ئاهەنگو ڕێوڕەسمەیان لە ڕێی ئەستێرەناسو سیحربازەکانەوە دیاری کرد، لەم ئاهەنگەدا – بەپێی دابو نەریتی خۆیان – کڵاوەکانیان لەسەر سەر هەڵگرتو

---

١ المغول للعريني ص: ٣٥٨.

٢ المغول للصياد، ص: ١٤٣.

بەرزیان کردنەوە، ئینجا (جەغتای) دەستەڕاستی (ئۆکتای) برای گرت، (ئۆکتین)ی برای (جەنگیزخان)یش دەستەچەپی (ئۆکتای) گرتو لەسەر تەختی — حکومڕانیان — دانیشاند، (تۆلی) جامە شەرابێکی پێشکەش کرد، پاشان تێکڕای ئامادەبوان بۆ ڕێزلێنانی (٣) جار لەسەر یەك ئەژنۆیان خستە سەر زەوی‌و کڕنۆشیان برد، ئینجا دولا هاتنەوەو لە ڕکوعدا پیرۆزباییان لێکرد، دوای کۆتایی هاتنی ئاهەنگی (تاج لەسەرنان) (ئۆکتای) لەگەڵ تێکڕای میرەکان هاتە دەرو (٣) جار لە بەرامبەر ڕۆژدا بەسەر ئەژنۆدا کەوتو کڕنوشیان برد، ئینجا بۆ خواردن‌و خواردنەوەی ئاهەنگ دانیشتن، دوای کۆتایی هاتنی ئاهەنگ مەغۆلەکان بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ لەسەر یەك چێشتیان بۆ ڕۆحی جەنگیزخان لێدەنا، (٤٠) کچیان لە میرزادەکان هەڵبژاردو بە جوانترین جوانیانەوەو ڕازاوەترین پۆشاکیانەوە بە نرخترین خشڵیانەوە سواری بە نرخترین‌و شۆخترین ئەسپیان کردن، بەڵام لە کۆتاییدا — بە بیروباوەڕی خۆیان — بۆ خۆشنودی ڕۆحی (جەنگیزخان) هەر هەموویان بە خۆیان‌و ئەسپەکانیانەوە کوشتن،[1] ئەمە بەشێك بوو لەو خورافیات‌و کلتورو داب‌و نەریتەی مەغۆلەکان باریان پێوە گرتبوو بەشێکیش بوو لە پرۆسەی داگیرکاریان.

## باسی سێهەم: لەنێوچوونی دەوڵەتی (خوارەزمی) بە دەستی (مەغۆل):

جوغرافی ناسانی موسڵمان ڕێکەوتون لەسەر دیاریکردنی سنووری هەرێمی (خوارەزم)، گوتویانە: سنووری لای خۆرئاوای (ولاتی تورکی غوززە)، سنووری لای خوارووی (خۆراسان)ە، سنووری لای خۆرهەڵاتی ولاتی ئەودیوڕووبارە، سنوری لای باکووریشی هەر ولاتی تورکە.[2]

(ئوستوخری) هەرێمی خوارەزمی بە بەشێك لە هەرێمەکانی (ئەودیو ڕوبار) حیساب کردووە، لەم نێوانەدا جوغرافیناسێکی تری سەدەی پێنجەمی کۆچی بە بەشێکی شارەکانی خۆراسانی حیساب کردووە،[3] لەوانەیە هۆی ئەم حیساب کردنەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەم هەرێمە لە سەدەی پێنجەمداو لە ساڵی ٤٣٠ك/١٠٣٨ز کەوتبووە ژێر قەڵەمڕەوی سەلجوقیەکان،[4] ئەم سنوور دانانەش واقیعی سیاسی سەپاندبووی نەك واقیعی جوغرافی.

---

١ المغول للصیاد ص: ٣٥٧.

٢ الدولة الخوارزمیة، د. نافع العبود ص: ١١.

٣ اکام المرجان في ذکر المدائن المشهورة في کل مکان ص: ١٤.

٤ أخبار الدولة السلجوقتي ص: ١٧.

بەڵام (یاقوتی حەمەوی) کە لەساڵی ٦٢٦ك/ ١٢٢٨ز دا مردووە: دەربارەی ئەم هەرێمە دەڵێ: خوارەزم ـ هەرێمیکی دابڕاوە لە خۆراسانو ئەودیو ڕووبار،[١] بەڵام لەم سەردەمەدا (خوارەزم) دەکەوێتە نێو یەکێتی سۆڤیەتی – پێشوو – و لە نێوان دوو کۆماری ئۆزبەکستانو تورکمەنستانی سۆڤێتی – پێشوو – دا دابەشکراوە،[٢] ئەمەش دوای داگیرکردنی ئەو هەرێمە سەربەخۆیە لە لایەن ڕووسەوەو لەسەرکارلابردنی خان (حیوة السید عبدالله خان بەهادور) لە ساڵی ١٩٢٤ز دا.[٣]

### یەکەم: سوڵتانەکانی (خوارەزم):

بنەچەکەی سوڵتانەکانی خوارەزم دەگەڕێتەوە سەر (ئەنوشتکین)ی کۆیلەی (بلباك)ی ئەمیری سلجوقی، کە کاتی خۆی لە وڵاتی (غور)[٤]ی سەر بە ئەفغانستانی ئەمڕۆ کڕیبووی، ئەو ئەمیرە سلجوقیە نیشانەکانی پیاوەتیو نەجابەتی لە جیسمی ڕێکوپێكو دەروونی هێدیو ئارامی (ئەنوشتکین)دا خوێندەوە، لێرەڕا پێش خۆیداو بردی بۆ کۆشکی (مەلیکشا)ی سوڵتانی سلجوقیو کاری (ئاوگێڕان)ی پێ سپێردرا.[٥] ئەم ئەرکە هەلی پلە بەرزبوونەوەی بۆ ڕەخساند، ئەوە بوو لە ساڵی ٤٧٠ك/ ١٠٧٧ز بوو بە سەرۆکی دەزگای نێوخۆپارێز (پۆلیس)ی هەرێمی خوارەزم، تا ساڵی ٤٩٠ك/ ١٠٩٦ز و ئەو ساڵەی تێیدا وەفاتی کرد لەسەر ئەم کارەی خۆی بەردەوام بوو، کاتێك (ئەنۆشتکین) کوڕە هەرە گەورەکەی خۆی – کە ناوی (قطب الدین محمد) بوو – بە مەبەستی خوێندنی (ئادابی سەرۆکایەتیو ڕێوڕەسمی فەرماندەیی) دەنێرێتە شاری (مەڕوە)، (قطب الدین محمد) لە ڕێی ئەم خوێندنەوە هەلی پلە بەرزبوونەوەی بۆ دەڕەخسێ، ئەمەو لە لایەن (میرزادە حەبەشی)ی حکومڕانی خۆراسانەوە کە سەر بە (بەرکیاروق)ی (سوڵتانی سلجوقی) بوو لە ساڵی ٤٩٠ك دا دەکرێتە والی هەرێمی (خوارەزم)و ناسناوی (خوارەزمشا)ی لێ دەنێ.[٦] لە مانگی (جەمادی یەکەمی) هەمان ساڵدا (بەرکیاروق)ی سوڵتانی (سلجوقی) (میر سنجر)ی برای دەکاتە حکومڕانی (خۆراسان)، (قطب الدین محمد)یش لەسەر کارەکەی خۆی مایەوە، تا ساڵی ٥٢١ك کاروباری هەرێمی (خوارەزم)ی بە فەرمانی (سنجر)ی حکومڕانی خۆراسان

١ معجم البلدان ٤/٤٠٠، الدولة الخوارزمية ص: ١١.

٢ الدولة الخوارزمية ص: ١٢.

٣ المصدر نفسه، ص: ١٢.

٤ نهاية الارب ٢٧/٢٩٧، الاتراك الخوارزميون ص: ١١.

٥ مفرج الكروب ٤/٣٢٢.

٦ الدولة الخوارزمية والمغول، حافظ الحمدي ص: ١٩.

بەڕێوەدەبردو گوێڕایەڵو پابەندی بڕیارەکانی بوو،[1] هۆی ئەم پابەندییەی (قطب الدین) دەگەڕایەوە بۆ زیرەکیو زرنگی خودی خۆیو پێزانیو ئەمەکناسی لە بەرامبەر چاکەی سلجوقیەکان کە لەگەڵ خۆیو باوکیان کردبوو، جگە لەوەش لەو سەردەمەدا سلجوقیەکان لە هەرەتی هێزو دەسەڵاتی تۆکمەو تەواودا بوون بە تایبەتیش لە سەردەمی فەترەی یەکەمی حکومڕانی سوڵتان (سنجر)دا، بەڵام (ئاتزی کوڕی قطب الدین محمد) کە لە ٥٢٢ك تا ٥٥١ك لە دوای باوکی حوکمی خوارەزمی گێڕا نەیتوانی ئارام بگرێتو لە ژێر ئەم فەرمانبەریەدا بمێنێتەوە، ئەوەبوو لە ساڵی ٥٣٠ك لە ژێر فەرمانی دەوڵەتی سلجوقی دەرچوو و لەگەڵ سوڵتان (سنجر) کەوتە ململانێیەکی درێژخایەنەوە، شاری (خوارەزم) (٣) جاران لە لایەن دەوڵەتی سلجوقیەوە ئابلۆقە درا، ئەم ئابلۆقانەلە ساڵانی (٥٣٣ك، ٥٣٨، ٥٤٢ك)یدا ئەنجام دران، دەرەنجامی هەرسێ ئابلۆقەکە بە گەردنکەچیو داوای لێبوردنو پێشکەشکردنی دیاریو بەخشش لە لایەن (ئاتسز)ەوە کۆتایی پێ دەهاتو سوڵتان (سنجر)ی سلجوقیش لێی قبوڵی دەکرد.[2]

لە ڕاستیدا سوڵتان (سنجر) فشاری دەرەکی لەسەر بوو و نەیدەتوانی بە تەواوەتی خۆی بۆ سەرکوتکردنو دامرکاندنەوەی سەرپێچیەکانی (ئاتسز) یەکلا بکاتەوە، هەر لەو سەردەمەدا سوپا گەورەکەی تووشی دوو دۆڕانی بێڕەزا بۆوە: یەکەم شکستی لە بەرامبەر هێرشی هۆزو تیرە بتپەرستەکانی (قەرەخەتای) بوو، کە ئەوکات حوکمی (تورکستان)یان دەگێڕاو هەڕەشەیان لە شارە ئیسلامیەکانی وڵاتی (ئەودیو ڕوبار) دەکرد، ئەم شکستە لە ساڵی ٥٣٦ کۆچیو لە گوندی (قەتوان) ڕوویدا کە (٥) فەرسەخ لە (سەمەرقەند)ەوە دوورە، لە ئەنجامدا: سوپای (سنجر) تەفرو تونا بوو و سەرکردەکانی سوپاو هاوسەری (سنجر) بە دیل گیرانو (سنجر)یش بەرەو شاری (تورمز) هەڵات، وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)یش بە تەواوەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی(قەرەخەتای)ەوە.[3]

لەگەڵ ئەوەدا (ئاتسز) دەستی لە هێنانی (قەرەخەتای)دا هەبوو بۆ سەر سلجوقیەکان — بە مەبەستی تۆڵە لێ سەندنەوەیان — بەڵام دوای ئەوەی بوونە مایەی هەڕەشە لە بەرامبەر (خوارەزم)دا بە ناچاری ئاشتی لەگەڵ ئەنجامدانو بەم پێیە ساڵانە (٣٠) هەزار دیناری باجو خەراج دەدا بە دەوڵەتی (قەرەخەتای).[4]

١ تأريخ ايران بعد الاسلام ص: ٢٨٣.

٢ الاتراك الخوارزميون، صبري سليم ص: ١٩.

٣ المصدر نفسه، ص: ١٩.

٤ المصدر نفسه، ص: ٢٠، تاريخ ايران بعد الاسلام ص: ٣٨٥.

شکستی دووەمی (سنجر) لە بەرامبەر هێرشی هۆزو تیرە تورکمانیەکانی (غوز) بوو کە لە دەوروبەری شاری (بەلخ) نیشتەجێ ببوون، ئەم شکستە لە ساڵی ٥٤٨ك/١١٥٣ز لە لای شاری مەڕوە ڕوویدا، لە ئەنجامدا: سەرکردەکانی سوپای (سنجر) کوژران‌و، خۆی‌و هاوسەرەکەشی دیلکران،[1] بەم شێوەیە لاوازبوونی حکومڕانی سلجوقیەکان لە ئێرانداو لە سەردەمی فەترەی دووەمی حکومڕانی (سنجر)دا سەری کێشا بۆ لاسەنگبوونی تەرازووی سیاسی‌و سەربازی لە ئاسیای نێوەڕاستدا، لە (خۆرهەلات)ڕا: مەترسیەکانی (قەرەخەتای) لە (تورکستان‌و ولاتی ئەودیو ڕووبار) کەفوکوڵیان دەکرد، لە (باشور)ڕا: تیرەو ڕەگەزەکانی (غوز) بە تایبەتی لە (کرمان‌و مەکران) سەرەتاتکێی هێرشەکانیان بەرەو زیادبوون دەچوون، لە (باکوور)ڕا: خوارەزمیەکان چاویان بڕیبووە سەروەت‌و سامانە سروشتیەکانی (خۆراسان)و دەیانەویست دەستی بەسەردا بگرن، سەرەڕای مردنی (ئاتسز)ی سوڵتانی خورەزم لە (٩)ی جەمادی دووەمی ٥٥١ك/١١٥٦ز یداو،[2] مردنی (سنجر)ی سوڵتانی سلجوقی لە (٤) ڕەبیعی یەکەمی ٥٥٢ك/١١٥٧زیداو،[3] ململانێی نێوان ئەم دوو سەڵتەنەتە کۆتایی پێنەهات، بەڵکو (ئەیل ئەرسەلانی کوڕی ئاتسن) کە لە ساڵی ٥٥١کۆچی تا ساڵی ٥٦٨کۆچی سوڵتانی دەوڵەتی خوارەزم بوو، دوابەدوای مردنی (سوڵتان سنجر) دەسەڵاتی خۆی بەسەر خۆرئاوای (خۆراسان)دا کێشا، دوای ئەویش (علا الدین تکش ی کوڕی ئەیل ئەرسەلان) کە لە ساڵی ٥٦٨ تا ساڵی ٥٩٦ی کۆچی سوڵتانی سەڵتەنەتی (خوارەزم) بوو، لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٣ز)یدا توانی لە لای شاری (ڕەی) چۆك بە (توغرولی سێهەم) سوڵتانی سلجوقی دابدات، بەم شێوەیە دەسەلاتی سەڵتەنەتی (سلجوقی) لە عێراقدا پێچرایەوە[4] و دەوڵەتی (خوارەزمی)یش لەگەڵ خاکی خیلافەتی عەبباسی بوونەوە بە هاوسنوور.[5]

دووەم: تێکهەڵچوونی نێوان دەوڵەتی خوارزمی‌و خیلافەتی عەبباسی:

ئەم هاوسنووریە ڕەزامەندی هەردووکلای لێ نەکەوتەوە، (الناصر لدین الله)ی خەلیفەی عەباسی (٥٧٥ـ٦٢٢ك) کە پێشدا بە ئومێدی ڕزگاربوونی لە دەسەلاتی سلجوقی دەستی لە پشتی خوارەزمیەکان دەدا، دوای ئەمە بۆی ڕوون بۆوە کە دوژمنە پیرو پەککەوتەکەی بە دوژمنێکی لاوی سەرسەخت گۆڕیوەتەوە، خوارەزمیەکان کە لە خۆرهەلاتەوە هاتبوون بەس

---

١ سلاجقة ايران والعراق، عبدالمنعم حسين ص: ١٣١.
٢ السلاجقة في التاريخ والحضارة، أحمد حلمي ص: ١١٨.
٣ العبر للذهبي ١٤٨/٤.
٤ الاتراك الخوارزميون ص: ٢١.
٥ المصدر نفسه، ص: ٢١.

بە داگیرکردنی موڵكو سامانی سلجوقیەکان وازیان نەهێنا، بەڵکو چاویان بڕیە هەموو ئەو پلەو پایە سەروەریانەی سلجوقیەکان لە بەغدا هەیانبوو لە: نووسینی ناوی خۆیان لەسەر سکەی پارەو هەبوونی کۆشکێکی تایبەت بۆ سوڵتانو هەروەها زاڵبوونی تەواویان بەسەر کۆشکی خیلافەت لە ڕووی کاروباری سیاسیو سەربازیەوە.[١]

بە مردنی سوڵتان (علاءالدین تکش)ی خوارەزمی لە ڕەمەزانی ٥٩٦ك/١٢٠٠ز هیچ شتێك لە بواری سیاسی گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، کاتێك (علاء الدین محمد)ی کوڕی ٥٩٦ـ٦١٧ك جڵەوی سەڵتەنەتی گرتەدەست، خوارەزمیەکان جارێکی تر داوای پێدانی ئەو پلەوپایە سیاسیانەیان کردەوە کە پێش ئەوان سلجوقیەکان لە خیلافەتی عەباسیدا هەیان بوون، بۆیە (ناصر لدین الله)ی خەلیفە بە ناچاری دەستی بەزمی پێشدای کردەوەو هانی (غۆری)یەکانی دەدا لە دژی خوارەزمیەکان بجەنگن.[٢]

پاشان زیاتر لەمە ورد بۆوەو میرو حکومڕانە نێوخۆییەکانی خۆرئاوای (ئێران)یشی لە دژ هاندان، بەڵکو هاوپەیمانی لەگەڵ (جلال الدین حەسەنی سێهەمی) ئیسماعیلی (٦٠٧ـ٦١٨)ی خاوەنی قەڵاکانی (ئیسماعیلیە) لە (کوهستانو ئالموتو ڕودبان) بەست، (جلال الدین) خۆی وانیشان دەدا کە وازی لە مەزەبی (ئیسماعیلیە) هێناوەو هاتۆتە سەر مەزەبی ئەهلی سوننەتو جەماعەت،[٣] سەرەڕای ئەمەش: خوارەزمیەکان دەسەڵاتی خۆیان لە تەواوی (ئێران)دا جێگیرکرد، لە باکوور: دەست بەسەر هەرێمی (مازندەران)ی باشووری (دەریای قەزوین)دا گیراو لە ساڵی ٦٠٦ك خرایە سەر دەوڵەتەکەیان،[٤] لە باشوور: لە ساڵی ٦٠٧ك دا دەست بەسەر هەرێمی (کرمان)و لە ساڵی ٦١١ك-یش دەست بەسەر هەرێمی (مەکران)دا گیرا، کە پانتایی ئەو دەشتە فراوانە لەخۆ دەگرێت کە بەسەر زەریای ئارامەوەیەو میناى ستراتیژی (هورموز)ی بازرگانی لێیە[٥]- (کە ئێستا بە بەندەر عەباس ناودەبرێت)، لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتدا: لە ساڵی ٦٠٣ك دا توانیان دوو شاری (هەراتو بەلخ) بخەنە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیانەوە کە لە چوارچێوەی دەوڵەتی (غۆری)دا بوون،[٦] (غۆری)یەکان لە ساڵی ٦١٢ك دا

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢١.
٢ الدولة الخوارزمية والمغول، حافظ حمدي ص:٣٧.
٣ تاريخ ايران بعد الاسلام ص: ٣٢٢، عباس اقبال.
٤ الخوارزميون والاتراك ص: ٢٢.
٥ المصدر نفسه، ص: ٢٣.
٦ المصدر نفسه، ص: ٢٣.

(غەزنە)ی پایتەختیان لێ گیرا،[١] حکومڕانییەکەی لەوانەوە بۆ (جلال الدین منکبرتی)ی کوڕە هەرەگەورەکەی سوڵتان (علا الدین تکش)ی خوارەزمی گوازرایەوە، کورتەی قسە لێرەدا ئەوەیە کە: دەوڵەتی (خوارەزمی) لەو کاتەدا گەیشتە ئەوپەڕی فراوانیو تێکگیرانی لەگەڵ خیلافەتی عەباسی ببوە شتێکی چاوەڕوانکراو.[٢]

لە ساڵی ٦١٤ك/١٢١٧ز (سوڵتانی خوارەزمی) سوپایەکی گەورەی ڕێکخستو بۆ خۆی پێشی کەوتو بەرەو خۆرئاواو بۆ هێرشکردنە سەر (بەغدا) بەڕێکەوت، پشت بەستوو بە فتوای کۆمەڵە زانایەکی ولاتی (ئەودیو ڕووبار) کە (الناصر لدین الله) بە شیاوی پۆستی خیلافەت نازانیّ، هیچ بە تاوانی نەزانی کە لە وتاری هەینیدا ناوی خەلیفە لاببات، پاشان یەکێك لە نەوەکانی (حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبیتالیب)ی لە شاری (ترمز) بە ناوی (علاءالدين أبو المكارم محمد بن أبي جعفر بن طاهر الحسيني)ی دیاری کردو کردی بە (خەلیفە)و ناوی لەسەر سکەی پارە (هەڵکەند)، بۆیە خەلیفەی عەباسی هیچکەی لە تواناتدا نەما دەستەپاچە لە بەرامبەر هەموو ئەم بەربەرەکانێیە پڕمەترسیە ڕامێنیّو ڕاوەستیّ، پاش ئەوەی کە بە چاوی خۆی بینی چیان بەسەر هاوپەیمانەکانیدا هێناو چۆن یەکەیەکە خستیاننە ژێر پێی خۆیانەوە،[٣] بۆیە خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسیە گەورە ئامادەکرد.

خوارەزمیەکان بە مرادی خۆیان نەگەیشتنو نەیانتوانی بگەنە (بەغدا)و خیلافەتی عەباسی بڕوخێننو (الناصر لدين الله)ی خەلیفە لەسەر پۆستەکەی لابەرن چونکە: کاتێك سوپاکەیان گەیشتە (ئەسەد ئاباد)ی خۆرئاوای (هەمەدان) گەردەلولێکی گەورەی بەفرو کرێوەیان بەسەرداهاتو ژمارەیەکی زۆر سەربازو ولاخیان تێداچوونو ماڵێکی زۆریشیان لیّ فەوتا، کوردەکانی دانیشتووی ئەو هەرێمەش بەسەریاندا دانو سوڵتانی (خوارەزمی)یش هیچ کونو کەلەبەرێکی وای دەست نەدەکەوت پێیدا بگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی خۆی.[٤]

سێهەم: هۆکارەکانی هێرشی (مەغۆڵ) بۆ سەر خوارەزمیەکان:

(جەنگیزخان) بیری لەوە کردەوە: کە کۆکردنەوەو چڕکردنەوەی هێزەکانی خۆی لە (ئەفغانستانو ئۆزبەکستان)دا لە کاتێکی وەك ئێستادا باشترین شتە بۆ خۆشکردنی ڕێگای

---

١ المصدر نفسه، ص: ٢٣.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٣.

٣ الاتراك الخوارزميون ص: ٢٤.

٤ المصدر نفسه، ص: ٢٤.

چوونە عێراقو ڕووخاندنی خیلافەتی عەباسی لە (بەغدا)، چونکە نێوانی چینو عێراق ماوەیەکی دوورو درێژە، کەواتە چاك وایە چەند بنکەیەکی گەورەی بە هاوارەوەچوونی جێگیر بۆ سوپای هێرشبەری مەغۆل لە نێوەندی چینو عێراقدا دامەزرێنێ، لە لایەکی ترەوە ئەم ناوچەیە ـ کە بە قەوقاز ناسراوە ـ لە ڕووی زۆری بەروبوومی کشتوکاڵو ئابوورییەوە وڵاتێکی دەوڵەمەندەو یەکێکە لە ناوچە شارستانیەکانی ئیسلامو خاوەن خەزێنەی پڕو سامانی زۆرو زەوەندە، زیاد لەمەش ئەو بە تاکتیك ناتوانێ لە دژی عێراق بجەنگێتو گەلانی موسڵمانیش لە پشتەوەڕا لێی بدەن، یان هێڵەکانی بە هاوارەوەچوونی لێ بگرن، هەموو ئەو هۆکارانە وای لە (جەنگیزخان) کرد کە لە سەرەتای کاریدا بیر لە هەڵایساندنی جەنگو هەرا بکاتەوە لە دژی ئەو ناوچەیەی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی، کە لەو کاتەدا بە (دەوڵەتی خوارەزمی) ناسرابوو ژمارەیەك لە هەرێمی بایەخداری ئیسلامی لەخۆ گرتبوون وەك (ئەفغانستان، ئۆزبەکستان، تورکمەنستان، کازاخستان، تاجیکستان، پاکستان، چەند پارچەیەکی (ئێران)یش)، پایتەختی ئەم دەوڵەتە فراوانە شاری (ئۆجەندە)ی وڵاتی تورکمەنستانی ئێستا بوو، (جەنگیزخان) نیمچە ڕێکەوتنێکی نێوان خۆشی لەگەڵ سوڵتان (محمدی کوڕی خوارەزمشا) ئەنجامدابوو، لەگەڵ ئەمەشدا جەنگیزخان لەو کەسانە نەبوو کە بایەخیان بە پەیمانەکانیان دەدا، یان ڕێزیان لە ڕێکەوتنەکانیان دەگرت، ئەم ڕێکەوتنەی تەنها بۆ ئەوە بوو تا ئاسایشی خۆرهەڵاتی ئاسیای بۆ دابین دەبێتو لە باری پشتەوەیڕا لە خۆی دڵنیا بێت، ئێستاش کە بارودۆخی ناوچەی چینو مەنغۆلیا جێگیر بووە، کەواتە کاتی ئەوە هاتووە بەرەو خۆرئاوا بڕواتو یەکەیەکە وڵاتانی ئیسلامی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە،[1] بەڵام چاك وایە جارێك ـ بەم ڕێکەوتنە درۆینە ـ جەنگ دیزە بە دەرخۆنەی لێ بکرێتو چاوەڕێی هۆکارێك بکرێتو بیانووی شەڕ بدا بە دەستەوەو بگوترێ کە ڕێکەوتنەکە بەسەرچووەو ئیدی کاری پێ ناکرێ، بۆیە (جەنگیزخان) لە هۆکارێکی ئاوا گونجاوی دەکۆڵیەوە،[2] چاوەڕێی کرد تا ئەو کاتەی ئەو هۆکارە هاتە پێشەوە، لەمەولا بە ئیزنی خودا قسە لەسەر ئەمە دەکرێت، بەڵام لێرەدا چەند هۆیەکی شاراوە لە پشت ڕوودانی ئەم هێرشە داگیرکاریە هەبوون، گرنگترینیان ئەمانە بوون:

---

١ تأريخ الدولة المغولية في ايران ص: ٥٠.

٢ قصة التتار، د. راغب السرجاني ص: ٢٢.

١ـ ئەو وشکەساڵیەی ئاسیای خۆرهەڵاتی گرتبۆوە:

بەهۆی وشکەساڵیو بێ بارانیەوە نەهاتی ڕووی لە (قەڕاقوم)ی پایتەختی جەنگیزخانو تەواوی وڵات کردبوو، بەردەوام حەوجێی خۆراکو ئازوخەو لەوەڕی پێویست بوون بۆ درێژەپێدانی ژیانی خۆیانو ئاژەڵەکانیان، بە هەمان شێوەش پێویستی زۆریان بە هەندێك کەلوپەلی تر هەبوو کە لە تەوژمە سروشتیەکانیان بپارێزێت وەکو جلو بەرگو شتی تریش، کاتێك (علاء الدين محمد خوارەزمشا) ڕێگاکانی بازرگانی لەسەر داخستنو نەیهێشت خۆراكو پۆشاكو کاڵای تریان بۆ بچێت، ئەمە وای کرد ڕوویان بەرەو — لێدانی — دەوڵەتی خوارەزمی بسوڕێ.[1]

٢ـ حاڵەتی بە ئاگایيو چوستو چالاکی مەغۆل:

مەغۆلەکان لەم کاتەدا لەوپەڕی بە ئاگاییو چوستو چالاکیدا بوو، سەرکەوتنەکانی پێشدای خۆیان لە چینو وڵاتانی تر بە بیر خۆ دێنایەوەو دەژیاندەوە، بەم هۆیەوە نەخشەیەکیان بۆ دەست بەسەرداگرتنی وڵاتە دراوسێکانیان دانا، دەنگوباسی دەوڵەتی خوارەزمیان پێگەیشت کە: چەندە فراوانەو خاوەنی بەروبوومو سامانێکی بێ ئەندازەو لەڕووی شارستانیشەوە لەوپەڕی ڕەونەقو جوانیدایە.[2]

٣ـ کوژرانی چەند بازرگانێکی مەغۆل:

هۆکاری ڕاستەوخۆو سەرەکی بۆ هەڵایسانی جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ کوژرانی چەند بازرگانێکی مەغۆل: پاش هەوڵە شکستخواردووەکەی (علاء الدين محمد خوارەزمشا) بۆ داگیرکردنی بەغدا لە ساڵی ٦١٥ك/١٢١٨ز و گەڕانەوەی بۆ (بوخارا)، (جەنگیزخان) وەفدێکی (٣) کەسی لە بازرگانە موسڵمانەکان کە لە (محمودی خوارەزمی، علی خواجەی بوخاری، یوسف کونکا ئەتراری) پێکهاتبوو ناردە لای (علا الدين محمد خوارەزمشا)، ئەم وەفدە چەند دیاریەکی بەرهەمهێنراوی ئاسیای ناوەڕاستیان پێ بوو بە مەبەستی گرێدانی چەند پەیوەندیەکی بازرگانی پتەو لە نێوان هەردووك دەوڵەتدا کە خزمەت بە بەرژەوەندی هەردوکلا بکات هاتبوونە ئەو وڵاتە،[3] (جەنگیزخان) نامەیەکی بە وەفدەکەدا ناردبوو، مێژوونووسان نامەکە بە نامەیەکی ناسکی مەغۆلەکانی ئەو کاتە وەسف دەکەن، تێیدا: داوای ئاشتیو هاوپەیمانیو گرێدانی ڕێکەوتنێکی بازرگانی نێوان هەردووك دەوڵەت دەکات،

---

١ الكامل لأبن الأثير ١٢/١٤٩، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٠.

٢ الدولة الخوارزمية، حافظ احمدي ص: ٦٧، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٠.

٣ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨١.

ئەمەی دادێ دەقی نامەکەیە: (نادیدە نیە لە لامان کە چەند شکۆدارو مەزنی، چەند دەست ڕۆیشتووو دەسەڵات فراوانی، زانیومە کە باڵادەستیو لە زۆربەی هەرێمەکانی زەویدا حوکم دەگێڕی، من پێم وایە ئاشتی کردن لەگەڵ تۆ بە ئەرکی سەر شان دەزانم، تۆش لای من وەکو خۆشەویستترین کوڕمی، لای ئێوە شاراوە نیە کە منیش حکومڕانی چینو دوای ئەوێش وڵاتە تورکەکان دەکەم، هەموو تیرەو هۆزەکانیان گەردنیان بۆ کەچ کردووم، لە هەموو کەس چاکتر دەزانی کە وڵاتی من مەڵبەندی سەربازانەو کانگەی زیوەو دەوڵەمەندەو بە خۆی بەڕێوەدەچێت، ئەگەر ئەمەت زانیو پێت چاك بوو ڕێگەی هاتوچۆی بازرگانیمان لەسەر ئاوەڵا بکە، سوودو بەرژەوەندی هەموو لایەك دەگرێتەوە)،[1] بە چاوپۆشی لەو مشتو مڕەی لەسەر نامەکە دروست بوو لە لایەن خوێنەرانیەوەو هەریەکە بە جۆرێکی لێکدەدایەوە، دەبێ نێوەڕۆکی نامەکە شکۆداریو مەزنایەتی سوڵتانی خوارەزمی بە کەم سەیرکردبێ؟، یان بە سۆزەوە نوسراوەو زیاد لە پێویست بە بەژنو باڵای سوڵتانی هەڵگوتووە؟، ئەوەی دوای خوێندنەوەی نامەکە ڕوویدا ئەوە بوو: کە (خوارەزمشا) پێناخۆش بوونی خۆی دەرخستو نیازی خراپی خۆی لە دژی (جەنگیزخان) ئاشکرا کرد، یەکێك لە نوێنەرانی جەنگیزخانی جودا کردەوە کە (محمودی خوارەزمی) بوو: بەڵێنی پێدا ئەگەر وەڵامی پرسیارەکانی بە ڕاستی بداتەوە بە چاکە لەگەڵی بجوڵێتەوە، وەك نیشانەیەك بۆ ڕاستو دروستی بەڵێنەکەشی بازنەیەکی گرانبەهای لە مەچەکی دەرهێناو پێشکەشی کردو مەرجی لەسەر دانا کە دەبێ ببێتە سیخوڕی ئەو لە دژی جەنگیزخان، پاشان بە حوکمی ترسو تەماع وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە.[2]

ئینجا داوای لێکرد ڕاستو دروستی نێوەڕۆکی نامەکەی جەنگیزخانی پێ بڵێ، کاتێك بە ڕاستی وەڵامی دایەوە، سوڵتان تووڕە بوو، ئینجا بە توندی داوای لێکرد ژمارەی جەنگاوەرانی سوپای (جەنگیزخان)ی بۆ ئاشکرا بکات، ــ لێرەدا لە پێناو سەلامەتیو لە ترسی ژیانی خۆی نەیوێرا بە دروستی وڵامی بداتەوە، بەڵکو بەوپەڕی زیرەکیو زرنگیەوە گوتی: سوپای جەنگیزخان لە بەرامبەر ئەم هەموو نەتەوەو سوپا زۆرە ـ ی تۆ–دا وەك سوارێك وایە لە بەرامبەر پۆلە سوارێکی زۆردا، یان وەك دوکەڵێك وایە لە بەرامبەر تاریکاییەکانی شەوێکدا، بەڵام (علا الدین محمد خوارەزمشا) وێڕای ئەم وەڵامەش ڕاستو

١ سیرة السلطان جلال الدین ص: ٨٣.
٢ سیرة السلطان جلال الدین ص: ٨٤، ٨٥.

دروستی هەڵوێستەکەی زانی، بۆیە نوێنەرەکان — ی جەنگیزخانی — بە خۆو بەو ڕێکەوتنو گرێبەستەی بۆی هاتبوون — لە هاموشۆی بازرگانان لە نێوان هەردووک دەوڵەتدا گەڕانەوە.[1]

٤ـ هاتوچۆی بازرگانان لە نێوان هەردوو دەوڵەتداو کوژرانی بازرگانانی (مەغۆل)

پاش واژۆکردنی ئەم ڕێکەوتنە بازرگانیە، (جەنگیزخان) بڕیاری دەستەبەرکردنی بازرگانی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئاسیای دەرکرد، هەوڵی تەواوی دا پشتێنەی بازرگانیەکە فراوان بکرێتو هێمنایەتی ڕێگاکانی لە دەست دزو جەردە دەستەبەر بکرێت، ئەمەو لەسەر ئەم ڕێگایانە چەند بنکەیەکی سەربازی بۆ پاسەوانی کردنی بازرگانیو کاڵاکانیان دانان، وەك (ابن العبری) دەڵێ پاسەوانەکان (قەراقەجییە)یان پێ دەگوتران بە واتای (پارێزگاران) دێ، فەرمانی بۆ پاسەوانەکان دەرکرد: کە هەر بازرگانێکی بیانی بە خۆیو کاڵاکانی هات دەبێت لەگەڵی بڕۆن تا دەیگەیەننە سەربازگەکانی مەغۆل.[2]

(جەنگیزخان) زۆری بایەخ بە لایەنی ئابووریداو دەیەویست هێزێکی ئابووری بێ‌پەزا دامەزرێنێ، بەم شێوەیە کاروانە بازرگانیەکان بە دەستوورێکی ڕێکوپێك لە نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئاسیادا هاموشۆیان دەکرد، لەو ساڵەدا کاروانێکی بازرگانی کە لە لایەن (٣) کەسی خەڵکی بوخاراوە سەرپەرشتی دەکراو کاڵاکانیان لە پۆشاکی زێڕ چنو پەشمینو لۆکە پێکهاتبوونو تریش کە لە خانەکانی مەغۆل دەوەشانەوە گەیشتە وڵاتی (جەنگیزخان)، پاسەوانەکان تەماشایان کرد یەك لە بازرگانەکان کە ناوی (احمد) بوو پۆشاکێکی پێیەو شایانی شانو شەوکەتی (خان)ە، بۆیە بەرەو کۆشکی خانیان بردن، کاتێك (احمد) چووە بەردەم خان، نرخێکی گرانی لەسەر پۆشاکەکە دانا، (خان) بەمە تووڕە دەبێتو هەموو کاڵاکانی لێ زەوت دەکاتو بەسەر دارو دەستەکانی خۆیدا دەیانبەخشێتەوەو ئەحمەدیش دەخاتە زیندانەوە، بەڵام دوو هاوەڵەکەی تری: کاتێك پێیان گوترا: نرخی کاڵاکانتان چەندە؟ لە وەڵامدا وتیان: ئەم کاڵایانەمان بۆ فرۆشتن نەهێناوە، بەڵکو دیاریەو بۆ خزمەتی (خان)مان هێناوە،[3] لەو کاتەدا (جەنگیزخان) فەرمانی دا زێڕو زیوێکی زۆریان لە پاداشتی ئەمەدا بداتێو دڵیشی لە بەرامبەر (احمد)دا نەرم بووو هەڵسوکەوتی دوو هاوەڵەکەی لەگەڵ کردو،[4] لێی بووری، ئینجا (جەنگیزخان) فەرمانی بە کوڕەکانو خانەکانو

---

١ تأريخ الخلفاء للسيوطي ص: ٤٦٩، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٢.

٢ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٨٥، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٣.

٣ تأريخ مختصر الدول، إبن العبري ص: ٤٠٠.

٤ تأريخ مختصر الدول، إبن العبري ص: ٤٠٠، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٤.

میرەکانی دا ژمارەیەك (بازرگانی) هاوەڵی خۆیان بە خۆیانو (بۆڵش)ی زێڕو زیوەوە لەگەڵ ئەم بازرگانانەدا بۆ – خوارەزم – بەڕێ بکەن، تا چ پارچەو کاڵایەکی بە نرخ هەیەو بۆ ئەوان گونجاوە بیکڕنو بیهێننەوە، مێژوونووسان دەربارەی ژمارەی ئەم بازرگانانە – ی مەغۆل – ڕایان جیاوازە، (نسوی) پێی وایە (٤) بوون، (ابن العبری) وتی: (١٥٠) بازرگانی موسڵمانو نەصرانیو تورکی بوون،[1] (جوینی) دەڵێ: (٤٠٠) بازرگان بوونو هەموویان موسڵمان بوون،[2] (إبن الأثیر)و (إبن خلدون)یش لەو نێوەدا ئاماژەیان بە ژمارە نەداوە،[3] ژمارەیان هەرچەند بووبێت، جەنگیزخان لە لایەن خۆیەوە نوێنەرێکی (مەغۆلی) بە نامەیەکەوە ناردۆتە لای سوڵتان (علاء الدین محمد خوارەزمشا)و تێیدا دەڵێ: بازرگانەکان – تان – گەیشتنە لامان، بە ساغو سەلامەتیو نۆکەری خۆمان لەگەڵ ناردوون تا هەندێك کاڵای نایابی وڵاتی ئێوەمان بۆ بێننەوە، پێویستە بە ساغو سەلامەتی بگەڕێنەوە لامانو ڕێکەوتنی نێوانیشمان داکۆکی لەسەر بکرێتەوەو دووڕوویی نێوانیشمان بنبڕ بکرێت.[4]

٥ـ کوژرانی بازرگانە مەغۆلەکانو دەستبەسەرداگرتنی پارەو کاڵاکانیان:

بازرگانە مەغۆلەکان گەیشتنە شاری (ئەترار)ی هەڵکەوتووی سەر سنووری خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (خوارەزم) کە ئەوکات دەروازەی بازرگانی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئاسیا بوو، حکومڕانی ئەو شارە (یەنالخان)ی خاڵۆزای (خوارەزمشا) بوو، (٢٠) هەزار سواریشی لەگەڵ بوو، (نەسەوی) دەڵێت: – ئەم حکومڕانە – نەوسە گڵاوەکەی حەزی چووە سەر ماڵەکەیان، ئەم خائینە پاتاڵخۆرە نامەیەکی بۆ سوڵتان بەڕێکرد، تێیدا دەڵێ: ئەم خەڵکە لە بەرگی بازرگاناندا هاتوونە (ئەترار)و بازرگانیش نین، بەڵکو هەموویان سیخوڕنو لە شتی وا دەکۆڵنەوە کە لەگەڵ پیشەکەیان یەك ناگرێتەوە،[5] ئیدی هێندەی بۆ تێچاندن تا لەنێوبردینان لە لایەن سوڵتانەوە بە شتێکی باش حیساب بکرێت، بۆیە داوای لێدەکرد، بڕیاری کوشتنی خۆیانو داگیرکردنی ماڵەکەیان دەربکات، (خوارەزمشا) داوای لێکرد جارێك تاڵوکەیان لێنەکاتو سەبرێکیان لەسەر بگرێت تا ئەو کاتە ڕای خۆی بە لایەکدا ساغ دەکاتەوە، بەڵام (یەنالخان) ئارامی نەگرتو چاوەڕێی ڕای سوڵتانی نەکردو سنووری بەزاندو

---

١ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٤.

٢ المصدر نفسه، ص: ١٨٤.

٣ المصدر نفسه، ص: ١٨٤.

٤ الدولة الخوارزمية ص: ٧٠.

٥ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٨٥ـ٨٦، تأريخ الخلفاء ص: ١٦٩.

قۆڵبەستی کردنو پاشانیش بێ سەروشوێن بوونو هەواڵیان نەما، ئینجا (یەنالخان) بە فرتو فێڵو ناپاکی هەمووماڵو کالا کەڵەکە کەوتووەکانی بۆ خۆی برد.[١]

ئەمەی گوتمان قسەی (نەسەوی) بوو و (سیوتی)یش پشتگیری لێ دەکات، بەلام مێژوونووسانی تر لە چەند ڕووەوە لەگەڵی جیاوازن:

أ- (نەسەوی) دەڵێ: (یەنالخان) لە نامەکەیدا سوڵتانی هانداوە ڕێگەی بدا دەستبەسەر ماڵەکەیاندا بگرێتو بشیان کوژێت، بەلام غەیری ئەو دەڵێن: ئەو جگە لە ناردنی هەواڵی گەیشتنیانو داوای ڕای سوڵتان دەربارەیان هیچ شتێکی لەمە زیاتر نەنووسیوە.

ب- کاتێك (نەسەوی) دەڵێ: سوڵتان فەرمانی پێدا جارێك بیانهێڵێتەوە تا ڕای خۆی دەربارەیان ساغ دەکاتەوە، بەلام (یەنال خان) پەلەی کرد سنووری بڕیاری ئەوی شکاندو بەبێ ئیزنی سوڵتان کوشتنی.[٢]

غەیری ئەو دەڵێن: (خوارەزمشا) سەرەتا فەرمانی دا جارێك بیانهێڵنەوە، دوای ئەمە بڕیاری کوشتنیانو دەستبەسەرداگرتنی ماڵەکەیانی دەرکردووە.

ج- (نەسەوی) دەڵێ: (یەنالخان) بە تەنیا ماڵەکەی بۆ خۆی زەوت کردووەو بەشی سوڵتانی لێ نەداوە، جگە لە ئەویش دەڵێن: ئەو دوای ئەوەی کوشتنی هەموو ماڵو کالاکانی بۆ لای سوڵتان نارد، سوڵتانیش بەسەر بازرگانەکانی سەمەرقەندو بوخارایدا دابەشکردنو نرخەکەی لێ وەرگرتن.[٣]

(فامبری) دەربارەی کوژرانی ئەو بازرگانانە دەڵێ: ئێمە (جوینی) بە ڕاست دەزانین کاتێك دەڵێ: خوێنی ئەوانە ڕێژرا، بەلام لە بەرامبەر هەر دڵۆپە خوێنێکیاندا ڕووبارە لافاوێك لە خوێن هەستا، سەریان بڕدرا، بەلام هەر تاڵە موویەکی سەریان بە نرخی ژیانی سەدان هەزار کەس تەواو بوو.[٤]

تەواوی بازرگانەکان - جگە لە یەکێکیان کە ڕێگەی هەڵاتنی پێدرابوو - هیچ کامێکی تریان ڕزگاری نەبوو، کاتێك گەیشتەوە کۆشکی (جەنگیزخان) چ کارەساتێك بەسەر هاوەڵەکانیدا هاتبوو بۆ جەنگیزخانی گێڕایەوە.[٥]

---

١ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٦، تأريخ مختصر الدول ص: ٤٠٠.

٢ العبر ٥/٥١٩، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٦.

٣ سير أعلام النبلاء ٢٢/٢٢٣، كيف دخل التتار بلاد المسلمين، د. سليمان العودة ص: ٢٣.

٤ تأريخ بخاري ص: ١٥٨، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٧.

٥ تأريخ بخاري ص: ١٥٩، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٧.

٦ـ بەکەڕخستنی دیبلۆماسیەتی مەغۆلی بۆ چارەسەری کێشەکە:

(جەنگیزخان) ویستی ئەم کێشەیە بە گرتنەبەری ڕێی ئاشتیانە لەگەڵ خوارەزمیەکان چارەسەر بکاتو پێشدا لە ڕاستی ڕووداوەکە ئاگاداربێت، بۆیە پەلەی نەکردو ڕای خۆی لەسەر چارەسەری ئاشتیانە دامەزراند، جەنگیزخان بەم هەنگاوەی دانایی‌و دووربینی خۆی سەلماند، هەروەك لە کاتی ڕووداوەکانی پێشوودا دەردەکەوێت کە (خوارەزمشا) چەند بە سامو هەیبەتە لە لای (جەنگیزخان)، بۆیە لێرەڕا دەستی بە ڕوخاندنی دەوڵەتەکەی کرد لە هەموو بوارەکانی دەروونی‌و سیاسی‌و سەربازی‌و ڕەوشتیەوە، (ئیبن کەفرەج بوغرا) و دوو (مەغۆلی)ی بە مەبەستی داوای ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکە ناردنە (خوارەزم)، نامەیەکیشی بۆ (علاء الدین محمد خوارەزمشا) پێدا ناردبوون، گوتبووی: (بۆ خۆت نووسیبووتو دەستی پەیمانت درێژکردبوو کە دەبێ بازرگانەکان پارێزگاریان لێ بکرێتو نابێ دەستدرێژیان بکرێتەسەر، ناپاکیت کردو پەیمانت شکاند، ناپاکی دزێوە، لە لایەن سوڵتانی ئیسلامەوە دزێوترە، ئەگەر دەڵێی (یەنالخان) بەبێ فەرمانی من ئەمەی کردووەو ڕاستیەکەی ئەوەیە، ئەوا (یەنالخان)م بدە دەست تا تۆڵەی ئەم کردەوەی لێ بکەمەوە، بەمە خوێن دەوەستێتو لەمە زیاتر نارژێت، ئەگەرنا ڕێگە بۆ جەنگێك دەدەی ڕۆحە بەنرخەکانی تێدا هەرزان دەبن‌و شیرو تیرو ڕمبی تێدا ڕاست دەبنەوە،[1] (علاء الدین محمد) هێند لە نامەکە پەست بوو تا کار بەوە گەیشت فەرمانی دا بە کوشتنی (ابن کفرج بغرا)، بەڵام دوو هاوەڵەکەی تری ئازاد کران‌و ڕێگەیان پێدرا بگەڕێنەوەو چ ڕوویداوە بیگێڕنەوە،[2] هەرکە هەواڵی ئەم دوژمنکاریە بە جەنگیزخان گەیشت، بە تووڕەیی یەوە گوتی: (دوو خۆر لە یەك ئاسماندا کۆنابنەوە، دروست نیە دوو (خاقان) لەسەر یەك زەوی هەبن)، ئینجا نامەیەکی سەرپێیانەی بۆ ناردو لە خراپەی دەرەنجامی کارەکەی ئاگادار دەکاتەوە: (تۆ بووی جەنگت هەڵبژارد، قەزاو قەدەر ناگەڕێتەوە، ئێمە نازانین دەرەنجام چۆن دەبێ، زانیاری ئەمە لای خودایە).[3]

بەم شێوەیە دەبینین کە (علاء الدین محمد خوارەزمشا) چۆن بەم سیاسەتە کاڵونەکولێوەی ڕووی هێرش‌و پەلاماری مەغۆلەکانی بە لای (خوارەزمیەکاندا) سوڕاند، ئەگەرا بە دوای دەرفەتێکی پێکەوە ژیان‌و هەموو دەرگاکانی بەڕوودا داخستن جگە لە دەرگای شەڕ نەبێ،[4] (برو) بەرپرسیارێتی هێرشی مەغۆل بۆ سەر موسڵمانان دەخاتە

١ مختصر تاريخ العرب، سير أمير ص: ٣٤٣، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٧.
٢ تاريخ الخلفاء للسيوطي ص: ١٦٩، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٨.
٣ هارلودلام، جنكيزخان ص: ١٩٧، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٨.
٤ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٨٨.

ئەستۆی (علاء الدین)و دەڵێ: ڕای دروست ئەوە بوو کە هیچ بەڵگەو بیانوویەك نەبوو ڕێ بە هێرشی مەغۆل بگرێت بەڵام چاوچنۆکیو ناپاکیو بەدقەولیو دوودڵی (علاء الدین)ی شای خوارەزم ڕێگای بۆ هێرشەکە خۆشکردو ناپاکیەکەی ئاشکرایە، چونکە ئەو نوێنەرو بازرگانە مەغۆلیەکانی کوشتوبڕ کرد، بەم ڕەفتارەی بیانووی دایە دەست جەنگیزخان تا هێرش بێنێ، دڵەڕاوکێیەکەش بەم شێوەیە بوو: کاتێك یەکەم گورزی مەغۆل بەر دەوڵەتەکەی کەوت لە جیاتی ئەو خۆبەگەورەزانیو شانو شەوکەوتەی پێشدا دەری دەخست، دەستی بە هاتو هاوارو بڵاوکردنەوەی ترسو دڵەڕاوکێ کرد لە نێو خەڵکدا،[١] کوشتو بڕی بازرگانو نوێنەرە مەغۆلەکانو زەوتکردنی کاڵاکانیان لە لایەن (علا الدین محمد خوارەزمشا) تەنها هۆکاری هاندەر نەبوو بۆ هێرشی (مەغۆل) بۆ سەر هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، بەڵکو هۆکارێکی سەرەکی تری ئەم هێرشە ئەوەبوو: کاتێك (سوڵتانی خوارەزم) دەوڵەتەکەی خۆی لەسەر حیسابی چەند وڵاتێکی تری خۆرهەڵات تا خۆرئاوای ئیسلامی فراوانکردو هەر وڵاتێکیشی داگیرکردبایە دەست بەجێ حکومڕانەکەی دەکوشت، ئەمە وای کرد — مەغۆلەکان — عەزمیان جەز مبێتو بە ئاسانی بتوانن هێرش بێننو دەست بەسەر وڵاتدا بگرن.

(إبن الأثیر) دەڵێ: ئەم (تەتارانە) — لەم هێرشەیاندا — کاریان ڕاست بوو و ئیشیان سەری گرت، چونکە هیچ بەربەستێك نەبوو پێشی پێ بگرێت، هۆی نەبوونی (بەربەست)یش ئەمەبوو: (محمد خوارەزمشا) دەستی بەسەر وڵاتان ــ ی ئیسلامی ــ داگرت، والیەکانی کوشتوبڕ کردن، بە تەنیا خۆی وەك سەرۆکی وڵات مایەوە، کاتێك تەنها خۆی لە بەرامبەر — مەغۆل — دا بەزی، سەرکردەیەکی تر نەبوو بەرگری لێ بکاتو وڵات بپارێزێت، ئەمەش تا خودا شتێك بێنێتەدی کە دەبوایە ببێ.[٢]

لێرەدا خەڵکانێك هەن هۆکاری داگیرکاری مەغۆل دەگێڕنەوە بۆ (الناصر لدین الله)ی خەلیفەی عەبباسی، کە گوایە ئەو (جەنگیزخان)ی هانداوە هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی خوارەزمی، (إبن الأثیر) ئەم تۆمەتە دەخاتە پاڵ خەلیفەو دەڵێ: کە عەجەم دەڵێن هۆکارەکە — هاندانی خەلیفە بووە — ڕاستو دروست وابووە، چونکە ئەو هانی تەتەرەکانیدا نامەو نامەکاری لەگەڵ ئەنجامدان تا چاو ببڕنە جیهانی ئیسلام، ئەمە ئەو کارەساتە گەورە بوو کە هەموو تاوانێکی گەورە لە پەنایدا خۆ بە چووك نیشان دەدا.[٣]

---

١ تاریخ الادب في ایران ص: ٥٥٦ـ٥٥٧.

٢ الكامل ١٢/١٤٩، عودة الروح للخلافة الاسلامیة ص: ١٨٩.

٣ عودة الروح للخلافة الاسلامیة ص: ١٨٩، الدولة الخوارزمیة ص: ٤٠.

دوابەدوای (إبن الأثير) چەند مێژوونووسێکی تری وەکو (ابن الوردي و ابن الفرات)یش هاتوونو ئەم تۆمەتەیان دووپات کردۆتەوە،[١] هەروەها هەمان تۆمەت لە نێو چەند کتێبێکی خۆرهەڵاتناسەکانیشدا هاتووە، وەکو (براون)، ئەو کاتێك باسی پەیوەندی نێوان خەلیفە (ناصر)و خوارەزمشا دەکات دەڵێ: خەلیفە هانی مەغۆلی دا هێرشی بکەنە سەر.[٢]

(هارولدلام و کارتن)یش بە جوتە گوتویانە: (خەلیفە) لە نامەکەیدا بۆ (جەنگیزخان) پێشنیاری کردبوو کە: تۆ لە خۆرهەڵاتەوە هێرش بکە سەر دەوڵەتی (خوارەزم)و منیش لە خۆرئاواوە هێرشی بۆ دێنم، پاشان بە جووتە تەختی دەکەین.[٣]

هەر کەسێك لە قسەکانی (إبن الأثير) وردبێتەوە یەکسەر تێدەگا کە چەندی رق لە (خەلیفە) بووەو بە مەبەستی زڕاندنی ناوەکەی تۆمەتباری کردووە، کاتێکیش هیچ سەرچاوەیەکی چاکی دەست ناکەوێت ناچار تۆمەتەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی نادروست کە خودی عەجەمە خوارەزمیەکان بوونو دژی (خەلیفە) بوون، بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە خەلیفە لەم تۆمەتە بێ بەریەو، شایانی باسە جگە لە (إبن الأثير) مێژوونووسێکی زۆر هەبوون لەو سەردەمەدا ژیاونو هیچ ئاماژەیەکیشیان بە بوونی پەیوەندی نێوان خەلیفە (ناصر)و مەغۆل نەکردووە، لە ڕستەی ئەم مێژوونووسانەدا:
(نسوي، سبط ابن الجوزي، ابن شداد، أبي شامة)و دوای ئەوانیش (إبن واصل، يونيني، إبن طباطبا) بەرچاو دەکەون، با سەبارەت بەو مێژوونووسە چینیانەی کە هاوڕێو هاوسەفەری (جەنگیزخان)و ڕۆمەکان بوون لە کاتی هێرشەکانیانداو پێ بەپێ مێژووەکەیان بۆ تۆمارکردوون، بێ ئاگا نەبین، خۆ نووسینەکانی ئەوان و لەبەر چاوی ئەو مێژوونووسە موسڵمانانەی پاشان بوونە نۆکەری مەغۆل نادیدە نەبوو،[٤] لەبەر ئەمە ئێمە تۆمەتبارکردنی خەلیفە بە هاندانی هێرشی داگیرکاری مەغۆل بۆ سەر دەوڵەتی خوارەزم بە دروست نازانینو ڕەتی دەکەینەوە، ئەو بە هیچ جۆرێك بە هۆکاری ئەم هێرشو پەلامارە حیساب ناکرێت، ئێمە پێمان وایە ڕەفتارەکانی (خوارەزمشا) بە تەنیا بەسەر بوویێتە هۆکاری هەستانی (جەنگیزخان) بەم هێرشە وێرانکاریەی سەر خۆرهەڵاتی جیهانی ئیسلام.[٥]

---

١ الاعلام للزركلي ١ـ٦، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٩٠.
٢ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٩٠.
٣ هارولدلام، جنكيزخان ص: ٩٠ـ٩١، عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٩٠.
٤ الحياة السياسية في العراق في العصر الأخير للقزاز ص: ٢٣١.
٥ عودة الروح للخلافة الاسلامية ص: ١٩١.

## چوارەم: هێرشی مەغۆل بۆ وڵاتی ئەودیو ڕووبارو عێراقی عەجەم:

### ١ـ وڵاتی ئەودیو ڕووبار:

دوا بە دوای کوژرانی بازرگانە مەغۆلەکان، (علاء الدين محمد خوارەزمشا) — کە لە شاری (بوخارا) بوو — هەندێك سیخوڕی خۆی بە مەبەستی زانینی چەندو چۆنی ئامادەسازی مەغۆل بۆ جەنگ بەرەو دەوروبەری کۆکشی حکومڕانی (جەنگیزخان) ناردن، ماوەیەکی دوورودرێژ مانەوە، لەو ماوەیەدا توانیان ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن، پاش گەڕانەوەیان گوتیان: مەغۆلەکان لە ژمارە نایەن، لە هەموو کەس ئارامگرترن لە جەنگدا، لە هەموو کەس شارەزاترن لە هونەرەکانی جەنگدا، چەندین کارگەی چەکیان هەیە، خوردو خۆراکی زۆریان هەیە، سیخوڕەکان بە تەواوەتی ڕاستیەکانیان گوتن و ئاماژەیان دا کە کەس ناتوانێ لە جەنگدا ڕووبەڕوویان بێتەوە.[1]

(علاء الدين محمد خوارەزمشا) بە قووڵی لەم زانیاریانەی کۆڵیەوە، ئینجا دەرکی بە گەورەیی هەڵەکەی خۆی کرد لە کوشتنی بازرگان و نوێنەرەکانی مەغۆل، لەم کارەی پەژێوان بۆوە، بەڵام ئێستا کاتی پەژێوانی نیە، بۆیە مێشکی خۆی خستە گەڕو دەستی بە دانانی چۆنیەتی کاری کرد،[2] لەم بارەوە ڕاوێژی بە پیاوێکی متمانەدار کرد کە (شهاب الخيوفي الفقيه)ی پێ دەگوترا، کاتێك هاتە بەردەمی پێی گوت: کارەساتێکی گەورە ڕوویداوەو پێویستە بیری لێ بکرێتەوە، خێرا ڕێیەك دیاری بکەین و کاری لەسەر بکەین: چونکە دوژمنێکی سەرسەختی تورك کە لە ژمارە نایەن خۆیان سازو باز کردووەو هێرشمان دەکەنە سەر،[3] (خیوفی) گوتی: کە چاك وایە نەفیر عام واتە ڕەشبگیری سەربازی ڕاگەیەنیٚو بانگهێشتی تەواوی والیەکانی وڵاتانی دەوروبەر بکات بە خۆیان و سوپاکانیانەوە پشتیوانی لێ بکەن، ئەگەر هەموو سوپاکان سازکران بەرەو ڕوباری (سەیحون)یان بەرێت کە سنووری دەوڵەتەکەیەتی لەگەڵ مەغۆل لە خۆرهەڵاتەوە،[4] بەڵام فەرماندەو ڕاوێژکارانی دەوڵەت، ڕایان پێچەوانە بوو، گوتیان کە چاك وایە خۆ لە مەغۆلەکان نەگەیەنرێت تا لە ڕووباری (سەیحون) دەپەڕنەوەو دەگەنە ئەو چاڵو چۆڵو دەشتو دۆڵو چیاو تەنگەبەرانەی شارەزایان نین و سەری خۆیانی لێ دەرناکەن و کە گەیشتنە (بوخارا)ش ماندوو شەکەتی تینیان بۆ دێنێو لەم

---

١ الكامل في التاريخ ٩/٣١٣، عودة الروح ص: ٣٦٤.

٢ الكامل لإبن الأثير ١٢/١٤٩ـ١٥٠، عودة الروح ص: ٣٦٤.

٣ عودة الروح ص: ١٩٣.

٤ الكامل في التاريخ ١٢/١٥٠، عودة الروح ص: ٣٦٤.

ساتە وەختەدا تێکڕا لە نێو دەبرێن و قڕایان تێ دەخرێت و سەرکەوتن مسۆگەر دەبێت،[١] هێندەی نەخایاند (خوارەزمشا) دەستی بە سازکردنی سوپا کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆل.[٢]

لە کاتێکدا (خوارەزمشا) بە خۆی و سوپایەکەوە بەرەو خۆرهەڵات دەڕۆیشت و خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل گورجوگۆڵ کردبوو، (جەنگیزخان)یش سوپایەکی گەورەی ڕێکخستبوو و ئەم فەرمانە توندو تیژانەی بەسەر سەربازەکانیدا دەخوێندەوە: دەی وەرن لەگەڵم، با بە هەموو هێزی خۆمان ئەو پیاوە لەنێو بەرین کە سوکایەتی پێکردووین و بە کەممان دەزانێ، ئێوە هەمووتان بەشدارن لە سەرکەوتنەکانمدا، با هەر فەرماندەی (١٠) کەسی یەك وەکو فەرماندەی (١٠) هەزار کەسی لەسەرپێ و ئامادەو بەئاگا بێت، هەر کەسێك سەرپێچی بکات یان لە ئەنجامدانی کارەکەیدا بیبەزێت و سەرنەکەوێ ئەوا ژیان و ژن و منداڵەکانی لەدەست دەدا.[٣]

أـ دەست بەسەرداگرتنی شاری (ئەترار):

لەساڵی ٦١٥ك/١٢١٨ز جەنگیزخان بە خۆی و سوپایەکی (٦٠٠) هەزار[٤] کەسی هەڵبژاردەی نێو سەربازەکانی لە خۆرهەڵاتی جیهانی ئیسلامیەوە دەستی بە داگیرکردنی وڵاتانی جیهانی ئیسلام کرد، سەرەتا لەسەر لێوارەکانی دەریای (سەیحون)ی نزیك شاری ئەترار جێگیر بوو، نەخشەی داڕشت لە پێشدا دەست بەسەر وڵاتی (ئەودیو ڕوبار)دا بگرێت کە لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرئاوا بە دوو ڕووباری سەیحون و جەیحون گەمارۆدراوە، لەبەر ئەمە بڕیاریدا پانەوپان لە چوار قۆڵەوە هێرشی بکاتەسەر بە جۆرێك سوپای بەرگریکاری خوارەزم توانای تێکشکاندنی ئەم هێرشە بەربڵاوەی نەبێت.[٥]

بەم شێوەیە هەرچوار سوپاکە لە یەك کاتدا دەستیان بە جموجۆڵ کرد تا بەسەر وڵاتی (ئەودیو ڕوبار) دادەن و دەستی بەسەردا بکێشن، (خوارەزمیەکان) هێرشیان کردە سەر سوپای مەغۆل، ئەمەو شەڕی دەستەویەخەو پێکهەڵشاخان لە نێوانیاندا گەرموگوڕ بوو، سوپای مەغۆلی ئەم قۆڵە بە سەرکردایەتی یەکێك لە کوڕەکانی (جەنگیزخان) بوو، ژمارەی

١ عودة الروح ص: ١٩٣.
٢ الكامل في التاريخ ١٢/١٥٠، عودة الروح ص: ١٩٣.
٣ عودة الروح ص: ١٩٤.
٤ المصدر نفسه، ص: ١٩٤.
٥ سيرة السلطان جلال الدين ص: ١٠٠، عودة الروح للخلافة ص: ١٩٥.

موسڵمانە کوژراوەکانی ئەم جەنگە (٢٠) هەزار کەس بوو، هی مەغۆلەکانیش لە زۆریان نەدەژمێران، لە شەوی چوارەمی جەنگەکەدا هەردوکلا لێك بوونەوە، موسڵمانەکان گەڕانەوە (بوخارا)، (خوارەزمشا) فەرمانی بە دانیشتوانی (بوخاراو سەمەرقەند) کرد خۆیان بۆ گەمارۆدران تاقەت بکەن، (٢٠) هەزار سەربازی لە (بوخارا)و (٥٠) هەزاریشی لە (سەمەرقەند) بەجێ هێشت، ئینجا بە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپا گەڕایەوە خوارەزمو خۆراسان.[١]

شاری (ئەتراڕ) زۆر بە چاکی مەحکەم کرابوو، هێزێکی (٥٠) هەزاری پاسەوانی بوونو سوپایەکی (١٠) دە هەزاریش بە سەرۆکایەتی (فەڕاجە)ی وەزیری سوڵتان هاریکاری دەکردن، ماوەی (٥) مانگ گەمارۆی سەر (ئەترار) درێژەی کێشا، تا کار بەوە گەیشت سوپای خوارەزمی لە بەرگری کردن شلو شەکەت بوو، ئینجا بەزیو تێکشکا، بەم شێوەیە داگیرکردنی شاری (ئەتراڕ)ی کلیلەی دەروازەی وڵاتی (ئەودیو ڕووبار) بۆ سوپای مەغۆل مەیسەر بوو.[٢]

هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ئەم شارە توندو تیژ بوو، هەڵوەدای (یەنالخان)ی حکومڕانی شارو بکوژی بازرگانەکان بوون، دەیانەویست بیگرنو تۆڵەی لێ بسێننەوە، ئەمەو لە ساڵی (٦١٦ك/١٢١٩ز) دەستیان بەسەر (ئەترار)دا گرت، تاڵانو بڕۆیان کردو دانیشتوانەکەشیان بەدەرێنا، (یەنالخان)یش پاشەوپاش بەرەو قەڵای شار کشایەوەو ماوەی مانگێك خۆی لەوێدا مەڵاسدا، لەم ماوەیەدا زۆربەی پیاوەکانی کوژران، لەگەڵ ئەمەشدا وەکو کەسێکی نائومێدو خوازیاری مەرگ بەرگری لە خۆی دەکرد، کاتێك بینی لە هەموو لایەکەوە دەورەدراوە، خۆی هەڵدایە سەر بانی ماڵێك، دوو سەربازی مەغۆلی بەدوای کەوتن، هیچی پێ نەمابوو بەرگری پێ لە خۆی بکا، لە لایەن ژنی ماڵەکان هەندێك بەردی بۆ هەڵدران، بەو بەردانە بەرگری لە خۆ دەکردو بەردبارانی سەربازەکانی پێ دەکرد، لە کۆتاییدا مەغۆلەکان قۆڵ بەستیان کردو بەرەو سەربازگەی جەنگیزخان پێش خۆیاندا، کە ئەو کاتە لە بەرامبەر شاری (سەمەرقەند) بوو، (جەنگیزخان) بڕیاریدا تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە، فەرمانی بە

---

١ الكامل في التاريخ ٩/٣٣١_٣٣٢، عودة الروح ص: ١٩٥.

٢ عودة الروح ص: ١٩٥.

پیاوەکانی خۆی کرد هەندێك زیو بتوێنەوەو بە چاوو گوێیدا بکەن، بەم شێوەیە (جەنگیزخان) بەڵێنە هەرەشەئامێزەکەی خۆی لە بەرامبەر بکوژانی بازرگانو نوێنەرەکانیدا هێنایەدی، بە ڕوخانی (ئەترار) دەروازەی وڵاتی ئەودیوی ڕووبار ئاوەڵا بوو.[١]

ب ـ دەستبەسەرداگرتنی شاری (جند):

دەربارەی سوپای دووەم کە لە ژێر سەرکردایەتی (جوجی)ی کوڕەگەورەی (جەنگیزخان)دا بوو، ڕووی لە شاری (جند) کرد لەسەر ڕووباری (سەیحون)، پاش داگیرکردنی زۆربەی شارو پەناگاکانی هەڵکەوتووی دەوروبەری سەر ڕووباری (سەیحون)و زاڵبوونی تەواوی بەسەر هەموو سەرچاوەکانی ئەم ڕووبارەدا، (جوجی) بە سوپایەکەوە لە شاری (جند) نزیك بۆوە، حکومڕانی شار کە بەمەی زانی بە شەو هەڵاتو کاروباری بەرگری کردنی شارەکەی بۆ دانیشتوانەکەی بەجێ هێشت، مەغۆلەکان بە مەبەستی ڕوخاندنی دیوارەکانی شار مەنجەنیقیان لە دەوروبەری (جەند) دامەزراندن، دانیشتوانی شار کە ئەم ئامادەسازیەی مەغۆلیان بینی دوو ڕایان بۆ دروست بوون، بە ڕای هەندێکیان بەرگری کردن پێویستە، بە ڕای ئەوانی تریش بەرگری کردن دادی نیەو چاك وایە خۆیانو شارەکەیان بە دەستەوە بدەن، بەڵکو ئەمە ببێتە تکاکارێکی باش خەڵك لە شمشێری مەغۆل بپارێزێت، زۆربەی خەڵکیش بە بەڵگەی ئەوەی مەغۆلەکان بە مەنجەنیق لە دیوارەکانی شاریان داوەو لە نێو شارڕا هیچ بەرگریەكو جموجۆڵێك لە دژی ئەوان دروست نەبووە پشتگیریان لە ڕای دووەم دەکرد، لە کۆتاییدا شار بە دەستەوە درا، کێ شەڕی کردبوو کوژرایەوەو تەواوی دانیشتوانیش خۆیان بە دەستەوەداو هیچیان لێ نەکرا، (جوجی) چەند حکومڕانێکی دڵسۆزی لەسەر شارە داگیرکراوەکان دانانو پاشان فەرمانی بە سەربازەکانی ددەدا لە ڕووبار بپەڕنەوەو بەرەو هەرێمی خوارەزم بەڕێ بکەون.[٢]

ت ـ دەست بەسەرداگرتنی (بنکت وخجندە):

بەڵام سوپای سێهەمی (جەنگیزخان) ڕووی لە شاری (بانکۆت)ی سەر ڕووباری (سەیحون)و شاری (خەجەندە)ی لای باشووری ڕووبارەکە کرد، دانیشتوانی (بانکۆت) بەبێ دەستکردنەوە خۆیانو شارەکەیان بە دەستەوەداو مەغۆلەکانیش پەیمانی پاراستنی سەرو ماڵیان پێدان، بەڵام ئەم مەغۆلانە کە هیچ لە واتای پەیمانو بەڵێن نازانن کاتێك چوونە نێو

---

١ الدولة الخوارزمية للمغول، حافظ احمد ص: ١٣٩.

٢ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٤٠.

شارەوە سەربازو خەڵکیان لێك هەڵاواردو ئینجا سەربازەکانیان کوشتن، لە نێو خەڵکەکەشدا کام گەنجە کەڵەگەتو بەبڕشتە هەڵیانبژاردنو خستیاننە نێو ڕیزی سوپای مەغۆڵەوە تا لە جەنگدا بەکاریان بێنن، ئینجا مەغۆڵەکان بەرەو باشوور بە لای دەستەڕاستی شاری (خەجەندە)ی سەر دەریای (سەیحون) ڕۆیشتن، - شاری خەجەندە بە باخچەو پارکەکانیو بەرو بازاڕەکانی ڕازابۆوە، دانیشتوانەکەشی بە ئازایەتیو بوێری ناسرابوو-.

(تیمور مولك)ی سەرکردەی پاسەوانانی خوارەزمی لەو شارەدا، بە چاکی زانی بە خۆو بە (١٠٠٠) سەربازەوە بچێتە دوورگەیەکی بچووکی نێو ڕووبارەکەو لە قەراغەکانی دوورکەوێتەوە، بەم کارەی خۆ لە تیربارانی مەغۆڵەکان دوور دەخاتەوەو شوێنێکی باشیشە بۆ خۆپەنادان.

زیاتر لە (٢٠) هەزار سەربازی مەغۆلی کە پێشدا بەشداریان لە گرتنی شاری (ئەتراڕ)و شارەکانی تردا کردبوو و بە پشتیوانی (٥٠) هەزار گەنجی ڕەشبگیرکراوی خوارەزمی گەمارۆی (تەیمور مولك)یان دا، گەنجە خوارەزمیەکانیان بردنە سەر شاخو لەوێڕا گاشە بەردیان پێ هەڵدەدانە نێو ڕووبارەکەوە تا پردێك بۆ مەغۆڵەکان دروست ببێتو خۆی پێدا بگەیەننە (تەیمور مولك)و سەربازەکانی، بەڵام (_تەیمور مولك) بڕیاریدا نەخشەکەیان پوچەڵ بکاتەوە، (١٢) کەشتی گەورەی بە دروستکردن دانو لاتەنیشتەکانی بە پێستە دادەپۆشین، هەموو ڕۆژێك (٦) کەشتی پڕ سەربازی دەناردنە سەر ئەو مەغۆڵانەی کاریان لەسەر پردە بازەکە دەکردو تیربارانیان دەکردن، (تەیمور مولك) لە کۆتاییدا بۆی دەرکەوت کە بەرگری کردن هیچ سودێك نادا بە دەستەوە بۆیە بڕیاری هەڵاتنی دەرکرد، پاش ئەوەی بارگەو کەلوپەلەکەی خۆیو سەربازەکانی لە (٧٠) وڵاخ بارکرد، چونکە مەغۆڵەکان لە سەر هەردوك لێواری ڕووبارەکە هەبوون، ئەوا ئەو بە نێوەڕاستی ڕووبارەکەداو بەرەو باکوور ملی لێنا، کاتێك بەم شێوەیە دەڕۆیشت بە فێڵی (جوجی) کوڕی (جەنگیزخان)ی زانی کە هێزێکی گەورەی مەغۆلی لە نزیك (جەند) لەسەر هەردوو لێواری ڕووبارەکە کۆکردۆتەوەو بەری ڕووبارەکەی بە کەشتی گرتووە، بۆیە (تەیمور مولك) بە ناچاری لە ڕووبارەکە هاتە دەرو بە سواری ئەسپەکەی خۆی بە نێو دوژمندا کرد، شەڕێکی گیانبازانەی لەگەڵ کردن، لەگەڵ ئەمەشدا توانی بە فێڵ خۆی دەرباز بکاتو لە کۆتاییدا بگاتە شاری (خوارەزم)، کە ئەو کاتە (جلال الدين مەنکەبەرتی)ی کوڕی (علا الدين خوارەزمشا) سەرکردایەتی پاسەوانەکانی ئەو شارەی دەکرد.[1]

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٤٤.

ث ـ دەست بەسەرداگرتنی شاری (بوخارا):

(بوخارا) یەکێك بوو لە شارەکانی وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)، مەغۆلەکان چاوی داگیرکەرانەیان تێ بڕی، لە کۆتایی ساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز)دا (جەنگیزخان) بە خۆو بە سوپایەکی زلەوە لە دەوروبەری شار جێگیر بوو، هەر بە گەیشتنی گەمارۆیەکی توندو تیژی خستە سەر، (٢٠) هەزار سەربازی موسڵمان ئەرکی بەرگری کردنی شاریان لەسەر شان بوو،[1] –ئێستا (بوخارا) شارێکی دەوڵەتی ئۆزبەکستانە، شاری ئیمامی مەزنو موحەدیثی گەورە (محمد اسماعیل البخاری)ی خاوەنی (صحیح البخاری)یە–.

ماوەی (٣) ڕۆژ لەسەریەك هێرش کرایە سەر شار، دوای ئەمە سوپای بەرگریکار لاوازیو کەم فێڵی لێ دەرکەوت، بۆیە پاشەوپاش بەرەو خۆراسان کشایەوە، بە حیسابی ئەوە ڕزگاری بێ، بەڵام ڕێبازی دەربازبوونو کشانەوە بەنێو ئەو هەموو ڕەشە سوپایەی مەغۆلدا مەحاڵ بوو، سوپای ئیسلامی لەسەر جەنگ بەردەوام بوو، شتێکی سەرکەوتن بەدەست هێنا، بەڵام لە کۆتاییدا سەری شکێنرایەوە، مەغۆلەکان بەدوایان کەوتن تا لە نزیك ڕوباری (جەیحون) شکستی گەورەیان دەرخوارددانو جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێ کەسیان لێ دەرباز نەبوو،[2] – پاش ئەمە – ئەو خەڵکەی لە شاردا مابۆوە تەماشایان کرد هێزەکەیان دەستەپاچە بووەو نائومێدی چۆتە هەناوی هەموو لایەکەوەو سەربازە ئازاکانیان شار جێ دێڵن، بۆیە (بدرالدین)ی قازی شاریان ناردە لای مەغۆلەکانو پێشنیاری بە دەستەوەدانی شارو چەپاڵەدانی خەڵکەکەیان کرد، (جەنگیزخان) وەڵامی دایەوەو لە (٤ی قوربانی ٦١٦ك/ ١٢١٩ز[3])یدا دەرگاکانی شاری بوخارا بەسەر سوپای مەغۆلدا ئاوەڵاکران، (جەنگیزخان) چووە نێو شارەوەو بە پەنا مزگەوتی (هاشم)دا تێپەڕی، وەیزانی کۆشکی (سوڵتان)ە، بۆیە بە سواری ئەسپەکەیەوە چووە ناویەوە، کاتێك پێی گوترا: ئەمە مزگەوتەوماڵی خودایە، لە ئەسپەکەی دابەزیو چووە سەر مینبەری مزگەوتو هاواری کردو گوتی: (ئالیك بڕاوە، خواردن بدەنە ئەسپەکان)، مەغۆلەکان لەم دەستەواژەی جەنگیزخان حاڵی بوون کە ئاماژەیان پێ دەدا شار تاڵان بکەن، یەکسەر پەلاماری چەند سندوقێکیان دا کە لە قوژبنی مزگەوتدا دانرابوونو چەند قورئانێکی گەورەیان تێدابوون، پەرپەریان کردنو خستیاننە بەر سمی وڵاخەکانیان، بەم شێوەیە مەغۆلەکان سوکایەتیان لە بەرامبەر قورئانو مزگەوتو

---

١ سیرة السلطان جلال الدین ص: ١٠٠، عودة الروح ص: ١٩٨.

٢ الکامل في التاریخ ٩/٣٣٢، عودة الروح ص: ١٩٨.

٣ الکامل في التاریخ ٩/٣٣٣، عودة الروح ص: ١٩٨.

ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ئەنجامدا، مەیان لە پەنا مزگەوتدا دەخواردەوەو گۆرانیبێژیان لە شارەکانرا دێنان و لە دەوری مزگەوت دەیانخواردەوەو گۆرانییان پێ دەگوتن.[1] پیاو ماقوڵ و ئیمامە گەورەکانیان دێنان و لە کۆڕی مەی خواردنەوەو گۆرانی و سەمادا خزمەتی سەربازە مەغۆلەکانیان پێ دەکردن،، یان دەبوایە بە گوێرەی ئاوازی مۆسیقای مەغۆل خودی خۆیان سەمایان بۆ بکردبانایە، (لیسوس البغال) یەکێك بوو لە نێو ئەو گەورە زانایانەی ئەم دەورەیان پێ دەبینین.[2]

پاش ئەمە (جەنگیزخان) خەڵکەکەی کۆکردەوەو داوای لێکردن سەرمایەدارەکانی بۆ دیاری بکەن، (٢٢٠) کەسیان بۆ دیاری کردن کە لە نێوانیاندا (٨٠) زەنگین دەبینران، داوای لێکردن لێی نزیك ببنەوە، قسەی زۆری بۆ کردن و بۆی ڕونکردنەوە کە ئامانج لەم هێرشەی تۆڵە سەندنەوەیە لە سوڵتانی خوارەزم، ئینجا گوتی: هەڵەیەکی گەورەو قێزەونتان ئەنجامدا، سەرۆکەکان هەر هەموویان تاوانبارن، ئەگەر پرسیار بکەن من کێم؟ پێتان دەڵێم: من تۆڵەی خودام لەسەر زەویدا، ئەگەر ئێوە تاوانبار نەبوونایە ئەوا خودا ڕێگەی منی نەدەدا بەم شێوەیە سزاتان بدەم،[3] دوای ئەوەی لە قسەکانی بۆوە، فەرمانی پێدان کە هەرچی خەزنەی شارەکەیان هەیە دەری بێنن، ئەگەرنا بۆ خۆی دەزانێ چۆناوچۆن بیاندۆزێتەوە، سەرو سەربازی مەغۆلیشی کردە پاسەوان و چاودێریان تا بە تەواوەتی خەزنەکانیان پێ کەشف بکەن.

(٤٠٠) سەربازی خوارەزمی کە لەگەڵ هێزی پاسەوان دەرنەچووبوون و لە نێو شاردا مابوونەوە خۆیان لە (قەلا)ی شاردا مەلاس دابوو، مەغۆلەکان گەنجەکانی شاریان ڕەشبگیرکردن و چەکیان دانێ و بەرەو (قەلا) پێش خۆیان دان، قەلاکەیان گەمارۆدا پاش کونکردنی دیوارەکانی بۆیان چوونە ژوورەوەو هەر هەموویان کوشتن، ئەم تاقمە سەربازە موسڵمانە بەوپەڕی ئازایەتی ماوەی (١١) ڕۆژ بەرگری کردو ژمارەیەکی زۆری لە مەغۆلەکان کوشت، وێڕای ئەمانیش ژمارەیەکی زۆری لەو موسڵمانانە کوشت کە لە گەمارۆی قەلاکەدا بەکارهێنرابوون.[4]

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٤٤.
٢ تأريخ بخاري ص: ١٩٩، عودة الروح ص: ١٩٩.
٣ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٤٤.
٤ المصدر نفسه، ص: ١٤٥.

(جەنگیزخان) کە تەماشای ئەو هەموو کوژراوە مەغۆلانەی کرد لە دەوروبەری قەڵا کوژراون چاوی تاریك بوون‌و سواری سەری خۆی بوو و فەرمانی بەسەر خەڵکی شاردادا لە شار بێنە دەرو جگە لە جل‌و بەرگی بەریان یەك شت لەگەڵ خۆیان نەبەن، ئینجا مەغۆلەکان هێرشیان بۆ نێو ماڵەکانیان کردو هەرچی هەبوو لە ماڵ‌و سامان تالان‌و بڕۆیان کردو تووشی هەر کەسێکی خەڵکی شاریش ببوونایە یەکسەر دەیانکوشت.[1]

(إبن الأثیر) بەم شێوەیە باسی ڕەفتاری مەغۆلەکان دەکات لە بەرامبەر ئەم شارە: کافرەکان چوونە نێو شارەوەو تالان‌و بڕۆیان کردو کەسێکیان دیبایە کە لە نێو شاردا بەجێ ماوە یەکسەر دەیانکوشت، (جەنگیزخان) چواردەورەی موسڵمانەکانی گرت، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد بەسەر خۆیاندا دابەش کەن، هەر کەسە بەشی خۆی برد، ڕۆژێکی یەکجار ناڕەحەت بوو، گریانی زۆری ژنان‌و پیاوان‌و منداڵان دەگەیشتە ئاسمان، لێکیان جودا کردنەوە منداڵیان لە دایکیان‌و ژنانیان لە پیاوانیان جودا کردنەوە، ژنەکانیان بەسەر خۆیاندا دابەش کردن، خانووو کۆشك‌و باڵەخانەکانی بوخارا ڕوخێنران‌و ئاداریان بەسەر پاداریانەوە نەما، وایان لێکرد وەك هەر شار نەبووبێت.[2]

بەڵام (إبن کثیر) دەڵێ: هێندەیان خەڵك لەو شارەدا کوشت مەگەر هەر خودای بەرزو مەزن بزانێت چەند بوون، ژن‌و منداڵەکانیان بە دیل گرتن، لەبەرچاوی کەس‌و کارەکانیان بەدڕەوشتیان لەگەڵ ژنەکانیان‌و کچەکانیان دەکرد، هەبوو کە ئەمەی دەدی خۆی گیانفیدا دەکردو بەرگری لە شەرەف‌و ناموسی خۆی دەکردو خۆی بە کوشت دەدا، هەشیان بوو قۆڵبەست دەکراو بە جۆرەها سزا ئەشکەنجە دەدرا، زۆری گریان‌و دادو فوغان لە شاردا دەنگی دەدایەوە.[3]

شایانی باسە مەغۆلەکان ئاگریان لە شار بەرداو سەرتاپا سوتا، چونکە زۆربەی خانووەکانیان لە دار دروستکرابوون، جگە لەو خانووانەی بە خشتەی سوورکراوە (ئاجور) دروست کرابوون یەك خانووش بە پێوە نەما، لە کۆتاییدا: ئەو کەمە خەڵکەی مابۆوە بەرەو خۆراسان ئاوارەبوون، بەم شێوەیە مەغۆلەکان خەڵکی شاری بوخارایان دەربەدەرو ئاوارە کرد کە خەڵکانێك بوون بە شەیدای زانست‌و هونەر بەنێوبانگ بوون، شیاوی باسە: کاتێك یەکێك لە دانیشتوانی ئەو شارە گەیشتە هەرێمی خۆراسان لەم دەستەواژە کورتەدا

---

١ المصدر نفسه، ص: ١٤٥.

٢ الکامل ٩/ ٣٣٣، عودة الروح ص: ٢٠٠.

٣ البدایة والنهایة ١٧ـ٨٠.

کارەساتی شەڕەنگێزی مەغۆلەکانی بەرامبەر بە (بوخارا)و خەڵکەکەی دەربڕی‌و گوتی: (هاتن‌و ڕوخاندیان‌و سوتاندیان‌و کوشتیان‌و تاڵانیانکردو جا ڕۆیشتن)،[1] شاری (بوخارا) بەم شێوەیە بەسەریەکدیدا داتەپیبووو وێرانەبوو تا ئەو کاتەی (جەنگیزخان) بە ماوەیەکی کەم پێش مردنی بە خودی خۆی چاکی کردەوەو سەر لەنوێ خانووەکانی دروست کردنەوە.[2]

ج ـ داگیرکردنی سەمەرقەند (٦١٧)ك:

دوای ئەوەی تەتەرەکان شاری گەورەی (بوخارا)یان ڕوخاندو خەڵکەکەیان لەنێو بردو خانووبەرەو مزگەوت‌و قوتابخانەکانی سوتاندن، ئینجا بەرەو شاری (سەمەرقەند)ی هاوسێی هێرشیان برد.

ـ (سەمەرقەند ئێستا شارێکە لە دەوڵەتی (ئۆزبەکستان)ی ئەمڕۆ، خەڵکێکی ڕەش‌و ڕووتی زۆری شاری (بوخارا)یان پێش خۆدابوون، (إبن الأثير) دەڵێ: بە ناشیرینترین‌و بێ بەزەیی ترین شێوە پێش خۆیان دابوون، هەر کەسێکیان ماندوو بوایە یان نەیتوانیبایە بڕوا یەکسەر دەیانکوشت،[3] لەبەر هۆکارێکی زۆر ئەم دیلانەیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردن، لەو هۆکارانە:

—هەر (١٠) کەسیان ئاڵایەکیان لە ئاڵاکانی تەتەر دەدانێ، ئەگەر یەکێك لە دوورەوە چاوی لە ئاڵاکان بایە دەیگوت ئەمانە هەموویا تەتەرن، بەم شێوەیە ژمارەیان لەبەر چاوی دوژمنەکانیان بە شێوەیەکی زۆر خۆی دەنواند، لە دووڕا دوژمن زەندەقی لێ دەچوون‌و ئیدی ئەوەی بە خەیاڵیاندا نەهاتبایە بەرگری کردن بوو.

—تۆبزیان لە دیلەکان دەکرد بە هاوشانی ئەوان شەڕ لەگەڵ دوژمنەکانیان بکەن، هەر کەسێك ئەمەی ڕەت کردبایەوە یان هێزی شەڕکردنی دەرنەخستایە دەیانکوشت.

—لە کاتی گەیشتنیان بە هێزی موسڵمانان دەیانکردنە سوپەرو قەڵغانی خۆیان‌و لە ڕیزی پێشەوەیان دادەنان‌و لە پشت ئەوانەوە خۆیان مەلاس دەدا، تیرو ڕمبیان دەهاویشتن‌و خۆشیان لە پەنایاندا دەپاراست.

—لەبەر دەروازەی شارە — گەمارۆدراوەکاندا — دەیانکوشتن، بەمە ترس‌و تۆقاندنیان دەخستە دڵی خەڵکەوەو هۆشداریان پێدەدان: ئەگەر بەرگری بکەن ئەم دەرەنجامە چاوەڕێی ئێوەش دەکات.

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٤٥.

٢ المصدر نفسه، ص: ١٤٥.

٣ الكامل في التاريخ، نقلا عن قصة التتار، د. السرجاني ص: ٣٠.

—ئەگەر تەتەرەكان كەسیان لێ بەدیل گیرابایە، بەم دیلانە دیلەكانی خۆیان دەگۆڕیەوە، ئەمە كەم ڕوویداوە: چونكە سوپای تەتار كەم تێكشكاوە.[١]

(سەمەرقەند) گەورەترین شاری (ئەودیو ڕووبار) بوو، پایتەختی هەرێمەكە بوو، لە پەنا ئەمانەشدا مەڵبەندێكی گرنگی بازرگانی بوو، بۆیە بە دیواری ئەستوورو بەرز حەوشەكرابوو، ژمارەیەك بورجی بەرز بۆ پاسەوانیو چاودێری بەسەر دەوروبەری شاریاندا دەڕوانی، وەك (إبن الأثیر) دەڵێ كاتێك (محمد خوارەزمشا) لەم شارە هەڵات هێزی پاسەوانی شار (٥٠) هەزار كەس دەبوون.[٢] (إبن العبري) پێی وایە: (٤٠) هەزار سوارەبوون، (جەنگیزخان) بە هەموو ئامادەسازیەكانی بەرگری ئەو شارە شارەزابوو، بۆیە نەخشەیەكی گەورەو تۆكمەی داڕشت، كە لە لای دیوارەكانی شار جەنگێكی دەستەویەخەو توندو تیژ دەكات، بۆیە كاری خۆی ڕێكخستو هەموو هێزەكانی خۆی — كە لە داگیركردنی (ئەترار)ی خۆرهەڵاتی وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)دا پێداهاتبوون — لە دەورەی شاری (سەمەرقەند) كۆكردەوە، ژمارەیەكی زۆری لە دیلەكانی (بوخارا) لەگەڵ خۆ هێنابوون، تا لە كاری گەمارۆدانی شاردا بەكاریان بێنێ.[٣]

كە گەیشتە بەرزاییەكانی (سەمەرقەند) تەماشای كرد سەربازەكانی زۆرنو لە ژمارە نایەن، پێی وابوو (٣٠) هەزاریان زیادن، ئەم (٣٠) هەزار سەربازەی بانگ كردنو ئەركی دەركردنی (سوڵتان علا الدین محمد خوارەزمشا)ی پێ سپاردن،[٤] (جەنگیزخان) هەموو ڕێگاو بانەكانی دەوروبەری شاری خستە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو كەلێنێكیشی نەهێشتەوە دوژمنەكەی سودی لێ ببینێ، لە پێكانی ئەم ئامانجەیدا سەركەوتووبوو.[٥]

(خانی) مەغۆل پێش چەند ساڵێك گرتنی قەڵاو دیواری شاری خەمڵاندبوو كە هەروا بە ئاسانی ناگیرێت، لەم بیروبۆچوونەیدا پشتی بەو قارەمانیەو بەرخودانەی دوو سەركردەی هێزی خوارەزم لە بەرامبەر مەغۆلەكاندا نواندیان بەستبوو، وێڕای ئەو هەموو زیانە گیانیەی لە لایەن ئەوانەوە بەریان كەوتبوو، لەبەر ئەوە بڕیاریدا بۆ خۆی سەركردایەتی گرتنی ئەم شارە بكات.[٦] پێشەكی توانی دەست بەسەر هەندێك دەروازەی شاردا بگرێت كە لە لایەن

---

١ قصة التتار، د. السرحاني ص: ٣١.
٢ الكامل ٣٣٣/٩، عودة الروح ص: ٢٠١.
٣ الكامل في التاریخ ٣٣٣/٩، تأریخ بخاري ص: ١٧٣، عودة الروح ص: ٢٠١.
٤ تأریخ بخاری ص: ١٧٣، عودة الروح ص: ٢٠١.
٥ تأریخ بخاری ص: ١٧٣، عودة الروح ص: ٢٠١.
٦ الدولة الخوارزمیة والمغول ص: ١٢٤، عودة الروح ص: ٢٠٢.

سەرکردەکانی سوپای خوارەزمیەوە پاسەوانیان لێدەکرا، لەو نێوانەدا زۆربەی هێزە پارێزگاریکارەکان — کە لە بنەچەکەدا (تورك) بوون، پێیان وابوو خۆ بەدەستەوەدان بۆتە شتێکی ناچاری، غەیری ئەوانیش رایان لەسەر جەنگ کردنو بەرگری کردن بوو، ئەمانە بە ناچاری خۆیان لە قەڵادا قایم کرد تا شەڕ بکەن.[١]

(جەنگیزخان) ـ پێشنیاری تورکەکانی (سەمەرقەند)ی ـ ی پەسەند کرد، بەڵێنی پێدان ئەگەر خۆیان بە دەستەوە بدەن دەیانخاتە ڕیزی سوپای مەغۆڵەوە، بۆیە بە خۆیانو خاوو خێزانەکانیانەوە لە شار چونە دەرەوەو پەیوەندیان بە سەربازگەی (مەغۆل)ەوە کرد، (جەنگیزخان) ویستی بە کردار بەڵێنەکەی خۆیان بۆ بسەلمێنێ، بۆیە بەفێڵو خافڵاندن فەرمانی دا وەك نەریتی سەربازە تورکەکان سەریان بتاشن، بەڵام لای دەمی ئێوارە (٣٠) هەزار کەسی لێ کوشتن کە لە نێوانیاندا گەورە سەرکردەکانیان دەبینران،[٢] زیاد لەمەش دانیشتوان و پارێزگارانی شار — ئەوانەی لە سەنگەری بەرگریدا مابوونەوە — هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە ئەگەر هێرش بەم شێوەیە بەردەوام بێ ئەوا هەموویان لە نێو دەچن، بۆیە لە ڕۆژی چوارەمی جەنگدا قازی شارو ژمارەیەك زانایان بە وەفد ناردنە لای (جەنگیزخان) تا پەیامی خۆ بەدەستەوەدانی خەڵکیان پێ بگەیەنن بە مەرجێك ژیانیان پارێزراو بێت، (جەنگیزخان) وەڵامی دانەوەو بەڵێنی پاراستنی دانێ، بەڵام کە دەرگاکانی شاریان لە ڕوودا ئاوەڵا بوو، مەغۆلەکان پابەندی بەڵێنیان نەبوون، بەڵکو فەرمانیان بە خەڵکی شار کرد بچنە دەرەوە، ئەوەی نەچووە دەرەوە بە شمشێر کوشتیان، دەستیان بەسەر قەڵادا گرت، شاریان تاڵان کرد، مزگەوتەکانیان سوتاندن، ئەم کارەساتە مەرگبارە لە (محرم)ی ساڵی ٦١٧ك/ ١٢٢٠ز یدا بوو، ئینجا (جەنگیزخان) خەڵکی بە تینو تاقەتو گەنجی لە نێو خەڵکەکەدا هەڵبژاردو بە زۆری چەکی بە ملدادانو خستنیە ڕیزی سوپای مەغۆلەوە، باخەوانە شارەزاکانی شاری بۆ (قەراقورم)ی پایتەخت بەڕێکردن، تاوەکو شاری (سەمەرقەند) بە باخچەو گوڵو گوڵزار بیرازێننەوە،[٣] پیشەوەرە شارەزاکان بە تایبەتی جۆڵاو ئاوریشم چنو لۆکەچنو بەرگدروەکانی کردنە کۆیلەو لە خزمەت هاوسەرەکانیو خزمە نزیکەکانی دانان، هەندێکیش لەمانە لەگەڵ (خان) بەرەو خۆراسان بەڕێکەوتی،[٤] ڕێگای بە

---

١ الحياة السياسية في عهد السيطرة المغولية ص: ٢٣ـ٢٤.
٢ تأريخ بخاري ص: ١١٦، عودة الروح ص: ٢٠٢.
٣ تأريخ بخاري ص: ١٧٤، عودة الروح ص: ٢٠٣.
٤ عودة الروح ص: ٢٠٣.

(٥٠) هەزار کەسی دانیشتوانی شاردا بگەڕێنەوە نێو شار دوای ئەوەی (١٠٠) هەزار پارچە زێڕیان پێدا،[١] (ابن العبری) ئەم خۆکڕینەوە بە (٢٠٠) هەزار دینار دەخەمڵێنێ‌و (٢) کەس لە دانیشتوانی (سەمەرقەند) ئەم پارەیان کۆکردەوە، بەم شێوەیە لە سەرەتای ساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ز یدا مەغۆلەکان دەستیان بەسەر ئەم شارەدا گرت.

(إبن الأثیر) بەم شێوەیە باسی ئەم داگیرکردنە دەکات: لە ڕۆژی چوارەمی هێرشەکەدا بانگەوازی خەڵکی شاریان کرد، کە هەر هەموویان بێنە دەرەوەی شار، کێ بەجێ بمێنێ دەیکوژن، جا هەموو خەڵك لە ژن‌و پیاوو منداڵ هاتنە دەری شار، مەغۆلەکان ئەوەی لەگەڵ خەڵکی (بوخارا) ئەنجامیان دابوو لە تاڵان کوشتن‌و گرتن‌و فەساد دەرهەق بە ئەمانیش کردیان، خۆیان بە نێو شاردا کرد، هەرچی ماڵ‌و سامان هەبوو تاڵانیان کرد، مزگەوتەکانیان سوتاندن، پەردەی کچێنی کچەکانیان دڕاند، خەڵکیان بە جۆرەها شێوە لە پێناوی ماڵ‌و سامان‌دا ئازاردا، ئەو ژنانەی بۆ کەنیزەك‌و کارەکەری نەدەشیان دەیانکوشتن،[٢] وێڕای هەموو ئەو وێرانکاریەی بەسەر ئەو شارەدا داهات (جەنگیزخان) ساڵانە سەرانەی (٣٠٠) هەزار دیناری لەسەر خەڵکەکەی دانا.[٣]

تا بزانین چ بەڵاو موسیبەتێك لە ئەنجامی هێرشی داگیرکارانەی مەغۆل بەسەر پایتەختی وڵاتی (ما وراء النهر = ئەودیو ڕووبار)دا هاتووە، ئەوەی (شانچ تون) نووسیویەتی سەبارەت بە ئەمە دێنینەوە: (شانچ تون) ئوسقوفێکی چینی بووو هاوڕێی (جەنگیزخان) بوو، لە کاتی ئەم هێرشانەیدا، دانراوێکی سەبارەت بەم گەشتە نووسیوە، دەڵێ: شاری (سەمەرقەند) پێش ڕاماڵرانی دەوڵەتی خوارەزمی (١٠٠) هەزار خێزانی لە باوەشی خۆی گرتبوو، بەڵام دوای داگیرکرانی لە لایەن مەغۆلەوە جگە لە چواریەکی دانیشتوانەکەی کەسی تێدا نەمایەوە، دەڵێ: زۆربەی کرێکارو پیشەوەرە چینیەکان لەم شارەدا بڵاوبوونەوە، هەرچەندە موڵك‌و ماڵی شار لە ژێر دەستی موسڵمانەکاندا مایەوە، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی کردنی لە ژێر چاودێری سوپای داگیرکەری مەغۆلی بوو.[٤]

پاش ڕووخانی (سەمەرقەند)ی پایتەختی سوڵتان محمدی خوارەزم‌و هەڵاتنی سوڵتان بەبەرچاوی هێزە مەغۆلیەکان، هەردووك دەرگای خاکی بنەماڵەی (خوارەزمی) بەبێ

---

١ الدولة الخوارزمية ص: ١٤٧.
٢ الكامل في التاريخ ١٢/١٦٩، الدولة الخوارزمية ص: ١٤٧.
٣ الدولة الخوارزمية ص: ١٤٨.
٤ المصدر نفسه، ص: ١٤٨.

پاسەوان بەسەر دوو لاشیپانیدا کرانەوەو هێزەکانی جەنگیزخان بەبێ ترسو بیم لە باری پانیو درێژیەوەو لەسەرەوە تا خوار بەبێ ئەوەی بە کەسێك لەڕوویاندا بوەستێتەوە تێیدا دەسوڕانەوە، هەر بۆیە هیچ سەیر نەبوو کە دوای ئەمە یەکەیەکەی شارەکانو ناوچەکان دوای یەکدا دەڕوخانو داگیردەکران، تا لە دەوروبەری بەهاری ئەو ساڵەدا مەغۆلەکان تەواوی خاکی وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)یان داگیرکرد، لە شاری (جەند)ی باکوورەوە تا شاری (بوخاراو سەمەرقەند)ی باشوورو بانکۆتو خەجەندیش لە نێوەڕاستەوە.[1]

بەم شێوەیە لەگەڵ هەرەسی تەواوی شارەکانی (ئەودیو ڕووبار) هێڵەکانی بەرگری یش کە سوپای ئیسلامی پشتی پێوەدابوون هەرەسیان هێنا، پاشانیش داگیرکردنی هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ مەغۆلەکان ئاسان بوو.[2]

**٢ـ لەنێوبردنی هەرێمەکانی خۆرئاوای دەوڵەتی (خوارەزمی)و مردنی (علاء الدین محمد خوارەزمشا):**

وەك دەردەکەوێت ئەو گورزانەی بەر هەندێك پارچەی دەوڵەتی خوارەزمی کەوتن لە لایەن مەغۆلەکانەوەو بە ڕوخانی قەڵاو شارەکانی (ئەتراڕو جەندو بانکۆتو خەجەندەو بوخاراو هی تریش) کۆتایی پێهات، کاریگەری گورچوبڕیان لەسەر دڵو دەروونو هەناوی (علاء الدین محمد خوارەزمشا) دانا، بۆیە کاتێك لە (بوخارا)ڕا هەڵاتو گەیشتە (سەمەرقەند) ـ ی پایتەخت ـ بیری لە ڕۆیشتنو کۆچ کردەوە بەرەو شوێنێك کە بتوانێ کاروباری دەوڵەتەکەی تێدا جێگیرو پارێزراو بکات، یان تێیدا بیر لە چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی ئەو دوژمنە زۆردارو داگیرکارە بکاتەوەو نەخشەیەکی گونجاوی بۆ دابنێ، لەبەر ئەمە وەزیرەکانیو گەورە سەرکردەکانی لە سەمەرقەند کۆکردنەوەو کۆبوونەوەیەکی بۆ ئەم مەبەستە پێکردن، لەم کۆبوونەدا دوو ڕا سەریان هەڵدا: یەکەمیان: پێی وابوو بەرگریکردن لە وڵاتی (ئەودیو ڕووبار) هیچ سوودێکی نیە، کەواتە چاك وایە خوارەزمیەکان گرنگی بە پارێزگاری کردنی هەرێمەکانی خۆرئاوای دەریاری (جەیحون) بدەن، دووەم ڕا: کشانەوە بەرەو (غەزنە)ی لە باشوور پەسند دەکرد،[3] (خوارەزمشا) ڕای دووەمی هەڵبژاردو بەرەو (غەزنە) ڕۆیشت، کاتێك لەم کۆچڕەویەدا گەیشتە (بەلخ)، (ركن الدین)ی کوڕی ـ و حکومڕانی (غەزنە) ـ وەزیرەکەی خۆی بۆ لا نارد بە ڕواڵەت تا ڕێو شوێنێکی باشی بۆ

---

١ سقوط الدولة العباسية ص: ١٢٣.

٢ عودة الروح للخلافة ص: ٢٠٣.

٣ عودة الروح ص: ٢٠٤.

دابنێ بەڵام ڕاستیەكەی ئەوە بوو دیكتاتۆریەتی بابی لە خۆی دوور بخاتەوەو ڕووی پێ لە (غەزنە) هەڵسوڕێنێ، كاتێك وەزیر هەڵوێستی سوڵتان علاء الدین ی وەرگرت — كە بە نیازە لە غەزنە نیشتەجێ بێ —، بە قسەی لوس و فڕوفێڵاوی پێی گوت كە چاك وایە ڕوو لە عێراقی عەجەمی نیشتمانی باب و باپیرانی بكات، چونكە ئەوێ بە سەروەت و سامانی زۆرو خەڵكی زۆر دەوڵەمەندەو جێگەیەكی قایم و مەحكەمیشەو تەنها دەتوانێ لە شوێنێكی ئاوا گونجاو خۆی لە مەغۆلەكان بپارێزێت، سوڵتانیش ڕاوێژی وەزیری پەسند كردو بەرەو شاری (نەیسابور)ی هەرێمی خۆراسان بەڕێكەوت، بەڵام هێندەی پێنەچوو هەواڵی بۆ هات كە مەغۆلەكان لە ڕووباری (جەیحون) پەڕیونەتەوەو خەریكە لێی نزیك دەبنەوەو لێی دەگەڕێن، بۆیە هێشتا جێی خۆی لە (نەیسابور) خۆش نەكردبوو كە بە ناچاری لەوێش هەڵات و بەرەو لایەكەی تری عێراقی عەجەمی بەڕێكەوت.[1]

هێزەكانی مەغۆل لە (سەمەرقەند) ڕا شوێن بە شوێن و پێ بەپێ بە دوای (سوڵتان) دەكەوتن، كاتێك ئەم هێزانە گەیشتنە (نەیسابور)ی خۆراسان تەماشایان كرد ئەوێشی بەجێ هێشتووە، بۆیە هەدایان نەداو بە دوای كەوتن، لە نزیك شاری (ڕەی) توانییان خۆ بگەیەننە سوپاكەی سوڵتان و شكستی دەرخوارد بدەن، لێرەدا (سوڵتانی خوارەزمی) بیری كردەوە كە چاك وایە پەنا بۆ خەلیفەی بەغدا بەرێت هەرچەندە دوژمنایەتیش لە نێوانیاندا هەیە، ڕۆیشت تا گەیشتە (مرج دەوڵەت ئاباد)ی هەرێمی هەمەدان، تا ئێرە (٢٠) هەزار سوار ڕەوی لەگەڵ مابۆوەو لێرەشدا هێرشی مەغۆلەكانیان گەیشتە سەر،[2] بۆیە بە ناچاری بەرەو باكوور بایدایەوەو ڕووی لە هەرێمی (مازندەران)ی باشووری دەریای (قەزوێن) كرد، ئینجا خۆی گەیاندە بەندەرێكی سەر دەریا كە پێی دەگوترا بەندەری (باب سكون = دەروازەی ئارامگرتن)، (نسوي) دەڵێ: لە مزگەوتی گوندێكی ئەو بەندەرەدا پێشنوێژی بۆ خەڵك دەكردو نەزرو سەدەقەی لە خۆدەگرت: ئەگەر خودا ساغ و سەلامەتی بۆ بنوسێ و دەسەڵاتەكەی بۆ بگێڕێتەوە ئەوا پەرە بە دادپەروەری دەدا، مەغۆلەكان لەوێش گەیشتنە سەری و هێرشیان كردە سەر جێگەكەی، لەو كاتەدا سواری كەشتیەك بووو خۆی گەیاندە یەكێ لە دوورگە (نەدیوە)كانی دەریای (خەزەر)،[3] كە ئەوكات دوورگەی (ئۆغرتشالی) پێ

---

١ الكامل ٩/٣٣٣.

٢ الكامل في التاريخ ٩/٣٣٣_٣٣٤، عودة الروح ص: ٢٠٥.

٣ سيرة السلطان ص: ١٠٦.

دەگوتراو ئێستا (لەسەر ڕای جیاوان) پێی دەگوترێت (جرکن)،[١] مەغۆلەکان تیربارانی بەلەمەکەیان کرد، ژمارەیەك لە سەربازەکان وەیانزانی هەنگاوتویانە بۆیە بە مەلە بەرەو لای ڕۆیشتن، نەیگەیشتنیّو خنکان، (خوارەزمشا) بە نەخۆشی گەیشتە دورگەی ناوبراو، هێندەی نەخایاند لە ٢٢/ ذي الحجةی ساڵی ٦١٧ی کۆچی/ ١٢٢٠ی زایینیو لەو دوورگەیەدا کۆچی دوایی کرد.[٢]

(نسوي) بارودۆخی ڕۆژانی دوایی ژیانی (سوڵتان علا الدين) وەسف دەکاتو دەڵێ: چەند کەسێك لەوانەی لە نێو کەشتیەکەدا هاوڕێی سوڵتان بوون بۆیان گێڕامەوە کە: ئێمە کەشتیەکەمان لێ دەخوڕیو سوڵتانیش نەخۆشیەکی چەند لایەنەی تووش ببوو دەستی پێ لە ژیان بەردابوو، بە دڵتەنگیو هەناسە سواری ئەم قسانەی دەکردن: (ئەو خاكو وڵاتەی هەمانبوو هەموومان لە دەست دا، بە ئەندازەی مەترێكمان زەوی نەما تا هەڵی کۆڵینو خۆمانی تێباوین، دونیا بۆ دانیشتوانەکەی نابێتە خانووی تێدا پاڵدانەوەی ڕاستی، بەڵکو دونیا تەفرەدانو هەڵخەڵەتاندنەو بەس، دونیا بریتیە لە خانوویەك بە دەرگایەکیدا دەچیە ناویەوە بە دەرگاکەی تریدا لێی دەچیتە دەرەوە، ئەی ژیرەکان پەند وەربگرن، (سوڵتان علا الدين) لە دواڕۆژەکانی ژیانیدا بە مەبەستی خۆشاردنەوەو خۆ پاراستن لە چنگی مەغۆلەکان خۆی گەیاندە یەکێك لە دوورگە بچووکەکانی دەریای (خەزەر)و لە ڕەشماڵێکدا نیشتەجێ بوو، دانیشتوانی قەراغ دەریای (مازندەران) خوردو خۆراكو پێداویستیەکانی تری ژیانیان بۆ دەبرد، سوڵتان وەسێتی دەکرد – ئەگەر حکومەتەکەی جێگیر بۆوە – دەبێ زەویو زار بۆ خەڵکەکە دابڕدرێت، کاتێك (جلال الدين منكبرتی) مەملەکەتی بابی بە چەند ساڵێك دوای مردنی بابی گێڕایەوە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خۆی دانی بە وەسێتەکانی بابی داهێناو ئەو زەویو زارانەی بەسەر خەڵکەکەدا دابەش کرد، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە هەر کەسێك هاتباو نیشانەیەکی – وەسێتەکەی – (علاء الدين)ی پێبایە (جلال الدين منكبرتی) زەوی بۆ دادەبڕی.

هەر کە (علاء الدين) نەخۆشیەکەی ڕۆژبەڕۆژ تینی زیاتری بۆ دێنیو (تورکان خاتوون)ی دایکیشی بە دیلی لەبەر دەستی مەغۆلەکان دایە، لەو کاتەدا بانگی هەرسێك کوڕەکەی خۆی (جلال الدين منكبرتیو ئۆزلاغشاو ئاغشا)ی کرد، پاش ئەوەی ڕایگەیاند کە تاکە کەسێکیان

---

١ تاريخ بخاري ص: ١٧٧، عودة الروح ص: ٢٠٥.

٢ سيرة السلطان ص: ١٠٧ـ١٠٨

بتوانێ دەوڵەتی خوارەزمی بپارێزێت (جلال الدين)ە، بۆیە کاروباری دەوڵەتەکەی خستە بەردەستی (جلال الدين منكبرتی)،[1] یەکێك لەو ڕستە قسانەی بۆ کوڕەکانی کردن ئەم ڕستەیەیە کە (نسوي) بۆمان دەگێڕێتەوە: (دەستبەندەکانی سەڵتەنەت لێك پچڕان، بنەماکانی دەوڵەت داڕمان، ئەم دوژمنە بە کەڵپەو چرنوکەکانی توند گرتوویەتی، جگە لە (منكبرتی)ی کوڕم کەس ناتوانێ تۆڵەم بسێنێتەوە، ئەوە من ئەوم لە جێی خۆم داناو ئێوەش هەردووکتان گوێڕایەڵی بن).[2]

پاش ئەوەی (سوڵتان علاء الدين)ماوەی مانگێکی لەو دوورگەیەدا بەسەر برد وەفاتی کردو هەر لەوێش نێژرا، ئەوەی جێی داخو مەراق بوو پارچە قوماشێکیان دەست نەکەوت پێی کفن بکەن، یەکێك لە نزیکەکانی کە ناوی (شمس الدين محمود) بوو کراسەکەی بەر خۆی داناو پێی کفن کرد، (سیوطي) دەگێڕێتەوە: بە پەتویەکی لۆکە چنراوی خۆی کفن کراوە.[3]

(ابن الوردي) بارودۆخی دواڕۆژەکانی ژیانی سوڵتان علا الدين محمد خوارەزمشا) بەم شێوەیە وەسف دەکات:

وفارق المسكين أوطانه ... وملكه ممتحناً بالمرض
وكم حوى من جوهر مثمن ... فما فدى الجوهر هذا العرض

(نسوي)یش کە هاوچەرخی ئەو ڕووداوانە بووەو لە نێو ماڵەکانی خوارەزمیدا خزمەتی کردووەو چەند بەیتە شیعرێکی دەربارەی ئەوان هۆنیوەتەوە کە لە جوانترین وێنەدا وەسفی بارودۆخی ژیانو گوزەرانی (علاء الدين) دەکات لە سەردەمی ئەوپەڕی دەسەلاتیداو لە سەردەمی لێقەومانیدا:

أذل الملوك وصاد القروم ... وصير كل عزيز ذليلا
وحف الملوك به خاضعين ... وزفوا إليه رعيلا رعيلا
فما تمكن من أمره ... وصارت له الارض الا قليلا
وأوهمه العز أن الزمان ... إذا رامه ارتد عنه كليلا
أتته المنية مغتاظة ... وسلت عليه حساما صقيلا
فلم تغن عنه حماة الرجال ... ولم يجد قيل عليه فقليلا

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٥١.
٢ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٥٢.
٣ تأريخ الخلفاء للسيوطي ص: ١١٣.

كـذلـك يـفـعـل بـالـشـامـتـين ويـفـنـيـهـم الـدهـر جـيـلا فـجـيلا[١]

ئامانجی مەغۆلەکان گرتنی (سوڵتان علاءالدین) بوو، بەڵام ئەم ئاواتەیان بۆ نەهاتەدی، هەرچەندە لە کاتی بەدواکەوتنو لێگەڕانیدا توانیان دەست بەسەر هەموو ئەو شارو قەڵایانەدا بگرن کە دەهاتنە ڕێیان، (مازندەران) یەکێك بوو لەو گەورە شارانەی هاتە ڕێیانو بە قەڵا مەحکەمەکانی ناوبانگی دەرکردبوو، لە ساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ز یدا زۆر بە سوكو ئاسانی داگیریان کردو هیچ بەرگریەکی وای لێ نەکرا کە شایانی باس بێ.[٢]

بەهەمان شێوە هەندێك لە مەغۆلەکان ڕوویان لە شاری (ڕەی) کردو لە ناخافڵ بەسەریاندادا و هێندەی نەخایاند داگیرو تاڵانو بڕۆیان کرد،[٣] بەڵام مەغۆلەکان لە (ڕەی)یدا نیشتەجێ نەبوون، بەڵکو بەپەلەو بێ دواکەوتن دوای (خوارەزمشا) دەکەوتنو هەر شارو دێهاتێکیان باتایە ڕێ تاڵانو بڕۆیان دەکردو شمشێریان لەسەر ملی دانیشتوانەکانیان دادەناو گەسکیان لە سەروەتو سامانەکانیان دەدا.

کاتێك گەیشتنە دەوروبەری (هەمەدان)، حکومڕانی شار بەرەو ڕوویان هاتو پێشنیاری (ئاشتی) بۆ کردنو دیاریەکی زۆرو بە نرخیشی لە پارەو سامانو پۆشاكو وڵاخە بەرزەو ڕەشەوڵاخو مەڕوماڵات لەگەڵ خۆ بۆ هێنابوون، ئەوانیش دانیشتوانی هەمەدانیان چەپاڵەداو خۆیان تێ نەگەیاندن، لەوێڕا بەرەو شاری (زنجان) ڕۆیشتنو ڕایانماڵی، ئینجا بەرەو شاری (قەزوێن) ڕۆیشتن، بەڵام خەڵکەکەی بە توندو تیژی ڕووبەڕوویان بوونەوەو شەڕێکی گەرمیان لەگەڵ کردن، بەڵام پاشان شکستیان خواردو (قەزوێن)یش کەوتە بەر ڕکێفی مەغۆلەکان.[٤]

ئینجا مەغۆلەکان بەرەو هەرێمی (ئازەربایجان) ڕۆیشتن، پێش ئەوەی بگەنە پایتەختی هەرێمەکە بە شاری (سنجار)دا تێپەڕینو تاڵانو بڕۆیان کردو خەڵکێکی زۆریشیان لە دانیشتوانی شار کوشتوبڕ کرد، دوای ئەوێش ڕوویان لە (قوس) کرد، بەڵام دانیشتوانەکەی خۆیان تێدا قایم کرد، ئیدی بەردەوام گەمارۆیاندا لە کۆتاییدا ئەوێشیان داگیرکرد.[٥]

کاتێك گەیشتنە (تەورێز) — ی پایتەخت — (ئۆزبەکی کوڕی پاڵەوان) بە سەروڕوی خۆش چووە پێشوازیانەوەو دیاریەکی زۆرو بەنرخیشی لە پارەو سامانو پۆشاكو وڵاخەبەرزەو

---

١ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٤٨، الدولة الخوارزمية ص: ١٥٣.

٢ عودة الروح للخلافة ص: ٢٠٦.

٣ تأريخ الخميس ٢/٣٦٨، عودة الروح ص: ٢٠٦.

٤ العبر للذهبي ٥/٦٤٤_٦٤٥، عودة الروح ص: ٢٠٧.

٥ تأريخ بان خلدون ٥/٥٢٠، عودة الروح ص: ٢٠٧.

ڕەشەوڵاخو ئاژەڵ پێشکەش کردن و ڕایگەیاند لەمەولا شارەکەی دەبێتە یەکێك لە شارەکانی مەغۆل،[1] بەڵام مەغۆلەکان بە هۆی ساردو سەرمای زستان بە ناچاری تەوریزیان بەجێ هێشت و بۆ خۆ گەرمکردنەوە لە ڕێی بیابانی (موغان)ەوە بەرەو کەنارە ئاوەکانی خۆرئاوای دەریای (قەزوێن) ڕۆیشتن و نیشتەجێ بوون، لەم ساتەوەختەدا (حکومڕانەکانی جۆرجیاو ئەتابەکییەی ئازەربایجان و مەلیك ئەشرەف موسای کوڕی مەلیك عادلی حکومڕانی جزیرەو خەلات) پەیماننامەیەکی بەرگرییان لە پێناوی تێکشکاندنەوەی هێرشی مەغۆل بەست و بڕیاریاندا لە وەرزی بەهاردا هێرشیان بکەنە سەر، بەڵام مەغۆلەکان لەم پیلانە بێ هەواڵ نەبوون، دەستیان بە پەلاماردانی ئەو گوندو دێهاتانەی دەوروبەریان کردو تێکیان شکاندن، پاشان دەستیان بەسەر قەڵاکانی (جۆرجیا)دا گرت و ڕووخاندیانن، بەرەبەرە چوونە نێو تەواوی وڵاتەوەو لە ذي الحجەی ساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ز یدا دەستیان بەسەر (تفلیس)ی پایتەختی (جۆرجیا)دا گرت،[2] هەرکە لە داگیرکردنی وڵاتی (جۆرجیا) بونەوە بۆ دووەم جار بەرەو (ئازەربایجان) باياندایەوە، خەریك بوو بگەنە (تەورێز)ی پایتەختی ئەو هەرێمە، بەڵام دانیشتوانەکەی ڕایانگەیاند کە خۆ بەدەستەوە دەدەن و پەیمانیاندا ساڵانە سەرانەیەکی زۆر بدەن، ئینجا مەغۆلەکان بەرەو شاری (مەڕاغە)ی سەر بە هەمان هەرێم ڕۆیشتن، حکومڕانی شار ژنێك بووو بڕیاریدا بە هەموو توانای خۆی بەرگری بکات، ئەمیرەخان خۆی لە یەکێك لە قەڵاکانی شاردا دامەزراندبوو، مەغۆلەکان بە مەنجەنیق بۆردومانی خەستی شارو قەڵاکانیان دەکرد، هێندەی نەخایاد لە ٤/ سەفەری ساڵی ٦١٨ك/١٢٢١ز یدا داگیریان کرد، (إبن الأثیر) دەڵێ: بە شمشێر خەڵکەکەیان سەربڕی، هێندەیان لێ کوشتن لە ژمارە نایەن، هەرچی سەروەت و سامان و کەلوپەلێکی بە کەڵکیان دەهات بە تاڵان بردیان، ئەوەی ماشەوە ئاگریان تێ بەردا،[3] مەغۆلەکان بۆ ئەوەی لە لەنێوچوونی هەموو خەڵکی شار دڵنیا بن، فەرمانیان بە ژمارەیەك دیلی موسڵمان کرد لە نێو کۆڵان و بازاڕەکاندا بانگ ڕابێڵن: (کە مەغۆلەکان ڕۆیشتوون و لە شاردا نەماون) خەڵکانێك کە لە ژێر زەمین و پەناو پەسیوەکاندا خۆیان حەشاردابوو بە قایان بەم بانگەوازە کردو هاتنە دەرەوە، مەغۆلەکان دەستگیریان کردن و هەر هەموویان کوشتن.[4]

---

١ عودة الروح ص: ٢٠٧.

٢ المصدر نفسه، ص: ٢٠٧، مرآة الجنان ٤/٣٧ـ٣٨.

٣ مرآة الجنان للیافعي ٤/٣٧ـ٣٨، عودة الروح ص: ٢٠٨.

٤ الدولة الخوارزمیة ص: ١٣٤ـ١٣٥.

ئەگەرچی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی ڕووبەڕووی ئەم هێرشە داگیرکاریە سامناکەی مەغۆل بۆوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا (الناصر لدين الله)ی خەلیفەی بەغدا هەوڵێکی ساکاریشی لە پێناوی بەگژداچوونەوەی دا نەدا، گوێشی بۆ هیچ کامێك لەو نوێنەرانە شل نەکرد کە لە لایەن ولاتە هێرش بۆکراوەکانەوە بۆ لای ڕەوانە کرابوون، هەر ئەم بێ هەڵوێستیەی خەلیفە، یان ئەو هەڵوێستە خراپەی خەلیفە لە بەرامبەر ئەو ولاتانەداو بەشداری نەکردنی لە ڕزگارکردنیاندا وای لە هەندێك مێژوونووس کردووە بە تۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ مەغۆلو هاندانی مەغۆلەکان بۆ داگیرکردنی دەوڵەتی خوارەزمی تاوانباری بکەن، کاتێك خەلیفە زانی مەغۆلەکان لە (مەراغە) دەرچوونو بەرەو شاری هەولێر (ئەربیل) بەڕێکەوتوون مەترسیەکی گەورەی ڕێ نیشت، بۆ ئەم مەبەستە ئەو میرو حکومڕانانەی سەر بە خۆی بوون لە ناوچەکەدا لەم مەترسیە ئاگاداری کردنەوە، (إبن الأثير) بەم شێوەیە باسی ئەو ترسو بیمەی خەڵکی (موسڵ) دەکات کاتێك هەواڵی هێرشی مەغۆلیان پێگەیشت کە بەرەو هەولێر (ئەربیل) بەڕێکەوتووە: ئێمە ئەو هەواڵەمان لە (موسڵ) پێ گەیشت، زۆر ترساین، تا کار بەوە گەیشت هەندێك خەڵك بڕیاریاندا لە ترسی (شمشێر) — ی مەغۆل — بڕۆنە دەری شار،[1] هەرکە (خەلیفە) هەواڵی هێرشی مەغۆلی بۆ سەر هەولێر (ئەربیل) پێگەیشت تەنگاو بوو، ئەوکات (مظفر الدين كوكبري) لە لایەن خەلیفەی بەغداوە ئەو شارەی بەڕێوە دەبرد، خەلیفە دەترسا مەغۆلەکان لە جیاتی ڕێی هەولێر (ئەربیل) بەڕێی (داقوق)دا بەرەو عێراقی عەرەبی بەڕێ بکەون، لەبەر ئەمە چەند نوێنەرێکی بۆ لای (سوڵتان مظفرالدين)ی هەولێر (ئەربیل)و (مەلیك بدرالدين لؤلؤ)ی (موسڵ)و مەلیك ئەشرەف موسای (جزیرە) ناردنو فەرمانی پێکردبوون بە خۆیانو سوپاکانیانەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکان خۆ بگەیەننە (داقوق)، لە حاڵێکدا بیانەوێت لە ڕێی (ئەربیل) لادەنو پاشقول لە عێراقی عەرەبی بگرن، (بدرالدين) بە خۆیو هەندێك لە سوپاکەی بەرەو داقوق بەڕێکەوت، (مظفر الدين)یش لە سەفەری ٦١٨ك/١٢٢١ز بە خۆیو سوپاکەیو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی خۆبەخش خۆی گەیاندە (داقوق)، بەڵام (مەلیك ئەشرەف) داوای لێبوردنی لە خەلیفە کردبوو کە بە خودی خۆی نەیتوانیوە لەگەڵ سوپاکەی بێتە (داقوق)، چونکە (مەلیك عیسای کوڕی مەلیم عادل)ی مەلیکی (دیمەشق) هاتۆتە لای‌و لە دژی (فەڕەنگ) کە (دمیاط)یان داگیرکردووە هاواری تێبەستووە.[2]

---

١ الكامل ١٢/ ١٥٥ـ١٥٦، عودة الروح ص: ٢٠٩.

٢ مرآة الجنان ٤/٣٧، ٤٨، عودة الروح ص: ٢١٠.

هێزەکانی میرانی ئەربیلو موسڵو جزیرە گەیشتنە (داقوق)، لە هەمان کاتدا سوپایەکی (٨٠٠) سوارەش لە لایەن خەلیفەوە،[١] بە سەرکردایەتی (قشتمر)ی کۆیلەی گەیشت، (خەلیفە) سەرکردایەتی هێزەکانی دابە دەست (سوڵتان مظفر الدین)و بەڵێنی پێدا هێزی سەربازی تریشی بە هاوارەوە بنێرێ، بەڵام حکومڕانانی وڵاتانی ئیسلامی هێزی پێویستیان پێ کۆنەبۆوە.

کاتێك مەغۆلەکان نزیك بوونەوە، هەواڵی کۆبوونەوەی هێزەکانی سوپای ئیسلامیان پێ گەیشت، وایانزانی ئەم هێزانە رووبەڕوویان دێنو بە دوایان دەکەون: لەبەر ئەمە پاشەوپاش کشانەوەو بەرەو عێراقی عەجەمی ڕۆیشتن، سوپای ئیسلامی ماوەیەکی باش لە (داقوق) جێگیر بوو، لەو ماوەیەدا بۆی دەرکەوت کە مەغۆلەکان لەڕێگای ئەوان لایانداوەو هێزە سەربازە بەڵێن پێدراوەکەشیان بۆ نەهات، لەبەر ئەوە بڵاوەکێنەیان کردو هەموویان لە ساڵی ٦١٨ك/١٢٢٢ز بۆ هەرێمەکانی خۆیان گەڕانەوە،[٢] (مەغۆلەکان) لەم ماوەیەی دواییدا بە کەیفی خۆیان لەم سەرەوسەری وڵاتە ئیسلامیەکانی (عێراقی عەجەمو ئارەزبایجانو ئێرانو جۆرجیا)دا تەراتێنیان دەکردو شارو قەڵاکانیان دەڕوخاندنو ئازارو ئەشکەنجەی دانیشتوانەکانیان دەداو ئەوەی بیانتوانیبایە هەلیگرن لە سەروەتو سامان هەڵیان دەگرتو دەیانبرد، ئینجا سوپای مەغۆل بە سەرکردایەتی دوو سەرکردەیان لە ناوچەی هەڵکەوتووی نێوان دەریای (قەزوێن)و دەریای (ڕەش) بەرەو وڵاتی (قەفجاق) و (ڕوسیا) پەڕینەوە، لەوێشڕا بەرەو (بولغاریا) ڕۆیشتنو ترسو تۆقاندنیان گەیاندە ئەوپەڕی سنوورەکانی ئەوروپا.[٣]

### ٣ـ داگیرکردنی (خورەزم) لە لایەن (مەغۆل)ەوە:

هەرێمی (خوارەزم) یەکێك بوو لەو هەرێمانەی لە لایەن (تورکان خاتوون)ی دایکی سوڵتان (علاء الدین محمد خوارەزمشا)ەوە حکومڕانی دەکرا، دەسەڵاتی (تورکان خاتوون) لەم هەرێمەدا زۆر لە دەسەڵاتی خودی سوڵتان پتەوتر بوو، چونکە هۆزی (کانکالی)ی نیشتەجێی دەشتەکانی هەڵکەوتووی باکووری خوارەزمو باکووری خۆرهەڵاتی دەریای قەزوێن خەڵکێکی زێدە باش بوونو زۆریش دڵسۆزی (تورکان خاتوون) بوون، سوڵتان (علا الدین) هەرچەندە لەگەڵ دایکی ناکۆك بوو، بەڵام کاتێك هەستی بە مەترسی هێرشی مەغۆل

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٣٥ـ١٣٦.
٢ عودة الروح ص: ٢١٠.
٣ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٥٨.

کرد لە بەرامبەریدا قیت بۆتەوەو ژیانی دەخاتە خەتەرەوە، بۆیە بە دوای دایکیدا ناردو داوای لێکرد لە (خوارەزم) دەرچێتو بە خۆیو هێزو دارو دەستەکەیەوە بەرەو هەرێمی (مازندەران)ی (باشووری دەریای قەزوین) بکشێتەوە، لە هەمان کاتدا کە (جەنگیزخان) بە دووبەرەکی نێوان علا الدینو دایکی زانی، نوێنەرێکی خۆی بە نامەیەکەوە بۆ لای (تورکان خاتوون) ناردو داوای لێکرد پاڵ بە ئەوانەوە بداتو، بەڵێنی دەدایە ئەگەر کارێکی لەو جۆرە بکات ئەوا (جەنگیزخان) دوای تەواوکردنی پرۆسەی داگیرکاریەکەی دەسەڵاتیو مەملەکەتەکەی خۆی دەداتەوە دەست خۆی، بەڵام (تورکان خاتوون) بایەخی بە نێوەرۆکی نامەکە نەدا،[1] کاتێکیش بە پاشەکشەی (سوڵتان علاء الدین)ی زانی، ئەوا لە کۆتایی ساڵی ٦١٦ك/ ١٢١٩ز یدا بڕیاریدا بە خۆیو کارەکەرەکانیو کوڕەکانی (علاء الدین)ەوەهەرێمی (خوارەزم) بەجێ بێڵێت، هەرچی خەزنەو پارەو زێڕو زیوو سامان هەبوو تا توانی باری کردو بردی، بەڵام پێش دەرچوونی تاوانێکی دڵڕەقانەو نامرۆڤانەی ئەنجامدا، فەرمانیدا: هەر کامێك لەو سەرۆکانەی (علاء الدین) دەستی بەسەر وڵاتو موڵكوماڵەکانیاندا گرتووەو ئێستا لە زینددانی خوارەزمدا بەندن، هەر هەموویان بکوژرێن، ڕۆڵەکانی توغڕولبەگی دواهەمین سوڵتانی (سلجوقی)ی عێراقو میرەکانی (بەلخو ترمزو بامیانو هەردووك کوڕی دواهەمین مەلیکی دۆلۆغۆریەو ژمارەیەکی زۆری تری میرو سەرکردە کوشتن).[2]

(تورکان خاتون) بۆ خۆپەنادان بەرەو عێراقی عەجەم بەڕێکەوت، لە ڕێگادا خۆی لە یەکێك لە قەڵا مەحکەمەکانی (مازندەران) مەڵاسدا، (سۆبۆتای)ی سەرکردەی سوپای مەغۆلی لە ماوەی ڕاوەدونانی (علا الدین) دا دەستی بەسەر ئەم قەڵایە داگرت، دوای ماوەی (٣) مانگ گەمارۆو برانی خواردنو خواردنەوە (تورکان خاتون) خۆی بەدەستەوەدا، ئەمەو خۆیو دارو دەستەکەیو ڕۆڵەکانی (علاء الدین) لەلایەن مەغۆلەکانەوە دیلکرانو بەرەو سەربازگەی (جەنگیزخان) ڕاپێچ کران، (تورکان خاتون) بەردەوام دیلی مەغۆلەکان بوو تا ئەو کاتەی بەرەو وڵاتی خۆیان ڕۆیشتنەوەو ئەویشیان لەگەڵ خۆیان بردو لە ساڵی ٦٣٠ك/١٢٣٣ز لە مەنغۆلیا مرد، بەڵام کوڕە بچوکەکانی علا الدین بە نەباڵغی لە لایەن (جەنگیزخان)ەوە کوژران، (جەنگیزخان) دوو دانە لە کچەکانی (علاء الدین)ی پێشکەشی (جەغتای)کوڕی کردن، ئەویش هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێکیان کردو ئەوەی تریشی دا بە

---

١ الدولة الخوارزمية ١٦١.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦١.

یەکێك لە پیاوە نزیکەکانی خۆی. هەروەها (جەنگیزخان) سێهەمین کچی (علاء الدین)ی پێشکەشی (دانیشمەند)ی دەرکەوانی کرد.[١]

بەم شێوەیە هەرێمی خوارەزم لە حوکمڕانە خوارەزمیەکان خاڵی بووو چاوەڕێ سەرەنجامی حەتمی خۆی دەکرد کە لەلایەن مەغۆلەکانەوە بەسەریبێ.[٢]

أ- گواستنەوەی (جلال الدین منکبرتی) لە خوارەزم:

دوابەدوای مردنی (سوڵتان علاء الدین) لە دورگە دابڕاوەکەی دەریای (قەزوێن)، هەر سێك کوڕەکەی سوڵتان (جلال الدین منبکرتیو ئۆزلاغشاو ئاغشا) لەوێڕا بەرەو هەرێمی (خوارەزم) پەڕینەوە، دانیشتوان بەو پەڕی دڵخۆشی یەوە پێشوازییان لێکردنو بەخێرهاتنەوەیان لێکردن، لەو کاتەوە تورکان خاتون ئەو هەرێمەی بە جێ هێشتبووو هەر خەمی خۆی لەبەر ببووو لەبیری چوو بوو حوکمڕانێکیان بە سەرەوە بەجێ بێڵێ، ئەوا (خوارەزم)ی پایتەختی هەرێمی (خوارەزم) ئاژاوەو ناکۆکی بەردەوامی تێدا هاتبووە ئاراوە، بۆیە بەهاتنەوەی کوڕانی سوڵتان شادومان بوون، (نسوی)گەیشتنەوەی (جلال الدین منکبرتی)و دوو براکەی بۆ هەرێمی (خوارەزم) لەم دەستەواژەیەدا وێنا دەکات: هەر کە سوڵتان بەر ڕەحمەتی خودا کەوتو لە دورگەکە نێژرا، (جلال الدین) بەخۆیو دووبراکەی (ئۆزلاغشاو ئاغشا) سواری کەشتی بوونو پەڕینەوە - خاکی خوارەزم - ... بە هاتنەوەیان خەڵك مزگێنیان دەدا بە یەکتری، خەڵکانێك، نەخۆشیەکەیان تەنگی پێ هەڵچنیبوون و شەکەتی کردبوون، بە گەیشتنی دەرمان موژدەیان دەدا بە یەکتریو، زیاد لە (٧)هەزار ئەسپسواری سوپای سوڵتانی لە دەورەیان کۆبۆوە.[٣]

لەگەڵ ئەوەدا (جلال الدین منبکرتی)و دوو براکەی توانیان سوپایەکی گەورە بۆ بەرەنگاربونەوەی مەغۆل ڕێك بخەنەوە، بەڵام لە بەدبەختی خوارەزمیەکان، پێکهاتەی سوپاکە لەو هۆزو تیرە تورکانە پێك هاتبوو کە خزمی نزیکی (تورکان خاتون)بوونو ڕازی نەبوو (جلال الدین) لە دوای باوکی جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، (جلال الدین) دەیویست سوپاکە بە ناچاریو لە ژێر فشاری هێزدا گەردنکەچی خۆی بکات، سوپاش پیلانی کوشتنی لە دژی گێڕا، جلال الدین جگە لە هەڵاتنو خۆدەربازکردن هیچی تری بەدەستەوە نەما، بە ناچاری لەگەڵ هێزێکی (٣٠٠) کەسی ئەسپ سوار بەسەرکردایەتی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٦١.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦٢.

٣ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٢.

(تەیمور مولك)ی حوكمڕانی شاری (خەجەندە) بەرەو خۆراسان هەڵات، ـ وەك پێشدا زانیمان (تەیمور مولك) دوای داگیركرانی شارەكەی لەلایەن مەغۆلەكانەوە بۆ هەرێمی (خوارەزم) هەڵاتبوو ـ، (جلال الدین) پاش بڕینی ئەو هەموو دەشتو بیابانە دووررو درێژەی نێوان (خوارەزم)و (خۆراسان) بە (١٦) ڕۆژ گەیشتە نزیك شاری (نەسا)،[1] بەڵام سوپای پیلانگێڕی دژی (جلال الدین) لە (خوارەزم) مایەوە تا ئەو كاتەی مەغۆلەكان هێرشیان بۆ هێنا ئەویش لە ترسان بەرەو خۆراسان هەڵات.

بە كۆچی (جلال الدین منبكرتی) لە خوارەزم دواهەمین هومێدی قوتاربوونی ئەو هەرێمەش لە چەنگی مەغۆلە هێرش بەرەكان كۆچی دوای كرد، چونكە هێزێكی وای تێدا نەمابوو بتوانێ بەرەنگاری شەپۆلی هێرشی مەغۆل ببێتەوە. كاتێك كوڕەكانی (علاء الدین خوارەزمشا) هاتنەوە (خوارەزم)و سوپایەكی گەورەیان تێدا كۆكردەوە، جەنگیزخان گوێی بەمە نەداو لای لێ نەكردەوە، بەڵكو سوپایەكی لە ژێر سەركردایەتی (٣) كوڕەكەی خۆی (جوجیو جەغتایو ئەغتای)ی لەگەڵ سوپاكەی جەنگیزخاندا كە بەشداری داگیركردنی وڵاتی (ئەو دیو ڕوباریان)كردبوو ـ، بەرەو ئەو شارە بەڕێكرد.

(جەنگیزخان) بە مەبەستی گەمارۆدانی كوڕەكانی (علاء الدین) لە هەموو لایەكەوە، فەرمانی بە سوپاكەی كرد لە خۆراسان لەسەر سنورەكانی باشور،[2] لەو بیابانەی خوارەزم لە خۆراسان جودا دەكاتەوە بوەستێ، (٧٠٠) ئەسپسوار بەچەكەوە لە نزیك شاری (نەسا) خۆیان سازدابوو، كاتێك دوو كوڕەكەی (علا الدین) ویستیان بە ڕووی مەغۆلەكاندا هەڵشاخێن، هێندەی نەخایاند سوپاكەیان شكستی خوارد، هەردووكیان دیلكران، (مەغۆلەكان) سەریان بڕین، بە مەبەستی سوكایەتی كردن بە خوارەزمیەكانو چاوترساندنی خەڵكی بەگشتیو خەڵكی دەستكەرەوە بەتایبەتی ئەم دووسەرانەیان بە نوكە ڕمب هەڵگرتو بەنێو كوچەو كۆڵانەكانی ئەو هەرێمەداو بەبەر چاوی خەڵكەوە دەیانسوڕاندنەوە.

هاوكات لەگەڵ ئەمەدا لە ذوالعقدةی ٦١٧ك/مایۆی ١٢٢٠ز یدا سوپای مەغۆل بەرەو شاری (خوارەزم)ی پایتەختی هەرێمی (خوارەزم) پێشڕەوی كرد، جێگەی ئەم شارە لە نزیك سەرچاوەی ڕوباری جەیحونو لە هەرێمێكی بیاباندا هەڵكەوتووە، بەجۆرێك جگە لەم شارە

---

١ المصدر نفسه ص: ١٦٣.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦٣.

تەنها چەند شارە دێ یەکی بچوكو چەند گوندێکی بەربڵاوو لێکدی دوور دێنە بەرچاوو بەس.[١]

ب ـ گەمارۆدانی شاری (خوارەزم):

وەك گوتمان سەرکردایەتی سوپای مەغۆل بە دەست جوجیو ئەغتای کوڕانی (جەنگیزخان)ەوەبوو، بەڵام سەرکردایەتی باڵا بەدەستی (جوجی)ی کوڕە گەورەیەوە بوو، بەم شێوەیە مەغۆلەکان بە گیانی مەعنەویانو زۆری سەربازیانو پشتیوانی کردنیان لەلایەن (جەنگیزخان)ەوە بەهێزو پشت ئەستور بوون، بەڵام سوپای (خوارەزمی) لەلایەن کەسەوە سەرپەرشتی نەدەکراو سەرۆکی نەمابوو، بەتایبەتی دوای هەڵاتنی (جلال الدین منبکرتی)و دوو براکەی، لەلایەکی ترەوە ئەم سوپایە لە هۆزەکانی (کانکالی)ی تورکی پێکهاتبوو کە زیاتر لە سوپایەکی لاوەکیو بەکرێگیراو دەچووو نە زۆر نە کەم بە لایەوە گرنگ نەبوو بەرگری لە خاکی (خوارەزم) بکات، هەر سێك هێزی سوپای مەغۆل گەیشتنە دەورەی شار، داوای خۆبەدەستەوەدانیان لە دانیشتوانەکەی دەکردو بەڵێنی هەڵسوکەوتی جوانیان پێ دەدان، (جوجی)ی پێی ڕاگەیاندن: کە باوکی بەڵێنی پێداوە بیکاتە حوکمڕانی هەرێمی (خوارەزم)و ئەویش دەیەوێ شاری (خوارەزم) بە پایتەختی ئەو هەرێمە بمێنێتەوەو نایەوێ بڕوخێتو وێران بێت، هەروەها هەواڵی دانێ کە هۆشداری بە سەربازەکانی داوە کە نابێ بە هیچ شێوەیەك دەستی ئازار بۆ ئەو هەرێمە درێژ بکەن.[٢]

پێشداش (سوڵتان علاء الدین)ی کۆچکردوو – دوابەدوای هەڵاتنی لەو هەرێمە – نامەیەکی بۆ دانیشتوانی شاری خوارەزم ناردبوو ئامۆژگاری کردبوون خۆ بەدەستەوە بدەنو بەرگری نەکەن، لە نامەکەیدا نوسیبووی: (دانیشتوانی خوارەزم مافی زۆرو زەوەندیان بەسەر ئێمەو پێشینامانەوە هەیە، بۆیە پێویستە دڵسۆزیو ئامۆژگاری پێویستیان پێشکەش بکەینو بەسۆزو بەزەیی یەوە بۆیان بڕوانین، ئەم دوژمنە دوژمنێکی زاڵو سەرکەوتووە، کەواتە ئاشتی بکەنو ڕێ ی نەرموونیانی هەڵبژێرن، چونکە ڕەتکردنەوەی شەڕ بە ڕووی خۆش سەرکەوتوترە.[٣]

لەگەڵ هۆشداری (جوجی)و ئامۆژگاری (سوڵتانی خوارەزمی)یشدا دانیشتوان بۆ دوو پۆل دابەش بوون: پۆلێکیان باوەڕی بە خۆبەدەستەوەدانی ناچاری هەبوو، پۆلەکەی تریش

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٤.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦٤.

٣ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٩٣.

باوەڕی بە بەرەنگاریو بەرگری کردن لە خۆونیشتمان هەبوو، پاشان پشتیوانانی ڕای دووەم زاڵبوونو شار هەڵوێستی بەرگری کردنی هەڵبژارد، دانیشتوان خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوە سازکرد، کاتێك مەغۆلەکان هەستیان بە خوارەزمیەکان کرد خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کردووە، ئەوانیش لە ڕاستی خۆیانەوە خۆیان بۆ جەنگ سازکردو ئامرازەکانی جەنگیان لە مەنجەنیقو مەتاڵو شتی تریشیان لە دەورەی شار دامەزراند، لەبەر ئەوەی مەغۆلەکان پێویستیان بە بەردێکی زۆر بوو بۆ کاتی گەمارۆدانو لە کاتی جەنگدا بە هۆی مەنجەنیقەکانەوە بۆ بەردبارانکردنی شارو قەڵاکان بەکاریان دێنان، بەڵام خاکی دەورەی ئەم شارە دەشت بووو بەردی کەمی لێ بوون، بۆیە بە ناچاری دەستیان بە بڕینی دارتووەکانی دەوروبەری شارکردو قەدەکانیان پارچەپارچە دەکردنو وەك تۆپی خڕیان لێ دەکردنو بۆ ماوەیەك لە نێو ئاویان دەهاویشتن تا قورسو بەهێزبن، پاش ئەمە دەیانتوانی بە مەنجەنیقەکانیان وەکو بەرد بیانهاوێژنو دیواری شاری پێ بڕوخێنن،[1] لەم نێوانەدا کە ئامادەسازی مەغۆلەکان لەسەر پێو لاقو لەتەریان وەستابوو، ژمارەیەکی زۆر لە دیلە موسڵمانەکان ڕاپێچ کرانو هێنرانە دەورەی شار، مەغۆلەکانیش لە هەڵکەندنی سەنگەرو خەندەکدا بەکاریان هێنانو ئەم کارەیان لە ماوەی (١٠) ڕۆژدا ئەنجامدا.[2]

ج ـ پەلاماردانی شارو داگیرکردنی:

هەرکە مەغۆلەکان لە ئامادەسازی خۆیان دڵنیابوون بۆ جەنگ، (٣) هەزار سەربازیان هێرشیان کرد، بەڵام ئەمجارە خوارەزمیەکان بەڕوویاندا هەڵشاخانو شکستیان بە هێرشەکە هێنا، بەم سەرکەوتنە گیانی مەعنەویان بەرزبۆوەو پێیان وابوو تازە سەرکەوتن دەبێتە بەشیانو مسۆگەربووە، بەڵام لە ڕاستیدا شکانی ئەم هێرشە دەگەڕایەوە بۆ سەرهەڵدانی ئاژاوەی نێو خودی مەغۆلەکان خۆیان، کە لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان (جوجیو جەغتای) کوڕانی (جەنگیزخان)دا دروست ببوو، لەگەڵ ئەم کێشەیەشدا گەمارۆی شار ماوەی (٦) مانگ درێژەی کێشا، لەو ماوەیەدا هێزەکانی مەغۆل نامەیەکیان بۆ جەنگیزخان نارد ـ کە ئەو کاتە لە بەرامبەر شاری (تاڵەقان)ی باری سەرەوەی ڕووباری (جەیحون) بوو ـ، داوایان لێ دەکرد یارمەتیو کۆمەکی مادیو مرۆییان بۆ بنێرێت تا ئەو کەلێنو بۆشاییانەی پێ پڕبکەنەوە کە لە ئەنجامی هێرشە شکستخواردووەکەدا تێیان کەوتووە، هەروەها هەواڵی

[1] سيرة السلطان جلال الدين ص: ٩٣.
[2] الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٥.

ناکۆکی نێوان (جوجی‌و جەغتای)یشیان بۆ ناردبوو، لەگەڵ هەموو ئەو ئاژاوەو پەرتەوازەییەی بەهۆی ناکۆکی ئەم دووانە لە نێو هێزەکانی مەغۆل کەوتووە.

کاتێك (جەنگیزخان) ئەم هەواڵانەی بیستن ناڕەحەت بوو، یەکسەر کۆمەکی ناردو فەرمانیشی دا (جەغتای)ی کوڕی سێهەمی دەبێتە سەرکردەی سوپاکە، فەرمانی بە (جەغتای)یش کردبوو دوو براکەی پێکەوە ئاشت بکاتەوە، کاتێك سەرکردەی تازە سوپاکەی سەرلەنوێ ڕێکخستەوەو کۆتایی بە ئاژاوەی نێو سوپاکە هێنا، فەرمانی بە سوپادا هێرش باتە سەر شاری (خوارەزم)، لە کۆتایی ئەم شەڕەدا مەغۆلەکان توانیان دیوارەکانی شار کون بکەن‌و ئاڵاکانی سەرکەوتن لەسەر ئەو دیوارانە هەڵ بدەن، ئینجا مەغۆلەکان ئاگریان لە ماڵ‌و باڵەخانەکانی شار بەردا، هەرچەند بەم دیوار بەزاندنە مەغۆلەکان تا ڕادەیەك توانیان سەرکەوتن تۆمار بکەن، بەڵام خوارەزمیەکان بڕیاری گیانفیدایی‌و بەرگری یەکجارەکیان دا لە پێناو خۆیان‌و شارەکەیاندا، ژنان‌و منداڵانیش لەم جیهادەدا بەشدارییەکی کاریگەریان کرد،[1] دوای ئەمە خوارەزمیەکان ماوەی هەفتەیەك لەسەر بەرگری کردن بەردەوام بوون، لە کۆتاییدا دانیشتوانی شار لە (٣) گەڕەکدا کۆبوونەوە، پاش ئەوەی هیچ ڕێبازێکی بەرگریان نەماو تەنگیان پێ هەڵچنرا پێشنیاری خۆبەدەستەوەدانی خۆیان نیشانی (مەغۆل)دا، ئەمەو زانای گەورە (عالی الدین)ی موحتەسیبی (خوارەزم)یان بۆ لای سەرکردەی سوپای مەغۆل نارد، ئەویش ڕێزی لێناو فەرمانی کرد لە خێوەتێکی تایبەتیدا دایبنیشێنن، کاتێك نوێنەری خوارەزمی‌و سەرکردەی سوپای مەغۆل لە بەرامبەر یەك دانیشتن، نوێنەری خوارەزم گوتی: (ئێمە – لەم ماوەیەدا – سام‌و هەیبەتی خانمان – بە چاوی خۆمان – بینی، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ڕەحمەت‌و بەزەیی – خان – ببینین)، سەرکردەی مەغۆلی توڕە بووو گوتی: چ شتێکتان بینیووە لە هەیبەتی من؟ پیاوی زۆریان لێ کوشتم، ماوەیەکی دوورو درێژ شەڕیان کرد؟ ئەوە منم سام‌و هەیبەتی ئەوانم دیوە، هەر ئێستا هەیبەتی خۆمیان نیشان دەدەم![2]

ئینجا سەرکردەی مەغۆل فەرمانیدا هەموو دانیشتوان بچێتە دەرەوەی شار، داوای لە پیشەوەران کرد بە تەنیا لە شوێنێك کۆببنەوە، هەیانبوو وایکردو لە مردن ڕزگاری بوو، هەشیانبوو بە قسەی نەکردن‌و پێیان وابوو: ئەم پیشەوەرانە بۆ وڵاتی مەغۆل بەڕێ دەکرێن‌و ئەوانەی تریش مانەوە لە وڵاتی خۆیاندا دەمێننەوەو نایانکوژن، پێشبینی خوارەزمیەکان

---

١ المصدر نفسه ص: ١٦٦.

٢ سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي ص: ٩٤.

دەربارەی کۆچی پیشەوەران بۆ وڵاتی (مەغۆل) ڕاست دەرچوو، بەلام پێشبینی دووەمیان بە ڕاست دەرنەچوو، چونکە مەغۆڵەکان هەموو خەڵکەکەیان بە شمشێر سەربڕی، هەر سەربازێکی مەغۆلی (٢٤) خوارەزمیان دەدانە دەستو دەیکوشتن، ئەگەر ئەوەمان زانی کە بە سوپاکەی مەغۆل لە (١٠٠) هەزار پیاو پێکهاتبوو ئەوا ئەو ژمارە زۆرەی خوارەزممان بۆ دەردەکەوێت کە لە لایەن ئەو سوپایەوە کوشتو بڕ کراون.[1]

لە کۆتاییدا جگە لە کیژۆڵەی بچووکو منداڵی نەباڵق – کە ئەمانە کرانە بەندەو کۆیلەی مەغۆلەکان – کەسێك لە دانیشتوانی ئەو شارە بە ساغی دەرنەچوو.[2]

س ـ (إبن الأثير)و وەسفی کارەساتەکەی (خوارەزم):

مەغۆلەکان ویستیان شوێنەواری ئەم شارە لەبەرچاو ونکەن، بۆیە بەربەستەکانی ڕووباری (جەیحون)یان بە ڕوودا کردنەوەو ئاو بەسەر شارگەڕا قمی کردو هەرچی کۆشكو باڵەخانە هەبوون هەمووی داڕمان، کارێکی وای بەسەرهات وەکو دوێنێ شار نەبووبێت، (إبن الأثير) ئەم کارەساتە لەم دەستەواژەیەدا زۆر بە وردی وێنا دەکاتو دەڵێ: ئینجا ئەو – مەغۆل–انە ئەو بەربەستەی بەری ئاوی (جەیحون)ی گرتبوو لە بەرامبەر شار–ی خوارەزم–دا، بەریان هەڵدا، ئاو هاتە نێو شارەوە، هەموو شارەکە قم بوو، کۆشكو خانوبەرەکان تەپین، شوێنەکە وەکو گۆماوێك مایەوە، هەڵبەتە کەسێکی ئەو شارە لەو شارەدا بە ڕوح دەرنەچوو، شارەکانی تر کەمێك خەڵکیان ڕزگاری بووە، هەیان بووە خۆی حەشارداوەو هەشیان بووە هەڵاتووە، هەندێکیشیان دەرچووەو خۆی بە دەستەوەداوە، هی واش هەبووە خۆی لە نێو کوژراوەکاندا ڕاکێشاوەو دوایە ڕزگاری بووە، بەلام دانیشتوانی (خوارەزم): ئەوەی لە ترسی تەتەرەکان خۆی حەشاردابوو ئاو خنکاندیو داتەپینی خانوو کوشتی، ئەم شارە بوو بە کاوڵو وێرانەبوو.[3]

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کە مەغۆلەکان دەستیان بەسەر (خوارەزم)دا گرت، تەماشا دەکەین (جەنگیزخان)یش خەریکی داگیرکردنی ئەو شارانەیە کە کەوتوونەتە لای ژووروی دەریای (جەیحون)، کە گرنگترینیان (ترمزو بەلخ)ن، ڕووداوێك کە زۆر نامۆو ناوازەو دڵتەزێنە: کاتێك (جەنگیزخان) دەستی بەسەر شاری (ترمز)دا گرت، فەرمانی دا هەموو دانیشتوان بچنە دەری شار، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد هە هەموویان کوشتو بڕ بکەن،

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٦.
٢ المصدر نفسه ص: ١٦٦.
٣ الكامل ١٨٢/١٢، الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٧.

لە سەروبەندی کوشتوبڕەکەدا سەربازێکی مەغۆلی خەریك بوو پیرێژنەیەك بکوژێت، ئەم پیرێژنە دەیەویست سەری خۆی بە گەوهەرێکی بەنرخ – کە هەی بوو – بکڕێتەوە، کاتێك مەغۆلەکە داوای گەوهەرەکەی لێکرد بە بیری هاتەوەکە کە قوتی داوە، خێرا مەغۆلەکە سکی پیرێژنەکە هەڵدەدڕێتو گەوهەرەکە دێنێتە دەرەوە، ئەم هەواڵە بە خێرایی لە نێو مەغۆلەکاندا بڵاوبۆوە، گومانیان برد هەموو دانیشتوانی شار پارەو گەوهەرەکانیان قووت داوە، لەبەر ئەمە (جەنگیزخان) فەرمانی کرد دەبێ هەموو کوژراوو مردووەکان سکیان هەڵبدڕدرێت تا ئەوەی زێڕو مرواریو جەواهێر هەیە بیاهێننە دەرەوە.[١]

پاش ئەوەی مەغۆلەکان دەستیان بەسەر هەردووك هەرێمی (ئەودیو رووبار)و (خوارەزم)دا گرت، ئینجا توانیان بە تەواوەتی گەمارۆی هەرێمی (خۆراسان) بدەن، بە جۆرێك یەك لە دوای یەك گورزی خۆیان دەوەشاندنو شار لە دوای شار داگیریان دەکردنو هیچ بەربەستێكو هیچ بەرگریکارێکیشیان لە ڕێگادا نەبوو.[٢]

٤ــ لە نێوبردنی (خۆراسان):

لە پایزی ٦١٧ی کۆچی/١٢٢٠زایینیدا فەرمان بە (تۆلۆی) کوڕی (جەنگیزخان) کرا بەرەو هەرێمی (خۆراسان) پێشرەوی بکات، (جەنگیزخان) بە نیازبوو بە خودی خۆی ئەم هەرێمە داگیر بکات بەڵام بە بەڵگەی ئەوە کە ئەو لە کەناری خۆرئاوای رووباری (جەیحون) پەڕیوەتەوەو بە مەبەستی داگیرکردنی شاری (بەلْخ) کە یەکێکە لە شارە دەوڵەمەندەکانو کەوتۆتە سەر کەناری خۆرئاوای رووباری (جەیحون) بەرێکەوتووە ئەوا دەبێ (تۆلۆی) ئەم ئەرکە راپەڕێنێت.[٣]

أــ دەستبەسەرداگرتنی (بەلْخ):

شاری (بەلْخ) قەڵاو شوورەیەکی وای بۆ نەکرابوون تا بتوانێ لە بەرامبەر هێرشو پەلامارەکانی (مەغۆل)دا خۆی رابگرێت، ئەم شارە لە چەند ڕوویەکەوە بەناوبانگ بوو:

یەکێك بوو لە شارە هەرە گەورەکانی خوارەزمی، بە حوکمی ئەوە کەوتبووە سەر یەکێك لە ڕارەوە گرنگەکانی بازرگانی لە ئاسیای نێوەڕاستدا خاوەنی بایەخێکی یەکجار زۆری ئابووری بوو، هەروەها لە رووی خانوبەرەو کۆشكو تەلارو ئاوەدانیو قەرەباڵغیو بەرو بازاڕەوە لەوپەڕی پێشکەوتندا بوو، گوتراوە: (١٢٠٠) مزگەوتی گەورەی تێدابووە، بێ لە

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٦٧.
٢ المصدر نفسه ص: ١٦٧.
٣ المصدر نفسه ص: ١٦٧.

هەبوونی ئەوەندەی تر لە مزگەوتی بچکۆلە، گەرماوی یەکجار زۆری تێدابووە، بە تایبەتی ئەو گەرماوانەی بۆ خەڵکی بیانیو ئەو بازرگانانە تەرخان کرابوون کە دەهاتنە ئەو شارەوە.[١]

لەگەڵ ئەوەدا ئەم شارە لە ساڵی ٦١٨ك/١٢٢١ز یدا خۆی بە دەستەوەدا، بەڵام لە چنگی وێرانکارانەی (جەنگیزخان) نەپارێزرا، هاوکات لەگەڵ ڕووخاندنی شارەکەدا (جەنگیزخان) دانیشتوانەکەشی نەبەخشی بەڵکو کوشتوبڕی کردن، ئینجا (جەنگیزخان) بەرەو دواوە کشایەوەو (تۆلۆی)ی کوڕی بەسەرکردایەتی سوپایەکی (٧٠) هەزار کەسی بەرەو (خۆراسان) نارد.

وەك دەردەکەوێت (جەنگیزخان) نەخشەی جەنگی گۆڕی – و بۆ خۆی بەرەو خۆراسان نەڕۆیشت – ئەمە لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت ویستبێتی لەم خاڵی وەستانەدا دەست بە مەملەکەتو سوپاکەیەوە بگرێت.[٢]

ب ـ داگیرکردنی (نەسا)و لەنێوبردنی دانیشتوانەکەی:

لە ساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ز پێشەنگی سوپاکەی (تۆلۆی) کە لە (١٠) هەزار سەرباز پێکهاتبوو بە سەرکردایەتی (توجاش)ی زاوای جەنگیزخان بەرەو هەرێمی (خۆراسان) بەڕێکەوت، (توجاش) بە خۆیو تیپە سەربازیەکەیەوە ڕووی لە (نەسا) کرد، لەگەڵ نزیك بوونەوەی یەکەمین کەتیبەی سوپاکە موسڵمانەکان لێیان هاتنە دەستو تیربارانیان کردن، دەرەنجام ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، (بلجوش)ی سەرکردەی کەتیبەکەش لە نێو کوژراوەکاندابوو، کاتێك (توجاش) بە خۆیو هێزەکانیەوە گەیشت، فەرمانی کرد (١٥) مەنجەنیق لە دەورەی شار دابمەزرێنن، دوای تێپەڕینی (١٥) ڕۆژ مەغۆلەکان توانیان کەلێنێك لە دیواری شار بکەنو پاشان لە شەودا داگیری بکەن، کە ڕۆژ بوّوە دەستیان بە تۆڵە سەندنەوەی (بلجوش)ی سەرکردەی کوژراویان کرد، هەر هەموو دانیشتوانیان هێنایە دەرەوەی شار، دەستیان لە پشتەوەڕا گرێدان، هەموویا بە یەکەوە بەستنەوە، ئینجا بە ژنو پیاوو منداڵەوە کوشتو بڕیان کردن، گوتراوە ژمارەی کوژراوانی شار زیاتر لە (٧٠) هەزار کەس بووە، (نسوي) ئەم کارەساتە بە شێوەیەك وێنا دەکات کە دڵو دەروون بۆی دەهەژێ، دەڵێ: وەکو چۆن شوان مەڕو ماڵات لێدەخوڕێ، ئاوا پێش خۆیان دابوون، بردیاننە پشت باخچەکانو لە بەتاڵییەك ڕایانگرتن، تەتەرەکان هێشتا دەستی تاڵانو بڕۆیان بۆ نێو شار

١ المصدر نفسه ص: ١٦٧.

٢ المصدر نفسه ص: ١٧٢.

درێژ نەكردبوو، هەر هەموو ژن‌و منداڵ‌و پیاوی شاریان لەو دەشتە فراوانەدا كۆكردنەوە، زیرەزیری ژنان‌و زیقەزیقی منداڵان‌و هات‌و هاوارو فوغانی پیران پەردەی ئاسمانی دەدڕی، ئینجا پێیان گوترا دەستی یەكتر بگرن، لە داماویان بە قسەیان كردن، ئەگەر بە قسەیان نەكردبانایەو هەڵاتبانایە ئەوا شاخ نزیك بووو زۆربەیان ڕزگاریان دەبوو.

هەركە دەستی یەكتریان گرت: بەر لێزمەی تیرو كەوانەكانیان دان، لەسەر تەپۆلكەی بەرز پاڵیان خستن، كردیاننە خۆراكی دڕندە كێویەكان‌و داڵاش‌و قەلەڕەشەكانی ئاسمان، خوێنی زۆر ڕژا پەردەی زۆر دڕێنرا منداڵانی شیرەخۆرە بەسەر مەمكی دایكەكانیانەوە كوژرابوون‌و جێ هێڵرابوون، بە زمانی خەڵكی قوتارووی ئەو شارەو خەڵكی غەوارە ژمارەی كوژراوانی ئەم كارەساتە (٧٠) هەزار كەس بوون.[1]

(نسوي) دەگێڕێتەوە: مەغۆلەكان بە نێو (خۆراسان)دا بڵاوبوونەوە، هەر كاتێك پەلاماری وڵاتێك یان شارێكیان دابایە جووتیارەكانی ئەو هەرێمەیان كۆدەكردنەوەو وەكو ئاژەڵ پێش خۆیان دەدان‌و لە گەمارۆدانی شارەكاندا وەكو سوپەرو مەتاڵ بەكاریان دەهێنان، ترس‌و تۆقان دڵ‌و دەروون‌و هەناوی دانیشتوانی داگیركردبوو، تا كار بەوە گەیشتبوو حاڵ‌و وەزعی كەسێك لە نێو ماڵەكەی خۆیدا بوو زۆر خراپتر بوو لە حاڵ‌و وەزعی كەسێك كە بە دیل گیراوە، چونكە نەیدەزانی سەرەنجامی بە كوێ دەگات.

مەغۆلەكان ئاغاو مسكێنەكانیان ڕەشبگیر دەكردن‌و بە تۆبزی لە كاروباری گەمارۆداندا بەكاریان دێنان، هەر كەسێك ملی نەدابایە بەوپەڕی زەبوونی دەكوژرا.[2]

ج ـ كوشتارگای شاری (مەڕوە):

سوپایەكی گەورەی (تەتار) بە سەركردایەتی چەند كوڕێكی (جەنگیزخان) دانیشتوانی دیلكراوی (بەڵخ)یان پێش خۆداو بەرەو شاری (مەڕوە) ڕۆیشت، سوپاكە بە سەركردایەتی (تۆلۆی) بەڕێكەوت‌و لە نزیك شارو لە بۆسەیەكدا بەسەر هێزێكی سوارەی توركمانیان داداو زیاتر لە (١٠) هەزار كەسیان لێ كوشتن‌و ئەوانی تریش هەڵاتن‌و ژمارەیەكی زۆر ڕانە مەڕو ئاژەڵی شاریشیان تالان كرد، لە ڕۆژی دوایدا ١/محرم ٦١٨ك/ ٢٥/فبرایر/١٢٢١ز یدا: (تۆلی) بە خۆی‌و (٥٠٠) سوارەوە — بە مەبەستی دەستنیشانكردنی قەڵاكانی شار — هاتە دەوروبەری شار، ماوەی حەفتەیەكی پێنەچوو تەواوی هێزە مەغۆلیەكان لە دەرەوەی شار

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٢.

٢ المصدر نفسه ص: ١٧٣.

کۆبوونەوەو خۆیان بۆ هێرش و پەلامار ئامادەکرد، خەڵکی گەمارۆدراوی (مەرِوە) دوو کەلێنی دەرچوونیان لەبەر دەمدا بوون، بەڵام مەغۆلەکان زوو ئەم دوو کەلێنەیان بەدی کردن، بۆیە شەو بە مەبەستی ڕێگرتن لە هەڵاتنی خەڵك و سوپای خوارەزمی لە بەرامبەر دیوارەکانی شارو کەلێنەکاندا شەونخوونیان کێشا.

ڕۆژی دواتر (مدیر الملك)ی سەرۆکی شار بە مەبەستی دەرخستنی پێشنیاری خۆ بەدەستەوەدان گەورە زانایانی ئاینی بۆ لای (تۆلۆی) ناردن، بە مەرجێك سەرو ماڵی دانیشتوان پارێزراو بێ، (تۆلۆی) بەڵێنی جێبەجێ کردنی داواکانی پێدان و بەڕێی کردنەوە، خودی (مدیر الملك) هاتە نێو سەربازگەی (مەغۆل)و دیاری بە نرخی بۆ (تۆلۆی) هێنابوون، (تۆلۆی) بەڵێنی دایە خۆی و دارو دەستەکەی لەسەر حکومڕانی شار دەهێڵێتەوەو پێی گوت: کە چاك وایە بانگهێشتی داورودەستەکەت بکەی تا پۆشاکی تایبەتیان لەبەر بکەین و خەڵاتیان پێشکەش بکەین، (مدیر الملك) بانگهێشتی کردن، کاتێك گەیشتنە نێو سەربازگەی (مەغۆل)، (تۆلۆی) هەموویانی لەگەڵ (مدیر الملك) بە یەکترەوە بەستنەوەو، داوای لێکردن ناوی خەڵك لە دوو لیستی دوورو درێژدا بژمێرن:[1]

لیستەی یەکەم: ناوی بازرگانە گەورەکان و سەرمایەدارەکانی شاری (مەرِوە) لە خۆبگرێت.

لیستەی دووەم: ناوی پیشەوەران و سنعەتکەرە شارەزاکان لە خۆبگرێت.

ئینجا (تۆلۆی) فەرمانی بە سوپاکەیدا هەموو دانیشتوانی شار بێننە دەرەوە، هەموو هاتنە دەرەوەو کەس لە نێو شاردا بەجێ نەما، کورسیەکی زێڕیان هێناو (تۆلۆی کوڕی جەنگیزخان) لەسەری دانیشت و ئینجا بڕیارەکانی خۆی دەرکردن:

- سەرۆکی شارو گەورە سەرکردەکان و کاربەدەستە باڵاکانی بە دەستەجەمعی بێننە پێشەوەو بەبەر چاوی دانیشتوانی شار بکوژرێن، یەك بە یەکی ئەم وەفدە گەورەیان هێنان و شمشێریان لە گەردندان و خەڵکیش تەماشایان دەکردو دەگریان.
- دەرهێنانی پیشەوەرو سنعەتکەرە شارەزاکان و ناردنیان بۆ (مەنغۆلیا) بە مەبەستی سوود بینین لە خۆیان و شارەزاییەکانیان.

---

[1] الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٥.

● دەرهێنانی سەرمایەدارەکان و ئەشکەنجەدانیان — بە مەبەستی ئاشکراکردنی خەزنەو پولو پارەکانیان—، ئەم ڕەفتارەیان ئەنجامداو خەڵکانێك لە ژێر ئەشکەنجەدان مردن، چونکە ئەوەی هەیبوو بەشی کڕینەوەی سەری خۆی نەدەکرد.

● چوونە نێو شارو پشکنینی ماڵەکان و دۆزینەوەی ماڵ و کەلوپەلی بە نرخ، کار بەوە گەیشت بە ئومێدو خولیای دۆزینەوەی زێڕو پارە گۆڕی سوڵتان (سنجر)یشیان هەڵدایەوە، ئەم گەڕان و پشکنینە (٣) ڕۆژ درێژەی کێشا.

● فەرمانی پێنجەم: کوڕی جەنگیزخان فەرمانی دا: هەموو خەڵکی شار کوشتو بڕ بکرێن، مەغۆلەکان یەك بە یەکی دانیشتوانی (مەڕوە)یان کوشت، دەیانگوت: ئەم شارە یاخی بوو لە ڕومان هەڵگەڕابۆوە، هەر کەسێکیش بەرگری بکات ئەمە سەرەنجامەکەیەتی.[1]

بەم شێوەیە شاری (مەڕوە) لەبەر چاوان بوو بە شوێنەوارێکی کاول و وێرانە، هەموو دانیشتوانەکەی کوژرا، (إبن الأثیر) دەڵێ: ژمارەیان (٧٠) هەزار کەس بووە، بەڵام (جوینی) لە کتێبە مێژووەکەی خۆیدا (تأريخ جهانكشاى)دا دەڵێ ژمارەی کوژراوانی شاری مەڕوە — کە لەو گۆڕەپانەدا کوژران — خۆی لە یەك ملیۆن و سێسەد هەزار کەس داوە، ئەمە جگە لە تەرمێکی زۆر کە لەملاولەولاو پەناو پەسیوان و شوێنی نادیاردا کەوتبوون.[2]

د_ تۆڵە سەندنەوە لە دانیشتوانی شاری (نەیسابور):

ساڵی ٦١٧ك/١٢٢٠ زاینی و پاش قەسابخانەکەی شاری (نەسا)، (توجاشر) بەرەو شاری (نەیسابور) بەڕێکەوت، بڕیاریدا داگیری بکات، دەستی بە هێرش و پەلامارکرد، لە ڕۆژی سێهەمی پەلامارەکەدا تیرێکی دوژمنەکانی بەرکەوت و کوژرا، جێگرەوەکەی پێی وابوو هێندەی هێزو سوپا لەبەر دەستدا نیە بەشی داگیرکردنی شار بکات، بۆیە گەمارۆی سەرشاری شکاندو بە ئومێدی ئەوە تا سوپاکەی (تۆلۆی) بە فریای دێ خۆی بە دەست بەسەرداگرتنی هەندێك قەڵای دەوروبەرەوە خەریك کرد،[3] ئەمەو پاش کۆکوژیەکەی دانیشتوانی شاری (مەڕوە) (تۆلۆی) لە ماوەی (١٢) ڕۆژدا خۆی گەیاندە شاری (نەیسابور)، (تۆلۆی) بڕیاریدا تۆڵەی (توجاشر) بکاتەوە، دانیشتوانی شار کە تەماشایان کرد مەغۆلەکان خۆیان بۆ هێرش و پەلامار ساز دەکەن، ئەوانیش خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوە ئامادە کرد،

---

١ قصة التتار، د. راغب السرجاني ص: ٤٧.
٢ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٥.
٣ المصدر نفسه ص: ١٧٤.

بەڵام کە وادەی هێرشو بەرەنگاربوونەوە نزیك بۆوە سەرکردەکانی سوپای خوارەزمیو دانیشتوانی شار تەماشای دەوروبەری شاریان کرد: ئاپۆڕای ڕەشی سوپای مەغۆلیان بینی، بەمە ترسو خەوف هەناوی داگیرکردن، بۆیە بە ناچاری وەفدێکی خۆیان کە لە گەورە زانایانی ئاینیو پیاوماقوڵانی شار پێکهاتبوو – بە سەرۆکایەتی (قاضي القضاة = سەرۆکی قازیەکان)ی خۆراسان بەرەو سەربازگەی (مەغۆل) نارد، پێشنیاری خۆبەدەستەوەدانو پێدانی سەرانەی ساڵانەیان بۆ (تۆلۆی) خستەڕوو، بەڵام (تۆلۆی) هەناوی بە ئاگری تۆڵەی (توجاشر)ی مێردی خوشکی گڕی گرتبووو کڵپەی دەکرد، بۆیە هەر پێشنیارێکی وەفدەکە دەیخستە ڕوو ڕەتی دەکردەوە،[1] لە ڕۆژی دووەمدا (تۆلۆی) سەنگەرەکانی پێشەوەی بەسەرکردنەوەو هانی دەدان، لە ڕۆژی ١٢ـ صفر – ٦١٨کۆچی/ ٧ـ ئەپریل ـ ١٢٢١ زاینیدا (تۆلۆی) فەرمانی دا لە هەموو لایەکەوە هێرش بکرێتە سەر شار، بە درێژایی ئەو ڕۆژو شەوە جەنگ بەردەوام بوو، ئینجا مەغۆلەکان توانیان ژمارەیەکی زۆر کونو کەلێن لە قەلاو دیوارەکانی شاردا پەیدا بکەنو لە هەموو لاڕا بچنە نێو شارەوە، کوچەو کۆڵانەکانو نێو خانوبەرەکان ببوونە مەیدانی شەڕو پێکدادان، لە کۆتاییدا مەغۆلەکان دەستیان بەسەر تەواوی شاردا گرت، لە تۆڵەی (توجاشر)دا دەستیان بە کوشتو بڕی خەڵك کرد، ژنەکەی (توجاشر) کە کچی (جەنگیزخان) بوو، بە سەرکردایەتی (١٠) هەزار سەربازی مەغۆلی خۆی بە نێو شاردا کرد، هەر کەسێکیان توش ببوایە لە ژنو منداڵو پیاوو پیر جەبیان نەدەداو دەیانکوشت، هەموو خەڵکی شاریان کوشت، تەنانەت سەگو پشیلەش لەم کوشتو بڕە ڕزگاریان نەبوو.[2]

بەڵگەیەك بۆ ئەو قسەیە: کە مەغۆلەکان بەوپەڕی سۆزو شەوقەوە تۆڵەیان لە دانیشتوانی نەیسابور دەکردەوە، ئەوەیە: (تۆلۆی) تێبینی کرد خەڵکانێك دەیانەوێت بە خەوتوویی خۆیان لە نێو کوژراوەکاندا ڕاکێشن تا لەم کوشتو بڕە ڕزگاریان بێ، بۆیە (تۆلۆی) بە مەبەستی ئەوە کەسی ئەو شارە بە زیندوویی دەرنەچێ فەرمانیدا سەری هەموو خەڵکە کوژراوەکە بە شمشێر ببڕدرێتو سەرەکان لە لایەك دابنرێنو لاشەکانیش لە تەنیشتیانەوە دابنرێن.[3]

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٦.

٢ المصدر نفسه.

٣ الكامل في التاريخ ١٢/١٨١، الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٧.

ڕووخاندنی شار (١٥) ڕۆژی خایاند، نیشانەکان تەخت کران جگە لە (٤٠٠) کەس پیشەوەرو سنعەتگەر کەسیان بە زیندوویی لەو شارەدا نەهێشتەوە، (تۆلۆی) بۆ ئەوەی دڵنیا بێ بە تەواوەتی قەلاچۆی خەڵکی کردووە پاش ڕۆیشتنی لە شار ژمارەیەك سەربازی تێدا بەجێ هێشتن، تا هەر کەسێك خۆی بە دەربخات بیکوژن، ئەمەو دوای ڕۆیشتنی سوپای مەغۆلی ژمارەیەك لە خەڵکی شار لە بن دارو بەردی شار هاتنە دەرەوەو ئەوانیش لە لایەن ئەو پۆلە سەربازانەوە کوشتو بڕ کران، شایانی باسە ڕوخاندنی ئەم شارە بە (٢) مانگ دوای مردنی (علاء الدين خوارەزمشا) ڕوویدا.[١]

س ـ گەردنکەچی شاری (هەڕات):

دوابەدوای کوشتو بڕو کاولکاریەکەی شاری (نەیسابور)، سوپاکەی مەغۆل بەرەو یەکێك لە شارە گرنگەکانی هەرێمی (خۆراسان) بەڕێکەوت کە شاری (هەڕات) بوو، (تۆلۆی)ی سەرکردە لە ڕێگادا پۆلە سەربازێکی بەرەو شاری (طوس) نارد، هەموو شاریان بە ئارامگای مەشهەدی (علي بن موسى الرضا) و (هارون الرشيد)یشەوە ڕوخاندن،[٢] کاتێك (تۆلۆی) گەیشتە سەر بەرزاییەکانی (هەڕات) نوێنەری بۆ نێو شار نارد، داوای خۆ بەدەستەوەدانی لێ دەکردن، ئەوانیش بە کوشتنی نوێنەرەکە وەلامی (تۆلۆ)یان دایەوەو خۆیان بۆ بەرگری کردن لە شارەکەیان ئامادەکرد، هێندەی پێنەچوو سوپای (مەغۆل) لە هەموو لایەکەوەو لە یەك کاتدا پەلاماری شاری دا. دوابەدوای گەمارۆدانێك کە بە ڕیوایەتی (إبن الأثير) (١٠) ڕۆژی خایاند،[٣] بە ڕیوایەتی مێژوونووسانی تریش (٨) ڕۆژی خایاند.[٤]

خەڵکی شار داوایان کرد ئەگەر – ژیانو گوزەرانیان پارێزراو بێت خۆیان بە دەستەوە دەدەن، لەو کاتەدا خەریك بوو سوپای مەغۆل پەرتەوازەیەکی سامناکی تێ بکەوێ، بۆیە (تۆلۆی) بە نابەدڵیەوە پێشنیاری شاری قبووڵ کرد، بەڵام کە چووە نێو شارەوە پەیمانی شکاندو دەورەی (١٢) هەزار کەسی لێ کوشتن، ئینجا حکومڕانێکی موسڵمانی بەسەرەوە دانانو بە فەرمانی بابی شاری (هەڕات)ی بەجێ هێشتو بۆ خزمەت (جەنگیزخان)ی باوکی گەڕایەوە (تالەقان).[٥]

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٧٧.
٢ الكامل في التاريخ ٩/٣٤٣، الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٥١.
٣ الكامل في التاريخ ٩/٣٤٣، عودة الروح ص: ٢١٩.
٤ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٥٢، عودة الروح ص: ٢١٩.
٥ الكامل في التاريخ ٩/٣٤٣، عودة الروح ص: ٢١٩.

هێندەی نەخایاند دانیشتوانی (هەرات) هەواڵی سەرکەوتنەکانی (جلال الدین منکبرتی)یان بیست کە لە هەرێمی (غەزنە) بەسەر مەغۆلەکانیدا تۆمار کردوون، بۆیە ئەوانیش شۆڕشیان لە دژی حوکمی مەغۆلی لە شارەکەدا گێڕا، ئەمە وای لە مەغۆلەکان کرد هێرشێکی خەست و خۆڵ بکەنە سەر شارو بە توندو تیژی داگیری بکەنەوە، تالآن و بڕۆیەکی زۆریان لێکردو پاشان کردیانە خۆراکی ئاگربارانی خۆیان.[1]

بەم شێوەیە هەرێمی (خۆراسان) گەردنکەچی مەغۆلەکان بوو، شایانی باسە: لەو کاتەدا مەغۆلەکان پەلاماری (خۆراسان) یان دەدا، یەکێك لە تیرە تورکمانەکان کە لە نزیك شاری (مەروە) نیشتەجێ بوو لە ترسی مەغۆلەکان وڵات و موڵك و ماڵی خۆیان بەجێ هێشت و بەرەو خۆرئاوا هەڵات و لە (ئەرمینیا) جێگیر بوو، دوای (٨) ساڵی تر مەغۆلەکان هێرشیان کردە سەر ئەو هەرێمەش، ئەم تیرە ئەوێشی بەجێ هێشت و بەرەو (ئاسیای بچووك) ڕۆیشت، ئەم تیرە لە (٤٤٠) خێزان پێکهاتبوو (ئورتۆغرول) سەرکردایەتی دەکرد، توانی لە هەرێمی (ئەنقەرە)ی سەر بە سەڵتەنەتی (سلجوقی)و هەڵکەوتوو لەسەر سنووری دەوڵەتی (بێزەنتی) جێی خۆی بکاتەوە، سەرکردایەتی ئەم تیرە تورکانە گەیشت بە (عوسمان): کە لە ساڵی ٧٠٠ کۆچی/ ١٣٠٠ زاینیداو پاش لاواز بوونی دەسەلآتی سلجوقی (لە ئاسیای بچووکدا) توانی لەسەر بناغەی دیوارە ڕووخاوەکانی ئەم دەوڵەتە دەوڵەتێکی تازە بۆ خۆی دامەزرێنێ، ناسناوی (سوڵتان)ی بە خۆیەوە لکاند، کەواتە (عوسمان) بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی (دەوڵەتی عوسمانی) دادەنرێت.

٥ـ داگیرکردنی هەرێمی (غەزنە):

کاتێك هەواڵی گەیشتنی (جلال الدین منکبرتی) بە خۆو بە سوپایەکی زۆرەوە بۆ (غەزنە) بە جەنگیزخان گەیشت، ئەویش بە خۆو بە سوپایەکی (٦٠) هەزاریەوە بە پەلە بەرەو ئەو هەرێمە بەڕێ کەوت، لەڕێگادا هەندێك لە سوپاکەی ڕاسپارد گەمارۆی قەڵای (بامیان) بدەن، زۆربەشی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (جلال الدین) بەڕێکەوت، هێندەی نەخایاند هێزەکانی قەڵاکەیان گرت و خۆیان بەنێوشاردا کرد، هەرچی کۆشك و تەلارو مزگەوت و مەڵبەندەکانی ژیان و شارستانی هەبوون هەرهەمویان ڕوخاندن و تەختیان کردن،[2]

---

١ عودة الروح ص: ٢١٩، الکامل ٩/٢٤٣.

٢ عودة الروح ص: ٢٢١.

لەم کاتەدا کە (جەنگیزخان) سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی بەسەر شاری (بامیان)دا تۆمارکرد، هەواڵی بۆهات کە (جلال الدین) توانیویەتی سەرپای مەغۆل لە دەشتەکانی (بەیرەوان)ی نزیك شاری (غەزنە) تێكو پێك بشكێنێت.

(جەنگیزخان) بەهەموو سوپاكەیەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ڕۆیشت، پێشووتریش: هەندێك لە هێزەكانی خۆی بە مەبەستی چاودێری كردنی جموجۆڵەكانی (جلال الدین)و بە هاوارەوەچوونو پێشكەش كردنی یارمەتی بەو سوپایەی گەمارۆی (قەندەهار)ی داوە ناردبوونە دەوروبەری شاری (كابول).

كاتێك پێشەنگی سوپاكەی جەنگیزخان لە (قەندەهار) لە لایەن (جلال الدین)ەوە تێكشكێنرا، ئەم هێزانە ڕوویان كردە (بەیرەوان)ی نزیك (غەزنە)، جەنگو پێكدادان لە نێوان ئەم سوپایانەو سوپای ئیسلامیداو لە دەشتەكانی دەوروبەری (بەیرەوان) ڕویدا،[1] دوابەدوای سەركەوتنی لە (قەندەهار) جلال الدین خۆی گەیاندە (غەزنە)، دەستی بە كۆكردنەوەی سوپاو ئامادەسازی كرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مەغۆلەكان، ئەمەو ئەم سەركردانە (سیف الدین بقراق الخلیجی، (أعظم الملك)ی حكومڕانی (بەڵخ)و هەردووك ئەمیر: مظفر ملك و حسن قزلق) بە خۆیانو (٣٠) هەزار جەنگاوەری ئەسپ سوارەوە لە خزمەتیدا ئامادەبوون، بە سوپاكەی خۆیشیو سوپاكەی (أمین الملك) ئەوەندەی تر دەبوون، بەمە ژمارەی سوپا گەیشتە (٦٠) هەزار جەنگاوەر، ئینجا پێشڕەوی كردو ڕۆیشت تا لەگەڵ هێزەكانی (تۆلۆی كوڕی جەنگیزخان) لە دەشتی (بەیرەوان) پێكهەڵشاخان، جەنگەكە بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەردەوام بوو، شەو لێك بوونەوە بە ئومێدی ئەوە بەیانی بە یەكتر بگەنەوە، لەگەڵ ئەو هەموو فرتو فێڵو پیلانە جەنگیانەی سوپای مەغۆل دەیزانینو بەكاری هێنان، بەڵام ئازایەتی (جلال الدین) گەورەترین كاریگەری هەبوو لەسەر تێكشكانی مەغۆلەكانو هەڵاتنیان لەبەر چاوی سوارانی خوارەزمیدا.[2]

(نسوي) زۆر بە شێوەیەكی ڕاستو دروستو جوان وەسفی ناخی خوارەزمیەكان دەكات لەو كاتەدا، دەربارەی ئەم سەركەوتنە دەڵێ: كاتێك ئاپۆڕای دوو سوپاكە پێكهەڵشاخان، (جلال الدین) خودی خۆی هەڵمەتی بردەسەر دڵو دەروونی (تولیخان)، سیستەمی سوپاكەی لێكترازاند، ئاڵاكانی خستە بەرسمی ئەسپەكانو ناچاری تێكشكانو هەڵاتنی

---

١ الكامل ٩/٣٤٣، عودة الروح ص: ٢٢١.

٢ عودة الروح ص: ٢٢٢.

کردن، شمشێری تۆڵە لەسەر گەردنیان بەرز بۆوە، (جلال الدين) بەسەر شانی مەغۆلەکاندا بازی دەداو بە شمشێرەکەی لە شانیانرا دایدەتاشین، چۆن وانەکا کە لە کاتێکدا: بە کوشتنی برایەکانی و لەدەستدانی باب و مەملەکەت و کەس و کارەکەی پشتیان شکاندووە، بەتەنێ ماوەتەوە نە باب ماوە نە کوڕ ماوە نەسەیید ماوە نە کۆیلە ماوە.

(تۆلۆیخان) لەنێو بڵێسەی ئاگری شەڕدا شکستی خواردو بەزی، دیلێکی زۆریان لێکرا،[1] خوارەزمیەکان تۆڵەیەکی توندو تیژیان لە مەغۆلەکان کردەوەو بزماریان لە گوێی دیلەکان دادەکوتان، (جلال الدين) تەماشای دەکردن لە خۆشی ئەم سەرکەوتنە دەم و چاوی گەشابۆوە.[2]

بە هۆی ئەم سەرکەوتنەی (جلال الدين) هەندێك شاری ئیسلامی کە پێشدا بە خۆشی خۆیان بە دەستەوە دابوو کودەتایان بەسەر مەغۆلەکاندا کرد، یەکێك لەو شارانە (هەرات) بوو، بەڵام کودەتاکە هێشتا لە نێو لانکەدا بوو سەرکوت کرایەوە، هەروەها هەر بەهۆی ئەم سەرکەوتنەی (جلال الدين)ەوە ترس و تۆقین کەوتە دڵ و دەروونی ئەو سوپایەی قەڵای (بەلْخ)ی گەمارۆ دابوو، بە ناچاری گەمارۆکەیان لەسەر لابرد.[3]

سەرکەوتنی (جلال الدين) لە دەشتی (بێرەوان) سەرکەوتنێکی کاتی بوو، کاتێك دەستکەوتەکانی جەنگی لە نێو سەرکردەو سەربازانی سوپاکەیدا دابەش دەکرد دوو سەرکردەی باڵا لەسەر ئەسپێکی عەرەبی کێشەیان لە نێواندا دروست بوو، کار بەوە گەیشت یەکێکیان شوڕکە دارێکی بەسەری بەرامبەرەکەیدا کێشا، سوڵتان بەم سوکایەتیە ناقایل بوو، بەڵام شوڕك وەشێنەکە داوای لێبوردنی نەکرد، دەرەنجام سەرکردەکەی تر بەخۆی و بە سەربازەکانیەوە بەرەو شاری (بیشاور)ی سەر سنووری (هیند) کشایەوە، پاش ئەوەی هەموو هەوڵەکانی سوڵتان بۆ گێڕانەوەیان بە هەواداچوو ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی (ئۆیغۆر)ی شاری غەزنە پەیوەندیان پێوەکردن.[4]

لەم کاتەدا سوپای موسڵمانان دووبەرەکی و دابەشبوونی تێکەوتبوو، (جەنگیزخان) ــ بۆ تۆڵەی شکستەی دەوروبەری (بەیرەوان) ـ خۆی گەیاندە (غەزنە)، (جلال الدين) لەم کاتەدا ــکە ئاژاوەو پەرتەوازەیی لە نێو سوپاکەیدا پەیداببوو ــ نەیەویست خۆی تووشی شەڕی

---

١ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٨٠ــ٨١.
٢ الدولة الخوارزمية ص: ١٨٢.
٣ عودة الروح ص: ٢٢٢.
٤ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ١٨٧.

خۆترێن بکات، لەبەر ئەمە بڕیاریدا بەرەو دەشتێکی هەڵکەوتووی خۆرئاوای ڕووباری (سند) پاشەکشە بکات، کە گەیشتە ئەوێ دەستی بە نامە نووسین کرد بۆ ئەو سەربازو سەرکردانەی لە سوپاکەی جودا ببوونەوەو دەیەویست بە لای خۆیدا ڕایانکێشێتەوە،[١] ئەمەو سوڵتانی خوارەزمی لە ساڵی ٦١٨کۆچی/١٢٢١ زاینیدا دەستی بە ڕێکخستنەوەی ئەو سوپا سەربازیە کردەوە کە تا ئێستا لەگەڵیدا مابۆوە، سەرکردایەتی کردنی دەستەڕاستی سوپاکەی بە (ئامین مولك)ی سەرکردە سپاردو فەرمانی پێدا پشتی بە لای ڕووباری (سند)ەوە بدات، فەرمانی بە سەرکردەی باڵی چەپیش کرد پشت بە بەرزاییەکانی چیایەکی ناوچەکەوە بدات، خۆیشی لەو نێوەندەدا مایەوە، ئینجا ئاگری جەنگ هەڵایسا، لە سەرەتادا خەریك بوو مەغۆلەکان بشکێن، بەڵام هێندەی نەخایاند لە پشتەوەڕا خۆیان بەنێو سوپای ئیسلامدا کرد، لە پشتەوەشڕا لە باڵی ڕاستی سوپای ئیسلامیانداو دەرەنجام موسڵمانەکان تێکشکان،[٢] (جلال الدین) لەگەڵ ئەمەشدا خۆی بە دەستەوە نەدا، جگە لە (٧٠٠) کەسی بە جەرگو ئازا کەسی تری بەدەستەوە نەمابوو، بەردەوام جەنگی دەکرد، (إبن الأثیر) بەم شێوەیە باسی ئەم ڕووداوە دەکات: هەر هەموو لایەك دانیان بەوە داهێنا کە تەواوی جەنگەکانی تر لە بەرامبەر ئەم جەنگەدا گاڵتەو گەپ بوون،[٣] ئامانجی (جلال الدین) لەم جەنگەدا ئەوەبوو کە دەیەویست کەلێنێك لە نێو سوپای مەغۆلدا دروست بکاتو دوایەش بە ئاسانی خۆی پێدا قوتار بکات، بەڵام لە کۆتاییدا ڕووی لە ڕووباری (سند) کرد، بە سواری ئەسپەکەیەوە خۆی بە ڕووبارەکەدادا کە (١٠) مەتر (٢٠ ذراع) قووڵ بوو، بەم شێوەیەتوانی لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوەو بەرەو کەناری خۆرهەڵات بڕوات، ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی کوژرانو ئەوانەش ویستیان بەرەو کەناری خۆرهەڵات هەڵێن خۆیان بە ڕووبارەکەداداو خنکان، یەکێك لە کوڕەکانی — کە تەمەنی (٧) ساڵان بوو — بە دیل گیراو (جەنگیزخان) بە دەستی خۆی کوشتی، کە (جلال الدین) گەیشتە سەر قەراغ ڕووباری (سند) دایکیو دایکی کوڕەکەیو خێزانەکەی هاواریان لێکرد توخوا ئەگەر نەمانکوژیو لە دیلکران ڕزگارمان نەکەی، فەرمانی پێکردن خۆیان هەڵدایە نێو ڕووبارەکەوەو خنکان، ئەمە یەکێك بوو لە بەڵا سەرسوڕهێنەرەکانو موسیبەتە کەم وێنەکانی مێژوو.[٤]

---

١ سیرة السلطان جلال الدین ص: ١٥٦ــ١٥٧.

٢ عودة الروح ص: ٢٢٣.

٣ الکامل ٩/٣٤٤، عودة الروح ص: ٢٢٤.

٤ تتمة المختصر في أخبار البشر لابن الوردي ص:١٥٥.

شایانی باسە (جلال الدین منکبرتی) وەکو وەفادارییەك بۆ ئەو ئەسپەی کە بە سواری ئەو لە ڕووبارەکە پەڕیەوەو بوو بە مایەی ڕزگارکردنی لە لای خۆی هێشتەوەو پارێزگاری لێدەکرد، تا گەڕایەوە ولاتی خۆی – سواری نەدەبووو خزمەتێکی باشی دەکرد.

مەغۆلەکان زۆریان حەز لێی بوو خۆ بگەیەننە (جلال الدین)و – لە ڕووباردا بیگرن – بۆیە زۆریان بڕیارياندا خۆ لە ڕووباردەن، بەلام (جەنگیزخان) بە پەلە هاتە پێشەوەو نەیهێشت ئەم کارە ئەنجام بدەن، کاتێك (جەنگیزخان) بیستی (جلال الدین) فەرمانی داوە هەرچی زێڕو زیوی پێیانە هەڵیدەنە نێو ڕووباری سندەوە – نەوەك بەردەستی مەغۆلەکان بکەوێ.

هەندێك لە پیاوانی خۆی ناردو خۆیان لە ڕووبار هاویشت و توانیان هەندێك لەو زێڕو پارە بێننە دەرەوە.[1]

لەگەڵ ئەوەدا سوڵتانی خوارەزمی و سوپاکەی توشی ئەم شکستە بێ ڕەزایەو هەڵوێستە زێدە ناخۆشە بوون، بەلام (٤) هەزار سەربازی خوارەزمی توانیان خۆ لە جەنگ دوژمن ڕزگاربکەن و بە ڕووباری (سند)دا بپەڕنەوەو – بە ڕووت و قووتی و پێخواسی وەکو تازە لە گۆڕ هاتبنە دەرەوەو بۆ مەیدانی حەشرو حیساب بچن – بگەنە کەناری خۆرهەلاتی دەریای سندو لە دەورەی سوڵتانەکەیان کۆ ببنەوە،[2] شتێکی سروشتی و ئاسایی بوو کە کاتێك (جلال الدین) بەم هەموو سەربازانەی خۆی گەیشت زۆر شادومان ببێ.[3]

ئەوەی گومانی تێدا نەبێ: (جلال الدین) لەو ماوەیەداو دوای کارەساتی سند کە لە ولاتی هیند گوزەراندی (لە تاو خۆی و دەوڵەتەکەی) لە شێوەی مرۆڤێکی شکاوو داماو خۆی دەردەخست، (إبن الوردي) لە چەند دێڕە شیعرێکدا وەسفی (جلال الدین)و دەوڵەتەکەی دەکات: کە چۆن لە پێشدا گەیشتبووە لوتکەی شکۆداری و بالادەستی و دوایەش چۆن کەوتە دۆڵی قوڵی داماوی و زەبوونی، وەکو دەڵێ:

من ملك الدنيا ودانت له فالجهل كل الجهل أن يحسدا
بقدر ماترفع أصحابها تحطهم فالرأي قرب المدا
ويلي على المغري بعليائها سيضحك اليوم ويبكي غدا
تعطيه كالمشفق لكنها تبطش في الأخذ كبطش العدا
مبتدأ حلو لمن ذاقه ولكن انظر خبر المبتدأ

١ الدولة الخوارزمية ص: ١٨٧.
٢ سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي ص: ٨٥.
٣ الدولة الخوارزمية ص: ١٨٨.

غـــدارة خـــوانـــة أهـــلـــهـــا    مــا زهــد الــزهــاد فــيــهــا ســـــدى[١]

(جلال الدين) لە ئازایەتیو پێشڕەوی کردندا بە نموونە دەهێنرێتەوە، (جەنگیزخان)ی دوژمنی زۆری پێ سەرسام بوو، دەربارەی ئەو گوتبووی: (پیاوی ئازا دەبێ ئاوابێ).[٢] بە کاربەدەستانی دەوڵەتەکەی خۆی دەگوت: (ئەو باوکە چەند بەختەوەرە کە ڕۆڵەی ئاوا ئازاو بەهێزی وەك (جلال لدین)ی لێ دەبێ، چونکە چیاوی ئازا لە لای پیاوی ئازا نرخی دەزانرێ، ئەگەرچی ئەو پیاوە سەرسەختترین دوژمنیشی بێ).[٣]

(غەزنە) دواهەمین هەرێم بوو لە هەرێمەکانی جیهانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیو لەسەردەمی (الناصر الدين الله)ی خەلیفەی عەباسیدا لە لایەن مەغۆلەکانەوە دەستی بەسەرداگیرا، پاش دڵنیابوونی (جەنگیزخان) لەوە کە بە تەواوەتی بەسەر ئەو هەرێمانەدا زاڵبووەو تۆڵەی لە بکوژانی بازرگانەکانی کردۆتەوە لە شاری (ئەتراڕ)[٤] و خاکی فراوانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیان لە چینەوە تا عێراق خستۆتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیانەوە، ئینجا پێیەکانی خۆیان لە هەموو کەرتەکانی دەوڵەتی (خوارەزمی) چەقاندن، هەرێمە داگیرکراوەکان لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرئاوا ئەم دەوڵەتانەی ئێستا دەگرێتەوە:

١ـ کازاخستان، ٢ـ قرغیزستان، ٣ـ تاجیکستان، ٤ـ ئۆزبەکستان، ٥ـ تورکمەنستان، ٦ـ پاکستان، جگە لە ناوچەکانی باشووری کە بە هەرێمی (کرمان) ناسراوە، ٧ـ ئەفغانستان، ٨ـ زۆرینەی ئێران، جگە لە ناوچەکانی بەشی خۆرئاوای سەر سنووری عێراق کە ئیسماعیلیەکان تێیدا نیشتەجێ بوون، ٩ـ ئازەربایجان، ١٠ـ ئەرمینیا، ١١ـ جۆرجیا، ١٢ـ باشووری خۆرئاوای ڕووسیا.[٥]

٦ـ کۆتایی هاتنی (جلال الدين منکبرتی):

دواهەمین سوڵتانی خوارەزمی (جلال الدين منکبرتی)یش ٦١٧ـ٦٢٧ك نەیتوانی هەتا سەر خۆ لە بەرامبەر مەغۆلەکان ڕابگرێ، چونکە دوابەدوای سەرکەوتنە مەزنەکەی کە لە ساڵی ٦١٨كو لە دەشتی دەوروبەری (بەیرەوان)ی نزیك شاری (کابول) بەسەر مەغۆلەکانیدا تۆمار کرد، هەر لە هەمان ساڵداو بە هۆی ناکۆکیو دووبەرەکی سەرکردەکانی سوپاکەیەوە لە

١ تتمة المختصر في أخبار البشر ص:١٥٥.
٢ الدول المستقلة في المغرب الاسلامي ص: ١٨٨.
٣ المصدر نفسه ص: ١٨٩.
٤ عودة الروح ص: ٢٢٤.
٥ قصة التتار ص: ٦٥.

بەرامبەر سوپاکەی (جەنگیزخان)دا تێکشکاو بە ناچاری لە ڕووباری (سند) پەڕیەوەو بەرەو وڵاتی (هیند) هەڵات.[١]

بەر لەوەی لە ساڵی ٦٢١ك هیندستان بەجێ بێڵێ، بڕیاریدا ڕوو لە سنووری ئەوپەڕی خۆرئاوا بکات، بە واتایەکی تر بڕیاریدا خۆیو سوپاکەی لە دوورترین خاڵی ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆلەکان جێگیر بکات، لێرەوە دەستی بە ڕۆیشتن کردو هەموو ئەو بیابانە وشکەڕۆیەی بڕی کە خاکی هیندستانو کرمان لێك جودا دەکاتەوە، (بوراق حاجب)ی حکومڕانی هەرێمی کرمان بە گەرمی پێشوازی لێکردو دڵسۆزی خۆی بۆ ئاشکرا کردو بە سوڵتانو گەورەی خۆی قبوڵ کرد، لەگەڵ ئەمەشدا یەکێك لە کچەکانی خۆی پێشکەش کرد، سوڵتانیش لێی قبوڵ کردو هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی ئەنجامدا، بە هەمان شێوە (سعدالله ئەتابەك)ی حکومڕانی هەرێمی (فارس)و (علا الدین)ی حکومڕانی (یەزد)یش هەمان هەڵوێستی حکومڕانی کرمانیان لە بەرامبەر سوڵتانی خوارەزمیدا نواندو بە سەرگەورەی خۆیان قبوڵ کرد.[٢]

هەنگاوی دووەمی (جلال الدین) دەست بەسەرداگرتنی شاری (ئەسفەهان)ی پایتەختی هەرێمی کوهستان بوو لە ناوچەی خۆرئاوای ئێران، کاتی خۆی (غیاث الدین)ی برای لە لایەن (سوڵتان علا الدین)ی باوکیەوە کرابووە حکومڕانی ئەم هەرێمە، پاش ڕۆیشتنەوەی مەغۆلەکان بەرەو خۆرهەڵات (غیاث الدین) دەسەڵاتی خۆی بە شێوەی جاران تێدا جێگیر کردەوە، لەگەڵ دەرکەوتنەوەی (جلال الدین)ی برای ئەویش وەکو حکومڕانەکانی تری هەرێمەکانی ئێران چووە ژێر ئاڵای سوڵتان (جلال الدین)ەوە، بەم شێوەیە تەواوی خۆرئاوای ئێران چووە ژێر دەسەڵاتی (جلال الدین)ەوە، دەوڵەتی تازەی خوارەزمی لەگەڵ خیلافەتی عەباسیدا بوونە هاوسنووری یەکتری، بارو دۆخە سیاسیەکان زۆریان یارمەتی (جلال الدین)دا، لە شەوالی ساڵی ٦٢٢ کۆچیدا خەلیفە (الناصر لدین الله)ی عەباسیو دوژمنی خوارەزمیەکان وەفاتی کرد، خەلیفە (الظاهر)ی کوڕیشی تەنها (٩) مانگ ژیاو لە ڕەجەبی ٦٢٣ی کۆچیدا وەفاتی کرد، پاش ئەویش (المستنصر بالله)ی کوڕی لە ساڵی ٦٢٣ــ٦٤٠ك جڵەوی خیلافەتی بە دەستەوە گرت، بەڵام ئەو (لەگەڵ خوارەزمیەکاندا) حەزی بە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی نەدەکرد، تا کار بەوە گەیشت لە کۆشکی خیلافەتدا پێشوازی لە نوێنەری (جلال الدین) کرد.[٣]

---

١ الأتراك الخوارزميون ص: ٢٥.
٢ كنز الدرر وجامع الغرر ٧/٢٦١.
٣ المصدر نفسه ص: ٢٨.

لە لایەکی ترەوە مەغۆلەکان لە ساڵی ٦٢٤ی کۆچیدا بە مردنی (جەنگیزخان)ی خاقانی گەورەیانەوە سەرگەرم ببوون،[١] بە ئامادەکردنی (کۆریلتا)وە سەرقاڵ ببوون تا بتوانن خانێکی نوێ بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

ئەمەو لە ماوەی (٢) ساڵدا (تۆلۆی) کوڕی جەنگیزخان کاروباری وڵاتی بەڕێوە دەبرد تا لە ساڵی ٦٢٦ك/١٢٢٩زاینیدا (ئۆکتای)ی کوڕی (جەنگیزخان)یان هەڵبژاردو کردیانە خانی گەورەی خۆیان.[٢]

هاوکات لەگەڵ ئەم ڕووداوانەدا (جلال الدین) دەرفەتی وەرگرتو بەرەو باکوور ڕۆیشتو هەرێمی (ئازەربایجان)ی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، لەوێشەوە تێپەڕی کردو هێرشی کردە سەر (کەرەج)و مەسیحیەکانی تێکشکاندنو دەستی بەسەر شاری (تفلیس)ی پایتەختدا گرتو تۆڵەی هەموو ئەو تاوانانەی لێ کردنەوە کە دەرهەق بە موسڵمانان بەگشتیو موسڵمانانی ئازەربایجان بە تایبەتی ئەنجامیان دابوو.[٣]

أ_ سەرەتای کۆتایی هاتنی (جلال الدین منکبرتی):

سەرەتای دەرکەوتنی خوارەزمیەکان لە ٢٨ی جەمادی دووەمی ساڵی ٦٢٧ی کۆچی لە شاری (خەلات)ی سەر بە دەسەڵاتی (مەلیك ئەشرەفی کوڕی عادلی ئەیوبی) بوو بە سەرەتای کۆتایی هاتنی سوڵتان (جلال الدینی مونکەبەرتی)، ئەمەو لە ٢٨ی ڕەمەزانی ٦٢٧ی کۆچیدا سوپای (جلال الدین) لە نزیك ئازەربایجان لە لایەن سوپای ئەییوبیانو سلجوقیانی ڕۆمی تاڵاوی شکستی دەرخوارد درا، خودی سوڵتان بەزیو بەرەو ئازەربایجان هەڵاتو سەربازەکانیشی بە مەبەستی حەسانەوەیەکی کەم بەرەو بیابانی (موغان) بەڕێکردن.[٤]

ئیسماعیلیەکان (لە ئالمۆت) کە پێشدا لە لایەن (جلال الدین)ەوە تەنگیان پێ هەڵچنرابوو ناچاری پێدانی سەرانەی ساڵانە ببوون – نەیانهێشت ئەم هەلە لە دەست دەرچێت، لەبەر ئەمە دەستیان بە نامەو نامەکاری کرد بۆ (مەغۆلەکان) تا پێش ئەوەی لەم زەبوونیەی هەستێتەوە بەسەریدا دانو کۆتایی بە دەسەڵاتی بێنن، لە ڕاستیدا مەغۆلەکان دەربارەی ئەمە پێویستیان بە هاندانی ئیسماعیلیەکانو غەیری ئەوانیش نەبوو، لەگەڵ

---

١ جامع التواريخ رشيد الدين ص: ٢٨.
٢ الأتراك الخوارزميون ص: ٢٨.
٣ المصدر نفسه ص: ٢٨.
٤ المصدر نفسه ص: ٢٨.

هەڵبژاردنی (ئۆکتای)ی کوڕی (جەنگیزخان) بە خانی گەورەی (مەغۆل)، ستراتیژیەتێکی تازەی (مەغۆل) سەری هەڵدا، کە خۆی لە (٣) پرۆسەی داگیرکاری سەربازی بەدوای یەکدا دەخستەڕوو، یەکەمیان: بۆ سەر باشووری چین، دووەمیان: بۆ سەر خۆرئاوای ئێران، سێهەمیان: بۆ سەر خۆرهەڵاتی ئۆروپا، بەم شێوەیە خۆرئاوای ئێران بە تایبەتیش باکووری خۆرئاوای بوو بە ئامانجی سەرەکی هێرشی مەغۆلەکان، کە (جلال الدین منکبرتی)ی سوڵتانی خوارەزمیو سەرسەختترین دوژمنی ئەوان خۆی لەوێدا مەڵاس داوە.

هەرچەندە سوڵتان (جلال الدین) لەگەڵ هەموو لایەك ناتەبا بوو، بەڵام هەرچۆنێك بوو دەستی بە نامە ناردن کرد بۆ لای: (المستنصر بالله)ی خەلیفەی عەباسیو (مەلیك ئەشرەفی ئەیوبی)ی حکومڕانی دیمەشقو جەزیرەو (سوڵتان علاء الدین کەیقوباد)ی سوڵتانی سلجوقیەکانی ڕۆمو چەندین میرو حکومڕانی تری وڵاتانی موسڵمان وەکو حکومڕانی (میافارقین)و (ماردین)، داوای لێکردبوون بە هاوارییەوە بچنو سوپای بۆ بنێرن تا بە هەمووان ڕووبەڕووی هێرشەکانی ئەم دوژمنە داگیرکارە ببنەوە کە هەڕەشە لە هەموو موسڵمانانو جیهانی ئیسلام دەکات، بەڵام وەڵامیان نەدایەوەو پشتیوانیان لێ نەکرد.[١]

ب ـ تێکچوونی هاوسەنگی سەربازی:

تێکشکانی یەکەمی خوارەزمیەکان لە لایەن مەغۆلەکانەوە ئەنجامگیریەکی سامناکی لە پاش خۆی بەجێ هێشتو کاریگەری گەورەی لەسەر ڕووداوە یەك لەدوای یەکەکانی خۆیەوە دانا.

سوپای خوارەزمی شکستێکی گەورەی خواردبوو، کە خۆی لە: هەزاران کوژراوو دیلو تێکچوونی سیستەمی سەربازیو لەدەستدانی زەبتو ڕەبت لە نێو سوپاداو نەمانی هەیبەتو سامی سوپاکەیان لەبەر چاوو دڵی هێزە سەربازیەکانی هاوسێی دا خۆی دەنواندکە پێشدا مایەی مەترسی بوو.

ئەم تێکچوونە لە هاوسەنگی هێزی سەربازی ناوچەکەدا سەری کێشا بۆ دەرکەوتنی چەند ئاماژەیەکی سیاسی لە لایەن هێزە سیاسیەکانی ناوچەکەوە، زۆربەی میرەکانی (جزیرە) هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەم هەڵوێستە نوێیە بە خێرایی دەیانخاتە ژێر تاوڵی دەسەڵاتی (ئەیوبی) — ی کە خۆی لە مەلیك ئەشرەفی نیشتەجێی دیمەشقدا دەبینێتەوەو لە لایەن (کامیل)ی برایو حکومڕانی میسرەوە پشتیوانی لێ دەکرێت —، لە لایەکی ترەوە دەروازەی

١ الأتراك الخوارزميون ص: ٣٠.

زۆربەی شارەکانی ژێر دەسەڵاتی سوڵتانی خوارەزمی لە خۆرهەڵاتی شاری (خەڵات) لەبەردەم (چاوی تەماعی) سلجوقیەکانی ڕۆمدا کراونەوە،[1] هەروەها مەملەکەتی (کەرج)ی مەسیحیش بە تایبەتی (تفلیس)ی پایتەخت بە خێرایی خۆی لە ژێر دەسەڵاتی خوارەزمی ڕزگار کرد،[2] هێندەی نەخایاند: ژمارەیەك شاری گرنگی وەکو (تەوریزو کنجە) لە دەسەڵاتی خوارەزمی هەڵگەڕانەوەو لە هەندێك شاردا خەڵکیشیان لێ کوشتن، ئیسماعیلیەکانیش لە (ئالموت) فێر ببوون دەستی دەستیان بەو باج و پیتاکە دەکرد کە لە لایەن سوڵتانی خوارەزمیەوە لەسەریان دانرابوو.[3]

بەڵام مەترسی هەرە گەورە مەغۆلەکان بوون، هێرش و پەلامارەکەیان لە سەعاتی سفردا بوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی پێشەنگی سوپاکەیان گەیشتبووە شاری (ڕەی)، ڕێگای هەرێمی ئازەربایجان کە سوپا بەزیوەکەی خوارەزمی تێیدا پەرت و بڵاو ببوو لەبەردەمیاندا کرابۆوە.

هەموو ئەو ئامازانە هەواڵیان دەدا: دەوڵەتی خوارەزمی دەڕوخێ و ئەستێرەی (جلال الدين منكبرتی)ی دوایین سوڵتانیشی ئاوا دەبێ.[4]

ج ـ (جلال الدين منكبرتی)و ئەو هەڵانەی لە قۆناغی دواییدا کەوتە نێویانەوە:

هەر هەموو ئامازەکەرەکان پێمان دەڵێن دەبێ دەوڵەتی خوارەزمی نەمێنێت و ئەستێرەی سوڵتانەکەشی ئاوا ببێت، چونکە دوابەدوای شکستی یەکەمی کەوتبووە نێو هەڵەو پەڵەیەکی زۆرەوە، لەو هەڵانە:

–لاوازبوونی سیستەمی زانیاری هەواڵگیری: کاتێك یەکێك لە سریەکانی هەواڵی هەڵەی دەربارەی گەڕانەوەی مەغۆلەکان دابوو، سریەیەکی تریش کەوتبووە نێو بۆسەی مەغۆلەکانەوە لە لای شاری ڕەی، سریەی سێهەمیش بە فەرمانی خودی سوڵتان ڕۆکەوت و هیچ کامێك لە ئەندامەکانی بۆ مازندەران و خۆراسان نەڕۆیشتن.

–بیروبۆچوونی هەڵەی (جلال الدين) سەبارەت بەوە: کە مەغۆلەکان وەرزی زستان لە (عێراقی عەجەم) دەمێننەوەو تا وەرزی بەهار نایەنە نێو خاکی (ئازەربایجان)ەوە، بۆیە لە نکاوو لە حاڵەتی چاوەڕوان نەکراودا بەسەریان داداو بە ناچاری ژنەکانی و خێزانەکەی لە

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٠.

٢ المغول للعريني ص: ١٨٠.

٣ الأتراك الخوارزميون ص: ٣١.

٤ المصدر نفسه ص: ٣١.

(ئەڕاك)ی نزیك (تەورێز) بەجێ هێشتن و خۆیشی بە پەلەو بە مەبەستی کۆکردنەوەی سەربازە پەرت بووەکانی بەرەو (مۆغان) بەڕێکەوت.[1]

-گرێوگرتنی (جلال الدين) بۆ نووسینی نامە بۆ (مەلیك ئەشرەفی ئەیوبی)ی حکومڕانی (جزیرەو ئەخلات) بە مەبەستی بە هاوارەوە چوون، لەگەڵ ئەمەشدا دڵسۆزەکانی دەوروبەری پێیان گوتبوو ئەمە هیچ سوودێکی نابێ، بە تایبەتیش کە (جلال الدين)لە شەوی گەمارۆدانی شاری (ئەخلات)دا (ست خاتوونی کەڕەجی) - ی هاوسەری مەلیك ئەشرەف و حکومڕانی ئەو شارە - ی گرتبوو سووریش بوو لەسەر هێشتنەوەی لە لای خۆی هەتا دوای تێکشکانیشی لە بەرامبەر سوپای (مەلیك ئەشرەف)و سوپای (سلجوقی)ی هاوپەیمانی لە ڕەمەزانی ٦٢٧ی کۆچیدا.[2]

-تەرخانکردنی (٦) هەزار ئەسپسواری خوارەزمی بۆ هێرشکردنە سەر شارەکانی (خرتبرت و مەلەتیەو ئەرزنجان) بۆ تۆڵەسەندنەوە لە (علاء الدين کەیقوباد)ی سوڵتانی سلجوقی ڕۆمی، بەڵێ لەگەڵ ئەوەشدا (جلال الدين) دوای شکستی یەکەمی تەنگی پێهەڵچنرابوو هێرشی مەغۆلەکانیش سەرانسوێی لێ دەکرد، ئەوا ئەو هێزە ئەسپسوارەی خۆی نارده سەر ئەو شارە ڕۆمیانەو تالانێکی زۆریان گرت و هێندەیان ئاژەڵ هێنابوونەوە سەربازگەی خوارەزمی کە (٢٠) مەڕ بە دینارێك دەفرۆشران،[3] ئەنجامدانی ئەم کارە لە لایەن سوڵتانی خوارەزمیەوە ئەوپەڕی کورتبینی ئەو دەردەخا لە بواری سیاسەتی ڕۆژدا، چونکە ئەو بەم کارەی هەموو ئەو ئومێدانەی تەفرو تونا کردن کە بەند بوون بە ئەگەری گۆڕانی هەڵوێستی سلجوقیەکان لەگەڵیدا بە تایبەتی لە ململانێ چاوەڕوانکراوەکەی لە دژی ئەو مەغۆلانەی سەرەتاتکەی پەلاماری سەر پاشماوەی دەوڵەتەکەی دەکەن.[4]

-تەفرەخواردنی (جلال الدين) بە نامەی (مەلیك ئەرتقی مەسعودی کوڕی ئەرتق) حکومڕانی (ئامەد): ئەو لەو نامەیەدا هانی دەدا وڵاتی سلجوقیەکانی ڕۆم داگیر بکات، بەڵێنیشی پێدابوو (٥) هەزار سەربازی بۆ پشتیوانیکردنی بۆ دەنێرێ، کاتێك (سوڵتان جلال الدين) - ئەم نامەیەی پێ گەیشت - ڕووی لە شاری (ئەسفەهان)ی پایتەختی هەرێمی کوهستان (چیا) بەرەو (ئامەد) وەرسوڕاند، کاتێك مەغۆلەکان ڕاوەدوویان نا پەنای بۆ

١ تأريخ ايران بعد الاسلام عباس اقبال ص: ٤٠٤.
٢ الأتراك الخوارزميون ص: ٣٢.
٣ المصدر نفسه ص: ٣٢.
٤ المصدر نفسه ص: ٣٢.

دیوارو قەڵاکانی ئەو شارە برد، بەڵام (مەلیك مەسعود) دەرگاکانی بۆ نەکردنەوەو دەستی بە ڕووەوە ناو خەڵکەکەشی بەردبارانیان کرد، بۆیە بە نائومێدی گەڕایەوەو بە ناچاریو بە تەنیا ڕووبەڕووی مەغۆلەکان بۆوە.

-متمانەی تەواوی خۆی لەسەر (ئۆتەرخان) دانابوو، کە بە خزمایەتی لە ڕێی خاڵوانەوە پێی دەگەیشتەوە، (ئۆتەرخان) هەمیشە ترسو بیمی وەبەر دەخستو دەیەویست بەم شێوازە بەسەر تەڵەی هەڵەیدا بخات، جارێکیان وای خستە خەیاڵەوە کە مەغۆلەکان لە سنووری (منازجرد) نەماونو گەڕاونەوە، کاتێکیش پەنای بۆ (ئامەد) بردو پەنایان نەدا، لە کاتی هەڵاتنیدا ئاماژەی پێدا کە بە هەمان ڕێگادا بگەڕێتەوە کە پێیدا هەڵاتبوو مەغۆلەکان ڕاوەدوویان نابوو، ئەویش - تا لەنێوچوونی لە هەموو لایەکەوە بە ڕای ئەو بێت - بە قسەی کردو بە هەمان ڕێدا گەڕایەوە، هەروەکو (نسوي) دەڵێ: لە کۆتا خاڵدا بەجێی هێشتو بە سەرەنجامی نادیاری سپاردو خۆیشی - واتە (ئۆتەرخان) - بە حوکمی هەبوونی نامە گۆڕینەوەی پێش وەخت لە نێوانیاندا بۆ لای (مەلیك مظفر شهاب الدین غازي) حکومڕانی (میافارقین) ڕۆیشت،[1] لە لایەکی ترەوە (جلال الدین) چەند هەڵەیەکی ناشیرینو بێزراوی لێ واقیع ببوون، لەوانە:

-خوگرتن بە مەی خواردنەوە لەگەڵ هاوەڵە هەرە نزیکەکانی، بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە لە لایەن مەغۆلەکانەوە تەنگاو دەکراو گەمارۆی دەدرا، دەچوونە نێو تاوڵەکەیەوە تەماشایان دەکرد: خەوتووەو سەرخۆش بووەو دەسەڵاتی منداڵە ساوایەکیشی نەماوە، ئەم ڕەفتارەی جگە لەوەی پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بوو، لە لایەکی تریشەوە پێچەوانەی ڕەوشتەکانی گۆڕەپانی جەنگ بوو، چونکە شوێنێکی ئاوا پێویستی بە هەبوونی پابەندی سەربازەکان بە سەرکردەکیانەوە هەیەو سەرکردەش پێویستی بە بەکارهێنانی عەقڵو ژیری خۆیو ڕاوێژکارەکانی دەوروبەریەوە هەیە، نەوەکو لە ژێر تاوڵی ڕەشی دۆڕانو بەزیندا بتلێتەوە.[2]

-کارەساتی (قلج)ی خزمەتکاری: (قلج) گەنجێکی خەساوی سەروسیما جوانکیلە بوو، (جلال الدین) تایبەتی کردبوو بە خۆیەوە، کاتێك ئەم کوڕە مرد، (جلال الدین) خەمو مەراقو داخو خەفەتێکی زۆری بۆ خوارد کە بۆ هیچ کەسی تر ئەمەی نەکردبوو، فەرمانی بە سەرکردەو سەربازەکانی کرد بە پیادە لەگەڵ تەرمەکەی بڕۆن، بۆ خۆشی کەمێك بە پیادە

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٣.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٣، سيرة جلال الدين ص: ٢٧٥.

ڕۆیشت، بەڵام وەزیرو سەرکردەکانی بە زۆری سواری ئەسپەکەیان کردەوە، کاتێك گەیشتنە نزیك (تەورێز) بۆ لای دانیشتوانی نارد هەر هەموویان بێنە دەرەوەو بە ماتەمینی پێشوازی تەرمی نۆکەرەکەی بکەن، ئەوانیش ئەمەیان کرد، بەڵام ڕەخنەی لێ گرتن کەوەك پێویست دڵتەنگیو گریانیان دەرنەبڕیوە، بۆیە بڕیاریدا سزایان بدا، بەڵام سەرکردەکان تکایان بۆ کردنو ئەویش لێی بوورین، دوای ئەوە بابای خەساو نەنێژرا، بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتبایە لەگەڵ خۆی دەیبردو لە تاوانی بە دەمو چاوو سنگی خۆی دەکێشا، کار بەوە گەیشت خواردنو خواردنەوەشی واز لێ هێنابوو، ئەگەر خواردەمەنیان دەخستە بەر دەمی، دەیگوت: لەم خواردنە بۆ (قلج)یش بەرن، کەس نەیدەوێرا بڵێ (قلج مردووە) چونکە دەکوژرا، خواردنەکەیان بۆ (قلج) دەبردو دەگەڕانەوە لای (جلال الدین)و دەیانگوت: ئەو ئێستا زەوی ماچ دەکاو دەڵێ: من ئێستا حاڵم لە پێشدا باشترە!!

لەم بارودۆخەیدا دڕدۆنگیو لوتبەرزیو توندو تیژی زۆری لە بەرامبەر سەرکردەو وەزیرەکانی پێشاندا، ئەم ڕەفتارە ناهەموارەی وای لێ کردن لە ژێر فەرمانی دەربچنو ببنە لایەنگیری وەزیرەکەی، (جلال الدین) بەتاقی تەنیو بە سەرگەردانی مایەوەو نەیدەزانی چ بکات، بە تایبەتی کاتێك مەغۆلەکان هێرشیان هێنایە سەر،[1] (وەزیر)یش بەرەو شاری (حیزان) بەڕێکەوتو سەرلەنوێ دروستی کردەوەو یاخی بوونی خۆی لە (جلال الدین) ڕاگەیاندو بە پەلە نامەی بۆ پاشاو حکومڕانەکان ناردو ڕایگەیاند کە ئەو پەیوەندی لەگەڵ ئەوان خۆش دەبێتو ئەگەر حوکمی (ئارانو ئازەربایجان) بگێڕێ ئەوا وتار بە ناوی ئەوانەوە دەخوێنێتەوە، ئەمەو نامەی بۆ (علاء الدین کەیقوباد)و (مەلیك ئەشرەف) نووسیو ڕایگەیاند کە لە (جلال الدین)ی دۆڕاو جودا بۆتەوەو لەمەولا بە فەرمانی ئەوان ڕەفتار دەکات.

(وەزیر) یاخی بوونەکەی درێژەی کێشا، کار بەوەگەیشت هەر کەسێك لە دارو دەستەی (سوڵتان) لە کاتی هەڵاتنیدا لە مەترسی مەغۆلەکان بە سنووری قەڵاکەیدا ڕەت بووایە قۆڵبەستی دەکردو دەیخستە ژێر ئازارو ئەشکەنجەوەو ماڵەکەشی لێ داگیردەکرد.[2] بەڵکو نامەی بۆ (حسام الدین قلج أرسلان)ی میری هەرە گەورەی تورکمانەکانی (ئاران) نووسیبوو، تێیدا فەرمانی پێدابوو: دەست بە شتە پیرۆزەکانو خەزنەکانی سوڵتانەوە بگرێتو پارێزگاریان لێ بکات، ئەگەر خودی سوڵتانیش هات نەیاندادتەوە دەستی.[3]

---

١ الكامل في التاريخ ٣٩٦/٩، الأتراك الخوارزميون ص: ٣٤.

٢ سيرة السلطان جلال الدين ص: ٣٥٧.

٣ المغول ص: ١٧٦، الأتراك الخوارزميون ص: ٣٥.

(جلال الدين) بە ناچاری دەستی بە ناردنی نامەی تەفرەئامێزو سەرنج ڕاکێش کرد بۆ لای (وەزیر) تا لە لای ئامادە بێت، کاتێك (وەزیر) گەیشت چەند ڕۆژێك لە لای خۆی هێشتەوەو پاشان کوشتی.[1]

– فەرمان کردن – بە (ئۆرخان)ی سەرکردەی سوپاکەی لە کاتێکدا مەغۆلەکان بۆ دواهەمین جار گەمارۆیاندا – کە بە خۆو بە سوپاوە بەجێی بێڵن بەڵکو مەغۆلەکان شوێنیان کەونو خۆی بە تەنها ڕزگاری ببێ، ئەو لەم فەرمانەیدا بە هەڵەدا چوو، چونکە وەکو (نسوي) دەڵێ: کاتێك (ئۆرخان) لێی جیابۆوە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك هاتنە ریزی سوپاکەی، کە گەیشتە هەولێر (ئەربیل) (٤) هەزار ئەسپسواری لەگەڵ بوو، بەرەو (ئیسفەهان) ڕۆیشتو ماوەیەکی زۆرو تا هاتنی مەغۆلەکان حوکمی تێدا گێڕا، (ئۆرخان) تا ساڵی (٦٣٩) لە وڵاتی فارس ژیا، ئەو ساڵەی (نسوي) کتێبە بە ناوبانگە مێژووییەکەی خۆی بە ناوی (ژیاننامەی سوڵتان جلال الدين منكبرتی) تێدا نووسیووە.[2]

س ـ کوژرانی (جلال الدين منكبرتی):

(ئۆکتای) سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی وەسێتەکەی (جەنگیزخان)ی باوکی، کە نەخشەکانی بەدوا ئەنجام بگەیەنێتو دەست بەسەر تەواوی جیهاندا بگرێت.

(جرماغون) یەکێك بوو لە سەرکردە سەربازیە هەرە دیارەکانی مەغۆل، (ئۆکتای) کردی بە سەرسوپای ئەو هێرشە تازەی کە بەرەو خۆرئاواو بۆ کۆتایی پێهێنانی (جلال الدين منكبرتی) بەڕێکرد، هەر کە سوپای مەغۆلەکان نزیك بۆوە، (جلال الدين) هەستی بە مەترسی گەورەی ئەوانو لاوازبوونی خۆی لە بەرامبەریاندا کرد، بۆیە بە پەلەپەل هاواری لە خەلیفەو حکومڕانانی وڵاتانی جیهانی ئیسلام بەستو بە نامە داوای لێدەکردن بە هانایەوە بێن تا بە هەموویانەوە لە بەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا بوەستنەوە.

(عطا ملك الجويني)ی مێژوونووس بەم شێوەیە نێوەڕۆکی نامەکەی (جلال الدين)مان نیشان دەدا: (سوپایەکی زۆرو زەوەندی تەتار وەك مێروو مار لە زۆریو لە دڕیدا بەرەو ڕوومان بەڕێکەوتووە، ئەگەر لێی گەڕێینو بە گژیدا نەچینەوە ئەوا قەڵاو شارەکان ناتوانن خۆی لەبەر ڕاگرن، ترسو تۆقان کەوتۆتە هەناوی دانیشتوانی ئەم هەرێمەوە، ئەگەر بڕوخێمو نێوانی ئێوەو ئەوان خاڵی بێت، ئێوە ناتوانن بەر بەم دوژمنە بگرن، کەواتە من بۆ

---

[1] الأتراك الخوارزميون ص: ٣٥.
[2] سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي ص: ٤٩٧.

ئێوە لە جیاتی بەربەستەکەی ئەسکەندەرم، هەر یەکێك لە ئێوە با بە پۆلە سەربازێك بە هاوارمانەوە بێت، هەر کە هەواڵی ڕێکەوتنو یەکگرتنی ئێمەیان پێگەیشت بەمە هێزو پێزیان لاواز دەبێو پشتیان دەشکێو سەربازانی ئێمەش گیانی غیرەتیان بەبەردا دەکرێتەوەو بەسەریاندا سەردەکەوین).[1]

لەگەڵ ئەوەدا بارودۆخەکە مەترسیدار بوو بەڵام نە خەلیفەی بەغداو نە حکومڕانو سوڵتانی وڵاتانی ئیسلامی وەڵامی هاتو هاواری (جلال الدین)یان نەدایەوە، بەڵکو لێی گەڕان بە تەنیا بێتو تووشی سەرەنجامی شومی خۆی بێت.

لەم ئانو ساتەدا مەغۆلەکان ئامانجی خۆیان لەسەر لەنێوبردنی (جلال الدین)و کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتەکەی چڕکردبۆوە، (جرماغۆن) هێرشی کردە سەر هەرێمەکانی (جلال الدین)و پێشەکی (ڕەی) داگیرکردو ئینجا دەستی بەسەر (هەمەدان)دا گرتو لەوێشەوە تا سەر سنووری (ئازەربایجان) ڕۆیشت، (جلال الدین)یش هەر جارێك ڕووبەڕووی مەغۆلەکان دەبۆوە پێشەکی دژە هێرشێکی دەکردو ئینجا پاشەکشەی دەکرد، ئەمەو مەغۆلەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە دوای دەکەوتن، لە کۆتاییدا گەیشتە ناوچەیەکی باریێ سەرەوەی (دیجلە)، لێرەدا (جلال الدین) لە دواهەمین ڕووبەڕووبوونەوەیدا لە بەرامبەر مەغۆلەکان ڕاوەستاو بە خۆو بە سوپاکەیەوە بە ڕوویاندا هەڵشاخاو پاش کوشتارێکی زۆرو کەوتنی زیانێکی زۆری گیانی سوپاکەی تێکشکاو خۆیشی بە تەنیا لە گۆڕەپانی جەنگ هەڵات، بەردەوام لێرەو لەوێ خۆی شوێنە ون دەکرد، تا گەیشتە چیاکانی کوردستان، ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٦٢٨ کۆچیدا بووە،[2] لە کۆتایدا کەوتە بەر دەستی ژمارەیەك کورد، یەکێکیان لە ١٥ی شوال ٦٢٨ك ئۆغستوس ١٢٣١ ز یدا کوشتی.[3]

تاقمێك لە پیاوماقوڵان بە بۆنەی کوژرانی (جلال الدین)ەوە پیرۆزباییان لە (مەلیك ئەشرەف)ی حکومڕانی دیمەشق کرد، ئەویش لە وەڵامیاندا گوتی: (پیرۆزبایی ئەوەم لێ دەکەن؟! لەمەولا دەرەنجامی ئەمە دەبینن، سوێند بە خودا ئەم تێکشکانە دەبێتە هۆکاری هاتنی تەتەرەکان بۆ نێو وڵاتانی ئیسلامی، دەوڵەتی خوارەزمی وێنەی ئەو بەربەستە بوو کە لە نێوان ئێمەو یاجوجو ماجوجدا هەبوو).[4]

---

١ العراق بين سقوط الدولة العباسية والعثمانية ص: ١٠١.
٢ المصدر نفسه ص: ١٠١.
٣ الأتراك الخوارزميون ص: ٣٥.
٤ العراق بين سقوط الدولة العباسية والعثمانية ص: ١٠٢.

(مەلیك شهاب الدین غازی ئەیوبی)ی حکومڕانی (میافارقین) فەرمانیدا بکوژەکەی (جلال الدین) بێننە بەردەمی، هێنایانو دانی بە کوشتنەکەدا هێناو ئەسپو زینو شمشێرەکەشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، پێشدا گوتمان (ئۆترخان)و کۆمەڵێك لە دەستو پێوەندەکانی سوڵتانی خوارەزمی چووبوونە لای (شهاب الدین غازی)و لە کۆشکەکەی ئەودا نیشتەجێ ببوون، (شهاب الدین) فەرمانیدا تەرمەکەی سوڵتان بە شەو لە (گوند)ڕا هەڵگیرێت، (شهاب الدین) بە (ئۆترخان)ی گوت: تەماشامە بزانە ئەوە؟ کە بینی گریاو گوتی: بەڵێ، بە شەو ناشتیانو گۆڕەکەیان لە ترسی هەڵدانەوە شوێنەون کرد.[1]

ك ـ تەفروتونابوونی خوارەزمیەکان:

خوارەزمیەکان: دوای تێکشکانیان لەسەر دەستی مەغۆلەکانو کوژرانی (جلال الدین)ی دوا سوڵتانیان لە هەموو لایەکەوە پەرتەوازە بوون، خاڵەکەی (جلال الدین)و هاوەڵەکانی چوونە لای (مەلیك ظاهر شهاب الدین غازی)ی حکومڕانی (میافارقین)، لە لایەکی ترەوە هاوسەرەکەی سوڵتانو نۆکەرو قەرەواشەکانیو هێزێکی گەورەی سەربازی گەلی بەرەو شاری (حەڕان) ڕۆیشتنو داوایان لە (ئەمیر صواب)ی حکومڕانی (جزیرە)ی سەر بە (کاملی ئەیوبی) کرد پەنایان بدات، پێشدا پەنای دان بەڵام دوایە ناپاکی لەگەڵ ئەنجامدان، سەربازەکانیان چەك کردنو ماڵو سامانەکەیان لێ سەندنو هاوسەرەکەشی لە قەڵای (حەڕان)دا بەند کرا، ئینجا بەرەو (دیمەشق) بەڕێکراو لەوێدا نیشتەجێ بوو.[2] بەڵام دەربارەی کەنیزەکەکەی سوڵتان ـ کە بە کەمێك پێش هێرشی مەغۆلەکان لای هاوەڵێکی خۆی داینابوو، کاتێك ئەم هاوەڵەی هەواڵی ڕاستو دروستی لەسەر لەنێوچوونی سوڵتان بیست، کەنیزەکەکەی لەگەڵ خۆی بردە بەغداو بە دیاری پێشکەشی (المستنصر بالله)ی خەلیفەی کرد، کەنیزەکی (جلال الدین) ـ تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد ـ بە لای خەلیفەوە لە هەموو کەنیزەکەکان گەورەترو ڕێزدارتر بوو.[3]

تیرەو تایەفەکانی تری (خوارەزمی) بەسەر هەرێمەکانی (نەسیبین)و (موسڵ)و (سنجار)و (ئەربیل)و شارەکانی تردا دابەشبوون، پاشایانو ڕەعیەتەکانیان بۆ خۆیان دەفڕاندن، کار بەوە گەیشتبوو جوتیارو دەشتەکیو دێهاتیەکانیش تەماعیان تێدەکردنو دەیانبردنو دەیانکردن بە بارەبەرو خزمەتکاری خۆیان.

---

١ الأتراك الخوارزميون ص: ٣٦.
٢ المصدر نفسه ض: ٣٧، التأريخ المنصوري ص: ١٥٧.
٣ مفرج الكروب ٤/٣٢٣.

بەشێکی زۆری خوارەزمیەکان بەرەو وڵاتی سلجوقیەکانی ڕۆمی ڕۆیشتن، (سوڵتان علاء الدين کەیقوبادی کوڕی خەسرەو)یش هەرێمێکی بە خزمەتکاری و پەیدارکردنی نانەسکی خۆیان لەوێدا نیشتەجێی کردن، ژمارەیەکی تریش لەو خوارەزمیانە بەرەو (ترابزۆن)ی هەڵکەوتوو لەسەر کەناری باشووری دەریای ڕەش و وڵاتی (کەرەج)ی هاوسێ هەڵاتن،[1] بەم شێوەیە خوارەزمیە لێقەوماوەکان لە ژمارەیەك ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیکی ئیسلامی گیرسانەوە، چاوەڕوان دەکرا ئەمانە لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچانەدا ئاوێتە ببن، بەڵام ئەو بارودۆخە سیاسیەی لەو کاتەدا دەورەی خۆرهەڵاتی نزیکی ئیسلامیدا بۆ جارێکی تر هەلی دانێ تا لە هێزێکی سەربازی کاریگەردا خۆیان ڕێکبخەنەوەو لە بچووکترین ململانێی سیاسی و سەربازیدا تا بە گەورەترینیان ڕادەگات پشکیان هەبێت، ئەمەو لە ساڵی ٦٤٢ی کۆچیدا بە بەشداری چالاکانەی (بيت المقدس) لە خاچپەرستەکان سێنرایەوەو تا هەڵایسانی جەنگی جیهانی دووەم لە ژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا مایەوە،[2] لەو کتێبەمدا کە دەربارەی پەلاماری (٤، ٥، ٦، ٧)ی خاچپەرستانە، مەسەلەی کۆتایی هاتنی خوارەزمیەکانم ڕوون کردۆتەوە.

## پێنجەم: هۆیەکانی لەنێوچوونی دەوڵەتی خوارەزمی:

هۆیەکانی ڕووخانی دەوڵەتی خوارەزمی زۆرن، بەڵام ئەو هۆکارەی کە هەموو هۆیەکانی تریش لە خۆدەگرێت: خۆبواردنیان بوو لە حوکمگێڕان بەپێی بەندەکانی شەرعی خودا لە سیستەمی سیاسی و دارایی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتیدا، کاتێك شەرعی خودا لە کاروباری دەوڵەتدا فەرامۆش دەکرێ دەوڵەت و نەتەوەکان و تاکەکانی ژێر سایەی ئەو حوکوحەتە لە دنیادا تووشی تەمبەڵی و دۆڕان دەبن، وەك زانیمان: هەڵە و تاوانەکانی (علاء الدين محمد خوارەزمشا) بوو بە هۆکاری ڕوخانی دەوڵەتی خوارەزمی و هێنانی کارەساتی هێرشی مەغۆل بەسەر ئوممەتدا، چونکە (علاء الدين) فەرمانی کوشتنی ئەو بازرگانە تەتەرانەی دەرکرد کە بۆ بازرگانی هاتبوونە نێو وڵاتی ئیسلامەوە، کاتێکیش (جەنگیزخان) – بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی هۆی کوژرانی بازرگانەکان – نوێنەری خۆی بۆ لای (علاء الدين) نارد، نوێنەرەکەشی کوشت، جەنگیزخان بڵێسەی تووڕەیی لێ هەڵسا، هێرشێکی بێ ئەمانی کردە

---
[1] المصدر نفسه ص: ٤/٣٢٥.
[2] الأتراك الخوارزميون ص: ٣٨.

سەر مەملەكەتی (خوارەزمشا)، پاشانیش ڕانەوەستاو هەڵیكوتایە سەر تێكڕای جیهانی ئیسلام.[١]

ئەگەر لە قورئانی پیرۆز ورد بینەوە كە چۆن ئاماژە بە گەشەسەندنو پێشكەوتنی گەلانو پوكانەوەو دواكەتنیان دەكات، چۆن بە پێی سوننە سابتەكانی خودا گەلان بەرهەمی كردەوەو ڕەوشتەكانی خۆیان دەبیننەوە، كاتێك قورئانی پیرۆز لە سەرەتای سورەتی (الاسراء)دا باسی هەرەسی نەتەوەی بەنی ئیسرائیلیو چەوسانەوەیان بە دەستی پاشا ستەمكارەكانو خەراپ بوونی مزگەوتی ئەقسا دەكات، هەموو هۆیەكەی دەگێڕێتەوە بۆ خودی نەتەوەی بەنی ئیسرائیلیو ڕەفتارە بەدەكانیان لە لوتبەرزیو یاخی بوونو سەركەشیو خراپەو خراپەكارییان لەسەر زەویدا.

وەك دەردەكەوێت: هۆكاری ڕاستەقینەی پشت ئەم بەڵاو موسیبەتە گەورەی كە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا هاتو سەر كوێرانە بە ڕوویدا هەڵتۆقی تەنها بە هۆی بەدڕەفتارییو هەڵەو تاوانی سیاسیو فیكری یەكێك لە حوكومڕانەكانی نەبوو، بێگومان ئەمە بە تەنیا نابێتە هۆی هاتنی لافاوێكی هێندە گەورە كە هەموو جیهانی ئیسلامی بەم شێوەیە لەگەڵ خۆی ڕامالّێ، ئەگەر مەشخەڵی قورئانی پیرۆز بە دەستەوە بگرینو تەماشایەكی بارودۆخی ڕەوشتیو ئایینیو كۆمەڵایەتیو سیاسی ئەو سەردەمە بكەین، وەك ڕۆژی ڕوون بۆمان دەردەكەوێت: كە ژمارەیەكی زۆر هۆكاری گەورەتر لەو هۆكارانەی بەبەر چاوەوەن لە پشت ئەم كارەساتە شوومەوە هەبوونو دەیسەلمێنن كە ئەم بەڵایە هەروا لە خۆڕاو لە نكاو بەسەر جیهانی ئیسلامدا نەهاتووە.[٢]

لەنێوچوونی نەتەوەكانو ڕوخانی دەوڵەتەكانو ئاوابوونی شارستانیەتەكان لە ڕەوڕەوەی مێژوودا هەروا بە خوتو خۆڕایی ڕوونادەن، بەڵكو لە ئەنجامی لادان لە ڕاستەڕێو زوڵمو زۆری خودی نەتەوەكان یان بنەماڵەی حوكمڕانی ئەو دەوڵەتانەوە بووە، ماوەیەكی دوورو درێژیان لەبەر دەستدا بووەو لەسەر زوڵمو ستەمو لادان بەردەوام بوون، دەرەنجام بڕیاری خودایان بەسەردا چەسپاوەو تۆڵەی لادانو ستەمو تاوانو سەرپێچیەكانیان لێ سەنراوەتەوە، ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز بە ڕاشكاوی دەربارەی ئەم جۆرە نەتەوانە دەدوێنو دەفەرموون: كە كاتێك خودا – جل جلاله – نازو نیعمەتی خۆی بەسەر هەر

---

١ رجال الفكر والدعوة في الاسلام ١/٢٧٠.

٢ المصدر نفسه ١/٢٧١.

نەتەوەو دەوڵەتێکدا ڕشت، تا سپڵەیی و بەدنمەکی لێ ڕوونەدات ئەو نازو نیعمەتانەی لێ ناسەنرێتەوە،[1] خودا (جل جلالە) دەفەرموویێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الانفال: ٥٣). ئایەتەکان دەربارەی ئەمە چ بەرامبەر بە تاك چ بەرامبەر بە کۆمەڵ زۆرن، بەڵکو قورئانی پیرۆز هۆکاری هەندێك بەلاو نەهامەتی دەگێڕێتەوە بۆ ئەوە کە خودا (جل جلالە)دەروازەکانی نازو نیعمەتی خۆی بەسەردا ئاوەڵا کردبوون و پاشان مۆڵەتی دابوونێ و پەتی بۆ شل کردبوون، لە ئەنجامدا ئامانجی دروستکرانی خۆیان و ئەو کارو کردەوانەی پێی ڕاسپێردرابوون لە زەینی خۆیاندا سڕیبۆوە، بەڵکو خودی خاوەنی نازو نیعمەتەکەشیان فەرامۆش کردبوو کە خودای بەرزو بالادەستە (جل جلالە)، فەلسەفەیان لێ دەداو هەموو ئەمانەیان بە بەرهەمی کردو کۆشش و زیرەکی و زەکاوەتی خۆیان دادەناو دەیانگوت: ئەگەر شایان نەبووینایە ئەم نازو نیعمەتەمان پێ نەدەدرا، قورئانی پیرۆز سەبارەت بەم جۆرە نەتەوانە دەفەرموویێت:

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا ۚ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ (الانعام: ٤٤). گرنگ ئەوەیە بزانین: خودا (جل جلالە) کەس لە نازو نیعمەتی خۆی بێبەش ناکات، بەڵکو نازو نیعمەت بەسەر باوەڕدارو بێ باوەڕدا دەڕێژێت، ئینجا چاودێری هەموو لایەك دەکات، هەر کەسێك سپڵەیی بکات و ئەم نازو نیعمەتە لە خراپەکاری و زوڵم و زۆرو لاساریدا بەکاربێنێ ئەوا خودا (جل جلالە) ماوەیەکی لە دنیادا پێ دەدات، سەرەنجام سزای دادپەروەرانەی خۆی لە کاتێکی گونجاودا بەسەردا دەسەپێنێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ (البقرة: ٢٨٦).

لە لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەت و شارستانیەتەکاندا بەدی دەکرێت کە: تاکە هۆکارێك بە تەنها نابێتە هۆی ئەم داڕوخانە، بەڵکو ژمارەیەك هۆ بەشداری بەرپابوون و بالادەستبوونی دەکەن و ژمارەیەك هۆکاری تریش بەشداری داڕوخان و هەرەسهێنانەکەی دەکەن، هەندێك لەو هۆکارانە کاریگەریەکەیان سست و لەسەرخۆیە، هەندێکیشیان کاریگەریەکەیان گەورەو خێرایە، هیچ دەوڵەتێك بە یەك گورز ناڕوخێت، بەڵکو کۆمەڵە

---

[1] في التفسير الاسلامي للتأريخ، نعما السامرائي ص:٨٨.

هۆکارێك بەیەکەوە ئەم کارەیان پێ دەکرێت، دەوڵەتی خوارەزمیش بەم شێوەیەو کۆمەڵە هۆکارێك بوونە مایەی ڕووخانی، دوای هێرش‌و پەلاماری مەغۆلەکان بۆ سەر وڵاتانی ئیسلام، دەسەڵاتی خوارەزمی لەسەر نەخشەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بۆ هەتاهەتایە سڕایەوە، گرنگترین هۆکارەکانی لەنێوچوونی – بە دیدو بۆچوونی من – ئەمانە بوون:

### ١ـ شکستخواردنیان لە بەرامبەر بەدیهێنانی تەوژمێکی شارستانی:

گەورەترین هەڵەی سوڵتانەکانیان خۆی لە بەرفراوانکردنی خاکی دەوڵەتەکەیان – لەسەر حیسابی وڵاتانی تری جیهانی ئیسلام –و خۆ خەریك کردن بە دروست کردنی قەڵاو شورەی دەورەی شارەکانیاندا دەنواند، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە هیچ بایەخێکیان نەدەدا بە گەیاندنی پەیامی ئیسلامی پیرۆز بە ئەو بەشە مرۆڤەی کە هاوسێیان بوو جیهانێکی سەربەخۆی بۆ خۆی دروست کردبوو، ئەگەر چاوپۆشی لە لایەنە ئایینیو واجبە ئیسلامیەکەش بکەین، ئەوا دەبوایە بە پێی داخوازیەکانی حیکمەت‌و سیاسەت هەڵسوکەوتیان بکردایەو گرنگیان بە خۆگونجاندن‌و خۆچەسپاندن لەگەڵ ئەم دنیا بەرفراوانەی مرۆڤایەتیدا دابایەو – پەیوەندی ئیمانییان لەگەڵ گەلانی تری ئیسلامیدا گرێدابایە، ئەگەر بەم شێوەیە ڕەفتاریان کردبایە شورەو بەربەستێکی گەورو پتەویان دادەمەزراندو نەك هەر خۆیان لە مەترسی گەورەی – مەغۆلەکان – پێ دەپاراست بە تەنیا، بەڵکو هەموو موسڵمانانیشیان دەپاراست.[1]

هەروەها (خوارەزمیەکان) نەیانتوانی پرۆژەیەکی شارستانی وا پێشکەش بکەن کە بتوانێ گیان‌و ژیانی دەوڵەت نوێ بکاتەوەو ئامانجەکانی بۆ دیاری بکات‌و بە گوڕو تین بەرەو پێشەوەی بەرێت، بەڵکو خۆیان بەنێو تونێلە تاریکەکاندا کردو دەرەنجام دەوڵەتەکەیان لەنێو چوو، هەرچەندە خاکی دەوڵەتەکەیان زۆر فراوان بوو، بەڵام نەیانتوانی نەیارە موسڵمانەکانیان بکەنە دۆستی خۆیان‌و بە هەموانیان لە بواری بانگەوازو بڵاوکردنەوەی ئیسلام‌و بانگەشەی گەلان کار بکەن، ڕاگەیاندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ئەو گەل‌و نەتەوانە بە زمانی عەرەبی‌و فێرکردنێکی ڕاست‌و دروستی ئەو گەلانە لەسەر ڕێنماییەکانی ئیسلام‌و تەرجەمەیەکی پاك‌و پوختی ئیسلام بە زمانی ئەو گەلانە لە ئەستۆی ئەواندا بوو کە نەیانکرد.

---

١ رجال الفكر والدعوة ١/٢٨٠.

پێویست بوو لەسەریان: هاوسەنگیان بێنایەدی لە نێوان: (دەوڵەت‌و بانگەواز، خاك‌و بیروباوەڕ، سیاسەت‌و فیکر)دا، ئەوان لە ئاستی ئەم پەیامە گەورەدا نەبوون‌و بەپێی ئەو بارودۆخ‌و هەلانەی بۆیان ڕەخسا پێشکەوتنێکی وایان پێشکەش نەکرد کە شیاوی پێهەڵداگوتن بێ، ئەم هەڵە گەورەیە لەوەدا خۆی زەق دەکاتەوە کە: ئەوان نەیانتوانی تەوژمێکی شارستانی وا دروست بکەن کە ببێتە تەواوکەری تەوژمەکانی فتوحاتی شارستانی ئیسلامی‌و هەموو بزوتنەوە لاڕێ‌و ئاژاوەچیەکانیش لەنێو خۆیدا بتوێنێتەوە، تەبیعەتی مێژووی شارستانیش هەمیشە بەم شێوە بووەو دەبێ، یان پێش دەکەوێت یان دەمرێ‌و لەنێو دەچێ، ڕەوڕەوەی مێژووی مرۆڤایەتیش هەرگیز لە خولدان ناکەوێت.[١]

## ٢ـ بێزرانی حکومەت لە لایەن گەلەوە:

سوڵتانەکانی دەوڵەتی خوارەزمی نەیانتوانی یەکێتی لە نێوان بەشی خۆرهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا دروست بکەن، بەڵکو خودی حوکومەتەکەیان لە لایەن تێکڕای هەرێمەکانی خۆرهەڵاتەوەبێزراوو قێزەون بوو، نە لە هەرێمی چیا (ئیسفەهان)دا، نە لە هەرێمی خۆراساناداو نە لە هیچ کامێك لە هەرێم‌و شارو دێهاتەکانی سەربەخۆیدا پەسندنەکرابوو، هەروەها نە لە وڵاتی (غۆر) نەلە وڵاتی (ئەفغانستان)یش ڕێزو حورمەت لەلایەن دانیشتوانەکانیانەوە بۆ ئەم حوکومەتە دانەنرا، لە وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)دا بێزراوو ڕقلێگیراو بوو، دانیشتوانی ئەو هەرێمە قەسابخانەکەی دانیشتوانی (سەمەرقەند)یان لە یاد نەچووبۆوە کە ژمارەی سەربڕاوەکانیان گەیشتبووە (٢٠٠) هەزار کەس، بە هەمان شێوە دانیشتوان بە هەموو چین‌و توێژەکانیەوە هاریکاری‌و پشتیوانی سوڵتانی (خوارەزمی)یان نەکرد، ئەوان لە کاتی ڕاوەدونانیشیدا لە لایەن مەغۆلەکانەوە بە هاواریەوە نەچوون‌و گوێیان نەدایە، هەرێمی (جبەنویان‌و سوبتای بەهاری)ی یش لە خۆرهەڵاتیەوە تا خۆرئاوای سوڵتانیان بەدەرێ دەنا، کەس یارمەتی نەدەدا، نە سەربازەکانی نە پاسەوانەکانی ئەو شارانەی پێیادا تێدەپەڕی، نە کارمەندانی حوکومەتەکەی‌و نە دانیشتوانی ئەو شارو هەرێمانە، هەر هەموویان تەماشای ڕاکردنەکەیان دەکردو بە مەغۆلەکانیان دەگوت بەم ڕێیەدا هەڵاتووە، پێیان خۆشبوو لەلایەن مەغۆلەکانەوە بگیرێت‌و دەستی لە بەرۆکیان بەربێت، چونکە کەس لێی قایل نەبوو، چینی زانایانی دەوڵەت بە جیاوازی مەزهەبەکانیان شافیعی یان حەنەفی، هەر هەموویان لە دڵ‌و دەروونیاندا ڕقێکی زۆر پەنگی خواردبۆوە، چونکە زیندانی دەکردن‌و پاشان دەیکوشتن‌و

---

١ بنو امية بين السقوط والانتحار ٩٨.، الدولة الاموية للصلابي ٢/٥٨٢.

هەڵی دەدانە نێو ڕووباری (جەیحون)ەوە، لە سەرووی ئەم زانایانەوە: (برهان الدین محمد احمد) ناسراوە بە (سەدری جیهان)، أبو سعید مجدالدین ی بەغدایی، جلال الدین ی ئیمامی سەمەرقەند، شهاب الدین ی کوڕیو أوحدالدین ی برای) دەبینرێن.

دەربارەی حوکمڕانەکانی (قەڕاخانی)یش: سولتان بە هاوکاری دایکی یەکەبەیەکە پاکتاوی کردنو هەندێکیانی بۆ شوێنی دوور دورخستنەوەو تا مردن لەوێدا بە دەست بەسەری مانەوە، ئەوانی تریشی زیندانی کردنو پاشان کوشتنیو تەرمەکانیشی فڕێدانە نێو ڕووباری (جەیحون)ەوە، وەکو (سولتان عوسمان) بە وێنەی مەڕ سەری بڕدرا، (تاج الدین بلکاخان)یش بەبێ هیچ سوچو تاوانێك لە لایەن (جیهان پالەوان)ی پیاوکوژی سولتان کوژراو سەری لێ کرایەوە، بەم شێوازە دڕندانە لەگەڵ تێکڕای میرەکانو حوکمڕانەکانو پیاوماقولانی مەملەکەتەکەیدا ڕەفتاری دەکرد، لەبەر ئەمە تاکەکانی گەل تۆزقاڵێك خۆشەویستیان لە دڵدا نەبوو بەرامبەر بە سولتان، بەڵکو ئەوەی لە دڵیاندا پەنگی خواردبۆوە بریتی بوو لە ڕقو توڕەییو داخو مەراق لە بەرامبەر هەموو ئەو زوڵمو زۆرو ستەمکاریەی لە لایەن خۆیو دارو دەستەکانیو سەربازەکانی دەرهەقیان ئەنجام دەدرا، دانیشتوانی هەر هەموو هەرێمەکان کە بە ئاسنو ئاگرو سەربازە تورکەکانی سەری پێدا نەواندبوونو گەردنی پێ کەچ کردبوون ڕقیان لە سولتانەکانو حوکومەتەکەیان دەبۆوە، هەرچی سۆزو بەزەیی هەبوو لەم سولتانانە دوور بوو، هەڵسوکەوتەکانیان نەفامانە بوون، توندو تیژیەکانیان دڕندانەبوون گیانەکانیان شەڕەنگێز بوون، هەر ئەم هەڵسوکەوتانەش بوونە هۆی فەوتانی بنەماڵەی سولتان.[1]

(جلال الدین ی کوڕی سولتان علاء الدین) دواهەمین سولتانی مۆنو مڕچو بێزراوو ڕق لێگیراوی ئەو سەڵتەنەتە بوو، چونکە بە سەربازانێکی نیمچە بەکرێگیراودەورەی خۆی تەنیبوو، حوکمڕانە موسڵمانەکانی خۆرئاوای ئێرانی وەکو سلجوقیەکانو ئەیوبیەکانو خەلیفەی عەبباسی بەغدا هاوکاری (جلال الدین)یان نەکرد، چونکە زۆری لە فیزو خۆ بەزلزانی تێپەڕاندبووو دەیەویست بە هێزو توندو تیژی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێتو لەسەر حیسابی گەلانو حوکمڕانە موسڵمانە هاوڕێکانی قەڵەمڕەوی حکومەتەکەی خۆی فراوان بکات.[2]

---

١ اوضاع الدولة اللإسلامية للغامدي ص: ٢٧٥، الفتوحات الاسلامية لبلاد الهند والسند، د. حذيفة الغامدي ص: ٥٥٨.
٢ الفتوحات الاسلامية لبلاد الهند والسند، د. حذيفة الغامدي ص: ٥٥٩.

### ٣ـ كێشەی نێوخۆی بنەماڵەی (خوارەزمی):

سوننەتی خودا لە بەرامبەر گەل و نەتەوەكاندا گۆڕانكاری بەسەردا نایەت و خاترو خوایشی لەگەڵ ناكرێت، خودا (جل جلالە) ناكۆكی داناوە بە یەكێك لە هۆكارەكانی لە نێوچوونی گەلان و ڕوخانی دەوڵەتەكان.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: (فإن من كان قبلكم إختلفوا فهلكوا) واتە: خەڵكانێك لە پێش ئێوەدا ناكۆك بوون و لەنێو چوون، لە ڕیوایەتێكی تردا (فأهلكوا) لەنێو بران، ڕیواتەكەی (ابن حبان)یش كە لە (ابن مسعود)ەوە دەیگێڕێتەوە ئاوایە: (فإنما أهلك من كان قبلكم بالإختلاف) واتە: ناكۆكی و ناتەبایی خەڵكانێكی پێش ئێوەی لەنێو برد.[١]

یەكێك لەو وانە گرنگانەی لەم لێكۆڵینەوە مێژووییەدا فێری دەبین ئەوەیە كە پێویستە بە خۆپاراستن لە هۆكارەكانی ناكۆكی زەمكراو خۆ لە لەنێوچوون بپارێزرێت، چونكە ناكۆكی یەكێك بوو لە هۆكارە كاریگەرەكانی تەفروتونابوون و نغرۆبوونی دەوڵەتی خوارەزمی و پەرتەوازەبوونی گەلەكەی، ژمارەیەك هۆكار لە پشت ناكۆكی بنەماڵەی خوارەزمییەوە وەستابوون، لە ڕستەی ئەو هۆكارانە: (لاوازی دەسەلاتی ئایینی، خۆپەرستی و خۆخۆشویستن، پێكهەڵپڕژان و جەنگ و هەرا لەسەر بەرژەوەندییە دنیاییەكان، پێداگرتن لەسەر دەسەلات و پلەوپایە)، ئەم هۆیانە ببوونە سووتەمەنی و دەستەچیلەی كێشمەكێش و ناكۆكییەكانی ئەندامانی بنەماڵەی حوكمڕانی خوارەزمی، ئەم هۆیانە گەورەترین و كاریگەرترین (كوینو)ن كە دەتوانێ سەربان و بەربان و دیوارو بناغەی دەوڵەت بڕوخێنێت.

(ابن خلدون) بە دواداچوونێكی باشی ئەم ڕاستییەی كردووە كە دەڵێ: یەكێك لە شوێنەوارەكانی پیربوونی دەوڵەت دابەشبوونیەتی، كێشەی خزمایەتی بازنەكەی بچووك دەكاتەوە، لە كۆتاییشدا سەردەكێشێ بۆ بەش بەش بوون و پوكانەوەی.[٢]

بە ململانێی نێوان (علاء الدین ی خوارەزمی) و (توركان خاتوون)ی دایكی ناكۆكییەكی توندو كاریگەر لە نێو بنەماڵەی حوكمڕانی خوارەزمیدا دەستی پێكرد، (توركان خاتوون) خەڵكێكی زۆری لە هێزەكانی هۆزەكەی خۆیدا – كانكالی تورك – ڕێك خستبوو كار بەوە گەیشتبوو دەسەلاتی ئەم هیچ لە دەسەلاتی سوڵتان كەمتر نەبوو، لێرەوە ئەگەر ڕووداوێك لەنێو چوارچێوەی دەوڵەتدا ڕوویدابایە، یان كێشەیەك باتبایە پێشەوە، ئەوا دوو بڕیاری دژ

---

١ صحيح البخاري بشرح العسقلاني ٩/١٠١ـ١٠٢.

٢ الضعف المعنوي وأثره في سقوط الأمم ص: ١١٨.

بەیەك یەکیان لە لایەن سوڵتانەوەو ئەوەی تریان لە لایەن (تورکان خاتوون)ەوە دەردەچوون، تەماشای مێژووی هەردووك بڕیارەکە دەکرا کامەیان تازەبوایە هەڵدەوەشێنرایەوە،[١] ئەو بڕیارانەی لە لایەن (تورکان خاتوون)ەوە دەردەچوون — بەبێ حیساب کردن بۆ مێژووەکەی — تەواو پێچەوانەی ئەو ڕێزو حورمەتە بوون کە پێویست بوو لە بڕیارەکانی سوڵتان بگیرێت، بە تایبەتی لەم بارودۆخە نائاساییانەدا، بۆیە دەبینین دەسەڵاتی (تورکان خاتوون)و هۆزەکەی لە نێو کاروباری دەوڵەتدا هێندە کاریگەر بوو کە بە تەواوەتی سامو هەیبەتی حوکمڕانەکانی لاوازکردبوو، لەگەڵ ئەمەشدا (سوڵتان علاء الدین) لەبەر خاتری دایکایەتیو زۆری کاربەدەستو میرانی دەوڵەت لە هۆزەکەی دایکی پێچەوانەی هیچ فەرمانێکی دایکی ڕەفتاری نەدەکرد، با نموونەیەك بێنینەوە لەسەر هێزو دەسەڵاتی ئەم ژنە لە نێو کاروباری دەوڵەتدا:

(تورکان خاتوون) یەکێك لە خزمەکانی خۆی بە ناوی (نظام الملك محمدی کوڕی صالح)ی کردبە وەزیری دەوڵەت، ئەم پیاوە خاوەن کەسایەتیەکی هێندە تێرو تەواو نەبوو کە شایانی ئەم پۆستە بێ، بەڵکو بەرتیل خۆرو کەم ڕەوشت بوو، لە بڕینەوەو یەکلایی کردنەوەی بڕیاردا سست بوو، ئەزقەزا (علا الدین) لە شاری (نەیسابور) دەبی٤ (صدرالدین جوندی)ی زانا — کە لە بنەماڵەیەك بوو زۆربەی ئەندامەکانیان کاربەدەستی دەوڵەت بوونو — وێڕای زانایەتیەکەشی پیاوێکی چاك بوو، لە لایەن (علاء الدین)ەوە پۆستی (قەزاوەت)ی شاری دەدرێتێ، پاشان پێی دەڵێ کە نابێ ـ بە پێی نەریتی نێوان زۆرینەی حوکمڕانەکان ڕەفتار بکات—و دیاری بۆ وەزیر بنێرێ.

(قازی) لە نێوان هەڕەشەی سوڵتانو ڕازی کردنی بۆ وەزیردا تێمابوو، هەرچۆنێك بێت دوای ئەمە قازی (٤) هەزار دیناری هێناو لە نێو کیسەیەکی مۆرکراوی پێچاو بە دزیەوە بۆ وەزیری نارد، کاتێك (علا الدین) بەمەی زانی، یەکسەر بۆ لای وەزیری ناردو داوای دیاریەکەی لێکردبوو، بە ناچاری دیاریەکەی قازی وەکو خۆی بە مۆرکراوی بۆ سوڵتان نارد، کاتێك قازی لەبەردەم سوڵتان ئامادەبوو، سوڵتان پرسیاری لەو جۆرە دیاریە کرد کە بۆ وەزیری ناردبوو، قازی لە وەڵامدا سوێندی بەسەری قازی خوارد کە ئەو هیچ شتێکی بۆ وەزیر نەناردووە، بەڵام کە سوڵتان کیسە دیاریەکەی خستەپێشی، قازی دانی پێدا هێنا، لەو

١ سیرة جلال الدین منکبرتي ص:٤٢.

کاتەدا سوڵتان فەرمانیدا قازیو وەزیر لەسەر پۆستەکانیان لابـبرێن،[١] (قازی) لەسەر کار لاچوو بەڵام (وەزیر) کەس نەیدەوێرا هەواڵی لابرانی پێ ڕابگەیەنێ، سوڵتانیش نەیدەتوانی کار بە بڕیارەکەی خۆی بکاتو وەزیر لە پۆستەکەی بێنێتە خوارەوە، دوای ئەمە (تورکان خاتوون) ئیدارەی مەملەکەتی (ئوزلاغ شا)ی کوڕی – واتە هەرێمی ( خوارەزم) –ی خستە ئەستۆی (نظام الملك)، وەزیر بە ئارەزووی شەڕەنگێزو پاتاڵخۆری خۆی لەو هەرێمە ڕەفتاری دەکرد،ماڵو سامانێکی زۆری پاشقولدا، کاتێك (سوڵتان) بەمەی زانی زۆر تووڕە بوو یەکسەر یەکێك لە سەرکردەکانی خۆی بۆ هەرێمی (خوارەزم) ناردو فەرمانی پێدا سەری وەزیری بە براوی بۆ بێنێ، تەبیعی دایکی سوڵتان بەم فەرمانە قایل نەبوو، بۆیە فەرمانیدا هەرکە سەرکردەی ناوبراو گەیشتە (خوارەزم) یەکسەر لە دیوانی وەزارەت ئامادەبێتو بە وەزیر ڕاگەیەنێ کە: (سوڵتان بە منی گوتووە جگە لە تۆ هیچ وەزیری ترم نیە، کەواتە لەسەر کارەکەت بمێنەوەو کەسیش لە هیچ هەرێمێکدا بۆی نیە قەدرت نەزانێتو سەرپێچی فەرمانەکانت بکات)، سەرکردەکە بە ناچاری فەرمانی (تورکان خاتوون)ی جێبەجێ کرد، بەم شێوەیە (نظام الملك) – لەگەڵ ئەوەدا سوڵتان زۆری داخو مەراق لێ دەخوارد – دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی هەبوو فەرمانو بڕیارەکانی لە خوارەزمو خۆراسانو مازندەران جێبەجێ دەکران.[٢]

دەسەڵاتی زۆری (تورکان خاتون) لە کاروباری وڵاتداو ڕێك نەبوونی نێوان ئەوو سوڵتانی کوڕی بناغەی دەوڵەتی خوارەزمی لە بنەوەڕا هەڵتەکاند، بە تایبەتی کە (تورکان خاتون)و هێزە سەربازیە بەکرێ گیراوەکەی ژێر دەستی – کە لە هۆزی (کانکالی) بوون – هەموو ناوچە ئەسڵیەکانی دەوڵەتی (خوارەزم)یان خستبووە ژێر دەسەڵاتی حوکومەتە سەربەخۆیەکەی خۆیانەوە، وێڕای ئەمەش خزمە نزیکەکانی خۆیان لە زۆربەی پۆستە باڵاکانی کاروباری وڵاتە داگیرکراوەکاندا دامەزراندبوون، سوڵتان لەم بوارەدا هیچی بەدەست نەبوو، تەنانەت دیاری کردنی سوڵتانی دوای خۆیو وەزیری حوکومەتەکەشی بە دەست تورکان خاتونی دایکی بوو.[٣]

مەڵبەندی هێزو دەسەڵاتی (تورکان خاتون) لە وڵاتی (خوارەزم)دا بوو، زۆرینەی سوپاو سەرکردەکانو کاربەدەستانی دەوڵەت لەو هەرێمەدا بوون، هەر هەموویان بە ڕەگەز تورکی

---

١ سيرة جلال الدين منكبري ص:٢٨ـ٢٩.
٢ الدولة الخوارزمية ولبمغول ص: ٢٣٥.
٣ تأريخ المغول منذ حملة جنكيزخان ص: ١٢٦.

(کانکالی) بوون یان کەسی تایبەتی مەملەکەو نۆکەرو خزمەتکای ئەو بوون، بە فەرمانی (تورکان خاتوون): (نظام الملك محمدی کوڕی صالح) پۆستی وەزارەتی درایەو (ئۆزلاغ شا)ش کرا بە وەلی عەهدی سوڵتان، ئەم بڕیارانە بە پێچەوانەی ویستو خواستی سوڵتان (علاء الدین) بوون، هەرچەندە (جلال الدینو رکن الدین)ی کوڕانی علا الدین لە (ئۆزلاغ شا)ی برایان گەورەتر بوون، بەڵام سوڵتان بە ناچاری هاتە سەر ڕای دایکیو (ئۆزلاغ شا)ی کرد بە وەلی عەهدی خۆیو ناسناوی (أبو مظفر قطب الدین)ی بەسەر دابڕا، هەموو ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە دایکی (ئۆزلاغ شا) سەر بە هۆزەکەی خودی (تورکان خاتون) بوو، کەسو کارەکەشی وەك کەسوکاری (تورکان خاتون) لە تورکە دەست ڕۆیشتووەکانو پشتیوانەکانی دایکی (خوارەزمشا) بوون.

بەم شێوەیە لەگەڵ گەڕانەوەی (جلال الدین) بۆ (خوارەزم)و لابردنی (ئۆزلاغ) لە پۆستی حوکمڕانیو بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حوکومەت لە لایەن (جلال الدین)ەوە یەکەمین کەس کە لە ژێر فەرمانی دەرچوو و شۆڕشی لێ کردو کاروباری لێ شێواندو ناچاری هەڵاتنی کرد لە خوارەزم (قوتلوغ خان)ی خاڵی (ئۆزلاغ شا) بوو، (تورکان خاتون) بە چاوی دوژمنایەتیەوە تەماشای سوڵتان (جلال الدین)ی دەکرد، کاتێك (جلال الدین) لە (خوارەزم) ڕایکرد، یەکێك لە کاربەدەستە تایبەتەکانی ئامۆژگاری (تورکان خاتون)ی کرد لەگەڵ سوپاکەی (جلال الدین) بڕوات، بەڵام (تورکان خاتون) ئەم ئامۆژگاریەی بەرپەرچ دایەوەو گوتی: لە لایەن (جەنگیزخان)ەوە بە دیل بگیرێم زۆرم پێ خۆشترە لە ژێر سایەی (جلال الدین)دا بژیم.

کورتەی قسان ئەمەیە: ئەم ژنە خۆپەرستو تینو بە خوێنە خزمە تورکەکانی هۆکاری هەرە سەرەکی تێکچوونی کاروباری (خوارەزمشا) بوون، هەر ناگوزوریەك توشی ئەم دەوڵەتە دەبوو هەمووی دەرەنجامی دیکتاتۆریو خۆسەپێنی ئەم ژنەو ناکۆکی نێوان ئەوو گوڕەکەی بوون.[1]

### ٤ـ لاوازی سیستەمی جەنگی خوارەزمیەکان:

یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانەی سەری کێشا بۆ سەرکەوتنی مەغۆلەکان خودی ئەو سیستەمە جەنگیو جۆری ئەو نەخشەیە بوو کە خوارەزمیەکان بۆ بەرگری کردن لە دەوڵەتەکەیانو وڵاتەکەیان لە دژی هێرشی مەغۆلەکان ئامادەیان کردبوو، زیاد لەمەش ئەو سوپا خوارەزمیەی (علاء الدین) پشتی پێ بەستبوو لە نەتەوەی (تورکمان)و تیرەو

١ تاریخ المغول، عباس اقبال ص: ٨٥.

تایەفەکانی (کانکالی) پێکهاتبوو، (تورکمان)ەکان بریتی بوون لە نەوەی تورکەکانی (غوز) کە بە سەرکردایەتی (سلجوقی)یەکان وڵاتی فارس (ئێران)یان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، نیشتەجێ بوونیان لەم بەشەی جیهانی ئیسلامیداو تێکەڵبوونیان لەگەڵ نەتەوەکانی فارسو عەرەب سەری کێشا بۆ ئەوە کە گۆڕانکاریەکی تەواو بەسەر پێکهاتەی جەستەیانو دابو نەریتیانو زمانی گفتو گۆیاندا بێت.

بەڵام تیرەکانی (کانکالی) کاتی خۆی نیشتەجێی دەشتە هەڵکەوتووەکانی باکووری (خوارەزم)و باکووری خۆرهەڵاتی دەریای (قەزوێن) بوون، لە ئەنجامی ژنو ژنخوازی نێوان ئەمانو سوڵتانەکانی (خوارەزمی) بەرەبەرە بەرەو وڵاتی (خوارەزم) هاتن، سوڵتان (علا الدین تکش) هاوسەرگیری لەگەڵ (تورکان خاتون)ی کچی یەکێك لە سەرکردەکانی ئەم تیرانە ئەنجامدا، لە ئەنجامی ئەمەدا خەڵکێکی زۆر لە خزمەکانی (تورکان خاتون)و ئەندامانی هۆزەکەی بۆ وڵاتی (خوارەزم) هاتنو بوونە خزمەتگوزاری (علا الدین محمد خوارەزم شا)، پاشان (سوڵتان) دەستی دەسەڵاتی کردنەوەو بە مەبەستی حوکمگێڕان بە ناوی ئەوەوە هەندێك هەرێمی دەوڵەتەکەی خستە بەردەستیان، بێگومان هێزی خوارەزمیەکان وردەوردە لە بەرامبەر ئەم حوکومەتە سەربازیە ئاغاواتیەدا لاواز دەبووو دەپوکایەوە، سوڵتانو خزمو دۆستە نزیکەکانی بۆیان دەرکەوت سەربازانی ئەم هۆزە گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریان لە بازنەی دلسۆزیدا نیەو گێرەشێوێنیەکەیان خەریکە پایەکانی حوکومەت بنکۆڵ دەکات، بۆیە بڕیاری دا هیچکە خۆ بە خزمەتی تێرکردنی هەواو هەوەسی ئەوانەوە خەریك نەکات، کاتێك (کانکالیەکان) هەستیان بە نیازی دڵو دەروونی سوڵتان کرد لە بەرامبەریاندا، پەنایان بۆ ترسو تۆقاندنی موسڵمانانو ڕاوو ڕوتو تاڵانکردنی دوکانەکانیان کرد لەسەر ڕێگاو بانەکان.[1]

ئەم چەکدارە بێگانانە بە چەندین شێواز ئازاری خەڵکیان دەدا، هێمنیو ئاسایشی وڵات شێوا، بارودۆخی سیاسی کۆمەڵایەتیشی لەگەڵ تێکچوو.[2]

سەربازانی تورك ببوونە سەرچاوەی دڵەڕاوکێو شڵەقانی دەوڵەتی خوارەزمی، زۆر گرنگیان بە بەرگریکردنی دەوڵەت نەدەدا، بەڵکو وێنەی هێزێکی بەکرێگیراو بوونو بەس، کە پاراستنی گەلێکی بێگانەیان پێ دەسپێردرێت، هەستیان دەکرد ئەگەر لە مەیدانی جەنگدا

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ٢٣٦.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٣٣.

سەرکەوتن بەدەست بێنن، ئەوا بەرهەمەکەی نایەتە گیرفانی ئەوانەوەو دەرەنجامەکەی بەخێروبێری ئەوان ناشکێتەوە، لە لایەکی ترەوە (سوپای خوارەزمی) لەسەر گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری سەرکردەکانیو ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتیەکان ڕانەهاتبوو، کە ئەم سیفەتە بە زەقی لە سوپای مەغۆلیدا بەرجەستە ببوو، لەمەش گرنگتر: سوڵتان علا الدین ی خوارەزمی متمانەی خۆی بە تەواوەتی لە لایەن گەلەوە لەدەستدابوو، بۆیە لە بەرەنگاربوونەوەی ئەم هێرشە سامناکەی مەغۆلەکاندا بەدڵ بەشداریان لەگەڵ نەکردو بە پەلە نەچوونە ژێر ئالاکەیەوەو وەکو پێویست بەماڵو سامان یارمەتیان نەدا، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە سوڵتان دەسەلاتێکی مادی وای نەبوو بتوانێ ڕەعێتەکەی پێ چەکدار بکات، بەلام لە بواری ئەو نەخشە جەنگیەی علاء الدین لە ڕووبەڕووبوونەوەکاندا ڕەچاویان کردبوو، تەماشا دەکەین نەخشەیەکی سەقەتو ناسەرکەوتووی بووە، ئەو لە جیاتی ئەوە یەك سوپایەکی گەورە کۆبکاتەوەو لە یەك لاوە ڕووبەڕووی مەغۆلەکانی پێ بکاتەوە، دەبینین هێزەکانی بەسەر شارە جیاجیاکانی (وڵاتی ئەودیو ڕووبار)دا دابەش دەکات، بۆ نموونە دەبینین (٢٠) هەزار سەرباز لە شاری (بوخارا)و (٥٠) هەزار سەرباز لە (سەمەرقەند) دادەنێتو لە شاری (ئەتراڕ)یش کە بە کلیلی دەروازەی ئەم هەرێمە دادەنرێتو — یەکەم هێرش ڕووی لە ئەوێیە — تەنها (٢٠) هەزار سەرباز دادەنێت، لە لایەکی ترەوە دەبینین ژمارەیەك کارمەند بە مەبەستی کۆکردنەوەی پیتاكو سەرانە بەنێو هەرێمەکانی دەوڵەتی خوارەزمیدا بڵاو دەکاتەوە بە حیسابی خۆی بە قەبارەی ئەم ماڵو سامانە سوپایەکی ڕێکوپێك دروست بکاتو وەکو یەك بەسەر هەرێمو شارەکانیاندا دابەش دەکات، بەم شێوەیە دەبینین سوپای خوارەزمی لەنێو شارەکاندا بڵاوکرابۆوەو بوو بە هۆی ئەوەی مەغۆلەکان بە ئاسانی شار بە شاری ئەو وڵاتە یەك لە دوای یەك داگیر بکەن، خۆ ئەگەر (علاء الدین) هەموو سوپاکەی کۆکردبایەوەو بەیەك کەڕەت بەرەنگاری مەغۆلەکان ببوایەوە زۆر لەوانەبوو بە ئاسانی لەنێوی بردبانایە.

دەبینین علاء الدین بە هۆی ئەوەی سوپاکانی لە شارەکاندا کۆکردبوونەوەو بە مەبەستی پاراستنی سەربازەکانی لە زەبرو گورزی دوژمنان بەوپەڕی گوڕو تینەوە کار بۆ قایم کردنی ئەو شارانەو بەهێزکردنی دیوارو قەلاکانیان دەکات، بۆ نموونە لەگەڵ ئەوەدا شاری (سەمەرقەند) زۆر بەرفراوان بوو، بەلام دەبینین (علاء الدین) بە مەبەستی بەرگریکردن دەست بە دروستکردنی شورەیەك بە دەورەی ئەو شارەدا دەکات، بۆ ئەم مەبەستە کارمەندەکانی خۆی بە وڵاتدا بڵاودەکاتەوە تا سەرانەو پیتاکێکی پێویست بەدەست بخاتو

پڕۆژەی دیوارەکەی پێ تەواو بکات، توانی لە ماوەیەکی کەمدا ماڵ کۆبکاتەوەو بەلام هێرشی کوتوپڕی مەغۆل نەیهێشت پڕۆژەکە تەواو بکات.

مێژوونووسان دەربارەی هۆکاری دابەشکردنی سوپای خوارەزمی بەسەر شارەکانداو بەم شێوازە لە لایەن (علاء الدین)ەوە بیروڕای جیاوازیان هەیە:

(جیبون) پێی وایە:بە گومانی علاء الدین مەغۆلەکان لە گەمارۆدانی ئەو شارە زۆرانە ماندوو دەبن، پاش ئەوەی هیچیان لەم شارانە دەست ناکەوێ بۆ وڵاتی خۆیان دەگەڕێنەوە.[١] (سیکس) پێی وایە: بەبۆچوونی علا الدین لەو کاتەدا جەنگیزخان هەندێك تالانو بڕۆ دەکاتو پاشان لە کوێڕا هاتووە بە ئەوێدا دەگەڕێتەوە،[٢] ئەم بۆچوونە پێچەوانەی هەنگاوەکانی پێشدای جەنگیزخانە لە داگیرکردنی هەرێمەکانی ئاسیای خۆرئاوادا. بە بۆچوونی (فلادیمیر ستۆف): سوڵتانی خوارەزمی متمانەی بە سوپاکەی نەبوو، دەترسا ئەگەر هەموو سوپاکەی لە شوێنێکداو لە ژێر سەرکردایەتی یەك سەرکردەدا کۆببێتەوە، ئەوا ئەو سەرکردەیە بە پشتیوانی سوپا لە دژی سوڵتان ڕاپەڕێتو کۆتایی بە دەسەڵاتی بێنێت، بێ لەمەی باسمان کرد سوپای خوارەزمی لەو ئاستەدا نەبوو بتوانێ کۆببێتەوە سەریەكو سەرکردەیەکی وا لێوەشاوەشیان نەبوو بەڕێوەی بەرێت، زیاد لەمەش (علاء الدین) پێی وابوو بەرەنگاربوونەوەی دوژمن لە دەشتو دەردا کارێکی گرانو قورسە، لەبەر ئەمە خۆ مەڵاسدان لە نێو شارو قەڵاکانیدا پەسند کرد.

لەوەی ڕابرد بۆمان دەردەکەوێت کە: سیستەمی جەنگی خوارەزمیەکان سیستەمێکی تێکەڵو پێکەڵو بێ سەروبەر بووە، هێزی سوپاکەیان بەش بەشو لێك جودا بووە، هەر لەبەر ئەمەش بوو شار لە دوای شارو شورە لە دوای شورەکانیان لە لایەن مەغۆلەکانەوە بە سوكو ئاسانی دەستیان بەسەردا گیرا، دوای ئەوەش مەغۆلەکان توانیان وڵاتی (ئەودیو ڕووبار) کە خوارەزمیەکان هۆکارەکانی بەرگریکردنیان لەوێدا چڕ کردبۆوە — بە تەواوەتی داگیر بکەن، زۆر بە ئاسانی (دەوڵەتی خوارەزمی) لە ڕەگو ڕیشە دەرکێشنو هەموو ئەو کۆشكو بینایانەی موسڵمانان دروستیان کردوون بڕوخێننو بیانکەنە کەلاوەو کەسیشی تێدا نەهێڵن تا بەسەریاندا بگریات.[٣]

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ٢٣٧.
٢ المصدر نفسه ص: ٢٣٧_٢٣٨.
٣ المصدر نفسه ص: ٢٣٨.

### ٥ـ خۆشویستنی دونیاو ڕق بوونەوە لە مەرگ:

لەو کاتەدا خۆشەویستی دونیا بەسەر سەرکردەو گەلدا زاڵ ببوو، موسڵمانان توشی بەزینی دەروونی ببوون، بە داماویو سەری کزەوە خۆیان بە دنیاوە هەڵواسیبوو، خۆیان لە شارو گوندەکانیاندا کوشمەڵە کردبووو چاوەڕێی مەرگی لە نکاویان دەکرد لەسەر دەستی مەغۆلەکان یەخەیان بگرێت، بە ڕاستی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕاستی فەرمووە: ((یوشك الأمم ان تتداعى عليكم، كما تتداعى الأكلة على قصحتها، فقال قائل: ومِن قلة يومئذ؟ قال: بل أنتم يومئذ كثير، ولكنكم غثاء كغثاء السيل، ولينزعنّ الله من صدور عدوكم المهابة منكم، وليقذفن في قلوبكم (الوهن) فقال قائل: يا رسول الله وما الوهن؟ قال: حب الدنيا وكراهية الموت))،[1] خۆشەویستی دونیا دڵەکانی داگیرکردبوو، موسڵمانان حەزیان بە مردنی ڕێی خودا نەدەکرد، وەکو کەفی قەراغ لافاویان لێهاتبوو، لافاو بەرەو خۆرهەڵات ڕۆیبایە پێشی دەکەوتن، بەرەو خۆرئاوا ڕۆیشتبایە پێشی دەکەوتن، بێ ڕاو ئامانجو ئاوات کەوتبوونە گۆڕێ، خودای باڵادەست سامو هەیبەتی موسڵمانانی لە دڵی تەتەرەکاندا دەرهێنابوو، گوێیان لە زۆری هێزی بەرامبەر نەبوو، خودا زەبوونیو لاوازیو بەزینی هەڵدابووە نێو دڵی موسڵمانانەوە، کار بەوە گەیشتبوو (١٠٠) سەربازی موسڵمان نەیاندەتوانی ڕووبەڕووی تاکە تەتەرێك ببنەوە... ولاحول ولا قوة الاّ بالله.[2] (أبو الحسن ی ندوی) دەڵێ: موسڵمانەکان بە جۆرێك زراویان لە تەتەرەکان چووبوو کار بەوە گەیشتبوو: جار هەبوو تاکە تەتەرێك بە شەقامی شارێکدا ڕەت دەبوو ئەگەر (١٠٠) موسڵمان لەوێ بوونایە یەك بە یەك هەمووی دەکوشتن، کەسیان زاتی نەدەکرد لە ڕووی هەڵگەڕێتەوە.[3]

جارێك ژنە تەتەرێك بە بەرگی پیاوانەوە دەچێتە ماڵێكو هەموو ئەندامانی ئەو خێزانە دەکوژێت. جار هەبوو تەتەرێك موسڵمانێکی بە دیل دەگرت، پێی دەگوت جارێك سەرت لەسەر ئەم بەردە دانێ تا دەچم خەنجەر دێنمو سەرت دەبڕم، موسڵمانەکە سەری دادەنەواندو نەیدەوێرا ببزوێ تا تەتەرەکە لە شار دەهاتەوەو بە خەنجەرەکەی سەری دەبڕی.[4]

---

١ سنن أبي داود، نقلا عن قصة التتار ص: ٤٠، ٤١.

٢ قصة التتار ص: ٤١.

٣ رجال الفكر والدعوة ١/ ٢٨٢.

٤ المصدر نفسه ١/٢٨٢، نقلا عن الكامل في التأريخ.

هێرشی تەتەرەکان بەڵاو نەهامەتیەکی یەکجار گەورە بوو، بە توندی جیهانی ئیسلامی هەژاندو راوەشاند، موسڵمانانی لاڵو پاڵو گێژو هێژکردن، ترس و تۆقاندن باڵی بەسەر تێکڕای جیهانی ئیسلامیدا کێشا، نائومێدیو ڕەشبینی بەسەر خەڵکدا زاڵبوو، پێیان وابوو (تەتار) بەڵایەکە لە ئاسمانەوە هاتووەو بەرگریکردنی مەحاڵە، پێوەر پلەی بەزینەکەیانی پێ نەدەخوێنرایەوە، ئەم پەندە لەنێو خەڵکدا بڵاوبۆوە: (ئەگەر گوتیان تەتار بەزیون باوەڕ مەکە). ڕوویان لە هەر وڵاتێکو دەوڵەتێك کردبایە لەنێو دەبراو دەڕوخێنرا، سنووری هەموو پیرۆزیەکانی ئیسلامیان دەبەزاند، ئاراستەی هێرشی تەتار بەرەو هەر شوێنێك بایە دەرەنجامی ڕوخاندنو وێرانکردنو داماوکردنو سنوور بەزاندنی پیرۆزیەکانی لێ دەکەوتەوە.

بێگومان هەموو جیهانی ئیسلامیو بە تایبەتیش بەشی خۆرهەڵاتی لە لایەن ئەم بەڵاو وەیشومە کوێرەوە غافڵگیرکرا، مێژوونووس هەموو ڕەنگێکی ڕووداوەکانی سەرگۆڕەپان تۆماردەکات، بە تەك چەندین جۆر دیمەن لەنێوچوونی گەلانو وڵاتاندا ڕادەبووری، قەڵەمەکەی هەموو ڕووداوەکان تۆمار دەکات، بەڵام دڵی نەرم نابێتو چاوی فرمێسك ناڕێژێ، بەڵام (إبن الأثير)ی مێژوونووسی بەناوبانگ کاتێك دەگاتە باسی ڕووداوەکانی (تەتار) ناتوانێ هەستی زامداریو دەروونی بە ئازاری خۆی پەردەپۆش بکات،[1] کاتێك دەڵێ: (من چەند ساڵێك پشتم لە باسکردنی ئەم کارەساتە کرد، چونکە پێم وابوو کارەساتێکی گەورەو دڵتەزێنەو پێم خۆش نەبوو باسی بکەم، من لە نووسینەوەی ئەم باسەدا لاقم لە دوایەبوون، ئاخر کێ بە لایەوە ئاسانە نالەی گیانەلای ئیسلامو موسڵمانان بنووسێتەوە؟ کێ ئەوە بە کەم دەگرێت؟ ئای، خۆزگە دایکم منی نەبووایە، خۆزگە پێش ئەم کارەساتە بمردمایەو چووبامایە خانەی لەبیرچوونەوە، بەڵام کۆمەڵە هاوڕێیەکم هانیان دام بینووسمەوە، بەڵام من هەر ڕاوەستام، پاشان هاتمە سەر ئەو ڕایە کە نەنووسینەوەی ئەم ڕووداوە هیچ سوودێك ناگەیەنێت، جا لێرەوە دەڵێین: ئەم فەسڵە باسی ڕووداوێکی گەورەو کارەساتێکی مەزن لە خۆ دەگرێت، ڕۆژگارو شەوگار ڕووداوی ئاوایان بە خۆیانەوە نەدیووە، کارەساتەکە بۆ هەموو خەڵك گشتگیر بوو و بۆ موسڵمانانیش تایبەتی بوو، ئەگەر قسەکەرێك بڵێ: لەوەتەی خودا جیهانی دروست کردووە تا ئێستاو لە بابە ئادەمەوە تا ئیمڕۆ خەڵك گیرۆدەی بەڵاو مەینەتی لەم شێوەیە نەبووە ڕاست دەکاتو باوەڕی پێ بکە، لەوانەیە خەڵك ڕووداوێکی لەم شێوەدا ببینێ، بەڵام تەنها ئەو کاتەیە کە یاجوجو ماجوج دێنو مرۆڤایەتی بەرەو لەنێوچوون

---

[1] المصدر نفسه

دەچێت، ــ مەغۆلەکان یان تەتەرەکان ــ کەسیان بە زیندوویی نەدەهێشتەوە، ژنان‌و پیاوان‌و منداڵانیان وێکڕا دەکوشت، سکی ژنی بارداریان هەڵدەدڕی‌و کۆرپەلەکەیان لێ دەکوشت، فانا لله وانا الیه راجعون ولا حول ولا قوة الاّ بالله العلي العظیم بۆ ئەم کارەساتە کە وەکو هەورێکی ڕەش ڕەشەبای بەدواوە بێ بە ئاسمانی وڵاتاندا هاتوچووو شەڕو خراپەی بە دنیادا بڵاو بۆوەو زەرەرو زیانیشی هەموو لایەکی گرتەوە.[1]

دانەری کتێبی (مرصاد العباد) – کە بە چاوی خۆی شایەدی ئەم ڕووداوە مەرگبارو کاولکارانەی شاری (ڕەی) جێگەی لە دایکبوونی‌و شاری (هەمەدان)ی جێگەی نیشتەجێی بووە دەڵێ: سوپای تەتار – خودا دایانوەشێنێ‌و بیانڕوخێنێ – لە ساڵی ٦١٨کۆچیدا دەستیان بەسەر وڵاتانی ئیسلامدا گرت، ئەو فیتنەو فەسادو خراپەکاری‌و کوشت‌و بڕو سوتاندن‌و ڕوخاندن‌و کاولکاریەو کارە ناشیرین‌و قێزەون‌و ئابڕوبەرانەی ئەم مرۆڤە لەعنەتیانە ئەنجامیاندان، بە بیستنیان مرۆڤ موچڕکی بە بەدەنیدا دێت، لە هیچ سەردەمێك لەسەردەمەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوێنەی نەبووە، نە لە سەردەمەکانی ئیسلامدا، نە لە سەردەمەکانی نەفامیدا، تەنها لە شاری (ڕەی)دا کە جێگەی لە دایکبوونمە (٧٠٠) هەزار موسڵمانیان گرت‌و کوشت، وشەکان ناتوانن وێنەی ئەو شەڕەنگێزی‌و خراپەکاریە بکێشن کە ئەمانە بەسەر جیهانی ئیسلام‌و موسڵمانانیاندا هێنا، ئەم کارەساتە زۆر لەوە زۆرترە کە بۆ خەڵك شی بکرێتەوە، پەنا بە خوا: ئەگەر غیرەتی ئیسلامەتی‌و ئازایەتی‌و مەردایەتی لە هەناوی شاو دەسەڵاتدارانی موسڵماناندا نەخرۆشی‌و نەگوترێ ئەوان بەرپرس‌و لێپرسراوی ئوممەتن، وەکو پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: ((الأمیر راع علی رعیته، وهو مسؤول عنها))، ئەگەر هەستی پیاوەتی‌و ڕەوشتی ڕەندیان تێدا نەبزوێت‌و بەرەو کۆبوونەوە لەسەر یەك وشەو بڕیاریان نەبات‌و گەردنکەچی فەرمانەکانی خودا نەبن، وەك دەفەرموێت: ﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ (التوبة: ٤١). ئەگەر بۆ بەرەنگاربوونەوەو بەرگرتن لە فیتنەیەکی ئاوا ئامادەی گیانبازی‌و ماڵبەخشین نەبن، ئەوا هەموو ئەمانە دەبنە بەڵگە بۆ ئەوە: کە موسڵمانان لەنکاو توشی داماوی‌و تێکشکای دەبن، جیهانی ئیسلامی دەچێتە باوەشی کوفرەوە، دەترسێم ئەو کاتە: موسڵمانان جگە لە ناوی (موسڵمان)ەتی هیچکەیان پێوە نەمێنێ، پاشانیش لە ئەنجامی ئەوەدا کە تەنها بە ناو

---

١ الکامل في التاریخ ١٢/١٤٧ـ١٤٨، رجال الفکر والدعوة ١/ ٢٨٣.

موسڵمان بین‌و کار بە موسڵمانەتیەکەمان نەکەین ناوو وێنەکەشمان بە جودا لە دەست بدەین.[1]

### ٦ـ وازهێنان لە (یەکێتی)و دەستکردن بە ستەمی بەندەکان (نەبوونی دادپەروەری):

ئەگەر پەرتەوازەیی ڕێبازی داڕوخان بێ، ئەوا بێگومان یەکێتی ڕێبازی شکۆداری‌و پایەداری‌و گرتنی پێگەیەکی بەرزە لە نێو گەلانی جیهاندا، هۆیەکیشە بۆ سەرکردایەتی کردنی مرۆڤایەتی‌و هێنانەدی شارستانیەتیەکی پاك‌و پوختی خودایی یانەی سەر ڕاست، ڕێنماکانی شەرع ئاراستەمان دەکەن بەرەو یەکڕیزی‌و یەکخستنی وشەو گەڕانەوە بەرەو شەرعی خوداو حوکمگێڕانی نێوخۆمان بەپێی قورئان‌و سوننەت، خودای بالادەست دەفەرموێت: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾﴾ (الشورى: ١٠). خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ (النساء: ٥٩).

ئەوکات شەرعی خودای بەرز پەکی خرابوو، بە دوای ئەمەدا پەرتەوازەیی‌و ناکۆکی‌و ناتەبایی‌و پارچەپارچەیی لە نێوان وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا سەری هەڵدا، ئیدی موسڵمانان نەیانتوانی کار بەم ئایەتە پیرۆز ەبکەن کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَاصْبِرُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٤٦﴾﴾ (الانفال: ٤٦). خودای بالادەست دۆڕان‌و بەزینی بە ناکۆکیەوە بەستۆتەوە، ئەوکاتە موسڵمانان لە نێو گێژاوی ناکۆکیدا تلیان دەدا، لەو کاتانەدا کە جاروبار ئاشتی لەگەڵ تەتەرەکان ئەنجام دەدراو شەڕ دەوەستا، موسڵمانەکان پەلاماری یەکتریان دەداو یەکتریان دەکوشت‌و دەگرت، دڵنیاشین کۆمەڵێك یان ئوممەتێك ئەمە سیفەتەکانی بن هەرگیز خودا سەرکەوتووی ناکات، کەواتە هیچ جێی سەرسوڕمان نیە کە مەغۆلەکان‌و غەیری ئەوانیش بەسەریاندا زاڵ ببن، (إبن الأثیر) دەڵێ: (محمدی کوڕی خوارەزمشا) دەستی بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا گرت‌و هەموو پاشاو حوکمڕانەکانی کوشتن، خۆی بە تەنیا وەکو دەسەڵاتداری وڵات مایەوە، کاتێك لە بەرامبەر تەتەرەکاندا شکا کەسێك — ی دەسەڵاتدار — لەو وڵاتەدا نەمابوو تا بە خۆی بگرێت‌و بیپارێزێت،[2] (محمدی خوارەزمی) پەیوەندی لەگەڵ حکومڕانانی وڵاتانی ئیسلامی دەوروبەری

---

١ رجال الفكر والدعوة ١/ ٢٨٤.

٢ الكامل في التأريخ، نقلا عن قصة التتار ص:٣٨.

پچڕاندبوو، هەرگیزاو هەرگیز هاریکاری کەسیانی نەدەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە یەك لە دوای یەك کوشتنی، شای ئەو وڵاتانەی دەکوشتن‌و وڵاتەکانیشی داگیردەکردن، بێگومان ئەم ڕەفتارە دوژمنکاریانەی ڕق‌و تووڕەییەکی زۆری لە دڵو دەروونی دانیشتوانی ئەو وڵاتانەدا بەجێ هێشتبوو، ئەمەی ئەو دەیکرد هیچ هونەرو حیکمەتێکی تێدا نەبوو، تەماشاکەن کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) وڵاتان فەتح دەکات، سەرانی خودی ئەو وڵاتانە دەکاتەوە سەرپەرشتیان‌و جێگەو پێگەیان دەپارێزێت‌و سەروەری خۆیان بۆ دەگێڕێتەوە، بەم شێوەیە پشتیوانی‌و خۆشەویستی ئەوانی بۆ خۆی مسۆگەر دەکرد، (مونزیری کوڕی ساوی)ی پاشای (بەحرێن)ی بە پاشای وڵات دانایەوە، (جیفرو عوباد)ی دوو پاشای (عومان)ی بە پاشای وڵات دانانەوە، هەروەها کاتێك (بازانی کوڕی سامانی فارسی)ی حوکومڕانی (یەمەن) موسڵمان بوو وەك پێشدا کردیەوە بە حوکمڕانی ئەو وڵاتە، بەلام ڕەفتارەکانی (محمدی خوارەزمی) پێچەوانەی ڕەفتارە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خودا بوون (ﷺ)، ئەو بەهێزو زۆرەملێ خۆی کردبووە سوڵتانی خەڵك‌و خەڵك خۆشیان نەدەویست، کاتێك حەوجێی خەڵك بوو کەسی دەست نەکەوت، کاتێك پێویستی بە پشت‌و پەنا بوو بە تەنیا کەوتە گۆڕێ، دەوڵەتی خوارەزمی بەس لەگەڵ (خیلافەتی عەبباسی) ناکۆك‌و ناکوڵەك نەبوو، بەڵکو خۆی هاویشتبووە نێو ململانێی نێو خۆشەوە، لەنێوخۆدا پیلان‌و شۆڕش‌و دژایەتی زۆر سەریان هەڵدابوو، دڵەکان لەم وڵاتەدا یەکیان نەدەگرت، ڕەنگدانەوەی لەسەر (ڕیزەکان)یش دروست کردبوو، دەرەنجام شکستی گەورە لە بەرامبەر مەغۆلەکاندا ڕوویدا، هەرگیز سەرکەوتن نایەتەدی مادام ئوممەت ئەمە حاڵی بێ،[1] خودای بەرزو مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾ (الصف: ٤).

بەلام (جلال الدین) کاتێك لە ساڵی ٦٢٧ی کۆچیدا پەلاماری (ئەخلات)ی سەر بە (دەوڵەتی ئەیوبی)دا، تەترناسا شمشێری لە گەردنی دانیشتوانەکەیدا، هەر کەسێکی دەستکەوت جەبی نەداو کوشتی، هەرچەندە دانیشتوان بە هۆی گەماڕۆی درێژخایەنی یەکەم زۆر کەم ببۆوە، هەبوو لە ترسان گیانی دەرچووبوو هەبوو لە برسان مردبوو، هەندێکیشیان لەگەڵ سەرکردەو سەربازەکان چووبوونە نێو (قەڵا)وە، خۆراك کەم ببوو، بەڵکو لە (ئەخلات)دا نەمابوو، کار بەوە گەیشت دانیشتوانەکەی ئێسترو کەرو سەگو پشیلەیان دەخوارد، مشکیان ڕاو دەکردو دەیانخوارد، لە ترسی (جلال الدین)و ڕەفتارە دڕندانەکەی‌و

---

١ قصة التتار ص: ٣٩.

خوێنڕێژیەکەی هیچ گەمارۆدراوێك بە وێنەی ئەوان ئارامیان نەگرت، کاتێك سەربازەکانی چوونە نێو شارەوە منداڵەکانیان لێ گرتنو لێ کوشتن، سەروەتو سامان تالان کرا، ئەوەی تەتەرەکان ئەنجامیان دەدا ئەوانیش ئاوایان کرد، کەواتە هیچ تاوان نەبوو کە خودای پاكو بێگەرد بە هۆی تاوانو ستەمی خۆیەوە گرتیو هیچکەی مۆڵەت نەداو لە ڕەگو ڕیشەی دەرکێشا.[1]

نەدەبوو ئەو هەر ململانێی لەگەڵ سوپاکانی شامو شوێنەکانی تری جیهانی ئیسلامیدا کردبایە، بەڵکو دەبوایە کاروباری دەوڵەتەکەی ڕێكو پێك کردبایەو سوپاکەشی لەسەر بنەماکانی ئیمانو ئەخلاق ڕاهێنابایە، (جلال الدين) لە بوارەکانی حیکمەتو دووربینی سیاسیو ڕەوشتە ڕەندەکان کە هەموو پاڵەوانو سەرکردەو سەرۆکێك دەتوانێ پەیدای بکات— هەژارو نەدار بوو، (جلال الدين) پیاوی شیاوی ئەو قۆناغە هەستیارە نەبوو، بە ئیزنی خودای باڵادەست لەمەولا جیاوازی گەورەی نێوان سیفەتەکانی (جلال الدين منكبرتی)و سیفەتەکانی (سيف الدين قطز) دەبینی، ئەو (قوتتەز)ەی لە جەنگی (عەین جالوت)دا سەرکەوتنی گەورەی بەسەر مەغۆلەکاندا تۆمار کرد.

ستەمو زۆرداری لە نێو دەوڵەتدا وەکو نەخۆشیە لەنێو لاشەی مرۆڤدا، ماوەیەك ئەو مرۆڤە نەخۆشە بەو هێزو وزەی لە جەستەیدایە خۆ ڕادەگرێت، بە تەواوبوونی ئەو ماوەیەو بڕانی ئەو وزەیە مەرگی نزیك دەبێتەوە، زوڵمو زۆرداری نێو ئوممەتو دەوڵەتیش بەم شێوەیەیە، لە ماوەیەکدا کە خودا بۆ خۆی بڕیویەتیەوە دەست بە ڕوخاندنو بنکۆڵکردنی پایەو شوێنەوارەکانی دەکات، تا بەرەبەرە لاوازی دەکاتو فڕزەی لێ دەبڕێتو لە نێوی دەبات، کەواتە ئەگەر ستەم بە پێی ئەو هێڵە گشتیانەی خوای پەروەردگار کێشاونی، یەکێك بێ لە هۆکارەکانی لەنێوچوونی گەلانو دەوڵەتان، بە هەمان شێوەش عەدالەتو دادپەروەری یەکێکە لە هۆکارەکانی مانەوەی ئەو گەلو دەوڵەتانە،[2] خودای بەرزو مەزن دەفەرموێت:

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾﴾ (الاعراف: ٣٤).

(آلوسي) بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ دەڵێ: واتە هەر کامێك لە نەتەوە لەنێوچووەکان (ئەجەل)ێکی هەبوو، واتە کاتێکی دیاریکراویان بۆ

---

١ مفرج الكروب ٤/٢٩٦.

٢ السنن الالهية، د. عبدالكريم زيدان ص: ١٢١.

ڕیشەکێش کردنیان دانرابوو،[١] هەرچەندە لەنێوچوونی نەتەوەکان شتێکی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام کاتی ڕوودانی لە لای ئێمە نەزانراوە، واتە ئێمە بە دڵنیایی دەزانین نەتەوەی ستەمکار دەبێ بە پێی سوننەتی خودا بکەوێتە نێو داوی ستەمەکەی خۆیو لەنێو بچێت، بەڵام ئێمە کتو مت نازانین کاتی لەنێوچوونەکە کەیەو کەس بۆی نیە ساڵو ڕۆژی دیاری بکات، ئەمە کاری خودای پەروەردگارە،[٢] وەکو دەفەرموویت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ۝١٠٠ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ۝١٠١ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ۝١٠٢﴾ (هود: ١٠٠_١٠٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی دەکاتەوە کە سزای خودا تەنها لەسەر نەتەوە ستەمکارەکانی پێشو کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو سوننەتو بەرنامەی خودا دەربارەی گرتنی هەر هەموو ستەمکارێك — لە هەر زەمانێکدا بێ — یەك بەرنامەیە، کەواتە دروست نیە کەس گومان بەرێ کە ئەم لەنێوچوونە تەنها بەو ستەمکارانەی پێشینەوە تایبەت بووە، چونکە کاتێك خودای بەرز بارودۆخی ئەوانە باس دەکات دەفەرموویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ﴾ (هود: ١٠٢).

خودا (جل جلاله) لەم ئایەتەدا بە ڕاشکاوی دەفەرموویت هەر کەسێك بەشداری ئەم — ستەمکارانەی پێشین بکات لەو کردارانەیاندا کە پێیانەوە لەنێوچوون دەبێ لەو سزا بە ئێشو ژانەی پێشیەوە گیرۆدەبوون بەشداریان بکات، ئایەتەکە هۆشدارمان دەکاتەوە لە مەترسی ستەم، دەگونجێ دەوڵەتی کافر دادپەروەر بێ، بەو واتایەی حکومڕانەکانی ستەم لە خەڵك ناکەن، خەڵکەکەشی لەنێو خۆیاندا ستەم لە یەکتر ناکەن، کەواتە ئەم دەوڵەتە هەرچەندە کافریشە بەڵام دەمێنێتەوە، چونکە لەنێوبردنی دەوڵەت لەبەر کافربوونەکەی بە تەنهاو بەس لەبەرنامەو سوننەتی خودادا نیە، بەڵام ئەگەر ستەمی حوکمڕانەکانیو ستەمکردنی نێوخۆی خەڵکەکەی لەگەڵ یەکتردا چووە پاڵ کافربوونەکە ئەو کاتە خودا بڕیاری لەنێوچوونی دەدات،[٣] خودای بەرز دەفەرموویت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ (هود: ١١٧).

---

١ تفسير الألوسي ١١٢/٨.
٢ السنن الالهية ص: ١٢١.
٣ المصدر نفسه ص: ١٢١.

ئیمامی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: مەبەست لە (ظلم) لەنێو ئەو ئایەتەدا (شرك)ە، واتایەکەشی ئەمەیە: خودای بەرزو باڵادەست دانیشتوانی شارێك تەنها لەبەر ئەوە کە موشریكو بت پەرستن لەنێو نابات، کاتێك ئەوان لە هەڵسوکەوتی نێو خۆیاندا ئاشتو گونجاو بنو لەسەر بنەمای چاکەکاری – نەك خراپەکاری – مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن،[1] لە تەفسیری (قرطبي)یشدا دەڵێ: بظلم أي بشرك وكفر: واتە ستەم لێرەدا بە واتای شیركو کوفر دێ، دەربارەی (وأهلها مصلحون) واتە: لەنێو خۆیاندا چاكو گونجاوبنو مافەکانی یەکتر بدەن، واتەی ئایەتەکەش بە گشتی ئەمەیە: خودای بەرزو باڵادەست دانیشتوانی ئەو شارە تەنها لەبەر کافربوونی لەنێو نابا تا مل لە خراپەکاری نەنێن، وەکو چۆن بەهۆی (تەرازوبازی)یەوە نەتەوەی (شوعەیب)ی لەنێوبردو بەهۆی (نێربازی)یشەوە نەتەوەی (لوط)ی لەنێو برد،[2] (إبن تيمية) سەبارەت بە لەنێوچوونی دەوڵەتی ستەمکار ئەگەر موسڵمانیش بێ دەڵێ: کاروباری دونیای خەڵك لەگەڵ دادپەروەریەك کە هەندێك جۆرە گوناهیشی لە تەکەوە بن زۆر چاکترو باشتر ڕێك دەکەوێت لەو ستەمو ماف زەوتکردنەوەی ئەگەرچی گوناهو تاوانیشی لە تەکەوە نەبن، لەبەر ئەوە گوتراوە: خودا دەوڵەتی دادپەروەر ڕاوەستاو دەکات ئەگەرچی کافریش بێت، دەوڵەتی ستەمکار ڕاوەستاو ناکات ئەگەرچی موسڵمانیش بێت، هەروەها دەگوترێت: دونیا لەگەڵ دادپەروەریو کوفردا بەردەوام دەبێ، بەڵام لەگەڵ ستەمو ئیسلامدا بەردەوام نابێ، لێرەدا دادپەروەری سیستەمی هەموو شتێکە، ئەگەر کاروباری دونیا بە دادپەروەری بەڕێوەببرێ، دونیا ڕاوەستاو دەبێ، ئەگەر بە دادپەروەریش بەڕێوە نەبرێ ڕاناوەستێ، ئەگەر خاوەنی ئەوەندە کاروبارە ئەو ئیمانەشی هەبێ لە دواڕۆژدا پاداشتی پێ وەربگرێتەوە.[3]

لە سەردەمی خوارەزمیەکاندا زوڵمو زۆری گەورە ئەنجامدران لە: خوێنرێژی بە ناهەقو کوشتاری موسڵمانانو پەلاماردانی شارە ئیسلامیەکانو گەمارۆدانیانو حەڵاڵکردنی خوێنوماڵو ناموسیانو زەویو زاریان، سوپای خوارەزمی بە نموونە دەهێنرێتەوە لە: تاڵانو بڕۆ، کوشتو بڕ، هەموو کارێکی قێزەون، زیناو داوێن پیسیان تێدا بڵاوببوەوە، نێربازی بە گەورەییو بچووکی نەبوو، ناپاکیو غەدرو خیانەت خوخدەیان بوو، شاری (تفلیس)یان بە مەرجی چەپاڵەدان گرت، بەڵام پاشان پەیمانیان شکاندو کوشتیانو بردیان، سەربارە

---

١ تفسير الرازي ١٦/١٨.

٢ تفسير القرطبي ١١٤/٩.

٣ رسالة الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر لابن تيمية ص: ٤٠.

تایبەتەکانی (جلال الدین) بریتی بوون لە پەستترین کەس، لە ڕووی شەڕەنگێزیو لاڕێیو سەرپێچیو خراپەکارییەوەناویان دەرکردبوو،[1] لە ڕاستیدا خوارەزمییەکان بە زوڵمو زۆرداری خۆیان بەشداریان لە سڕانەوەی ئاسەواری دەوڵەتەکەی خۆیاندا کرد لە مێژوودا.

### ٧ـ خۆپەرستی محمد علاو الدین ی خوارەزمیو تێکشکانە دەروونیەکەی:

خۆشەرستی محمد علاء الدین لەوەدا دەرکەوت: کە زۆر بایەخی بە پاراستنی خۆیو خێزانەکەیو خزمو نزیکەکانی خۆی دەداو دەربارەی پاراستنی گەلەکەی کەمتەرخەمی دەکرد، زۆر بە جیددی دەستی بە خەزنەی خۆیو باپیرانییەوە دەگرتو پارێزگاری لێدەکردو گوێی بە پاراستنی موڵکو ماڵی خەزێنەی گەلەکەی نەدەدا، وەکو بە درێژایی مێژوو باوە: وێنەی ئەم جۆرە سەرکردانە لە بەرامبەر ئەو بەڵاو وەیشومانەی کە وەك ڕەشەباو گەردەلول گەلانو دەوڵەتان ڕادەماڵن خۆڕانـاگرنو دەڕوخێن، گەلێکی بەم جۆرەش بەم بارە ناهەمووارە قایل بێتو ڕۆژێك لە ڕۆژان قۆڵی چاکسازی لێ هەڵنەماڵێ دەبێ بشکێ.

سوڵتان (محمد علاء الدین)ی خوارەزمی لە (نەیسابور) هەڵات، تەتەرەکان ڕاستەوخۆ بەدوای کەوتن، شار بە شارو دێ بە دێ ڕاویان دەنا، ئەویش بە بەزیویو داماویو لێقەوماوی خۆی گەیاندە یەکێك لە دورگە نەدیوەکانی دەریای (قەزوێن)، نەخشەی هەڵاتنی سوڵتان محمدی خوارەزمی سەری گرت، بە هەژاریو نەداریو ژیانی سەختی نێو ئەو دوورگە ڕازی بوو، لەگەڵ ئەوەدا ئەو پاشای سەر تەخت بووو خاوەنی وڵاتێکی فراوانو سەروەتو سامانێکی بێ حیساب بوو، بەڵام ئێستا مادام بۆ خۆی بە ڕوح دەرچووە قەیناکات با هیچی نەبێو کەسی نەبێ، لە ڕاستیدا ئەمە بریتی بوو لە نەخۆشیەکی دەروونیو ئەخلاقی، هێندەی نەخایاند تا (سوڵتان محمد علاء الدین خوارەزمشا) بە تەنیاییو دەربەدەریو هەژاریو دەردەسەریو کوێرەوەری لەم دوورگەیەدا مرد، خودا (جل جلاله) ڕاستی فەرموو:

﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖ﴾ (النساء: ٧٨).

بۆ سوڵتانی خوارەزمی وا باشتر بوو بە سەربەرزییەوەو دەروونی چەسپاوەوەو دڵی ئارامەوە لە مەیدانی جیهاددا بکوژرایە، دەبوایە پێشوازی لە مەرگ کردبایە نەك لە بەری هەڵاتبایە.[2]

---

١ سير أعلام النبلاء ٢٢/٣٢٨.

٢ قصة التتار ص: ٣٦، ٣٧.

بەڵام ئەو خۆپەرستیە قێزەونەی و ڕوخانە دەروونیەی پێیەوە گیرۆدە ببوو تەپەتەپیان خستە دڵو ئازایەتی و کارامەیی سەربازانی مەغۆل کاریان تێکردبووو تا بڵێی لێیان دەترسا، پاش ئەوەی (سولتان) لە (سەمەرقەند) گەڕایەوە بەردەوام باسی خۆگری و شارەزایی و تیراندازی و شیربازی سەربازە مەغۆلەکانی دەکرد، ئەمەی بە چاوی خۆی لێ بینیبوون، بۆیە لە بەرامبەریاندا دەستەپاچە بووو لە کاتی هەڵاتنیشدا خەڵکی لە هێرشی مەغۆلەکان ئاگادار دەکردەوەو داوای لێدەکردن دەست نەکەنەوەو خۆ بەدەستەوە بدەن و فەرمانبەرداریان بکەن، ترس و تۆقان و هەڵاتنی سولتان کاریگەری خراپی لەسەر سەربازەکانی و دانیشتوانی شارەکان دانا، سەری کێشا بۆ لێکهەڵوەشانی سوپاو لاوازبوونی گیانی بەرگری و جیهاد لە لایەن دانیشتوانەوە،[١] هەڵاتنی سولتان لە گۆڕەپانی جەنگدا یەکێك بوو لە هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی خوارەزمی.

### ٨ـ کەسایەتی (جلال الدین مونکەبەرتی):

پاش ئەوە (جەنگیزخان) بۆ وڵاتی خۆی - (مەنغۆلیا) گەڕایەوە، (جلال الدین)یش لە وڵاتی (هیند) ڕا گەڕایەوە، حکومەتێکی باڵبڵاوی لە بەشی خۆرئاوای دەوڵەتی خوارەزمی دامەزراند، هەرچی هێزو وزەو کردو کۆششی هەیبوو - بۆ تۆڵە سەندنەوەی (علا الدین)ی باوکی و فراوانکردنی پانتایی دەوڵەتەکەی لەسەر حیسابی وڵاتانی تری ئیسلام - لە دژی سولتان و حوکمڕانە هاوسێکانی بەکاری هێنا، لەسەروی هەموویانەوە خەلیفەی عەباسی، بۆیە سولتان خەم و مەراقی تەنها لە دەورەی تۆڵە سەندنەوەو پاوانخوازیدا گێژی دەخواردو لە توانایدا نەبوو کار بۆ توندو تۆڵکردنی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان خۆی و هاوسێکانی بکات، لەبەر ئەوە لەم ماوە کەم و کورتەیدا کە گوزەراندی توانی بە هێزە ئیسلامیەکانەوە خەریك بێت و شەکەتیان بکات و بەرەو لاوازبوونیان بەرێت، توانی ڕق و تووڕەیی موسڵمانان بۆ خۆی بەرهەم بێنێ، دەورەیان چۆڵ کرد، زیاد لەمەش هیچ حیسابێکی بۆ ئەو مەغۆلانە نەکرد کە بە هۆی لاکردنەوە لە کێشەکانی نێو خۆیان بۆ ماوەیەك لە جیهانی ئیسلامی کشابوونەوە، کاتێك (جلال الدین مونکەبەرتی) بۆ وڵاتەکەی دەگەڕایەوەو بە چوارمەشقی لەسەر کورسی سەڵتەنەت ڕۆدەنیشتەوە پێویست بوو لەسەری: سوود لە هەڵەکانی باوکی و تێکشکانە سیاسیەکانی وەربگرێت و کار بۆ قایلکردن و سەرنج ڕاکێشانی هاوسێکانی بکات و هاوپەیمانیەتیەکی ئیسلامیان لەگەڵ ڕێك بخات و سەرلە نوێ بە یەکدەنگی و یەکڕەنگی و

---

١ تأريخ المغول، عباس إقبال ص: ١٣٠.

یەکرێزی بەرەنگاری مەغۆلەکان ببنەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە دووبارە بە چاوی دوژمنایەتیو ڕکەبەریەوە بۆ هێزو سوپا ئیسلامیەکانی دەوروبەری نۆڕیو لەنێو وڵاتەکانی خۆیاندا بەسەری دادان، دەستدرێژی کردە سەر مەملەکەتەکانی خەلیفەو حوکمڕانە موسڵمانەکان لە وڵاتی (نێوان دوو ڕووبار)دا، هەروەها ئازەربایجانو جۆرجیای داگیرکردنو دانیشتوانەکانیشی گەردنکەچ کردن، دژایەتی لەگەڵ (فیرقەی ئیسماعیلی) سازداو فیرقەی ناوبراویش هانی مەغۆلەکانی دایەوە جارێکی تر خاکی دەوڵەتی خوارەزم داگیربکەنەوە.[١]

(إبن الأثیر) بە جۆرێك وەسفی سیاسەتی خاریجی جلال الدین مونکەبەرتی دەکات کە لەسەر شانۆی مێژووی تازەدا نواندی کە ڕێك لەگەڵ ئەو زەرەرو زیانانە یەك دەگرێتەوە کە لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەدا هاتنە ئاراوە، دەڵێ: (جلال الدین) ژیاننامەیەکی بەدی هەبوو، بە ناشیرینی کاروباری دەوڵەتەکەی هەڵدەسوڕاند، هیچ کامێك لە هاوسێکانی نەما دوژمنایەتی لەگەڵ نەکاتو دەست درێژی نەکاتە سەر سنووری شارەکانی، ئەوە بوو هەرکە لە (ئەسفەهان) بە دەرکەوتەوە، سوپای بۆ پەلاماری هەرێمی (خوزستان) ڕێکخستو شاری (شوسشتەر) — کە لە ژێر قەڵەمڕەوی خەلیفەدا بوو — گەمارۆیدا، بەرەو (دقوقا) — کە هەر سەر بە خەلیفە بوو — ڕۆیشتو تاڵانو بڕۆو کوشتو کوشتاری تێدا ئەنجامدا، ئینجا هێرشی کردە سەر (ئازەربایجان)ی سەر بە حوکمڕانی (ئۆزبەك)و داگیری کرد، پاشان بەرەو (کەڕج=جۆرجیا) ڕۆیشتو لە ژێر هێرشو زەبرو زەنگدا ئەوێشی داگیر کرد، بە هەمان شێوە دوژمنایەتی (مەلیك ئەشرەفی) حوکمڕانی (ئەخلات)و (علا الدین)ی حوکمڕانی وڵاتی (ڕۆم)ی کرد، هێرشی کردە سەر (فیرقەی ئیسماعیلیە)و تاڵانو بڕۆو کوشتو کوشتاری لێ کردنو پیتاکێکی ساڵانەشی لەسەر دانان، ئەم حوکمڕانانەو حوکمڕانانی تریش کە ناومان نەبردن — لە کاتی لێقەوماندا — وازیان لێ دەهێناو دەستیان نەگرت[٢]و بەم شێوەیە لە ئەنجامی هێرشو پەلامارەکانیو ڕەفتارە دوژمنکاریەکانی لە دژی وڵاتەکانیان، ئەم سەرۆكو سەرکردانە لە کاتی هەڵاتنیدا لە چنگ هێرشە کتوپڕەکەی مەغۆل بۆ سەری پەنایان نەداو دەستی کۆمەکیان بۆ درێژ نەکرد.[٣]

بەڵام لە نێوخۆدا: دەبینین (جلال الدین) هەوڵدەدا تەنها بۆ خۆی حوکمڕان بێو بە زۆری خۆ دەسەپێنێ، (غیاث الدین)ی برای بە خۆیو سوپاو سەرکردەیەکی زۆرەوە پشتی

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ٢٣٩.

٢ الكامل في التأريخ ٢٣٠/١٢.

٣ الدولة الخوارزمية ص: ٢٤٠.

بەردەداتو بەجێی دەهێڵێ، لە کاتێکدا کە (جلال الدین) زۆر پێویستی بەم جۆرە گەورە سەرکردانە هەیە، زۆربەیان لە دەورەی دەتەکنەوەو بە کۆمەڵێك پیلانو نەخشەی شۆڕش لە بەرامبەریدا ڕاست دەبنەوە، لە وڵاتی (ئازەربایجان)و چەند وڵاتێکی تریشدا شۆڕشیان لێکردو تۆماری دەسەڵاتی (جلال الدین)یان پێچایەوە.[1]

هەروەها (جلال الدین) نەیتوانی سوپایەکی وا ڕێكو پێك دابمەزرێنێو بە هۆیەوە ڕووبەڕووی هێرشی لە ناکاوی مەغۆلەکان ببێتەوە، کاتێکیش سەعاتی سفر هاتە پێشەوەو زەنگی هۆشداری هێرشەکە زرنگایەوەو مەغۆلەکان خۆیان بەنێوجەرگەی وڵاتەکەیدا کردو پێش ئەوەی چاکسازی نێوخۆو دەرەوەی وڵات ئەنجامدا غافلگیریان کردو، دەرەنجام سەرلەنوێ مەغۆلەکان لە ساڵی ٦٢٨ك/ ١٢٣١زاینیدا تەختو تاراجو دەسەڵاتی دەوڵەتی خوارەزمیان ڕاماڵییەوە، بەڵێ بە لەنێوچوونی دواهەمین کەسایەتی خوارەزمی ئەوەی (نوشتکین) دەوڵەتی خوارەزمیش بەیەکجاری لەنێو چوو.[2]

(ذهبي) بە شانو باڵی (جلال الدین)دا هەڵدەڵێو دەڵێ:

سوڵتانی مەزن جلال الدین مونکەبەرتی کوڕی سوڵتانی مەزن علا الدین محمد کوڕی سوڵتان خوارەزمشای خوارەزمی، دەستی بەسەر وڵاتاندا گرت، نەتەوەکان گەردنکەچییان بۆ نواند، شتی سەرسوڕهێنەری هەیە، ژیاننامەکەی لە لای من لە بەرگێکدایە... پیاوێکی ڕەنگ ئەسمەری کورتەباڵای تورکی بوو، عەجەم زمان بوو، بە تورکیو فارسی دەدوا، بەڵام ئازایەتیەکەی ئەوەندە بەسە کە لە جەنگەکانیدا باسی لێوە کراوە، شێرێکی ئازاو بە هەڵمەت بوو، ئازاترین سوارچاك بوو، هەمیشە لە سەرپێو ئامادە بوو، تورە نەبوو، جنێوفرۆش نەبوو، بەڕێزو بەویقار بوو، پێکەنینی زەردەخەنە بوو نەك قاقا، زۆربلێ نەبوو، کەسانی دادپەروەری هەڵدەبژاردن، بەڵام لە ڕۆژگاری فیتنەو ئاشووبدا لە نێوان بەرزبوونەوەو دابەزیندا هاتوچۆی دەکرد کە باسکردنی زۆر هەڵدەگرێ بەڵام دوایی تێکشکا، تەتارەکان لێی تۆقیبوون، ئەگەر ئەو نەبوایە هەموو دنیایان دەگرت، (محیی الدین ی کوڕی جەوزی) بە نوێنەر چووبووە لای، بینیبووی قورئانی بە دەستەوەیەو دەیخوێنێتو دەگریات، سەبارەت بە ڕەفتاری سەربازەکانی کە لە زۆرو بۆریانو نافەرمانی ئەو ئەنجامی دەدەن عوزری بۆ هێنابۆوەو داوای لێبوردنی کردبوو.[3]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٤٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٤٠.

٣ سير أعلام النبلاء ٢٢/٣٢٦، ٣٢٧، ٣٢٨.

### ٩ـ کورتبینی خەلیفە (الناصر لدین الله)ی عەبباسی:

لەو سەردەمەدا (جلال الدین) لە وڵاتی (هیند) بوو، (غیاث الدین)ی برای بە سوود وەرگرتن لە پاشەکشەی ڕێژەیی مەغۆلەکان – توانی دەست بەسەر ناوچەکانی باکوورو خۆرئاواو باشوری ئێراندا بگرێت، شارەکانی (ڕەی)و (ئیسفەهان) لە باکورو هەرێمی (کرمان) لە باشورو لە چوارچێوەی دەوڵەتەکەیدا بوون، بەڵام ناوچەکانی خۆرهەڵاتو باکووری خۆرهەڵاتی ئێران کە هەرێمی (خۆراسان) بە تەواوەتی دەگرێتەوە لە ژێر دەسەڵاتی مەغۆلەکاندا بوو، (غیاث الدین کوڕی خوارەزمشا)و دەوڵەتەکەی وەکو بەربەستو نێوانێکی بەرز وابوو لە نێوان مەغۆلەکانو خیلافەتی عەباسیدا، لەو ئانو ساتەدا وا لە خەلیفە (الناصر لدین الله)ی عەباسی چاوەڕوان دەکرا کە: یارمەتی (غیاث الدین)ی دابایە، تا بتوانێ بە ڕێكو پێکی پایەکانی دەسەڵاتو حوکمەتەکەیو لەو ناوچانە بچەسپێنێ، پێویست بوو ناکۆکیو دووبەرەکیە کۆنەکانی نێوان خۆیو مەملەکەتی خوارەزمی لەبیر خۆی بەرێتەوە، چونکە ئێستا ئەوان ڕووبەڕووی دوژمنێکی هاوبەش بوونەتەوە کە (مەغۆلە)، ئەگەر گریمان هۆکارەکانی پاڵنەری ئاینیو برایەتیو سەرخستنی موسڵمانانەش لە ئارادا نەبووایە، ئەوا بارودۆخی ئەو کاتەو ستراتیژیەت ئەمەی لەسەر پێویست دەکرد کە دەبێ ئیمرۆ (غیاث الدین) لە ناوچەکەی خۆیدا دەست ڕۆیشتوو و پێ چەسپاوو ئامادەو تەییار بێ، لەبەر ئەوە ئەو ڕاستەوخۆ لە بەرامبەر تەتارەکاندا ڕاوەستاوەو هەرێمەکەشی بە دەروازەی خۆرهەڵاتی خیلافەتی عەباسی لە بەغدا دادەنرێت، خۆ ئەگەر تەتارەکان بتوانن بەسەر (غیاث الدین)دا زاڵ بن ئەوا قۆناغی دووەم دەست پێدەکات کە خیلافەتی عەبباسیە، بەڵام خەلیفە (الناصر لدین الله)ی عەبباسی دەرکی بەم پێشهاتانە نەدەکرد،[1] ئەو بە کورتبینیو نەخۆشیە دەروونیەکانیەوە گیرۆدە ببوو، وەکو حەزکردنی لە تۆڵە سەندنەوە، فێڵ کردن موسڵمانان، ناکۆکیو ناتەباییە کۆنەکانی نێوان خۆیو خوارەزمیەکانی لەبیرنەدەکردنو دەیەویست پایەکانی سەڵتەنەتی ئەو وڵاتە لەجێی خۆیان ڕۆبچن، ئەوەی لەبیرچوبۆوە کە ئەوان لە نێوان ئەوو تەتارەکاندان، وێڕای ئەمەش ئاژاوەو فیتنەی لە نێوان (غیاث الدین)و (ئیغان تائیسی)ی خاڵیدا هەڵایساند، (ئیغان) پیاوێکی گەورە بووو لە فێڵەکانی جەنگدا بیروڕای هەبوو، وەکو فەرماندە لەنێو سوپای (غیاث)دا کاری دەکرد، (غیاث)یش بەبێ پرسو ڕاکانی ئەو هیچ فەرمانێکی نەدەبڕیەوە، خەلیفە (الناصر) نامەی بۆ نارد، هەڵینابوو شۆڕش لە دژی

---

١ قصة التتار ص: ٦٨.

(غیاث) بکاتو دەسەلاتداری لە لا گەورە دەکرد، ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدا خەلیفە پشتیوانی لە (ئیغان تائیسی) دەکاتو (غیاث الدین) لە حوکمگێڕان دوور دەخاتەوە، خەلیفە دەربەستی ئەوە نەبوو کە ئاگری ئەم ئاژاوەیە لە وڵاتێکی هاوسێی ئەو بەردەبێت کە بە گرنگترین خاڵی ستراتیژی خۆیشی حیساب دەکرێت.

پرۆژە پیلانگێڕیەکەی (خەلیفە) سەری گرت، جەنگ لە نێوان (غیاث)و خاڵیدا دروست بوو، کوشتارێکی گەورە ڕوویدا، ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان لە شەڕەشیری براکوژیدا کوژران، (ئیغان تائیسی)ی خاڵی (غیاث الدین) تێکشکاو ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانی کوژرانو دیلکران، خۆیو ئەوانەی بە پشتیەوە مابوونەوە بەرەو (ئازەربایجان) هەڵاتن، ولا حول ولا قوة الاّ بالله.[1]

(خەلیفەی عەباسی) نەك هەر بە واجبی خۆی هەڵنەستاو لە دژی مەغۆلەکان پشتگیری موسڵمانانی نەکرد، بەڵکو ببووە کوینویەكو لە پشتی ئەوانەی ڕادەکێشا کە خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوە ئامادە دەکرد، مێژوونووسان زۆر زەمبی ئەم خەلیفەیان کردووەو ڕەخنەی توندو تیژیان ئاڕاستەی خوخدەکانی کردووە، (إبن الأثیر)ی مێژوونووس دەربارەی قسە دەکاتو دەڵێ: (هەڵسوکەوتی لە بەرامبەر ژێردەستەکانیدا ناشیرینو قێزەون بوو، ستەمکار بوو، لە ڕۆژگاری ئەودا (عێراق) وێران دەبوو، دانیشتوانەکەی بە نێو وڵاتدا پەرتەوازە دەکرد، موڵكو ماڵی لێ زەوت دەکردن، هەر شتێکی کردبایە دەواییە لێی پەشیمان دەبۆوە، وێنەی ئەمە: میوانخانەیەکی ڕۆژوشکاندنی لە (بەغدا) بۆ خەڵك دروست کرد تا ئێوارەی ڕەمەزانان لەوێدا ڕۆژوەکانیان بشکێنن، ئەمە ماوەیەکی خایاند، بەلام سەرەنجام وازی لێ هێنا، ئینجا میوانخانەیەکی بۆ حاجیان دروست کرد لە بەغدا، ئەویش ماوەیەکی خایاند بەلام دوایی دایخست. باجو پێتاکی تازە بڕیار لەسەر دراوی لادا بە تایبەتی لەسەر بەغدا، پاشان داینایەوە، گەورەترین هیوایەتی فندەق هاویشتنو کۆتربازیو شەروالی گەنجانە بوو، خەڵکی عێراقو غەیری عێراقیش ئەم دابو نەریتەی ئەویان ڕەچاوکرد، خوگرتنی خەلیفە بەم جۆرە شتانەوە لە کارە هەرە سەیرو سەمەرەو سەرسوڕهێنەرەکان دەژمێردرێن،[2] کەواتە: خەلیفە (الناصر) دوژمنی خوارەزمیەکان بووو لە بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکاندا هاریکاری نەکردن، بەڵکو کاری کرد بۆ هەڵایساندنی ئاژاوە لەنێو ڕیزی موسڵماناندا، (خەلیفە) یەکێك بوو لە

---

١ قصة التتار ص: ٧٠.

٢ الكامل في التاريخ ١٢/١٨١، رجال الفكر والدعوة ١/ ٢٧٥.

هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی خوارەزمی، بێگومان دەست درێژی خوارەزمیەکان لە پێشدا بۆ سەر خیلافەتی بەغدا یەکێك بوو لە هۆیەکانی لاوازبوونیان‌و ڕانەوەستانی خەلیفە لەگەڵیان لە دژی مەغۆلەکان.

**١٠ـ دیارنەبوونی زانایان:**

ڕۆڵی زانایان‌و شەرعزانان لە بەدیهێنانی سەرکەوتنە مەزنەکانی ئوممەتدا هەمیشە دیارو بەرچاو بووەو لە لایەن حوکمڕانە ڕەسەنەکان‌و گەلی بە ویژدانیش جێگەو پێگەی پڕ ڕێزو حورمەتیان پێ ڕەوا دیتراوە، دەبینین هەر زانایان بوون چەندین کتێبیان سەبارەت بە گرنگی‌و گەورەیی جیهادو فیداکاری‌و ژیاننامەی پێغەمبەری سەرکردە (ﷺ)یان لە جەنگەکانداو مێژووی سەرهەڵدانی ئیسلام‌و سەرکەوتنەکانی ئوممەتیان بەسەر دوژمناندا نووسیوەتەوە، وەك دەبینین لە نێو دەوڵەتی خوارەزمیشدا وتاربێژانی مزگەوت‌و زانایان‌و شەرعزانان لەگەڵ تەواوی چینەکانی خەڵکدا جموجۆڵیان دەکردو بە هاوشانی سەربازان لەنێو گۆڕەپانی جەندا بەگژ دوژمناندا دەچوونەوە، بەڵام دەشبینین کە دەوڵەتی خوارەزمی هیچ جێگەو پێگەیەکی بە شکۆی بە زانایان نەبەخشیبوو، بەڵکو زانایان لە نێوەندی دەسەڵاتدا بوونیان هەر نەبوو، ئەوان ڕۆڵ‌و کاریگەری زانایانیان پەك خستبوو، ئەمەش یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی ڕمانی دەوڵەتی خوارەزمی.

**١١ـ پرۆژەی (مەغۆل):**

(جەنگیزخان)ی سەرکردەی پرۆژەی مەغۆل دەستی بە تەواوی هۆکارەکانی سەرکەوتنی مادی‌و قانونیەوە گرتبوو، وێنەی: سەرکردایەتیەکی هاوسەنگ‌و ڕونی ئامانج‌و ئامادەکردنی تاك‌و سەرکوتکردنی هۆیەکانی پەرتەوازەیی لە نێو گەلانی مەغۆلیداو دەستگرتن بە نەریتەکانی کۆمەڵایەتی‌و یەکڕیزی‌و یەکدەنگی‌و دابەشکردنی ڕۆڵی تاکەکان، نەخشەی ساغ‌و سەلیم‌و بەڕێوەبەرایەتیەکی سەرکەوتوو، ڕێکخستنێکی دامەزراوو چەندین هۆکاری تریش، وێڕای ئەمەش هەرەس هاتنی بارودۆخی وڵاتانی ئیسلامی بە هۆی فەرامۆش کردنی شەریعەتی پەروەردگاریان، دەکرێ لەم چەند خاڵانەی دادێن هۆکارەکانی سەرکەوتنی مەغۆل بەسەر دەوڵەتی خوارەزمیدا کورت بکەینەوە:

أ‌- زیرەکی‌و فامیدەیی چەسپاوی‌و خۆڕاگری‌و خۆبەکەمزانی (جەنگیزخان).

ب- زانیاری تەواوی لەسەر بارودۆخی مەملەکەتەکەی (خوارەزمشا)، وەرگرتنی ئەو زانیاریانە لە زاری بازرگانە موسڵمانەکان‌و تەرجەمەکەرەکان‌و شارەزایانی ڕێگاو بانەکان ئەنجام دەدا.

ج- (یاسا)ی (جەنگیزخانی)و ڕۆڵی حوکمە توندو تیژەکانی لە پاراستنی یەکڕیزی مەغۆلەکانو سەرپێدانەواندنیان بۆ یەك بڕیارو بەس.

د- ڕێکەوتنی تەواو لە نێوان سەرکردەکانیو ڕۆڵەکانیدا، بە جۆرێك دوای دەرکرانی ڕای (جەنگیزخان) کەس بۆی نەبوو رایەکی تر ڕاگەیەنێ، هەر هەموویان تێکڕا ئامرازی جێبەجێکردنی فەرمانەکانو پێکانی ئامانجەکان بوون، هیچ کامێکیان بیری سەربەخۆیی یان بیری سەرکەوتنی بەسەر بەرامبەرەکەیدا لە زەینیدا گەلاڵە نەدەبوو.

س- یەکێتی زمانو دابو نەریتو یەك ئامانجی لە نێوان سەربازانی (جەنگیزخان)دا، خوارەزمیەکان لەم ڕووەوە هەژار بوون.[١]

ع- بەهێزی سیستەمی کۆمەڵایەتیو جەنگی مەغۆلەکان لە بەرامبەر خوارەزمیەکاندا، ئەوان گرنگیان بە چۆنیەتی دەدا نەك بە چەندێتی، دەسەڵاتی باڵا هی (جەنگیزخان) بوو، دوا بڕیار لە هەموو کارێکی گەورەو بچووکدا بە دەست ئەو بوو، بە خودی خۆی سەرپەرشتی ڕێکخستنی سوپاو ئامادەکردنو ڕاهێنانو کێشانی نەخشەی شوێنەکانی جەنگو هەڵبژاردنی کاتی لەبارو گونجاوی ئەنجامدانی جەنگەکان دەکرد، سوپای مەغۆلی بە باشترین شێوازی سەربازی ڕێکخرابوو.[٢]

ئەوەی تا ئێستا بەسەری ڕابوردین، بریتی بوو لە گرنگترین هۆکارەکانی هەرەس هێنانی (دەوڵەتی خوارەزمی)، ئەم هۆکارانە لە نێو یەکتردا ئاڵقەبەندنو چوونە نێو یەکترەوەو هەر یەکەیان کاری لە تەنیشتەکەی کردووە، هۆکاری سیاسی کار لە هۆکاری سەربازی دەکاتو بە پێچەوانەشەوە دروستە.

### شەشەم: مردنی جەنگیزخان:

(جەنگیزخان) لە زستانی ١٢٢٥ی زاینیەوە تا هاوینی ١٢٢٦ی زاینی لە بارەگای سەرەکی ئیمپراتۆریەتە گەورەکەیو لە لای ڕووباری (تولا)وە گوزەراندی، دەورەی بە هەڤاڵە متمانەپێکراوو پەسەندکراوەکانی گیرابوو، پێی گوتن: (بە ڕاستی ئێوە لەو کارە ڕاستو دروستانەدا کە پێویست بوو ئەنجام بدرێن یارمەتیتان دامو هێزو تواناتان پێ بەخشیم، لە کاتی کردنی کاری چەوتیشدا دەستتان گرتمو نەتان هێشت ئەنجامیان بدەم، بە هۆی ئەو ڕەوشتە بەرزەی ئێوەوە من بەم پلە بەرزو باڵایە گەیشتم).[٣]

---

١ تأريخ المغول، عباس إقبال ص: ١٣١.

٢ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ٢٤٠_٢٤٤.

٣ جنكيزخان ص: ٢٧٥.

(جەنگیزخان) کارێکی مابوو ئەنجامیدا، ئەویش سزادانی (ئۆهس-هسیا)ی پاشای (شی-شیا)ی مەملەکەتی (تانغۆتی)ی هاوسنووری (تبت) بوو، هەرچەندە مەملەکەتەکەی کەوتبووە ژێر ڕکێفی قەڵەمڕەوی مەغۆلەکانەوە بەڵام پاشای (تانغۆت) ڕەتی کردبۆوە سوپاکەی لە جەنگی گەڵ خوارەزمەکاندا بەشداری بکات، (جەنگیزخان) لەو ڕۆژەوە بە ئاراستەی خۆرئاوا بەڕێکەوت پەیمانی دا لە بەرامبەر ئەم نافەرمانیەدا بە دەستی خۆی سزای پاشای (تانغۆت) بداتو لێپرسینەوەی توندی لەگەڵ ئەنجام بدات، ئەمەو لە ساڵی ١٢٢٦زاینیدا هەر هەموو سوپاکەی کۆکردەوە، شایانی باسە وێڕای حەزی تۆڵە چەند پاڵنەرێکی تریش هەبوون بۆ داگیرکردنی ئەو هەرێمە، چینیەکانی ئیمپراتۆریەتی (کین=زێڕ) پاش بەجێهێشتنی ئەو وڵاتە لە لایەن جەنگیزخانەوە تەکانیان بە خۆداو بەشێکی زۆری هەرێمەکانی وڵاتەکەیان لە ژێر چنگی مەغۆلەکان دەرهێنابۆوە، ژەنەڕاڵ (مۆخۆلی)ی مەغۆلی کە لە لایەن جەنگیزخانەوە بەڕێوەبردنی کاروباری چینی پێ سپێردرابو کەوتبووە نێو شەڕێکی دەستەویەخەی بەردەوامی چینیەکان، جەنگیزخان دەیزانی وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە چینیەکانی وڵاتی (کین- زێڕ) لەم بارودۆخەدا بە هۆی هۆکاری جوگرافیەوە ئەگەر مەحاڵیش نەبێ زۆر قورس دەکەوێت لەسەریان، لەم نێوەندەدا کە دەیبینی دەسەڵاتی مەغۆلی لە وڵاتی (تانغۆت)دا شلۆقەو ناجێگیرە، بۆیە هەموو خەمەکانی لەسەر ئەو وڵاتە چڕ کردنەوە، ئەم سوپایەی ڕێکخستو بۆ پێکانی ئامانجەکەی کەسی لە جەنەڕاڵەکانی نەکردە سەرکردە، بەڵکو بۆ خۆی - لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی بەرەو ژوور چووبوو بوو بە پێشەنگی هێرشەکە، ئەم بڕیارە نیشانمان دەدا - کە جەنگیزخان تا ئەمڕۆش هێزو وزەی ئەندامیو ژیریو عەقلی پێماوە، جەنگ لە پایزی ١٢٢٦ی زاینیدا دەستی پێکرد، سەرەتا سەرکەوتنی باشیان تۆمارکرد، بەڵام لە وەرزی زستانداو لە گەرمەی ڕاوو شکاردا ئەسپەکەی (جەنگیزخان) لە ترسی ئەسپە کێویەکان - کە لەو ناوچانەدا بوونیان زۆر بوو - ڕەویەوەو سەرسمێکی بردو (خانی مەزن)ی مەغۆلی بە زەویدادا، (خان) لە ئەنجامی ئەمەدا تووشی نەخۆشیەکی توندو تیژ بوو، تینو تاوی نەخۆشیەکەی کاریگەری زۆری لەسەر دانا، بانگهێشتی کوڕەکانی گەلیو ژەنەڕاڵە بە تەمەنەکانی کردو سەبارەت بەو کارانەی لە ئێستادا ئەنجامدانیان پێویستە ڕاوێژی پێکردن، یەکێکیان گوتی: گەلی (تانغۆت) گەلیکی شارستانیەو لە شاردا نیشتەجێنو فێری بەجێهێشتنی شار نین، ئێستا وا گونجاوە بۆ وڵاتی خۆمان بگەڕێینەوە، ئەندامانی کۆبوونەوەکە هەموویان لەسەر ئەم ڕایە پێکهاتن، بەڵام جەنگیزخان ڕەتی کردەوەو گوتی: ئەگەر ئێمە لە ئێستادا ئێرە بەجێ بێڵین

تانغۆتیەکان دەڵێن لێمان دەترسێن، من بەجێی ناهێڵمو هەر لێرە چاسەرەی نەخۆشیەکەم دەکەم، هەر ئێستا نامەیەکیان بۆ دەنێرم، با بزانین چۆنمان وەڵام دەدەنەوە، ئەمەش نێوەرۆکی نامەکەیە: (بەڵێنت دا ببی بە دەستی ڕاستم، بەڵام بۆ جەنگی خوارەزمیەکان لەگەڵم نەهاتی، بەم سەرپێچیەت سوکایەتیت ئەنجام داوە، ئێستا کە وڵاتی خوارەزمیەکانم داگیرکردووە هاتووم داوات لێدەکەم داوای لێبوردنم لێ بکەی).

پاشای (تانغۆت) بە چەند دەستەواژەیەکی ئیهانە ئامێز وەڵامی (جەنگیزخان)ی دایەوە: لەبەر ئەوە (جەنگیزخان) زۆر توورە بووو یەك بەخۆ هاواری کرد: (ئایا دوای ئەم سوکایەتی پێکردنە دەگونجێ لێرە دوورکەومەوە؟! من سوێند بە ئاسمانی هەمیشەیی دەخۆم ئێرە بەجێ ناهێڵم ئەگەر سەریشم تێدابچێ).

سوێندەکەی بردە سەر، وڵاتو دەوڵەتی (تانغۆت)ی ڕوخاند، بەڵام بە دوای ئەمەدا مرد.

(جەنگیزخان) لەو کاتەوە لەڕاودا لەسەر وڵاخەکەی بەربۆوە نەخۆش کەوتبوو هەستی پێکردبوو ئەم نەخۆشیە تەڕایی ژیانی لێ هەڵدەمژێ.[1] کاتێك نەخۆشیەکە تینی بۆ هێنا و زانی ئەم کاتە کاتی سەرەمەرگیەتی، بانگهێشتی کوڕەکانی کردو وەسێتی بۆ کردن کە (ئۆکتای) کوڕی لەبەر ئەم سیفەتانەی کە تێیدا بەرجەستەن لە جێی خۆی دادەنێ: (ڕای بەهێزو پتەوی، عەقڵی قورسو کاملی)، لەبەر ئەمە (ئۆکتای) کرد بە وەلی عەهدی خۆیو کوڕەکانی لەسەر ئەم دیاریکردنەی باوکیان پێکهاتن، ئەمەش دەقی وەسێتنامەکەی جەنگیزخانە بۆ کوڕەکانی: (ئەی ڕۆڵە چاکەکانم بزانن گەشتی من بەرەو ئاخیرەت نزیك بۆتەوە، ئەجەلی مەرگم هاتۆتە پێشەوە، من بەهێزو توانای خوداوەندەکانو پشتیوانی ئاسمان وڵاتێکی بەرفراوانم گرتووە، بە جۆرێك ئەگەر یەکێك لە ناوەندی ئەو وڵاتەڕا بەرەو سنوورێکی بڕوا ماوەی ساڵێکی پێ دەچێ، ئەم کارەی ئەنجامم داوە لەبەر خاتری ئێوە بووە، بۆ ئێوەم ئامادە کردووە، ئەی ڕۆڵەکانم، جا وەسێتی من بۆ ئێوە ئەمەیە: لە دوای من خۆتان بە تێکردنی دوژمنانو بەرزکردنەوەی هاوەڵان خەریك دەکەن، هەمووتان لەسەر یەك ڕاوبۆچوون کۆدەبنەوە، بەشکم لە نازو نیعمەتو بەختەوەریدا بژینو لەزەت لە مەملەکەت وەربگرن).[2] پاشان جەنگیزخان لە نیوەی یەکەمی ڕەمەزانی ٦٢٤ کۆچی بەرامبەر ئۆغستۆسی ١٢٢٧ زاینی، لە هەرێمی (سوچینی) نزیك شاری (تسن جو) گیانی دا بە

---

١ جنكيزخان ص: ٢٧٧، ٢٧٨.

٢ المغول في التأريخ، د. العباد ص: ١٣٨.

دەستەوە، تەرمەکەیان بەرەو (مەنغۆلیا) بردەوەو لەو شوێنەی ڕووباری (ئۆنۆن‌و کۆرلین)ی لێ هەڵدەقوڵێ خرایە گۆڕەوە، بەڵام بە گوێرەی (کلتوری مەغۆل) شوێنی گۆڕەکەی بوو بە ڕازێکی نێو خەزێنەی ڕازەکان.

# فەسڵی دووەم

## ڕوخاندنی (بەغدا) لە لایەن مەغۆڵەکانەوە

### باسی یەکەم: جێنشینەکانی جەنگیزخان:

### یەکەم: دابەشکردنی مەملەکەتەکانی جەنگیزخان:

(جەنگیزخان) ژنگەلو کەنیزەکگەلێکی فرەی هەبوون، (یەسۆنجین)ی هاوسەری بەسەرهەمواندا هەڵبژاردبوو، هەر لەبەر ئەمە کوڕەکانیشی خستبوونە پێش کوڕەکانی ترەوە، لە کۆی (٩) کوڕی چواریانی لە (یەسۆنجین) ببوونو ناویان (جوجی، جوغتای، ئۆکتای، تۆلۆی) بوو، بابیان گرنگترین کاری پێ دەسپاردنو لە بەڕێوەبەرایەتی کردنی ئیمراتۆریەتە فراوانەکەیدا بە تەواوەتی پشتی پێ دەبەستن، بۆ وێنە: دەبینین (جوجی)ی کوڕە گەورەی دەکاتە سەرپەرشتیاری کاروبارەکانی نێچیرەوانیو ڕێکخستنو ڕازاندنەوەی کۆشکو تەلارەکان، (جوغتای) کوڕیشی دەکاتە سەرپەرشتیاری ڕێکخستنی کاروباری قەزاوەتو چەسپاندنی حوکمو یاساکانو سەپاندنی سزاکان بەسەر تاوانکارانو سەرپێچیکەراندا.

(ئۆکتای) کوڕی سێهەمی کردبووە سەرپەرشتیاری کاروباری بەڕێوەبردنو دارایيو هەڵسوڕاندنی بەرژەوەندیەکانی خەڵك.

(تۆلۆی)یشی ڕاستەوخۆ کردبووە سەرپەرشتیاری کاروباری سەربازیو ئامادەسازی سوپاکان، بۆیە ناسناوی (ئۆلغ نۆیان)[1]ی بەسەردا براوە.

هێشتا (جەنگیزخان) لە ژیاندا بوو، بڕیاریدا ئیمپراتۆریەتەکەی بەسەر ئەم (٤) کوڕەیدا دابەش بکات، چونکە بە ڕای ئەو ئەمە باشترین هۆکارە بۆ ڕاهاتنی کوڕەکانی لەسەر حوکمەتداریو هەڵگرتنی باری بەرپرسیاریەتی، دابەشکردنەکە بەم شێوەیە بوو:

١- بەشی (جوجی) کوڕە گەورەی (جەنگیزخان):

وڵاتی نێوان ڕووباری (ئەرتەش)و کەنارە باشووریەکانی دەریای قەزوێن بەر (جوجی) کەوت، ئەم وڵاتی (قەبقاج)و دەشتە کاکی بە کاکیە: بە هۆی ئەوەی ڕەنگی تاوڵی

---

١ ئۆلغ نۆیان واتە: فەرماندەی گەورە.

سەربازگەکانی زەرد بووو بە ناوی (هۆزی زێڕین)ەوە بە ناوبانگ بوو، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە نەتەوەی تورك و تورکمان پێکهاتبوو،[1] کاتێك (جوجی) پێش باوکی مرد، (جەنگیزخان) بڕیاریدا ئەم هەرێمانە بخاتە بەر دەستی (باتون ی کوڕی جوجی)، (باتون) بە سیفەتەکانی هەست ناسکی و شیرین زمانی و بیرتیژی بەناوبانگ بوو، ببوە سەرداری ماڵی (جەنگیزخان) لە کاتی هەڵایسانی کێشمەکێشی گرتنی کورسی ئیمپراتۆریەتدا ڕۆڵێکی کاریگەرو یەکلاکەرەوەی بینیبوو.

٢- بەشی (جوغتای): وڵاتی (ئۆیغۆر)و هەرێمەکانی (ئەودیو ڕووبار)و (کاشغر)و (بەلَخ)و (غەزنە)شی خستە ژێر دەسەڵاتی (جوغتای)ەوە.

٣- بەشی (ئۆکتای)ی وەلی عەهد: بەشی ئەو لە بەشی براکانی کەمتر بوو، ناوچەکانی چیای (تارباجای)و دەوروبەری دەریاچەی (ئالاجۆل)و بەستاوی ڕووباری (یەمیل)ی هەڵکەوتووی خۆرئاوای (مەنغۆلیا) بەر (ئۆکتای) کەوتن.

٤- بەشی (تۆلۆی): (مەنغۆلیا)ی وڵاتی چەکەو بنەچەکەی (جەنگیزخان) کە دۆڵ و شیوەکانی ڕووباری (کرۆلین)و (ئۆنۆن)و (ئۆرخۆن)و هەرێمی (کەراکورم) لەخۆ دەگرێت بووبە بەشی (تۆلۆی)ی کوڕی هەرە بچووکی (جەنگیزخان)، (تۆلۆی)ی بە گوێرەی داب و نەریتی مەغۆل چونکە کوڕی بچووکی خانە دوابەدوای مردنی باوکی بوو بە سەروەسێتی کورسی دەسەڵات، ئەو بە یاریدەی (٣) ڕاوێژکار تا هەڵبژاردن و دانانی جێنشینی (جەنگیزخان) بۆ ماوەی (٢) ساڵ لە (٦٢٤ـ٦٢٦ کۆچی بەرامبەر ١٢٢٧ـ١٢٢٩)ی زاینی کاروباری ئیمپراتۆریەتی بەڕێوەبرد.[2]

### دووەم: هەڵبژاردنی (ئۆکتای) بە خانی گەورەی (مەغۆل):

کورسیەکەی (جەنگیزخان) دوای مردنی ماوەی (٢) ساڵ بە خاڵی مایەوە، پاشان میرە گەورەکان بە چاکیان زانی لە پێناوی چاکسازی کاروباری دەوڵەت و بەرگرتن لەو درزو کەلێنانەی خەریکە لە ئیمپراتۆریەت پەیدا دەبن، بە پەلەو بێ دواکەوتن خانێکی نوێ بۆ خۆیان دیاری بکەن، هەر هەموویان لەسەر ئەم بڕیارە یەکدەنگ بوون، دەستیان بە ئامادەکاریەکانی گرێدانی کۆنگرەی ڕاوێژ (کۆریلتای) کرد، بۆ ئەم مەبەستە نوێنەرو جارچیەریان بە هەموو لایەکی مەملەکەتدا بڵاو کردنەوە، میرەکان و سەرکردەکانی سوپا

---

١ السلوك للمقريزي، نقلا عن المغول، د، الصياد ص: ١٦٤.

٢ المغول للصياد ص: ١٦٥.

هەموویان هاتنە (مەنغۆلیا)، تا (٣) ڕۆژ لە نێو بەزمو ڕەزمی خۆشیو خواردنەوەو گۆرانیو سەمادا ڕایان بوارد، دوای ئەمە سەبارەت بەهەڵبژاردنی (خانی نوێ) دەستیان بە وتوویژو ڕاگۆڕینەوە کرد، دەرەنجام بە یەکدەنگی بڕیاریاندا(ئۆکتای) لەسەر تەختی ئیمپراتۆریەت دانێن، هەرچەندە (ئۆکتای) دەیویست بە بڕوبیانوی سامناکی پۆستەکەو ناشایستەیی خۆی بۆ ئەم پۆستە خۆی بدزێتەوەو، لەم بەرپرسیاریەتیە خۆی دورخاتەوەو دەیگوت کە (تۆلوی)ی برا بچووکی شایستەترەو بەپێی دابو نەریتی (مەغۆل)یش ئێستا لە جێی باوکی دانیشتووەو کاتی خۆشی زیاتر لەگەڵ باوکی هەڵسوکەوتی کردووەو زیاتر بە بنەما قانونیەکان شارەزایە، بەڵام براکانیو خزمەکانی هەر هەموو دەروازەکانی بەهانەو بڕو بیانوویان بەسەردا داخستنو پێداگیریان لەسەر وەرگتنی ئەم پۆستە کردەوە، لەگەڵ ئەمەشدا وەسێتی سەرەمەرگی باوکیان بەبیر هێنایەوە — کە چۆن ویلایەتی عەهدی بۆ ئەو بەجێهێشتووە—، دەرەنجام بە بڕیارو ویستی ئەوان ڕازیبوو، لەو کاتەدا ( جوغتای) دەستەڕاستی (ئۆکتای) برای گرتو (تۆلوی)یش دەستە چەپی گرتو (ئۆتجکین)ی مامیشی پشتێنەکەی گرتو بردیان لەسەر کورسی (خان)یان دانا، ئامادەبووانی ناوەوەو دەرەوەی کۆکشی ئیمپراتۆریەت بە دەنگی بەرز هاواریان کرد: (ئۆکتای بوو بە خاقان)، واتە بوو بە خانی گەورەی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل، ئەم ڕووداوە لە بەهاری ٦٢٦ کۆچی بەرامبەر ١٢٢٩ی زایینیو لە نێو کۆنگرەی گشتی مەغۆل (کۆریلتای)دا بوو، ئینجا خان — بە پێی دابو نەریتی مەغۆل — پارەو سامانی بەسەر خزمەکانیو هۆزەکاندا بەشیەوە، فەرمانیدا ماوەی (٣) ڕۆژ لەسەر یەك خوردو خۆراك بە خێری (جەنگیزخان) بدرێت بە خەڵك، (٤٠) کچی شۆخو شەنگی لەنێو کچە میرەکانی هاوەڵی هەڵبژاردنو بە جوانترین پۆشاکی بە نرخو زێڕو جەواهێرەوە ڕازاندنیەوە، ئینجا بە سواری ئەسپی ڕەسەن بەرەو لای (جەنگیزخان)ی بەڕێکردن[1] ـ بە پێی بیروباوەڕی خۆیان کوشتیانن ـ، هەروەها (ئۆکتای) لەگەڵ چووە سەر عەرشی دەسەڵات بڕیاریدا دەبێ هەموو فەرمانەکانی (جەنگیزخان) جێبەجێ بکرێنو لە گۆڕانو دەستکاری بپارێزرێن، لێبوردنی گشتیشی بۆ هەموو ئەوانە دەرکرد کە پێش ئەوەی لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشێ تاوانو گوناهەیان ئەنجام داوە، هەڕەشەی سزای توندو تیژیشی ئاڕاستەی هەموو ئەو کەسانە کرد کە دوای ئەوە بە نیازن سەرپێچی قانونەکان دەکەن، زۆریشی بایەخ بە تەواوکردنی ئەو پرۆژانەدا کە باوکی بۆ داگیرکردنی وڵاتان

---

١ المصدر نفسه ص: ١٦٧.

دایرشتبوونو هێشتا تەواوی نەکردوون، لەبەر ئەمە سوپای پێویستی بۆ داگیرکردنی ئێرانو ئەورووپاو چین سازوباز کرد.[1]

**سێهەم: مەغۆڵەکان لەسەر دزەکردنیان بۆ نێو ولاتانی ئیسلامی بەردەوام دەبن:**

خودی هەڵبژاردنی (ئۆکتای) کوڕی (جەنگیزخان) بە خانی گەورەی (مەغۆل) جاڕدانێك بوو بۆ هەڵکوتانی هێرشێکی تازەی مەغۆلەکان بۆ سەر هەرێمەکانی دەوڵەتی خوارەزمیو کۆتایی پێهێنانی یەکجاری ئەو دەوڵەتە، هەرچەندە تاکو ئێستا ولاتی (ئەودیو ڕووبار) لە لایەن مەغۆلەکانەوە داگیرکراوەو پێش ئەمەش چەند هێرشێکی ڕێکوپێکی نیزامی کراوەتەسەر هێزەکانی (جلال الدین منکبرتی)، جار هەبووە (جلال الدین) سەرکەوتووەو جاریش هەبووە مەغۆلەکان سەرکەوتوون،[2] بەلام هەرچۆنێك بێت ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە بەدەست نەهاتبوو، بۆیە (ئۆکتای) سەرکردایەتی کردنی هێرشی سەر (ئێران)ی خستە ئەستۆی (جوزماغون نۆیان)ی سەرکردەی بە ناوبانگ، ئەویش بە سوپایەکی (٥٠) هەزار سەربازیەوەو بە هاوەلایەتی ژمارەیەك سەرکردەی سەربازی شارەزای مەغۆل بەڕێکەوت، پێشدا بە تێکڕایی لەسەر داواکاری میرو حوکمڕانەکانیان لە (خوارەزم) بەرەو (تورکستان) چوون، لەم هەرێمانەدا ژمارەیەکی زۆری دیلو گیراوی دوژمنانی خۆیان موسڵمانان لەگەڵ خۆ ڕەپێچەکدانو بەمە ژمارەی سەربازانی ئەم هێرشە خۆی لە (١٠٠) هەزار سەربازدا،[3] ــ مەغۆلەکان لەم هێرشەیاندا بۆ سەر ئێران ــ وەك لە پێشدا ڕابورد توانیان سوپای (جلال الدین منکبرتی) تێك بشکێنن، پاش نواندنی ڕۆڵێکی پاڵەوانانەو بەرەنگاربوونەوەیەکی قارەمانانە لە لایەن (جلال الدین منکبرتی)یەوە، مەغۆلەکان توانیان لەسەر سەرختترینو مەترسیدارترین دوژمن ڕزگاریان ببێتو بەسەریدا زاڵ بن ئیدی لەمەودوا هەموو دەروازەکانی پرۆژەی داگیرکاری لەبەر دەمیاندا ئاوەلابوونو بەبێ ئەوەی هیچ بەربەستو کۆسپێك بێتە سەر ڕێگەیان، بە سوكو ئاسانی توانیان هێرشو پەلامارەکانیان بۆ سەر زۆربەی ولاتانی ئیسلامی دەست پێ بکەنو،[4] بە دەستی نەگریسیان کاولو وێرانیان بکەن، سەرکردەیەکی سوپای خوارەزمی بە ناوی (ئۆرخان) لە دواهەمین هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر (جلال الدین)و سوپاکەی توانی گیانی (جلال الدین) پێش ئەوە بەرەو (کوردستان) ڕابکا لە چەنگی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٦٧.
٢ المصدر نفسه ص: ١٧١.
٣ المصدر نفسه ص: ١٧١.
٤ المغول للصياد ص: ١٧٩.

مەغۆلەکان ڕزگار بکات، (ئۆرخان) پاش کوژرانی (جلال الدین) بە خۆیو (٤) هەزار سەربازی خوارەزمی گەیشتە (ئەربیل)، لەوێڕا بە تاکی تەنیا بەرەو (ئیسفەهان) ڕۆیشت، لەوێ لە لایەن مەغۆلەکانەوە کوژرا، پاش کوژرانی –دواهەمین سەرکردەی خوارەزمی– سەربازە خوارەزمیەکان لە چیاکانی (کوردستانو جزیرەو شام)دا بڵاوبوونەوە، ژمارەیەکیان لە لایەن کوردەکانو عەرەبە خێڵەکیەکانەوە کوژران، ئەوانی ماشنەوە بڕیاریاندا ببنە سەربازو خزمەتگوزاری سوڵتانەکانی ئەیوبیو سلجوقیەکانی ڕۆمی، ماوەیەکی درێژخایەن بوونە مایەی نانەوەی ئاشوبو ناڕەحەتی لەو وڵاتانەی کاریان تێدا دەکرد.[١]

مەغۆلەکان هێزەکانی خۆیان کردبووە (٣) سوپای سەرەکی:

سوپای یەکەم: (دیاربەکرو ئەرز ڕۆمو میافارقینو ماردینو نەسیبینو سنجار)ی داگیرکرد، سوپاکە تا کەنارە ئاوەکانی ڕووباری فورات پێشڕەوی کرد، لە کوشتو کوشتاری ڕەشەخەڵکو تاڵانو بڕۆدا زۆریان تێپەڕاند، دانیشتوان هێندە ترسی ڕێ نیشبوو تەنانەت زاتیان نەکرد بەرگریەکی کەمیش لە خۆیان بکەن، هەندێك چیرۆكو بەسەرهات گێڕدراونەتەوە مرۆڤ بە خوێندنەوەو بیستنیان کزەی لە جەرگی دێتو مەراق دایدەگرێت، خۆ ئەگەر مێژوونووسێکی گەورەو باوەڕپێکراوی وەك (إبن الأثير) نەینوسیبانایەوە دەمانگوت ئەمانە هەڵبەستراون.[٢]

(إبن الأثير) دەڵێ: ژمارەیەك بەسەرهات دەربارەی ئەو – مەغۆل – انە گێڕدراونەوە، خەریکە گوێ بە درۆیان دادەنێو بە قایان پێناکات کە چۆن خودا (جل جلاله) ترسو بیمی ئەوانەی خستۆتە دڵو دەروونی خەڵکەوەو لە بەرامبەریاندا زەندەقیان چووە، تا ئەوەی گوتراوە: سەربازێکی مەغۆلی دەچووە نێو گوندێك یان کۆڵانێكو وا ڕێدەکەوت خەڵکێکی زۆری لێ دەبوو، یەك بە یەك پێیاندا دەهاتو دەیکوشتنو کەسێك لەو هەموو خەڵکە جەسارەتی نەدەکرد ڕاست بێتەوەو دەستێك بۆ مەغۆلەکە درێژ بکات.[٣]

بەڵام سوپای دووهەم: ڕووی لە شاری (بەدلیس) کردو پاش ئەوە گرتی سوتاندی بەرەو شاری (خەلات) ڕۆیشتو دەستی بەسەر ژمارەیەك قەڵای دەوروبەری ئەوێو چەند شوێنێکی تردا گرت.

---

١ المصدر نفسه ص: ١٧٩.

٢ المغول للصياد ص: ١٧٩.

٣ المصدر نفسه ص: ١٨٠.

سوپای سێهەم: بەرەو هەرێمی (ئازەربایجان) ڕۆیشت، دەستی بە پەلاماركردو شار بە دوای شار داگیری كردن، لە كۆتاییدا بڕیاریدا (تەورێز)ی پایتەخت بگرێت، ئەمەو لە سەرەتای ساڵی ٦٢٩ی ك/ ١٢٣٢ زاینیدا بەبێ دەستكردنە خۆی بە دەستەوەدا، هۆكاری ئەمەش ئەوە بوو: خەڵكی ئەم شارو هەرێمانە نێوانیان لەگەڵ (جلال الدین) خۆش نەبوو، كاتێك زەبوونی (جلال الدین)یان بۆ دەركەوت، شۆڕشیان لە حوكمڕانەكانیان كردن و كوشتنیانن و سەریان لە لاشە كردنەوەو بەدیاری بۆ مەغۆلەكانیان ناردن، هێشتا مەغۆلەكان نەگەیشتبوونە دەروازەكانی تەورێز، خەڵك بە پێشوازیەوە چوون و دیاری هەمەڕەنگیان لە قوماش و كەلوپەلی تر پێشكەشی سەركردەكانی (مەغۆل) كرد، بەڵێنیان دا ساڵانە سەرانەیەكی زۆریان بدەنێ و حوكمڕانی شاریشیان لێ قبووڵ كردن، مەغۆلەكان دیاریەكانیان لێ وەرگرتن و خۆیان بە نێو شاردا كرد، ئەم شارە لە چاو شارەكانی تردا بە ساغ و سەلیمی دەرچووو وێران نەكرا.[1]

لە ساڵی ٦٣٢_٦٣٣ك/١٢٣٤_١٢٣٥ز مەغۆلەكان خۆیان بەنێو هەرێمی هەولێر (ئەربیل)دا كردو گەمارۆی پایتەختەكەیاندا، بەڵام دانیشتوانی بە پەلە چوونە نێو قەڵاكەوەو لەوێدا خۆیان مەڵاسدا، مەغۆلەكان ماوەی (٤٠) ڕۆژ گەمارۆی قەڵایان دا، دانیشتوان سەروەت و سامانێكی زۆریاندا بە مەغۆلەكان و خۆیان كڕیەوە، بەڵام مەغۆلەكان تا هەواڵیان پێ نەگەیشت كە لە بەغداوە هێزی بەهاوارەوە چوون بەرەو (ئەربیل) بەڕێ كەوتووە گەمارۆكەیان نەشكاند، ئینجا ئەوێیان بەجێ هێشت و لە باكوری بەرەو عێراق داگەڕان و لە ساڵی ٦٣٤ك/١٢٣٦ز گەیشتنە (سامەڕا)، كاتێك (خەلیفە) زانی مەترسی هەڕەشەی لێ دەكات كۆبوونەوەی بە زانایان كردو فتوایاندا كە: (جەنگ لە پێناوی خودادا لە حەجی ماڵی خودا خێری زیاترە)، ئەمەو خەلیفە جاڕی جیهادی داو بە پەلە سوپایەكی گەورەی بە سەركردایەتی (مجاهد الدین دەوایدار)[2] ڕێكخست، سوپاكە توانی لە (تكریت)ی نێوان ڕووباری (دیجلە)و چیای (حەمرین) مەغۆلەكان تێك بشكێنێ و ژمارەیەكی زۆر دیلی موسڵمانان كە لە كاتی قوڵە شەڕەكانی (ئەربیل)گیرابوون ئازاد بكات، موسڵمانان قەڵاو شورەی قایمیان لە دەرەوەی شاری (بەغدا) دروست كردن، ئینجا مەغۆلەكان بۆ جارێكی تر بەرەو بەغدا هەڵمەتیان بردو لە ساڵی ٦٣٥ك/١٢٣٧ز هێزی موسڵمانیان لە (خانەقین)

---

١ المصدر نفسه ص: ١٨٠.

٢ المصدر نفسه ص: ١٨١، دەوایدر بە واتای میرزاو كاتیب دێ.

تێکشکاندو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن‌و ئەوەی ماشنەوە بەرەو بەغدا گەڕانەوە،[١] بە هەمان شێوە مەغۆلەکان لێشاوی هێرشەکانیان بۆ سەر (جۆرجیاو ئەرمینیا) بەردەوام بووو دەستیان بە کاولکردن‌و ڕوخاندن کرد، بەڵام لە پاشان بۆ ئەو دوو وڵاتە گەڕانەوەو چ ڕێ‌و شوێنێکیان لە بەرامبەر دوو هەرێمی فارس‌و کرمان گرتە بەر هەمان ڕێ‌و شوێنیشیان لە بەرامبەر ئەم دوو وڵاتەدا گرتەبەر، هەروەها مەغۆلەکان بەبێ ئەوەی تووشی هیچ بەرەنگاریەك ببنەوە بە تەواوەتی هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی (خوارەزمی)یان خستە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خۆیانەوە، ئەمەو (سوجستان‌و غەزنەو کابول‌و سنووری سند) خۆیان بە دەستەوەدا)، هەروەها مەغۆلەکان لە ساڵی ٦٤٠ك/١٢٤٣ز یداو دوای سەرکەوتنیان لە جەنگی دەستەویەخەی (کۆسەتاغ)دا توانیان بەسەر سلجوقیەکانی ڕۆمدا زاڵ ببن، ئەمەو دوای ئەمە (ئەنازۆل) کەوتە ژێر ڕکێفی (مەغۆل)ەوەو سوڵتان (غیاث الدین) گەردنکەچی خۆی بۆ (خان)ی مەغۆل دەربڕی‌و پەیمانی دا ساڵانە سەرانەی بداتێ.[٢]

### ١ـ زەوتکردنی هەرێمەکانی چینی باکوور:

دوابەدوای مردنی (جەنگیزخان) بنەماڵەی (کین) توانیان بەشێکی زۆری مەملەکەتە داگیرکراوەکەیان بستێننەوەو شاری (کای-فۆنج)ی هەرێمی (هۆنان)یس بکەنە پایتەختی خۆیان، بەڵام کاتێك (ئۆکتای) ڕێشمەی دەسەڵاتی مەغۆلی گرتە دەست، خۆی کۆکردەوەو سوپای بۆ زەوتکردنی ئەو هەرێمانە سازکرد، ئەمەو لە ساڵی ٦٢٧ك/١٢٢٩ز یداو هاوکات لەگەڵ ئەوەدا سەربازەکانی لە ئێران بە دوای (جلال الدین منکبرتی)دا دەکەوتن، سوپایەکی گەورەی ڕێکخست‌و بە سەرکردایەتی خۆی‌و (جوغتای‌و تولوی) برای بەرەو دەشتی (هوانگ-هۆ) کە مەغۆلەکان (فزاموران)یان پێ دەگوت بەڕێکەوت، ئینجا سوپاکەی کردە دوو بەشی سەرەکی: یەکەمیان بە سەرکردایەتی (ئۆکتای) لە باکوورەوە هێرشی برد، دووەمیان بە سەرکردایەتی (تۆلۆی) هێرشی کردە سەر باشووری ئەو وڵاتە، لە ئەنجامی هێرش‌و تێکهەڵچوونەکان مەغۆلەکان سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر چینیەکاندا تۆمارکردن‌و خاکێکی زۆرو بەرفراوانیان لێ زەوت کردن، پاش ئەمە دەست بەسەرداگرتنی (کای فۆنج)ی پایتەختیان خستە ئەستۆی (سۆبۆتای) سەرکردە، ئەمەو لە ساڵی ٦٣١ك/١٢٣٣ز یدا ئەم پایتەختە مەزنە لە لایەن مەغۆلەکانەوە داگیرکراو کەمە خەڵکێك نەبێ لە دانیشتوانەکەی کە

---

١ الحوادث الجامعة لابن الفوطي ص: ١١٣، المغول للصياد ص: ١٨١.

٢ المغول ص: ١٨٣.

توانیان خۆ دەربازبکەنو ڕابکەن دەنا هەمووی کوژرا، لە گرەمەی ئەم کارەساتەدا (یی لیو جوتسا)ی وەزیر لەبەر ئۆکتای پاڕایەوەو تکای لێکرد فەرمانی ڕوخاندنی شار دەرنەکا، بەڵکو بیخاتە سەر دەوڵەتی مەغۆل، ئەویش تکاکەی قبوڵ کرد.[1]

لەو کاتەدا مەغۆلەکان هێرشەکانیان بۆ سەر چینی باکور ئەنجام دەدان، بنەماڵەی (سۆنگ)ی حوکمڕانی چینی باشور یارمەتی مەغۆلەکانیان دەداو تەماعیان دەخستنە بەردەم تا لە خاکی چینی باکوردا بەشیان بدەن، کاتێك ئەم ئاواتەیان بەباچوو، شەڕ لە نێوان ئەوانو مەغۆلەکاندا هەڵگیرسا، ئەم شەڕە بوو بە هەلێکی زێڕین بە دەست مەغۆلەکانەوە تا ڕەگو ڕیشەی ئەم بنەماڵە بە یەکجاری هەڵکێشنو مەملەکەتەکەشیان بخەنە سەر دەوڵەتەکەی خۆیان، بەڵام ئەم ئامانجە لەسەردەمی جێنشینەکانی (ئۆکتای)دا هاتەدی.[2]

### ٢ـ مەغۆلەکان لە (ئەوروپا)دا:

پاش گەڕانەوەی (ئۆکتای) لە چین بە سەرکەوتوویی، سوپایەکی گەورەی (١٥٠) هەزاری ڕێکخست، (باتوی کوڕی جوجی) کردە سەرکردەی ئەم سوپایە، گرتنی ولاتی (ڕوسو جەرکسو بولغارو هەرێمەکانی ئەورووپای خۆرهەلات)ی خستە ئەستۆ، (سۆبۆتای)ی سەرکردەی سەربازی سەرکردایەتی فیعلی هێرشەکان بوو، سوپاکە توانی دەست بەسەر ناوچەی هەڵکەوتووی نێوان چیای (ئۆراڵ)و نیوەدورگەی (قرم)دابگرێت کە نیشتمانی (باشقردو بولغار) بوو، حوکمڕانەکانی ڕووسیای بەزاندن، شاری (مۆسکۆ)ی سوتاند، هەردوو شاری (سوزدالو فلادیمیر)ی ڕوخاندن، ئاگری لە (سوزدال) بەردا، شاری (فلایمیر) دیمەنێکی سامناکی بەخۆوە بینی، لە هەموو شوێنێکدا خەڵك سەردەبڕدرا، لە نێو بڵێسەی ئاگردا خەڵك ڕای دەکردو پەنایان بۆ (کەنیسە) دەبرد، دوای ئەمە سوپاکە بەرەو مەملەکەتی (ئۆکرانیا) بەڕێکەوت، وێرانکاریو خراپەکاری زۆریان لەو ناوچانەدا ئەنجامدا، لە ساڵی ٦٣٨ك/١٢٤٠ز یدا دەستیان بەسەر (کییف)ی پایتەختدا گرتو هەر هەموویان بەسەر یەکتردا داتەپاند، ئینجا هەرێمی (گالیسیا)ی ڕوسی یان تالان کرد، بەم شێوەیە ڕوسیای پانو بەرین بە تەواوەتی کەوتە ژێر دەستی مەغۆلەکانو ماوەی (٢) سەدەو نیو لەسەر یەك (٦٣٦ـ٨٨٦ك) حوکمیان تێدا گێڕا.

---

١ المصدر نفسه ص: ١٨٥.

٢ المصدر نفسه ص: ١٨٦.

پاش ئەوە لە داگیرکردنی (ڕوسیا) بوونەوە سوپاکەیان بوو بە دوو بەش:

بەشی یەکەم: بەرەو (پۆڵندا) هێرش دەبا.

بەشی دووەم: بەرەو (مەجەڕ) هێرش دەبا.

بەشی یەکەمی سوپای مەغۆل هێرشی بردو توانی بەسەر سوپای هاوپەیمانی (پۆڵۆنیاو ئەڵمانیا) زاڵ بێت کە خۆی لە (٣٠) هەزار سەرباز دەدا، دەستیان بەسەر شاری (بیرسلاو) داگرتو بەرەو شاری (بەرلین) پێشڕەویان کرد، پاش کوشتو بڕی دانیشتوانی ئەم هەرێمە بە تەنهاو کاولکردنی شارەکانی، بە مەبەستی نیشاندانی دەسەڵاتو زەبروزەنگی بەهێزیانو شانازیان بەم ڕەفتارەیان هەستان گوێی کوژراوەکانیان لێکردنەوە کە ژمارەیان (٢٧٠) هەزار دانە بوو خستیاننە نێو چەند کیسەیەکەوەو لێرەولەوێ لەگەڵ خۆیان دەگێڕان.[١]

بەشی دووەمی سوپاکەش لە هەمان کاتدا بەسەر (مەجەڕ)ەکاندا زاڵ بووو دەستی بەسەر (بیست)ی پایتەختدا گرتو ئینجا بەرەو (ڤیێننا) لە لایەکەوەو لە قۆڵێکی تریشەوە بەرەو کەنارە ئاوەکانی دەریای (ئەدریاتیك) ڕۆیشت، لەم گەرمە ساتەدا کە مەغۆلەکان لە نێو خاکی ئەورووپادا پێشڕەویان دەکرد هەواڵی مەرگی (ئۆکتای)ی خانی گەورەیان پێگەیشت، ئەمەو ئۆکتای لە ساڵی ٦٣٩ك/١٢٤١ز یدا مردو (باتۆ و سۆبۆتا)ی داوایان لێکرا بە پەلەو بێ دواکەوتن بۆ کۆبوونەوەی (کۆریلتای) بگەڕێنەوەو بەشداری هەڵبژاردنی خانی نوێ بکەن، بەم ڕەنگە هەرێمەکانی خۆرئاوای ئەورووپا لە مەترسی داگیرکاری چاوەڕوانکراوو نەخشە بۆ کێشراوی مەغۆلەکان ڕزگاری بوو.[٢]

### ٣ـ مردنی ئۆکتا یخان:

(ئۆکتای) خۆی لە مەی خواردنەوەدا شەلال کردبوو، ئەمە وایکرد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زەبونو لاواز بێت، کەسە تایبەتو دڵسۆزەکانیشی نەیاندەتوانی وازی پێ لێ بێنن، بەڵکو لە ڕقی ئەوان زیاتری دەخواردەوە، کاتێك سوپاکەی لە ئەورووپا دەجەنگا، ئەو ماوەی (٧) ساڵ بە بەردەوامی لەنێو خواردنو خواردنەوەو ڕابواردنی خۆیدا تلی دەدا، دەرەنجام کاری لە تەندروستی کرد، شەوێك کە زۆری خوادبۆوەو لە مەستیان خەوی لێکەوتبوو ئەجەل چیکەی مۆڵەت نەداو گیانی لە جەستەی جودا کردەوە، ئەمە لە ساڵی ٦٣٩ك/١٢٤١ زاینیدا بوو.[٣]

---

١ تأريخ مختصر الدول لابن العبري ص: ٢٤٨. المغول للصياد ص: ١٨٧.

٢ المغول للصياد ص: ١٨٨.

٣ المغول للصياد ص: ١٨٨.

### ٤ـ ڕێکخستن و چاکسازیەکانی سەردەمی (ئۆکتای):

(ئۆکتای) لەسەردەمی خۆیدا چەند چاکسازیەکی لە نێو وڵاتانی داگیرکراودا ئەنجامدان، کاتێك وڵاتی (چین)ی داگیرکرد، کاروباری ئەوێی خستە بەر دەستی (یی لیو جوتسای)ی وەزیری: ئەم وەزیرە توانی حوکومەتێکی دامەزراوو ڕێکوپێك بە پشتیوانی خوێندەواران و خەڵکی چالاکی (چینی و ئۆیغۆری و ئێرانی و تیبتی) دابمەزرێنێ، کاروباری دارایی ڕێکوپێك کردو پەیوەندیەکانی دەرەوەو ناوەوەی چینی توندو تۆڵ کردن، ئەمەو میزانیەیەکی نەگۆڕی بۆ ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی داناو چینیەکانی پابەند کردن ساڵانە سەرانەی خۆیان لە پارەو کاڵا بە ئەندازەی دیاریکراوی بەرهەمەکانی خۆیان لە پۆشاکی ئاوریشم و دانەوێڵە بدەن بە ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی، لە هەمان کاتدا ئەو مەغۆلانەی ڕەوە ئەسپ و مەڕو ماڵات و ئاژەڵ بەخێو دەکەن دەبێ لە ١٠٪ی بەرهەمەکانیان پێشکەشی دەوڵەت بکەن، ئینجا (یی لیو جوتسای) وەزیر چەند قوتابخانەیەکی لە شاری (پەکین)و (خان بالیغ)دا دروست کردن، لەم قوتابخانانەدا خەڵکانی پسپۆڕو شارەزاو لێهاتوو لە چینی لاوان دەیانخوێندو لێی دەردەچوون، هاوکات لەگەڵ خوێندنی زانستەکاندا ڕێنماییەکانی ئایینی (کۆنفۆشیس)یان تێدا دەخوێند،[1] کاتێك (ئۆکتای) چینی باکوری بە تەواوەتی گرت، کاروباری وڵاتی (ئەودیو ڕوباری)ی بە (محمد یلواج) سپارد، ئەویش (مسعود بەگ)ی کوڕی کردە حوکمڕانی وڵات، باوك و کوڕ هەردووکیان قۆڵیان لێ هەڵماڵی و ئەوەی مەغۆلەکان ڕوخاندبوویان لەو هەرێمەدا هەموویان بیناکردەوەو زۆر دڵسۆزانە دەستیان بە خزمەتی دانیشتوانەکەی کردو دەوڵەتێکی ڕێکوپێکیان دروستکردو بارودۆخی ناوچەکانیان ئاسایی کردنەوەو حاڵ و گوزەرانی خەڵکیان خۆش کرد.[2]

ئۆکتای حەزی لە دروست کردنی خانوبەرەو کۆشك و تەلار دەکرد، لە ساڵی ٦٣١ك/١٢٣٤ز یدا پرۆژەی دروست کردنی پایتەختی تازەی بۆ ئیمپراتۆریەتەکەی دەست پێکرد، فەرمانیدا کۆشکێکی بەرز لەنێوەندی پایتەختدا دروست بکرێت، بە جۆرێك بەرزی هەر پایەیەکی بە ئەندازەی دووری تیرهاوێژێك درێژ بێت و کۆشکێکی بەرزو ڕازاوە لەنێو ئەو پایانەدا دروست بکرێت، پاشان دەستیان بە ڕازاندنەوەو دروستکردنی نەخش و نیگاری سەر داروديوارەکانی کرد، فەرمانی بە براکانی و کوڕەکانیان و تێکڕای میرەکان کرد هەر یەکێك

---

١ المصدر نفسه ص: ١٨٩.

٢ المصدر نفسه ص: ١٨٩.

کۆشکێکی گەورەو ڕازاوە لە دەورەی ئەم کۆشکە دروست بکەن، ئەوانیش هەر هەموویان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، کاتێك لە دروستکردن و ڕازاندنەوەی کۆشك و تەلارەکان بوونەوە، تەماشایان کرد کۆمەڵگایەکی خانوبەرەی ڕازاوەو ڕێکوپێك بەسەریەکەوەیان پێك هێناوە، شایانی باسە دروست کردنی ئەم کۆشکانە بە چاودێری شارەزاترین ئەندازیاری چینی – کە بۆ ئەم مەبەستە هێنابوویانن – تەواو کران،[1] هەروەها ئۆکتای پەرەی بە سیستەمی گەیاندن (بريد)داو بیری لە هەڵکەندنی بیرەئاو کردەوە لەسەر ڕێگاوبانی بیابانەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا.[2]

## هـ- هەڵسوکەوتی (ئۆکتای) لە بەرامبەر موسڵمانانی ژێر دەسەڵاتی:

(ئۆکتای) پاشایەکی بەخشندەو بەڕێز بوو، لە بەرامبەر موسڵمانانی نێو دەوڵەتەکەیدا خۆش ڕەفتار بوو، هاوکات لەگەڵ ئەم نەجابەتەی ئۆکتایدا (جوغتای) برای وازی لە ئازاردان و زیان پێگەیاندنی موسڵمانان نەدەهێنا، حەزی دەکرد لە تەواوی شارەکاندا ڕیشەکێشیان بکات، لەپێناو جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتەی، هانی پیاوماقوڵ و میرو سەرکردەکانی مەغۆلی دەدا لە لای ئۆکتای زەمبی موسڵمانان بکەن، بەڵکو لەبەر چاوی ڕەش ببن و بڕیاری لەنێوبردنیان بدات، ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕاهیبێکی بوزایی دێتە لای (خان)و دەڵێ: (کە ئەو بە خەون جەنگیزخانی دیوەو فەرمانی بە (ئۆکتای) کوڕی دەکرد کە لە نێو هەموو وڵاتاندا دەست بە لەنێوبردنی موسڵمانان بکات و وەسێتی پێکردووە بە هیچ شێوەیەك لە بەرامبەر جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەدا دوو دڵ نەبێت و ماوەی چاوتروکانێکیش ڕانەوەستێ، چونکە ئێستا ژمارەی موسڵمانان زۆر بووەو بەم شێوەیە بروات کۆتایی بە دەسەڵات و حوکمڕانی مەغۆل دەهێنن)، کاتێك (ئۆکتای) بە تەواوەتی گوێی لەم قسەیە بوو، ئەو – کە زیرەك بووو موسڵمانانی خۆش دەویستن – یەکسەر دەرکی بەوە کرد کە ئەم قسەیە درۆیەکی هەڵبەستراوەو بە فیتی (جوغتای)ی برای ستەمکاری ڕێکخراوە، ئینجا (ئۆکتای) داوای کرد کۆبوونەوەیەکی فراوان بە ئامادەبوونی گەورە کەسایەتیەکانی مەغۆل و حوکمڕانانی هەرێمەکان و ڕاهیبی بوزایی ببەسترێت، ــ لە کۆبوونەوەکەدا – فەرمانی بە ڕاهیبەکە کرد بە ڕەوانی وەسێتەکەی (جەنگیزخان) بۆ ئامادەبووان بخوێنێتەوە، پاش

---

١ المصدر نفسه ص: ١٩١.

٢ المغول، د. العريني ص: ١٦٢.

خوێندنەوەکە، (ئۆکتای) گوتی: هەر داوایەك تا دەرکەوێ ڕاستەو درۆ نیەو ساغەو نەخۆش نیە پێویستی بە بەڵگەو شایەد هەیە، هەموو ئامادەبووان گوتیان بەڵێ وایە، ئینجا (خان) ڕووی لە ڕاهیبەکە کردو پرسیاری لێکرد: مەغۆلی دەزانی یان تورکی؟ یان هەردووکیان دەزانی؟!... ڕاهیبەکە وەڵامی دایەوەو گوتی: من بەس (تورکی) دەزانم، لەو کاتەدا (ئۆکتای) گوتی: (جەنگیزخان) جگە لە مەغۆلی هیچ زمانی تری نەدەزانین، تۆش جگە لە (تورکی) زمانی تر نازانی، باشە تۆ بە چ زمانێك ئەم فەرمانەت پێگەیشت، بە مەغۆلی یان بە تورکی؟[١] کاتێك ڕاهیبەکە زانی درۆیەکەی بەدەرکەوت، وەڵامی نەدایەوەو خەجاڵەت بوو و ڕەنگی هێنان و بردن، بەم شێوەیە درۆو دووڕوویی کابرای ڕاهیب بۆ هەموو لایەك دەرکەوت، بەڵام (ئۆکتای) نەیهێشت ئەم هەلە بە خۆڕایی بڕوات و ڕاهیبیش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچێت و هیچ گورزی پەند ئامێزی بەرنەکەون و ڕەوشتی لەکەدار نەبێت، بۆیە پێی گوت: من لەبەر خاتری (جوغتای) برام ناتکوژم، لە کوێرا هاتووی بۆ ئەوێ بگەڕێوە، بە (جوغتای)و دارودەستەکەی بڵێ: کە دەست لە ئازاردانی موسڵمانان هەڵبگرن، چونکە ئەوان براو هاوپەیمانن، مەملەکەتەکەمان بە هۆیانەوە بەهێز بووە، بە یاریدەو هاریکاری ئەوان جیهان بۆمان دەستەمۆ بووەو هاتۆتە ژێر فەرمانمانەوە.

گێڕدراوەتەوە: کاتێك مەغۆلەکان بڕیاریاندا نابێ کەس بە شێوازی موسڵمانان مەڕو ئاژەڵ سەر ببڕێت، بەڵکو دەبێ سنگی شەق بکرێت و شان و شەپیلکی لێبکرێنەوەو جەرگو هەناوی دەربێنن تا دەمرێت، ڕێ دەکەوێ ڕۆژێك موسڵمانێك لە بازاڕ مەڕێك دەکڕێت و بەرەو ماڵی دەباتەوە، دەرگاکانی حەوشەو ماڵ دادەخات، ئینجا (بسم الله)ی لێ دەکات و خەریك دەبێ سەری ببڕێ، لەو کاتەدا پیاوێکی تورکی وڵاتی (قەبچاق) لە بازاڕدا دەیبینێت و بە دوای دەکەوێت، دەچێتە سەربانی خانووەکەو بۆ موسڵمانەکە دەچێتە خوارەوەو دەیگرێت و بەرەو کۆشکی (خان)ی دەبا، (خان) جێگیرەکانی خۆی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلە دەنێرێ، کاتێك ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیان خستە بەردەم (خان)، گوتی: ئەم پیاوە موسڵمانە هەژارە ڕێزی لە قانون ـ ی وڵات ـ گرتووە، بەڵام ئەم پیاوە تورکە ڕێزی قانونی شکاندووەو چۆتە سەربانی ماڵی ئەو هەژارە، بەم شێوەیە موسڵمانەکە ڕزگاری بووو تورکە (قەبجاق)یەکەش کوژرا.[٢]

---

١ المغول للصياد ص: ١٩٣.

٢ جامع التواريخ ٢/٦٢ـ٦٣، المغول للصياد ص: ١٩٤.

**٦ـ كیوك خان (٦٤٤ـ٦٤٧ك/ ١٢٤٦ـ١٢٤٩ز):**

به مردنی (ئۆكتای) بارودۆخی (مەغۆل) ئاڵۆزا، لەسەر چوونە سەر عەرشی دەسەڵات، ناكۆكیان تێكەوت، (باتۆ)ی شای خانەكانی (ڕوسیا)و دۆڵی (قەبجاق)و دیارترین میرە گەورەكانی بنەماڵەی (جەنگیزخان) حەزی نەدەكرد كەس لە بنەماڵەی (ئۆكتای) ئەم پۆستە بەدەستەوە بگرێت، (كوتان)ی كوڕی دووەمی (ئۆكتای) حەزی لێبوو جێی بابی بگرێتەوە، كۆمەڵێكی تریش ڕایان وابوو وەسیەتەكەی (ئۆكتای) جێبەجێ بكرێت باشەو (شیرامون)ی نەوەی منداڵی بكرێتە خانی گەورەی مەغۆل، لەبەر ئەوە كاتێكی زۆر تێپەڕی‌و ڕای گشتی لەسەر كەسێك یەكی نەگرت‌و (كیوك)ی كوڕە گەورەی (ئۆكتای)یش لە بارەگای ئیمپراتۆریەت دوربوو، هەلێكی لەبار بۆ تەماعكارانی عەرشی مەغۆل دروست بوو، (ئۆتجكین)ی برای (جەنگیزخان) لە نێوانیاندا خۆی دەرخست، ویستی بە زۆرداری عەرش داگیر بكا، نەخشەی داڕشت‌و سوپایەكی گەورەی بە چەك‌و ئەسلەحەی پێویست ئامادەكردو ویستی بەسەر سەربازگەی بارەگای (خان) دادا، سەربازو شوێنكەوتوان هاروژان، (توراكینا) — ی خاتون‌و خێزانی ئۆكتای — بەم نەخشەیەی زانی، بە پەلە نوێنەری خۆی بۆلا نارد، بە نەرمونیانی لۆمە‌و گازندی لێكردو هەوڵەكانی خۆی خستنە گەڕ تا بە لای خۆیدا ڕایكێشێ، ئەمەو (توراكینا خاتون) سەركەوتنی بە دەست هێنا، (ئۆتجكین) یش پەشیمان بۆوەو ڕێی بۆ بەهانەكانی خۆی خۆشكردن‌و ئینجا بەرەو نیشتمانی ئەسڵی خۆی گەڕایەوە، بەڵام (توراكینا خاتوون) بڕیاریدا دەبێ ئەم پۆستە تەنها بۆ (كیوك)ی كوڕی بێت، بۆیە لە ماوەی (٤) ساڵی تەواودا هەموو هەوڵەكانی خۆی بە گەڕخستن‌و بە هەموو توانایەكی مادی‌و مەعنەوی‌و بە پێشكەشكردنی دیاری بە نرخ‌و زێڕو پارەی زۆر میرە نزیكەكان‌و سەركردەكانی مەغۆلی بە لای خۆیدا كەمەندكێش كردن‌و خستنیە ژێر ئامازەو فەرمانی خۆیەوە، هاوكات لەگەڵ ئەمەدا هەموو هەڵەكانی قۆستنەوەو خۆی لە چنگی ئەو كەسایەتی‌و میرانە ڕزگاركرد كە لە دژی سیاسەت‌و نەخشەی ئەو كاریان دەكرد، (توراكینا خاتون) دەركەوانێكی ئافرەتی هەبوو بە ناو (فاطمة) كە خەڵكی مەشهەدی (طوس) بوو — (فاتیمە) زۆر زیرەك‌و ژیرو بیر تیژو شایستە بوو، ببوە جێی متمانەی تەواوی (توراكینا)و بەڵكو پارێزەری نهێنیەكانی — بوو، لەبەر ئەمە گەورەكانی وڵات بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەكانی خۆیان بەكاریان دێنا، (توراكینا) سەبارەت بە میرەكان‌و كاربەدەستانی دەوڵەت‌و خاوەن پۆستە گەورەكانی سەردەمی (ئۆكتای) بە تەنیا ڕاوێژی بە (فاتیمە) دەكردو قسەكانی ئەوی بە هەند هەڵدەگرتن، كاتێك (توراكینا خاتون) دڵنیا بوو لەوە بۆتە

خاوەنی وەرەقەی براوەو بارودۆخەکان سازو لە بارن بۆ سەرخستنی نەخشەکەی، ئینجا نوێنەری خۆی بۆ لای گەورە کەسایەتیەکانی مەغۆلی لە تەواوی ولآتاندا ناردو داوای لێکردن بۆ کۆبوونەوەی گشتی (کۆریلتای)ی‌و بە ڕەسمی ناساندنی (کیوك) وەکو خانی گەورە نوێ ی مەغۆل ئامادەبن.[1]

## ٧ـ هەڵبژاردنی (کیوك خان) بە خانی گەورەی مەغۆل:

لە ساڵی ٦٤٤ك/١٢٤٦ز یدا لەسەر کەناری یەکێك لە دەریاچەکانی خۆرئاوای مەنغۆلیا، (کۆریلتا) کۆبوونەوەی خۆی بۆ هەڵبژاردنی خانی گەورە گرێدا، زۆربەی ئامادەبووان پێشنیاریان کرد (کیوك) هەڵبژێردرێت، بەڵام بە هۆی لاوازیو نەخۆشی بیانووی هێنایەوە، پاشان لەسەر ئارەزووی میرەکانو بە مەرجێك حوکمڕانی لە دوای خۆی بە میرات بۆ نەوەکانی بێ پۆستەکەی وەرگرت، هەموو لایەك بەمە قایل بوون، لەم کاتەدا میرو سەرکردەکان کڵاوەکانیان دانانو پشتێنەکان کردنەوەو (کیوك)یان لەسەر عەرش دانیشاند، پەرداخەکانیان بە دەستەوە گرتنو لە بەرامبەر عەرشەکەیدا دولا هاتنەوەو بە ڕەسمی هەڵبژاردنی (کیوك)یان بە خانی گەورەی مەغۆل ڕاگەیاند، بەم بۆنەوە ماوەی هەفتەیەك ئاهەنگیان گێڕاو (کیوك)یش سەروەتو سامانو بەخششی بەسەر میرەکانو سەرۆکی هۆزەکاندا دابەشکرد.

سەرچاوەکانی مێژوو دەڵێن: (کیوك خان) بە خۆشی ڕەفتاری لەگەڵ نوێنەری (خەلیفە)دا کرد، بەڵام نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ خەلیفە پێدا ناردبۆوە، بەڵام جامی تووڕەیی خۆی بەسەر سەری نوێنەری فیرقەی (ئیسماعیلی)یدا ڕشتووەو سەرکوتو ڕیسوای کردوون، بەوپەڕی وشكو برینگیو توندو تیژی وەڵامی سەرۆکەکەیانی دابۆوە.[2]

(کیوك خان) پیاوێکی شەڕانیو شەقاوە بووو حەزی لە جەنگو هەرا بوو، زۆر بە جەنگیزخانی باپیری دەچوو، هێشتا حوکومەتەکەی بە تەواوەتی دانەمەزراندبوو میرو پیاوماقوڵو سەرکردەکانی مەغۆلی ئاگادارکردەوە ئاگایان لە حوکمەکانی (یاسا) بێتو بە موو لێی لانەدەنو نەیگۆڕنو تەئویلکاری تێدا نەکەن، فەرمانیدا: هەموو ئەو کەسانە سزا بدرێن کە پێش هاتنە سەرحوکمی لە بەرامبەر ئەنجامدانی ئەرکەکانیان کەمتەرخەمیان نواندووە، یان سەرپێچیان ئەنجامداوە، بە هەمان شێوە فەرمانی بەسەر میرو سەرکردەکان

---

١ المغول للصیاد ص: ١٩٦.

٢ المصدر نفسه ص: ١٩٦.

دەدا بە پەلەو بێ دواکەوتن سوپاو پێویستیەکانی جەنگ سازکەن‌و دەست بەسەر (چینی باشور)دا بگرن، ئەمەو ئەرکی داگیرکردنی (چینی باشور)ی خستە ئەستۆی (سۆبۆتا)ی، (ئیلینجیکتای)یشی بۆ (ئێران) نارد تا تەواوی وڵاتانی ئیسلامی – کە تا ئێستا نەگیراون – داگیریان بکات، لەگەڵ ئەمەشدا سوڵتەی تەواوی پێداو کردی بە سەرپەرشتیاری کاروباری (ڕۆم‌و کەرج‌و موسڵ‌و دیاربەکر)، (محمود)ی کرد بە حوکمڕانی مەملەکەتەکانی (خەتا)، (میر مەسعود بەگ)ی کردە حوکمڕانی وڵاتی (ئەودیو ڕوبار)و (تورکستان)، (میر ئەرغون)یشی کردە والی وڵاتی (خۆراسان‌و عێراق‌و ئازەربایجان‌و شێروان‌و لوڕو کرمان‌و فارس‌و لایەکی هیند)، سوڵتان (رکن الدين)یش بە حوکمی ئەوە بۆ ئامەنگی هەڵبژاردنی هاتبووە (مەنغۆلیا) (عزالدين)ی برا گەورەی لەسەر حوکم لاداو بۆ خۆی سوڵتەی (ڕۆم)ی گرتە دەست، هەروەها کیوك بڕیاریدا (داودی بچوك)ی ناسراو بە (ئیبن فەین) بچێتە ژێر حوکمی (داودی گەورە)ی حوکمڕانی (تفليس)ەوە.[1]

أـ سیاسەتی (کیوك خان) لە بەرامبەر مەسیحیەکاندا:

(توراکینا خاتون) لەسەر ئاینی مەسیحی بوو، لەبەر ئەمە (کیوك)ی کوڕی لە منداڵیدا خستە بەردەستی (میرقوداق)ی مەسیحی‌و چاودێری پەروەردەکردنی بە ئەو سپارد، کاتێك (کیوك) چووە سەر عەرشی دەسەڵات (جینقای) کۆنە ڕاوێژکاری باوکی لە خۆ نزیك کردەوە، (جینقای) سەر بە هۆزی (کرایت) بوو لەسەر ئاینی (مەسیحی) بوو، کیوك هەر بەمە ڕانەوەستا بەڵکو پۆستی وەزارەتی دایە دەست (جینقای)، ئەم دوو کەسایەتیە مەسیحیە کاریگەریەکی بەهێزیان لەسەر خانی مەغۆل هەبوو، بە جۆرێك سۆزێکی زۆری بۆ مەسیحیەکانی وێنەی (کەرج‌و ئەرمەن‌و ڕوس) هەبوو.[2]

(براون)ی مێژونوس باس لەوە دەکا کە هەڵبژاردنی (کیوك) لە (کۆریلتای) لەگەڵ تەواوی هەڵبژاردنەکانی تر جودا بوو، لەم هەڵبژاردنەدا ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەرانی دەوڵەتانی بیانی‌و خەڵکانێکی زۆری گەلە ژێر دەستەکانی خۆیان کە مەغۆلی نەبوون تیایدا ئامادەبوون، لەنێو ئەمانەدا دوو کاهینی مەسیحی دەبینران کە لە لایەن پاپاوەو بە چەند وتارێکەوە – کە مێژوەکانیان بۆ ئۆغستۆسی ١٢٤٥ز/٦٤٣ك دەگەڕێتەوە – نێردرابوون، ئەم کاهینانە باشترین پێشوازیان لێکرا،[3] بەڵام کاتێك (کیوك) نامەی (پاپا)ی خوێندەوە، لە وەڵامیدا

---

١ تأريخ مختصر الدول ص: ٢٥٧، المغول ص: ١٩٨.

٢ المغول للصياد ص: ١٩٩.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٠٠.

داوای لێکرد دان بە سەروەری دەوڵەتەکەیدا بێنێت و دەبێ ئەوو میرو حوکمڕانەکانی خۆرئاوا بێن و سوێندی گەردنکەچی و فەرمانبەرداری لەبەردەمدا بۆ بخۆن، کاتێک (یوحەننا) لە کۆتایی ساڵی ١٢٤٧ز یدا گەیشتەوە لای پاپا نامە نائومێدکەرەکەی (کیوک)ی دایەدەست، دوای ئەوە کە لە لای خۆی هێشتەوە ڕاپۆرتێکی دوورو درێژی پێوەلکاند، نووسیبووی: (مەغۆلەکان جگە لە مەبەستی داگیرکاری و پاوانخوازی بۆ هیچ مەبەستێکی تر دەرنەچوون).[1]

پوختەی قسە ئەمەیە: لە سەردەمی (کیوک خان)دا پلەوپایەو کاروباری مەسیحیەکان بە ئەندازەیەکی باش بەرەو پێش چوو، بەڵام دەنگی موسڵمانان کش و مات بوو، لەبەر ئەمە دایکە مەسیحیەکەی و هەردووک وەزیرە مەسیحیەکەی کاریگەریەکی بێ ئەندازەو بەرچاویان لەسەر (کیوک خان) هەبوو، لە لایەکی ترەوە پزیشکە مەسیحیەکان توانیان کاروباری تەندروستی نێو کۆشکی ئیمپراتۆریەت بخەنە ژێر سەرپەرشتی خۆیانەوەو لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەدا هەندێك داب و کلتوری مەسیحی لەنێو نێوەندەکانی مەغۆلیدا تەشەنەیان کردو بڵاو بوونەوە.[2]

ب ـ مردنی کیوک خان ٦٤٧ك/١٢٤٩ز:

بارودۆخی مەغۆلەکان تێکچوو، لەسەر ئەوە کێ بچێتە سەر عەرشی دەسەڵات کێشمەکێشیان تێکەوت، میر (باتۆ)ی شای خانەکانی (ڕوسیا)و دۆڵی (قەبجاق)و یەکێك لە سەرکردە هەرە بەرچاوەکانی نێو بنەماڵەی جەنگیزخان حەزی نەدەکرد کەس لە بنەماڵەی (ئۆکتای) ئەم پۆستە بە دەستەوە بگرێت،[3] لە کاتی دانانی (کیوک) بە خانی گەورەی مەغۆل لە کۆبوونەوەی (کۆریلتای) ئامادە نەبوو، بەڵکو هەر نەهات بۆ مەنغۆلیا، کاتێك (کیوک خان) بوو بە خانی گەورە نەزری کرد دەبێ (باتۆ) بە هۆی ئەم هەڵوێستە دوژمنکاریەی لە بەرامبەر (ئۆکتای) نواندووە بە شێوەیەکی گشتی و لە بەرامبەر بنەماڵەکەشی نواندووە بە شێوەیەکی تایبەتی، سزای هەڵوێستەکەی وەربگرێت و سەری خۆی دانەوێنێت، بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە سنووری (سەمەرقەند) ئەجەل بەرۆکی گرت و لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ٦٤٧ك/١٢٤٩ز یدا گیانی لە دەستدا، (توراکینا خاتون)ی دایکیشی بە چەند مانگێك مەرگی ڕەپێش مەرگی (کیوک) کەوت.[4]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٠٠.
٢ المغول للصياد ص: ٢٠١.
٣ المصدر نفسه ص: ١٩٥.
٤ المصدر نفسه ص: ١٩٥.

### ٨ـ هەڵبژاردنی (مەنکۆ) بە خانی گەورەی مەغۆڵ:

دوابەدوای مردنی (کیوك خان)، (جوغتای)و دارودەستەکەی ویستیان (شیرامون) بکەنە ئیمپراتۆری (مەغۆل)، بەڵام هەڵێنانی هەنگاوێکی لەم جۆرە پێویستی بە ڕەزامەندی میر (باتۆ) دەکات، چونکە ئەو ئێستا لە پلەو پایەو تەمەندا لە هەموو میرەکان لەپێشترو گەورەترەو دەبێ لە هەڵبژاردنی خانەکاندا مافی لە هەمووان زیاتر هەبێ، لەسەر ئەم بنەمایە نوێنەریان بۆ لا ناردو داوایان لێدەکرد بۆ بەستنی کۆنگرەی (کۆریلتای) دانانی خانی نوێ بێتە (مەنغۆلیا)، وەڵامی دانەوە کە نەخۆشەو ناتوانێ بە ڕێگادا بڕوات، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا (باتۆ) بانگەشەی میرە گەورەکانو سەرکردە سەربازیەکانی کرد بێنە (قەبجاق)و لەوێ کۆنگرەی (کۆریلتای) ببەستنو بەشداری لە هەڵبژاردنی خانی نوێدا بکەن، بەڵام کوڕەکانی ئۆکتایو جوغتای بەرهەڵستی ئەم پێشنیارەیان کردو دەیانگوت: دەبێ (کۆریلتای) بە پێی کلتوری مەغۆل تەنها لە بارەگای ئەسڵی (جەنگیزخان) گرێ بدرێت، لەبەر ئەمە ئەوان نەچوونە (قەبجاق)و هەندێك کەسیان بە نوێنەرایەتی خۆیان ناردن، بەڵام (مەنکۆ)و براکانی وەڵامی بانگەشەکەی (باتۆ)یان بە ئەرێ دایەوەو بە پەلە خۆیان گەیاندە کۆنگرەکە، ئەمەو لەوێدا (مەنکۆ) کرا بە (خان)و ناوی (مەنکۆخان)ی بەسەردا بڕا، بەم شێوەیە پۆستی حوکمڕانی بۆ ڕۆڵەکانی تۆلۆی گوازرایەوە، کە بە لقی دووەمی بنەماڵەی جەنگیزخان دادەنران، جا لەبەر ئەوەی هەموو میرە گەورەکان ئامادەی کۆبوونەوەکە نەبوون هەموویان ڕێکەوتن لەسەر ئەوە جارێکی ترو لە سەرەتایساڵی تازەدا (کۆریلتای) ببەسترێتەوەو سەرجەمی میرو سەرگەورەکانی مەغۆل بە ڕەسمی دان بە دانانی (مەنکۆ) دابنێن وەکو خانی گەورەی مەغۆل، ئەمەو سەرلەنوێ لە مانگی ذي الحجة ٦٤٨ك/ ئەپریلی ١٢٦٠ز یداو لە هەرێمی (قەراقورم)دا (کۆریلتای) کۆبوونەوەی خۆی گرێدایەوەو بە کوێرایی چاوی دوژمنان بە ڕەسمی هەڵبژاردنی (مەنکۆ)ی بە خانی گەورەی مەغۆل ڕاگەیەنرا، دوژمنەکانی سیاسەتی (مەنکۆ) بەم بڕیارە قایل نەبوونو نەچوونە ژێر فەرمانیەوەو هەوڵیاندا پیلانێك داڕێژنو بە هێزی سەربازی دەوڵەتەکەی (مەنکۆ) بڕوخێنن، (مەنکۆ) لە کاتی گونجاودا بەمەی زانیو پێش جێبەجێکردنی پیلانەکەیان شۆڕشچیەکانی قۆڵبەست کردن، کاتێك لێکۆڵینەوەی لەسەر کردن دانیان بە تاوانەکانیاندا هێنا، (مەنکۆ) بە نیاز بوو لێیان خۆش بێ، بەڵام میرە گەورەکان هۆشداریان دایە کە نەرمیان لەگەڵ نەنوێنێتو پێویستە تۆڵەیان لێ بکاتەوە، پاشان سەبارەت بەمە ڕاوێژی بە (محمود یلواج) کرد، ئەویش بەسەرهاتی ئەسکەندەرو ئەرەستۆو هەڵگەڕاوەکانی بۆ خستەڕووو گوتی: کاتێك ئەسکەندەر

دەستی بەسەر زۆربەی وڵاتانی جیهاندا گرت، ویستی بەرەو (هیند) بڕوات، بەڵام میرو سەرگەورەکانی دەوڵەتەکەی لە ژێر فەرمانی دەرچوون و بە دوای نەکەوتن و هەریەکێك لەوان سەربەخۆیی وڵاتەکەی و — خۆسەپاندنی خۆی بەسەر حوکومەتی ئەو وڵاتەدا ڕاگەیاند، (ئەسکەندەر) لە ئاست چارەسەرکردنی کێشەکەدا دەستەپاچەبوو، بۆیە نوێنەرێکی خۆی بۆ لای (ئەرەستۆ)ی وەزیری نارد کە لە زیرەکیدا وێنەی نەبوو، نوێنەرەکە گەیشتە لای ئەرەستۆو باسی یاخی بوون و هەڵگەڕانەوەی میرەکانی (ئەسکەندەر)ی بۆ کرد، پرسیاری چارەسەرکردنی کێشەکەی ئاراستەکرد، (ئەرەستۆ) نوێنەرەکەی ئەسکەندەری لەگەڵ خۆی بردە نێو یەکێك لە باخەکان، فەرمانی پێکرد درەختە گەورەکان لە ڕەگو ڕیشەڕا دەرکێشێ و نەمامەکان بچێنێ، کاتێك نوێنەرەکە گەڕایەوەو ئەم وتەیەی ئەرەستۆی گێڕایەوە، ئەسکەندەر گوتی: وەڵامێکی باشی داوەتەوە، تۆ لە مەبەستەکەی نەگەیشتووی: ئینجا ئەسکەندەر بە پەلەو بێ دواکەوتن میرەکانی لەنێوبردن و کوڕەکانی خۆی لەجێ دانان، (مەنکۆخان) ئەم قسانەی (محمود یلواج)ی پەسند کردن و فەرمانیدا: لە گەردنی گیراوەکان بدرێ و پۆستەکانیان بدرێنە دەست خەڵکانی تر.[١]

أـ چاکسازیە نێوخۆییەکانی (مەنکۆخان):

مەنکۆخان بایەخێکی زۆرو گەورەی بە چاکسازیە نێوخۆییەکان و سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی داو توانی سەرکەوتنێکی بێ وێنە لەم پێناوەدا بۆ خۆی تۆمار بکا،(مەنکۆ) لە حوکمڕانە هەرە باشەکانی مەغۆل دادەنرێ کە بە باشترین شێوە سیاسەتی مەغۆلەکانی کردووە، ئەو لەگەڵ ئەوەدا زۆر سوور بوو لەسەر پابەندبوون بە بەندەکانی (یاسا)و پاراستنی کلتوری (مەغۆل)، بەڵام بە حوکمی ئەوە ماوەیەکی درێژخایەن لە نێو ئەو گەلانەدا ژیابوو کە شارستانی بوون و زۆریان لەگەڵ تێکەڵ ببوو، ئەوا کاریگەری ئەوانیشی بە سەرەوە بوو، ڕقی لە ڕابواردن و دیاریو بەخشین دەبۆوە، جگە لە ڕاو هیچ ئاواتێکی تری نەبوو، زۆر چاك بوو، بە زیرەك و زیرەك و زرنگ بوو، لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا لێهاتووبوو، سەربازێکی تێکۆشەرو سیاسیەکی شارەزابوو، بەم سیفەتانەیەوە توانی بە شێوازێکی تازەو گەرم و گوڕیەکی لە نوێ هێزو پێزو گیان و ژیان وەبەر کەلەشی ئیمپراتۆریەتەکەی (جەنگیزخان)ی باپیریدا بکاتەوە.[٢]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٠٩، جامع التواريخ ٢١/٢٩٦ـ٢٩٧.

٢ المصدر نفسه ص: ٢١٠.

ب ـ ئەنجامدانی یەکسانی لە نێوان تیرەو تایەفەکانی نێو ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل):

(مەنکۆخان) جیاوازی نەدەخستە نێو تیرەو تایەفەو گەلانی ژێر ئیمپراتۆریەتەکەی، بە یەکسانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ مەسیحیو موسڵمانو بوزیەکاندا دەکرد، ئازادی بۆ هەموو لایەك دابین کردبوو، ئەگەر ڕێگای بە یەکێك لەوان دابایە گفتوگۆی مەسەلەکانی ئایین لەگەڵ یەکێکی تردا بکات کەشو هەوایەکی ئازادی بۆ دروست دەکردن، هەرچەندە (مەنکۆ) لەسەر بیروباوەڕی کۆنی (شامانی) مابۆوە، بەڵام بەبێ جیاوازی بەشداری لە جەژنەکانی بوزیو مەسیحیو ئیسلامیدا دەکرد، باوەڕی بە خودای تاقانە هەبوو دەیگوت: پێویستە هەموو مرۆڤێك چۆن حەز دەکات با ئەوا بیپەرستێ.[1]

(مەنکۆ) لەم سیاسەتەیدا پەیڕەوی لە (سورقویتی بیکی)ی دایکی دەکردو لە لایەن ئەوەوە کاریگەری گەورەی لەسەر دانرابوو، ئەم ژنە هەرچەندە لەسەر ئایینی مەسیحی بوو، بەڵام ڕەفتاری لەگەڵ موسڵمانانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەیدا خۆش بوو، خۆشی دەویستن، بە تایبەتیش ڕێزو خۆشەویستی زۆری بۆ مەلاو زانایانیان دەخستەڕووو بە دیاریو بەخششی زۆرو گرانبەها بەسەری دەکردنەوە، هەر بەمە ڕانەوەستا، بەڵکو لە بوخارادا قوتابخانەیەکی گەورەی لەسەر حیسابی سەرمایەی تایبەتی خۆی دروستکردو موڵكو ماڵێکی زۆری لەسەر وەقف کردو (شیخ الاسلام سیف الدین الباخرزی)ی کردە سەرپەرشتیاریو مامۆستای لەسەر دامەزراندنو مشوری لە کاروباری قوتابیو فەقێیەکانی دەخواردو مەسرەفی دەکێشان، خێری بەسەر هەزارە موسڵمانەکاندا دەبەخشیەوە، بەم شێوەیە (سورقویتی بیکی) لەسەر خێرو خێراتو کاری چاکە بەردەوام بوو، تا لە مانگی ذي الحجة ٦٤٩ك/١٢٥١ز کۆچی دوایی کرد.[2]

ج ـ پرۆژەی هاوپەیمانی نێوان مەغۆلو مەسیحیان:

(مەنکۆخان) پێشوازیەکی گەرمی لە نێردراوی (لویس) کردو ڕێگەی پێدا بەوپەڕی ئازادی گفتوگۆ لەگەڵ زانایانی موسڵمانو بوزیدا بکات، بەڵام وەڵامێکی تەواوو تینوشکێنی سەبارەت بە دروست کردنی یەکێتی نێوان مەغۆلو مەسیحیان نەدایەوە، بەڵکو داوای لێکرد بە لویسو تێکڕای شا مەسیحیەکان ڕاگەیەنێ بە پەلە بێنە ژێر ئالای دەوڵەتی مەغۆلەوە، ئەمەو (ڕۆبرۆق) ماوەی (٥) مانگ لە (قەراقورم)ی پایتەخت مایەوە، دوای ئەمە بەرەو (شام)

---

١ المصدر نفسه ص: ٢١١.
٢ المصدر نفسه ص: ٢١١.

گەڕایەوە، لە شاری (عەکا) لەگەڵ (لویس) کۆبۆوەو نامەکەی (مەنکۆ)ی پێدا.[١] (خانی مەغۆل) دەیەویست سەروەری خۆی بەسەر هەموو جیهاندا بسەپێنێ، لە سیاسەتی دەرەوەیدا بێ ئەنداز سادەو ساکار بوو، دۆستەکانی — لە دەوڵەتانی دراوسێ — بە شوێنکەوتووی خۆی دادەنان، بەڵام بە چاوی دوژمنایەتی سەیری ناحەزەکانی دەکردن و دەیگوت کە پێویستە لە ڕەگ و ڕیشە دەربکێشرێن، یان زەبون و سەرشۆڕ بکرێن تا گەردنکەچی خۆیانی بۆ دەنوێنن، (ولیم رۆبروق)ی نێردراوی (لویس) هەموو هەوڵەکانی خۆی لە لای (مەنکۆخان) خستنە گەڕ، گەیشتە ئەو دەرەنجامە: هەر کاتێك (لویس)و میرە گەورەکانی مەسیحی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خۆیان و نەتەوەکەیان لە بەرامبەر سەروەری جیهاندا نواند، ئەوا بە بەڵێنی ڕاست و دروست و هاوکاری تەواوی (کیوك خان) دەگات، بەڵام (پاشای فەرەنسا) بەم مەرجانە قایل نەبوو (ڕۆبروق)یش لە ئۆغستۆسی ١٢٥٤ز یدا (قەراقورم)ی بەجێهێشتوو بەرەو کۆشکی (باتۆ) ملی لێنا، ئەو ڕێگەی ئاسیای نێوەڕاستی بڕی و ئینجا چووە نێو خاکی قەوقازو لەوێشڕا بەنێو وڵاتی سلجوقیەکان و ئەنازۆڵی ئەرمینیادا ڕۆیشت و لەوێشەوە خۆی گەیاندەوە (عەککا)، شایانی باسە (ڕۆبرۆق) لەم گەشتەیداو لە هەموو شارو ئاوەدانی و — ڕێگاوبانێکدا ڕێزێکی وای لێدەگیرا کە شایستەی نێردراوێك بێ لە لایەن خانی گەورەوە حیسابی بۆ کرابێ، هەرچۆنێك بێ (ڕۆبروق) لەم گەشتەیدا زانیاریەکی زۆرو بەسوودی لەسەر مەغۆلەکان دەستکەوت، ئەو — لە سەفەرنامەکەی خۆیدا — باسی سروشت و کلتوورو ژیانی کۆمەڵایەتی مەغۆلەکانمان بۆ دەکات، چ شتێکی تریشی لەم گەشتەیدا بەرچاوی هاتبێ باسی لێوەکردووە، ئەو باسی هەموو هۆزو گەل و پێکهاتەکانی ڕەگەزی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی و هەموو ئەو گەلانەش (جەنگیزخان) خستبوونیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە کردووە.[٢]

س ـ سیاسەتی دەرەوەی (مەنکۆخان):

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر حوکومەتەکەیداو جێگیربوونی بارودۆخی نێوخۆو کۆتایی پێهێنانی تەواوی ناحەزە سیاسیەکانی، ئینجا (مەنکۆخان) بایەخی بە پرۆسەی داگیرکاری و بەرفراوانکردنی خاك و زەمینی ئیمپراتۆریەکەیدا، بڕیاریدا هەموو ئەو وڵاتانە داگیربکات، کە تا ئێستا نەتوانراوە زەوت بکرێن، بۆ ئەم مەبەستە دوو هێرشی سەربازی گەورەی ڕێکخستن،

---

١ الدولة الخوارزمية والمغول ص: ٢٤٨، المغول للصياد ص: ٢١٢.

٢ تأريخ مفصل عن ايران، عباس إقبال ١/١٦٠.

(هۆلاکۆ)ی برا بچووکی کردە سەرکردەی یەکێکیان و لەنێوبردنی دەسەلاتی (فیرقەی ئیسماعیلیە)و ژێر دەستەکردنی (خەلیفەی عەباسی) خستە ئەستۆ، (قوبیلا)ی برا نێوەنجیشی کردە سەرکردەی هێزەکەی ترو زەوتکردنی هەرێمەکانی (چینی باشور)ی پێ سپارد، (مەنکۆخان)یش هەڵمەتێکی سەربازی تری بۆ خۆی ڕێکخست و بڕیاریدا لەنێو ئەو وڵاتە بەرفراوانەدا هەندێك هەرێمی تر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.[١]

هـ ـ هەڵوێستەیەك بۆ توێژینەوە:

–سنووری دەوڵەتی تەتار لە ساڵی ٦٣٩کۆچیدا بەم جۆرە بوو: کۆریا لە خۆرهەڵاتەوە تا (پۆڵەندا) لە خۆرئاواوە، (سیبریا) لە باکوورەوە تا (دەریای چین) لە باشورەوە، ئەمە خۆی لە خۆیداو لەو ماوە کورتەدا بەرفراوانیەکی سامناکە، بەم شێوەیە هێزی تەتار لە جیهان تاکە هێزێك بوو، کە لە گەورەیی و زۆرو زەوەندیدا وێنەی نەبوو.

–دوابەدوای (ئۆکتای)، (کیوك)ی کوڕی سەرکردایەتی (تەتار)ی کرد، ئەم خانە نوێیە پێی وابوو لە جیاتی داگیرکردنی خاك و وڵاتی نوێ کە ناتوانن بەڕێوەیان بەرن و بیانپارێزن، دەبێ پایەکانی دەسەلاتیان لە نێو وڵاتە گیراوەکاندا بچەسپێنن و ژێردەستەیی گەل و سوپاکانیان مسۆگەر بکەن، بۆیە لە سەردەمی ئەم (خانەدا) پەلامارەکانی (تەتار) ڕاگیران و دەستیان لە موڵك و دەوڵەتە فراوانەکەیان گیر کردو لە ئالۆزی و داڕوخان پاراستیان.

–(تەتار) لە هێرشەکانی پێشدایاندا نیوەی بەشی خۆرهەلاتی ئیسلامیان داگیرکردبوو، زۆربەی هەرێمە ئیسلامیەکانی ئاسیایان خستبوونە نێو دەوڵەتەکەی خۆیانەوە، هەموو دیاردە شارستانیەتیەکانیان لەنێو بردن، تەواوی بزوتنەوەکانی بەرەنگاریشیان سەرکوت کردن، ئەم بارودۆخە تا ساڵانێکی زۆر درێژەی کێشا.

–بەشی نێوەڕاستی جیهانی ئیسلامی لە عێراقەوە تا میسر خاکێکی پارچەپارچەو کەلانێکی پەرتەوازەو ناکۆکی هەبوون، لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی دەوڵەتانی جیهان بەبەرچاوی ئەوانەوە لە لایەن سوپاکانی (تەتار) دەڕوخێنران، لەم ساتەوەختانەدا خۆیان بە ناکۆکی نێوخۆوە خەریك دەکردو ڕۆژبەڕۆژ لێکترازان و دەست لێك بەردان زیاتر دەبوو، بە هەمان شێوە بەشی خۆرئاوای (جیهانی ئیسلامی)یش کە (لیبیا و تونس و جەزائیرو مەغریب و خۆرئاوای ئەفریقیا) لە خۆ دەگرێت، بە تەواوەتی لێکهەڵوەشابوو.

---

١ المغول للصیاد ص: ٢١٦.

–ئەورووپای مەسیحی دەردی بە دەست (تەتار)ەوە چەشتبوو، سەدان هەزار کەسیان لێ سەربڕدرابوون، کەنیسەکانیان ڕوخێنرابوون و شارەکانیان سوتماك کرابوون، بەڵکو هەڕەشەیەکی سامناکی ڕاستەقینە بەر دەرگای پێکرتبوون و دەترسان (تەتار) خۆ بە (ڕۆما)ی پایتەختی نەسرانی کاسۆلیکیدا بکات و ئەوەی ناشێ بیکات.

–هەرچەندە مەسیحیەکان بە چاوی خۆیان کردارەکانی (تەتار)یان بینیبوو، بەڵام ڕاوبۆچوونی پاشاکانیان لە ئەورووپای خۆرئاوا (فەرەنساو ئینگلتەراو ئیتاڵیاو ئەڵمانیا) لەسەر ئەمە بوو کە: ئەم قۆناغە کاتیەو لە شوێنێکدا ڕاوەدەستێ...، لەبەر ئەمە خاچپەرستەکان و پاشاکانیان ئامادەیی تەواوی خۆیان بۆ هاوکاری (تەتار) دەردەبڕی[١] لە دژی موسڵمانان.

–پاش ئەنجامدانی هێرشەکانیان بۆ سەر ئەورووپا، سوپای تەتار نیمچە گۆڕانێك لە بیروباوەڕیاندا ڕوویدا، لەم کاتەدا ژمارەیەکی زۆری سەرکردەکانی (مەغۆل) هاوسەرگیریان لەگەڵ کیژانی مەسیحیدا ئەنجامدا، بەم شێوازەو بە ڕێژەیەکی بەرچاو بیروباوەڕی ئاینی مەسیحی هاتە نێو کۆشکەکانی ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل)ەوە، ئەمە هاریکاریەکی باشی بۆ هاوکاری نێوان تەتارو خاچپەرستان ڕەخساند.

–هێرش و هەڵمەتی خاچپەرستان بۆ سەر موسڵمانانی میسرو شام بەردەوام بوو، لەم کاتەدا میسرو شام لە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەییوبیاندا بوون بەڵام ئەم ڕۆژانە بە دواڕۆژی دەسەڵاتی ئەیوبیان دادەنرێن، لەنێوخۆیاندا لە ململانێدا بوون، موسڵمانان لە دوو لاوە بەر گورز کەوتن، گورزی تەتارو گورزی خاچپەرستان، لەگەڵ ئەمەشدا کۆڵیان لە ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕی خۆبەخۆ نەدەهێنا.

–لە ساڵی ٦٤٠ی کۆچیدا (المستنصر بالله)ی خەلیفەی عەباسی کۆچی دوایی کرد، (المستعصم بالله)ی کوڕی جێگەی گرتەوە، لەو کاتەدا خەلیفە (المستعصم) تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو، هەرچەندە ناوبانگی دەرکردبوو کە زۆر قورئان دەخوێنێت و تەماشای تەفسیرو شەرع دەکات و خێرخوازی چاکە، بەڵام زۆر لە سیاسەت شارەزا نەبوو، سەرناس نەبوو، پیاوی چاك و خراپی لێك نەدەکردنەوە، لەبەر ئەمە بە نەزانی تێکەوت و داورودەستەیەکی گەندەڵی دروست کردو خیلافەت لە پێشدا چەند لاواز بوو هێندەی تر زەبوون و لاواز بوو، بە ئیزنی خودا لەمەولا بە دوورودرێژی باسی لێوە دەکەین.

---

١ قصة التتار ص: ٩٣.

-جگە لە سنوورێکی تەنگەبەر لە خۆرئاوای هەرێمی فارس (خۆرئاوای ئێرانی ئێستا ـ شیراز-) هیچ مەودایەکی تر لە نێوان مەغۆلەکان‌و خیلافەتی عەباسیدا نەمابوو، ئەم سنوورە لەگەڵ گرنگیەکەیدا زۆر تەنگەبەر بوو، فیرقەی (ئیسماعیلیە)ی شیعەی خەتەرناك لەوێدا دەژیان، پیاوی مەیدانی جەنگ‌و کوشتار بوون، جگە لەوەی شوێنەکەیان شاخاوی‌و عاسێ بوو، قەڵاو شورەی مەحکەمیشیان دروست کردبوون، بە بەردەوامی لە دژی مەزەبی سوننەت‌و جەماعەت دەجوڵانەوەو زۆریان رق لێ دەبوونەوە، بە زۆری لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا هاوکاریان دەکرد، جار هەبوو نامەیان بۆ (تەتار) دەنارد جاریش بۆ هەبوو خاچپەرستان، مەغۆلەکان دەرکیان بە بوونیان دەکرد، بەڵام متمانەیان پێ نەدەکردن، ئەوان حەزیان نەدەکرد هیچ سوپایەکی بەهێزو توانا لەسەر رووی زەویدا بمێنێ جگە لە سوپای خۆیان.[١]

## چوارەم: (هۆلاکۆ)و لەنێوبردنی (ئیسماعیلیە):

دوابەدوای ڕوخاندنی دەوڵەتی خوارەزمی‌و دەست بەسەرداگرتنی هەرێمەکانی، دەروازەکانی وڵاتانی خۆرئاوای ئیسلامی لە ڕووی هێرشەکانی مەغۆلدا کرانەوە، حوکمڕانانی ئیسلام بایەخی دەوڵەتی خوارەزمیان دەزانی کە چۆن وەك بەربەستێکی بەهێزو دامەزراو لە نێوان ئەوان‌و مەغۆلەکاندا ڕاوەستاوە، هەر چۆنێك بێ (مەنکۆخان) هێرشی سوپاکەی (هۆلاکۆ)ی هێند بە تێرو تەسەلی ئامادە کرد، کە سەرکەوتن مسۆگەر بکات، لە پێش سوپاکەوە چەند ڕێناسێکی بە ڕێگای نێوان (قەراقورم)و کەنارە ئاوەکانی دەریای ـجەیحون)دا ناردن، تا ڕێگاکە تاقی بکەنەوە، ئەمەو چەند پردە بازێکیان بەسەر ڕووبارە قوڵ‌و تیژڕەوەکاندا دروست کردن،[٢] ئینجا نەخشەی دارێژراوی هێرشەکەی بۆ (هۆلاکۆ)ی برای خستەڕوو و گوتی: ئێستا تۆ بەسەر سوپایەکی گەورەو هێزێکی بێ هەژمارەوەی، پێویستە لە (توران)ەوە تا (ئێران) بڕۆی، لە هەموو کارێکی وردو درشتدا پارێزگاری لە کلتورەکانی جەنگیزخان‌و قانونەکانی بکەی، هەر کەسێك لەم وڵاتە فراوانەتدا لە (جەیحون)ەوە تا ئەوپەڕی وڵاتی (میسر) گوێڕایەڵی فەرمانەکانت دەکات‌و خۆ لە لاملی دەپارێزێت بەوپەڕی سۆزو خۆشەویستی‌و نازو نیعمەتەوە ڕەفتاری لەگەڵ بنوێنە، بەڵام هەر کەسێك سەرپێچی کردی بە خۆی‌و خاوو خێزانی‌و ژن‌و منداڵی و خزم‌و کەس‌و کاریەوە لە نێو جلێتاوی سەرشۆڕی‌و سوك‌و ڕیسواییدا بیخنکێنە.

---

١ قصة التتار د. راغب السرجاني ص: ٩٤.

٢ جامع التواريخ ١/٢٣٥، جهاد المماليك ضد المغول ص: ٤٦.

لە هەرێمی (کوهستان)ی (خۆراسان)ڕا دەست پێ بکە، هەرچی قەڵاو شورە هەیە بیڕوخێنە، ئەگەر (خەلیفە)ی بەغدا هاتە پێش و فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی خۆی بۆ (مەغۆل) خستەڕوو، بە هیچ شێوەیەك توخنی مەکەوە — و زیانی پێ مەگەیەنە —، بەڵام ئەگەر خۆی بە زل زانی و سەرپێچی کرد بیخە ڕیزی لەنێوبراوانەوە، هەروەها دەبێ عەقڵی دامەزراوت و ڕای ڕێکوپێکت لە هەموو کاروبارێکدا مەشخەڵت بن، دەبێ لە هەموو حاڵێکدا وریاو بە ئاگا بی، دەبێ باری سەرشانی ژێردەستەکانت سوك بکەیت و خۆشگوزەرانیان بکەی، وڵاتێکیش وێران بووە، یەکسەر دروستی بکەوەو ئاوەدانی بکەوە، باوەڕت پتەو بێ کە تۆ لەمەولا بە پشتیوانی هێزی خودای مەزن دەست بەسەر وڵاتانی دوژمنانتدا دەگریت، تا کار بەوە دەگا دەبیتە خاوەنی گەرمێن و کوێستان و زستانە هەوارو هاوینە هەوارێکی زۆر، سەبارەت بە هەموو کێشەکان و کاروبارەکان ڕاوێژ بە (دقوزخاتون) بکە،[١] ئینجا لە ساڵی ٦٥١ك/١٢٥٣ز یدا (هۆلاکۆ)بە سەرکردایەتی سوپاکەی (قەراقوم)ی پایتەختی مەغۆلی بەجێ هێشت و بەرەو ئامانج بەڕێکەوت، میرەکانی (مەغۆل) لەسەر ڕێگاوبانی هەرێمەکانی خۆیان بە خواردن و خواردنەوەی تەواوەوە پێشوازیان لێ دەکردن و ڕێگاکانیان لە بەردو دڕك و دار پاك دەکردەوەو لەسەر ڕووبارو دەریاکان کەشتیان بۆ ئامادەکردبوون تا پێیان بپەڕنەوە، هەریەکە لەو ئەمیرو پیاو ماقوڵانە سەربازێکی زۆریان ئامادە کردبوون و خستیاننە گەڵ ڕیزەکانی سوپای (هۆلاکۆ)وە.[٢]

لە شەعبانی ٦٥٣ك/١٢٥٥ز سوپاکە گەیشتە (سەمەرقەند)، (٤٠) ڕۆژ لەوێدا گوزەراندی و ئینجا بەرەو (کیش) بەڕێکەوت، لەم شارەدا تەواوی میرو حوکمڕانانی خۆراسان بە دیاری بەنرخەوە هاتنە لای (هۆلاکۆ)و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خۆیان نیشاندا، ئەمەو ماوەی مانگێك لە (کیش)دا مایەوەو ژمارەیەك نامەی بۆ پاشاو سوڵتانەکانی دەوڵەتانی هاوسێ نارد، داوای لێدەکردن بۆ لەنێوبردنی (ئیسماعیلیە)کان و تێکشکاندنی قەڵاو شورەکانیان هاوکاری بکەن، لە بەرامبەر ئەمەدا بەڵێنی دەدانێ کە لەسەر وڵاتەکانی خۆیان دەیانهێڵێتەوەو زیانیان پێ ناگەیەنێ، بەڵام ئەگەر هاریکاری نەکەن، ئەوا لەگەڵ (ئیسماعیلیەکان) توشی دەردی لەنێو بردنیان دەکات.[٣]

---

١ جهاد المماليك ضد المغول والصليبيينص: ٤٧.

٢ المصدر نفسه ص: ٤٧.

٣ جامع التواريخ ١/٢٤٠، جهاد المماليك ضد المغول ص: ٤٧.

### ١ـ دەرکەوتنی قەڵاکانی (ئیسماعیلیه):

(فاتیمیەکان) پێداگیر بوون لەسەر بڵاوکردنەوەی بانگەوازی شیعەگەری (ئیسماعیلیه) لە تەواوی دەوڵەتانی ئیسلامیدا، بانگەشەکەیان لە فارس و عێراق سەری گرت، دەسەڵاتی (ئیسماعیلیەکان) لە سەردەمی (مەلیکشا)ی سوڵتانی (سلجوقی)دا زیادی کرد، کار بەوە گەیشت دەستیان بەسەر (ئیسفەهان)دا گرت و لە سەردەمی (أحمدی کوڕی عبدالملك ی کوڕی عطاش)دا، بانگەوازی خۆیان تێدا بڵاوکردەوە، (حسن کوڕی صباح)ی بە ڕەگەز (یەمەنی) یەکێك بوو لە شاگردەکانی، باوکی بۆ (کوفە) دورخرابۆوە، لەوێشەوە بۆ (قوم)، ئینجا بۆ (ڕەی)، (حسن) لە (ڕەی) لە دایك بووو بنەماکانی بیروباوەڕی بانگەوازی (ئیسماعیلیه) لە (عبدالملك ی کوڕی عطاش)ی — بانگەوازچی ئیسماعیلیەی عێراق — ڕا فێربوو.

لە ساڵی ٤٧١ك (حسن) دوای ڕێگابڕینێکی مەترسیدارو بە مەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ (المستنصر)ی ئیمامی (فاتیمەکان) گەیشتە (میسر)، زیاتر لە ساڵێك مایەوەو شانسی چاوپێکەوتنی ئیمامی بەرنەکەوت، لەگەڵ تاقمێك فەرەنگی سواری کەشتی بووو میسری بەجێ هێشت، شەپۆلەکانی دەریا ڕووی کەشتیەکەیان بەرەو شاری (حەلەب) برد، لە حەلەبڕا بەرەو (ئیسفەهان)و لەوێڕا بەرەو قەڵای (ئاڵموت) گەڕایەوە، (نظام الملك)ی وەزیری گەورەی سلجوقی و دامەزرێنەری قوتابخانەکانی (نیزامیە) — کە لە کتێبی (السلاجقة)دا باسمان لێوە کردووە — لە (ئاڵموت)ی دەرکرد، بەڵام لە ساڵی ٤٨٣کۆچیدا لایەنگرانی (حسن) توانیان دەست بەسەر قەڵای (ئاڵموت = واتا هێلانەی قەلەڕەش)دا بگرن،[1] کاتێك (حسن) لە (ئاڵموت) جێگیر بوو جارچیانی بیروباوەڕەکەی بە هەموو لایەکدا بڵاوکردنەوە، شایانی باسە (حسن الصباح) بانگەشەی بۆ نزاری کوڕی (مستنصر)ی ئیمامی فاتیمیان دەکرد، چونکە (مستنصر) (نزار)ی کوڕە گەورەی لە ویلایەتی عەهد دەرکردبووو ئەم پۆستەی بۆ (مستعلی)ی کوڕی دانابوو، ئەو کاتە (حسن) لە میسر دەبێ‌و، بە حوکمی ئەوە جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە ئەمە لەگەڵ بیروباوەڕی (ئیسماعیلیه) نایەتەوە کە کوڕە گەورە فت بکرێ‌و کار بە کوڕی بچووك بسپێردرێت ڕەت دەکاتەوە، دوای ئەمە دەخرێتە زیندانەوە، پاش ئازاد بوون میسر بەجێ دێڵێت‌و لەو هەرێمانەدا دەستیان بەسەردا دەگرێت بانگەشە بۆ (نزار) دەکات.[2]

---

١ الدول المستقلة في المشرق ص: ١٩١.

٢ تأريخ مصر، ابن میسر ص: ٢٦ ومابعدها.

(حسن کوڕی صباح) دوابە دوای مردنی (مەلیکشا) کاری بۆ فراوانکردنی دەوڵەتەکەی کرد، دەوڵەتەکەی لەسەر بیروباوەڕی شیعە (ئیسماعیلیە)ی توندڕەو بوون، لە ئیسلامی ساغ دەرچووبوون، (أبو حامدی غزالی) کتێبێکی بە ناوی (فضائح الباطنیة) داناوەو تێیدا بیروباوەڕەکانی فیرقەی (ئیسماعیلیە)ی باتینی پوچەڵ کردونەتەوە،[1] منیش لە کتێبی (السلاجقة)دا بە دوورو درێژی قسەم لەسەر کردوون.

## ٢ـ ڕیشەکێش کردنی دەوڵەتی (ئیسماعیلیە):

لە مانگی ذي الحجەی ٦٥٣ک/یەنایەری ١٢٥٦ز، هۆلاکۆ فەرمانی بە وەستانی هاتوچۆی تێکڕای کەشتیو بەلەمەکانی دەریای (جەیحون) کرد، فەرمانیدا پردێك لەسەر ئەم ڕووبارە دروست بکرێتو هێزەکانی پێیدا بپەڕنەوەو لەوێڕا بەرەو قەڵاکانی (ئیسماعیلیە) بەڕێکەوت، لە لەوەڕگای (شبورقان)ی نزیك شاری (بەلخ) تاوڵیان هەڵدانو (هۆلاکۆ)و سوپاکەی زستان لەوێ مانەوە،[2] ئینجا هۆلاکۆ بە سەرکردایەتی سوپا سەرەکیەکەی خۆی، خۆی گەیاندە قەڵا قایمەکانی (ئیسماعیلیە)، جارجار بە فیڵو جارجار بە بەکارهێنانی هێز توانی یەك لەدوایەکی قەڵاکانیان بگرێت، ئەمەو لە کۆتایی ساڵی ٦٥٤ک/١٢٥٧ز یدا دواهەمین قەڵایان کە قەڵای (ئاڵموت) بوو گیراو (رکن الدین خوارەزمشا)ی سەرۆکی ئیسماعیلیان نەیتوانی چی دیکە خۆ لە بەرامبەر (هۆلاکۆ)دا ڕابگرێتو خۆی بە دەستەوەداو لە بەرامبەریدا سەری خستە سەر خاكو ماچی کرد، بەم شێوەیە مەغۆلەکان توانیان هەموو قەڵاکانیان کە ژمارەیان (١٠٠) قەڵابوو بگرن، ئەو قەڵایانەی کە ئیسماعیلیەکان ساڵانێکی دوورو درێژ کردبوویاننە هێلانەی خۆیان، (هۆلاکۆ) بەس بە دەست بەسەرداگرتنی قەڵاکانی (ئیسماعیلیە) لەم ناوچەیەدا ڕانەوەستاو، بەڵکو داوای لە (رکن الدین خوارەزمشا) کرد تەواوی قەڵاکانی (ئیسماعیلیە)ی لە وڵاتی شام بە دەستەوە بدا، ئەویش بەڵێی بۆ کردو بۆ ئەم مەبەستە چەند نوێنەرێکی بە هاوڕێیەتی نێردراوی (هۆلاکۆ) بۆ وڵاتی شام ناردنو بانگەشەی خەڵکیان دەکرد هەر کاتێك ئاڵای مەغۆلەکانیان گەیشتنێ بە پەلەو بێ دواکەوتن خۆ بە دەستەوە بدەن.[3]

## پێنجەم: جوڵانی سوپاکانی مەغۆل بەرەو بەغدا:

دوای ئەوە (هۆلاکۆ) ئیسماعیلیەکانی لەنێو بردن، بەپێی نەخشەی (مەنکۆخان)ی برای بەرەو پێکانی ئامانجی دووەمیو دەست بەسەرداگرتنی بەغداو لەنێوبردنی خیلافەتی

---

١ دولة السلاجقة للصلابي ص: ١٣٠.

٢ جهاد المماليك للغامدي ص:٤٨، نقلا عن جامع التواريخ.

٣ المصدر نفسه ص: ٤٩.

عەباسی هەنگاوی هەڵێنا، ئەو خیلافەتەی پیر ببووو دیاردەکانی لاوازیو ڕوخانی لێ دەرکەوتبوونو، لە ڕاستیدا دەردی لاوازیو لێکهەڵوەشان – پێش هاتنی مەغۆل بە ماوەیەکی دووروودرێژ – جەستەی خیلافەتی عەباسی داگیرکردبوو، ئەمەش لەبەر ئەو ڕستە هۆکارانەی کە هەندێکمان لە پێشدا باس کردنو هەندێکی تریش بە ئیزنی خودا لە دوایيدا باس دەکەین، پێوەندی نێوان خیلافەتو وڵاتانی ئیسلامی لێکهەڵوەشابوو، ژمارەیەکی زۆر دەوڵەتو میرنشینی سەربەخۆ لەنێو جەرگەی خیلافەتی عەباسیو دەورووبەریدا دروست ببوون، لەو کاتەدا مەغۆلەکان هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر وڵاتانی ئیسلامی لە بەشی خۆرهەڵاتدا دەست پێکرد (المستعصم بالله) خەلیفەی دەوڵەتی عەباسی بوو (٦٤٠_٦٥٦ك/١٢٤٢_١٢٥٨ز).[١]

### ١ـ بەڕێکەوتنی سوپای هێرشبەری مەغۆل بەرەو (بەغدا):

دوای پێکانی ئامانجی یەکەمیو لەنێو بردنی فیرقەی (ئیسماعیلیە)، (هۆلاکۆ) بەرەو پێکانی ئامانجی دووەمیو کۆتایی پێهێنانی خیلافەتی عەباسی بەڕێکەوت، ئەمەو لە ڕەمەزانی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز یدا (هۆلاکۆ) نامەیەکی پڕ هەڕەشەو گوڕەشەی بە نوێنەری خۆیدا بۆ (خەلیفە) نارد، تێیدا هاتبوو:

(لە کاتی گرتنی قەڵای خوا نەناسەکاندا نوێنەرمان بۆ لا ناردیو داوامان لێکردی بەهێزی سەربازیەوە بە هاوارمانەوە بێی، هەرچەندە فەرمانبەرداری خۆت خستبووە ڕوو، بەڵام بۆت نەناردین، خۆ نیشانەی فەرمانبەرداریو یەکبونت لەگەڵ ئێمەدا ئەمەبوو کە هەر کاتێك هێرش بکەینە سەر یاخیو سەرپێچیکاران هێزی سەربازیت لەگەڵ ئێمەدا ئامادەبێ، ئێستا سوپات نەناردووەو بەهانە دەهێنیتەوە، خۆ لەسەر زمانی هەموو خەڵك بە گشتیو خەڵکانی تایبەتو نزیکت بەگوێت گەیشتبوو: لە سەردەمی (جەنگیزخان)ەوە سوپای مەغۆل چ کارەساتێکی بەسەر جیهانو جیهانیاندا هێناوە،[٢] تا ئیمڕۆشی لەگەڵدا بیێ چی بەسەر (خوارەزمیو سلجوقیو پاشایانی دیالەمیو ئەتابەکیو خەڵکانی تری) خاوەن هێزو دەسەڵاتدا هێناوەو بە هەوڵو توانای خودای هەربووو قەدیمو دایم سەرکەوتنی بەسەریاندا تۆمارکردووە، هەرگیز دەروازەی (بەغدا) لە ڕووی یەکێك لەم تیرەو تایەفەیەو دەوڵەتانەی – ڕوخێنران– دا نەخرابوو، هەموو کاتو ساتێك کردبوویانە بنکەی دەسەڵاتی خۆیان، جا چۆن

---

١ جهاد المالكص: ٥٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٥٤.

ئەم دەروازە لە ڕووی ئێمەی خاوەن دەسەلات و سەڵتەنەت دادەخرێ؟ پێش ئەمە ئامۆژگاریمان کردبووی، ئێستاش پێت دەڵێین: لە ڕق و کینەو دوژمنایەتی دوورکەوەوە نەعلە بە دەستتەوە مەگرەو، ڕۆژ بە قوڕ سواغ مەکە، دەنا ماندوو دەبی، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەی ڕۆیی ڕۆیی، جا ئەگەر خەلیفە گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار دەبێ، با قەڵاکان بڕوخێنێت و چاڵەکانیش پڕکاتەوە، کاروباری وڵات بخاتە دەست کوڕەکەی و بۆ خۆی خێرا بێتە لامان، ئەگەر ناشیەوێ بێتە لامان، با وەزیرو سولەیمانشاو دوایدار بنێری، تا بەبێ کەم و زیاد پەیامی ئێمەی پێ ڕاگەیەنن، ئەگەر وەلامی فەرمانی ئێمەی دایەوە ئێمەش: داخ و ڕقی خۆمان دادەمرکێنینەوەو دەوڵەت و سوپاو جەماوەری وەکو خۆی و بەدەست لێ نەدراوی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر گوێی بۆ ئامۆژگاریەکان شل نەکردو دمبە دمەو دووبەرەکی و ناکۆکی هەڵبژارد، با سوپا ئامادەکات و گۆڕەپانی جەنگ دیاری بکات، ئەوا ئێمە لە بەرامبەریدا ڕاوەستاوین و ئامادەی جەنگانین، هەر کاتێك سوپاکەم بەرەو بەغدا بە ئاگری تووڕەوە هانداو پێشی کەوتم، ئەگەر لە ئاسماندا یان لە زەمیندا خۆت حەشار دابێ... ئەوا ڕۆژێك دادێ لە نێو کاکەشانی فەلەکەوە داتدەبەزێنم، هەروەکو شێر لە سەرێڕا بە زەویت دادەم، کەس بە زیندوویی لە وڵاتەکەتدا ناهێڵمەوە، شارو هەرێم و وڵات و تێکڕای خاکت دەکەمە خۆراکی ئاگر، جا ئەگەر دەتهەوێ خۆت و خێزان و بنەماڵەت بپارێزیت ئەوا عاقڵانەو زیرەکانە گوێ بۆ ئامۆژگاریەکانم بگرە، ئەگەرنا لەمەولا تەماشادەکەم داخۆ ویستی خودا چۆن دەبێ.[١]

خەلیفە (المستعصم) بە توندی داواکەی ڕەت کردەوە، بە نامەیەکی پڕ لە سوکایەتی پێکردن و بەکەم دانان وەلامی (هۆلاکۆ)ی دایەوەو تێیدا گوتی:

(ئەی جحێڵی هەرزەکار...ی هەڵوەدای تەمەنی کورت، هۆ ئەو کەسەی بە دوو ڕۆژی — سەرکەوتن — تەفرەی خواردووەو پێی وایە گەمارۆی هەموو جیهانی داوەو بەسەریدا زاڵ بووەو بە خەیاڵی خۆی بڕیارەکانی بەجێن و دەبێ سەربگرن، بۆچی و لەبەرچی داوای شتێك لە من دەکەی کە هەرگیز دەستت لێی گیرنابێ؟ چاك بزانەو ئاگادار بە: هەموو دانیشتوان لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرئاوا، لە پاشاکانەوە تا چەقۆ تیژکەرەوەکان، لە مەلاکانەوە تا پاپاکان، ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هەیەو کار بە ئاین دەکەن، هەر هەموویان بەندەی کۆشکی خیلافەت و سەربازی منن، هەر کاتێك پەنجە هەڵێنم، خەڵکم لە دەورە کۆدەبێتەوەو سەرەتا

١ جامع التواريخ، نقلا عن المغول للصياد ص: ٢٥٦.

کاروباری (ئێران) یەکلا دەکەمەوەو ئینجا بەرەو وڵاتی (توران) دەچمو کەسانی شیاو لە جێگای شیاوی خۆیان دادەنێم، لەو کاتەدا سەر ڕووی زەمین بە نیسبەت ئێوەوە پڕ دەبێ لە ئاڵۆزی دڵەڕاوکێ —، بەڵام نە دەمەوێ دوژمنایەتیو ڕکەبەری — لەگەڵ ئێوە — بکەم، نە دەشمەوێ زیانو زەرەر بە خەڵك بگەیەنم، لە هەمان کاتیشدا کە من لەگەڵ (هۆلاکۆخان) یەك دڵو یەك زمان بێن حەز ناکەم خەڵك لە پشت هاموشۆی سوپاوە پێم هەڵبڵێنو باسی خێرم بکەن، یان بە پێچەوانەوە ڕەخنە بگرنو زەمبم بکەن، جا ئێستا ئەگەر تۆ وەکو من دەتەوێ تۆوی خۆشەویستی بچێنی، باشە لەگەڵ ئەمەدا چ کارێکت بەسەر قەڵاو شورەو چاڵو سەنگەری ژێر دەستەکانی منەوە هەیە؟ ڕێگای دۆستایەتی بگرەبەرو بەرەو (خۆراسان) بگەڕێوە، خۆ ئەگەر بە نیازی شەڕو جەنگانیشی، بەڵگەو بیانو مەگرەو ماوەی چاوتروکانێك ڕامەوەستە، من هەزاران تاقمە سوارو هەزاران تاقمە پیادەڕەوم لەبەردەستدانو خۆیان بۆ جەنگ سازکردووە، ئەوان لە کاتی جەنگانو شەڕە شمشێردا تۆز لە ئاوی دەریا هەڵدەستێنن.[١]

نێردراوەکانی خەلیفە گەیشتنە لای (هۆلاکۆ)، کاتێك نامەی خەلیفەی خوێندەوەو بە ئازاردرانی نێردراوەکانی زانی لە لایەن خەڵکی بەغداوە، بە توندی تورە بوو، نێردراوەکانی موسعتەسەمی بە نامەیەکی ترەوە بەڕێکردنەوە، نامەکە بە زمانێکی توندو تیژ نوسرابوو دواهەمین هۆشداریشی لەخۆگرتبوو، گوتبووی: خۆشەویستی پلەو پایەو ماڵو سامان تووشی بەڵای کردوی، بە جۆرێك سەرت بەم دەوڵەتە فانیەوە سورماوەو تەفرەت خواردووە گوێت گران بوونو ئامۆژگاری خێری دڵسۆزان نابیستیو بە هیچ کارت تێ ناکرێ، بە ڕاستی لە ڕێگەی باوكو باپیرانت ترازاوی، کەواتە لە ئێستاڕا خۆت بۆ جەنگو ڕووبەڕووبوونەوە ساز بکە، چونکە ئەوا من بە سوپایەکەوە کە هەر دەڵێی مارو مێروووەو ڕەوەی کوللەیە بەرەو (بەغدا) بەڕێ دەکەوم، ئەگەر گەردوون بە شێوەیەکی تریش وەرچەرخێ، هەر بە ویستو خواستی خودای مەزنو باڵادەستە.[٢]

(هۆلاکۆ) پێش ئەوە دەست بە هێرش بکا، سەبارەت بە هەڵاتنو ئاوابوونی ئەستێرەی بەختو بەدبەختی ڕاوێژی بە ئەستێرە ناسان کرد، (حسام الدین)ی گەردوونناس لە لایەن (مەنکۆخان)ەوە بە هاوڕێیەتی (هۆلاکۆ) هاتبوو، لەبەر ئەوە سوننی مەزهەب بووو سۆزی بۆ

---

١ وثائق الحروب الصليبية والغزوالمغولي، محمد ماهر حمادة ص: ٣٤٧.
٢ جامع التواريخ، نقلا عن المغول للصياد ص: ٢٥٦.

(خەلیفە) دەبزوا، زۆر داکۆکی دەکرد هۆلاکۆ هەنگاو بەرەو (بەغدا) نەنێ، دەهاتو دەچوو بۆی دوپات دەکردەوە کە ئەم هێرشە کارەساتێك بەسەر سیستەمی گەردووندا دێنی، وێڕای ئەمەش دەرەنجامە شومەکەی بەسەر خودی (خان)دا دەشکێتەوە، لەو ڕستەقسانەی (حسام الدین) کردنی: لە ڕاستیدا هەر پاشایەك – تا ئەم ساتە وەختە – خۆی ئازاکردبێ‌و خیلافەتی بە ئامانج گرتبێت‌و بە سوپاوە بەرەو (بەغدا) کشابێ یەکسەر تەختو تاراجی حوکمی لێکهەڵوەشاوەو لە ژیانیدا نەماوە، خۆ ئەگەر (هۆلاکۆخان) گوێ لە ئامۆژگاریەکانم نەگرێت‌و پرۆژەکەی جێبەجێ بکات ئەوا (٦) کارەساتی گەورەی لێ دەکەونەوە:

–هەموو ئەسپەکان مردار دەبنەوەو سەربازەکانیش نەخۆش دەبن.

–هەرگیز خۆر هەڵنایە.

–ڕووەك لە زەویدا شین نابێ‌و ناڕوێت.

–هەرگیز باران نابارێت.

–ڕەشەبای توند هەڵدەکات‌و جیهان بە دەست بوومە لەرزانەوە دەناڵێنێ.

–(خانی مەزن) لەم ساڵەدا دەمرێت.[1]

بەلام میرو سەرکردەکان گوتیان: ڕۆیشتن بەرەو (بەغدا) خۆی لە خۆیدا بەرژەوەندیە، پاش ئەمە هۆلاکۆ بانگهێشتی (نصیرالدین طوسي)ی کردو ڕاوێژی پێکرد، لەبەر ئەوە (طوسي) ڕکی لە (خەلیفە) دەبۆوە حەزی لە ڕووخانی دەکرد، هەرچی (حسام الدین) گوتبووی هەر هەمووی هەڵوەشاندەوەو (هۆلاکۆ)ی دڵنیا کرد کە هیچ بەربەستێك لە نێوان ئەوو داگیرکردنی بەغدادا نیە، بەڵکو بەڵگەگەلێکی بەهێزیشی هێنانەوە کە هەواڵەکانی (حسام الدین) بە درۆ دەخەنەوە، گوتی: زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە پێناوی بەرگریکردن لە ئاین گیانیان لەدەست داوە، لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کارەساتێك ڕووی نەداوە، خۆ ئەگەر بشگوترێ ئەمە تایبەتە بە – ڕۆڵانی (عەباس)ەوە، ئەوا دەبینین زۆر کەس لە دژی ئەم بنەماڵە شۆڕشیان کردووەو هەندێکیان (خەلیفە)یان لێ کوشتوون‌و بەمەش هیچ ڕووی نەداوە، ئینجا (طوسي) نموونەی بە (طاهری کوڕی حسین)ی سەرکردەی سوپای (مأمون) هێنایەوە کە (محمد أمین)ی کوشتووەو باسی ئەو میرانەشی کرد کە (متوکل‌و منتصرو معتز)و غەیری ئەوانیشیان لێ کوشتوون.[2]

---

١ المغول للصیاد ص: ٢٥٩.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٦٠.

**٢ـ گەمارۆدانی بەغدا:**

دوابەدوای ئەمە (هۆلاکۆ) فەرمانی بە سوپا مەغۆلیەکانی دەوروبەری وڵاتی ڕۆمدا لە ڕێگای (هەولێر) ئەربیلو موسڵەوە بە ئاراستەی بەغدا بکشێنو لە باری خۆرئاواوە دەورەی بتەنو تا سوپاکانی (هۆلاکۆ) لە لای خۆرهەڵاتەوە پێیان دەگەن چاوەڕێ بکەن، (کیتوبۆقا)ی سەرکردەی هەرە چاکی (هۆلاکۆ)ش لە باڵی چەپەوەو لە ڕێگای (لوڕستانو خوزستان)ەوە بەرەو پایتەختی عەباسی هات، بە هەمان شێوەو ژمارەیەك لە میرو سەرکردەکانی تری مەغۆل لە ڕێگەی (کوردستان)ی ئێستاوە خۆیان گەیاندە دەورەی بەغدا، لە سەرەتای مانگی موحەڕەمی ساڵی ٦٢٥ك/١٢٥٧ز هۆلاکۆ لە (هەمەدان)ەوە لە ڕێگای (کرماشانو حەلوان)*ەوە بەرەو (دیجلە) هات، (ئەمیر ئەرغۆنو خواجە نصیرالدین طوسيو سیف الدین بێتکەچی وەزیر[١] و علاء الدین عطاء الجویني)ی لەگەڵدا بوون، (هۆلاکۆ) لە ڕێگاداو لە ناوچە شاخاویەکانی هاوسنووری (عێراق)دا لە ڕێی بەخشینیماڵو سامانەوە خەڵکێکی زۆری بە لای خۆیدا ڕاکێشا، بە هەمان شێوە توانی هێزێکی زۆری سەربازی لە سوپای (سلیمان شا) بخاتە نێو ڕیزی سوپاکەی خۆیەوە.[٢]

(بدرالدین لۆلۆ)ی حوکمڕانی (موسڵ)و (ئەتابەك أبوبکر) لە هەرێمی (فارس) بە ماڵو بە پیاو کۆمەکی (هۆلاکۆ)یان کرد، کاتێك هەموو هێزەکانی (مەغۆل) هاتنو لە دەورەی (بەغدا) ئاپۆڕایان بەست، (هۆلاکۆ) لە شوێنێکی بەرزی دەرەوەی بەغدا هەڵیدا، سوپا سازکراوەکەی (خەلیفە) بە سەرکردایەتی (مجاهدالدین ئایبەك دەوایداری بچووك) ویستی نەهێڵێ هێزەکانی مەغۆل جێگیر بنو مۆڵ بن، بەڵام بە خراپی تێکشکاو ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی لە لایەن مەغۆلەکانەوە کوژران، ئەمەو لە ڕۆژی ٣ شەممە ٢٢محرم ٦٥٦ك/١٢٥٨ز گەمارۆی سەر بەغدا توندکراو تا کۆتایی مانگ درێژەی کێشا، لەم ماوەیەدا مەغۆلەکان دەستی وێرانکاریان بۆ سەر شار درێژ دەکردو دەستیان بە داگیرکردنی بورجو قەڵاکان کرد، کار بەوە گەیشت لەم قۆڵە پەلامارانەیاندا قەڵاو شورەکانی بەشی خۆرهەڵاتیان داگیرکردن.[٣]

**٣ـ سازشەکانی کۆتایی:**

خەلیفە تەنگاو بوو، ویستی لە ڕێی ناردنی نوێنەرو دیاری بە نرخو گرانبەهاوە مەغۆلەکان ئارام بکاتەوەو لە داگیرکردنی بەغدایان پاشگەز بکاتەوە، بەڵام هۆلاکۆ وەڵامی نەدایەوە،[٤]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٦٠.
٢ المصدر نفسه ص: ٢٦١.
٣ المصدر نفسه ص: ٢٦٢.
٤ المصدر نفسه ص: ٢٦٢.

خەلیفە پەنای بۆ (مؤیدالدین ی علقمي)ی وەزیریو بە مەزەب شیعە بردو پرسیاری لێکرد چ بکات باشە؟ وەزیر ئاماژەی پێدا کە بە خودی خۆی لەگەڵ (هۆلاکۆ) دانیشێتو سازشی لەگەڵ بکات، نێردراوەکان چوونە لای (هۆلاکۆ)و هەواڵیان پێدا (خەلیفە) دێتە لات، (هۆلاکۆ)ش فەرمانیدا (خەلیفە) بێ، بەڵام بە تەنها نا، بەڵکو دەبێ تەواوی گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەیو وەزیرەکانیو زانایانی ئایینیو سەرکردەو پیاو ماقوڵانی خەڵکی لەگەڵدا بێنو هەموویان ئامادەی گفتوگۆکان بن، چونکە بە بۆچوونی (هۆلاکۆ) تەنها بەم شێوەیە سازش دەکرێتو هەموو لایەکیش پێیەوە پابەند دەبن.

(خەلیفە) گەورە پیاوانی کۆکردەوەو بە خۆیو وەفدێکی بە سامەوە بەرەو تاوڵەکەی (هۆلاکۆ) – کە لەودیوی شوورەی بەشی خۆرهەڵاتی بەغدا هەڵیدابوو – ڕۆیشت، کە بەڕێکەوت: فرمێسك لە چاویدا قەتیس ماو وشك هەڵات، خوێن لە دەمارەکانیدا بەستی، لێدانەکانی دڵی خێرا بوون، بەرەو هەناسە سواریو پشوو تەنگی ڕۆیشت، خەلیفە بە سوكو چروکیو داماوی هاتەدەر، ئەو تا دوێنێ لەم کۆشکەیدا پێشوازی لە وەفدی میرو پاشایان دەکرد، باپیرەپێشینەکانی لەم کۆشکەڕا – کە ئێستا خەلیفە لێی هاتەدەر – سەرکردایەتی هەموو دنیایان دەکرد، وەفدەکەی خەلیفە زۆر گەورە بوو، (٧٠٠) گەورە پیاوی (بەغدا)ی لەخۆر گرتبوو، بە تەبیعەت (مؤیدالدین ی علقمي) وەزیریشی لەگەڵدا بوو، وەفدەکە لە تاوڵەکەی هۆلاکۆ نزیك بۆوە، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە لای (هۆلاکۆ) تیپێکی پاسەوانی ئیمپراتۆری مەغۆلی پێشی بە وەفدەکە گرتو نەیانهێشت هەموو ئەندامانی وەفد بچنە ژوورەوە، بەڵکو گوتیان: دەبێ خەلیفە تەنها بە خۆیو (١٧) پیاوەوە بچێتە لای (هۆلاکۆ)، ئەوانی تریش بۆ پشکنینی ورد لە دەرەوە ڕادەوەستێنرێن، خەلیفە بە خۆو (١٧) کەسەکەوە چووە ژوورەوە، تەواوی وەفدەکەش ڕەپێچەك درانو بەرەو مەرگ بردران!! جگە لە خەلیفەو تاقمەکەی هەر هەموویان کۆکوژ کران، سەرۆك هۆزەکان، وەزیرەکان، زانایەکان، پیاوماقوڵەکان، ڕاوێژکارەکان هەموویان کوژرانو قڕیان تێخستن، بەڵام (خەلیفە) نەکوژرا، (هۆلاکۆ) کاری پێ مابوو، ئینجا (هۆلاکۆ) بەوپەڕی توندو تیژیو خۆ بەزلزانیەوە فەرمانی دەردەکردن، (خەلیفە) بۆی دەرکەوت کە ئەندامانی وەفدەکەی بە تەواوەتی کوژراون، ئینجا زانی تەتارو هاوێنەکانیان بێ پەیمانو بێ دەرکن ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾ (التوبة: ١٠).

(هۆلاکۆ) ئەم چەند فەرمانەی بەسەر (خەلیفە)دا سەپاندن:

أ- دەبێ (خەلیفە) فەرمان بدا: خەڵکی (بەغدا) چەکەکانیان دانێن‌و واز لە بەرگری بهێنن، ئەمە شتێکی ئاسان‌و ئاسایی بوو، چونکە زۆرینەی دانیشتوان نەیاندەتوانی چەك هەڵبگرن، بەڵکو هەر حەزیشیان لێ نەبوو.

ب- (خەلیفە) کۆت‌و زنجیر دەکرێ، زنجیرەکەی درێژ دەکرێت‌و بەرەو شار پێش خۆیانی دەدەن‌و هەرچی خەزێنەی عەبباسیەکانەو مەڵبەندی زێڕو زیوو دیاریە بە نرخەکان‌و کەلوپەلە گرانبەهاکانە لە نێو کۆشکەکانی خیلافەت‌و بەیتولمالدا هەیە پێشانیان دەدا.[١]

ج- دەبێ دوو کوڕەکەی خەلیفە بەبەر چاوی خۆیەوە بکوژرێن، ئەمەو (أحمد- أبوالعباس)ی کوڕە گەورەی‌و (عبدالرحمن-أبو الفضل)ی کوڕە نێوەنجیەکەی کوژران‌و...... هەروەها دەبێ (مبارك- أبو المناقب)ی کوڕی سێهەمی‌و (فاطمە‌و خدیجە‌و مریم)ی خوشکانی خەلیفە هەر هەموویان بەدیل بگیرێن.

د- دەبێ ژمارەیەك پیاو – کە لە لایەن (ابن العلقمی)ی ناپاکەوە لە لای (هۆلاکۆ) ناویان درابوو – بانگ بکرێن، ئەم پیاوانە بریتی بوون لە ژمارەیەك زانای ئەهلی سوننە، (ابن العلقمی) ڕکی لێ دەبوونەوە، ئەمەو هەر هەموویان هێنران، هەر یەکێك لەمانە لە ماڵی خۆی دەهێنرایە دەرەوەو ژن‌و منداڵ‌و ئەندامانی خێزانەکەشی لەگەڵدا بوون، تەتارەکان دەیانبردە دەرەوەی بەغداو لە نزیك گۆڕستانێك ڕادەگیراو پاشان زاناکە چۆن مەڕ لە لایەن قەسابەوە سەردەبڕدرێ لە لایەن تەتارەکانەوە سەردەبڕدرا، ژن‌و منداڵەکانیشی دەستگیردەکران، یان بۆ کوشتن، یان دەکرانە تاڵانی، ئەم بارودۆخە بە هەموو پێوەرێك کارەساتێکی دڵتەزێن‌و ویژدان هەژێن بوو.

بەم شێوازە: شێخ (محي الدين يوسف ی کوڕی شێخ الفرج ی ابن الجوزی)ی مامۆستای (دار الخلافة) بە خۆی‌و هەرسێك کوڕەکەیەوە: (عبدالله و عبدالرحمن‌و عبدالكريم) سەربڕدرا.

هەروەها (مجاهد الدين ايبك)و (سليمان شا)ی برای کە سەرکردایەتی بانگەوازی جیهادیان دەکرد لە بەغدا بە جوتە سەربڕدران.

هەروەها (شێخ علی کوڕی النیار)ی مامۆستای مامۆستایان‌و مامۆستاو پەروەردەکەرو ڕاهێنەری خەلیفەش سەربڕدرا، ئینجا دوابەدوای ئەمانە پێشەواو وتاربێژی مزگەوتەکان‌و قورئانخوێن‌و حافیزانی قورئان هێنران‌و سەربڕدران، هەموو ئەم کارانە ئەنجام دران‌و

---

١ قصة التتار ص: ١٤٩، ١٥٠.

(خەلیفە) زیندووەو دەشبینی کە چۆن (هۆلاکۆ) بە چاوی دۆستانە هەڵسوکەوت لەگەڵ (ابن العلقمی)ی وەزیری خاینو ناپاك دەنوێنێ، پەیوەندی نێوان ئەم دوانەی بە چاکی بۆ ڕوون بۆوە، هەموو ڕاستیەکان لە بەرامبەریدا دەرکەوتن، دەرکی بە دەرەنجامەکانی سپاردنی کاروبار بە خەڵکی ناشایستەی کرد، بەڵام دوای چی؟ هەڵبەتە دوای لەدەستدانی کات![1]

### ٤ـ حەلاڵکردنی بەغدا:

دوابەدوای چەکدانانی دانیشتوانی شارو کوژرانی ئەم کۆمەڵە هەڵبژاردەیەو پڕبوونی کۆڵانو بازاڕو کونو قوژبنەکانی شار لە سەربازانی تەتارو مەغۆل، هۆلاکۆ فەرمانە قێزەونەکەی خۆی سەبارەت بە حەلاڵکردنی بەغدا دەرکرد،[2] بەسەر هەموو شتێکدا هاتن، مزگەوتەکانیان بە مەبەستی دەستگرتن بەسەر قوببە زێڕ کفتکراوەکانیان ڕوخاندن، دوای تاڵانو بڕۆی ئەوی تێیاندایە لە دیاریە بەنرخو نایابەکان هەر هەموو کۆشکەکانیان ڕوخاندن، کوشتو کوشتارو خوێنڕشتنو تاڵانو بڕۆیان بۆ خۆیان حەلاڵ کرد، مەغۆلەکان لەم بوارەدا زۆریان تێپەڕاند، دەگێڕنەوە یەکێکیان دەچێتە نێو کۆڵانێکی تەنگەبەرەوە (٤٠) منداڵ دەبینێو دەیانکوژێ، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە: دایکیان لە پێش ئەواندا کوژراونو ئەویش بەزەیی پێدا هاتوونەوە بۆیە کوشتوونی.[3]

مێژوونووسە میانەڕەوەکان ژمارەی کوژراوانی بەغدا بە (٨٠٠) هەزار کەس دەخەمڵێنن،[4] تەتارەکان بەس پیاوە بەهێزەکانیان نەدەکوشتن، بەڵکو لە کوشتنی پیرەپیاوو ژنانیش ڕانەدەوەستان، مەگەر ژنێکیان پێ جوان بایە، دەیانگرتو بە تاڵانی داگیریان دەکرد،[5] کەس بە ساغی بۆی دەرنەچوو مەگەر کەسێك خۆی لە بیرێك یان کونێکدا حەشاردابێ، ئەم هێرشە ماوەی (٤٠) ڕۆژ درێژەی کێشا، ئاگر هەموو شوێنێکی گرتەوە، هەرچی توشی بوو قوتیداو هەڵی لوشی، وشكو تەڕی پێکەوە سوتاند، زۆربەی کۆشكو تەلارەکانو مزگەوتی خەلیفەو مەشهەدی ئیمام کازمو گۆڕی خەلیفەکانیان لە (ڕەسافە) بەسەر یەکدا داتەپاندن،[6] کاتێك (هۆلاکۆ) چووە نێو (یەغدا)وە، بەرەو کۆشکی (خیلافە) چوو، لە باری ڕاست دانیشتو بەم

---

١ قصة التتار ص: ١٥١.

٢ قصة التتار ص: ١٥١.

٣ المغول للصیاد ص: ٢٦٥.

٤ دول الاسلام للذهبي ٢/١٢٣، المغول للصیاد ص: ٢٦٥.

٥ قصة التتار ص: ٢٦٥.

٦ بغداد في عهد الخلافة العباسیة، ترجمة بشیر فرنسیس ص: ٢٩٢ـ٢٩٣.

بۆنەوە لەگەڵ میرەکانی خۆی ئاهەنگیان گێڕا، فەرمانیدا (خەلیفە) بێنن، کە هات پێی گوت: ئەتۆ (خانەخوێ)ی‌و ئێمەش میوانین، کەواتە دەبێ هەستی‌و ئەرکی میوانداری جێبەجێ بکەی، (خەلیفە) گوتی ڕاست دەکەی، ترس‌و بیمی لێ نیشتبووو سەری سوڕمابووو ڕامابوو، بە شێوەیەك پەشۆکابووو شڵەژابوو نەیدەزانی کلیلەی خەزێنەکانی لە کوێ داناون، ناچار فەرمانیدا قفڵەکان بشکێنن‌و (٢) هەزار پۆشاك‌و (١٠) هەزار دینارو ژمارەیەکی زۆر گەوهەرو مرواری‌و بەردی بە نرخی دەرهێنان‌و پێشکەشی (هۆلاکۆخان)ی کردن، ئەویش ئاوڕی لێ نەدانەوەو بەسەر داروودەستەکەیدا دابەش کردن، ئینجا ڕووی کردە (خەلیفە)و گوتی: ئەو ماڵ‌و سەروەت‌و سامانەی لەسەر زەویدا هەتە ئاشکرایە کە هەر هەمووی (تاڵانی)یەو بەشی سەربازەکانمانە، ئێستا دەمانەوێ پەردە لەسەر ئەو سەروەت‌و سامانەت هەڵدەیەوە کە شاردوتەتەوە، چیەو لە کوێیە؟ لەو کاتەدا خەلیفە دانی نا بە هەبوونی حەوزێکی پڕ لە زێڕ لە نێوەڕاستی کۆشکدا، کاتێك ئەو شوێنەیان هەڵکەند تەماشایان کرد پڕە لە زێڕی خۆلاسە کە هەر پارچەیەکی بریتی بوو لە (١٠٠) مسقال، ئینجا (هۆلاکۆ) فەرمانیدا بنەماڵەی خەلیفەو داروودەستەکەی سەرژمێر بکرێت، (٧٠٠) ژن‌و کەنیزەك‌و (١٠٠٠) خزمەتگوزار — (کۆیلە)یان ژماردن،[1] کاتێك ژنەکانی سەرژمێر کران، خەلیفە بە سەری کزو دەنگی نوزەڵەوە گوتی: (ئەو ژنانەم پێ بدەنوە کە نە تیشکی ڕۆژیان لەسەر هەڵاتووە نە ڕووناکی مانگ)، (هۆلاکۆ) فەرمانیدا بە ئارەزووی خۆی (١٠٠) ژن لە نێوانیاندا هەڵبژێرێت کە خزمی‌و خۆشەویستنی، ئینجا (هۆلاکۆ) شەو بەرەو سەربازگەکەی خۆی گەڕایەوە، بەیانیەکەی فەرمانی بە (سونجاق)ی سەر سوپای کرد بچێتە نێو شارەوەو دەست بەسەر ماڵ‌و سامانی (خەلیفە)دا بگرێت‌و لە شاری بێنێتە دەر، ئەویش هەرچی خەلیفەکانی عەباسی لە ماوەی (٥) سەدەدا پەسمەندەیان کردبوو هەمووی کۆکردەوەو بردی.[2]

لە کۆتاییداو پاش ئەوە (هۆلاکۆ)و سوپاکەی لە خوێنڕشتن‌و کاولکاری‌و تاڵان‌و بڕۆو کوشت‌و بڕ زۆریان تێپەڕاند، (هۆلاکۆ) بڕیاریدا: کۆتایی بە کوشتن بهێنرێت و هەر کەسە بچێتەوە سەر کاری تایبەتی خۆی، (إبن کثیر) دەڵێ: کاتێك لە (بەغدا) جاڕی هێمنی‌و ئاسایش درا خەڵك لەنێو گۆڕستان‌و چاڵاوو خەندەك‌و دارو پەردوە ڕوخاوەکاندا هاتنە دەرەوە هەر دەتگوت مردوون‌و تازە لەنێو گۆڕەکانیان هاتوونەتە دەرەوە، یەکتریان

---

١ تأريخ مختصر الدول ص: ٢٧١، المغول للصياد ص: ٢٦٦.

٢ جامع التواريخ ص: ٣٠٠_٣٠٢، المغول للصياد ص: ٢٦٦.

نەدەناسیەوە، باوك كوڕی خۆیو برا برای خۆی نەدەناسیەوە، هەموو ئەمانەش ڕەنگیان پەڕیبوو تووشی نەخۆشی بوونو خۆیان گەیاندە كاروانی كوژراوەكان.[١]

### ٥ـ كوژرانی خەلیفە (المستعصم بالله):

(هۆلاكۆ) بەوپەڕی خراپی ڕەفتاری لەگەڵ (خەلیفە)دا دەنواند، بە جۆرێك خواردنی لێ قەدەغە كردبوو، كاتێك (خەلیفە) هەستی بە برسێتی كرد داوای خواردنی كرد، (هۆلاكۆ) بە دەستی خۆی سینیەكی پڕ زێڕی لەبەردەم داناو پێی گوت: بخۆ، (خەلیفە) گوتی چۆن زێڕ دەخورێ؟ هۆلاكۆ وەڵامی دایەوە: ئەگەر دەتزانی زێڕ ناخورێ، ئەدی بۆچی هەڵت دەگرتو بەسەر سەربازەكانتدا دابەشت نەدەكردو تا لە ڕۆژێكی ئاوادا خۆتو ماڵی میراتیتان لە هێرشی سوپایەكی ئاوادا بپاراستبایە؟ بۆچی ئەم دەرگا ئاسنینانەت نەدەكردن بە تیرو شیرو بە پەلە نەدەهاتی بۆ سەر كەنارەكانی دەریای (جەیحون)و پێشت بە پەڕینەوەی من نەدەگرت؟.... (خەلیفە) وەڵامی دایەوە: ئەمە بە قەزاو قەدەری خوا بوو،[٢] (هۆلاكۆ) گوتی: ئەوەی ئێستاش بەسەرتۆدا جێبەجێ دەكرێت هەر بە قەزاو قەدەری خودایە، لە گێڕانەوەیەكی تردا دەڵێ كاتێك (هۆلاكۆ) ئەم پرسیارانەی ئاراستەی (خەلیفە) كردن، (خەلیفە) بێ دەنگی هەڵبژاردو وەڵامی نەدایەوە.[٣]

بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی كوژرانی (مستعصم)، تا ئێستاشی لەگەڵدابێ مەسەلەیەكی شاردراوەیەو بە چاكی ساغ نەبۆتەوەو گێڕانەوەی مێژوو نووسەكان دژ بەیەك دەوەستنەوە:

مێژوونووسی مەزن (أبو الفداء ابن كثير) سەبارەت بە جیاوازی ڕیوایەتەكانی تایبەت بە كوژرانی (خەلیفە موستەعصم) وێنەیەكی ڕوونو ئاشكرامان نیشان دەداو دەڵێ: كەس ئاگاداری چۆنیەتی كوژرانەكەی نەبووە، گوتراوە كە گوایە خنكێنراوە یان خستوویانەتە نێو گونیەیەكەوەو بەرپێلاقەیان داوەو ئینجا مردووە، یان لە (دیجلە)دا خنكێنراوە، دەستەواژەكەی بەم شێوەیە كۆتایی پێ دێنێ: خودا بە ڕاستی ئەمە زاناترە.[٤]

لە نێوژ مێژوونووساندا مەشهورە كە (معتصم) خرابێتە نێو جەواڵێكی سەر گرێدراوەوەو بە شەقو پێلاقە لێی درابێتو بەم شێوەیە كوژرابێت، لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەداو دەڵێ:

---

١ المغول للصیاد ص: ٢٦٦، البداية والنهاية ١٣/٢٠٣.

٢ المغول للصیاد ص: ٢٦٧.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٦٧.

٤ المختصر أخبار البشر ٣/٢٠٣، المغول للصیاد ص: ٢٦٨.

لەبەرچی هۆلاکۆ ئەم شێوازەی بۆ کوشتنی (موعتەسەم) هەڵبژاردووە؟ دەربارەی ئەمە چەند بەهانەیەك بۆ ئەم کارەی هێنراوەتەوە، لەمانە:

أ- بەلای ڕاوێژکارە موسڵمانەکانی (هۆلاکۆخان)ەوە قورس بوو (خەلیفە) - کە ئەمیری ئیماندارانەو سەرۆکی ئاینی ئەوانیشە - خوێنی بڕێژرێت، لەبەر ئەمە هۆشداریان دا بە (هۆلاکۆ) کە کارێکی لەم شێوە بکا، تا کار بەوە گەیشت یەکێك لە گەردوونناسە - موسڵمانەکان - پێی گوت: ئەگەر (خەلیفە) بکوژی، جیهان تاریك دەبێ‌و ڕەش هەڵدەگیرسێت‌و نیشانەکانی قیامەتی بە دوادا دێن،[1] لەم کاتەشدا - وەکو پێشوو - (نصیر الدین طوسي) ئەم پروپاگەندەیەی ڕەتدایەوەو چەند بەڵگەیەکی واقیعی خستەڕووو سەلماندی ژمارەیەك خەلیفەی عەباسی کوژراون‌و هیچ کارەساتیش ڕوویان نەداوە، جا کاتێك هۆلاکۆ ڕای خۆی لەسەر کوشتنی ساغ کردەوە، خۆی لە ڕشتنی خوێنەکەی بواردو بەم شێوەیەی پێشدا باسکرا گیانی لە جەستەی جودا کردەوە.

ب- (هۆلاکۆ) (موستەعسەمی) کوشت بەبێ ئەوەی بێڵێ خوێنی لێ بڕژێ، لە ترسی قسەو مەترسیەکانی زانا موسڵمانەکان نەبوو، بەڵکو ئەمە کلتوری مەغۆل بووو بەس - دەربارەی کوشتنی پیاوی مەزن -، هەروەکو چۆن (النويري) ئاماژە بە ئەمە دەکات‌و دەڵێ: (خەلیفە)یان هێنایە لای (هۆلاکۆ)، ئەویش فەرمانیدا بخرێتە تای خەرارێکەوەو بخرێتە بەر سمی ئەسپەوەو بەم شێوەیە تاکو دەمرێ گێرە بکرێت، ئەم کارەی پێکردو مرد، وەکو چۆن لە هەواڵی دەوڵەتی عەباسیش باسمان کردووە تەتارەکان داب‌و نەریتیان ئاوابوو کە بە شێوەیەکی گشتی خوێنی پاشاو گەورەپیاوان نارێژن،[2] (ابن خلدون) دەڵێ: (موستەعسەم) دەستگیرکراو خرایە نێو تا خەرارێکەوەو بە سندوڵکوت لێیان دەدا نەوەك خوێنی لێ بڕژێ - بە پێی بیروباوەڕی خۆیان -.[3]

(هۆلاکۆ) بە پەیڕەوی کلتوری نەتەوەکەی ڕەفتاری دەکرد، کە کلتورەکەیان ڕشتنی خوێنی هەر سەرۆکێك قەدەغە دەکات کە خوێنی پاشایەتی بە دەمارەکانیاندا هاموشۆی کردبێت: بۆیە - بۆ کوشتنی پاشا دوژمنەکانیان شێوازی خنکاندن - بە دانانی کۆمەڵە پەڕۆیەکی ئەستوور لەسەر دەم‌و لووتی - بەکاردەهێنن. لەسەر ئەم بنەمایە دەرکەوت کە هۆکاری دووەم ڕاشترە! چونکە لە ناشتنی تەرمەکەشیدا کلتوری خۆیان ڕەچاوکردووە،

---

١ مجالس المؤمنين ص: ٤٠٠ للششتري، المغول للصياد ص: ٢٦٩.
٢ نهاية الأرب في فنون الأدب، نقلا عن المغول للصياد ص: ٢٦٩.
٣ العبر وديوان المبتدأ والخبر ٥/٥٤٣.

ئەوان تەرمی (خەلیفە)یان لە شوێنێکی نادیار ناشتووە، تا ئەوەی کە (سیوطي) ئەم قسەیە لە (ذهبي)یەوە دەهێنێت: من گومان نابەم نێژرابێ، (ابن الغوطي) دەڵێ: سوڵتان (هۆلاکۆ) فەرمانیدا بکوژرێ، لە ڕۆژی (٤) شەممەی (١٠)ی سەفەردا کوژراو خوێنی نەڕێژرا، بەڵکو خرایە نێو گونیەکەوەو بەر شەقو پێلاقەیاندا هەتا مرد، ئینجا نێژراو گۆڕەکەشی شوێنەون کرا،[1] هەروەك دەربارەی – شاردنەوەی – خانو گەورەکانی مەغۆل زانراوە، ئەوان مردووەکانیان – بە تایبەتی گەورەکانیان – لە شوێنی دوور ئاوەدانی دەنێژنو گۆڕەکانیان شوێنە ون دەکەن، بەم شێوەیە (مەغۆلەکان) لەسەر ئەم کلتورەیان بەردەوام بوون تا سوڵتان غازان خان (٦٩٤_٧٠٣ك) هاتو موسڵمان بووو ئەم کلتورەی هەڵوەشاندەوە، بۆ خۆی لە حاڵی حەیاتیدا گۆڕستانێکی گەورەی بۆ خۆی دروست کردو فەرمانیدا لەوێدا بینێژن، ئەمەبوو بە یەکەمین سوڵتانی مەغۆلی لە گۆڕستانێکی ئاشکرادا بنێژرێ.[2]

**٦ـ وێران کردنی شارستانی:**

دوای لێبوونەوەی (هۆلاکۆ)و سوپاکەی لە کوشتو بڕی دانیشتوانی بەغداو خاپورکردنی دیاردە شارستانیەکانیو، (هۆلاکۆ) فەرمانی دا (بەغدا) تالانو بڕۆ بکرێت، مەغۆلو تەتارەکان بەنێو شار وەربوونو هەرچی لەوێدابووو ئەوەی عەباسیەکان پەسمەندەیان کردبوو لە زێڕو زەبەرو سەروەتو سامانو کەلەپوری بەنرخی وەکو فەرشو جاجمو بەرماڵو قوماشی ئاوریشمو لۆکەو کەتانو خێوەتو زینو کورتانی ئەسپو... هتد فەرهود کرد، شاریان بەر مەنجەنیق دا زۆربەی خانوبەرەو بەرو بازاڕو مزگەوتو قوتابخانەو کتێبخانەکانی ڕوخێنرانو سوتێنران، بڵێسەی ئاگر کەوتەوەو تاریکەشەوی بۆ ماوەی چەند شەوێك ڕاماڵیو شاری ڕووناك کردەوە، کوشتو بڕو تالانو بڕۆ (٤٠) ڕۆژی خایاند،[3] پاش ئەم (٤٠) ڕۆژە (بەغدا) ڕوخانو سوتانو کاولبوونێکی وای بەسەرهات، چاو بە بینینی بەقای نەدەکرد کە ئەمە بەغدابێ، زانایەك پاش ئەم کارەساتە گەورە سەردانی بەغدا دەکاتو ئەوەی بینیویەتی بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوە: سەرو بنی شارم کردو بە هەموویدا گەڕامو بەم شێوەیەم بینی: شارێکی چۆڵو هۆڵ، خەڵکێکی زەردو زەبوونو ڕزیوو ڕەنگ هەڵبزڕکاو، دارو پەردوویەکی بەسەر یەکدا ڕوخاوو کۆشكو تەلاری کاولکراوو دەشتو خاکێکی کشو ماتو خەماوی مەینەتیو ناڕەحەتیو تەنگەتاوی هەموو لایەکی ئەم شارەو هەموو دانیشتوانی

---

١ المغول للصياد ص: ٢٧٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٧٠.

٣ مآثر الإناقة في معالم الخلافة ٩١/٢.

گرتبۆوە، ئەوەی بە زیندوویی مابوونەوە لە شار هەڵاتبوون و لە وڵاتدا پەرتەوازە ببوون و لە دۆڵ و شیوو پەناو پەسیواندا حەوابوونەوە، چۆن وانەبێ، کۆشک و خانوبەرەکانیان ڕوخابوون و غەریبی خاوەنەکانیان دەکردو دەگریان، هەموو ڕنق و ڕۆزی و نازو نیعمەتەکانیان تالآن کرابوون، شنەبا بەسەر خانوبەرەکانیاندا هەڵی دەکردو دەیگوت دەبێ کەسیان لێ دەرنەچوویێ و بە زیندوویی نەمابێ؟ منیش ڕاوەستام و ڕامام و گریام و بانگم بەسەر کۆشک و تەلارە تەپیوەکان و دانیشتوانەکانیاندا لێدا:

وأنــدب أطــلالـهــا تــارة　　　وأبـكـي عـلـى فـرقـة الـظـاعـنـيـنـا
فـلـو ذهـبـت مـقـلـة بـالـبـكـاء　　　لـفـرط الـغـرام لـكـنـا عـمـيـنـا[1]

کتێبخانەی گەورەی بەغداش کە گەورەترین کتێبخانەی سەر زەوی ئەو زەمانە بوو ــ گوشراوی فیکری موسڵمانانی ماوەی زیاتر لە (٦٠٠) ساڵی لە خۆرگرتبوو ــ بەر ئەم هێرشە دڕندانەیە کەوت، کتێبخانەی بەغدا هەموو ئەم زانستانەی لەخۆدا کۆکردبوونەوە: زانستە ئەدەبی و هونەرییەکان، زانستە شەرعیەکانی وەکو تەفسیری قورئان و فەرموودەو فیقهو عەقیدەو ڕەوشت، زانستەکانی بایەلۆژی وەکو پزیشکی و گەردوونناسی و ئەندازیاری و کیمیایی و جوغرافی و زەویناسی، زانستە مرۆڤایەتییەکانی وەکو سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و مێژوویی و فەلسەفی و غەیری ئەمانەو سەدان بەیتە شیعرو هەزاران چیرۆک و پەخشان، خۆ ئەگەر وەرگێڕاوی بیانیەکانی یۆنانی و فارسی و هیندی و هی تریش هەژمار کەین ئەوجا قەبارەی ئەو زیانە زۆرەمان بۆ دەردەکەوێ کە بەر تەواوی مرۆڤایەتی کەوتووە، کتێبخانەی (بەغدا) بە هەموو پێوەرێك مەزن بوو، جگە لە کتێبخانەی (قورتوبەی ئیسلامی ئەندەلوس) هیچ کتێبخانەیەکی تر لەو سەردەمەدا لە گەورەییدا خۆی لە قەرەی ئەو نەداوە، (کتێبخانەی قورتوبەش) سبحان الله لە ساڵی ٦٣٦ کۆچیداو (٢٠) ساڵ پێش ڕووخانی بەغدا لە لایەن مەسیحیەکانی ئەندەلوسەوە بە هەمان دەردو کارەساتی کتێبخانەی (بەغدا) چوو، ئەمەو لە کاتێکدا شاری (قورتوبە) لە ساڵی ٦٣٦کۆچیدا لە لایەن مەسیحیەکانەوە ڕوخێنراو یەکێك لە قەشە مەسیحیەکان کە ناوی (کمبیس) بوو بە دەستی خۆی ئاگری لە کتێبەکانی کتێبخانەی شار بەردا، کە هەزاران تەمەن و سەروەت و سامانێکی زۆرو عەرەق و شەونخونی و تێکۆشانێکی زۆر لە نووسینەوەیاندا سەرف کرابوو.[2]

---

١ بغداد مدينة السلام وغزو المغول ص: ٢٥٥.
٢ قصة التتار ص: ١٥٩.

کتێبخانـەی (بەغـدا) لـە لایـەن خەلیفـەی عەباسـی هارونەڕەشـید (١٧٠ك ــ١٩٣ك)ەوە دامەزرێنرا، لە سەردەمی خەلیفە مەئمون (١٩٨ــ٢١٨ك)دا بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی سەند، خەلیفەکانی دواتریش بە نۆبەی خۆیان کتێبخانەکەیان بە کتێبی زۆرترو گرانقەدر دەوڵەمەندتر کرد، تا کار بەوە گەیشت بوو بە خانەیەکی زانیاری، بە خەیاڵدا نەدەهات چەند زانیاری لە نێویدا هەیە، لەسەردەمێکدا بە ڕەچاوکردنی ئەوە چاپەمەنی تێدا پەیدا نەبوو، ملیۆنەها کتێبی بەرگکراو لە کتێبخانەکەیدا کۆکرابوونەوەو سەفتە کرابوون، خانوبەرەی کتێبخانەی بەغدا لە تاقمە ژوورێکی گەورە پێکهاتبوو، هەر تاقمە ژوورە بۆ کۆکردنەوەی یەکێك لە ماددەکانی زانست تەرخان کرابوو، تاقمە ژوورێك بۆ کتێبەکانی فیقهو زانستی شەرعی، تاقمەیەکی تر بۆ کتێبەکانی پزیشکی، یەکی تریش بۆ کتێبە کیمیاییەکان و چوارەمیش بۆ لێکۆڵینەوە سیاسیەکان و.... هتد.

سەدان کارمەند لەو کتێبخانەدا هەڵدەسوڕان و چاودێریان دەکردو بێ پسانەوە لەسەر ڕێکخستن و تازەکردنەوەی بەردەوام بوون.

لەنێو ئەم کارمەندانەدا ئەم جۆرە کەسانە دەبینران:

(النساخون)- لەبەرگرەوان و نووسەرەوانی کتێب، ئەمانە بەم کارەیان ژمارەی کتێبیان بۆ چەندین کتێب زیاد دەکرد.

(المناولون)- وێدەرانی کتێب: ئەمانە کتێبیان لە ڕەفەبەرزەکانەوە بۆ خوێنەران دەهێنایە خوارەوە.

(المترجمون)- وەرگێڕەرانی کتێب: ئەمانیش کتێبی بیانیان بۆ سەر زمانی قورئان وەردەگێڕان.

(الباحثون)- لێکۆڵەران: ئەمان بە دوای خاڵێك لە خاڵەکانی زانستدا دەگەڕان بۆ خەڵك لە نێو ئەو کتێبخانە گەورەدا.

ژمارەیەك ژوورو هۆڵی تایبەت بۆ خوێندنەوەو گفتوگۆو کۆڕی زانستی تەرخان کرابوون، ژمارەیەك ژووری تر بۆ پشودان و خواردن و خواردنەوەو حەوانەوەو خەوتنی ئەو خوێنەرانە دیاری کرابوون کە لە شوێنی دوورەوە بۆ خوێندن هاتبوونە بەغدا، ئەم کتێبخانە گوشراوێکی خەست و خۆڵی بیرو زەینی بەشەری لەخۆگرتبوو، (مەئمون) دوابەدوای تۆمارکردنی سەرکەوتنە سەربازیەکانی بەسەر پاشای (ڕۆم)داو لە کاتی وتووێژو پەیماننامەکانیدا یەکێك لە مەرجەکانی ئەمە بوو کە پاشای ڕۆم ڕێگا بە وەرگێڕەروان بدا کتێبەکانی کتێبخانەی

(قوستەنتینیە) بۆ سەر زمانی قورئان وەرگێڕن، خەلیفەکانی عەباسی کارمەندی تایبەتیان بەسەر زەویدا بڵاودەکردەوە تا کتێبی زانستی پەیداکەن‌و بیانهێننە کتێبخانەی بەغداو بەزانا موسڵمانەکانیان ڕادەسپاردن ئەم کتێبانە هەڵسەنگێنن‌و دوای ڕەخنەو شیکردنەوە، وەریان گێڕنە سەر زمانی عەرەبی، ژمارەیەکی زۆر لەو کتێبانەی بە زمانەکانی یۆنانی‌و سریانی‌و هیندی‌و سەنسکریتی‌و فارسی‌و لاتینی‌و غەیری ئەمانیش نوسرابوون لە کتێبخانەی گەورەی (بەغدا) کاری وەرگێڕانیان ئەنجامدرا.[1]

ـ تەتارەکان چیان بەسەر کتێبخانە گەورەکەی (بەغدا) هێنا؟

تەتارەکان ملیۆنەها کتێبی بەنرخ‌و گرانقەدریان هەڵگرتن‌و هەڵیاندانە نێو دەریای (دیجلە)وە، مەغۆلەکان کردو کۆششی زانستیانەی سەدەکانی پێشدایان بە خڕی هەڵدایە خڕی (دیجلەوە)، ئاوەڕوونەکەی دیجلە ڕەنگی مەرەکەبی کتێبەکان بەسەریدا زاڵ بووو ڕەش هەڵگەڕا، سوارەی مەغۆلەکان بەسەر لیژنە کتێنەکاندا ڕمبازێنی دەکردو ئەم بەرەوبەری ڕووباری دەکرد، ئەمە تاوانێك بووو دەرهەق بە مرۆڤایەتی ئەنجام دراو لە مێژوودا دووبارە بوونەوەی زۆرە، تاوانێکی ئاوا مەگەر لە ئەندەلوس لە بەرامبەر کتێبخانەی (قورتوبەو غەرناتەو ئەشبیلیەو بلەنسیەو سەرقەستە... هتد) ئەنجام درابێ، خاچپەرستەکانیش زیاتر لە (٣) ملیۆن کتێبی کتێبخانەی (تەرابلوس)ی لوبنانیان سوتاندن، لە فەلەستینیش هەمان تاوانیان بەسەر کتێبخانەکانی (غەززەو قودس‌و عەسقەلان)دا هێنا، ئینجا دوای ئەوان داگیرکەرانی نوێی ئەوروپایی لە سەدەی (٩)دا کە دابارینە نێو وڵاتانی ئیسلامی تاوانی خۆیان بەرامبەر کتێبخانەکان ئەنجامدا، بەڵام بە شێوازێکی نوێ، ئەم ئەوروپاییانە زیرەکتر بوون، کتێبەکانیان نەسوتاندن بەڵکو تاڵانیان کردن‌و لەگەڵ خۆیان بۆ ئەوروپایان بردنەوە، بەردەوام تا ئیمڕۆشی لەگەڵدابێ کتێبخانەو مۆزەخانەکانی ئەوروپا گەورەترین‌و نایابترین کۆمەڵە کتێبی زانستیان لەخۆ گرتووە کە هەر هەموویان بەرهەم‌و نووسراوی موسڵمانانی چەند سەدەیەکی لەسەریەکی پێش ئەم داگیرکاریەن، هیچ گومانی تێدا نیە ژمارەی ئەو کتێبانەو سەرچاوە سەرەکیانەی لە ئەوروپا هەن بە ڕێژەیەکی زۆر زیاترن لەو کتێب‌و سەرچاوە گرنگانەی لە جیهانی ئیسلامیدا هەن، داگیرکەران بە هەموو توانایەکیانەوەو بە درێژایی هەموو سەدەکانی مێژوو خەباتیان کردووە تا ئوممەتی ئیسلامی لە هەموو جۆرەکانی زانست‌و پێشەوتن بێ بەش بکەن، جارێك لە ڕێگای سوتاندنی کتێبخانەکانیان، جارێکی تر لە ڕێگای قم کردنی کتێبەکانیان لە دەریادا، جارێکی تریش لە ڕێگای دزینی

---

١ قصة التتار ص: ١٦١.

کتێب و بەرهەمە زانستەکانیان، ئێستاش لە ڕێگای گۆڕین و دەستکاری کردنی پەیڕەو و پرۆگرامی خوێندن دەیانەوێ هەرچی بەسوودو مایەی بەهێزبوون و پێشکەوتنە لە مێشکی نەوەی نوێی موسڵمانیدا نەهێڵن، چونکە داگیرکەران چاك دەزانن زانست لە ئیسلامدا چەندە بایەخدارە، لە لایەکی تریشەوە چاك دەزانن ئەگەر موسڵمانان بە زانست گۆش بکرێن و ڕابهێنرێن چۆن ڕۆڵی گرنگ لە جیهاندا دەگێڕن.[1]

پاش ئەوەی مەغۆلەکان کتێبخانەی بەغدایان ڕوخاندو کتێبەکانیان خنکاندن، ئینجا بەرەو کۆشك و تەلارە جوان و ڕازێنراوەکان بایاندایەوە، کەلوپەلە بەنرخەکانیان تاڵان کردن، هەر شتێك پێیان هەڵنەگیرابایە و نەیانتوانیبایە دەیانسوتاند، دەستیان بە ڕوخاندن و سوتاندن کرد، زۆربەی شار وێران کراو خانوبەرەو کۆشك و تەلارەکانیان لەگەڵ زەوی تەخت کران، ئاگرو دوکەڵ لەنێویاندا کڵپەی دەسەندو ئاسمانی تەنیبوو، ماوەی (٤) ڕۆژی ڕەبەق ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا، شەقامەکانی بەغدا بە خوێن سوور ببوون و تەرمی بۆگەنی کوژران لە هەموو کوچەو کۆڵانێکدا بەسەر یەکدا کەڵەکەکرابوون، (هۆلاکۆ) ترسا نەخۆشی لە ئەنجامی بۆنی ساردی خوێن و کوژراوان بڵاوبێتەوەو سوپاکەی بگرێتەوە، لەبەر ئەمە چەند بڕیارێکی دەرکردن:

أ- سوپای تەتار تا تووشی نەخۆشی نەبێ بە تێکڕایی لە بەغدا دەردەچێت و بۆ شارێکی باکووری عێراق دەگوازێتەوە، هێزێکی بچووکی پاسەوانی تەتار لە دووری دەوروبەری بەغدا وەکو ئێشکەچی بەجێ دەمێنێ.

ب- جاڕی هێمنایەتی ڕاست و دروست لە بەغدا دەدرێ، نابێ دوای ئەم (٤٠) ڕۆژە هیچ موسڵمانێك بەبێ هۆ بکوژرێت، بەڵکو کوژراوەکانیان بنێژن و شار لە تەرم و خوێن پاك کەنەوە.

ج- (هۆلاکۆ) بڕیاریدا (مؤيد الدينى علقمي) شیعە بکاتە سەرۆکی ئەنجومەنی حوکمی دیاریکراوی مەغۆلی بۆ سەر بەغداو بڕیارەکانی مەغۆل لەو شارەدا جێبەجێ دەکات.[2]

**٧- (مؤيد الدينى علقمي)ی حوکمڕانی بەغدا:**

(مؤيد الدين) تەنها بە ناوو سەرو سوڕەت حوکمڕان بوو، سەرکردایەتی فیعلی بە دەست خودی مەغۆلەکانەوە بوو، مەغۆلەکان لە پێناوی ئەوەدا بە تەواوەتی بیکەنە داردەست و نۆکەری زەلیلی خۆیان لەگەڵی کەوتنە شەڕە جەنگی دەروونی و سوکایەتیان پێ دەکرد، لە

---

١ قصة التتار ص: ١٦٣.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦٣.

ڕۆژگاری – حوکمڕانیەتیەکەیدا – هێندەیان سوکو چروکو داماو کرد، پەردەی شەرمو شکۆو سامو هەیبەتی لێ داماڵرا – بە شێوەیەك کە وەسف ناکرێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان ژنێك (ابن العلقمي) دەبینێ ئەوا سواری ئێسترێك بووەو تەتارێکیش بە قەمچی ئێسترەکەی لێ دەخوڕێت، ژنەکە دێتە تەنیشتیەوەو پێی دەڵێ: ئەی (ابن العلقمی) ڕۆڵەکانی عەباس بەم شێوازە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردی؟! ئەم وشەیە (تیرئاسا) لە دڵی هەڵدەچەقێتو پاشان دەچێتەوە ماڵەوەو دەرگا لەسەر خۆی پێوە دەدا، هەتاکو لە سەرەتای مانگی جەمادی دووەمی ئەو ساڵەدا بە خەمو پەژارەوە تا مرد نەهاتە دەرەوە، ئەمەو ٦٣ ساڵ ژیاو لە گۆڕستانی شیعەکاندا نێژرا.

(ابن العلقمی) سوکایەتیەکی بێ ئەندازەی لە لایەن تەتارەکانو موسڵمانەکانەوە بەرامبەر کرا کە لە وەسف کردن نایە، دوای خۆی وەزارەت درایە دەست کوڕەکەی، خودا بە پەلەو بێ دواکەوتن بۆ لای خۆی بردەوە، شاعیرێك بەم شێوەیە بە جوێن شڕی دەکات:

یا فرقة الاسلام نوحوا واندبوا    أسفاً علی ما حل بالمستعصم
دست الوزارة کان قبل زمانه    لابن الفرات فصار لابن العلقمي[1]

## ٨ـ حکومەتی هۆلاکۆ (حوکومەتی ئیلخانی لە عێراقدا):

دوای هەرەسی بەغدا (هۆلاکۆ) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشتگیری دەسەڵاتی خۆی لە عێراقدا کردو دەستی بە ڕێکخستنی بەڕێوەبەرایەتیو کاروباری دەوڵەت کرد، هێزی سەربازی بەرەو فوراتو نێوەڕاستی عێراق نارد، دانیشتوانی (حیللەو کوفە) پێشوازیان لێکردنو چەند پردێکی پەڕینەوەشیان بۆ دامەزراندن، لێرەڕا تیپە سەربازیەکە بەرەو (واسیت) بەڕێکەوت – کە پاشماوەی هێزەکانی (مەمالیك)ی لێ مابوون –، بە توندی ڕووبەڕوویان بوونەوەو پێکهەڵشاخان دروست بوو، ئەمەو جەنگەکە بە تێکشکانی هێزەکەی (مەمالیك)و کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی شار کۆتایی پێهات، مەغۆلەکان لەوێ ڕانەوەستانو بە شوێن تاقمە سەربازە هەڵاتووەکانی (مەمالیك) کەوتنو بەرەو (خۆزستان) ڕۆیشتن، دەرەنجام زۆربەی سەربازانی هێزەکەی (مەمالیك) لەنێوچوونو ئەوانی ماشنەوە خۆیان بە دەستەوەدا، لەو سەروبەندانەدا هۆلاکۆ بنەماکانی ئیدارەی عێراقی دامەزراندنو دایەوە دەست خودی عێراقیەکان، جگە لە ئیدارەی سەربازیو ئەرکەکانی پۆلیس گۆڕانیەکی بەرچاوی لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی تری دەوڵەتدا ئەنجام نەدان، پۆستی بەڕێوەبەرایەتی

---

١ البداية والنهاية ١٧/٣٨٠.

(سوپاو پۆلیسی) دایە دەست (بەهادوری خۆراسانی)، (فخرالدینی دامەغانی) لەسەر پۆستی (دیوانداری) وەکو خۆی دامەزراندەوە، (مؤید الدینی علقمي)ی وەزیری پێشدای (موستعەسەم)ی لەسەر پۆستی وەزارەت دامەزراندەوە، بەڵام دوای ئەمە هێندەی نەخایاند، توشی نەخۆشی دەروونیو پەژارەییو خەمناکی بوو لە جەمادی دووەمی ئەو ساڵەدا، واتە (٣) مانگ دوای هەرەسی بەغدا گیانی لەدەستدا، (عزالدین أبو الفضل)ی کوڕیان لەسەر پۆستەکەی دانایەوە، ئەمەو ولاتی عێراق لە جیاتی (٧) هەرێم کرایە (٥) هەرێمی ئیداری، پۆستی بەڕێوبەرایەتی هەر هەرێمێك بە ناوی پۆستی (صدر) دەدرایە دەست بەرپرسێك، ئەویش ژمارەیەك جێگرو ڕاوێژکارو داروودەستەی لە دەورەی خۆی کۆدەکردنەوە، هەرێمەکان بەم شێوەیە بوون:

١- ئیدارەی خۆرهەلات: شاری خالیسو بەندەنیجینو ڕێگای خۆراسانی دەگرتەوە.
٢- ئیدارەی فوڕات.
٣- ئیدارەی کوفەو حیللە.
٤- ئیدارەی بەسرەو واسیت.
٥- ئیدارەی دوجەیلو موستەنسریە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە ئەم دابەشکردنە لەگەڵ دابەشکردنی جوغرافی بۆ ناوچە کشتوکاڵیەکانی عێراق گونجاوو ڕێکوپێکە، ئەمەو (هۆلاکۆ) (احمدی کوڕی عمران)ی - کە خەڵکی (باجسری) بوو - کردە سەرۆکی ئیدارەی خۆرهەلات.[1] (تاج الدین علی کوڕی دوامی) کە لە سەردەمی موستەعسەمدا پۆستی دەرگاوانی پێ سپێردرابوو کردە سەرۆکی ئیدارەی فوڕات، (عزالدین بن أبی الحدید)یشی لە پۆستی کاتبی (تۆمار) دامەزراند، بەلام دوای ماوەیەکی کورت وەفاتی کرد، شیاوی باسە کاتبی تۆمار ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە (خاوەنی دیوان)ەوە هەیە، بە حوکمی تەبیعەتی پۆستەکە کاتبی تۆمار ئاگاداری هەموو نهێنیەکانی ئیدارەی دەوڵەتە، کاتبی تۆمار لەسەردەمی ئیلخانیەکاندا ڕۆڵێکی بایەخداری هەبوو، تا کار بەوە گەیشتبوو پێیان دەگوت: (کاتیبی عێراق)، جاروبارە پۆستی (خاوەنی دیوان)یشی بەڕێوە دەبرد.

بەلام سەبارەت بە پۆستە ئاینیەکان لەسەرووی هەموویانەوە پۆستی (قەزاوەت)، ئەوا (هۆلاکۆ) ئەو پۆستەی بە قازی (عبدالمنعم بەندەنیجی) سپاردو کردی بە قازی قازیان،

---

١ العراق بین سقوط الدولة العباسیة وسقوط الدولة العثمانیة ص: ١٣٨.

پۆستی هەموو ئەوقافەکانی دەوڵەتی ئێلخانیش خرایە بەردەستی (نصیرالدین الطوسي)، (شهاب الدين بن عبدالله)ش کرایە سەرۆکی ئەوقافی شاری بەغدا، ئەو لە سەردەمی خۆیدا سەرپەرشتی چاککردنەوەی مزگەوتی خەلیفەو مەشهەدی ئیمام کازمو کردنەوەی قوتابخانەکانو هێنانەوەی زانایانو توندوتۆڵکردنی نێوانی زانایانو سۆفی مەشرەبانو برینەوەی ئازوخەو ڕۆزی بۆیانی دەکرد.

پاش جێگیرکردنی بنەماکانی دەوڵەتی عێراق (هۆلاکۆ) بەرەو (ئێران) گەڕایەوە، چونکە (خۆراسان) لەو سەردەمەدا بنکەی سەرەکی دەسەلاتی مەغۆلیو مەڵبەندی دەوڵەتی (ئێلخانی)ی (هۆلاکۆ) بوو، دەسەلاتی ئەم دەوڵەتە (٨٠) ساڵی خایاند، (عێراق)یش لەم نێوانەدا هەرێمێکی سەر بەم دەوڵەتە بوو.[1]

دەوڵەتی ئێلخانی لە فارسو عێراقدا سنوورەکەی بەم شێوەیە بوو، لە ڕووباری (جەیحون)ەوە بۆ زەریای (هادی)و لە (سند)ەوە بۆ (فورات) درێژ ببۆوەو هەندێك خاکی ئاسیای بچووکیشی بەرخۆدابوون، حوکمڕانەکانی ئێران بەو نیشانەی کە سەر بە خانی گەورەی (چین)ن ناوی (ئێلخان)یان بەسەر خۆیاندا دادەبڕی ، (ئێلخان)ەکان یەك لەدوای یەك حوکمی وڵاتی (ئێران)یان گێڕا تا بەیەکجاری لە ساڵی ٧٥٦ك/١٣٥٥زایینیدا دوایان بڕاو دەوڵەتەکەشیان کۆتایی پێهات.[2]

ـ حکومەتی عێراق لە سەردەمی (جوێنی)دا:

لە ذي الحجة ٥٧٦ك دا، واتە دوای تێپەڕینی ساڵێك بەسەر ڕوخانی بەغدا وەزیر (عزالدین)ی کوڕی (ابن العلقمی) کۆچی دوایی کرد، مێژوونووس (علا الدين کوڕی عطاء الملك الجويني) جێگەی گرتەوە، ئەو بەڕەگەز لە بنەماڵەیەکی خاوەن پێگەی ڕەسەنی ئەدەبدۆستی بە دەسەلاتی ئێرانی بوو، بە دامەزراندنی (جوینی) کاروباری وەزارەتی عێراق لە ژێردەستی عەرەب دەرچوو، ڕاستەوخۆ بە حوکومەتی ناوەندی ئێران بەسترایەوە، (جوینی)یش چووە ڕیزی وەزیرەکانی دیوانی وەزارەتی میر (ئەرغۆن)ی مەغۆلی حوکمڕانی (ئێران)، ژمارەیەك گەشتی بەنێو وڵاتانی (مەغۆل)داکردن، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاگاداری ژیانو گوزەرانی مەغۆلەکانو وڵاتەکانیان بوو، لە بارودۆخی نەتەوەکانی (تورکو مەغۆلی) کۆڵیەوەو توانی مەوادێکی زۆرو زەوەندی مێژوویی دەربارەیان کۆکاتەوەو بە زمانی فارسی بینوسێتەوە، کتێبەکەی ناونا (تأريخ جهانكشاى) — واتە مێژووی جیهانگیر — کە مەبەستی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٣٩.

٢ الدولة المستقلة في المشرق ٢٠٥.

پێ (جەنگیزخان) بوو، بوو بە سەرچاوەی سەرەمی مێژووی مەغۆل، بەڵام باسەکانی کتێبەکە لەگەڵ گێرانەوەی جەنگەکانی (هۆلاکۆ) لەگەڵ فیرقەی (ئیسماعیلیە) لە وڵاتی (چیا)دا کۆتایی یان پێ دێ، ئەمە لە حاڵێکدا (جوینی) لە کاتی ئە هێرشانەدا لەگەڵ (هۆلاکۆ) بووە، هەروەها لە کاتی پەلاماردانی سەر (بەغدا)ش لە (هۆلاکۆ) دانەبڕابوو.[١]

## ٩ـ پاشاو میرەکان بە وەفد دێنە لای (هۆلاکۆ):

هەرەسی بەغدا ترس‌و بیم‌و دڵەڕاوکێیەکی زۆری لەنێو جیهانی ئیسلامدا بڵاوکردەوە، حوکمڕان‌و میری هەرێمەکان بە داماوی‌و سەری کزەوە دەهاتنە لای (هۆلاکۆ)، لە ترسان‌و بۆ خۆپاراستن لە شەڕەکانی دەستیان بۆ بەسنگەوە دەناو پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لێ دەکردو ئامادەیی خۆیان بۆ گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری ئەو دەردەبڕی‌و بە زمانی لوس‌و چاپلوسی دەیانەویست (هۆلاکۆ) لە خۆیان قایل بکەن، لەو میرانەی بە مەبەستی پیرۆزبایی (هۆلاکۆ) بۆ شاری (مەراغە)ی سەر بە هەرێمی (ئازەربایجان) چوون، (بدر الدین لؤلؤ)ی ئەتابەکی (موسڵ)، (ابوبکر)ی ئەتابەکی (فارس) کوڕەکەی خۆی بۆ ئەم مەبەستە نارد، لە نزیك شاری (تەورێز)یش دوو سوڵتانی سلجوقی دژ بەیەك کە برای یەکتر بوون: (سوڵتان عزالدین کەیکاوسی دووەم)و (سوڵتان رکن الدین قلج ئەرسەلانی چوارەم)، خۆیان گەیاندە سەربازگەی (هۆلاکۆخان)، (عزالدین) لە ترسان هەڵدەلەرزا: چونکە سەربازەکانی ئەو لە کاتی ڕووبەڕووبوونەیان لەگەڵ (بایجوتویان)ی سەرسوپای مەغۆلیدا شەڕیان کردبوو لە ئاکامدا لە (ئاقسەرا) لە لایەن هێزەکەی (بایجونویان) شکستیان خواردبوو، کاتێك (بەغدا) لەسەر دەستی هۆلاکۆ هەرەسی هێنا، (عزالدین) لە شوێنی خۆی‌و پلەوپایەی لە تۆڵەی بە زەبری (خان) دەترسا، بۆیە ویستی بە بەکارهێنانی شێوازێکی موتەمەللیقانە خۆی لەم تەنگژەیەی تێی کەوتووە ڕزگار بکات، هەستا وێنەی دەم‌و چاوو سەری خۆی لە بنی جووتە نەعلەیەکدا کێشاو پێشکەشی خانی ڕق هەستاوی کردن‌و پێی گوت: نۆکەری خۆت هیواخوازە قاچی پیرۆزی لەسەر سەری پیرۆزی بەندەی خۆی دابنێ،[٢] (دوقوزخاتون) تکای بۆ کردو هۆلاکۆ دڵی نەرم بووو لێی خۆش بوو، گومانی تێدا نیە، ئەم هەڵوێستە سەر شۆڕانەیە، وێنای هەندێك لە حوکمڕانە موسڵمانەکانی ئەو سەردەمەمان بۆ دەکێشێ کە چۆن تووشی سوك‌و ڕیسوایی ببوون.[٣]

---

١ العراق بين سقوط الدولة العباسية وسقوط الدولة العثمانية ص: ١٤٠، ١٤١.
٢ المغول للصياد ص: ٢٧٩.
٣ المغول للصياد ص: ٢٧٩.

## شەشەم: ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی و باسێك لە ژیانی خەلیفە (المستعصم باللە):

(ابن کثیر) دەڵێ: ئەمیری ئیمانداران (المستعصم باللە) دواخەلیفەی (بنی عباس) لە عێراقدا، ناوی (أبو أحمد عبداللە کوڕی ئەمیری ئیمانداران (المستنصر باللە)ی أبی جعفری منصور کوڕی (الظاهر بأمر اللە) أبی نصر محمد کوڕی (الناصر لدین اللە) أبو العباس أحمد کوڕی ئەمیری ئیمانداران (المستضيء بامر اللە) أبی محمد الحسن کوڕی ئەمیری ئیمانداران (المستنجد باللە) أبو المظفر یوسف کوڕی ئەمیری ئیمانداران (المقتضی لامر اللە) أبی عبداللە محمد کوڕی ئەمیری ئیمانداران (المظفر باللە) أبو العباس أحمد کوڕی (المقتدي بأمر اللە) أبو القاسم عبداللە کوڕی ئەمیری زەخیرە أبو العباس أحمد کوڕی ئەمیر إسحاق کوڕی (المقتدر باللە) أبی الفضل جعفر کوڕی (المعتضد باللە) أبی العباس أحمد کوڕی ئەمیر (الموفق) أبی أحمد طلحة کوڕی (المتوکل علی اللە) أبی الفضل جعفر کوڕی (المعتصم باللە) أبی إسحاق محمد کوڕی ڕەشید أبی محمد هارون کوڕی (المهدی) أبی عبداللە محمد کوڕی منصور أبی جعفر عبداللە کوڕی محمد کوڕی علی کوڕی عبداللە کوڕی عباس ی کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم هاشمی عباس)، لەساڵی ٦٠٩کۆچیدا لە دایك بووە، لە ٢٠ی جمادی بە کەمی ٦٤٠ کۆچیدا بەیعەتی خیلافەتی پێدرا، لە ڕۆژی چوارشەممەداو لە ١٤/صفر/٦٥٦کۆچیدا کوژرا، لەو ڕۆژەدا کە کوژرا تەمەنی (٤٧) ساڵی بوو خوا ڕەحمی پێ بکات، سەرو سورەتێکی جوانی هەبوو، خاوەنی خوخدەو ڕەوشتێکی بەرز بوو، عەقیدەو ئیمانێکی ساغو سەلیمی هەبوو، لە دادپەروەریو خێرو خێراتو ڕێزگرتنی زانایانو خودا پەرستاندا شوێنی (المستنصر)ی بابی هەڵگرتبوو، ئیعجازی عیلمی بۆ لە زانایانی خۆراسان وەرگرتووە، وەکو: حافز ئیبنونەجاریو مۆیدی طوسيو أبو روح عبدالمعزی کوڕی محمد الهرویو أبو بکر قاسم ی کوڕی عبداللە ی کوڕی الضّفارو غەیری ئەوانیش، کۆمەڵە زانایەکیش لە دەمی ئەویان گێڕاوەتەوە وەکو: مامۆستای مامۆستایان صدرالدین أبو الحسن علی کوڕی محمدی کوڕی سیّار)ی مامۆستاو ڕاهێنەرو پەروەردەکەری، ئەم دوو زانا گەورە: ئیمام (محي الدین ابن الجوزي)و شێخ (نجم الدین باذرانی)ی ئیجازەی زانستیان لە لایەن ئەوەوە وەرگرتووەو باسیشیان لێوە کردووە، ئەو (خوا ڕەحمی پێ بکات) وەکو بابو باپیرانی سوننی بووو لەسەر ڕێڕەوی سەلەف بووو عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتی هەبوو، بەڵام نەرم بووو زۆر وریا نەبوو سەروەتو سامانی خۆش دەویستو پەسەندەی دەکرد، ئەو ئەمانەتەی لە لایەن (ناصر داودی کوڕی موعەززەم)ی پێ سپێردرابوو پاشقولی داو نەیدایەوە، بەهای ئەمانەتەکە خۆی لە (١٠٠) هەزار دینار دەدا، کارێکی لەم جۆرە لە (خەلیفە) ناوەشێتەوەو

قێزەونە، بەڵکو لە خەڵکانی بێ پلەوپایەش ناوەشێتەوە، وەکو قورئان دەفەرمووێت لە ئەهلی کیتابیش ناشیرینە، ئەوان هی وایان تێدایە ئەگەر بارە زێڕێکیشی لەلا دانێی دوایە دەتداتەوە، هی واشیان هەیە ئەگەر دینارێکیشی پێ بسپێری ناتداتەوە وەکو خودای بالادەست دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا﴾ (ال عمران: ٧٥).

تەتارەکان لە ڕۆژی ٤شەممە ١٤/صفر/٦٥٦داو لە تەمەنی ٤٠ ساڵو ٤ مانگیدا بە مەغدوری کوشتیان، ماوەی خیلافەتەکەی ١٥ ساڵو ٨ مانگو چەند ڕۆژێك بوو، خودا ڕەحمی پێ بکاتو جێگەی خۆش بکاتو ڕێزی لێنێ، دوای گیرانی (٢) کوڕی کوژرانو کوڕێكو (٣) کچیشی گیران، بە کوژرانی ئەو وەجاخی خیلافەتی بنی عباس کوێربۆوەو کەس نەبوو جێی بگرێتەوە، دواهەمین خەلیفەی عەباسی بوو، ئەو خەلیفانەی لەگەڵ هەبوونی هێزو پێزی دەسەلاتیان خێریان لێ چاوەڕوان دەکراو بە عەدالەتو دادپەروەری کاروباری ئوممەتیان بەڕێوەدەبرد، بە کوژرانی (عبدالله المستعصم) کۆتاییان پێهاتو ژمارەیان گەیشتە (٣٧) خەلیفە، یەکەم خەلیفەیان (عبدالله ی سفاح) بوو، لە ساڵی ١٣٢ی کۆچیداو پاش کۆتایی پێهێنانی دەوڵەتی (ئەمەوی) بەیعەتی خیلافەتی پێدراو بنەماکانی دەوڵەتی عەباسی لە عێراقدا دامەزراندن، بە کۆتایی هاتنی المستعصم لە ساڵی ٦٥٦ کۆچیدا دوایان بڕاو دەوڵەتو خیلافەتیان کۆتایی پێهات، ماوەی دەسەلاتی خیلافەتی عەباسی (٥٢٤) ساڵ بوو، لە دوای ٥٤٠ کۆچیو لە سەردەمی (بەساسیری)دا ماوەی ساڵێكو چەند مانگێکی ڕەبەق دەستیان لە جڵەوی حوکمڕانی عێراق بەربووە، ئینجا وەکو پێشدا جڵەوەکەیان کەوتەوە بەردەست، جێگای باسە عەباسیەکان وەکو ئەمەویەکان نەبوونو لە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامیدا بالادەست نەبوون.[1]

وەك دەبینین ولاتی (مەغریب) لە ژێر قەڵەمڕەوی عەباسیەکان دەرچووبوو، سەرەتا ژمارەیەك لە نەوەکانی (بەنی ئومەییە) لە ڕەچەڵەکی (عبدالرحمن ی کوڕی معاویەی کوڕی هوشامی کوڕی عبدالملك)و هەندێك خەڵکی گەلیان حوکمڕانی ئەو ولاتەیان کرد، دوای ساڵانێکی درێژخایەن هەندێك مەلیکی تر دەسەلاتی خۆیان بەسەردا سەپاند، ئەوانەی ناوی (فاتیمیەکان)یان لەخۆ نابوو چەند سەدەیەك لە بەرامبەر عەباسیەکاندا حوکمڕانی ولاتی

١ البداية والنهاية ٣٦٧/١٧.

میسرو هەندێك وڵاتی مەغریبیان دەکردو جاروبارەش پەلیان بۆ وڵاتی شام دەهاویشت‌و زەمانێکی دوورودرێژیش دەسەڵاتی خۆیان بەسەر وڵاتی (حرمین) — حیجازدا — کێشا.[١]

دەوڵەتی (فاتیمیەکان) نزیکەی (٣٠٠) ساڵ بەردەوام بوو، تا (العاضد باللە)ی دواهەمین خەلیفەیان لە دوای (٥٦٠)ی کۆچی‌و لە دەوڵەتی (الصلاحیة الناصریة المقدسیة) کۆچی دوایی کرد، ژمارەی خەلیفەکانیان (١٤) دانە بوون، ماوەی دەسەڵاتیان لە ساڵی ٢٩٧ی کۆچیەوە دەستی پێکردو بە مردنی (العاضد) لە ساڵی (٥٦٠)و چەند ساڵێکدا کۆتایی پێهات.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە: ماوەی خیلافەتی دوای پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە گوێرەی فەرموودەی (صحیح) (٣٠) ساڵی تەواو بوو، أبوبکرو عمرو عوسمان‌و علی لە ڕستەی ئەم خیلافەتە سەرڕاستەدان‌و (حسن)ی کوڕی (علی)یش (٦) مانگ پۆستی خیلافەت دەگرێتە دەست‌و بەمە (٣٠) ساڵی تەواو لەم خیلافەتە پڕ دەبێ، ئێمە ئەم بابەتەمان لە باسی (دلائل النبوة= بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیدا) جێگیر کردووە پاش ئەم سەردەمە مەلیکایەتی (پاشایەتی) دێتە پێشەوە، یەکەم مەلیکی زنجیرەی ڕۆڵەکانی ئەبو سوفیان لە (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)ڕا دەست پێدەکات، ئینجا (یەزید) دێ، دوای ئەویش معاویەی کوڕی یەزیدی کوڕی موعاویە، مەلیکایەتی ئەم ماڵەی کە بە (معاویە) دەستی پێکرد، بە (معاویە)ش کۆتایی پێهات‌و بە یەکجاری وەجاخی کوێر بۆوە.

ئینجا مەلیکایەتیەکە لە ماڵی (سوفیان)ەوە گوازرایەوە ماڵی مەڕوانی کوڕی حەکەمی کوڕی أبی العاص ی کوڕی عبدشمس ی کوڕی عبدمناف ی کوڕی قصی، یەکەم مەلیکیان (مەڕوانی کوڕی حەکەم) بوو، پاش ئەویش (عبدالملك)ی کوڕی بووە مەلیك، ئینجا سەرە هاتە سەر وەلیدی کوڕی عبدالملك، لەوێشەوە بۆ (سلیمان)ی برای، لەوێشەوە بۆ (عمری کوڕی عبدالعزیز)ی ئامۆزای، ئینجا بۆ (یەزیدی کوڕی عبدالملك)، ئینجا بۆ (هشام ی کوڕی عبدالملك)، دوای ئەویش بۆ (ولیدی کوڕی یزید)، ئینجا بۆ (یزیدی کوڕی وەلید)، پاش ئەویش بۆ (ابراهیم الناقص)ی برای — کە کوڕی وەلیدیشە — لەوێشڕا بۆ (مروانی کوڕ محمدی ناسراو بە (حمار)، ئەمەیان دواهەمین مەلیکی (بنی مروان) بوو، یەکەمیان ناوی (مەڕوان) بوو دواهەمینیشیان هەر ناوی (مەڕوان) بوو، یەکەمین خەلیفەی (بنی عباسی)یش ناوی (عبداللە) بووو بە (السفاح) شۆرەتی پەیداکردبوو، دواهەمین خەلیفەشیان هەر ناوی (عبداللە) بوو کە بە (المستعصم) ناوی دەرکردبوو.

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٦٧/١٧.

بە هەمان شێوە یەکەمین خەلیفەی (فاتیمیەکان)یش ناوی (عبدالله المهدی) بووو دواهەمینیشیان ناوی (عبدالله العاضد) بوو، ئەمەی باسمان کرد ڕێکەوتنێکی سەرسوڕهێنەرو دەگمەنە خەڵکانێکی کەم نەبێ دەرك بەمە ناکەن،[١] خودای پاك و پێگەرد بۆ خۆی زاناترە.

ئەمە قەسیدەیەکە لە لایەن شاعیرێکی بەڕێزەوە نووسراوەتەوەو ناوی هەموو خەلیفەکانی تێدا باس کردووە:

الحمد لله العظيم عرشه — القاهر الفرد القويّ بطشُه
مقلّبِ الايام والدّهور — وجامع الأنام للنُّشُور
ثم الصلاة بدوام الأبد — على النبيٍّ المصطفى محمد
وآله وصحبه الكِرام — السادة الأئمة الأعلام
وبعد هذه أُرجوزة — نظمتها لطيفة وجيزة
نظمت فيها الراشدين الخلفا — من قام من بعد النبي المصطفى
ومن تلاهم وهلمّ جرًّا — جعلتها تبصرة وذكرى
ليعلم العاقل ذوالتّصوير — كيف جرت حوادث الأمور
وكلُّ ذي مقدرة وملك — معرّضون للفناء والهُلْكِ
وفي اختلاف الليل والنهار — تبصرة لكلّ ذي اعتبار
والملك للجبار في بلاده — يورثه من يشاء من عباده
وكل مخلوق فللفناء — وكل ملك فإلى انتهاء
ولا يدوم غير ملك الباري — سبحانه من مَلِكِ القهار
منفرد بالعزّ والبقاء — وما سواه فإلى انقضاء
أول من بُويع بالخلافة — بعد النبي ابن أبي قحافة
أعني الإمامَ العادلَ الصديقا — ثم ارتضى من بعده الفاروقا
ففتح البلاد والأمصارا — واستأصلت سيُوفُه الكفارا
وقام بالعدل قِياما يُرضِي — بذاك جبارَ السماء والارض
ورضي الناس بذي النورين — ثم عليّ والد السِّبْطين
ثم أتت كتائب مع الحسن — كادوا بأن يُجَدِّدوا بها الفتن
فأصلح الله على يديه — كما عزا نبّينا اليه

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٦٨/١٧.

| | |
|---|---|
| وأجمع الناس على معاوية | ونقل القصة كل رواية |
| فمهد الملك كما يريد | وقام فيه بعده يزيد |
| ثم أنه وكان برّا راشدا | أعني أبا ليلى وكان زاهداً |
| فترك الإمرة لا عن غلَبَة | ولم يكن منه اليها طلبة |
| وابن الزبير بالحجاز يدأب | وفي طلب الملك وفيه ينصر |
| وبالشام بايعوا مروانا | بحكم من يقول كن فكانا |
| ولم يدم في الملك غير عام | وعافصته أسهم الحمام |
| واستوثق الملك لعبدالملك | ونار نجم سعده في الفلك |
| وكل من نازعه في الملك | خرّ صريعاً بسيوف الهُلك |
| فقتل المُصْعَبَ بالعراق | وسيّر الحجاج ذي الشقاق |
| الى الحجاز بسيوف النِّقم | وابن الزبير لائذٌ بالحرم |
| فجاء بعد قتله بصلبه | ولم يخف ي أمره من ربه |
| وعندما صفت له الأمور | تقلبت لحينه الدهور |
| ثم أتى من بعده الوليد | ثم سليمان الفتى الرشيد |
| ثم استفاض في الورى عدل عمر | تابع أمر ربه كما أمر |
| وكان يدعى بأسبح القوم | وذي الصلاة والتُّقى والصوم |
| فجاء بالعدل وبالإحسان | وكفَّ أهل الظلم والطُّغيان |
| مقتدياً بسنة الرسول | والراشدين من ذوي العقول |
| فجّرع الاسلام كأسى فقده | ولم يروا مِثْلاً له من بعده |
| ثم يزيد بعده هشام | ثم الوليد فُتَّ منه الهام |
| ثم يزيد وهو يدعى الناقصا | فجاءه حِمامُهُ معافِصا |
| ولم تَطُل مَدة ابراهيما | وكان كل أمره سقيما |
| وأسند الملك الى مروانا | فكان من أموره ما كانا |
| وانقرض الملك على يديه | وحادث الدهر سطا عليه |
| وقتله قد كان بالصَّعيد | ولم تفده كثرة العديد |
| وكان فيه حتف آل الحكم | واستُنزعت عنهم ضُروب النّعم |
| ثم أتى ملك بني العباس | لازال فينا ثابتَ الأساس |
| وجاءَت البيعة من أرض العجم | وقلّدت بيعتهم كلُّ الأمم |

| | |
|---|---|
| وكل من نازعهم من الأمم | خرّ صريعاً لليدين والفم |
| وقد ذكرت من تولّى منهم | حين تولى القائم المستعصم |
| أولهم ينعت بالسفاح | وبعده المنصور ذوالنجاح[1] |
| ثم أتى من بعده المهدي | يتلوه موسى الهادي الصّفيّ |
| وجاء هارون الرشيد بعده | ثم الأمين حين ذاق فقده |
| وقام بعد قتله المأمون | وبعده المعتصم المكين |
| واستخلف الواثق بعد المعتصم | ثم أخوه جعفر مُوفِي الذّمم |
| وأخلص النية في التوكل | لله ذي العرش القديم الأول |
| فأدحض البدعة في زمانه | وقامت السُّنّة في أوانه |
| ولم يُبَقّ بدعة مُضِلّة | والبس المعتزليّ ذلّة |
| فرحمة الله عليه أبداً | ماغار نجم في السماء أو بَدا |
| وعندما استشهد قام المنتصر | والمستعين بعده كما ذُكر |
| وجاء بعد موته المعتز | والمهتدي المكرّم الأعزّ |
| وبعده استولى وقام المعتمد | ومهد الملك وساس المعتضد |
| والمكتفي في الصحف العليا سُطر | وبعده ساس الأمور المقتدر |
| واستوثق الملك بعزّ القاهر | وبعده الراضي أخو المفاخر |
| والمتقي من بعده والمستكفي | ثم المطيع ما به خُلْف |
| والطائع الطائع ثم القادر | والقائم الزاهد وهو الشاكر |
| والمقتدي من بعده المستظهر | ثم أتى المسترشد الموقّر |
| وبعده الراشد ثم المقتفي | وحين مات استنجدوا بيوسف[2] |
| والمستضيء العادل في أفعاله | الصادق الصدوق في أقواله |
| والناصر الشهم الشديد الباس | ودام طول مُكثه في الناس |
| ثم تلاه الظاهر الكريمُ | وعَدْله كلّ به عليم |
| ولم تُظل أيامه في المملكة | غيرَ شهور واعترته الهلكة |
| وعهده كان إلى المستنصر | العادل البَرِّ الكريم العنصر |

١ البداية والنهاية ١٧/٣٧١.
٢ البداية والنهاية ١٧/٣٧٢.

دام يسوسُ الناس سبْع عشرة — وأشهراً بعزمات برّة
ثم توفّي عام أربعينا — وفي جمادي صادف المنونا
وبايع الخلائق والمستعصما — صلّى عليه ربّنا وسلّما
يبعثُ نُجب الرّسل من الآفاق — يقضون بالبيعة والوفاق
وشرفوا بذكره المنابرا — ونشروا من جُوده المفاخرا
وسار في الآفاق حسنُ سيرته — وعدله الزائد في رعيته[1]

ئینجا (شێخ عماد الدين ابن كثير) دەڵێ: منیش دوای ئەمە دەڵێم:

ثم ابتلاه الله بعد التتار — أبتاع جنكيزخان الجبّار
صححه ابن ابنِ له هولاكو — فلم يكن من امره فكاك
فمزقوا جنوده وشمله — وقتلوه نفسه وأهله
ودمروا بغداد والبلادا — وقتّلوا الأصفاد والأجدادا
وانتهبوا المال مع الحريم — ولم يخافوا سطوة العظيم
وغرّهم إنظاره وحمله — وما اقتضاه عدله وحكمه
وشغرت من بعده الخلافة — ولم يؤرّخ مثلها من آفة
ثم أقام الملك أعني الظاهرا — خليفة أعني به المستنصرا
ثم ولي من بعد ذاك الحاكم — قسيم بيبرس الإمام العالم
ثم ابنه الخليفة المستكفي — وبعض هذا للبيب يكفي
ثم ولي من بعده جماعة — ما عندهم علم ولا بضاعة[2]
ثم خليفة الوقت المعتضد — ولايكاد الدهر مثله يجد
في حسن خلق واعتقاد وجلي — كيف لا وهو من الشّمّ الأُلى
سادوا البلاد والعباد فضلاً — وملئوا الأقطار حكماً وعدلا
أولاد عم المصطفى محمد — وأفضل الخلق بلا تردُّد
صلى عليه ذو الجلال — مادامت الأيام والليالي[3]

---

١ البداية والنهاية ١٧/٢٧٣.
٢ البداية والنهاية ١٧/٢٧٣.
٣ المصدر نفسه ص: ١٧/٢٧٤.

## حەوتەم: گرنگترین هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی:

خۆ دوورخستنەوە لە جێبەجێکردنی شەریعەتی خودا تەمبەڵیو دڵتەنگی دنیاو تەفرو تونابوونی سزای قیامەت بۆ تاكو كۆ ڕادەكێشێ، شوێنەوارەکانی خۆدوورخستنەوە لە شەرع لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی ئاینیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووری دەردەکەون، بە جۆرێك بەڵاو ئاشوب هێندە بەسەر خەڵكدا دێن تا تەواوی کاروبارەکانی ژیانیان دەشێوێنێ. خودای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور: ٦٣).

بێگومان ئوممەتی ئیسلامیو حوکمڕانەکانی لە دوادوایەکانی دەوڵەتی عەبباسیدا لە شەرعی خودا دوورکەوتبوونەوەو لە ژیانی دونیا ڕۆچووبوونو تووشی دڵەڕاوکەو سەرگەردانیو ترسو تۆقان ببوون، لە بەرامبەر پەلاماری مەغۆڵدا هەرەسیان هێنا، سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگری شکێنران، نەیانتوانی سەربازانەو چیا ئاسا خۆڕاگرنو هەر جارێك بەڕووی داگیرکاردا هەڵدەشاخان ترسو بەزین بە هۆی تاوانەکانیانەوە دڵوو دەروونی داگیردەکردنو تووشی چۆك لەرزینو پشووتەنگی دەبوون، لە هەموو بوارەکانی ژیندا تووشی تەنگژەو تەنگەتاوی ببوون: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ (طه: ١٢٤).

گەلانو حوکمڕانانی بەشی خۆرهەڵاتی ئیسلامی (ئەودیوڕووبارو ئێرانو عێراق) تووشی دۆڕانو سەرگەردانیو هەست نەکردن بە بوونی خۆو مردنی ویژدانی ڕوحی ببوون – مەگەر خودا ڕەحمی بە خەڵکانێك کردبێت لەم نێوەداو بەم دەردانەوە گیرۆدە نەبووبی –، فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگەگرتن لە خراپە نەمابوو، ئەوەی بەسەر جوولەکەکان هات بەهۆی وازهێنانیان لە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، بەسەر ئەوانیش هات، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾﴾ (المائدة: ٧٨-٧٩).

هەر کاتێك ئوممەت شەرعی خودا بە گەورە دانانێو فەرمانەکانی جێبەجێ ناکاتو سنووری قەدەغەکانی دەشکێنێ بە دەردی جوولەکە گیرۆدە دەبێتو هەوەسی دێنێ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (کلا، والله لتأمرنّ بالمعروف ولتنهون عن المنكر ولتأخذون

على يد الظالم، ولتأطرنه على الحق أطرا ولتقصرنه على الحق قصرا، أو لينصرن الله بقلوب بعضكم بعضا، ثم ليلعنكم كما لعنهم).[1]

حوکمڕانانی موسڵمانانی (ئەودیو ڕووبارو ئێران‌و عێراق) بەهۆی گۆڕانی دڵ‌و دەروونیان لە گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداری‌و گەردنکەچیڕا بۆ سەرپێچی‌و هەڵگەڕانەوە لە دژی حوکمەکانی خودا سوننەت‌و بڕیاری جێبەجێکراوی خودای باڵادەستیان بەسەرداهات، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الانفال: ٥٣). ئەو کۆمەڵگایانەش کە ملی خۆیان بۆ ئەو جۆرە حوکمڕان‌و حوکمەتانە نەوی دەکەن کە لە شەرعی خودا لادەدەن ئەگەر کەسانێکیان تێدا پەیدا نەبن‌و بەرەو ڕووی ئەو واقیعە نەبنەوەو داوای گێڕانەوەی حوکمی خودا نەکەن ئەوا بە تێکڕای تووشی داماوی‌و زەبوونی‌و سوک‌و چروکی دەبن.

لەو وڵاتە موسڵمانانەدا دەست درێژیکردنە سەر گیان‌و ماڵ‌و ناموس زۆری پەرە سەندبوو، حوکمەکانی شەریعەت پەکیان خرابوو، بەهۆی دوورکەوتنەوە لە کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) شەڕو هەراو بەڵاو ئاشووب تەشەنەی سەند، دوژمنایەتی‌و ڕق‌و کینە لە بەرامبەر یەکتریدا پەنگی خواردەوە، مەغۆلەکان بە ئاسانی پرۆژەی داگیرکاری خۆیان لە بوخاراو سەمەرقەندو ئەفغانستان‌و ئێران‌و عێراق جێبەجێ کرد، ڕۆژبەڕۆژ هێزو دەسەڵاتیان زیادی دەکرد، دەستیان لە دەستکەوتی گەورە گیربوون، سەرکەوتنی خودا بە نسیبی سەرۆکی یەکێك لەو وڵاتانە نەبوو ـ کە ناومان هێنان ـ، لە ئارامی‌و پایەداری بێ بەش کران، تووشی ترس‌و تۆقان بوون لە دوژمن، هەندێك شار بەهۆی گەمارۆی درێژخایەنی مەغۆلەوە تووشی برسێتی‌و قات‌و قڕی هاتن، مەغۆلەکان ژمارەیەکی زۆرو بێ شوماریان لە موسڵمانان کوشت‌و ئافرەت‌و کچانێکی زۆریشیان لێ داگیرکردن.

بێگومان دوورکەوتنەوە لە شەرعی خوداو دەست نەگرتن بە سوننەتەکانی خودا لە مەیدانی ململانێ‌و ڕووبەڕووبوونەوەدا لە دەستدانی وڵات‌و دەسەڵات‌و زاڵ بوونی کافران‌و بەڵاو موسیبەتی یەك لە دوای یەك بە دوای خۆیدا دەهێنێ.

یەکێك لە سوننەتەکانی خودا کە لەنێو نێوەڕۆك‌و حەقیقەتی ئاین‌و مێژوودا دەرهێنراوە ئەمەیە: هەر کاتێك سەرپێچی خودا کرا لە لایەن کەسانێکەوە کە دەیناسن کەسانێکیان بەسەردا زاڵ دەکات کە نایناسن. هەر لەبەر ئەمەش بوو خودا مەغۆلەکانی بەسەر

---

[1] سنن أبي داود، رقم الحديث: ٤٦٧٠.

موسڵمانانداا زاڵ کردن، کاتێکیش زانایانو شەرعزانان لە (میسر) لە دەورەی (سیف الدین قطز) گردبوونەوەو پەیمانیاندا ئاینی خودا سەربخەن، خودا لە (عین جالوت)دا بەسەر مەغۆلەکانیدا سەرخستن، لەمەولا بە ئیزنی خودا بە درێژی باسی لێوە دەکرێت.

ئەو تاوانانەی خودای مەزن دەسەڵاتەکانی پێ لەنێو دەباتو سزای ئوممەتانی پێ دەدات دوو بەشن:

–ئینکاری کردنی پێغەمبەرانو باوەڕنەکردن بەوەی پێی هاتوون.[١]

–بەدنمەکیو سپڵەیی لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکاندا بە خۆبەزلزانیو فیزو دەمارو ڕەتکردنەوەی هەقو بەسوك تەماشاکردنی خەڵكو ستەمکردن لە لاوازانو خۆشویستنی بەهێزانو زێدەڕۆیی کردن لە گوناهو تاوانو سەرسام بوون بە سەروەتو سامان، ئەم سیفەتانە هەر هەموویان بە سپڵەییو بەدنمەکی دەژمێردرێن لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکان، بەکارنەهێنانی نیعمەتەکان لە بەرژەوەندیو سوودی خەڵکیداو دادپەروەری گشتیدا تاوانە، ئەم تاوانی دووەمە بوو حوکمڕانانی موسڵمانان لەم قۆناغی مێژووی ئوممەتدا بە چاکی شولیان لێ هەڵکێشابووو موو بە موو خاڵ بە خاڵ جێبەجێیان دەکرد.[٢]

هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی زۆر بوون، زەمانێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیبووو پیر ببوو، پێش هاتنی (هۆلاکۆ) دیاردەکانی هەرەسی لێ دەرکەوتبوون، پێش ئەمەو ماوەیەکی زۆر ڕەگەکانی نێو جەستەی ئەم دەوڵەتە لەبەر هۆکارگەلێکی بێ هەژمار وشك هەڵاتبوون، لەمەولا بە ئیزنی خودا ڕونیان دەکەینەوە:

### ١ـ دیارنەبوونی سەرکردایەتیەکی کاربەجێ:[٣]

خەلیفە (المستعصم باللە): پیاوێکی زاناو شارەزا نەبوو و دەربارەی کاروباری دەوڵەتەکەی کەم تەرخەم بوو، پیاوی ئەو شوێنە گرنگو چارەنووسسازە نەبوو کە بۆی دانرابوو، خاوەنی کەسایەتیەکی هێندە تۆکمەو بەهێز نەبوو، نەیتوانی وەکو سەرکردەیەکی لێهاتوو نوێنەرایەتی سەرکردایەتیەکی سەر ڕاست بکات، لە کاتێکدا لێکدا لێکدا هەواڵی نزیك بوونەوەی مەغۆلەکانی پێگەیشت، بەڵام وەکو پێویست خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم هێرشە مەترسیدارە ئامادە نەکرد،[٣] لە ئاستی هۆشیاریو بەرپرسیاری دا نەبوو، نەشارەزاو بێ ئاگابووو خاوەنی تەگبیرو ڕا نەبوو، بێ هیممەتو بێ مشور بوو، سەروەتو سامانی

---

١ تاریخ دولتي لبمرابطين والموحدين للصلابي ص: ١٤٢.

٢ المصدر نفسه ص: ١٤٢.

٣ جهاد المماليك ص: ٣٥١، قضايا ومواقف من التاريخ العباسي ص: ٢٠٤.

خۆش دەویست، کاروباری پشتگوێ دەخستن‌و بە خەڵکی دەسپاردن‌و بۆ خۆی پاڵی لێ دەدایەوە، ئەگەر بەس ئەو ڕەفتارەی لە بەرامبەر سپاردەکەی (مەلیك ناسر داود)دا نواندی بخەینەڕوو بەسە بۆ کەسێکی وەکو ئەو پێی لەکەدار بکرێت‌و ببێزرێ.

بێگومان لاوازی سەرکردەیی لە کەسایەتی (مستعصم)دا بە یەکێك لە هۆکارە ڕێ خۆشکەرو لە پێشینەکانی ڕوخانی دەوڵەتی عەباسی دێتە هەژمار، ئەو نەیدەزانی وەزیری باش بۆ خۆی هەڵبژێرێ، توانای بە دواداچوونی کاروبارەکانی‌و لێپرسینەوەی سەرکردەکانی نەبوو، ئەو سەرکردایەتی نەدەکرد، بەڵکو سەرکردایەتی بە سەرەوە دەکرا، ئەم خوخدەی (خەلیفە) سەری کێشا بۆ ئەوە، هەندێك لە کەسانی دەوروبەری جورئەت بنوێنن‌و غافڵگیری بکەن‌و بەرەنگاری ببنەوە، لەبەر ئەوە لە سەردەمی ئەودا ئاشوب‌و تورەیی‌و پرتەو بۆڵەی خەڵك زیادی کردو باری ئابووری لێکهەڵوەشابوو گرانی‌و قات‌و قڕی‌و پاشقولدان بڵاوببۆوەو، دزو جەردەو قۆڵبڕو تەڵەکەبازان بە بەر چاوی پۆلیسەوە یان بە ڕێکەوتن لەگەڵیاندا ماڵ‌و سامانی خەڵکیان دەدزی، خەلیفە لێپرسینەوەو لێپێچانەوەی نە لە بەرامبەر پۆلیسدا دەکرد نە لە بەرامبەر وەزیرەکەیدا دەکرد، ئەو وەزیرەی بەسەر هەموو دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت‌و هەرێمە سەربەخۆکانیشدا باڵادەست بوو، (ابن العلقمی)ی وەزیر بە مەبەستی نەهێشتنی سەروەری ئیسلامی‌و ڕوخانی خیلافەت لە ژێرەوە ئاگری شۆڕش‌و کودەتای خۆش دەکردو نەخشەو پیلانی سازدەدان.[1]

ئەو سەرکردایەتیە سەرڕاست‌و ڕەشیدەی قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکات‌و سیفەت‌و ڕەوشتەکانی ڕون دەکاتەوەو هانی ئوممەت دەدا کار بۆ هێنانەدی بکات، لە ئارادا نەمابوو، ئوممەت مافی خۆی لە هەڵبژاردن‌و دیاری کردنی سەرکردایەتیەکی لەم شێوە بۆ خۆی واز لێ هێنابوو، بەڵکو بە مافی خۆی نەدەزانی لە دژی تاوان‌و هەڵەی حوکمڕانانی ڕاپەڕێت‌و لێپرسینەوەو لێپێچانەوەیان لەگەڵ بکات، ئەویش گیان‌و ویژدانی کەوتبووە بەر تاوێرەکانی داڕوخان، (خەلیفە)ش دەورەی بە قودسیەت‌و پیرۆزیەکی وەهمی‌و خەیاڵی تەنرابوو، پێوەرەکانی شەریعەت‌و ئامانجە بەرزەکانی سەبارەت بەم مەسەلەیەو چەندان مەسەلەی تر فەرامۆش کرابوون.

خودای باڵادەست‌و کاربەجێ پێوەرو سیفەتەکانی (سەرکردایەتی سەرڕاست‌و ڕەشید)مان لە چیرۆکی (ذي القرنين)و ژیاننامەی (داودو سولەیمان علیهما السلام)و غەیری ئەوانیش لە

---

١ بغداد مدينة السلام وغزو المغول ص: ١٢٥.

قورئانی پیرۆزدا بۆ دەخاتەڕوو، خودا (جل جلاله) بە مەبەستی ئەوە حوکمڕانانی ئوممەت چاو لە نموونەکانی بکەن بەم شێوەیەو لە ماوەی گێڕانەوەی بەسەرهاتی (ذي القرنين)دا نیشانەکانی پایەداری هەر حوکمەتێکمان نیشان دەدا، گرنگترینی ئەم نیشانانە:

- (ذي القرنين)و دەستووری دادپەروەری:

خودای بەرز دەفەرموویت: ﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾(الكهف: ٨٧ــ٨٨). واتە: (ذي القرنين) گوتی: هەر کەس جەورو ستەم بکات، ئێمەش لەمەولا سزای دەدەین، پاشان دەگەڕێتەوە لای پەروەردگاری‌و، ئەویش سزایەکی بێ وێنەی دەدات، بەڵام هەر کەسێك ئیمان بێنێت‌و کاروکردەوەی چاك ئەنجام بدات ئەوا — جگە لەوە لە دوارۆژدا پاداشتی چاکی دەدرێتەوەو، ئێمەش بڕیارو کلروبارەکانی خۆمانی لەسەر سوك‌و ئاسان دەکەین.

- گرنگیدانی بە زانست‌و بەکارهێنانی لە چاکەدا:

وەك دەبینین ژمارەیەك زانستی باشی لەنێو دەوڵەتە بەهێزەکەیدا بەگەڕ خستبوون، گرنگترینی ئەو زانستانە زانستی جوغرافیا بوو، (ذي القرنين) شارەزایی چاکی هەبوو لە دابەشبوونی زەوی‌و ڕێگاوبان‌و چیاو دۆڵ‌و دەشتەکانیدا، لەبەر ئەمە توانی ئەم زانستە لە هاتوچۆی سوپاکەیدا لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاواو لە باکوورەوە بۆ باشوور بەکاربێنێ، هەروەها لە هەموو جۆرە زانستەکانی سەردەمی خۆیدا شارەزاییەکی پێویستی هەبوو، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ (الكهف: ٩٦) توخمی کانزاکانی ناسیون‌و لە دیاری کردنیان‌و زانینی سیفەتەکانیان‌و بەکارهێنان‌و سوود لێ وەرگرتنیاندا شارەزابوو، بێگومان (ذي القرنين) کانزاکانی لە دروستکردنی هەموو ئەو کەلوپەل‌و ئامرازانەدا بەکارهێنان کە دەوڵەتەکەی حەوجێیان بووو، بەپێی هەل‌و دەرفەتی ڕەخساویش تەواوی تواناکانی بۆ پێکانی ئامانجەکانی خستەگەڕ.

- لە هەڵسەنگاندنی کاروبارەکانی‌و پێوانەکردنی تواناکانیدا واقیعی بوو:

پێشەکی ئەندازەی قەبارەی خەتەرە پێشهاتووەکەی دەگرت، ئینجا ئەندازەی چارەسەری پێویستی بۆ دەگرت، قورئانی پیرۆز باسی (ڕەوشتە سەرکردەیی)یەکانی دەکات

له: ئارامیو دان بەخۆداگرتنو سامو هەیبەتو ئازایەتیو هاوسەنگی کەسایەتیو زۆر زیکر کردنی خوداو خۆپاراستن لە خواردنو بەهەدەردانی ماڵو سامانی خەڵکو گەشتی جیهادکردن له پێناوی خوداداو پابەند بوون به ڕۆشنبیری شارستانیو... هتد، کێ دەیەوێ زیاتر لەمە بزانێ با تەماشای کتێبی (فقه النصر والتمکین في القرآن الکریم)[1] بکات، ئەم پێوەرو ڕەوشتو سیفەتانەی کە بۆ هەڵبژاردنی حوکمڕان پێویست بوون لە ئارادا نەمابوون، لەبەر ئەمە پۆستی خیلافەت درایە دەست کەسێك کە شیاو نەبوو لێی نەدەوەشایەوە، بۆیە لاوازی خەلیفە بەشداری لە ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسیدا کرد.

## ٢ـ پشتگوێ خستنی فەریزەی جیهاد لە لایەن عەباسیەکان:

پشتگوێخستنی فەریزەی جیهاد لە لایەن عەباسیەکانەوە کاریگەرترین بەڵکو مەترسیدارترین هۆکار بوو بۆ ڕوخانی خیلافەتی عەبباسی، دوابەدوای بەسەرچوونی سەردەمی خیلافەتی (المستعصم بالله) – (٢١٨ـ٢٢٧ك/ ٨٣٣ـ٨٤٢)دا بوو بە خەلیفە – هیچ جەنگو جیهادێکی شایستە نابینینو نابیستین دەوڵەت پێی هەستابێ، بنەمای (جیهادی بەردەوام) بۆ پاراستنی ئەو دەوڵەتە بەرفراوانو پەلو پۆدارە لەنێو بنەما سەرەکیەکانی سیاسەتی دەوڵەتی عەبباسیدا بوونی نەمابوو، لەنێو ناکۆکیە نێوخۆییەکاندا تلیان دەداو بەم دەردەوە توشی مردنی لەسەرخۆ دەبوون، ئەگەر ئەوان وزەو تواناکانی ئوممەتیان ئاڕاستەی (جیهاد) کردبایەو لە دژی خاچپەرستەکاندا بەکاریان هێنابایە، بەشێوەیەکی سروشتی بزوتنەوە ڕووخێنەرەکانو ئاشووبە دەرکەوتووەکان دەپوکانەوە، گومانی تێدا نیە ئەم جۆرە بزوتنەوە ئاژاوەگێڕانە تەنها لە کەشو هەوای پیسو گوماوی لێڵدا سەر هەڵدەدەنو تەشەنە دەکەن، تاکە کەشو هەوایەکی سازو لەبار بۆ پوکانەوەو لەنێوچوونیان تەنها کەشو هەوای جەنگو جیهادەو لەوێدا ڕەشو سپی لێك جودا دەبێتەوەو زێڕ بە ساغی دەمێنێتەوەو خڵتەو خاڵیش دەتوێتەوە، دەوڵەتی ئیسلامی پێویستی زۆری بە هەڵکردنو بەرزکردنەوەی ئاڵای جیهاد هەبوو، تا خەڵکی لە ژێر کۆکاتەوەو لەو دووبەرەکیو پەرتەوازەی تێی کەوتوون ڕزگاریان بکاتو لە کەشو هەوای بێدەنگ بوونو چۆکدادان لە بەرامبەر دوژمندا بیهێنێتە دەرو بەرەو ئامانجی سەرکەوتنو پایەداریو سەقامگیری بەرێ، بەڵام – بە داخەوە – عەباسیەکان ئاڵای جیهادیان لە دژی داگیرکەری دەرەکی بەرز نەکردەوە، لەنێو جەرگەی ماڵی خۆیاندا جەنگو هەرایان دروست کردو تووشی داماوی

---

[1] فقه النصر والتمکین في القرآن الکریم ص: ١٦٣ـ١٦٤.

بوونو ئاڵای سەرپێچی کارانو یاخیانی نێوخۆ بەرز کرانەوە، ئەوان دەیانتوانی ڕەگەزە هەمەچەشنەکانی نێو دەوڵەتەکەیان لە ژێر ئاڵای جیهاددا کۆکەنەوەو ڕووبەڕووی داگیرکەرو پەلاماردەرە بت پەرستە یەك لە دوای یەکەکان ببنەوە، بەڵام ئەمەیان نەکرد، بۆیە چەندین بزوتنەوەی جۆراوجۆری ڕەگەزپەرست – لە ژێر ئاڵای ئاڵو واڵادا – کەمو زۆر پەیوەندیان بە ئیسلامو جیهادەوە نەبوو – بە مەبەستی پارچەپارچەکردنی دەوڵەت ڕاست ببوونەوە، (هۆلاکۆ) – ی نەوەی جەنگیزخان – لە ساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز یدا هێرشی هێنا، شکستی بە هەموو کەس دەخوارد تەنها ئەوانە نەبێ کە ڕێبازی (جیهاد)یان هەڵبژاردبوو، ـ خەلیفەو دارودەستەکەی – هەموو هەوڵێکیان بۆ چارەسەری کۆتایی هاتنی شەڕو شکاندنی ئاڵقەی گەمارۆی سەر (بەغدا)دا تەنها ڕێبازە بەهێزو زیندووو چارەسەرسازە ئیسلامیەکە نەبێ کە (جیهادە)، (هۆلاکۆ) پەلاماری (بەغدا)یدا، (مەنجەنیق)ی بە گەڕ خستو شورەو قەڵاکانی ڕوخاندن، ئاداری بەسەر پادارەوە نەهێشت، تا کار بەوە گەیشت لەبەر بەرپابوونی بۆنسۆی دوکەڵو بۆگەنی زۆر ژیانی تێدا نەدەکرا، کاتێکیش (خەلیفە) (موستەعسەم) بەخۆیو (٧٠٠) کەس لە وەزیرو کاربەدەستانی دەوڵەتەکەیو قازیەکانی بەبێ هیچ مەرجێك خۆیان بەدەستەوەدا، (هۆلاکۆ) یەکسەر فەرمانیدا بیانکوژن، بەم شێوەیە تۆماری خیلافەتی عەبباسی لولپێچ کرا، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە گرتنەبەری شێوازی خەونی ڕۆمانسی سادە هەرگیز نابێتە هۆکاری مانەوەو دامەزراوبوونی شارستانیەکان، ئەوانەی خاوەنی ئیرادەی هێرشو هەڵمەت نین، توانای بەرگریش لەدەست دەدەن،[١] بێگومان دەوڵەتی عەباسی فەرێزەی جیهادی پەکخستبوو کۆڵی لە پێکانی ئامانجەکانی دابوو، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

أ– چەسپاندنی حوکمی خودا کە خۆی لە جێبەجێکردنی دەستووری ئیسلامیدا دەبینێتەوە، خودای گەورەو باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ (النساء: ١٠٥).

ب– کارکردن بۆ نەهێشتنی بێ باوەڕی: خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿فَلۡيُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٧٤﴾ (النساء: ٧٤).

---

١ دراسة لسقوط ثلاثين دولة اسلامية ص: ١٢٧.

ج- بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری کافران بۆ سەر وڵاتانی ئیسلامی: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠﴾ (البقرة: ١٩٠).

هەروەها چەندین ئامانجی تریش، کە پێکانیان پێویستی بە (جیهادی بەردەوام) هەبوو، کەواتە پشتگوێ خستنی فەریزەی (جیهاد)و گرنگی نەدان بە ئامانجەکانی، یەکێك بوو لە هۆکارە کاریگەرەکانی ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی.

**٣ـ لەدەستدانی یەکێتی سیاسی لەنێو جیهانی ئیسلامیدا:**

لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی دووەمی کۆچی‌و هەشتەمی زاینییەوە لاوازی‌و پەرتەوازەیی دزەی کردە نێو دەوڵەتی عەباسی بەرفراوانەوە، هەندێك لە وڵاتە دوورەکانی بەغدای پایتەختی خیلافەت جیابوونەوەو سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاندو دەوڵەتی ناوەندیش نەیتوانی بیانگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

دەوڵەتی (ئەداریسە): لە ساڵی ١٧٢ك/٨٠٠ز لە وڵاتی (مەغریب) دامەزرێنرا، ئینجا دەوڵەتی (فاتیمی)یش لە ساڵی ٢٩٧ك/٩٠٩ز لە وڵاتی (تونس)دا لەسەر بناغەی دەوڵەتە ڕوخاوەکەی (ئەغالیبە) دروست بوو، دەوڵەتی (تۆلۆنی)یش لە ساڵی ٢٥٤ك/٦٦٨ز لە (مسر) سەری هەڵداو لە ساڵی ٣٢٣ك/٩٣٥زایینیدا دەوڵەتی (ئیخشیدی) جێگەی گرتەوە، هێندەی نەخایاند (فاتیمیەکان) لە ساڵی ٣٥٨ك/٩٦٩زایینیدا دەستیان بەسەر (میسر)دا گرت‌و (قاهیرە)یان کردە پایتەختی دەوڵەتەکەیان.

بەم شێوەیە (بەشی خۆرئاوای ئیسلامی)و (میسر) بەرەبەرە بە گوێرەی کات‌و شوێن لە بازنەی دەوڵەتی عەبباسی دەرچووو خیلافەتێکی تر دەرکەوت‌و دەستی بەسەر نیوەی خۆرئاوای ئیسلامیدا گرت‌و هەوڵی دەدا دەسەڵاتی خۆی بەسەر بەشە نیوەکەی خۆرهەڵاتی ئیسلامیشدا بکێشێ کە وەکو نیوە بەشەکەی خۆرئاوا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندبوو.

دەوڵەتی (زاهیری) لە ساڵی ٢٠٥ك/٨٢٠ز یدا لە (خۆراسان) بەرپابوو، ساڵی ٢٥٤ك/٨٦٧ز دەوڵەتی (سەففاری) جێگەی گرتەوە، ئینجا دەوڵەتی (سامانی) کە لە ساڵی ٢٠٤ك/٨١٩ز یدا لە وڵاتی (ئەودیو ڕوبار) دروست ببوو، دەستی بەسەر (خۆراسان)دا گرت‌و دەیەویست هەموو ئەو هەرێمانە داگیر بکات کە سەر بە دەوڵەتی (سەففاری) بوون، بەرەبەرە قەڵەمڕەوی خیلافەتی عەبباسی لە دەسەڵاتێکی (سیاسی ئیداری ڕوحی)یەوە گۆڕا بۆ دەسەڵاتێکی (ڕوحی)و بەس، کار بەوە گەیشت تەنها ناوی خەلیفە لە دوای باسکردنی ناوی سەرۆکی دەسەڵاتداری هەرێم بخوێنرێتەوەو بەس، لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی‌و لێکهەڵوەشانی

دەسەڵاتەکەی[1] بە خاتری کۆمەڵە هۆکارێکی سەرەکیەوە بوو کە ئێرە جێی باس لێکردنی نیە، لە سەردەمی (المستعصم)دا (٢١٨ــ٢٢٧ك)، تورکەکان پشکی گەورەیان هەبوو لە دەسەڵاتدا، (موعتەسەم) ئەوانی لە خۆ نزیك دەکردەوەو پۆستی باڵای لە پایتەختو هەرێمەکان دەدانە دەست، پاسەوانی کردنی کۆشکەکەی پێ سپاردبوون، کار بەوە گەیشت لە نێو بەغدا دەست درێژیان دەکردە سەر خەڵكو سکاڵای زۆر لە بەرامبەریان بەرز دەکرانەوە، (موعتەسەم) شاری (سامەڕا)ی بۆ دروستکردنو کردی بە پایتەختی ئەوانو ئەو تورکانەی لە دەرەوەی ئەو هالابوون لە کۆشکی خیلافەتدا، دەسەڵاتیان پەرەی سەند، وای لێهات خۆیان بە تەنها دەسەڵاتی ڕەهایان بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەتدا هەبوو، بە ویستو خواستی خۆیان خەلیفەیان هەڵدەبژارد، حەزیان بە کێ نەکردبایەو لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیان نەهاتبایەوە لەسەر پۆستەکەیان لادەبرد.

(بووەیهی)یە شیعەکان لە ساڵی ٣٣٤ك/٩٤٥ز دەستیان بەسەر (عێراق)دا گرتو خستیانە سەر دەوڵەتەکەی خۆیان کە پێشدا لە (فارس) دایانمەزراندبوو، ئینجا ئەمان بوونە خاوەن سوڵتەی ڕەها بەسەر کاروباری خیلافەتداو، کار بەوە گەیشت هەڵوێستی ستەمکارانەیان لە بەرامبەر (خەلیفە)دا دەنواند، هەندێك خەلیفەیان ئازارو ئەشکەنجەدانو هەندێکی تریشیان زیندانی کردن، ژمارەیەکی تریشیان کوشتن، ئەو شیعانە دوای ئەوەی فاتیمیەکان دەستیان بەسەر میسردا گرت دەیانتوانی کۆتایی بە خیلافەتی عەبباسی بێننو، لە (عێراق)و (خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا) بە شێوەیەکی تایبەت بانگەوازی بۆ خیلافەتی (فاتیمی) بکەن، بەڵام ئەوان ئەم کارەیان نەکرد، لەبەر ئەوە نا پارێزگاری لە خیلافەتی عەبباسی بکەنو حەزیان بە چارەی بێ، بەڵکو لە پێناوی ئەوەدابوو دەسەڵاتو دەوڵەتی خۆیان نەبێتە قوربانی دەوڵەتی (فاتیمی)، ئەو (فاتیمیانە)ی کە ئێستا دەسەڵاتیان فراوان بووەو توانیویانە دەست بەسەر وڵاتی (شامو نیوە دوورگەی عەرەبی)دا بگرنو جارچییەکانی خۆیان لە پێناو بنکۆڵ کردنو ڕوخاندنی (خیلافەتی عەباسی)و دەست بەسەرداگرتنی (خۆرهەڵاتی ئیسلامی) بەنێو (عێراق)دا بڵاو کردوونەوە، لە ساڵی ٤٤٧ك/١٠٥٥ز یدا یەکێك لە جارچیانی بانگەوازی فاتیمی توانی سود لە لاوازی بوەیهیەکان وەرگرێتو لە ڕێی لایەنگرەکانیەوە لە نێو ئەو دەوڵەتەدا فیتنەو ئاشووب هەڵایسێنێو خەلیفە بگرێتو زیندانی بکات، (خەلیفە) هاواری لە (توغرۆل بەگی) سوڵتانی دەوڵەتی سلجوقی بەست – کە لە

---

١ دور نورالدين محمود في نهضة الأمة ص: ٢٥.

ساڵی ٤٢٧ك/١٠٣٧ز لە هەندێك ناوچەی هەرێمی (خۆراسان)دا دامەزرابوو، ئینجا بە سوود وەرگرتن لە لاوازی بوەیهیەکان پەلو پۆی بۆ باکورو باشوری ئێران هاویشتبوو —، سوڵتانی سلجوقی ئەم دەرفەتەی قۆستەوەو بە هێزێکی زۆرەوە بەرەو (عێراق) ڕۆیشتو کۆتایی بە ئاشووبەکەو دەوڵەتی (بوەیهی) هێناو دەسەڵاتو قەدرو ڕێزی جارانی بۆ (خەلیفە) گێڕایەوە، بەڵام پاش ئەوەی (توغرۆل بەگ) لە ساڵی ٤٥٠ك/١٠٥٨ز یدا بەغدای بەجێ هێشت، (بەساسیری) — کە بە بانگەشەی فاتیمیەکان کاری تێکرابوو — دەستی بەسەر (بەغدا)دا گرتو بانگەشەی بۆ (خەلیفە)ی فاتیمی (المستنصر بالله) کرد، بەڵام سەرلەنوێ (توغرۆل بەگ) گەڕایەوە بەغداو کۆتایی بە جارچیو شۆڕشچیانی فاتیمی هێنا لە عێراقدا، ئەمجارەیان بارودۆخی عێراق بە بەرژەوەندی دەوڵەتی سلجوقیی سوننی مەزەب ئاسایی بۆوەو کاروبارەکان بۆ خیلافەتی عەباسی هاتنەوە جێگەی پێشوویان، سلجوقیەکان ڕێزو حورمەتێکی زۆریان بۆ خەلیفە دەخستەڕوو، بەڵام تەنها وەکو ڕەمزێکی ئایینی هێشتبوویانەوەو هیچ هێزو دەسەڵاتێکی نەبوو، کاتێك خاچپەرستەکان لە ساڵی ٤٩٢ك/١٠٩٩ز یدا هێرشیان هێنایە سەر وڵاتی (شام)، خیلافەتی عەباسی جگە لە ناردنی نوێنەر بۆ لای سوڵتانەکانی دەوڵەتی سلجوقی تا چارەسەری بارودۆخەکە بکەن هیچ دەسەڵاتێکی تری نەبووو نەیدەتوانی بەرەنگاری هێرشەکە ببێتەوە.[1]

ئەمەو پەیوەندی نێوان سلجوقیەکانو عەبباسیەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە نێوان هەڵکشانو داکشاندا بوو، هاتنە پێشەوەی (خوارەزمیەکان)یش وەکو هێزێکی نوێ لە ناوچەکەدا گرژیو ئاڵۆزی نێوان ئەوانو خەلیفەکانی عەباسی لێکەوتەوە — وەك لە پێشدا باسکرا —، هەرچەندە لە سەردەمی (المستعصم)ی دواهەمین خەلیفەی عەباسیدا خیلافەتی عەباسی ڕووبەڕووی نارەحەتیو مەینەتی زۆرو زەوەند بۆوە، بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بە هیچ هەوڵو تەقەلایەکی دیبلۆماسی موستەعسەمی خەلیفە ناکەن کە لە پێناوی دەرچوونی لەم گێژاوەدا دابێتیو پەیوەندی بە هیچ کامێك لە هێزو دەسەڵاتە ئیسلامیەکانی دەوروبەریەوە کردبێ، بە تایبەتیش ئەییوبیەکانی شامو مەمالیکەکانی میسر، وەك بۆمان ڕوون بۆوە ئەو هەر بەو دڵەوە ژیاوە کە ئەم هێزانە هی خۆنیو هەر کاتێك پێویستی پێ بوونو ئاماژەیەکی بۆ کردن لە خزمەتیدا ئامادە دەبن، نامەکەی خەلیفە بۆ هۆلاکۆ کە وەڵامی هێرشەکانی تێدا دەداتەوە ئەم ڕاستیەمان نیشان دەدا، لەو نامەدا هاتووە: کە هەر

---

١ دولة السلاجقة، للصلابي ص: ٥٥٩.

هەموو هێزە ئیسلامیەکان چاوەڕێی ئامادەیەکی سادەو ساکاری خەلیفە دەکەن تا لە ڕووی مەغۆلەکاندا بوەستنەوە، ئەوەی لە یاد چووبوو کە ئەییوبیەکانو مەمالیکەکان بە کێشە نێوخۆییەکانیان سەرقاڵنو ناتوانن لە بارودۆخێکی ئاوادا بە کۆمەكو هاوکاری بەغداوە بچن.[١]

**ێ ـ لاوازی سوپای عەبباسی:**

لە دوا سەردەمەکانی عەبباسیدا، قەوارەی خیلافەت تووشی لێکهەڵوەشانو لێکترازان بوو، وڵاتەکان بە یەکجاری یان بە نایەکجاری خۆیان لە دەوڵەت هەڵاوارد، خەلیفەیەك گرنگی بە سوپا دەداو یەکی تر دەهات گوێی پێ نەدەدا، یان خەلیفەیەك لە ماوەیەکی سەردەمی خۆیدا سوپای ڕێکدەخستو ماوەیەکی تریش ئیهمالی دەکرد، خەلیفە (المستنصر بالله)ی باوکی (المستعصم بالله)ی دواهەمین خەلیفەی عەبباسی گیانو ژیانی بەبەر سوپای دەوڵەتدا کردەوەو ڕێکی خستەوە، ئەم کارەی لە دوای ئەوە هات — کە دەوڵەتی عەبباسیسەروەری خۆی لەدەست دابووو پارچە پارچە ببووو خەریك بوو بەرەو فەوتان بڕوات —، بەڵام خەلیفە (المستنصر) هاتو بە مەبەستی ئەوە بتوانێ هێرشی چاوەڕوانکراوی مەغۆل تێك بشکێنێو وڵاتی ئیسلامیان لێ پاکساز بکاتو ئاودیوی سنووریان بکاتەوە ژمارەی سوپای عەبباسی بەرەو (١٠٠) هەزار سەرباز پێهەڵا برد.

بەڵام دارودەستەی خەلیفە (المستعصم)ی کوڕی گرنگیان بەم بابەتە نەداو کاروباری سوپایان خستە ئەستۆی خودی (خەلیفە)، خەلیفەش متمانەی تەواوی بە بیروبۆچوونو ڕاکانی (ابن العلقمی)ی بە ڕەگەز فارسی وەزیری هەبوو، لەسەر ڕاوبۆچوونی ئەو ژمارەی سەربازانی سوپای لە (١٠٠) هەزارەوە دابەزاند تەنها (٢٠) هەزار، ئەمە لە حاڵێکدا مەغۆلەکان سەرسوێیان لە دەوڵەتە تەنگ پێ هەڵچنراوەکەی عەبباسی گرتبووو (هەمەدان)یان کردبووە پایتەختو شوێنی دەرچوونی هێرشەکانیان، لەم کاتەدا کاربەدەستانی خەلیفەو وەزیرو گزیرو ڕاوێژکارانی هیممەتیان نەکردو کەسیان لە ڕاست ئەم خەتەرە لەنێوبەرە بە ئاگا نەهێناو وەستاوێکیان لە جێگەی خۆی نەجولاند، لە لایەکی ترەوە خەلیفە بارودۆخی سەربازانی پشتگوێ خستو ڕزقو ڕۆزی یەك کە بۆیان برابۆوە لەسەری بڕینو ناوی لە تۆمارەکانی سەربازیدا کوژاندنەوە، کار بەوە گەیشت ئەم سەربازە ماڵ وێرانانەلە کوچەو کۆڵانو بەرو بازاڕو مزگەوتەکاندا سواڵیان دەکرد، شاعیران هۆنراوەی زۆریان لەسەر نووسیون.[٢]

---

١ جهاد المماليك للغامدي ص: ٥٣.
٢ بغداد مدينة السلام ص: ١٣٩.

(ابن کثیر) دەڵێ: پێش کارەساتەکە (ابن العلقمی)ی وەزیر سەربازانی لە سوپا دەتەکاندنەوەو ناوی لە تۆماری دیواندا دەکوژاندنەوە، هێزەکانی سوپا لە دوا ڕۆژەکانی سەردەمی (المستنصر باللە)دا خۆی لە (١٠٠) هەزار سەربازو سەرکردەو ئەمیر دەدا، هی وایان تێدا بوو پلەوپایەی لە (پاشای گەورە) باڵاتر بوو، (ابن العلقمی)ی شەوو ڕۆژ هەوڵی دەدا لە سوپا کەم کاتەوە، تا وای لێهات (١٠) هەزار سەباز مایەوە، ئینجا لە ژێرەوە نامەی بۆ (تەتار) دەنووسیو وەرە وەرەی دەکردن وڵات بگرن....و زاناو قازیو موفتیەکان بکوژن.[1]

سوپای خەلیفە سیستەمی لەنێودا نەمابوو، بۆ چەند یەکەیەکی سەربازی دابەش ببووو هەر هێزە لە ڕاست خۆی بە بڕیاری خۆی کاری دەکردو پەیوەندی بە هێزەکانی ترەوە نەبوو و، وەکو سوپای مەغۆل نەبوو کە لەنێو ئەواندا بە هۆی هەبوونی سەرکردایەتیەکی باڵاو تایبەتکرانی بە خودی (خان)و پشتیوانی لێکرانی لە لایەن دیوانی ڕاوێژکاری جەنگ — کە لە گەورە سەرکردەکانی مەغۆلو میرەکانیان پێکهاتبوو —، لە کارەکانی (دیوانی ڕاوێژکاری جەنگ)ی مەغۆلی کێشانی نەخشەی جەنگ بوو، بەڵام نە (خەلیفە)و نە سەرکردەکانی سوپاکەی گرنگیان بە هونەری کۆکردنەوەی زانیاریو ڕاستیەکانی نێو وڵاتی دوژمن نەدەدا، بەڵکو (خەلیفە) دەربارەی ئەمە زۆر بێ ئاگا بووو هیچی لێ نەدەزانی، بەڵام مەغۆلەکان گرنگیەکی زۆریان بە هونەری هەواڵگری دەدا، سوپاکانیان چاوساغی زۆریان هەبوونو ڕاستی بارودۆخەکانیان بۆ دەگواستنەوە، یەکێك لە شێوازی ئەم هونەرەیان ئەمە بوو، مەفرەزەی سەربازیان بە نهێنی دەناردنە سەر دوژمنەکانیانو جاسوسیان بەسەرەوە دەکردن، لەوانەیە چەند ساڵێکی دوورو درێژ ئەم هونەرەیان لە بەرامبەر وڵاتێکدا ئەنجامدایە، ئینجا دوای وەرگرتنی هەستو خوستی تەواویان هێرشیان کردبێتە سەر، زۆربەی سەرکەوتنەکانی مەغۆل بۆ چەند هۆکارێکی سەرەکی دەگەڕێتەوە کە لە نێوانیاندا هونەری هەواڵگیری لە پێشەوەی ئەو هۆکارانەوە دەژمێردرێ، ئەوان بە تەواوەتی بۆیان ڕوون بۆوە کە دەوڵەتی عەبباسی سنوورەکانی چۆڵو بێ پاسەوانن، تەواوی سیستەمەکانی لێك هەڵوەشاون، سوپا سەربازیەکانی تێك شکاون، بە کورتی سەرتاپای دەوڵەت تێکچووەو لەبەر یەك ترازاوە،[2] ئینجا بڕیاریدا هێرشی بکاتە سەر.

---

١ البداية والنهاية ١٣/١٩٦، بغداد مدينة السلام ص: ١٣٩.

٢ خلفاء بني العباس والمغول، اسطقوا بغداد ص: ٥٦٨_٥٦٩.

٥ـ لاوازبوونی دەماری دەوڵەتچێتی:

دەوڵەتی عەباسی لەسەر ڕەگو ڕیشەیەکی پێکەوە بەستراوی نەتەوەیی دانەمەزرابوو، بەڵکو لەسەر بیروبۆچوونێکی ئیسلامی هەمەلایەنە بەرپابوو، لەو دەوڵەتەدا ئیسلام هێزە نەتەوەییو چەند ڕەگەزیەکانی پێکەوە کۆکردبوونەوەو لە یەك بازنەدا ڕێکی خستبوون، عەباسیەکان پۆستی وەزارەتیان دەدا بە کەسێکی غەیرە عەرەب کە خۆیان پەسندیان دەکرد هەروەها پۆستی سەرکردایەتی سوپایان دەدا بە کەسێکی ناعەرەبو کەسێکی عەرەب، بەلام لەگەل ئەمەشدا هەمیشە گومانو واهیمە دەورەی مێشكو هۆشی دەدانو دەترسان ناعەرەبەکان خۆ بەسەر دەسەلاتدا بسەپێنن، هەر کاتێك بۆنی شتێکی لەو بابەتەیان لە وەزیرێك یان سەرکردەیەکی عەجەمی خۆراسانی کردبایە بە پەلەو بێ ساغکردنەوەو لێکۆڵینەوە ڕەپێچەکیان دەدا.

بنۆڕە (مەنسور) چی بەسەر (ئەبو موسلیمی خۆراسانی)ی یەکەمین وەزیرو سەرکردەی سوپای عەباسی داهێنا، هەرچەندە (أبو مسلم) دەستپێشخەریەکی چاكو پەرێزێکی پاکی لە بوژانەوەی دەوڵەتو بەرقەرارکردنیدا هەبوو، بەلام ئەمە لە بەرامبەر گومانی (أبو جعفر)دا سوودی نەبوو غیرەتی ڕێی نەدەدا کەس بەشداری موڵكو ماڵو سەڵتەنەتی بکات، هەرچەندە نابێ پاکانەی (أبو مسلم) بکەینو بڵێین هەرگیز نیازی ئەوە نەبووە جڵەوی دەسەلات بۆ لای نەتەوەکەی خۆی بسوڕێنێ، یان بڵێین عەبباسیەکان بە بۆچوونی ئەو تەنها هۆکارو ئامرازی پێداچوونە سەرەوە بوونو بەس، کاتێك (أبو مسلم) کوژرا سەرکردەیەکی فارسی کە پێ دەچێ ئاگرپەرست بووبێ — بە ناوی (سنباذ) خەڵکێکی زۆری کۆکردەوەو داوای تۆڵەی خوێنی (أبو مسلم)ی دەکرد، خەریك بوو وڵاتی خۆراسان ڕاتەکێنێ، بەلام (أبو جعفر) هێزێکی بە شێوازی دەمارگریری عەرەبی تێکەڵ بە عەقیدەی ئیسلامی بە سەرکردایەتی (جمهوری کوڕی میڕاری عەجەلی) کە سەر بە هۆزی (ڕەبیعە) بوو ناردە سەرو تێکی شکاندنو چۆکی پێدادان، ئینجا (ڕواندیە)کان داوای تۆڵەیان دەکرد، بە هەمان شێوە (معن ی کوڕی زائیدەی شەیبانی)ی سەر بە هۆزی (ڕەبیعە)ی بەگژدا کردنو کۆتایی بە ئەوانیش هێنا.

بە کورتی دەوڵەتی عەبباسی: لە کۆمەڵە نەتەوەیەکی زۆر پێکهات کە ئاینیان یەك بوو بەلام ڕەگەزەکانیان هەمەجۆر بوون، ململانێی لاوەکی لەسەر حیسابی هەموو لایەکیان دروست دەبوو کە ئیسلام یەکی خستبوون، لە کۆتاییدا بە هۆی لە گرێژنەچوونی

هاوسەنگی هێزی ناوچەکەو لە دەستدانی ئەو جێگەو پێگە ئاینیەی دەوڵەتی لە هەرەس دەپاراست ململانێ لە نێوان نەتەوەکانو ڕەگەزەکان بە شێوەیەکی گشتی بەرپا دەبوو لەو نێوانەدا عەباسیەکان بوونە قوربانی، ژمارەیەك نەتەوەی ناعەرەب خۆیان لە دەرەوەی دەمارگیری دەوڵەتی عەباسی هاڵاند: پێشەکی فارسەکان کە خاوەنی دەسەڵاتی تەواو بوون، ئینجا تورکەکان هاتن، دوای ئەوانیش بوەیهیەکان ئینجا سلجوقیەکان– وەکو لە پێشدا باسمان کرد–، خەلیفەکانی عەباسی – دوای بێ هێزبوونو لاوازبوونی سلجوقیەکان – تەکانیان بەخۆدەدا لە خەوە درێژخایەنەکەیان ڕاپەڕن، بەڵام کتوپڕ مەغۆلەکان وەکو سێڵاوی بە لێشاو هاتنو ڕووبەڕوویان بوونەوە هەروەها ئەو حاڵەتە دەمارگیریەی دەوڵەت خۆی لەسەر ڕاگرتبوو لاوازو بێ هێز بوو.[١]

### ٦ـ کزبوونی بەهای پەیمان:

وەفاداری بەرامبەر بە پەیمان ڕەوشتێکی ڕەسەنی ئیسلامیەو موسڵمانان پارێزگاریان لێکردووەو گیانو ماڵی خۆیان لە پێناویدا بەخت کردووە، نەتەوەکانی فارسو ڕۆمو بەربەرو غەیری ئەوانیش شایەدی ئەمەیان بۆ داوە، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾ (الإسراء: ٣٤)، هەروەها خودا دەفەرمووێت: ﴿وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾﴾(النحل: ٩١). ئەمەو چەندین ئایەتی تریش لە قورئانی پیرۆزدا واجب بوونی وەفاداری لە بەرامبەر پەیمانو بەڵێننامەکان چەندپات دەکەنەوەو حیسابی یەکێك لە پایە هەرە پتەوەکانی بۆ دەکەن کە ئوممەتی ئیسلامی لەسەر ڕادەوەستن، خەلیفە ڕەشیدو سەرڕاستەکان بەڵێنو پەیمانەکانیان دەبردنە سەر، کاتێك دەوڵەتی عەبباسی هات، چەندین ڕووداوی لەسەر یەك لە لایەن سەرکردەکانی ئەو دەوڵەتەوە ڕوویاندا کە دەبنە نیشانەو بەڵگە لەسەر ئەوە کە خەلیفەکانیان عەبسی هیچ نرخو بەهایەکیان بۆ بەڵێنو پەیمان دانەناوە.

(مەنسوڕ) هێشتا (سفاح)ی بابی لە ژیاندا بوو (ابن أبي هبيرة)ی چەپاڵەداو پاشان کوشتی، (ئەبو موسلیمی خۆراسانی)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (عەبباسی) ئامـاژەی بە (منصور)دا بیکوژێ، ئەوان بەبێ پرسو ڕای (أبو مسلم) هیچ هەنگاوێکیان نەدەنا، پاشان

---
١ الدولة العباسية، للخضري ص: ٤٨٠.

(منصور) هەمان شانۆگەری لە دژی خودی (أبو مسلم)یشدا ئەنجامداو پاش ئەوەی پەیمانی پێدا گیان و ژیانی بپارێزێت گرتی و کوشتی، پاش ئەمیش (عبدالله ی کوڕی علی)ی مامی ئەمانداو دوایە کوشتی، هەر لەبەر ئەم پەیمان شکێنیە بوو، کاتێك (منصور) نامەی بۆ (محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی حسن) ناردو گوتبووی کە بەڵێنی پێدەدا چەپاڵەی بدا، (محمد) بەم وشانە وەڵامی دەداتەوە: حەز دەکەم جۆری ئەمان و چەپاڵەدانەکەت پێناسەکەی، چەپاڵەدانەکەی (ابن ابی هبیره)یە یان چەپاڵەدانەکەی (أبو مسلم)ە یان چەپاڵەدانەکەی (عبدالله ی کوڕی علی) مامتە؟ والسلام.

ئەمە وەڵامێکی ددانشکێن بوو بۆ خەلیفە.

پەیمان شکێنی بووە پەڵەیەکی نەنگ بەنێوچاوانی مێژووی دەوڵەتی عەبباسیەوە، ئەم کارانەی لە سەردەمیەکەمی دەوڵەتدا ئەنجام دران ڕچەی بۆ سەردەمەکانی دوای خۆی شکاند، کە هەر کاتێك زانیان بەرژەوەندی خۆیان پەیمان بردنەسەر ناخوازێ بوێرن و هەنگاو بنێن پابەند نەبن بەو پەیمانەی بەستوویانە و بەو بەڵێنەی داویانە، بە تایبەتیش ئەو بەڵێنانەی تایبەت بوون بە ویلایەتی عەهدەوە، بۆ نموونە (سفاح) بەڵێنی دا پۆستی خیلافەت لە دوای (منصور) بداتە دەست عیسای کوڕی موسا، بەڵام (منصور) فشارێکی زۆری خستە سەر (عیسا)و دوای هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆر واداری کرد ڕەزامەندی دەربېڕێت و پۆستەکە بۆ (محمد المهدی کوڕی منصور) واز لێ بێنێ، کار بەوە گەیشتبوو (عیسا) لە (منصور) هەڵگەڕێتەوەو ئاژاوە بەرپابێت، بەڕای من ئەگەر پشتیوانی هەبوونایە وازی نەدەهێنا، بەڵام بەپێی ئەو شیعرەی لێیەوە بەجێماوە بە حیسابی خۆی بەرژەوەندی ئوممەتی بەسەر بەرژەوەندی خۆیدا هەڵبژاردووە، وەکو دەڵێ:

خيرت أمرين ضاع الحزم بينهما — إما صغار وإما فتنة عمم

وقد هممت مراراً أن أساجلهم — كأس المنية لو لا الله والرحم

دوای ئەمیش (ئەمین) هەمان شانۆگەری لە بەرامبەر (مەئمون)ی برایدا نواندووە، ئەمەیان سەری کێشا بۆ ئاشووبێکی پەل و پۆدارو بەربڵاوو ئوممەت ماوەی (٤) ساڵی تەواو لە ساڵی ١٩٤ـ١٩٨ك تاڵاوی ئەم فیتنەو ئاشوبەی چەشت، کەسێکیان تێدا نەبوو پارێزگاری لە پەیمانەکان بکات و لە سزای پەیمان شکێنی بترسێت، شتێکی بەڵگە نەویستە کە مەسەلەی پەیمانشکێنی و بەڵێن نەبردنە سەر هەر لە نێوان (٢) کەسی نێو کۆشکی خیلافەتدا کورت هەڵنەهاتبوو بەس، بەڵکو ئەم دەردە کوشندەیە نێو تەواوی سەرکردەو

والیەکانی گرتبۆوەو ئەنجامدانی پەیمان شکێنی ببووە کارێکی ئاسایی لە لایانو ڕێگاکانی هەڵگەڕانەوەو جودابوونەوەو بەڵێن شکێنیو پەیمان بەزاندن ئاسان دەکران.

(ڕەشید) چەپاڵە نامەیەکی بۆ (یەحیای کوڕی عبدالله) نووسیو بە تەواوەتی دڵنیای کرد کە دەیپارێزێت، بەڵام کاتێك دڵی لێ پیس بوو گومانی لەسەر پەیداکرد، ئینجا بە دوای قیلەیەکدا دەگەڕا ڕێگەی پێ بدا پەیمانەکەی بشکێنێ، بۆ ئەم مەبەستە زاناو شەرعزانانی سەردەمی خۆی ڕاسپاردن تا فتوایەکی بۆ بدەن، هەیانبوو دینو ڕەوشتی کردە حەکەمو ئاینی نەخستە ژێر تەوژمی هەواو ئارەزووی خەلیفە، هەشیانبوو بەپێی ئارەزووی خەلیفە جوڵایەوەو فتوای بۆدا، هەموو ئەو عەیبو عارو نەنگیانە سەریان کێشا بۆ ناکۆکیو پەرتەوازەیی نێو ئوممەتو لاوازیو زەبوونی هەستی دەمارگیری دەوڵەت، کارهاتە سەر ئەمە خەلیفەکان کۆمەکی هێزو دەسەڵاتیان لە خەڵکانێك دەخواست کە بەسەریاندا زاڵ ببوون.[1]

### ٧ـ بێ هیمەتی پاشاو سوڵتانەکانی دەوروبەر:

لە بەرامبەر ئەوەدا مەغۆلەکان هێزو پێزیان زۆرو زەوەند بووو یەك هەڵوێستو یەکبڕیار بوونو زەبر وەشێنی چوستو چالاك بوون، موسڵمانان بە گشتیو حوکمڕانو سوڵتەکانیان بە تایبەتی بێ هیمەتی ڕووی تێکردبوونو لە جیاتی خۆ خەریککردن بە جیهادو بەرەنگاری نوقمی گێژاوی گاڵتەو گەپو کاری بێ هودە ببوون، (إبن الأثیر)ی مێژوونووس (٢) ساڵ پێش وەفاتیو لە ساڵی (٦٢٨)ی کۆچیدا هەواڵی مەرگەساتی ئیسلامو ئەهلەکەی ڕادەگەیەنێتو بەم شێوەیە بارودۆخی حوکمڕانەکان باس دەکات: لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە بۆ خۆی ئیسلامو موسڵمانان سەرخا، دەنا پێم وانیە پاشاو سوڵتانەکانی ئیسلام حەزیان لە جیهادو سەرخستنی دینی خوا هەبێ، بەڵکو هەر یەکێك لەوان بە گاڵتەو گەپو هەواو ئارەزووو ستەمکردنی بەردەستەکانیەوە خەریکە، بە لای منەوە ئەمە لە دوژمن مەترسیدارترە، خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗ ﴾ (الانفال: ٢٥).[2] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا بارودۆخی (خیلافەتی عەباسی)یش لەمەی باسکرا بە دەرنەبوو، بەڵکو بازنەی سەڵتەنەتی عەباسیو سنوورەکەی یەکجار تەسك بۆوەو خەڵکانی تر حوکمی بەشەکانی تری جیهانی ئیسلامیان دەکرد، کە ئەمە لە سەردەمی

---

١ الدولة العباسیة ص: ٤٩٠.

٢ الکامل في التاریخ ١٢/٤٩٧، کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص:٣٩.

دەوڵەتی ئەمەویدا ڕێگەی پێ نەدرابوو، وێڕای ئەمەش خەلیفەکانی عەباسی زۆربەی کاتەکانی خۆیان بۆ هەوەس بازیو کۆکردنەوەی سەروەتو سامانو بەسەر یەکنانی تەرخان کردبوو،[1] (ابن کثیر) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ لە ماوەی باسکردنی هۆکارەکانی کۆتایی پێهێنانی دەوڵەتی عەبباسی لەسەردەستی تەتەرەکان ئەم ڕاستیانەمان بۆ دەخاتەڕووو دەڵێ: عەبباسیەکان بە پێچەوانەی ئەمەویەکان دەسەلاتی تەواویان بەسەر هەموو وڵاتو شارو گوندەکاندا نەبوو، ئەوان بە هۆی لاوازی خیلافەتەکەیانو سەرقاڵ بوونیان بە هەوەسبازیو کۆکردنەوەی ماڵو سامان لە زۆربەی کاتەکانیاندا: وڵاتانی مەغریبو خۆراسانو ئەودیو ڕووبار وڵاتانێکی تریش لەژێر دەسەلاتی عەباسی دەرچوون تا کار بەوە گەیشت جگە لە بەغداو کەمێك لە وڵاتی عێراق نەبێ هیچ شوێنێکی تریان بە دەستەوە نەما.[2]

(قطب الدین ی یونینی) دەڵێ:..... (مستعصم)یان خستە پێش (الخفاجی) مامیەوە بۆ پۆستی خیلافەت، چونکە دەیانزانی نەرمونیانو خۆش باوەڕەو دەتوانن لەڕێی ئەوەوە فەرمانو بڕیارەکانی خۆیان بسەپێنن، خۆ ئەگەر ئەوەی (ابن العبری) باسی لێوە دەکات ڕاست بێ، لەوەکە (موستەعسەم) پیاوێکی بێ هیمەت بووەو دەستبەرداری هەموو هەرێمەکانی خیلافەت بووە جگە لە (بەغدا)، ئەوە خۆی لە خۆیدا کارەساتی گەورەیە، ئینجا دەڵێ (موستەعسەم) گوتوویەتی: من (بەغدا)م بەسەو ئەگەر واز لە هەموو هەرێمەکان بێنم بۆ ئەوان ئەوانیش زۆریم لێ ناکەن بەغدام بە تۆبزی لێ ناستێنن، ئەگەر من لە (بەغدا) بم — کە ماڵی خۆمەو خانووی نیشتەجێمە — هێرشم ناکەنە سەر،[3] هەرچۆنێك بێت لاوازی (موستەعسەم) لای هەموو کەس هەتا بە تەتەرەکانیش دەگات زانراوبوو، لەبەر ئەمە پێیان دەگوت (ئەبلەه) واتە (گێلو دەبەنگ).

ئەم زەبوونیو لاوازیو بێ هێزیەی باسکرا هەر سنوورەکانی دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیو مەڵبەندی خیلافەتو ناخو دەروونی خەلیفەی نەگرتبۆوەو بەس، بەڵکو وەکو تیراوە تەشەنەی کردو پاشاو سوڵتانەکانی وڵاتانی شامو میسریشی گرتەوە، (ابن کثیر) سەبارەت بە ڕووداوەکانی ساڵی ٦٥٨ك — دەڵێ: (مەلیك ناسری کوڕی عبدالعزیز)ی سوڵتانی دیمەشقو حەلەبو (مەلیك موغیسی کوڕی عادل)ی سوڵتانی کەرکو شەوبەك بە هاوکاری

---

١ کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص: ٤٠.
٢ البدایة والنهایة ١٣/١٩٥، کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص: ٤٠.
٣ تأریخ مختصر الدول ص: ٢٥٥.

(ئەمیر ركن الدین بیبرسی بندقداری) بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر (میسر)و داگیرکون،[1] پێش ئەمەش (ذهبي) دەڵێ: لە ساڵی ٦٥٦دا سوپاکەی (ناسر) بە سەرکردایەتی (موغیس)ی سوڵتانی (کەرك) بۆ گرتنی میسر بەڕێکەوت، (موزەففەر قوتتەن)ی جێگری (منصور علی کوڕی المعز) لە (رمل) بەرەنگاریان بۆوەو تاقمە سەرکردەیەکی لێ بەدیل گرتنو پاشان لە گەردنی دان،[2] هەروەها پێش ئەمەش: لە ساڵی ٦٤٢کۆچیدا گەمارۆدانی (دیمەشق) لە لایەن (خوارەزمیەکانەوە) لە بەرژەوەندی حوکمڕانی (میسر)دا بوو، قاتوقڕی تینی هێنا، (شامیەکان) بە خۆیانو پۆلە سەربازێکی (فەڕەنگ)ەوە لە نێوان (عەسقەلان)و (غەززە) بەرەو ڕوویان بوونەوە، بەڵام بە تێکشکانی خۆیان کۆتایی بە جەنگەکە هات، (خوارەزمیەکان) (فەڕەنگ)ەکانو (ئەندێك)ی حوکمڕانی (حیمس)یان وەبەر هێرشو پەلاماری بێ ئەمانی خۆیاندان، خەزێنەکانی (ئەندێك)یان تاڵان کردن، (ئەندێك) دەستی بە گریان کرد –و ڕازی شکستەی بەم وشانە دەربڕی – : (چاك دەمزانی کاتێك لە ژێر سێبەری خاچەکان دەڕۆیشتین کە تێك دەشکێین)، (ابن الأثیر) بارودۆخی موسڵمانانی ئەم سەردەمە بەم شێوەیە وەسف دەکات:

ئەو موسڵمانانەی بەر هێرشو پەلاماری ئەم دوو تایەفە(ی تەتارو فەڕەنگ) نەکەوتن، خۆیان لە نێوان خۆیان شیرو تیریان لێکتر دەسووو فیتنەو ئاژاوەی نێوانیان لەسەر قاچ وەستابوو.[3] کەواتە کە هەموو ئەم شتانە زانران دەکرێ باوەڕ بکەین کە بۆچی ئاوا – مەغۆلەکان بە خێرایی بە جیهانی ئیسلامدا – بڵاوبوونەوە، سامو هەیبەتیان دڵی موسڵمانانی داگیرکردو بەرەنگاربوونەوەش بۆچی ئاوا لاوازو کز بوو؟!، والله غالب علی أمره.[4]

### ٨ـ تەنازولە سیاسیەکان ترسنۆکی عەباسیەکان نیشان دەدەن:

دوای ئەوە تێکڕای پاشاو سوڵتانەکانی زەمین حیسابیان بۆ خەلیفەکانی عەبباسی دەکردو سامو هەیبەتی دەوڵەتەکەیان دڵو مێشکی داگرتبوونو لە ترسان بوایە یان وەك ڕێزو تەقدیر بوایە سەرانەو دیاریان پێشکەش دەکردنو بەم کارەیان خۆشەویستیو خۆش هاوسێیی خۆیان دەردەبڕیو خۆشیانو مەملەکەتەکانی خۆیان لە بەرامبەر مەترسیەکانی دەسەڵاتی عەبباسی چەپاڵە دەدا.

---

١ البدایة والنهایة ٢٠٧/١٣، کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص: ٤٢.
٢ سیر أعلام النبلاء ١٨١/٢٣، کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص:٤٣.
٣ الکامل في التاریخ ٣٦١/١٢، کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص:٤٣.
٤ کیف دخل التتار بلاد المسلمین ص:٤٣.

بەلام پاشان ئەم کارە پێچەوانە بۆوەو خەلیفەکانی سەردەمەکانی دوایەی عەبباسی دیاریو سەروەتو سامانیان بۆ (هۆلاکۆ) دەنارد کە هاوشێوەی سەرانە بوو، بەلام ئەمان ئەم کارەیان بە خاتری خۆشەویستیو خۆش دراوسێیی ئەنجام نەدەدا، بەڵکو بە خاتری ئەوەبوو هێرشیان نەکاتە سەرو لە شەڕی ئەو بپارێزرێن.

بەڵێ: خەلیفە (مستنصر بالله) دیاری نایابو زێڕو زەبەرو سامانو کەنیزەكو کۆیلەو ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی زۆری بۆ هۆلاکۆ دەنارد، لەگەڵ ئەوەدا هۆشیارو زرنگیش بوو بەلام دەیەویست ئەم بەم دیاریانە خۆیان لە لا خۆشەویست بکات یان هیچکە نەبێ خۆ لە شەڕیان بپارێزێ، کاتێك (مستعصم) بوو بە خەلیفە: ئامـاژەی پێکرا – ئەگەر ژمارەی سەربازانی سوپا کەم بکاتەوەو خۆ لەگەڵ تەتار بسازێنێو ماڵو سامانیان وەبەر بکات ئەوا بە مەبەستی خۆی دەگات، ئەویش ئەمەی کرد.[١]

بێگومان خۆ بردنە پێشەوە لە تەتەرەکان بەم جۆرەو پێشکەشکردنی ماڵو سامان پێیان: بەڵگەیەکی گەورەو ئاشکرایە لەسەر لاوازیو بەزینو خراپی دەوڵەتەکەی (ابن العلقمی)ی وەزیرو نیازپیسی خودی وەزیرو کوێرایی داهاتنی دەسەلاتی (قەزا)و سەرکردەکانی سوپاو کەودەنیو نازیرەکیانو سەرگێژەی خەلیفە لە نێو تەنگژەی ترسو دڵەڕاوکێو پاشانیش ڕوودانی ڕووخانی دەوڵەتی خیلافەت، لە ڕاستیدا ڕوخانی خیلافەت بوو بە ئامانجی سەرەکی مەغۆلەکان، پاش ئەوە لە ڕێی تەنازولە سیاسیە نابەجێو خاڵی لە نەخشە داڕێژی دروستو تێڕوانینی ستراتیژیانە یانەی عەباسیەکانلاوازی گیانی فیداکاریو بەرەنگاری عەباسیەکانیان بۆ ڕوون بۆوە هاتنو ئامانجیان پێکا، کەواتە تەنازولە سیاسیەکان بوونە هۆکارێك لەنێو ڕستە هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی عەباسی.[٢]

### ٩ـ فرەمەڵبەندی هێزەکان:

جڵەوی ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی بەغدا بە دەست یەك مەڵبەندەوە نەبوو، بەڵکو ژمارەیەك سوڵتەی دژ بەیەك هەبوونو هەر یەکەش لە ڕاستی خۆیڕا دەستدرێژی دەکردە سەر ئەوەی تریانو خۆی لە کاروباری هەڵدەقورتاند، لێرەدا هیچ پەیوەندیەکی واش نەبوو سەرۆکی ئەم سوڵتانە لەسەر ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەت پێکەوە کۆبکاتەوەو، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕقیان لە یەکتر دەبۆوەو لەگەڵ یەکتر ناکۆك بوونو پیلانیان لە دژی یەکتر

١ بغداد مدينة السلام وغزو المغول ص: ١٤١.
٢ المغول للصياد ص:٢٥٣.

دەگێڕانو هەریەکەیان لە لای خەلیفە زەمبی ئەوانی تری دەکردو بە گێلو نەزانی دەردێنان، لە سەرووی هەمووشیانەوە (خەلیفە) ویستو ئیرادەی لە دەستدا بووو کەسایەتی لاواز بووو نەیدەتوانی سوڵتە بە دەستەکان لە سنووری دەسەڵاتی شەرعی خۆیان ڕابگرێت، ئەمە سەری کێشا بۆ فراوان بوونی زەمینەی دووبەرەکی نێوان سەرکردەکانو توندتربوونی دژایەتی نێوانیان، بە تایبەتیش دوژمنایەتی نێوان (مؤيد الدين العلقمي)ی وەزیر — شیعە مەزەب — و (مجاهد الدين أبيك الدوايدار الصغير)ی — سەرۆك سوپا — ی سوننە مەزەب —، لەم نێوانەدا لە هەموو ناکۆکیەکانی نێو بەغدا زیاتر زەق بۆوە، پێش پەلامارەکەی هۆلاکۆ: (دەوایداری بچووك) خەڵکێکی زۆری شوانەوێڵەو ئاژاوەچیو پەستو نزمی لە دەورەی خۆی کۆکردنەوەو هەڕەشەی لە هێمنایەتی دەکردو بە نیاز بوو نەخشە دارێژێ (خەلیفە) لێبخاتو یەکێکی تری لەجێ دانێ، کاتێك (وەزیر) بەم پیلانەی زانی، یەکسەر خەلیفەی لێ ئاگادار کردەوەو داوای لێکرد ئەم ئاشوبە لەنێو بێشکەکەیدا لەنێو بەرێ، بەڵام (خەلیفە) کێشەکەی بە هەند وەرنەگرتو بە سیاسەتی گوێ پێنەدانی سپاردو گوێی بۆ ئامۆژگاریەکانی وەزیر نەگرتو (دەوایدار)یشی ئەماندداو فەرمانیدا لە وتاردا ناوی لە دوای ناوی خەلیفە بخوێنرێتەوە، بێگومان شێوازی هەڵسوکەوتی خەلیفە لە بەرامبەر ڕووداوێکی ئاوادا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خیلافەت لەم سەردەمەدا کەوتۆتە نێو بارودۆخێکی زۆر خراپەوە، کە خۆی لە خۆیدا دەری دەخا ڕێگەی ڕوخاندنو لەنێوچوونی داوە، لەو کاتەوە ئەم ڕووداوە هاتبووە پێشەوە (وەزیر)و (دەوایدار) لە لای خەلیفە پیلانو تەڵەکەیان لە یەکتر دەکردن، ئەمە کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر ئاڵۆزبوونی کاروبارو ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسی.[١]

### ١٠ـ داگیرکرانی هێڵو سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگری:

کاتێك خەلیفەکانی عەبباسی گوێیان بە (خوارەزمیەکان) نەداو لێگەڕان بەس بۆ خۆیان بەرگری لە هێرشو پەلاماری مەغۆلەکان بکەن، بەم هەڵوێستەیان کەوتنە هەڵەیەکی گەورەو ستراتیژیەوە، چونکە ڕوونو ئاشکرا بوو هەر کاتێك ئەم سەنگەرانەی پێشەوە بگیرێن — زۆر ئاساییە مەغۆلەکان خۆ بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عەباسیدا بکەنو ئەوەی بێتەڕێگەیان پێش خۆی بدەن، لەسەر شانی خەلیفەکانی عەبباسی واجب بوو، پێش بە پرۆژەکانی (جەنگیزخان)و ڕۆڵەو نەوەکانی بگرن کە داگیرکردنی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیان بە ئامانج گرتبوو، کاتێك بەبەرچاوی ئەوانەوە دەوڵەتیخوارەزمی دەڕوخێنراو دەسوتێنراو دەکوژراو

---

١ المغول للصياد ص: ٢٥٣.

دەبڕدرا لایان بە لایدا نەکردەوەو ئەرکی سەرشانی جیهادی خۆیان لە بە هاوارەوەچوونی برایانی هاوعەقیدەیان نەکردەوە، بێگومان ململانێی نەتەوەکان و پێکهەڵشاخانی ژیارو دەوڵەتان، بەپێی سوننەتە سابتەکانی خوای باڵادەست دەستاودەستی سەرکەوتن دەکەن و لەم نێوەدا حیساب بۆ هەست و سۆزو خۆدانەپاڵی بنەماڵەی پێغەمبەری بەڕێزا (ﷺ)و تا شوێنکەوتنیشی ناکرێت، بەڵکو حیساب بۆ دەستگرتن بە سونەتەکانی ململانێ دەکرێ و بەس.

لەسەر (مستعصم بالله)ی خەلیفەی عەبباسی و وەزیرەکانی و کاتبی دیوانەکانی و پاسەوان و دەرکەوانەکانی و سەرکردەی سەربازەکانی پێویست بوو، بزانن چ لە دەوروبەریان ڕوودەدا، چۆن (هۆلاکۆ) پەلامار دەدا، هەڕەشە دەکات، بەڵێن دەدا، ژێردەستە دەکا، بە تایبەتیش دوای ئەوە (هۆلاکۆ) توانی زۆرێك لە هەرێمەکانی عەبباسی ڕامالێت و زەوتیان بکات و پەیوەندیان بە مەڵبەندی خیلافەتەوە بپچڕێت، بەم شێوەیە خیلافەت بە دەست چەند موسیبەتێکەوە دەیناڵاند، یەکێکیان ئەوە بوو کە هاوپەیمان و پارێزەرانی خەلیفە لە دەوڵەتە دراوسێکانی هاوسنووری عێراق لە خەلیفە تەکینەوە، لە لایەکی تریشەوە سەرۆکی وڵاتەکان لە ترسی (هۆلاکۆ) نەیاندەوێرا بڕیارەکانی دەوڵەتی عەبباسی بەسەر خۆیاندا جێبەجێ بکەن، وردە وردە پەیوەندی نێوان خیلافەت و وڵاتەکان لێکهەڵوەشاو بە ناچاری و بە مەبەستی خۆ پاراستن لە شەڕو گێچەڵی مەغۆلەکان لایەنگری خۆیان بۆ هۆلاکۆ ڕاگەیاندو سامانی نایاب و گرانبەهایان بە دیاری بۆ دەبردن، تا ئەوە لە ساڵی ٦٥٥ك (عەزیزی کوڕی مەلیك ناسر) بە هاوڕێیەتی (سیف الدین ی کوڕی ابراهیمی حاکی حافیزی) سەردانی (هۆلاکۆ) دەکات و دیاریەکی گرانبەهاو جوانی پێشکەش دەکات.[1]

ڕۆیشتنی (هۆلاکۆ) بە خۆو بە سوپا مەغۆلیەکەیەوە بەرەو بەغداو دوای نامە پڕ هەڕەشەکانی شێوەیەکی سەربازیی ڕێکوپێکی دیاری خێرای نیشان دەدا، (خەلیفە موستەعسەم)یش لە نێو خەیاڵاتی پاك و پیرۆزی بنەماڵەی عەبباسی و خەونە خۆشە مێژووییەکانی نقوم ببوو، بەم وەڵامە سەرسوڕهێنەرە باسی شکۆداری عەبباسیەکانی بۆ (هۆلاکۆ) خستەڕوو: (ئەگەر لە لای (خان) نادیدەیە، با لە شارەزایانی دەوروبەری پرسیار بکا، هەر مەلیکێك — تا ئەم سەردەمە — نیازی هێرشی بۆ سەر بنەماڵەی عەبباسی و بەغدای (دار السلام) هەبووبێ، تووشی سەرەنجامێکی ڕەش بووە، هەرچەندە ئەو مەلیك و

---

[1] بغداد مدينة السلام ص: ١٥٩.

پاشایانەی نیازێکی لەم جۆرەیان هەبێت، خاوەن دەسەڵاتی گەورەو بێڕەزاش بن ئەوا هەر شکست دەخۆن، چونکە بینای ئەم بنەماڵە ئەوپەڕی قایمو مەحکەمەو تا دنیا خراپ بوون دەمێنێتەوە.......

تا ئەو شوێنەی دەڵێ: لە بەرژەوەندی (خان)دا نیە نیازی – خراپی – بەرامبەر بە بنەماڵەی عەبباسی هەبێ، کەواتە ئاگادار بە زەمانە شتێکی خراپت بەسەر نەهێنێ).

(هۆلاکۆ) بەم قسانە پەستتر بوو نوێنەرەکانی خەلیفەی بەم قسانەوە بەڕێکردنەوەو گوتی پێی بڵێن:

–برۆ لە ئاسن شارو شورە دروست بکە.

–لە پۆڵا بورجو هەیکەل بەرز بکەوە.

–سوپایەك لە شەیتانو هەڵگەڕاوەکان ساز بکە.

–ئینجا وەرە مەیدانەوەو شەڕو جەنگم لەگەڵ بکە.

–ئەگەر لەنێو ئاسمان بێ دەتهێنمە خوارەوە.

–ئینجا بەپاڵ دەتخەمە نێو زاری دڕندەکانەوە.[1]

دەبوایە خەلیفەو داورودەستەکەی ڕاوێژێکی باشیان سەبارەت بەم بەڵا لابەلایە کردبایەو ساغو سەلیم ترینو ڕێکوپێکترینو بەهێزترین ڕێگا چارەیان هەڵبژاردبایەو بە هێزەکانی سوپاو سامانو چەكو چۆڵ پشتیوانیان لە سەنگەرەکانی هێڵەکانی پێشەوەی بەرەنگاربوونەوە کردبایە، بەمە دەتوانرا بەر بە مەغۆلەکان بگیرێت، بەڵام بەرژەوەندیە کەسیەکانو ململانە نێوخۆییەکانو پیلانە گڵاوەکان، ئەمانە هەر هەموویان لە ئاسمانی سیاسەتە کرچو کاڵەکەی خەلیفەو پیاوەکانی دەخولانەوە.[2]

هێرشەکەی (هۆلاکۆ)و سوپا مەغۆلیەکەی شتێکی تازە نەبوو، بەڵکو درێژبوونەوەی ساڵانێکی دوورودرێژ بوو، ئەم ڕاستیە بە لای خەلیفەو حوکمگێڕانی وڵات شاراوە نەبوو، بەڵکو هەموو ئەو کارەساتانەی مەغۆلەکان لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەدا بەسەر موسڵمانانیاندا هێنان سەرنجی خەڵکانی دوورو نزیكو تا بێ ئاگاو خەوتوانیشی بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو، پەلامارە دڕندانەکەی مەغۆل پارچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بەر کەڵپەکانی خۆی دەداو بە خراپترین شێواز کوت کوتی دەکردن، پرۆژەیەکی بەرەنگاربوونەوەش بە سەرکردایەتی خەلیفە لە ئارادا نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی ترسو تۆقانو نەفامی سیاسی

---

١ جامع التواريخ، نقلا عن بغداد مدينة السلام ص: ١٥٢.

٢ بغداد مدينة السلام ص: ١٦٠.

سەربازی (خەلیفە) سنوورەکانو تەواوی وڵات حەلاڵ کران، (موستەعسەم) هێڵەکانی پێشەوەی بۆ ئوممەت بەبێ پشتیوانی مادیو مەعنەوی بەجێ هێشتن، تا دەستەویەخەی دەرەنجامەکەی خۆی ببێتەوە.

### ١١ـ ڕۆڵی نەسڕاینەکان لە ڕوخانی دەوڵەتی عەبباسیدا:

سوپاکەی (هۆلاکۆ) لە کاتی هێرشە گەورەکانیدا بۆ سەر خاکی دەوڵەتی (ئیسماعیلیە)و خاکی (خیلافەتی عەبباسی)و شامو فەلەستین، ژمارەیەکی زۆری مەسیحی نەستوری لەخۆگرتبوو، کە لە سەرو هەموویانە (کدبوقا نوبان)ی گەورە سەرکردەی مەسیحی مەزەب دەبینرا، مەغۆلەکان بە پاڵنەری پەیداکردنی ماددەو فراوانکردنی خاکی وڵاتەکەیانو لەپێناو دروست کردنی ئیمپراتۆریەتە جیهانیەکەیان بە سۆزو خرۆشەوەو بەوپەڕی پەرۆشەوە تێدەکۆشانو هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی خۆیان بۆ سەر وڵاتانێکی زۆر ئەنجام دەدا، لە زەریای (ئارام)ی خۆرهەڵاتەوەو هیندی چینی باشورەوە تا خاکی (پۆڵەندا)و نێوجەرگەی ئەورووپای خۆرئاوا، لە سیبیریاو دەریای بەڵتیقی باکوورەوە تا نیوەکیشوەری هیندو باکووری نێوەدوورگەی عەرەبی باشور.[١]

هەروەها مەسیحیەکانی (کەڕج) کە بە (جرجانی) بەناوبانگ بوون لە نێوڕیزەکانی سوپای (مەغۆل)دا بوونو ئەمانە وەکو تەواوی ڕەعیتەکانی مەغۆلی گەردنکەچو فەرمانبەرداری بڕیارەکانی (قەراقورم)ی ناوەندی دەسەڵاتی (مەغۆل)و (خان)ەکەی بوون، بۆیە بە چەندین کەتیبەی سەربازیو سەروەتو سامانو چەکو چۆڵی زۆرەوە بەشداری هێرشەکانیان دەکرد،[٢] کاتێك مەغۆلەکان چوونە نێو بەغداوە ڕێژێکی زۆری مەسیحیە نیشتەجێکانی ئەو شارەیان گرت، ماڵو ناموسیان پاراستنو، لە لایەن سەربازە مەغۆلەکانەوە پاسەوانی ماڵو خانووبەرەکانیان دەکرا، هەندێك لە موسڵمانان لە ترسی کوشتو بڕی مەغۆلەکان پەنایان بۆ ماڵە مەسیحیەکان برد، هەر کەسێك لە لایەن مەسیحیەکانی بەغداوە چەپاڵە دەدرا لە کوشتارە دڕندانەکەی مەغۆل دەربازی دەبوو.[٣]

### ١٢ـ ڕۆڵی حوکمڕانانی وڵاتانی ئیسلامی لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عەباسیدا:

کاتێك (هۆلاکۆ) بەخۆو بە سوپایەکەوە بەرەو لەنێوبردنی (ئیسماعیلیە)و (دەوڵەتی عەبباسی) بەڕێکەوت، کەتیبەی سەربازی هەندێك حوکمڕانە موسڵمانەکانی لەگەڵ کەوتن،

---

١ سقوط الدولة العباسية ص: ٣٢٠.
٢ المصدر نفسه ص: ٣٢٣.
٣ المصدر نفسه ص: ٣٢٤.

هۆکارەکانی بەزینو دۆڕان دڵو دەروونو هەناوی ئەو سەرۆکانەی داگیرکردبوو، لە ڕستەی ئەو هۆکارانە:

-کزبوونی هاندەری ئایینی لە لای زۆربەی ئەو میرانە.

-خۆپەرستیو خۆخۆیی.

-ترسو تۆقان - کە زۆرینەی خەڵکی گرتبۆوە.

-داکۆکی کردن لەسەر بەرژەوەندی دنیایی.

-لاوازبوونی (الولاء والبراء = دۆستایەتیو دوژمنایەتی) لە بیروباوەڕدا.

ژمارەیەك لەو حوکمڕانو میرە موسڵمانانە خیانەتی گەورەیان بەرامبەر ئوممەتی ئیسلامیو ئایینو بیروباوەڕەکەیان کردو بەشداریەکی چالاکانەی هێرشەکانی مەغۆلیان بۆ سەر دەوڵەتی عەبباسی کرد، بەناوبانگترینی ئەو حوکمڕانانە:

أ- بوڕاق حاجیبو جێنشینەکانی:

حوکمڕانی هەرێمی کرمان بوو، یەکەمین حوکمڕانی هەرێمێکی ئیسلامی بوو لە کاتی پەلاماری سەر بەغدا بەشداری مەغۆلەکانی کرد، وەکو زانراوە هەرێمی کرمان پارچەیەك بوو لە خاکی دەوڵەتی خوارەزمی، لە لایەن ئەمیر (غیاث الدین)ی کوڕی دووەمی سوڵتان (محمد خوارەزمشا) حوکمڕانی دەکرا، بە خودی خۆی (بوڕاق حاجب)ی لە جێگەی خۆی داناو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هەرێمەکەدا کردی بە وەکیلی خۆی، دوای بەرپابوونی دووبەرەکی نێوان (غیاث الدین)و (جلال الدین)ی برا گەورەی، (غیاث الدین) هەڵاتەوە بۆ (کرمان)، (بوڕاق حاجب) (غیاث الدین)ی ڕەشەکوژ کردو سەری لە لاشەی جودا کردەوەو بۆ (ئەکتا)ی (خانی گەورە)ی مەغۆلی نارد لە (قەراقورم)و ڕایگەیاند کە لەمەولا گەردنکەچو فەرمانبەرداری دەسەڵاتی (مەغۆل) دەبێتو هەرێمەکەشی بەشێك دەبێ لە ئیمپراتۆریەتی مەغۆل.

ئیدی لەمەودوا بوو بە گەورە سیخوڕی ناوچەکەو هەرچی هەواڵو گۆڕانکاری سیاسیو سەربازی هەرێمەکانی خۆرئاوا هەبوو کۆی دەکردنەوەو بۆ ئاغا تازەکانی خۆی دەناردنو بەوپەڕی گەرمو گوڕی خزمەتی بەرژەوەندیە فراوانخوازیو جیهانگیریەکەی ئەوانی دەکرد، هەر زانیاریەکی پێی بوو سەبارەت بە (جلال الدین منکبرتی)ی سەرۆکی پێشوویو نهێنیە گرنگەکانی دەوڵەتەکەی خستیە بەردەم مەغۆلەکان، بەم کارەی بەشداریەکی بەرچاوی کرد لە ڕوخاندنو لەنێوبردنی دەوڵەتی خوارەزمیو بەس بەمە ڕانەوەستا، بەڵکو بەخۆیو چەکدارەکانی بە هاوشانی تەتارەکان هێرشی دەکردە سەر وڵاتانی ئیسلامی، لە ساڵی

٦٣٢ك/١٢٣٤ز بەشداری پەلاماری سەر وڵاتی (ئاسیای بچووك)ی كرد – كە ئەو كاتە سلجوقیەكان حوكمیان تێدا دەگێڕا –، لە دوای خۆیشی هەدرووك جێنشینەكەی خۆی (ركن الدین خواجە الحق) (٦٣٢ـــ٦٥٠ك/١٢٣٤ـــ١٢٥٢ز)و (قطب الدین محمد) (٦٥٠ـ٦٥٥ك/١٢٥٢ـ١٢٥٧ز) لە خۆ بردنە پێشەوەو خزمەتچێتیدا هەوڵیان دەدا پێش یەكتر بدەنەوە، هەریەكەیان لە ڕاست خۆیەوە دەچوو بۆ (مەنغۆلیا)و دەیەویست بیسەلمێنێ كە ئەو لە ڕكەبەرەكەی دڵسۆزترەو نۆكەرێكی چاكترە بۆ مەغۆلەكان و شیاوترو لێوەشاوەتریشە بۆ گێڕانی حوكمی هەرێمی (كرمان)، ئەمەو لە (قەڕاقورم)ی پایتەختی مەغۆلەكان هەریەكەیان لە ڕاست خۆیەوە داوای لە (خان)ی گەورە دەكرد، ئەگەر لە وڵاتی كرماندا كردی بە حوكمگێڕ دەبێ بیشیكا بە كاربەدەست و نۆكەرێكی خۆیشی.[1]

كاتێك مەغۆلەكان بە سەركردایەتی هۆلاكۆ گەیشتنە خۆرهەڵاتی ئێران و دەستیان بە هێرشە گەورەكەی خۆیان بۆ سەر شارو قەڵاو شورەكانی دەوڵەتی (ئیسماعیلیە) كردو لەوێشەوەبەرەو خۆرئاوا داكشان، (قطب الدین محمد)ی حوكمگێڕی ئەو كاتی (كرمان) چەند هێزێكی سەربازی تایبەتی هەرێمەكەی خۆی كە لە زۆری و هێزوپێزدا خۆیان لە هێزەكانی (بەرد) دەدا، خستە ڕیزی سوپا هێرشبەرەكەی مەغۆل، بە جۆرێك كەتیبەیەكی سەربازی سەربەخۆی پێك هێنابوو و لە ژێر سەركردایەتی (هۆلاكۆ)دا لە دژی عەبباسیەكان و موسڵمانانی (عێراق)و (جزیرە)و (شام) دەجەنگا.[2]

ب ـ (ئەتابەك)ی هەرێمی (فارس):

حوكمگێڕی هەرێمی (فارس)یش شان بە شانی (بوراق حاجیب)ی هەرێمی (كرمان)ی دراوسێی گەردنكەچی حكومەتەكەی بۆ سوڵتانی مەغۆل ڕاگەیاند، بەردەوام نوێنەری خۆی بۆ (قەڕاقورم)ی پایتەختی مەغۆل دەناردن و خزمەتكاری خۆی بۆ دووپات دەكردنەوە، كاتێك (هۆلاكۆ) بەرەو خۆرئاوا هات و گەیشتە وڵاتی (ئەودیو ڕووبار)، ـــ بە پێی ڕیوایەتی جورجانی ـ خودی (ابو بكر)ی ئەتابەكی (فارس) بە پێشوازی (هۆلاكۆ) چوو، ـــ بەڵام بە پێی ڕیوایەتی (رشید الدین) – (سعد)ی كوڕی بۆ ئەوێ چووەو پێشوازی لێ كردووەو ئامادەیی خۆی بۆ هاریكاری ئەوان و بەشداریكردنی هێرشەكانیان دەربڕیووە، ئەمەو دوای ئەمە كەتیبەیەكی سەربازی – كە زۆربەی سەربازەكانی ئەسپ سواری ئەزموندیدە بوون –

---

١ سقوط الدولة العباسية ص: ٣٥٤.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٥٥.

خستە گەڵ هێزەکانی مەغۆل، ئەم کەتیبە سەربازیە هەر لە دژی (ئیسماعیلیە)کانو (عەباسیەکان) نەجەنگا، بەڵکو بەشداری هەموو هێرشە دڕندانەکانی مەغۆلی کرد بۆ سەر تەواوی موسڵمانانی (جزیرەو شامو میسر)، پاش ڕوخانی (بەغدا)و لەنێوچوونی (دەوڵەتی عەباسی)، حوکمگێڕی هەرێمی (فارس) (سەعد)ی کوڕی بۆ لای (هۆلاکۆ)ی سەرکردەی مەغۆل نارد، تا پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەی لێ بکاتو فەرمانەکانی لەمەولای لێ وەربگرێتو لە جیاتی بابیشی دەستی بۆ بە سنگەوە بنێتو خزمەتکاری خۆی بۆ دووپات بکاتەوە.[1]

جـ ـ (بدرالدین لؤلؤ)و (ئەتابەکیەی موسڵ):

(بدرالدین) بە (مەلیك ڕەحیم) ناسناوی دەرکردبوو، یەکێك بوو لە تۆکەرەکانی دەوڵەتی (ئەتابەکیەی موسڵ) دوایە کودەتای بەسەردا کردن، خودی خۆی ماوەی (٥٠) ساڵ حوکمی هەرێمی موسڵی گێڕاوە، پیاوێکی شیعە مەزەب بووەو هەموو ساڵێك قەندیلێکی ئاڵتوونی بە کێشی هەزار دینار بۆ سەر مەشهەدی ئیمامی عەلی دەنارد، (ابن کثیر) دەڵێ: ئەمە بەڵگەیە لەسەری کە شیعەیەکی بێ ئاقڵ بووە،[2] بەڵام بە ڕەگەز (ئەرمەنی) بووە، (ذهبي) دەڵێ: (بدرالدین) لەسەر دابو نەریتی گەلەکەی خۆی ئاهەنگی بۆ جەژنی (شەعانین) دەگێڕاو سفرەیەکی گەورەو بێرەزای دەڕازاندەوەو مەی تێدا دەگێڕدراو گۆرانی بێژ گۆرانیان تێدا دەگوتن، ئەو لەو ڕۆژەدا لە شوێنێکی بەرز پارەو زێڕی بەسەر خەڵکیدا هەڵدەداو ئەوانیش کورد گوتەنی گوێ فرۆچکێنەیان لەسەر دەکرد، ئەو لەبەر ئەوە دروشمی مەسیحیەکانی دەژیاندنەوە لەبەر چاوی موسڵمانان بێزراو بوو، دەربارەی گوتراوە:

یـعـظّـم أعـیـاد الـنـصـاری مـحـبـة ... ویـزعـم ان الله عـیـسـی بـن مـریـم
إذا نــبــهــتــه نــخــوة اریــحــیّــة ... الی الـمـجـد قـالـت أرمـیـنـیـتـه: نـم[3]

بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی بەشداری کردنو هاریکاری کردنی تەتارەکان (ابن کثیر) دەڵێ: کاتێك لە ساڵی ٦٥٦کۆچیدا سوپای مەغۆل لە دەورەی بەغدا دابەزی مۆڵی خوارد، (بدرالدین)یش دەیەویست لە ترسی خۆی خۆیان لەگەڵ بسازێنێ، بۆیە بەش بە حاڵی خۆی کۆمەکی نارد، سەربازەکانی لە شاری بەغدا ببوونە چاوساغی تەتارەکانو شوێنە گرنگەکانی وەکو عەمبارەکانی ئازوخەو مەخزەنەکانی پارەو دیاریە گرانبەهاکانو مەڵبەندە گرنگەکانی

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٥٧.
٢ البدایة والنهایة ٢٠٣/١٣.
٣ سیر اعلام النبلاء ٣٥٧/٢٣.

تریان بۆ دەدۆزینەوە،[1] (ذهبي) سەبارەت بە (بدرالدين) دەڵێ: ئەو خۆی لەگەڵ تەتارەکانو پاشاکانی ئیسلام دەسازاند،[2] بەڵکو هەندێك مێژوونووس دەگێڕنەوە کە: حوکمڕانی موسڵ یەکێ بووە لە هاندەرانی هۆلاکۆ تا خەلیفەی عەبباسی بکوژێ، کاتێکیش (هۆلاکۆ) بەغدای ڕوخاندو وێرانی کردو بەجێی هێشت، (مەلیك ڕەحیم) بە دەستو دیاریەکی نایاب بەوە سەردانی کردو خزمەتکاری خۆی بۆ دووپات کردەوە، (هۆلاکۆ) بە گەرمی پێشوازی لێکرد، پاش چەند ڕۆژێك دوای گەڕانەوەی بۆ (موسڵ) کۆچی دوایی کرد،[3] (ذهبي) دەڵێ: گەوهەرێکی نایابی پێشکەشی (هۆلاکۆ) کرد، داوای لێی کرد بە دەستی خۆی لە گوێی بکات، ئەویش پاڵکەوتو گوارەکەی لەگوێ کرد، هۆلاکۆش بە نۆبەی خۆی لە کاتی گەڕانەوەیدا هەندێك بارگەی بۆ پێچایەوە، ماڵئاوایی لە (هۆلاکۆ) کردو بەرەو (موسڵ) گەڕایەوە، کە گەیشتەوە کۆچی دوایی کرد.[4]

پەیوەندی نێوان (مەلیك ڕەحیم)و بنەماڵەکەی لەگەڵ تەتەرەکان بەرەو پێش چوو، سەری کێشا بۆ خزمایەتیو ژنو ژنخوازی، (مەلیك صالح ئیسماعیل)ی کوڕی کچی (هۆلاکۆ)ی خواست، بەڵام ئەم هاوسەرگیریە بەرکەی نەکردو (مەلیك صالح) دڵی لە کچەکەی هۆلاکۆ پیس کردو تووڕەی کردو تەتەرەکان پەلاماری موسڵمانانیاندا، گەمارۆ (١٠) مانگی تەواوی خایاند، پاش ئەمە گیرا، (مەلیك صالح) بە مەرجی ئەماندران خۆیو شاری بەدەستەوەدا بەڵام غەدریان لێکردو سەرو ماڵی موسڵمانانیشیان حەڵاڵ کرد.[5]

د ـ سوڵتانە سلجوقیەکانی ئاسیای بچووك:

سوڵتانەکانی سەڵتەنەتی سلجوقی ئاسیای بچووکیش چوونە ڕیزی ئەو موسڵمانانەوە کە لە کاتی هێرشکردنە سەر دەوڵەتی عەباسیدا چووبوونە ژێر ئاڵای مەغۆلەکانەوە، بەڵکو ئەم سوڵتانانە لەگەڵ میری باقی ویلایەتەکانی تر لە گوێڕایەڵی کردنو فەرمانبەرداری کردنیان بۆ مەغۆلەکان پێش یەکتریان دەدایەوە، ئەم پێشبڕکە قێزەونە لە نێوان (عزالدين کەیکاوسی دووەم)و (رکن الدين قيلج ئەرسەلانی چوارەم)دا بە تۆخی ڕەنگی دابۆوە، هەردووکلایان بە مەبەستی ڕازی کردنی مەغۆلەکان زۆر ڕێگای نامەردانەو سەرشۆڕانەیان گرتەبەر، بەڵکو

---

١ البداية والنهاية ١٣/١٩٠.

٢ سير اعلام النبلاء ٢٣/٣٥٦.

٣ البداية والنهاية ١٣/٢٠٣، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٥٢.

٤ سير اعلام النبلاء ٢٣/٣٥٧.

٥ المصدر نفسه ٢٣/٣٥٣.

(ركن الدين) یەكێك بوو لەو حوكمڕانانەی كە بە مەبەستی دەربڕینی هەستو نەستی دڵسۆزیو وەفاداریو خزمەتكاری بۆ (خانی گەورە) سەردانی مەنغۆلیای كردبوو چووبووە خزمەت (كیوك خان)،[١] كاتێكیش هۆلاكۆ لە ڕێگەی پەلامارە بەربڵاوەكەی بۆ سەر فیرقەی ئیسماعیلیەو دەوڵەتی عەباسیو خاكی شامو میسر گەیشتە وڵاتی (ئەودیو ڕوبار) هەردووك نۆكەری مونافیس (عزالدین)و (ركن الدین) خۆیان گەیاندە خزمەتیو ئامادەییو وەفاداری خۆیان پێشكەش كرد، هەر یەكێك لەم دووانە دەیەویست زیاتر لەوەی تریان خۆ ڕەپێش بكاتو بە مەبەستی گەیشتن بە ڕەزامەندی سەركردەی مەغۆل نۆكەرایەتی باشتر بنوێنێ.

هـ ـ خەڵكانی تریش:

جگە لەم میرو سوڵتانانەی ناومان هێنان خەڵكانێكی تریش تاك تاكو تاقم تاقم لە لایەن مەغۆلەكانەوەو جێگرەكانیان بەسەر هەرێمەكانی توركستانو ئێرانو ئەودیو ڕووبارەوە چەكداركرانو لە هێرشی مەغۆلەكان بۆ سەر موسڵمانانی عێراقو جزیرەو شامو فەلەستیندا بەشداری بەرچاویان هەبوو، (مسعود یلتواش)ی حوكمڕانی هەردووك هەرێمی (توركستان)و (ئەودیو ڕووبار)و (ئەرغون ئاغا)ی حوكمڕانی (ئێران) سەربازگەلێكی موسڵمانیان سازكردنو لەگەڵ هێزە پەلامارەدەرەكەی (هۆلاكۆخان)یان خستن، لەسەر ئەم بنەمایە دەبینین موسڵمانانێكی یەكجار زۆر پەیوەندیان بە مەغۆلەكانەوە كردووە (كدیوقانویان)و (بایجونویان) دوو سەركردەی سوپای مەغۆل بوونو موسڵمانانێكی زۆریان لەگەڵ كەوتن، (نصیرالدین توسی)و (علاءالدین عطا ملك الجویني)ی مێژوونووسو (حسان الدین)ی ئەستێرەناس لیستەی ئەو ژمارە زۆرە موسڵمانانەیان گرتۆتەوە، كە هاتوونەتە ژێر فەرماندەیی مەغۆلو هێرشیان كردۆتە سەر دەوڵەتی عەباسیو وڵاتانی ئیسلامیو باشووری خۆرئاوای ئاسیا، ئەم ڕەشە خەڵكە موڵسمانەش بەشداری كاریگەریان هەبوو لەسەر لەنێوبردنی دەوڵەتی عەباسیو بەهێزكردنی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل.[٢]

## ١٣ـ دوورخستنەوەی كەسایەتیە هەڵكەوتووەكان:

(المستنصر بالله) یەكێك بوو لەو خەلیفە عەباسیانەی كە بەردەوام هەوڵیان دەدا خوێنی گەرم بەبەر لەشی خیلافەتدا بكەنەوەو هێزو سامی لە دەست چووی بۆ بگێڕنەوە، ئەو – لە سەردەمی خۆیدا – گەشەی بە سوپاداو ژمارەی گەیاندە (١٠٠) هەزار سەرباز،[٣] دارای

---

١ سقوط الدولة العباسية ص: ٣٦٧.

٢ سقوط الدولة العباسية ص: ٣٦٨ـ٣٦٩.

٣ ذيل المرآة الزمان لليونيني ص: ٢٥٤، بغداد مدينة السلام ص: ١٣٦.

هیمەتێکی بەرزو ئازایەتێکی زۆرو نەفسێکی گەورە بوو و توانای هەڵێنانی هەنگاوی گەورەی هەبوو، تەتارەکان لە سەردەمی ئەودا چەند هێرشێکیان هێنان بەلآم مەردانە بەرەنگاریان بۆوەو دوای تۆڵە سەندنەوە بەسەر پاشوانیاندا تێکی شکاندنەوە،[1] (الخفاجی) برای خەلیفە (المستنصر) بوو، لە کەسایەتیدا حیسابی (مستنصر)ی بۆ دەکراو پێی دەچوو دوای مردنی (خەلیفە) جێگەی بگرێتەوەو شوێن پێی پەیڕەو و بڕیارەکانی ئەو بکەوێ، بەلآم پیاوانی دەوڵەت – واتە وەزیرو فەرماندە سەربازیەکان – بڕیاریاندا پیاوێك بۆ خیلافەت هەڵبژێرن کە هیچ کام لەم سیفەتانەی لە (الخفاجي)دا هەبوون لە ئەودا بوونیان نەبێ، چونکە (الخفاجي) لاوێکی کارامەو هەڵکەوتووو چالاكو زیرەكو بیرتیژ بوو و هەستی بەرپرسیارێتی تێدا بەرجەستە ببوو، وێڕای هەموو ئەمانە (الخفاجي) لە سیفەتی مەردایەتیو ئازایەتیدا پێش (المستنصر)ی براشی دابۆوە، ئەو دەیگوت: (ئەگەر خودا کاروباری ئوممەت– ی ئیسلام–م بخاتە بەردەست شەرت بێ بە شەرتی خودا سوپاکەم لە ڕووباری (جەیحون) بپەڕێنمەوەو خاکی ئیسلام لە تەتارەکان پاك بکەمەوەو کوشتنو گرتنو بردنیان بەسەر بێنمو لەنێویان بەرم).

ئەمەو دارو دەستەی دەوڵەت بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە) کۆبوونەوە، (دەواتدار)و (شەرابی) کە ئەو کاتە لە کۆبوونەوەکەدا نەبوونو تەواوی کاربەدەستان دەترسان ئەگەر (الخفاجي) هەڵبژێرن، جڵەوی هەموو کاروبارەکان بخاتە دەستی خۆیەوەو چ حیسابێك بۆ ئەوان نەکات، لە لایەکی تریشەوە ئەوان چاك دەیانزانی (المستعصم) پیاوێکی نەرمو نیانو لەسەرخۆیەو گەردنکەچی بڕیارەکانی ئەوان دەبێت، بۆیە هەموویان ڕێکەوتن لەسەر ئەوە پۆستی خیلافەت لە دوای (المستنصر) بدرێتە دەست (المستعصم باالله)ی کوڕی، ئەو پۆستەکەی وەرگرتو ئەوانیش تەگبیرو ڕایان کەوتە دەست،[2] کاروباری دەوڵەتیان خستە دەست کەسی ناشیاو.

### ١٤ـ کێبڕکێی عەلەویەکان:

دەوڵەتی عەبباسی بەهۆی لە فەرمان دەرچوونی (محمدی کوڕی عبدالله)ی ناسراو بە (النفس الزکیة= نەفس پاك) لە (مەدینە) درزی تێکەوت، خەڵکێکی زۆری هەرێمی (خۆراسان) چاوەڕێی ڕاپەڕینی ئەویان دەکرد، بەلآم (ابو جعفری منصور) لێی بە ئاگا هاتو ئازایانە

---

١ بغداد مدینة السلام ص: ١٣٦.

٢ بغداد مدینة السلام ص: ١٣٦.

عەزمی جەزم کردو کۆتایی بە (محمد)و (ابراهیم)ی براشی هێنا کە ئەویش لە (بصرة) شۆڕشی کردبوو، خۆ ئەگەر (منصور) ئەم کارەی نەکردبایە خەریك بوو چوار دیواری دەوڵەتی عەباسی بلەرزێن، لە ئەنجامی ئەمەدا، عەباسیەکان لە بەرامبەر ئامۆزاکانیان — نەوەکانی علی — کەوتنە بەدگومانیەوە، تەنگیان پێ هەڵچنین‌و چاودێری توندیان خستە سەر کەسە دیارو ناسراوەکانیان، هێزە سەربازەکانیان لە گەڕان‌و ڕاوەدوونانیاندا شەکەت بوون، توندوتیژی پەرەی سەند، عەلەویەکان نەیاندەزانی چۆن لەو زیندان‌و تەنگژەیە دەباز بن، وەکو باڵندەی نێو قەفەسیان لێ هاتبوو، لە ساڵی ١٦٩کۆچیداو لە سەردەمی خەلیفە (الهادی)دا (حوسێنی کوڕی عەلی) لە شاری (مەککە)دا شۆڕشی کرد، بەڵام لێنەگەڕان بە ئامانج بگات‌و لە (فەخ)ی نزیك (مەککە) کوشتیان، (ادریس ی کوڕی عبدالله)و (یەحیا)ی برای لەم کارەساتەدا دەربازیان بوو، (ادریس) بە ئاراستەی خۆرئاوا بەڕێکەوت‌و بە نێو خاکی (میسر)و باکووری ئەفریقیادا تێپەڕی‌و لە کۆتاییدا لەوپەڕی وڵاتی (مەغریب) گیرسایەوە، تیرەو تایەفەکانی هۆزی (ئەمازیغ) باوەشی سۆزو میهرەبانیان بۆ کردەوەو بەیعەتی (خیلافەت)یان پێدا، ئەمەو دەوڵەتی (ئەداریسە)ی لە بەشێکی ئەو وڵاتەدا دامەزراند.

(یەحیا)ش بە ئاراستەی خۆرهەڵات بەڕێکەوت‌و لە دەوروبەری (دلێم) گیرسایەوە، بەڵام بە هۆی نزیك بوونی لە مەڵبەندی (خیلافەت) کارەکەی سەری نەگرت.

کاتێك باس‌و خواسی ئەم دوو برایە بڵاوبۆوە کاربەدەستانێکی سەر بە بنەماڵەی عەباسی هاوسۆزی‌و پشتیوانی خۆیان بۆ عەلەویەکان دەرخست، ئەمەو (واضح)ی نۆکەری بنەماڵەی عەبباسی لە میسر خۆی گەیاندە (ادریس)و ڕێگای دەرچوونی بە خاکی ئەو وڵاتەدا بۆ خۆشکردو بەرەو (مەغریب)ی بەڕێکرد، (جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی)یش بە فریای (یەحیا) کەوت‌و لە چنگی (رشید)ی دەرباز کرد، ئەمە وای لە (رشید) کرد تەنگ بە هەموو ئەو کەسانە هەڵبچنێ کە بە هاوسۆزی بۆ عەلەویەکان تۆمەتبار دەکرێن، (موسای کازمی کوڕی جەعفەری صادق)ی بۆ بەغدا پەلکێش کردو خستیە ژێر چاودێری خۆیەوە، بەڵێ لایەکی جەستەی دەوڵەتی عەبباسی برینێکی قووڵی تێکەوت، گەلی (بەربەر)ی (مەغریب) جورئەتیان نواندو لە ژێر فەرمانی دەوڵەتی عەبباسی دەرچوون‌و بە باوەڕی خۆیان ئەوان لە نێو هەموو گەلاندا شانسێکی باشیان دەستکەوتووەو بە یەکێك لە ڕۆڵەکانی (ال بیت)ی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شادبوون‌و کردوویانە بە خەلیفەی خۆیان.

(رشید) وەکو ئەو کەسەی لێهاتبوو کە ئاگر لە بەشێکی ماڵەکەی بەربوو، ئەویش دەیەویست فوی لێ بکاتو بە حیسابی خۆی بیکوژێنێتەوە، بەڵام هەر ئەوەندەی زانی ئاگر هەموو ماڵەکەی گرتەوە، ئەو هەستا بە ناچاری لە دژی دەوڵەتی (ئەداریسە) دەوڵەتی (ئەغالیبە)ی لە (ئەفریقیا) دامەزراندو (قەیرەوان)یشی بۆ کردە پایتەخت، (رشید) ئەم کارەی کرد–و ئامانجیشی نەپێکا–.

ئینجا سەردەمی (مأمون) هاتە پێشەوە، تەماشای کرد مەترسی عەلەویەکان دەورەی دەوڵەتی عەباسی تەنیووە، زۆربەی خەڵکیو زانایانی ئاینی بە لای عەلەویەکاندا دەشکێنەوەو بەهۆی ئەو گەندەڵیەی تێی کەوتووە ڕقیان لە دەوڵەت دەبێتەوە، (مأمون) بیری کردەوە لەوانەیە بە خۆ خۆشەویست کردنو خۆ نزیك کردنەوە لێیان ساردیان بکاتەوەو لە هێزو پێزو گەرمو گوڕیان کەم بکاتەوە، زۆربەی شیعەکانی ئەو کات (عەلی ڕەزا)یان بە ئیمامی خۆیان دادەنا، لەبەر ئەمە (عەلی ڕەزا)ی دیاری کردو بەڵێنی ویلایەتی عەهدی پێدا، وا گومان دەبرێ کە ئەو ئەم کارەی بە مەبەستی ڕازی کردنی (فەزڵی کوڕی سەهل)ی وەزیری دەستەڕاستیو تەگبیرکەری کاروباری دەوڵەتەکەیو دوورخستنەوەی (ئەمین)ی برای لە پۆستی خیلافەت ئەنجامدابێ، بەڵام دەرەنجامی ئەم کارە بە سەریدا شکایەوە، ئەو لە لایەکەوە عەلەویەکانی ڕازی کردن بەڵام لە لایەکی ترەوە عەباسیەکانو ڕۆڵەکانی بانگەشەی خیلافەتی عەباسی لەخۆ تووڕەکردن، ئەوان لە (بەغدا) شۆڕشیان لێکردو لە پۆستی خیلافەت دایانبەزاند، (ابراهیم ی کوڕی مەهدی)ی مامیان لە جێگە دانا، بۆ چاکردنەوەی بارودۆخەکەو پینەکردنەوەی ئەم کونە گەورەیە پیلانی لە دژی (فەزڵی کوڕی سەهل) گێڕاو چەند کەسێکی بە شمشێرەوە ناردنە سەرو لە حەمامدا کوشتیان، دوابەدوای کوژرانی (فەزڵ) (عەلیڕەزا)ش وەفاتی کرد خەڵکانێك دەڵێن (مأمون) ژەهرخواردی کردووە بەڵام بەڵگەیان بێهێزە، ئەمەو دوا بە دوای مردنی ئەم دووانە کاروبارەکان گەڕانەوە سەر دۆخی جارانیان، خەڵکی بەغدا کۆڵیان لە (ابراهیم)داو بۆ لای (مأمون) گەڕانەوە، پاش ئەمە (مأمون) لەسەر دۆستایەتی کردنی عەلەویەکان بەردەوام بوو، ئەگەر زانیبای نیازی دەرچوونو شۆڕشیشیان هەیە، وێنەی (رشید)ی باوکی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن، ئەویش دوای شۆڕشی عەلەویەکانی (یەمەن) ڕێك لاسای باوکی کردەوەو دەوڵەتی (زیادیة)ی بۆ دامەزراندن کە کتو مت لە دەوڵەتی (ئەغالیبە)ی ئەفریقیا (تونس) دەچوو، چونکە هەردووك دەوڵەتەکە لە دامەزراندنیاندا یەك ئامانجیان هەبوو.[1]

---

١ الدولة العباسية ص: ٤٨٥.

ڕێوشوێنی دەستبەسەری (الحجر)یان بەرامبەر ئیمامەکانی شیعەدا گرتە بەرو (مأمون) فەرمانی پێکردن یان دەبێ لە (بەغدا) لە ژێر چاودێری خۆیدا نیشتەجێ بن، یان دەبێ بچنە (سامەڕا)، بێگومان خەلیفەکانی عەباسی هەڵسوکەوتیان لە بەرامبەر عەلەویەکاندا وەکو یەك نەبوو.

(قرامطة) بە ناوی خۆشەویستی (ئالوبەیت) هاتنە پێشەوەو چواردیواری دەوڵەتی عەباسی یان ڕاتەکاند، (فاطمیة)کان ڕاپەڕینو دەستیان بەسەر (ئەفریقیاو جەزائیرو چەند ناوچەیەکی باکووری ئەفریقیا)دا گرتو دەستی دەسەلاتی خۆیان بەسەر (میسرو سوریاو حیجازو یەمەنو قەراغە ئاوەکانی فوڕات)دا کێشا، هێندەی نەمابوو ئاگری شۆڕشەکەیان دەمو چاوی دەوڵەتی عەباسی داپلۆخێنێ، (بنی بویە)ی شیعە لەنێوەڕاستی سەدەی چوارەمدا هاتنو دەستیان بەسەر (بەغدا)دا گرتو هێندەی تر بارودۆخەکەیان شێواند، شیعەکانیان ئازاد کردن، بە ئارەزووی خۆیان چیان پێ خۆش بێ لە دابو نەریتە داهێنراوەکانیان ئەنجامی بدەن، ئەوان لە ڕۆژی عاشورادا ژنو پیاو و گەورەو بچووکیان دەهاتنە دەرەوەو بە دەستەجەمعی شینو بابۆڕۆو سینگکوتانو گریانیان — بە حیسابی خۆیان — بۆ (حوسێنی کوڕی علی) دەکردو خەمو پەژارەی خۆیان بەرپا دەکرد، کاربەوە گەیشتبوو خەڵك لە ڕێی شیعەگەریەوە خۆیان لە سوڵتان نزیك دەکردەوە، لەسەرەتای سەدەی شەشەمدا ئاشووبی (باطنیة) لە (فارسو شام) سەری هەڵداو خەڵکیان شپرزە کردو کاروباری دەوڵەتانیشیان تێکدانو توانیان دەست بۆ سەر چەند خەلیفەیەکی عەباسی درێژ بکەنو بیانکوژن، ئەمەو ئەم کێشمەکێشمە سیاسیە لە وڵاتی (میسر) درێژەی کێشا تا دەوڵەتی (فاطمیة) بە یەکجاری لەسەر دەستی (نورالدین محمود زنکی)و لە ڕێی یەکێك لە سەرکردە پاڵەوانەکانی — واتە (صلاح الدین ی ئەیوبی) ڕوخێنرا.

هەروەها کێشمەکێشمی نێوان عەلەویەکانو عەباسیەکان لە سەردەمی یەکەمین خەلیفەی عەباسیەوە تا دواهەمین خەلیفە درێژەی کێشا، ئەمە بوو بە هۆیەکی سەرەکی لاوازبوونی دەوڵەتی عەباسیو سست بوونی دەمارگیری هەواداریبۆ ئەو دەوڵەتەو،[1] ئینجا لەنێوچوونی.

### ١٥ـ ڕابواردنو خۆشگوزەرانیو کاریگەری لەسەر لەنێوچوونی دەوڵەتی عەباسی:

باسی خۆشگوزەرانیو خۆشگوزەرانان چەند جارێك لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ)و بەرهەمی زانایانی پێشینماندا هاتووە، ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا

---

١ الدولة العباسية للخضري ص: ٤٨٨.

هاتووە بەم شێوەیەیە، خودای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾ (الاسراء: ١٦)، (واتە: هەر کات بمانەوێ ئاوەدانیەك لەنێوبەرین، فەرمان بە خۆشگوزەرانەکانیان دەکەین پێڕەوی دەستووری خودا بکەن، بەڵام لە پێڕەوەکەلایاندا، جا بڕیاری لەنێوبردنی خودایان بەسەردا واجب بوو، ئێمە تێکوپێکمان شکاندن).

خۆشگوزەرانان لەنێو هەموو نەتەوەیەکدا بریتین لە چینی باریێ سەرەوەو دەستیان لە جڵەوی دەسەلاتو سامان گیربووەو خزمەتکارو کارەکەر بە دەوریاندا دێنو دەچنو خزمەتیان دەکەن، بۆ خۆیان لە پشوودانو نانخۆری بەر سێبەرنو بەوپەڕی لوتبەرزیو دەعیەو سەرووەری یەوە دەژینو هەوای کەشو فش لە بەدەنیان دەگەڕێتو لە جڵێتاوی فیسقو فەسادو بێ شەرمیدا بۆگەن دەبنو بە ڕەوشتە بەرزەکانو شتە پیرۆزەکان رادەبوێرنو زمانیان لە باسو خواسی شەرەفو ناموسی خەڵك دەگێڕنو داوێن پیسیو دزیو گزی لەنێو ئوممەتدا ئەنجام دەدەنو پەرەی پێ دەدەنو خوخدە جوانو پەسندەکان هەرزان دەکەن — کە بێگومان هیچ گەلو نەتەوەیەك بەبێ بوونیان ناژیەتو ڕاوەستاو نابێ —، ئینجا ئوممەتیش بەرهەڵدایی تێدەکەوێتو بە یەکجاری لێك هەڵدەوەشێتو ڕەگەزەکانی هێزو پێزو هۆکارەکانی مانەوەو بەرقەراربوونی لەدەست دەچن، پاشان لەنێو دەچێتو تۆماری دەپێچرێتەوە، ئەم ئایەتە سوننەتی خودا دەرهەق بە لەنێوچوونی هەر ئوممەتێك دەخاتەڕوو، هەر کاتێك خودا بڕیاری لەنێووچوونی هەر ئاوەدانیەکی دابێ، لەبەر ئەوە بووە کە خودی خۆی دەستی بە هۆکارەکانی لەنێوچوون گرتووەو فیسقو فەسادی تێدا بەگشتی بڵاوبۆتەوەو خۆی بە قەبەیی نیشانداوە، ئینجا خوداش بەپێی سوننەتی سابتی خۆی سزای داڕوخانو لەنێوچوونی بەسەردا نازڵ کردوون، بێگومان ئەو گەلە بۆ خۆی بەرپرسیاری سزاکەیە،[١] چونکە ڕێگەی بە خۆشگوزەرانەکان نەگرتو گۆڕانکاری بەسەر ئەو سیستەمەدا نەهێنا کە ڕێگا بە دروست بوونی چینی بۆرژواو خۆشگوزەران دەدات، پەروەردگاری باڵادەست چەند دەستوورێکی بۆ ژیانی مرۆڤایەتی داناوە کە کەس ناتوانێ بیانبەزێنێو چەند سوننەتێکیشی داناوە کە هەرگیز گۆڕانکاریان بەسەردا نایات، هەر کاتێکیش هۆکارەکان دێنە ئاراوە دەرەنجامەکانیش زۆر دەبن،[٢] ئەم ئایەتە دەقێکی ڕاشکاوە

١ في ظلال القرآن، سيد قطب ٢٢١٧/٤.
٢ المصدر نفسه ٢٢١٨/٤.

سەبارەت بە لەنێوچوونی گەلان‌و پوکانەوەیان‌و لێکهەڵوەشانی هێزو پێزیان بەهۆی ئەو هەواو هەوەس‌و ئارەزوو پەرستیەی پێشدا حوکمڕان‌و چینی سەرەوەیان دەگرێتەوەو پاشانیش هەموو ئوممەت دەتەنێتەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەکا کە: خۆشگوزەرانی سەردەکێشێ بۆ لادان، لادانیش سەردەکێشێ بۆ لەنێوچوون، جا ئەوانەی کار بۆ پایەداربوونی ئوممەت دەکەن، پێشەکی پێویستە خۆیان لەسەر هێزی دەروون‌و ئیرادەی بەهێزو نیازی ڕاست‌و ڕەوان‌و دڵسۆزی پاك‌و پوخت ڕابێنن، بێگومان بەم شێوە سەرکەوتن‌و پشتگیری لە لایەن پەروەردگاری جیهانیان مسۆگەر دەبێت.[١]

خۆشگوزەرانی کاریگەری خراپی هەیە لەسەر دەوڵەتان‌و گەلان، بەڵکو (کوینو)یەکەو هێزوپێزو وزەو تواناکان دەڕوخێنێ، چونکە خۆشگوزەرانی: مرۆڤ تەفرە دەدا کە تا هەمیشە لەسەر زەوی دەژیات‌و بۆیە پێویستە لەسەری لە هەواو هەوەس‌و سەروەت‌و ساماندا ڕۆچێت‌و خۆی بە هەموو شتێکی ئەم دنیایەوە –ئەگەر کەم بایەخیش بن– خەریك بکات‌و بە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری پۆستی دەسەڵات‌و پلەو پایەو سەروەت‌و سامانەکەی نەبێت‌و لە لایەکی تریشەوە: واتا بەرزەکانی ژیانی لەبیردەباتەوەو لە گیانفیدایی‌و جیهادکردن لەڕێی خودای دووردەخاتەوەو بە بیانووی خۆ ماندوو نەکردن لێ ناگەڕێ کارە گرنگ‌و مەزنەکان ئەنجام بدات، ڕێی ئەنجامدانی هەموو ئەو کارە ئاسانانەی بۆ خۆش دەکات ئەگەرچی بە ئەنجامی نەفس نزمی‌و پەست‌و زەبوونیشی بگەیەنێت.[٢]

بێگومان خۆشگوزەرانی‌و ڕابواردنی نابەهەق هێندەی دەوڵەتی عەباسی کزو زەبوون کرد تا ئەو پلەوپایە نزمەی کە لە بەرامبەر تەتارەکاندا بە ئەنجامی بەزین‌و ڕوخانی گەیاند، ڕوخان‌و هەرەسێك کە هیچ کەڕەتا ئەم جۆرە ڕوخانە بەسەر دەوڵەتی ئیسلامیدا نەهاتبێ، تەماشاکەو چیان دەکرد، ئەوجا دەزانی بۆچی زەبوون بوون‌و داڕوخان:

(مأمون ی کوڕی هارونە ڕەشید) دواهەمین خەلیفەی بەهێزی عەباسیەکان بووە، گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ (بوران)ی کچی (حەسەنی کوڕی سەهل)ی وەزیری ئەنجامدا، ڕەنگە بڵێی: جا چ بووە؟ ئاهەنگەکە لەماڵی (حسن ی کوڕی سهل ی سرخسی)و لە (فم الصلح)ی نزیك ششاری (واسط) گێڕدرا، (فم الصلح) ناوی ڕووبارێکی گەورەیەو کەوتۆتە سەروی (واسط)ەوەو ژمارەیەك گوندی لە دەورە بوون، تەلاری (حسن ی کوڕی سهل)ی

---

١ مجلة لواء الاسلام، العدد الخامس ص: ٢٥٩، أبو زهرة.
٢ الترف واثره في الدعاة والمسلمين ص: ٢٢، محمد موسى الشريف.

وەزیری (مأمون)یش لەسەر رووبارەکە بوو، (مأمون)یش هەر لەوێو لەبەر رێزی باوکی بوکەکەی گواستەوە، (بوك) ناوی (خدیجة) بووو بە (بوران) ناسرابوو، ئاهەنگەکە بە شێوازێك بەرێوە چوو کە لە هیچ سەردەمێك لە سەردەمەکانی (جاهلی)و (ئیسلام)یشدا ئاهەنگی ئاوا نەگێڕدرابێ، (مأمون)و دارودەستەکەیو کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەتەکەیو تەواوی پیاو ماقوڵان هاتبوونە (فم الصلح)، وەزیری خەزور – لە خۆشیان – بەندەقی میسکی بەسەر سەری جەماوەردا بڵاوکردنەوە، هەر یەکێك لەم بەندەقانە پارچە نووسراوێکی تێدابووو ناوی خانوبەرەیان پارچە زەوی یان ناوی کەنیزەك یان ناوی کۆیلەیەك یان ناوی ئەسپێك یان ناوی هەر شتێکی تری تێدا بوو، هەر کەسێك بەری کەوتبایە دەیبردە لای وەکیلی وەزیرو بەپێی شانسی خۆی ناوی چی تێدا بوایە ئەو شتەی دەدرایە، پاش ئەمەش تورەکە دیناروو پارچە میسكو پارچە عەنبەری بەسەر خەڵکدا هەڵدان، وەزیر مەسرەفی (مأمون)و داروەستەو سەرکردەو سەربازەکانی تەواوی خەڵکانی هاوەڵی کێشا، کە بێگومان هێندە زۆر بوون لە ژمار نەدەهاتن، مەیتەرو وەزیرو بەلەمەوانو تەواوی خەڵکی گەڵی لەم مەسرەفە بێ بەش نەکران، کەسێکی نێو سەربازگەی (مأمون) سادەترین پێویستی نە بۆ خۆی نە بۆ وڵاخەکەی نەدەکڕی، هەمووی لەسەر حیسابی خەزورو وەزیری خەلیفە بوو، (طبري) دەڵێ: (مأمون) ماوەی (١٩) رۆژ لە لای (حسن) میوان بوو، هەموو رۆژێك هەرچی پێویستیەکی هەبوایە بۆ خۆیو خەڵکانی گەڵی بۆی دابین دەکردن، بڕی خەرجیان (٥٠) هەزار هەزار درهەم بوو،[١] ئەم سەردانەی (مأمون) بۆ لای (حسن)ی کوڕی (سهل) لە (فم الصلح) لە ٨ی رەمەزانی ٢١٠ کۆچیدا بوو، (حسن) فەرشێکی لە زێڕ چنراوی بۆ بەرپێی (مأمون) راخست، کاتێك لەسەری راوەستا مەرجانو مرواری زۆری بەسەردا هەڵدان،[٢] (مأمون) لە شەوی سێهەمی گەشتەکەیدا شەوی زاوایەتی لەگەڵ (بوران)ی تازە بوکدا بەسەر برد، کاتێك بە تەنیشت یەکەوە دانیشتن، نەنکی (بوران) پڕی سینیە زێڕێکی مرواری بەسەردا هەڵدان، (مأمون) بە (بوران)ی گوت هەڵیان بگرەوە، پرسیاری لێکرد چەند دانە مرواری بوون؟ (بوران) گوتی: (١٠٠٠) دەنك بوون، ئینجا نەنکی بە خڕی خستنیە کۆشی (بوران)ەوەو گوتی: دیاریە بۆ تۆ، چی کەشت پێویستە پێم بڵێ، ئینجا نەنکی بە بورانی گوت: قسە لەگەڵ – مێردە – گەورەکەت بکە، چونکە پێی گوتی قسە بکە، (بوران)یش

---

١ واتە ٥٠ ملیۆن درهەم زیو، کە بۆ ئەو کاتە پارەیەکی خەیاڵی بوو.

٢ تاريخ الطبري، نقلا عن الترف د. محمد موسى الشريف ص: ٣٤.

داوای لە (مأمون) کرد: لە (ابراهیم ی کوڕی مهدی) مامی ببورێو ڕێگەش بە (ست زوبێدە)ی دایکی (جعفر) بدا بۆ (حج) بچێ، (مأمون) لە وەڵامدا گوتی: باشە، دایکی (جعفر)یش بەدلەیەکی لە زێڕ چنراوی بەبەر (بوران)دا کرد، لەم شەوەدا مۆمێکی عەنبەریان لەنێو قەپاغێکی زێڕیندا هەڵیساندبوو کە کێشەکەی (٤٠) مەن بوو، (مأمون) ڕەخنەی لێگرتن‌و گوتی ئەمە زێدەڕۆیی‌و ئیسرافە،[1] ئەی (سبحان الله) ئەمەی تا ئێستا کراوە ئیسراف نەبووە![2] کاتێك سەروبەندی ڕۆیشتنی هاتە پێشەوە زەوی‌و زاری (قم الصلح)ی لەسەر (حسن) تاپۆ کرد، ئینجا فەرمانی پێکرد (١٠) هەزار درهەم ببەخشێ،[3] (حسن)یش دانیشت‌و پارەو سامانی بەسەر سەرکردەو سەربازو خەڵکی هاوڕێی خەلیفەدا دابەشکرد، (حسن) بەرامبەر بە شاعیران‌و خەڵکانی تریش بەخشندە بووە، شاعیرێك بەم شێوەیە بەسەر (حسن)یدا هەڵگوتووە:

تقوم خليلتي لما رأتني   أشد مطيتي من بعد حل
أبعد الفضل ترتحل المطايا   فقلت نعم الى الحسن بن سهل

هەموو ژیانیان خۆشگوزەرانی بوو، دەست‌و دەمو ددانیان لە خاك گیرکردبوو، دڵیان بە زرق‌و بەرقەکانی دنیا خۆش کردبوو، شولیان لە دنیاداری‌و خۆش ویستنی پارەو سامان‌و ڕابواردنی بێ واتا هەڵکێشابوو، کۆشك‌و باڵەخانەی گەورەو فراوانیان لە بەغدا دروستکردبوون،[4] هەموو هونەرێکی جوانکاری‌و نەخش‌و نیگاریان لە دروستکردنی کۆشك‌و تەلارو فەرش‌و پەردەو تەواوی کەلوپەلی چێشتخانە لە قاپ‌و قاچاغ‌و مەنجەڵ‌و کەوچك‌و وێنە هەڵواسراوو دانراوەکانی ماڵەکانیان بەکاردێنا، هەروەها هونەری جۆراوجۆریان لە سازکردنی خواردن‌و خواردنەوەدا بەکاردێنا، گرنگیان بە پۆشین‌و لەبەرکردنی زێڕو زەبەری زۆرو جلوبەرگی بریقەدارو بۆنی خۆش دەداو، مۆدیلە باوەکانی ئەو سەردەمەیان بەکاردێنان، لە بەرگ‌و پۆشاکدا کاریگەری فارسەکانیان لەسەر بوو، بایەخی زۆریان بە ئامرازەکانی یاری‌و ڕابواردن دەدا وەکو: پێشبڕکێی ئەسپسواری، کۆتربازی‌و یاری دار هەلوکێن‌و شترنج‌و تاوڵەو ڕاوەبازو ڕاوە تاژی‌و ڕاوە سەگ، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەو خۆشگوزەرانیی‌و ڕابواردن‌و کەش‌و فشیەی خەلیفەکانی عەباسی‌و بنەماڵەکەیان‌و وەزیرو گزیرەکانیان‌و

---

١ الترف، محمد موسی ص: ٣٥.

٢ الترف، محمد موسی ص: ٣٥.

٣ الترف، محمد موسی ص: ٣٥.

٤ تاریخ الطبري، نقلا عن الترف ص: ٣٧.

سەرکردەو بازرگانەکانیان و هەندێك لە شاعیران و زانایان و گۆرانی بێژەکانیان تێی کەوتبوون، بەڵام گەل و ڕەشەخەڵك ڕەنجکێش و ماندو و مجرۆو برسی و داماوبوو و ژیانێکی کولەمەرگی بەسەردەبرد، ئەمە لە کاتێکدا خەزێنەکانی دەوڵەت زێڕو زەبەرو پارەو سامان و ئازووخەیان لەسەرەوە دەڕژاو، بەردەوامیش لەسەر تا سەرو کون و قوژبنەکانی مەملەکەتڕا بۆی دەهات و بەسەری دادەکرا، ڕیوایەتگەلێکی زۆرو زەوەند سەبارەت بەم بابەتە گێڕدراونەوەو دەری دەخەن: کە دەوڵەت چەند دەوڵەمەند بووەو خەلیفەو کاربەدەستەکانیش چەند خۆشگوزەران بوون و چەندەش سەروەت و سامان و زێڕو پارە بەسەر کەنیزەك و گۆرانیبێژان و ئاهەنگەکانی سەماو چڵپاوخۆران و چاپلوسانی کۆشکی خیلافەتدا دابەشکراوە، دەری دەخەن کە خەلیفەکان و وەزیرەکان و والی و سەرکردەکان لە بەرامبەر شایەران و چاوەشان و خەڵکانی کەسانی تری پەست و نزم چەندە سەخی و دڵاوا بوون، لەمانەشیان تێپەڕاندبوو و لە فارسەکانەوە فێری چەند داب و نەریتێکی تریش ببوون، وەکو: کلتوری سفرە ڕازاندنەوەو ڕابواردنی شەوانەو مەی خواردنەوە، هەموو ئەو خۆشگوزەرانیی و کەش و فشیەی عەباسیەکان سەری کێشا بۆ بەرپابوونی چەند شۆڕش و هەڵگەڕانەوەیەك لەنێو جەرگەی خیلافەتدا، هەرچەندە ئەمەی گوتمان سیفەتی هەموو خەلیفەکان نەبوو، بەڵام زۆرینەیان بەم شێوەیە بوون،[1] کەواتە ڕووخان و بەزینی دەوڵەتی عەباسی لە بەرامبەر هێرشی مەغۆلەکاندا — ڕووداوێکی ئاسایی و سروشتی بوو، ئێستا تەماشای ئەم دیمەنە بکە کە (ابن کثیر) بۆمان وێنا دەکات:

لە کاتێکدا تەتارەکان گەمارۆی کۆشکی خیلافەتیان دابوو لە هەموو لایەکەوە تیربارانیان دەکردن، یەکێك لە کەنیزەکەکانی خەلیفە کە ناوی (عەرەفە) بوو، لەبەردەمی خەلیفەدا گەمەو سەمای دەکردو خەلیفەی بەپێکەنین دێنا، تیرێك لە کونی پەنجەرەیەکدا هات و (عەرەفە)ی پێکاو کوشتی، (خەلیفە) پەشۆکاو بە خراپی ڕەنگی تێك چڕژا، کە تەماشای تێرەکەی کرد لەسەری نووسرابوو: ئەگەر خوا بیەوێت قەزاو قەدەری خۆی جێبەجێ دەکات، هۆشی خاوەن عەقڵەکان دەباتەوە،[2] لەو کاتەدا (خەلیفە) فەرمانیکرد زیاتر کون و کەلێنەکان بگرن و دیواری بەرزتر لە دەورەی کۆشکی خیلافەتدا هەڵبچنن، بەڵام موسیبەتەکە زۆر لەمە گەورەتر بوو کە بەم شێوەیە بگێڕدرێتەوە.[3]

---

١ الترف ص: ٣٧_٣٩.
٢ البداية والنهاية ١٣/١٩٠، كيف دخل التتار ص: ٤٢.
٣ كيف دخل التتار ص: ٤٢.

سەردەمێك لە مێژووی ئیسلامدا گوزەری کرد ژیان هەموو لە دەورەی تاکە کەسێکی وەکو (خەلیفە) یان (مەلیك) دەسوڕایەوە، ئەو دەورەی بە تاقمەکەسێکی وەکو وەزیرو گزیرو کوڕەکانی تەنرابوو، هەموو وڵات بە موڵك‌و سامانی تایبەتی ئەو دادەنرا، بە ئارەزووی خۆی حوکمی بەسەر خۆیان‌و سەروەت‌و سامانیانەوە دەکرد، ئەمە ئەو سەردەمە بوو ماوەیەکی دوورو درێژ لە خۆرهەڵاتدا گەشایەوەو بەزین‌و داتەپینێکی بێ ڕادەی بەسەر ژیان‌و دڵ‌و دەروونی ئوممەتدا داسەپاند، ئەم سەردەمە ناکرێ بە سەردەمێکی ئیسلامی‌و سروشتی‌و عەقڵانی ناوزەد بکرێ، چونکە نە ئیسلام پێی ڕازییەو نە عەقڵیش دانی پێدا دەنێ، بەڵکو خودی ئیسلام هاتووە ئەم جۆرە سەردەمە بڕوخێنێ‌و لە ڕەگ‌و ڕیشەی دەربێنێ، ئەمە هەمان سەردەمە کە پێغەمبەری ئیسلامی تێدا نێردراو ئەویش ناوی نا: (سەردەمی جاهیلی)و بە توندی ڕەخنەی لێگرت، ڕەخنەی توندی ئاراستەی خوسرەوو قەیسەر دەکردو دنیا پەرستی‌و خۆشگوزەرانی ئەوانی بە عەیب‌و عار ناودەبرد، سەردەمی ڕابواردنی ناڕەواو خۆشگوزەرانی لەسەر حیسابی خەڵك لە هەر کات‌و شوێنێك بێت شایانی بەردەوام بوون‌و مانەوە نیە، ئەم سەردەمە ناتوانێ خۆی لەنێو ئوممەتی ئیسلامدا بخزێنێ مەگەر لە حاڵەتێکدا ئوممەت دەستی لەخۆ بەردابنەوەو دەستەوستان بووبێت، یان مێشك‌و عەقڵی تووشی نەخۆشی بووبێ، یان بیرو هۆشی لە دەست دابێ، یان دەروون‌و ڕوحی وێکڕا مردبن.[١] خۆرکەی خۆشگوزەرانی دەوڵەتی عەباسی داڕزاندو تووشی لاوازی‌و زەردو زەبوونی کردو نەیتوانی خۆی لە بەرامبەر گەردەلوولەکانی (مەغۆل)دا ڕابگرێت، دومەڵی گەندەڵی لە (بەغدای دار السلام)ی نێوەندی خیلافەتدا سەری هەڵدابوو، دیاردەی فیزو خۆ بەزلزانی مەلیکایەتی‌و سەڵتەنەتداری سەرکوێرانە بەسەریدا زاڵ ببوو، دەسەڵاتی نۆکەرو دەست‌و پێوەندەکان خۆی خزاندبووە نێو کۆشکەکانی خیلافەت، سەروەت‌و سامان‌و شار گەیشتنە لوتکە، بە خەیاڵدا نەدەهات خزمەتکارو نۆکەرو کۆیلەکانی کۆشکی خیلافەت چەندەیان سەروەت‌و سامان‌و خانوبەرەو کۆشك‌و تەلار هەیە، ئەم نموونەیە بەسە ئەم ڕاستیەمانی پێ بسەلمێنین:

(علاءالدين ى طبرسي ظاهري) کۆیلەیەك بوو و خەلیفە کڕیبووی، موچەی ساڵانەی لە دەوڵەتدا (٣٠٠) هەزار دینار بوو، کۆشکێکی لە بەغدا هەبوو کەس کۆشکی ئاوای نەبوو، هەروەها (مجاهدالدين ئایبك ی دیوداری مستنصری)یش: باشترین‌و زۆرترین سەروەت‌و

١ الترف، محمد موسى ص: ٤١.

سامانی لە: (پارەو کۆیلەو وڵاخە بەرزەو خانوبەرەو باخ و بێستان و پارچە زەوی و پێکەوە نابوو... هتد) ئەوە هەر لێگەڕێ کە ئەو هەموو پارەو زێڕو زیوەی لە شەوانی هاوسەرگیری کوڕو کچەکانیدا خەرجی کردووە حیسابەکەی بە خەیاڵدا نەدەهات.

بە هەمان شێوە (عبدالمغنی کوڕی فاخر) — کە لە ٦٤٨ کۆچی دا مردووە — لە کۆشکی خیلافەتدا (شیخ الفراشین) بووە، لەگەڵ ئەوەدا بە زانستەوە خەریك بوو بەڵام ژیانێکی پاشایانەی دەگوزەراند، ئەمە لە کاتێکدا مامۆستاو ئوستادانی قوتابخانەی (المستنصریه) کە بە حیساب بریتی بوون لە گەورەترین زاناو لە گەورەترین زانکۆی ئەو سەردەمەدا وانەیان دەگوتەوە موچەی مانگانەیان لە (١٢) دیناری تێپەڕ نەدەکرد.

لە لایەکی ترەوە دەبینین (٤) هەزار دینار لە لایەن (شرابی)ی خزمەتکاریەوە پێشکەشی (مجاهدالدین ئایبك ی مستنصری)ی ناسراو بە (دویداری بچووك) دەکرێ بە بۆنەی ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ کچی (بدرالدین لؤلؤ)ی حوکمڕانی موسڵ، هەروەها (٣) هەزار دیناریشی بەسەر وەفدەکەی موسڵ دا دابەشکرد کە بوکیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

بۆ ئەوەی مەودای هەموو ئەو دیاردە درۆزنانەو خۆدەرخستنە کەش و فشانەو فیزو شانازیە پاشایانەمان بۆ دەرکەوێ، پێویستە دەربارەی ئەو کوڕو ئاهەنگانە شتێك بزانین کە بە بۆنەی جەژنەکان و ڕێوڕەسمی دانانی خەلیفەو کاربەدەستەکان ڕێکدەخران بزانین کە چ لەوێدا ڕووی دەدا، بێگومان لەو ئاهەنگانەدا خەڵك مشەوەش دەبوون و ئاگایان نە لە خۆیان نە لە ئەنجامدانی نوێژەکانیان نەدەما، لە ساڵی ٦٤٠ کۆچیدا ئاهەنگێکی مەلەکی لە جەژنی ڕەمەزاندا ئەنجام درا، ئاهەنگ تا شەو بەردەوام بوو، خەڵك نوێژی جەژنیان بە نیەتی قەزاو گێڕایەوە لە دوای ئاهەنگەکەو پێش نیوە شەو ئەنجامدرا،[1] لە کتێبی (العسجد المسوك)دا هاتووە: لە ١٠/ذي الحجة/٦٤٤ دا سەربازگەل چوونە دەرەوەی شار، نوێژی جەژنیان لە کاتی خۆرئاوادا ئەنجامدا، بەڵام ماچکردنی زەوی بۆ چەند جارێك لەبەرامبەر خەلیفەدا شتێك بوو هۆگری ببوون، هەروەها چەندین شتی بێ لەزەتتر وەکو ماچکردنی دەست و دارو دیوارو لاشیپانەی دەرگای ماڵیان و خاکی بەرپێی خۆی و سمی ئەسپەکەی و... هتد، ئەم سەردەمە بە سەردەمی داگیرکردن و زەوتکردنی موڵك و سامان و خانوبەرەو زەوی و زاری خەڵك و بڵاوبوونەوەی بەرتیل و بەرتیلکاری و لەسەر کار لابردنی کارمەندانی بە تواناو گرتن و ڕەپێچکدانیان و فرۆشتنی — سەروەت و موڵك و ماڵەکانیان — ناوی دەرکردبوو، هەروەها هەر

---

١ رجال الفكر والدعوة ١/ ٢٧٤.

لەم سەردەمەدا: (فیرقەی باطنیة) پەرەی سەندبوو و تەڵەکەبازو قۆڵبڕیش شولیان لە خواردنی ماڵی خەڵك هەڵکێشابوو، دووبەرەکی لە نێوان هۆزو عەشیرەتەکان تەشەنەی کردبووو ڕەوشتو خوخدەکان لێك هەڵوەشابوون، شەرمو شکۆ لە گۆڕێدا نەمابوو و خەڵکی ڕوویان لە قومارخانەو مەیخانەو کەنیزەكو چاوەشخانەکان دەکردو خەڵکانی چاوچنۆکیش هەر خەریکی لەسەر یەك دانانی ماڵو سامان بوون.[1]

حکومڕانو میرو فەرماندەکان لەو سەردەمە مێژووییە تەنگەتاویەدا زۆر بایەخیان بە خۆشگوزەرانیو ڕۆچوون لە هەوەسبازیو بەدەستخستنی پلەو پۆستی بەرزو پارێزگاری لێکردنیو قۆرغکردنیو بەدەستخستنی ژیانێکی ئاسوودە بۆ خۆیان دەدا،[2] سوننەتو قانونی نەگۆڕی خودا: لە بەرامبەر گەلانی پێشوودا کە بە دەستکەوتنی نازو نیعمەتەکان خۆیان لێگۆڕاو سەرپێچیان کردو لە شەرعی خودا دوورکەوتنەوە جێبەجێ کراو بە سزای لەنێوچوونو داڕوخان وەلامیان درایەوە، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾﴾ (هود: ١١٦).

واتا: (دەبوایە لەنێو خەڵکی سەردەمەکانی پێش ئێوەدا کەسانێکی باوەڕ بەرزو کردەوە باش هەبوونایەو پێشگیریان لە نانەوەی خراپەکاری سەر زەوی کردبایە، تەنها کەمێك لەو گەلانە نەبێت کە لە دەست ڕابواردنی بە ناهەق ڕزگارمان کردن، بەلام ئەوانەی ستەمیان دەکرد بە دوای ڕابواردنو خۆشگوزەرانی کەوتنو تاوانبار بوون).

هەروەها خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾﴾ (الانبياء: ١١ـ١٣).

واتا: (ئێمە زۆر ئاوەدانیمان بەهۆی ستەمکاری نێو خۆیانیانەوە بەسەر یەکدا داڕوخاندوون، دوای ئەوان خەڵکانێکی ترمان لە شوێنی ئەواندا دانایەوە، هەر کە هەستو خوستی سەختی سزای ئێمەیان هەست پێکرد لە ئاوەدانی دەرچوونو هەلاتن، خودا

---

١ المصدر نفسه ١/٢٧٤.
٢ المصدر نفسه.

فەرمووی: ڕامەکەن، بگەڕێنەوە نێو خۆشگوزەرانیە ناڕەوەکەتان و کۆشك و تەلارەکانتان، بەڵکو لێپرسینەوەو لێپێچانەوەتان لەگەڵ بکرێت).

هەروەها خودای بەرزو بالادەست دەفەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾﴾ (الطلاق: ٨ـ١٠).

واتا: (زۆر ئاوەدانی سەرپێچی فەرمانەکانی پەروەردگاریان و پێغەمبەرەکانیان کرد، ئێمە لێپرسینەوەیەکی توندمان لەگەڵ کردن و سزایەکی سەخت و دژوارمان دان، سزای دەرەنجامی سەرپێچیەکانیان چەشت، دەرەنجامی سەرپێچیەکانیشیان بەزین و زیان و دۆڕان بوو، خودا — سزایەکی توندیشی — بۆ قیامەت — بۆ ئامادە کردوون، جا کەواتە ئەی ئەوانەی عەقڵتان هەیە و ئیمانتان هێناوە لە خودا بترسن، خۆ خودا قورئان — دەستوور — ی بۆ دابەزاندوون).

### ١٦ـ گەیشتن بە خاڵی کۆتایی لێکهەڵوەشان و داڕوخان

لە بابەتی هۆکارەکانی هەرەسی دەوڵەتی عەباسیدا باسی لاوازی کەسایەتی (المستعصم بالله)م کرد، بەڵام هەندێك لێکوڵەر هەوڵیان داوە بەرگری لێ بکەن و بە چاکە پێی هەڵابڵێن و بڵێن: دەستی بە سوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) گرتبوو، لە دژی بیدعە ڕادەوەستاو بەرامبەر بە ڕەعێتەکەی پیاوێکی نەرم و حەلیم بوو و گرنگی بە کاروباری ئوممەت و بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت دەدا[1] ... هتد.

هەروەك مامۆستای گەورەمان بیرمەندی گەورەی ئیسلامی (ابو الحسن الندوی) لەسەر ئەم ڕایەیە و ئامارەی بەوە داوە کە پینەدۆز بە پینەکردنی ئەو هەموو کون و دڕاوە زۆرانە ڕانەگەیشتووەو دەڵێ: (مستعصم) پیاوێکی مێژوو پاك و بیروباوەڕ چاك بووە، ئەو داکۆکی لەسەر چاکسازی بارودۆخ و خۆشگوزەرانی و ئاوەدانی وڵات دەکرد، بەڵام گەندەڵی تەواوی ژن و پیاوانی دەوڵەتەکەی گرتبۆوە، بە ڕادەیەك کەس نەیدەتوانی کاریگەری لەسەر قەڵاچۆکردنی هەبێ، مەگەر کەسێك لە لایەن خوداوە ئیرادەیەکی بەهێزی پێ بەخشرابێت و کەسایەتیەکی دەگمەن و هەڵکەوتووی بۆ دروست بووبێ، کێ دەتوانێ ببێتە بەربەستێکی بەهێز لە ڕوو ئەو هەموو گەندەڵی و بودەڵیەدا خۆڕاگری و بەسەر ئەم بارودۆخە شێواوەدا

---

[1] أمير المؤمنين المستعصم بالله العباسي ص: ٣٧ـ٤٩.

زاڵ بێت و زەوتی بکات!، لەم جۆرە حاڵەتەدا هیچ شتێك سوودی نابێ، مەگەر کەڵە پیاوانێك کە لە تواناياندا هەیە سپێدەی سەردەمانێکی تازە هەڵبێنن و چەند حوکومەتێکی تازە لە مێژوودا دابمەزرێنن، مێژوو خۆی چەند بارە کردەوەو دواهەمین حوکمڕانی دەوڵەتێکی داڕوخاو وەسفی (پارێزکاری و چاکەخوازی) دەکرێ، بەلام ئەو بنەماڵە یان مەملەکەتە گەیشتۆتە دواهەمین خاڵی لێکهەڵوەشان و ڕوخانی، دومەڵی گەندەڵی بەسەر جەستەیدا زاڵ بوو و کاسەش پڕ بوو و لێی ڕژا، ئەو کاتە لەوێندەری کەس نەیدەتوانی نێوانێك لە نێوان ئەو حکومەتە و ئەو کۆتاییە پڕ ئێش و ژانە بکاتە قانونی ئاسمان و سروشتی شتەکان بەسەریدا سەپاندووە، قەدەری خودا لەسەر ئەمە بوو دوا پیاو لە بەرامبەر کۆتایی هاتنی حکومەت و بنەماڵە حوکمڕانەکەی بەرپرسیاربێ ئەگەرچی پیاوێکی بەدین و صاڵحیش بووبێ و لە پێشینەکانی خۆیشی زیاترو گەرمو گوڕتر داکۆکی لەسەر چاکردنی بارودۆخ و نەهێشتنی گەندەڵی کردبێ، بێگومان ژمارەیەك لە صاڵحانی ئەو سەردەمە خۆیان بە زانست و وانە گوتنەوەو بەندایەتیەوە خەریك کردبوو، ژمارەیەکی تریش خۆیان لە گۆشەی مزگەوتەکاندا تەنها کردبوو، بەلام گەندەڵی دولینگەی بەسەر قەلاندۆشانی چینی حکومڕان و بۆرژواکاندا هێنابوونە خوارەوە.[1]

(ابو الحسن الخزرجي)ی مێژوونووس لە وەسفی خەڵکی عێراقی ئەو ڕۆژگارەدا دەڵێ: ئەوان گرنگیان بە کەرتی تایبەت و دابڕینی زەوی و زار بۆ خۆیان و کەسابەت و بازرگانی دەدا، بەرژەوەندی گشتیان پشتگوێ خستبوو، خۆیان بەو کاروبارانەوە سەرقاڵ دەکرد کە لە ڕوانگەی ئاینەوە ڕێگەیان پێ نادرێ، ستەمیان لە کرێکاران و ڕەنجدەران دەکردو بۆ خۆشیان خەریکی کەڵەکەکردن و لەسەر یەکنانی بلۆکی پارەو زێڕو زەبەر بوون، دەسەلاتیش لەگەڵ کوفر سەردەگرێ و درێژە دەکێشێ، بەلام هەرگیز لەگەڵ ستەم بەردەوام نابێ.[2]

### ١٧ـ ڕوخانی بارودۆخی ئابووری:

داتەپینی بارودۆخی ئابووری کاریگەریەکی لە ڕادەبەدەری هەبوو لەسەر لاوازبوونی دەوڵەتی عەباسی، هەندێك لە والی و حوکمڕانەکان باج و خەراجێکی زۆریان لەسەر ڕەعێت دانابوو، نەخشەیەکی ستەمکارانەیان بە زیانی گەل و لە بەرژەوەندی چینی حوکمڕان پێڕەو دەکرد، ئەمە ڕاستەوخۆ کاری کردە سەر ژیانی کشتوکاڵی و پیشەسازی و بەرەو بێ بازاڕی کردن و، خەڵك لەکارکردن دەسڵەمیەوە، هەر کاتێك چینی حوکمڕان دەوڵەمەندتر دەبوون

---

١ رجال الفكر والدعوة ١/٢٧٧.

٢ المصدر نفسه ١/٢٧٧.

چینی هەژاران و ڕەنجدەرانیش هەژارتر دەبوون، کاتێکیش جیهانی ئیسلامی پارچەپارچە بوو چەند دەوڵەتۆچکەیەکی بۆ دروست بوو، هەر یەکێك لە والی ئەو وڵاتانە دەستی بە زەوتکردنو دەست بەسەرداگرتنی موڵكو سامانی ڕەعێتەکەی خۆیدا دەگرت، جەنگە یەك لە دوا یەکەکانیش سەری کێشا بۆ کەمبوونەوەی پیاوانی هێزی کار، زۆر لە زەویە کشتوکاڵییو مەزراکان بە بەیاریو نەکێلراوی مابوونەوە، هاتنی چەند لافاو و سێلاوێکی بەردەوامیش دەشتەکانی باشووری عێراقیان وێران کرد،[١] لە هاوینی ٦٤٥ك/١٢٥٦ز بارانێکی بە خورەزم باریو دەرەنجام سێلاوێکی گەورەی لێ کەوتەوەو شاری (بەغدا)ی نوقوم کرد، بە جۆرێك دواچینی کۆشكو تەلارو نیشانەکانی شاری بە تەواوەتی داپۆشیبوو، ئەم لافاوە (٥٠) ڕۆژی ڕەبەق درێژەی کێشا، پاش ئەمە کاری کردە سەر عێراقو نیوەی خاکی کشتوکاڵی ئەو وڵاتەی خەراپ کرد.[٢]

**١٨ـ ململانێی نێوخۆی (بەغدا):**

دانیشتوانی بەغدا بریتی بوو لە خەڵکانی سوننەو شیعەو مەسیحیو جوولەکە، ئەمانە بەردەوام لەسەر پرسە ئاینیەکان ناکۆك بوونو دەربارەی ئینتیمای سیاسیش هەریەکە ڕووی لە لایەك بوو، بارودۆخێکی ئاوا بەردەوامیش حەتمەن لەجێی خۆی ناوەستێتو کاتێك دێ ئاشوبو ئاژاوەی نێوان دانیشتوانی لێ دەکەوێتەوە، ئەمەو لە کۆتاییەکانی سەردەمی (المستعصم)دا جەنگو هەرا لە نێوان شیعەو سوننەدا بەرپابووو، (خەلیفە) (ابوبکر)ی کوڕی ڕاسپارد ناوبژیوانیان بکاتو کۆتایی بە کێشەکە بێنێ،[٣] (ئەبو بەکری کوڕی موستەعسەم)و (دویداری بچووك) چوونە نێو بارودۆخەکەوەو پشتی سوننەکانیان گرت، کار بەوە گەیشت بەری (کەرخ) تالان کرا، شیعەکان بەڵایەکی گەورەیان بەسەرهات، (مۆیدالدین ی علقمي) بەم داخو خەفەتەوەو لە تۆڵەی مەزەبەکەی خۆی شمشێری تەتارەکانی لە دژی سوننەکان ڕاست کردەوە، بەڵکو بە دژی شیعەو جوولەکەو نەساراش تەواو بوو.[٤]

**١٩ـ ناپاکیەکانی (ابن العلقمي) وەزیرو شیعە مەزەب:**

ناوی (أبو طالب مؤیدالدین محمد) کوڕی (أحمد) کوڕی (علی) کوڕی (أبي طالب) کوڕی (العلقمی)ی بەغدایی ڕافیزی یە،[٥] (سبکی) دەڵێ: شیعەیەکی ڕافیزی بوو، دڵو دەروونی

---

١ جهاد المماليك ص: ٢٥٤.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٥٤.

٣ المغول للصياد ص: ٢٥٤.

٤ سير أعلام النبلاء ٢٣/٣٦٢.

٥ المصدر نفسه ٢٣/٣٥١.

بەرامبەر ئیسلامو ئەهلی ئیسلام کرد پڕ بوو لە بوغزو غەرەز،[١] (ذهبي) دەڵێ: ماوەی (١٤) ساڵ پۆستی وەزارەتی خەلیفە (المستعصم)ی عەباسی بەدەستەوە بوو، لەم ماوەیەدا فیکرەی ڕافیزەی بڵاودەکردەوە، سوننەکانیش لێی نەقایل بوونو لە دژی وەستانەوە، ئەویش سەری داخستو بوغزو غەرەزی داگرتو غەزری،[٢] (أبن كثير) دەڵێ: ڕافیزەیەکی پیس بوو، لە بەرامبەر ئیسلامو ئەهلی ئیسلامدا دڵی کرمێ بوو.[٣]

لە شوێنێکی تردا دەڵێ: شیعەیەکی تۆخو ڕافیزەیەکی دەروون پیس بوو،[٤] هەوڵەکانی خۆی خستنە گەڕ بۆ تەفروتوناکردنی ئیسلامو وێرانکردنی بەغدا، هەروەك (الصفدی) دەڵێ،[٥] کافری بەسەر ئیسلامو موسڵمانان وەرکردنو چ خراپ بوو بەسەری هێنان،[٦] (ذهبي) دەڵێ: بیرێکی قووڵی بۆ ئوممەت هەڵکەند تا تێی بکەوێ، خێرا خۆشی کەوتە ناوی سووكو چروك بوو،[٧] هەنگاوەکانی پیلانە گڵاوەکەی (العلقمي):

أ_ نامەو نامەکاری: چەندجار نامەی بۆ (هۆلاکۆ) نووسیو هانی دا تا عەزمی جەزم بێتو خۆی ئازا بکاتو هێرش بکاتە سەر عێراق، کە داگیریشی کرد (العلقمي) دەسەڵاتێکی هەبێتو ئامانجەکانی خۆی لەم ڕێیەوە جێبەجێ بکات.[٨]

گوتراوە: هەر جارێك بیویستایە نامەیەك بۆ (تەتار) بنێرێ فێڵێکی دەکرد، بەڵکو فێڵی وای دەکردن بە خەیاڵی کەسدا نەدەهاتن، دەڵێن: جارێك نەفەرە نامەبەرەکە بانگ دەکاتو سەری پاك بۆ دەتاشێ، (خاڵکوت) چۆن دەکات، ئەویش ئاوا بە نوکەدەرزی مەبەستەکانی خۆی لەسەر سەری دەنوسێتو کل بەسەر جێ نووسینەکەیدا — کە برینداربووە — دەڕێژێ، لێی دەگەڕێ تا قژی سەری دێتەوەو نوسینەکە دەشارێتەوە، ئینجا ئامادەی دەکاتو پێی دەڵێ: برۆ تا دەگەیە (تەتارەکان) پێیان بڵێ سەرت بۆ بتاشنو نامەکەی سەر سەرت بخوێننەوە، دوارستەی نامەکە ئەمە بوو: کاغەزەکە بدڕێنن، ئەوانیش سەریان بڕی، ئەمەی باسکرا ئەوپەڕی تەڵەکەبازیو دۆڕاوی (العلقمي) دەردەخات، بێگومان سیاسەتی نامەو

---

١ طبقات الشافعية ص: ٢٦٢.
٢ سير أعلام النبلاء ٢٣/٣٦٢.
٣ البداية والنهاية ١٣/٣٠٢.
٤ البداية والنهاية ١٣/١٩٤.
٥ الوافي بالوافيات ١/١٨٤، كيف دخل التتار ص: ٥٥.
٦ البداية والنهاية ١٣/٢٠٢، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٥٥.
٧ سير اعلام النبلاء ٢٣/٣٦٢.
٨ المصدر نفسه ٢٣/٣٦٢.

نامەکاری بە یەکەمین هەنگاوی ئەم پەیوەندیە ناشەریفانە حیساب ناکرێت، بەڵکو حەتمەن پێشدا ڕێخۆشکەری تریش هەبوون، ئینجا پەیوەندیەکە بەم قۆناغە گەیشتووە.[1]

ب ـ لاوازکردنی سوپا:

(إبن العلقمي) سیاسەتێکی گڵاوی ڕەچاوکردو سوپای خیلافەتی لاوازکرد، بەمەش ڕێگەی بۆ تەتارەکان خۆش کرد تا بە ئاسانی و بێ گیروگرفت خۆ بە (بەغدا)دا بکەن و ڕووبەڕووی بەرگریەکی وا نەبن کە شایانی لێ سڵەمینەوە بێ، ئەمەو پێش هاتنی تەتار ژمارەی سەربازانی سوپای کەم کردەوەو ناوی لە تۆماری دیواندا ڕەش دەکردنەوەو موچەکەی لێ دەبڕین، ئەو لەم کارەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا: چونکە ژمارەی سەربازانی سوپا لە سەردەمی (المستنصر)دا گەیشتبووە (١٠٠) هەزار کەس، بەڵام لە سەردەمی (المستعصم)دا، (إبن العلقمي) شەو و ڕۆژ هەوڵی دەدا ئەم ڕێژەیە دابەزێنێ و لە دوارۆژەکانی ئەو سەردەمەدا تەنها (١٠) هەزار سەربازی لێ مایەوە، (ذهبي) دەڵێ: (المستعصم) (إبن العلقمي)ی ڕافیزی کردە وەزیری خۆی، ئەویش ڕۆژی و ڕۆژیخۆری گەل و دەوڵەتی وێکڕا لەناوبردن، کۆکردنەوەی سەروەت و سامانی لەبەر چاو و دڵی خەلیفە جوان و شیرین کردو قەبارەی سوپای پێ بچووک کردەوەو موچەی سەربازانی پێ بڕی،[2] تا بارودۆخی سەربازانی سوپا بە جۆرێك شێواو لە برسان زەبوون بوون و دەهاتنە نێو بازاڕو مزگەوتەکانەوەو دەستیان لەبەر خەڵك پان دەکردەوە، کەواتە هەقی خۆی بوو شاعیران ئەوەندە شێعرانەیان پێ هەڵبڵێن و دادو فوغان و حەیران بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا لێ بدەن،[3] بێگومان هەموو ئەم بڕیارە نابەجێیانەی خەلیفە لەژێر کاریگەری سیاسەتی ئەم شیعە ڕافیزیە داخ لەدڵەدا بوو، (إبن كثير) دەڵێ: (موستەعسەم) لەلایەن وەزارەتەکەیەوە پارێزراو نەبوو، چونکە وەزیرێکی خوارو ڕێگە چەوتی هەبوو،[4] لە شوێنێکی تردا دەڵێ: ئەو وەزیرێکی خراپ بوو، لە دژی خۆی و لە دژی خەلیفەو لە دژی موسڵمانان،[5] کاتێك (إبن العلقمي) زانی لە کارەکانی خۆی بۆتەوەو ئامانجەکانی خۆی پێکاون، نامەیەکی بۆ (تەتار)ەکان نووسی و گرتن و داگیرکردنی وڵاتی لەبەر دڵ شیرین کردن و گوتی کە ئێستا ڕێگا خۆش بووەو بار لەبارەو ڕێ هەموارەو خەڵك و

---

١ كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٥٦.
٢ سير أعلام النبلاء ٢٣/٣٧٥.
٣ البداية والنهاية ١٣/١٩١، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٥٧.
٤ المصدر السابق نفسه ١٣/١٥٧، المصدر نفسه ص: ٥٧.
٥ المصدر السابق نفسه ١٣/٢٠١، المصدر نفسه ص: ٥٧.

سوپاش لاوازو زەبوونو بێ داروبارە،[١] بەم شێوازە دەبینین کە سیاسەتی (إبن العلقمي) چەندە بە قوڵایی ناوەندی دەسەڵاتدا ڕۆچووەو نیازو مەبەستەکانیشی چەند گڵاوو بۆگەن بوون، (ولایحیق المکر السيء الا بأهلە) فێڵی خراپیش تەنها بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە.[٢]

ج ـ ناپاکی نواندن دەرهەق بە قازیانو زانایانو خەلیفە:

سیاسەتی (إبن العلقمي) لەم سنوورەدا ڕانەوەستا، بەڵکو هەر کە (تەتەرەکان) بەرەو (بەغدا) هاتن، ئەو یەکەمین کەس بوو کە بە خۆیو خانەوادەو تەواوی دارودەستەو خزمەتکارو پاسەوانەکانیەوە چووە دەرەوەی شارو پێشوازی لە (هۆلاکۆ)کرد، پاش کۆبوونەوەی لەگەڵ (هۆلاکۆ) هاتەوەو بە خەلیفەی ڕاگەیاند کە چاك وایە جەنابی (خەلیفە) بچێتە لای (هۆلاکۆ)و بەم شێوەیە صوڵحی لەگەڵ بکاتو نیوەی عێراق بۆ (هۆلاکۆ) بێتو نیوەکەی تریش بۆ (خەلیفە) بێت، (خەلیفە) بەخۆیو وەفدێکی گەورەی (٧٠٠) کەسی کە لە (قازیو زانایانی ئاینیو سۆفیو کاربەدەستانی باڵای دەوڵەتو فەرماندە پلە بەرزەکانی سوپاو پیاو ماقوڵان) پێکهاتبوو، بە سواری بەرەو لای (هۆلاکۆ) بەڕێکەوت، کاتێك لە تاوڵی (هۆلاکۆ) نزیك بوونەوە، ئەندامانی وەفد جگە لە (خەلیفەو (١٧) کەس) هەر هەموویان لە وڵاخەکانیان دابەزێنرانو بەرەو مەرگ ڕەپێچەك درانو وڵاخەکانیشیان داگیرکران، (خەلیفە) هێنرایە بەردەم (هۆلاکۆ)و ئەویش پرسیارگەلێکی زۆری لێ کرد، گوتراوە: (خەلیفە) لە وەڵامی پرسیارەکاندا بەهۆی پۆزلێدانی هۆلاکۆ بەسەریەوەو سوکایەتی پێکردنی زمانی لاڵو پاڵ ببوو قسەی تێکەڵو پێکەڵ دەکردن، ئینجا بە دەستبەسەرکراویو گەمارۆدراوی لە لایەن (نصیرالدین ی طوسي)و (إبن العلقمي)یەوە — کە هەردووکیان شیعە بوون — هێنرایەوە بۆ بەغدا، هەموو زێڕو خشڵو کەلوپەلە نایابەکانی کۆشکەکانی خیلافەت تاڵانو بڕۆ کران، ئینجا ئەم دوو شیعە ڕافیزیە بە (هۆلاکۆ)یان گوت: صوڵح لەگەڵ خەلیفە نەکات، (وەزیر) گوتی: سوڵح کردن لەسەر نیوەییو برابەشی هەر یەك دوو ساڵ دەخایەنێتو پاشان بارودۆخ وەك پێش خۆی لێ دێتەوە، گوتیان چاك وایە بیکوژی، دەشگوترێ: (إبن العلقمي)ی وەزیرو (نصیرالدین ی طوسي) بە (هۆلاکۆ)یان گوت: (خەلیفە) بکوژە، بۆیە کاتێك (خەلیفە) لە بەغدا گەڕایەوە، (هۆلاکۆ) فەرمانیدا بکوژرێ.[٣]

---

١ المصدر السابق نفسه ١٣/١٩٢، المصدر نفسه ص: ٥٧.

٢ کیف دخل التتار ص: ٥٨.

٣ سیر أعلام النبلاء ٢٣/١٨٣، کیف دخل التتار ص: ٥٩.

س ـ هاندەرەکانی (إبن العلقمي):

پرسیارێکی گرنگ: (إبن العلقمي) لەبەرچی ئەمەی کرد؟ بۆچی ئەم کارەساتەی بەسەر (خیلافەتی عەباسی)دا هێنا؟ وەڵامەکەی بە کورتی: شیعەی ڕافیزە بەشێوەیەکی گشتی دڵو دەروونیان بەرامبەر ئەهلی (سوننە) بۆگەنەو بیروباوەڕێکی خراپیان دەرهەق هەیەو بە لایانەوە ئاساییە لە پێناوی لەنێوبردنیان هاوکاری بێ باوەڕان بکەن، (إبن تيمية) دەڵێ: هەر کەسێك باوەڕی بە عەدالەتی ابوبکرو عمرو کۆچەرانو یاریدەدەران هەبێتو چۆن خودا لێیان ڕازی بووە ئاوا لێیان ڕازی بێت، بەبێ ئیمانی دادەنێن، بە مەزەبی خۆیان دەڵێن مەزەبی (جەماوەر)و هەر کەسێکیش لە بازنەی ئەم مەزەبە دەرچێت خوێنی بە حەڵاڵ دادەنێن، پێیان ڕەوا نیە ژنو ژنخوازی (پرۆسەی هاوسەرگیری) لەگەڵ دانیشتوانی (شامو میسرو حیجازو مەغریبو یەمەنو عێراقو جزیرەو تێکڕای وڵاتانی تری جیهانی ئیسلام) بکرێتو دەست کوژیشیان بە حەڵاڵ نازانن، دەڵێن کافرێتی ئەوانە لە کافرێتی جوولەکەو نەسارا زۆر تۆخترە، چونکە ئەمانە کافری ڕەسەننو ئەوانیش هەڵگەڕاوەو مورتەدن،.... ئەم (ڕافین)انە بە گەورەترین هاندەر دادەنرێن بۆ پەلاماری (جەنگیزخان)ی پاشای کافران بۆ سەر جیهانی ئیسلامو هاتنی هۆلاکۆ بۆ وڵاتی (عێراق)و داگیرکردنی (حەلەب)و تاڵانو بڕۆی (صالحیە)و دەیان شوێنی ترلە لایەن تەتەرەکانەوە، هەیان بوو لە کاتی هاتنی (تەتار)دا وەزیری موسڵمانان بوو، دوای ئەمە بوو بە وەزیری دەوڵەتی (تەتار)و لەسەر پۆستەکەی مایەوە،[1] هەروەها دەڵێ: (ڕافیزە) (تەتار)و دەوڵەتی (تەتار)یان خۆش دەوێ، چونکە ئەو دەسەڵاتو دەستڕۆیشتنەی بەهۆی ئەوانەوە دەستیان دەکەوێ لە دەوڵەتی (ئیسلام)دا دەستیان ناکەوێ، ئەوان هاوکاری موشریكو جوولەکەو نەسارانو لە بەرەی جەنگی ئەوانەدان لە دژی موسڵمانان، گەورەترین هۆکارو کاریگەرترین هاندەر بوون بۆ پەلکێشکردنی (تەتار)ەکان ـ پێش موسڵمان بوونیان ـ بۆ نێو خاکی ڕۆژهەڵاتی خۆراسانو عێراقو شام، هەروەها گەورەترین هاوکارو پشتیوانیان بوون بۆ داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامو کوشتنو گرتنی موسڵمانانو زەوتکردنی حورمەکانیان، مەسەلەی (إبن العلقمي)و هاوونێنەکانی لەگەڵ (خەلیفە)و والی (حەلەب) نێوبانگی هەیەو تێکڕای خەڵکی پێی زانیووە... کاتێك موسڵمانان بەسەر (نەسارا)دا سەردەکەون (ڕافیزە)کان خەفەت دەخۆن، بەڵام کاتێك (موشریكو

---

١ الفتاوى ٢٨/٤٧٧، ٤٧٨، كيف دخل التتار ص: ٦٠.

نەساڕا) بەسەر (موسڵمانان)دا سەردەکەون بە پێچەوانەوە ڕافیزەکان جەژنو خۆشی دەگێڕن.[١]

هەر (إبن تيمية) لە (منهاج السنة)دا دەڵێ: زۆربەی ڕافیزەکان لە نێوی دڵیانەوە بێ باوەڕانیان لە موسڵمانان خۆشتر دەوێن: لەبەر ئەمە کاتێك (تورکە کافرەکان) لە بەشی خۆرهەڵاتەوە هێرشیان هێناو دەستیان بە کوشتو بڕو خوێنڕێژی موسڵمانانی (خۆراسانو عێراقو شامو حزيره)و وڵاتانی تر کرد، ڕافیزەکان لە دژی موسڵمانان چون هاوکاری ئەوانیان کرد، بە هەمان شێوە ڕافیزەکانی (شامو حەلەب)و شوێنەکانی تریش بوونە گەورەترین پشتیوانو هاوکاری تەتارەکان لە دژی موسڵمانان، ئەوان هەمیشە دۆستایەتی جوولەکەو نەساڕاو موشریکەکان دەکەنو لە کاتی کوشتارو دوژمنایەتی موسڵماناندا هاوکاریان دەکەن.[٢]

مێژوونووسان سەبارەت بە گۆڕانی هەڵوێستی (إبن العلقمي) لە بەرامبەر (تەتار)ەکان بەم شێوەیە هۆیەکەی دەگێڕنەوە بۆ ئەوە: – کاتی ئاژاوەی نێوان شیعەو سوننەی بەغدا– (ابوبکری کوڕی خەلیفە)و (دویداری بچووك) لەسەر سوننەکانیان کردەوەو لە دژی شیعەکان بەهێزیان کردنو تا کار بەوە گەیشت ئەوبەری (کەڕخ) تاڵانو بڕۆ کراو بەڵایەکی گەورە بەسەر شیعەکاندا هێنرا، (إبن العلقمي) ئەمەی لەسەر دڵ خڕ بوو و ویستی بە شیری بڕندەی تەتارەکان تۆڵە لە سوننەکان بکاتەوە،[٣] بۆیە نامەی بۆ (هۆلاکۆ) دەنووسینو تەماعی عێراقی دەخستە پێش دەم، ئینجا نوێنەرانی هۆلاکۆ هاتنە بەغدا، ژێر بەژێر فەرمانیان بۆ زۆر کەس پێ بوون، خەلیفەش نەیدەزانی چ باسەو چ دەگوزەرێ.[٤]

(إبن كثير) دەڵێ: لە ساڵی ڕابردوو (واتە لە ساڵی ٦٥٥ کۆچیدا) شەڕێکی گەورە لە نێوان (ئەهلی سوننە)و (ڕافیزە)کاندا ڕوویدا، (کەڕخ)و گەڕەکی (ڕافیزە)کانو خانوبەرەی خزمەکانی (إبن العلقمي)ی وەزیر تاڵانو بڕۆ کران، داخو مەراقی خواردو لەسەر دڵو هەناوی بوو بە گرێ، هەر ئەمەش بوو هانیدا پیلان لە دژی ئیسلامو موسڵمانان بگێڕێو کارەساتێکی هێندە گەورەی بەسەر (بەغدا) هێنا، کە لەوەتەی دروستکراوە تا ئیمڕۆ شتێکی لەم شێوەیە لە مێژوودا تۆمار نەکراوە.[٥]

---

١ الفتاوى ٢٨/٥٢٧، ٥٢٨، كيف دخل التتار ص: ٦١.
٢ منهاج السنة ٢/١٠٤، كيف دخل التتار ص: ٦٢.
٣ سير أعلام النبلاء ٢٣/٣٦٢، كيف دخل التتار ص: ٦٢.
٤ سير أعلام النبلاء ٢٣/١٨٠، كيف دخل التتار ص: ٦٣.
٥ البداية والنهاية ١٣/١٩١، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٦٤.

ش ـ تەڵەکەبازی بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە:

خـودای بـەرز دەفـەرمووێت: ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾ (فـاطر: ٤٣)، واتـە: (فـرِو فێڵ هەر یەخەی خاوەنەکەی دەگرێ)، (تەتار)ەکان خۆیان بەنێو (بەغدا)دا کردو ئـەوەی لـە دەسـتیان هـات لـە سـتەمو خراپـەو خوێنرێـژیو بەدڕەوشـتیو شـەرەفو نـاموس شـکاندن کردیان، (إبن العلقمي)یش هەرگیز لەمە پـارێزراو نـەبوو، (ذهـبي) وەسـفێکی پـڕ وردەکاری حاڵو وەزعی ئەو کاتەی ئەوی کردووەو بـەم دەسـتەواژە جوانـە دەری بڕیـوە: چاڵێکی بۆ ئوممەت هەڵکەند، خێرا بۆ خۆی کەوتە نـاویو تـالاوی سـووكو چروکیـشی چەشـکرد، پـێش ئێستا کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت، خۆیو تاقمـە سـوارەی هـاوڕێی بـە تاقمـە سـوارەی سـوڵتان دەچـوون، بـەلام ئێـستا سـواری ئێـستر دەبـێو بـە تـەنیا بەڕێـدا دەڕوات، پـاش ئەمـە بـە غەمباریو زیانداری مرد، لە دواڕۆژیش زیاتر سەرشۆڕ دەبێو تۆڵەی زیاتری لێ دەکرێتەوە.[1]

(الصفدي) دەگێڕێتەوە: (إبن العلقمي) لە کاتێکدا پەژێوان ببـۆوە کـە دادی نـەدەدا، ئـەو ئەم قسەیەی زۆر دووپات دەکردەوە: (قەزاو قـەدەر بـە پێـچەوانەی ئاواتـەکانم کـاری خـۆی کـرد)، چـونکە سـوکایەتی زۆری لـە لایـەن تەتـەرە پلەپەسـتە (خوێڕیـە)کانـەوە پێکـرا، دەگێڕنـەوە: ڕۆژێـك لـە بارەگـای دیـوان — ی وەزارەت لەسـەر کورسـی — دانیـشتبوو، سەربازێکی (تەتەر)ی سـادە بـە سـواری وڵاخەکـەی، بـە ژووردا دەکـاتو وڵاخەکـەی لەسـەر ڕایەخی وەزیر ڕادەگرێتو خۆیشی دانابەزێ، بە ئارەووزی خۆی وتووێژی لەگەڵ وەزیرکـرد، ئەسپەکە میزی بە ڕایەخەکەدا کردو پرِیشکەکانی بەر شاقەلی وەزیر کەوتن، لەگەڵ ئەمەشـدا جەنابی وەزیر، چونکە بـە مـرادی خـۆی گـەیبوو هێـزی دانبـەخۆدارگتنی بـەکارهێناو هیـچی نەگوت، شیعەکانیش بە شێوەیەکی گشتی — کـە هـەموویان خـزمو کەسـی ئـەو بـوون — لـە تـاوانو درِنـدەیی تـەتارەکان پـارێزراو نـەبوون، زۆر سـەیر بـوو کـە لـە ڕقـی سـوننەکانو دەمارگیری بۆ شیعەکان هەموو ئەو سـوکایەتیو تاوانانـەی بـە حـەلاڵ دادەنـان، دەگێڕنـەوە یەکێك لە دانیشتوانی (بەغدا) پێی دەڵێ: ئەی مەولاو سەروەرمان ئەوەی بەسەر ئەم شارەدا هاتووە لە سۆنگەی پیلانی تۆوە بووەو تۆ کردووتە، تۆ شیعەیو شیعەگەریت بـەکارهێناوە، بەلام پیاو ماقولانێکی زۆری (فاطمي) کە هەژمار ناکرێن کوژراون، دەستدرێژی کراوەتە سـەر ژنەکانیانو پەردەی کچێنی کێژگەلێکی زۆریان کە بەس خودای بەرز دەزانێ کون کـراوە، لـە وەلامدا گوتی: دوای ئەوەی (دوادار)و هاوبیرەکانی کوژران چ دەبێ با ببێ، گوێ مەدەیە.[2]

---

١ سير اعلام النبلاء ٢٣/٣٦٢.

٢ الوافي بالوافيات ١/١٨٥.

ئەمەو (تەتەرەکان) هێندەیان زەردو زەبوون کرد بۆ هەر شوێنێك چووبایە دەبوایە بەدوای (ابن عمران) ناوێك کەوتبایە کە کاتی خۆی لە دەوڵەتەکەی (المستعصم)دا نۆکەر بووە،[1] (النويري) شتێکی خراپتر لەمە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (هۆلاکۆ) داوای لێ دەکا بێتە لای، هەر کە دەگاتە جێ، بە بیانووی بێ وادەیی‌و بێ بەڵێنی دەرهەق کەسێك نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتووە بەر جوێنی دەداتو داوەشاوی دەکات.[2]

(السيوطي) باس دەکا کە: کاربەوە گەیشت وەکو کۆیلەیەکی لێهاتبوو بە ڕەنگ هەڵبزرکاوی‌و پەژارەیی مرد.[3] هەرچەندە هەڵوێستی (إبن العلقمي) بە هیچ شێوەیەك ساغو سەلیم نەبوو، بەڵام ناتوانین هەموو ئۆباڵەکە بخەینە ئەستۆی ئەو، بەڵکو خودی خەلیفەو پیاوانی دەوروبەریشی برابەشی ئەم هەڵوێستەی ئەو بوون، ئەمەو هەڵوێستی ئەوو خەلیفەو دارودەستەکەی‌و هۆکارگەلێکی تریش – کە لە باسی لەنێوچوونی دەوڵەتی عەباسیدا باسکران – پشکیان لەم کارەساتەدا هەبوو، لە ڕاستیدا هەڵوێستی (إبن العلقمي) پارچەی وێنەیەك بوو[4] لە وێنەی ئەو هۆکارگەلەی بەشیان لە ڕوخانی دەوڵەتی عەباسیدا هەبوو، (خومەینی) شانازی بە تاوانەکانی (إبن العلقمي)و (طوسي) دەکات کە لە کاتی پۆستە بەرزەکانیاندا – بە حیسابی خۆیان – بەشداری کوشتنی موسڵمانانیان کردووەو بەم شێوەیە قسە دەکات: خەڵك (واتە شیعە) بە لەدەستدانی (خواجە نصرالدين ی طوسي)و هاوشێوەکانی زیانێکی گەورەیان لێ دەکەوێت، چونکە ئەمانە خزمەتی گەورەیان بە ئیسلام کرد،[5] ئەم (خزمەتگوزاریانە) کەمێك پێش ئەو لە لایەن (خوانساری)یەوە پەردەیان لەسەر هەڵدرایەوەو لە باسی (نصيرالدين طوسي)دا گوتی: لە کۆی ئەو کاروبارە گرنگە بەناوبانگانەی لێی گێڕدراونەوە لە لایەن (هۆلاکۆخان)ەوە داوای لێکراوە ببێتە ڕاوێژکارو وەزیری‌و لەگەڵ تاقمە سوارەی سوڵتانی خاوەن پشتیوان بە مەبەستی ڕێنمایی کردنی بەندەکان‌و چاکسازی‌و پاکسازی وڵات بە لەنێوبردنی دەسەڵاتی ڕۆڵەکانی عەبباس‌و کۆکوژکردنی شوێنکەوتووی ئەو بنەماڵە بودەڵەیەو ڕژێنرانی خوێنی پیسیان بەوێنەی ئاوی ڕوباران بۆ نێو ئاوی (دیجلە)و لەوێشەوە بۆ نێو ئاگری دۆزەخو خانەی بێ خێرو بێر، بەرەو (بەغدا)ی (دار السلام) بەڕێکەوت.[6]

---

١ المغول في التاريخ ص: ٢٧٤، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٦٦.
٢ نهاية الارب في فنون الادب، نقلا عن كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٦٦.
٣ تاريخ الخلفاء للسيوطي ص: ٣٧٨، كيف دخل التتار بلاد المسلمين ص: ٦٦.
٤ العراق سياقات الواحدة والانقسام، بشير نافع ص: ٦٣.
٥ روضات الجنات ٦/٣٠٠-٣٠١، أصول مذهب الشيعة للقفازي ١٤٧٢/٣.
٦ أصول مذهب الشيعة للقفازي ١٤٧٣/٣.

ك ـ (ابن طاوس)و خیلافەتی عەباسی:

(علی کوڕی طاوس) لە کاتی ڕوخانی بەغدا یەکێك بوو لە مەڕجەعەکانی شیعە، ئەو دەوڵەتی عەباسی بە شەرعی نەدەزانیو بە بیروباوەڕی خۆی دەوڵەتێکی داگیرکەرو زەوتکەر بوو، ئیشی بۆ لەنێوچوونی دەکردو پشتیوانی لێکردنی لە بەرامبەر دوژمنەکانی بەڕەوا دانەدەنا، کاتێك لە ساڵی ٦٣٤کۆچیداو لە سەردەمی (المستنصر)دا بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەسیاسیەکانی نێوان دەوڵەتی (عەباسی)و سەڵتەنەتی (تەتار) داوای لێکرا ببێتە نوێنەری دەوڵەتی عەباسی، (ابن طاوس) قایل نەبوو، چونکە ئەگەر ئەمە قبوڵ بکات ئەوا دەبێتە نوێنەرێکی هەمیشەیی دەوڵەتی عەباسی[1] ی زەوتکارو ناشەرعی، کاتێکیش (بەغدا) لە لایەن (مەغۆل)ەوە ڕوخێنراو دانیشتوانی (حِلّة) ئاوارەی (بطائح) بوون، زاناو ڕیشچەرموەکانی عەلەوی لەگەڵ مجدالدین (ابن طاوس) چوونە خزمەتی (سوڵتان هۆلاکۆ)، داوایان لێکردو لەبەری پاڕانەوە خوێنی خۆیانو خەڵکەکەیان نەڕێژێ، ئەویش داوایەکەی لێ وەرگرتنو تاقمە سەربازێکی لەگەڵ ناردنەوە بۆ (بطائح)و هەموو خەڵکە ناسراوەکانی خۆیان بە گەورەو بچووكوماڵو خێزانەوە کۆکردەوەو ماڵێکی زۆرو زەوەندیان کۆکردەوەو بۆ سوڵتانیان نارد، بەم ماڵو سامانە سەری خۆیان کڕیەوە.[2]

کاتێك (بەغدا) بە تەواوەتی دەستی بەسەردا گیرا، هۆلاکۆ فەرمانی دا زانایان (فتوا) لەسەر ئەمە بدەن: کام سوڵتانە باشترە؟ موسڵمانی ستەمکار یان بێباوەڕی دادپەروەر؟ ئینجا زانایانی کۆکردەوە، رضي الدين (علی کوڕی طاوس) پێشەنگیان بوو — لە لایەن (تەتار)ەوە — ڕێزی زۆری بۆ دانرابوو، کە بینی کەس وەڵام ناداتەوە، هاتە پێشەوەو نەخشەیەکی بۆ هەڵسەنگاندنی پرسیارەکە داڕشتو بە دوورودرێژی ڕوونی کردەوە کە: سوڵتانی بێباوەڕی دادپەروە لە سوڵتانی موسڵمانی ستەمکار باشترە، ئینجا ئەوانی تریش قسەی خۆیان لەسەر بابەتەکە کردو وەکو ئەو فتوایان دا.[3]

بەر لە گرتنی بەغدا، (ابن طاوس) داوای ئەمانی لە (هۆلاکۆ) کرد، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی کردو بە گوتەیەکی هەڵبەستراو بە دەم (علی کوڕی ئەبی تالیب)ەوە عەباسیەکانی لە لای ئەو ناوزڕاو کردن، کاتێك گەیشتە مەجلیسی (هۆلاکۆ)، هۆلاکۆ پێی گوت: پێم بڵێ، چۆن وێرات نامەم بۆ بنووسیو بێیتە لام، پێش ئەوە بزانن کاروباری منو کاروباری

---

١ الفقيه والدولة، الفكر السياسي الشيعي ص: ٩٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٩٤.

٣ المصدر نفسه ص: ٩٤.

حوکمەتەکەتان بە گوێ دەکات؟ باشە ئەگەر ئاشتی لەگەڵ ئەنجام داموو منیش لێرە ڕۆیشتم، ئەو کاتە ئێوە لە خۆتان ناترسن؟! (ابن طاوس) گوتی: ئێمە پێش ئەوەمان داوەتەوە، چونکە ئەمیری ئیمانداران (علی کوڕی ئەبی تالیب) لە وتارێکدا فەرموویەتی: زەورا، تۆ چوزانی زەورا چیە؟ خاکێکی خاوەن دارگەزە، کۆشکو تەلاری لێ بینادەکرێن، خزمەتچیو خەزنەی زۆری لێ دەبن، ڕۆڵەکانی عەباس تێیدا نیشتەجێ دەبن، کۆشکەکانیان دەڕازێننەوە، دەیکەنە ماڵی ڕابواردنو گەمەی خۆیان، زوڵمو زۆرو ستەمی زۆری لە لایەن ستەمکارانەوە تێدا دەکرێ، پڕ دەبێ لە ئیمامی تاوانبارو فەرماندەی لاڕێو وەزیری ناپاك، ڕۆڵەکانی فارسو ڕۆم خزمەتیان دەکەن، ئەگەر بە چاکەیان زانی فەرمان بە کردنی ناکەن، ئەگەر خراپەیان هەست پێ کرد پێشگیری لە ئەنجامدانی ناکەن، کار بەوە دەگات پیاوانو ژنانیان لەگەڵ پیاوانو ژنانی دوژمنانیان یەکسانو بەرامبەر دەبن، لەو دەمەدا لە لایەن تورکەوە پەلامار دەدرێنو غەمو پەژارە هەموو لایەك دەگرێتەوەو گریانو واوەیلاو دادو فوغانو شینو شەپۆر هەموو ئاوەدانی زەورا دەتەنێتەوە، ئەو تورکانە چاویان بچووکە، ڕووی دەمو چاویان خڕە، پۆشاکیان ئاسنە، کۆسە پیاون، پاشایەك پێشیان دەکەوێ: دەنگی گەورەیە، زەبری بەهێزە، هیمەتی بەرزە، بە هەر شارێکدا تێپەڕێ دەیگرێ، هەر ئالایەك لە بەرامبەری هەڵبدرێت تایدەنەوێنێ، واوەیلا بۆ ئەو کەسەی لە دژی دەوەستێتەوە، ئەو بەم شێوەیە دێتو دەڕوا تا سەرکەوتن بەدەست دێنێ[١] جا کاتێك ئێمە ئەوەمان بۆ باسکرا ئێستا ئەو سیفەتانە لە ئێوەدا بەدی دەکەین، لەبەر ئەمە هاتوینە خزمەت جەنابتو تکات لێ دەکەین، (الحلی) قسە لەسەر ئەمە دەکاتو دەڵێ: ئەویش دڵی دانەوەو خۆشحاڵی کردنو فەرمانێکی بە ناوی (ابن طاوس)ەوە بۆ دانیشتوانی (حلة) دەرکردو دڵنیای کردن کە هێرشیان ناکاتە سەر.

ئەم ڕیوایەتە یەکێکە لە درۆ دەلەسەو بوختانەکانی شیعە بەدەم ئیمامی (عەلی)یەوە لە پێناوی: شێواندنی مێژووی عەباسیەکان لەسەر زمانی ئیمامو چاپلوسیو خۆڕەپێشکردنیان بۆ لای (هۆلاکۆ)ی بت پەرست، ئەم قسەیەی (ابن طاوس) گوتی: (هەر ئالایەك لە بەرەی دژی ئەو هەڵبکرێ دای دەنەوێنێ، واوەیلا بۆ ئەو کەسەی دوژمنایەتی ئەو دەکا، ئەو بەردەوام بەرەوپێش دەڕوا تا دەرەنجام سەردەکەوێ)[٢]، واقیعو ڕاستیەکانی مێژوو بە درۆی

---

١ المصدر نفسه ص: ٩٦.
٢ المصدر نفسه ص: ٩٦.

دەخەنەوە، چونکە ئاڵاشەکاوەکەی (هۆلاکۆ) لە جەنگی (عەین جالوت)داو لە لایەن (سیف الدین قطز)ی سوننە مەزەبی سەرکردەی سوپای (مصر)ەوە تێکشکێنراو دانەوێنرا، بە هەمان شێوە (بەرەکەخان)ی مەغۆلی ئامۆزای دوای موسڵمان بوونی لە جەنگێکی دەستەویەخەی خوێناویدا بەزینێکی گەورەی بەسەر هۆلاکۆدا تۆمار کردو تاڵاوی شکستی بە گەروودا کرد، بەڵکو (هۆلاکۆ)بە خەفەتو مەراقی کارەساتەکەی جەنگی (عەین جالوت) کە بەسەر سەربازەکانیدا هێنرا سەری نایەوەو مرد، بە ئیزنی خودا لەمەولا خوێنەر ئەم بابەتە لە لاپەڕەکانی دواتردا دەخوێنێتەوە.

(ابن طاوس) بە فتوایەکانی پەتپەتێنەو گەمەی سیاسی دەکردو دەیەویست وا نیشاندا: کە (هۆلاکۆ) لە خەلیفە (مستعصم) باشترە، لە کاتێکدا یەکەمیان کافری دادپەروەرو دووەمیان موسڵمانی زۆردارە، باشە عەدالەتو دادپەروەری (هۆلاکۆ) کوانێ؟ ئەو جگە لە ڕوخاندنو لەنێوبردنو ناموس شکاندنو بەکۆیلەکردنی خەڵك چ دەستکەوتێکی تری دەبینرێت؟ ئەم دڵپیسو دەروون نەخۆشە پێی وایە: دەستدرێژی کردنە سەر موسڵمانانی سوننەو دەوڵەتەکەیان دادپەروەریەو بەس، بەلام هەموو ڕەفتارەکانی (ابن طاوس) دووڕوویی و چاپلوسی بوونو لەپێناوی ئەوەدابوون تا خۆی لە (هۆلاکۆ) نزیك بکاتەوە، هەروەها ئەو لە بێنەوبەرەی سیاسی دورەپەرێزی نەدەکردو بە هەڵوێستی هەمەچەشنە بەشداری دەکردو وەك دەبینین بە چەند ڕیوایەتێکی هەڵبەستراو - کە باس لە غەیبو هەواڵی نادیار دەکەن - دەچێتە سەرمێزی گفتوگۆو دەیەوێت پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ دەوڵەتی مەغۆلی ببەستێ، ئەو پێی وایە ئەم بەڵگەو دەقە - هەڵبەستراوانە - دەستەبەری لابردنی ئەو ئاستەنگانە دەکەن کە شەرع لابردنیان بە زەروری دەزانێ.[1]

بێگومان کەسە دیارەکانی شیعە لەو قۆناغەدا وەکو: (ابن طاوسی حیللیء، العلقمي و نصیر الطوسيو هی تریش) یەکێك بوون لە هۆکارە کاریگەرەکانی ڕوخانی (دەوڵەتی عەباسی)، ئەوان ئامادەو چەك لەسەر شان بوون لەسەر حیسابی کۆتایی پێهێنانی عەباسیەکان هەڵسوکەوت لەگەڵ (مەغۆل) بکەنو پەیوەندی بەهێزو پتەویان لەگەڵ ببەستن.

**٢٠- ئەزموونديدەيی ئەسپ سوارانی (تەتار)و هێزو پێزی ئیمپراتۆریەتی (مەغۆل):**

پێویستە ئەوە فەرامۆش نەکەین: کە ئەسپ سوارەکانی مەغۆل لە جەنگو کوشتار ڕاهاتبوونو ئەزموونی زۆریان دیبوو و دەستیان بە ئامرازە مادیەکانو تەواوی هۆکارەکانی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٠١.

بردنەوەو سەرکەوتن گرتبوو لە: (سەرکردایەتیەکی کار دروستو حەکیم، دیاربوونی ئامانج، ئامادەکردنی تاکەکانو جەختکردنەوەی یەکبوونو یەکێتی ڕیزەکان، دەسەڵاتی یاسا، دابەشکردنی ڕۆڵ گێڕان، نەخشەی ساغو سەلیم، بەڕێوەبەرایەتی سەرکەوتوو، ڕێکخستنی دامەزراو، کۆمەکی ئابووری، پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندن بۆ سوپاکەیان، وریایی‌و هۆشداری تەواو لە بەرامبەر دوژمنو دەیان هۆکاری تریش) کە هەر هەموویان دەبنە نیشانەو بەڵگەی ڕاهاتوویی‌و لێهاتوویی ئەسپ سوارانی (مەغۆل) لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا، ئەمانە گرنگترین هۆکارەکانی ڕمانی دەوڵەتی عەباسی بوون، کە هەر هەموویان تێکهەڵکێشی یەکتر بوونو پەیوەندیان بە یەکترەوە هەیەو کاریگەری پێچەوانەشیان بەسەر یەکترەوە هەیە، بۆ وێنە هۆکاری (ئاینی) کار لە هۆکاری سەربازی دەکاتو ئەویش بە پێچەوانەوە کاری تێدەکاتەوەو هەروەها.

لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتانو دامەزراوییان یەکێکە لە کارە هەرەگرنگو پڕبایەخەکان کە ئوممەتی ئیسلامی لە جێبەجێکردنی پرۆسە شارستانیەتیەکەیدا پێویستی پێ دەبێتو کە سەرکردایەتی کردنی مرۆڤایەتی‌و ڕابەرایەتی کردنی جیهان بە پێڕەوی پەروەردگار بە ئامانج دەگرێ.

## هەشتەم: ئەنجامەکانی ڕووخانی (بەغدا):

ڕوخانی بەغداو لەنێوچوونی خیلافەتی عەباسی – کە زیاتر لە (٥) سەدە درێژەی کێشا – لە ڕیزی ڕووداوە هەرە گەورەکانی مێژوو دەژمێردرێو خراپترین کاریگەری لەسەر دڵو دەروونی موسڵمانان داناو زللەیەکی توندو تیژ بوو بەر ڕوومەتیان کەوتو نەهامەتیەکی ناخۆش بوو بەسەر سەریاندا هات، چونکە لەم کارەساتەدا لە لایەن ئەو مەغۆلە بێ باوەڕو بتپەرستانەوە حەیاو حورمەتیان شکێنرا، کە برندەترین خەنجەریان لە پاش شانی خیلافەتو بنەماڵەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا، کەواتە هیچ سەیر نیە کە ئەنجامی مەترسیداریشی لێ کەوتبنەوە،[١] لەم چەند خاڵانەدا ئەنجامەکان کورت دەکەینەوە:

### ١ـ نەمانی دەسەڵاتی ڕوحی‌و ئەدەبی:

موسڵمانان بەگشتی لەسەر ئەو باوەڕە بوون خیلافەت سومبولی تەواوی دەوڵەتانی ئیسلامیەو پێویستە هەمیشە ڕاوەستاوو پێ چەسپاو بێ، بە چاوی ڕێزو شکۆوە تەماشای (خەلیفە)یان دەکرد، لەسەروی هەموو ئەمانەشەوە پێگە ئاینیەکەی کاریگەریەکی یەکجار

---

١ المغول في التاريخ للصياد ص: ٢٧٩.

قوڵی لەسەر هەناوی هەمووان هەبوو، هەرچەندە ماوەی چەند سەدەیەك بوو خیلافەت بەشێکی گەورەی دەسەڵاتی مادی خۆی لەدەستدابوو، بەلام لە بەرامبەر ئەمەدا دەسەڵاتی ڕوحیو ئەدەبی هەمیشە لەزیادبووندا بوو، کاتێکیش (بەغدا) ڕوخاو (خەلیفە) کوژرا، ئەم دەسەڵاتەش کۆتایی پێهاتو پێگە ئاینیەکەی پایتەختیش کە لە لوتکەدا بوو دارما.[1]

**٢ـ (بەغدا) شاری ناسەرەکی:**

پێش هێرشەکەی مەغۆل (بەغدا) مەڵبەندی چالاکیە سیاسیەکانی تەواوی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بوو، نوێنەرانی حوکمڕان و میرەکان بە پێشەنگی خۆیان دادەناو، پەیوەندیەکانی نێوان بەغداو پایتەختی هەرێمەکان بەرقەرار بوو، بەلام کاتێك کەوتە دەستی مەغۆل، بوو بە شارێکی ناسەرەکیو، والیەکیان بە سەرەوە دادەناو بەس، هەموو چالاکیە سیاسیەکان بۆ شارەکانی باکووری (ئازەربایجان) گوازرانەوە، چونکە لەوێدا ڕۆڵی پایتەختەکان دەگێڕدراو، بەمە بەغدا بایەخی سیاسی لە دەستدا، (رنیسمان) دەڵێ: بەغدا بەرەبەرە لە پاکو خاوێنیو ڕێکوپێکیدا بەرەو سەردەمە کۆنەکانی دەچۆوە، بە جۆرێك دوای تێپەڕینی (٤) ساڵ قەبارەکەی بۆ ١/١٠ی پێشدا بچووك بۆوەو وێنەی شارێکی بچووکی لێهات لەنێو هەرێمێکدا،[2] بە ڕووخانی بەغدا خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەگشتی چووە نێو سەردەمێکی تازەوەو دوای (هۆلاکۆ) کوڕەکانی حوکمیان تێدا دەگێڕا، ئەوانیش پلە بە پلە خۆیان لە دەسەڵاتی (مەغۆل) پچڕاندو پەیوەندیان بە (قەراکورم)ی پایتەختی ئیمپراتۆریەتەوە نەما، دەوڵەتێکی سەر بە خۆیان بە ناوی دەوڵەتی (ئێلخانی) لە (ئێران) دامەزراند.[3]

**٣ـ هەرەسی زانستەکان و جێگەو پێگەی زمانی عەرەبی:**

بەغدا مەڵبەندێکی گرنگی زانستو ئەدەبو هونەر بوو بە هەموو لقو پۆپەکانیانەوە، زانایان و قوتابیان بە مەبەستی بەهرەمەندبوون لە ڕۆشنبیریە ئیسلامیەکەی بەغدا بە لێشاو ڕوویان تێدەکرد، بۆیە ئەم شارە پڕ ببوو لە زاناو ئەدیبو فەیلەسوفو شاعیر، هەموو ئەمانە لە تێکڕای گۆشەو کەنارەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا دەبوونە ئوستادو پێشەنگی فێرخوازانی زانستو ئەدەب، کاتێك ئەم نەگبەتیو نەهامەتیەی لە لایەن مەغۆلەکانەوە بەسەرهات، هەزاران زاناو شاعیر کوژران و ئەوانەی دەربازیان بوو ئاوارە بوونو پەنایان بۆ

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٨٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٨٠، تاريخ الحروب الصليبية ٣/٥٢٢.

٣ المغول للصياد ص: ٢٨٠

میسرو شامو شوێنی تر برد،[١] کتێبخانەکان سوتێنران‌و قوتابخانەو پەیمانگاکان ڕوخێنران‌و هەموو ئەو شوێنەوارە ئیسلامیانەی هونەرمەندانی موسڵمان لە داهێنانیاندا خۆیان ماندوو کردبوو و کاتێکی زۆریان تێدا سەرف کردبوو لەنێوبران‌و لەگەڵ خاک‌و خۆڵ وردو خاش کران، کورتەی قسان ئەوەیە: ڕوخانی (بەغدا) دوای ڕوخانی (بوخاراو نەیسابورو ڕەی‌و شارەکانی تری) جیهانی زانست‌و هونەرو ئەدەب، لە ڕاستیدا تاوانێکی گەورە بوو و دەرهەق بە شارستانی‌و ڕۆشنبیری ئەنجام درا، چونکە بەم کارەساتە (زمانی عەرەبی) جێگەو پێگەی خۆی لە تێکڕای گۆڕەپانەکانی ڕۆشنبیری‌و زانستی‌و ئەدەبی لەدەستداو (زمانی فارسی) بەسەر (زمانی عەرەبی)یدا زاڵ کرا، هەرچەندە ئەم زمانە وەکو زمانێکی زانستی‌و ئەدەبی لە (ئێران)دا مایەوەو ئەدیبان‌و نووسەرانی ئێرانی لە بوارەکانی فێربوون‌و پێ نوسینیدا نەیانتوانی دەست بەرداری بن، بەڵام زیاتر بایەخیان بە زمانی فارسی دەدا، چونکە لەو کاتەدا ئەم زمانە نەیدەتوانی ئارەزووەکانی خەڵك تێر بکات‌و لەگەڵ هەست‌و نەستی ئەوان بێتەوە، (براون) دەڵێ: ڕوخانی (بەغدا) وەکو پایتەختی موسڵمانان‌و گچکەکردنەوەی بۆ شارێکی ناوچەیی، زەبرێکی گورچوبڕ بوو شاڕەگی پەیوەندی یەکێتی ئوممەتانی ئیسلامی – ئەو کاتەی – پچڕاند، هەروەها جێگەو پێگەی (زمانی عەرەبی)یش لە (ئێران) زەبرێکی پشتشکێنی بەرکەوت‌و بەکارهێنانی لە زانستەکانی فیقهدا کورت هەڵێنرا، کاتێك دەگەینە کۆتایی سەدەی (١٣)ی زاینی (٧) کۆچی‌و تەماشایەکی ئەو کتێبانە دەکەین لە (ئێران)دا نوسراون‌و دانراون، کتێبی عەرەبیمان بە دەگمەن دێنە بەرچاو.[٢]

**ﮐ- خۆشی‌و شادی نەسرانیەکان:**

نەسرانیەکان لەم هێرشانەی دوایەدا هاوکارو پشتیوانی (تەتار) بوون، پاشاکانی (ئەرمینیاو کەرج)و میری (ئەنتاکیە) هاتبوونە بەرەی ئەوانەوە، بۆیە ئەوان بەم کارەساتە دڵخۆش بوون‌و شادومانی چوار لای جیهانی نەسرانی گرتەوە، لە کاتێکیشدا بینیان تەتارەکان وادەکانیان بەجێ دێنن لە پاراستنی سەرو ماڵ‌و ناموسی مەسیحیەکانی بەغدا، هێندەی دیکە خۆشحاڵ بوون، جگە لەمەش (هۆلاکۆ) چەند دیاریەکی گرانبەهای پێشکەشی (ماکیکا)ی بەتریکی نەسرانی کردن‌و یەکێك لە کۆشکە گەورەکانی خیلافەتی عەباسیی هەڵکەوتووی سەر ڕووباری دیجلەی پێداو کردی بە ئەندامی مەجلیسی حوکمی تازەو ڕاوێژکاری تایبەت‌و کەسی هەرە نزیکی خۆی لە بەغدا.[٣]

---

١ المصدر نفسه.
٢ تأريخ الادب في ايران ص: ٥٦٤، المغول ص: ١٨١.
٣ قصة التتار ص: ١٦٩.

مەسیحیەکان بە ڕووخانی بەغداو نەمانی دەوڵەتی عەباسی شادیان گێڕاو هەلهەلەی سەرکەوتنیان بۆ (هۆلاکۆ)و (دوقوزخاتوون)ی هاوسەرە مەسیحیەکەی لێ دەداو حیسابی (قوستەنتین‌و هێلینا)یان بۆ دەکردن‌و دەیانگوت ئەم دوانە هەر دەڵێی خودا ناردوونی تا تۆڵە لە دوژمنەکانی مەسیح بکەنەوە.[١] بەڵام شادی‌و خۆشی مەسیحیەکان زۆر درێژەی نەکێشاو هێندەی نەخایاند موسڵمانان بە سەرکردایەتی (سیف الدین قطن)و لە ساڵی ٦٥٨کۆچیداو لە جەنگی (عەین جالوت)دا تەتارە پشت‌و پەنایەکانی ئەوانیان تێکوپێك شکاندن، بە ئیزنی خودا لەمەولا باسی لێوە دەکرێ.

### ٥ـ قاهیرە دەبێتە پایتەختی خیلافەت:

ڕوخانی بەغداو نەمانی دەوڵەتی عەباسی کاریگەری گەورەی لەسەر دڵ‌و هەناوی موسڵمانان دانا، نەبوونی (خەلیفە)یەك‌و خاڵی بوونی جێگەو پێگە بەرزو ڕوحانیەکەی بۆشاییەکی گەورەی لەبەر چاوان دروست کرد، کاتێك (ظاهر بیبرس)ی سوڵتانی دەوڵەتی (مەمالیك) چووە سەر تەختی سەڵتەنەتی (میسر) گەڕاگەڕا تا یەکێکی لە ئەندامانی بنەماڵەی (عەباسی) دۆزیەوەو لە ساڵی ٦٥٩ك/١٢٦٠ز یداو لە میسر کردی بە (خەلیفە)، بەم شێوەیە سەرلەنوێ خیلافەتی عەباسی لە (میسر) سەری هەڵدایەوەو هەمان شێوە دەسەڵاتە ڕوحی‌و مەعنەویەکەی پێشدای لە (قاهیرە) بۆ گێڕدرایەوەو چالاکیە سیاسی‌و ڕۆشنبیریەکانیش بۆ و ولاتە گوازرانەوە، (ظاهر بیبرس) بە مەبەستی وەرگرتنی سیفەتی شەرعی بۆ دەوڵەتەکەی‌و فراوانکردنی دەسەڵاتی لەڕێی (خەلیفە) — بەو ئیعتیبارەی پارێزەری ئاینە — هەستا خیلافەتی عەباسی لە (میسر)دا زیندوو کردەوە،[٢] ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە تا ساڵی ٩٢٣ك/١٥١٧ز لە وڵاتی میسردا بەرقەرار بوو، لەو ساڵەدا سوڵتان سەلیمی عوسمانی دەستی بەسەردا گرت‌و خیلافەتی عەباسی هەڵوەشاندەوەو جارێکی تر مەڵبەندی خیلافەت لە (قاهیرە)وە بۆ (قوستەنتینیە)ی پایتەختی عوسمانیەکان گوازرایەوە.[٣]

### ٦ـ تەشەنەکردنی شیعەگەری:

ڕوخانی بەغدا کاریگەری زۆری لەسەر بڵاوبوونەوەی شیعەگەری دانا، وەکو زانراوە خیلافەتی عەباسی سوننە مەزەب لە سەردەمانی خۆیدا سەرکوتی شیعەگەری دەکردو لە

---

١ المغول للصیاد ص: ١٨٢، تاریخ الحروب الصلیبیة ٣/٥٢٢.
٢ النظم الاسلامیة ص: ١٣٠، حسن ابراهیم حسن.
٣ المغول للصیاد ص: ٢٨٣.

ناوچەکانی (ئێران)و شوێنانی تریش سنوورێکی لەبەردەم بڵاوبوونەوەی مەزەبی ناوبراودا دانابوو، بەڵام لەگەڵ لەنێوچوونی خیلافەتی عەباسیو لە ئەنجامی زیادبوونی دەسەڵاتی پیاوانی شیعە لەنێو نێوەندەکانی حکومەتی مەغۆلیدا وەکو (نصیرالدین الطوسي)ی ڕاوێژکاری (هۆلاکۆ)و (مؤیدالدین العلقمي)ی وەزیری پێشدای خەلیفەو حوکمداری (مەغۆل)ی (بەغدا) دوای ڕوخانی، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو شیعەگەری لەو ناوچانەدا تەشەنەی کردو بڵاوبۆوە.

وێڕای ئەمەش ئەو مەسیحیانەی لە داگیرکردنی (بەغدا)و ڕوخانی دەوڵەتی عەباسیدا پشتیوانی (هۆلاکۆ)یان کرد دەسەڵاتی زۆریان پێدراو لەسەر حیسابی موسڵمانانی ئەو ناوچانە پۆستی بەرزو باڵایان وەرگرتن، بە تایبەتیش (دوقوزخاتوون)ی هاوسەری (هۆلاکۆ) (مەسیحی نەستوری) بوو و هەستو سۆزی لە بەرامبەر مەسیحیەکانی خۆرهەڵات دەبزواو لە لای (هۆلاکۆ)ی هاوسەری کاری بۆ دەکردنو پلەو پایەی بەرز دەکردنەوە.[1]

**٧ـ تەقینەوەی وزەی ئوممەت (قانونی بەرەنگاربوونەوە):**

ئوممەت هەستی کرد مەترسیەکی گەورە یەخەی ئاینو ئیمانەکەی گرتووە، لەبەر ئەمە خۆی بۆ تۆڵە سەندنەوە لە مەغۆلەکان سازدایەوەو لە گۆڕەپانی (عەین جالووت)داو بە سەرکردایەتی (سیف الدین قطز) بەرەنگاریان بۆوەو- تێکوپێکی شکاندن -، ئەوەی جێی سەرنجە: ئەم جەنگە هەر لە خۆڕاو لە ئەنجامی دەست بەتاڵیو بێ کاری ڕووی نەدا، لە جەنگی (بەغدا) جودا نەبوو، چونکە بەس دوو ساڵ کەوتبووە نێوانیانەوەو ئەم دوو ساڵە سەردەمی وەستانو تێوەڕامانو ئاشتیو سازش نەبوو، نەخێر، بەڵکو هەموو جەنگەکان ئەڵقەی زنجیرێکی نەپساو بوونو جەنگی (عەین جالووت)یش بەرهەمێکی سروشتیو ئەنجامی جەنگەکانی پێشوو بوو و بەس، چونکە ئەم جەنگە زەبرێکی کورچوبڕ بوو بۆ تەتەرەکانو دوای ئەوە بە ڕاوەستاویو پێ چەسپاوی نەمانەوە،[2] هەروەها ڕێگەی چوونە (عەین جالووت) هەروا ئاسانو سادە نەبوو، بەڵکو هەزاران شەهیدی ڕێگەی خودا کە بۆ ئەوێ بەڕێکەوتن توسکاییەك ئومێدی سەرکەوتنو دەربازبوونیان لە هۆشدا نەبوو، بەڵام بە خاتری ئەوە نموونەیەکی بەرزی ئازایەتی نیان بدەنو، ببنە پێشەنگی وەچەی دوای خۆیانو، بە ئومێدی ئەوەش بە بەڵگەوە بە لیقای پەروەرگار بگەن، ڕێگەی شەهادتیان هەڵبژارد،[3] لەمەولا بە ئیزنی خودا باسی لێوە دەکرێ.

---

١ جهاد المماليك ص: ٦٤.

٢ نحو رؤية جديدة للتأريخ الاسلامي ص: ١٤٨، د. عبدالعظيم.

٣ المصدر نفسه ص: ١٥٤.

**٨ــ لەدایك بوونی (عوسمانی یەکەم)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ٦٥٦ك:**

هاوکات لەگەڵ ڕوخانی دەوڵەتی عەباسی لە ساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز، (عوسمان)ی کوڕی (توغرول)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (عوسمانی) لەدایك بوو، ئوممەت بەهۆی گوناهو تاوانەکانی خۆیەوە لاواز بوو و ئەم کارەساتە سامناکەی بەسەرهات و مەغۆلەکان بەسەریدا زاڵ بوون و شەرەف و ناموسی لێ هەتك کردن و خوێنی ڕشتن و خەڵکی زۆری لێ کوشتن و سەروەت و سامانی لێ تالآن کردن و شارو ئاوەدانیەکانی لێ وێران کردن، بەڵێ، لەنێو ئەم دارو پەردوە ڕوخاوو خوێنەڕژاوو لاشە هەنجن هەنجن کراوەی ئوممەتدا (عوسمان)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (عوسمانی) لەدایك بوو، ئەمە خۆی لە خۆیدا واتایەکی ناسك و پڕشنگدارە لەسەر ئەمە: ئەگەرچی ئوممەت گەیشتۆتە دواخاڵی لاوازی و زەبوونی و دەستەپاچەیی، بەڵام دەبێ لێرەدا هەنگاو هەڵێنێتەوەو دەست بەخۆ داڕشتن و چەقاندنەوەی پایەکانی دەسەڵات بکاتەوەو هەموو کەوتنێك دەبێت هەستانەوەیەکی بەدوادا بێت، ئەم واتا ناسك و پڕشنگدارە یەکێکە لە حیکمەت و خواست و ویستەکانی خودای کاربەجێ، خودای بەرز دەفەرموێت:

﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾﴾ (القصص: ٤)، واتە: (فیرعەون لەسەر خاك ــ ی میسر ــ ڕۆزی دەسەڵاتی لێدەدا، خەڵکی ئەوێی کردبووە تاقم تاقم، تاقمەیەکی ئەو خەڵکەی ــ کە بەنو ئیسرائیلی بوون ــ دەچەوساندەوە، نێرەوەزەکانی لێ دەکوشتن، مێیەکانی دەهێشتنەوە، ئەو ــ فیرعەونە ــ لە ڕیزی خراپەکاران بوو).

هەروەها خودای پاك و بەرز فەرمووی: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (القصص: ٥ــ٦)، واتە: (ویستمان چاکەی خۆمان لە بەرامبەر ئەو چەوساوانەی نێو ئەو وڵاتە بنوێنین و بیانکەین بە پێشەوای خەڵك و میراتگری دەسەڵاتی فیرعەون و لەسەر زەمینیشدا دەسەڵاتدارو پێ چەسپاویان بکەین).

لەدایك بوونی (موسا) علیه السلام موژدەی دەستپێکردنی ڕزگاربوون و دەسەڵاتدار بوونی بەنی ئیسرائیلی دا، هەرچەندە خودای باڵادەست دەتوانێ لە ماوەی نێوان چێشتەنگاو و خۆرئاوابوونێکدا دەسەڵات بە بەندەکانی خۆی بدا، بەڵکو لە ماوەی چاوتروکانێکدا دەتوانێ

ئەمە بکا، بەڵام خودا دەیەوێت ئێمە ڕێبازە شەرعیەکانو سوننەتە کەونیەکان بناسینو حیسابیان بۆ بکەینو دان بەخۆدابگرینو لەسەر ئاینەکەی خودا بمێنینەوە، هەر کاتێکیش خودا خواستی لەسەر هاتنەوەی شتێك بوو ئەوا هۆکارەکانی هەنگاو بە هەنگاو و بە ڕیز — نەك بە یەکجار — بۆ دەرەخسێنیو دەسازێنێ، هەر بە لەدایکبوونی (عوسمانی) سەرکردە لە ساڵی ڕوخانی دەوڵەتی عەباسیدا، پایەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی (عوسمانی) سەریان لە خاك دەرهێناو بەپێگەیشتنی ئەو دەوڵەتەکەش دامەزرا.[١]

## ٩ـ هەڵوێستی شاعیران لە بەرامبەر ڕوخانی (بەغدا):

ئەم کارەساتە گەورە دڵو دەروونی تەواوی موسڵمانانی هەژاند، شاعیران لەم نێوەدا لە هەموو لایەك زیاتر دڵو دەروونیان هەژا، لەبەر ئەمە دەستیان بە هۆنینەوەی هۆنراوەی خەفەتاوی کردو وێنای ئەو واقیعە تفتو تاڵەیان دەکرد کە بەسەر ئیسلامو دەوڵەتەکەیاندا هاتبوو: لەنێو ئەم شاعیرانەدا:

أـ تقي الدين ی کوڕی أبی اليسر: ئەو بەم شێوازە بەسەر بەغدا هەڵدەڵێ:

لسائل الدمع عن بغدادَ أخبار — فما وقوفك والأحباب قد ساروا
يا زائرين الى الزوراء لاتَفِدوا — فما بذاك الحِمى والدّار ديّارُ
تاج الخلافة والربع الذي شرُفت — به المعالم قد عفّاه إقفار
أضحى لعصف البِلى في ربعه اثر — وللدموع على الآثار آثار[٢]
يا نار قلبي من نار لحرب وغى — شبت عليه ووافي الرّبع اعصار
علا الصليب على اعلى منابرها — وقام بالأمر من يحويه زنّار
وكم حريم سبته الترك غاصبة — وكان من دون ذاك الستر أستار
وكم بدور على البدرية إنخسفت؟ — ولم يعُد لبدور منه إبدار
وكم ذخائر أضحت وهي شائعة — من النهاب وقد حازته كفار
وكم حدودٍ أقيمت من سيوفهم — على الرقاب وحطّت فيه أوزار
ناديت والسّبْيُ مهتوك تجرّهم — الى السفاح من الأعداء دعّار[٣]

---

١ الدولة العثمانية للصلابي ص: ٤٧.
٢ شذرات الذهب ٧/٤٦٩.
٣ المصدر نفسه ٧/٤٧٠.

ب ـ شمس الدين الكوفي الواعظ: ئەویش دەڵێ:

عـــنـــدي لأجـــل فـــراقـــكـم آلام ... فـــإلام أعـــذل فـــيـــكـــم وألام
من كـان مثـلـي لـلـحـبـيـب مفـارقـاً ... لاتـــعـــذلـــوه فـــالـكـلام كـــلام
نـعـم الـمـسـاعـد دمـعـي الجاري على ... خـــديّ إلا انـــه نـمّـام
ويذيـب روحـي نـوْح كل حمامـة ... فـكأنـما نـوح الـحـمـام حِـمَـام
ان كـنـت مـثـلـي لـلأحـبـة فـاقـداً ... أو فـي فـؤادك لـوعـة وغـرام
قـف فـي دار الـظـاعـنـين ونـادهـمـا ... يـادار مـا صـنـعـت بـك الأيـام
أعـرضـت عـنـك لأنـهـم مـذ أعـرضـوا ... لـم يـبـق في بـشـاشـة تُـشَـام
يـادار أيـن زمـان ربـعـك مـونـقـاً ... وشـعـارك الإجـلال والإكـرام
يـادار مـذ أفـلـت نـجـومـك عـمّـنـا ... والله مـن بـعـد الـضـيـاء ظـلام
فـلـبـعـدهـم قَـرُب الـردى ولـفـقـدهـم ... فُـقـد الـهـدى وتـزلـزل الإسـلام
فـمـتـى قـبـلـت مـن الأعـادي سـاكـنـا ... بـعـد الأحـبـة لا سـقـاك غـمـام
يـاسـادتـي امـا الـفـؤاد فـشـيّـق ... قَـلِـق وأمـا أدمـعـي فَـسِـجـام
والـدار مـذ عـدمـت جـمـال وجـوهـكـم ... لـم يـبـق فـي ذاك الـمـقـام مُـقـام
لاحـظ فـيـهـا لـلـعـيـون ... ولـيـس للأقـدام في عـرصـاتـها إقـدام

تا دەڵێ:

يـا غـائـبـين وفـي الـفـؤاد لـبـعـدهـم ... نـار لـهـا بـين الـضـلـوع ضـرام
لا كُـتْـبِـكـم تـأتـي ولا أخـبـاركـم ... تـروى ولا تُـدنـيـكـم الأحـلام
أقـصـتْـكُـم الـدنـيـا عـلـيّ وكـلـمـا ... جَـدَّ الـنـوى لَـعِـبَـت بـي الأسـقـام
ولـقـيـت مـن صـرف الـزمـان وجـوره ... مـالـم تُـخَـيِّـلـه لِـيَ الأوهـام
يـا لـيـتَ شـعـري كـيـف حـال أحـبـتي ... وبـأي أرض خـيّـمـوا وأقـامـوا
مـالـي أنـيـس غـير بـيـت قـالـه ... صَـبٌّ رمـتـه مـن الـفـراق سـهـام
ولله مـا اخـتـرت الـفـراق وإنـمـا ... حـكـمـت عـلـيّ بـذلـك الأيـام[1]

جگە لە شاعیرانی عەرەب شاعیرانی ناعەرەبیش بەشداری ئەم خەفەتو ناسۆرەیان کردووەو بە سۆزەوەشیعری ناسکیان بەسەر بەغداو خیلافەتو خەلیفەدا هەڵگوتوون، (سعدی شیرازی) گەورە شاعیری فارس کە لەو سەردەمەدا لە شاری (شیراز) ژیاوەو لە

[1] أصداء الغزو المغولي، مأمون جرّار ص: ١٤٦.

گۆڕەپانی جەنگ دوور بووە، بەڵام وەکو تیغی ڕەسەن خۆی لە کالان ڕانەگرتووەو بە فارسی هۆنراوەیەکی پڕ سۆزو خرۆشی بەسەر (المستعصم)ی خەلیفەدا هەڵگوتووەو لە ماوەی شیعرەکەیدا داخو خەفەتی خۆی لە بەرامبەر لەنێوچوونی خیلافەتی عەباسیدا دەربڕیوەو دەڵێ:

هەقە ئاسمان فرمێسکی خوێن بەسەر زەویدا بڕێژێ

لە سوێی موستەعسەمو خیلافەتەکەی بخرۆشێتو بەژێ

بە هەمان شێوەو سەبارەت بەم بابەتە هۆنراوەیەکی تری - کە بە هۆنراوە هەرە جوانەکانی دادەنرێ - بە زمانی عەرەبی نووسیوە، هەروەکو ئەوە ئەو بەم دوو هۆنراوەیەی ویستبێتی بە جیهانی نیشان بدا کە خیلافەتی عەباسی هی هەموو موسڵمانان بووە چ عەرەب چ فارس و هەروەها، ئەو بە عەرەبی ئاوا دەڵێ:

حبست بجفنيّ المدامع لاتجري

فلما طغى الماء إستطال على السكر

نسيم صبا بغداد بعد خرابها

تمنيت لو كانت تمر على قبري[1]

---

[1] المغول في التاريخ ص: ٢٨٦.

# فەسڵی سێیەم

# بەرپابوونی دەوڵەتی (مەمالیك)

## باسی یەکەم: بنەچەکەی مەمالیك و چۆنیەتی پێگەیشتنیان

### یەکەم: (مەمالیك) کێن؟

(مەمالیك) وشەیەکی عەرەبیەو لە کوردیدا بە واتای (کۆیلەکان) دێت و کۆی وشەی (مملوك= کۆیلە)یە. (مەمالیك): لە ڕستەی ئەو کۆیلانە بوون کە لە سەردەمانی کۆمەڵگا دێرینەکاندا کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکراو لە کاری هەمەجۆردا ڕۆڵیان پێ دەگێڕان، بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی دەوڵەتی (ئەمەوی)یدا کۆیلە تورکەکان لە خزمەتی سەربازیدا بەکارهێنران، (طبري) بۆمان باس دەکا: کە (نصری کوڕی سیار)ی والی ئەمەوی لە خۆراسان (١٠٠٠) کۆیلەی تورکی کڕین و چەك و ئەسپی پێدان،[١] وڵاتی (ئەودیو ڕووبار) سەرچاوەی سەرەکی کۆیلەی تورك بوو،[٢] لەو سەردەمەدا ئەم کۆیلانە جگە لە خزمەتی سەربازی لە زۆرینەی کاروبارەکانی تری دەوڵەتیشدا کاریان پێ سپێردرابوو،[٣] فرۆشگاکانی کۆیلەی سپی لەنیوەدوورگەی (قەرم)و وڵاتانی (قەوقاز)و (قەفقاج)و ئاسیای بچووك)و (تورکستان)و (ئەودیو ڕووبار) بەرفراوان کران، لەنێو ئەم کۆیلانەدا ڕەگەزەکانی (تورك و شەراکیسەو ڕۆم و کوردو ئەورووپیش) بەرچا دەکەوتن.[٤]

خەلیفە (المعتصم)ی عەباسی (٢١٨ـ٢٢٧ك/٨٣٣ـ٨٤٢ز) یەکەم کەس بوو فیرقەی سەربازی گەورەی لێ دروست کردوون و لەجێی ئەو عەرەبانەدا ناوی تۆمار کردن کە ناوی لە تۆماری سەربازیدا سڕیبوونەوە،[٥] ژمارەی کۆیلەکانی (موعتەسەم) گەیشتبووە دەیان هەزارو بەغدای لێ پڕکردبوون و سەری کێشابوو بۆ ئەوە لەسەر ڕێگاوبانەکان لەگەڵ خەڵك

---

١ تأريخ الطبري، عصر الدولة الاموية، نقلا عن بيت المقدس د. النقر ص: ٤٧.

٢ تأريخ بيت المقدس في العصر المملوكي،د. النقر ص: ٤٧.

٣ تأريخ المغول والمماليك ص: ٦١ـ٦٢، تأريخ بيت المقدس ص: ٤٧.

٤ المصدر نفسه ص: ٦١.

٥ تأريخ بيت المقدس ص: ٤٧.

دەرگیردەبوونو دەرەنجام تورەیی‌و ناڕەزایی دانیشتوانی شاری لێکەوتەوە، (موعتەسەم)یش شاری (سامەڕا)ی بۆ دروست کردن‌و کردی بە پایتەختی ئەوان‌و بارەگای سوپا تورکەکەی – کە لە کۆیلەو ئازادان پێکهاتبوو –،[1] ئەو ئەم سوپایەی بە مەبەستی ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی سیاسی‌و سەربازی فارسی‌و عەرەبی بەکارهێنا، دەستی بە کڕین‌و ڕاهێنان‌و سازدانی کۆیلەی تورك کرد، ئەو پێی وابوو ئەم تورکانە وەکو فارسەکان چاو نابڕنە پۆستە بالاکانی دەسەڵات‌و وەکو عەرەبەکانیش دەمارگیر نین،[2] بەڵام هێندەی پێ نەچوو کۆیلەکان دەستیان لە کاروبارەکانی دەوڵەت وەردەداو کار بەوە گەیشت چیان بویستبایەو بەدڵیان بوایە دەیانکرد،[3] لەو کاتەوە خەلیفە (المتوکل) لە ساڵی ٢٤٧ك/٨٦١ز کوژرا، (خەلیفە) لەبەر دەستی ئەواندا دەست بەسەر بوو و وەکو گیراوی لێ هاتبوو، بە کەیفی خۆیان لە خەلیفایەتیان دەخست یان دەیانکوشت،[4] بەم شێوەیە ئەم سەربازە کۆیلانە لە دژی (خەلیفە) وەکو تاقمێکی هەڵگەڕاوەیان لێهاتبوو، کاروبارەکانی ئیدارەو حکومەتیان تێکدابوو، دەرەنجام هەموو هەرێمەکان لە دەورەی پایتەخت تەکینەوە، هاوکات لەگەڵ دەستەپاچەبوونی خەلیفەو سەرهەڵدانی تەماعی سەربەخۆبوون لە لای هەرێمەکان زۆر ئاسایی بوو دەسەڵاتی تورکەکان لە خیلافەتی عەباسیدا زیاد بکات، سوپاو سەرکردە سەربازیەکانیشیان بوونە ئامرازێکی باشی دەستی خەلیفەکان بۆ سەرکوتکردن‌و کۆتایی پێهێنانی بزوتنەوە سەربەخۆ خوازەکان، لەبەر ئەمە کۆیلە تورکەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گرنگی زیاتریان پێدراو کار بەوە گەیشت خەڵکانی والی‌و وەزیرو دەوڵەتداریان لێ دروست بوون.[5]

لە سەردەمی خیلافەتی عەباسی یەکەمدا، وشەی (مەمالیك) زاراوەیەکی تایبەت بوو بەکارهێنانی لەسەر ئەو تاقمە کۆیلە سپیە کورت هەڵاتبوو کە لە بازاڕەکانی کۆیلە فرۆشیدا دەکڕدران‌و پاشان لە فیرقەی سەربازی تایبەتدا خزمەتیان پێ دەکرا، لەگەڵ لاوازبوونی دەسەڵاتی عەباسی لەسەردەمی خیلافەتی عەباسی دووەمدا: زۆرشتێکی ئاسایی‌و سروشتی بوو پێویستی زۆریان بە کۆیلە تورکەکان هەبێ، لە لایەکی ترەوە ئەو دەوڵەتۆچکانەی لە

---

١ قيام دولة المماليك الأولى في مصر والشام ص: ١٢.
٢ تأريخ المغول والمماليك، مجموعة من المؤلفين ص: ٦٢.
٣ كتاب الروضتين في أخبار الدولتين، نقلا عن تأريخ المغول والمماليك ص: ٦٢.
٤ الفخري في الاداب السلطانية لإبن طباطبا ص: ٢٢٠.
٥ تأريخ المغول والمماليك ص: ٦٢.

جەستەی خیلافەتی عەباسی بوونەوە وەکو (تۆلۆنیو ئەخشەدیەکان لە میسر،[١] سەفاریو سامانیەکان لە خۆراسانو[٢] دەوروبەری، غەزنەو غۆرییەکان لە هیند)[٣] ئەمانە هەموویان لە پێناوی بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان دەستیان بە کڕینی ئەم کۆیلە سپیە تورکانە کرد، لەگەڵ دەرکەوتنی سلجوقیەکان لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، بە حوکمی ئەوە بۆ خۆیان ڕەگەزێکی (تورك) بوونو پشتیشیان بە تورکە کۆیلەکان بەست، ئەوا دەسەڵاتی تورکەکان بە شێوەیەکی گشتی زیادی کرد.[٤]

(نظام الملك)ی گەورە وەزیری (ئەلب ئەرسەلان)و (مەلیك شای) سوڵتانی سلجوقی کتێبێکی بە ناوی (سیاسەتنامە) داناوەو بە یەکەمین کەس دادەنرێ بناغەی بەرنامەی پەروەردەو ڕاهێنانی بۆ کۆیلەکان دانابێ، لە کتێبی (سیاسەتنامە)دا هاتووە: لە حاڵەتی زۆر پێویستدا نەبێ، نابێ کۆیلەکان گرانایی خزمەتیان بخرێتە سەرشانو لەبەر خۆرەتاو ڕابگیرێن، پێویستە فێربکرێنو ڕابهێنرێن، هەروەکو چۆن بە خێرایی بڵاوەکێنە دەکەن، ئاواش بە پەلە کۆببنەوە، هەر هەموو ڕۆژێك پێویست بەوە ناکات فەرمانیان بەسەردا نوێ بکرێتەوەو داوای ئیشیان لێ بکرێتەوە وەکو تەواوی کۆیلە کارمەندەکانی: ئاوگێڕ، سەربازو وێنەی ئەمان، هەروەها وەکو ئەو کۆیلانەی لە خزمەت دەرگاوانەکانو گەورە میرەکانن، پێویستە پێیان بگوترێ هەر ڕۆژە ژمارەیەکیان ئامادەی خزمەت بن، لە تایبەتەکانیش ژمارەیەکی دیاریکراویان ئامادە بن، سوڵتان چەند کۆیلەیەکی منداڵی هەن، دەبێ چینێکی تایبەت لە خۆیان بەسەردا بکرێتە چاودێرو لەنێو ئەمانیشدا نەقیب هەبێ.[٥]

ئەمەو نیزامولمولکی وەزیری (مەلیکشا)ی سوڵتانی سلجوقی کۆیلەکانی ڕێکخستنو لە هەموو کەس زیاتر مشوری لێ دەخواردن، سوپایەکی گەورەی لێ سازدابوونو بۆ هەر شوێنێك چووبایە دەورەیان دەدا، ئەم سوپایە بە (کۆیلەکانی نیزامی) — واتە بە ناوی خۆیەوە — ناوی دەرکردبوو و دەوڵەتەکەی خۆی پێ بەهێز کردبوو.[٦]

---

١ المواعظ والاعتبار للمقريزي، نقلا عن تاريخ بيت المقدس ص: ٨٤.
٢ تأريخ ايران بعد الاسلام، عباس اقبال ص: ٩٧_١٦٧.
٣ تاريخ بيت المقدس ص: ٨٤.
٤ المصدر نفسه ص: ٨٤.
٥ دولة آل سلجوق لأصفهاني ص: ١١٣، تأريخ المغول والترك ص: ٦٥.
٦ دولة آل سلجوق لأصفهاني ص: ٧٦، تأريخ المغول والترك ص: ٦٦.

هەروەها (نیزامولمولك) یەكەمین كەس بوو زەوی‌و كەرتی كشتوكاڵی بەسەر كۆیلە توركەكاندا دابەشكرد، پێش ئەمە پارەو هەق دەستیان دەدرایە،[١] بەم شێوەیە زەوی‌و ناوچەی فراوانیان دەخرایە بەردەست‌و دەبوایە ئاوەدانیان كردبایەوەو پەنێویان هێنابایە، بەمەش هێندەی تر سەروەت‌و سامان زیاد دەبوو و دەوڵەتیش بەهێز دەبوو، دوای ئەوەش سەركردە سەربازیەكانی كۆیلەكان ژمارەیەك قەڵاو شارو هەرێمیان گرتن بەمە ناوی (ئەتابەك) — واتە میروبەگ — یان لێنران،[٢] شایانی باسە یەكەم كەس ناسناوی (ئەتابەك)ی وەرگرت (نیزامولمولك)ی وەزیر بوو، كاتێك لە ساڵی ٤٦٥دا سوڵتان (مەلیكشا) هەڵسوڕاندنی كاروباری دەوڵەتی خستە بەردەست ئەم ناسناوەشی پێ بەخشی،[٣] هەروەها سلجوقیەكان ژمارەیەك كۆیلەی خوێندەوارو زیرەكیان هەڵدەبژاردن‌و لە كۆشكەكانی خۆیاندا دایان دەنان‌و كاروباری پەروەردەو خوێندنی منداڵەكانیان پێ دەسپاردن‌و لە كرێی ئەمەو خزمەتی سەربازیان لە كاتی جەنگەكاندا هەرێمی گەورەو فراوانیان پێ دەبەخشین، بەڵام هێندەی نەخایاند ئەم ئەتابەكانە بوونە دەسەڵاتداری فیعلی هەرێمەكانی ژێردەستیان، بە تایبەتیش كاتێك دەوڵەت لاوازبوو و لێكهەڵوەشا، ئەمان هەریەكە لە ڕاستی خۆیەوە بەرەبەرە بوو بە خاوەن‌و كوێخای ئەو هەرێمەی لەبەر دەستیدایەو[٤] چەند دەوڵەتۆچكەیەكی بچووكیان لە جەستەی دەوڵەتی سلجوقی كردنەوەو بە ناوی دەوڵەتی (ئەتابەكە)وە ناسران، (عمادالدین زەنگی) بەهێزترینی ئەو ئەتابەكانە بوو و دەوڵەتێكی دامەزراند كە (موسڵ‌و حەلەب‌و دیاربەبیعە)ی لەخۆگرتبوو،[٥] دوای مردنی (عمادالدین)، (نورالدین محمود)ی كوڕی جێگەی گرتەوەو دەوڵەتەكەی فراوانتر كردو دەستی بەسەر (دیمەشق)یشدا گرت‌و دوایەش كۆتایی بە دەوڵەتی (فاتیمیەكان) هێناو دەرەنجام وڵاتی میسریش خرایە چوارچێوەی دەوڵەتی (زەنگی)یەوە، لە كتێبی (عصر الدولة الزنكية)دا قسەی زۆرم لەسەر (عماالدین‌و نورالدین)ی كوڕی كردووە، (نورالدین محمود) ژمارەیەكی زۆری لە كۆیلە توركەكان كڕین‌و زۆرینەی سوپای دەوڵەتی (زەنكی)یان لێ پێكهات،[٦] (ئەییوبیەكان)یش بە دوای (زەنگی)یەكاندا هاتن‌و هێندەی تریان كۆیلە كڕین‌و خستیاننە خزمەتی سەربازیەوە، شیاوی ئاماژە پێكردنە زۆربەی

---

١ تأريخ المغول والترك ص: ٦٦.

٢ صبح الأعشى ٤/١٨، تأريخ المغول والترك ص: ٦٦.

٣ اخبار الدولة السلجوقية ص: ١٦٩، ١٩٧، تأريخ المغول والترك ص: ٦٦.

٤ تأريخ المغول والترك ص: ٦٦.

٥ تاريخ بيت المقدس ص: ٤٩.

٦ المصدر نفسه ص: ٤٩.

پێکهاتەی ئەو سوپایەی لە لایەن (أسدالدین شێرکۆ)وە سەرکردایەتی کراو وڵاتی (میسر)ی پێ گیرا، بریتی بوون لە (مەمالیك و میرانی نوریه)،[١] بەم شێوەیە کۆیلەکانی (صلاح الدین) بە (مەمالیکی سەلاحی)و کۆیلەکانی (أسد الدین شێرکۆ)ش بە (مەمالیکی ئەسەدی) ناسرابوون، لە سەردەمی (مەمالیك عادل)یشدا کۆیلەکان (مەمالیکی عادلی)یان پێ دەگوترا، کاتێکیش (مەلیك عادل) وەفاتی کردو کورەکانی لەجێی دانیشتن، هەر تاقمە کۆیلە بەناوی کورێکیانەوە ناویان دەهێنرا وەکو (مەمالیکی ئەشرەفی)و (مەمالیکی عادلی)و هەروەها.[٢]

أ ـ نجم الدین أیوب و مەمالیك:

دەگوترێ (سوڵتان مەلیك صالح نجم الدینی أیوبی) چەند پێکهاتەیەکی تازەی هێزی سەربازی خستە نێو سوپای ئەییوبییەوەو لە پێناوی بەهێزکردنیدا چەند هەنگاوو نەخشەیەکی سەربازی هەڵێناون: گرنگترینی ئەو هەنگاوانە: زۆری بایەخ بە کڕینی کۆیلەی تورك داو بە جۆرێك پێش ئەو لە دەسەڵاتی ئەیوبییدا هێندەی بایەخ پێ نەدرابوو، ئەو لە ماوەی دەسەڵاتی خۆیداو بە یەك کەڕەت ژمارەی (١٠٠٠) کۆیلەی لە هەرێمی تورکستان (خوارەزم)و ناوچەکانی باکووری دەریای ڕەش و دەریای قەزوین و شوێنی تریش هێناون و خستنیە ریزی سوپاکەی خۆیەوە.[٣]

کار بەوە گەیشت لەسەردەمی (مەلیك صالح)دا ڕەگەزی تورك لەنێو سوپای ئەیوبییدا بووە زۆرینەیەکی بەرچاوو خێرا چەند یەکەیەکی سەربازی سیاسیان لێ دروست بوو و هەموو ئەمانەش، دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر وەفاتی (مەلیك صالح)دا گۆڕانی بۆ (دەوڵەتی مەمالیکی بەحری)و پاشان تەواوی ڕەگەزەکانی تری وەکو (بەربەرو سودان) بەرەبەرە لەنێو سوپای ئەیوبییدا لەبەر ئاپۆڕای کۆیلەکان نەدەدیتران. گرنگترین نیشانەکانی گەشەپێدانی پەیکەری سوپای ئەیوبی لە سەردەمی سوڵتان مەلیك صالح (نجم الدینی ئەیوبی)دا:

أ‌- الصالحیة: صالحیە: بریتی بوو لەو هێزە سەربازە تازەی ئەیوبی کە (مەلیك صالح) لە کۆیلە تورکەکانی دروست کردبوو، دواتر بە ناوی (بەحری = دەریایی)یەوە ناسران و پاشانیش بۆ ماوەی دوو سەدەو نیو ڕۆڵی گرنگی خۆیان لەمێژووی پڕ ترسناکی (میسر)دا گێڕا.

---

١ کتاب الروضتین ١/١٥٥، تأریخ المغول والترك ص: ٦٨.

٢ تأریخ المغول والترك ص: ٦٩.

٣ الملك الصالح وانجازاته السیاسیة اولعسکریة ص: ١٠٩.

(إبن تغري بردى) له (إبن واصل)ى مێژوونووسى ئەيوبيەكان دەگێڕێتەوە: (مەليك صالح) هێندەى كۆيلەى توركى كڕين بە چەشنێك كەسێك لە بنەماڵەكەى هێندەى نەكڕيبن، زۆرينەى سوپاكەى خۆى لەو كۆيلانە (مەماليك) دروست كردو بەسەر هەموو ڕەگەزەكانيدا هەڵبژاردن بەڵكو بەسەر ڕەگەزى (كورد)يشيدا هەڵبژاردن،[1] وەكو ديارە (صالح) بەم كارەى ويستوويەتى لە بەرامبەر ئەوەدا كاتێك چووە سەر تەختى سەڵتەنەت كۆيلەكان پشتيوانيان لێكردو سوپاسيان بكاتو وەفادارى خۆى لە بەرامبەرياندا بنوێنێ، لەبەر ئەمەو پاش ئەوە ناپاكى لە لايەن ڕەگەزەكانى ترى سوپاوە لە بەرامبەر ئەنجام درا، هەستا هێزێكى بەهێزو تۆكمەى سەربازى لەم كۆيلانە دروست كردو بۆ سەپاندنى ويستو خواستەكانىو بڕيارەكانى خۆى بەسەر تەواوى هەرێمەكانى دەوڵەتى ئەيوبيدا پشتى پێ دەبەستو بەسەر تەواوى پێكهاتەكانى تريدا هەڵدەبژاردن.[2]

سەبارەت بە هۆكارى ناوى ئەم هێزە سەربازيە بە (بەحرى=دەريايى) چەند ڕايەك هەن:

- ڕاى يەكەم: هۆيەكەى دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە كە (مەليك صالح) ئەم فيرقە سەربازيەى لە دوورگەيەكى سەر دەرياى نيل بە ناوى دوورگەى (روضة) جێگير كردو قشڵەيەكى گەورەى سەربازيشى بۆ دروست كردن، زۆربەى كۆيلەكانيش بريتى بوون لە توركە هێنراوەكانى وڵاتى (قەفقاج)ى باكوورى دەرياى ڕەشو وڵاتى (قەوقان)ى نزيك دەرياى (قەزوێن)، توركە قەفقاجيەكان بە جوانى بە ژنو بالاو دەمو چاوو چەلەنگىو ئازايەتى شازو دەگمەن لە تەواوى توركەكانى تر جيادەكرانەوە، ئەمە وێڕاى ئەوە كە زۆر پابەندى گەورەى خۆيان دەبوون، ئەمانە بوونە كاكڵەى سوپاى ئەيوبىو چەندين هێزى چاكو پارتيزانو گورزوەشێنى چاكيان لێ دروست بوون، لە ئەنجامى ئەوەدا سوڵتان متمانەى پێ بوونو بە دڵنياييەوە پشتى پێ دەبەستو پلەوپايەى بەرزى سەربازى لە سوپادا پێ دەبەخشين، وەكو ئەو پلە بەرزەى دابووى بە پێشەنگى كۆيلەكان (ركن الدين بيربس)، بێگومان (ركن الدين بيربس) ڕۆڵێكى گرنگو كاريگەرى گێڕا لە سەرخستنى (مەليك صالح) بۆ چوونە سەر كورسى سەڵتەنەتو دواى ئەوەش سەرخستنى بەسەر دوژمنانى خاچپەرستو فەرەنگيدا لە تەواوى جەنگەكاندا، بە تايبەتيش جەنگى (المنصورة).[3]

---

١ المصدر نفسه ص: ١١٠.
٢ المصدر نفسه ص: ١١٠.
٣ المصدر نفسه ص: ١١٠.

ب - قشڵەی (مەمالیکی صالحیە) لە دورگەی (الروضة)دا:

(مەلیك صالح) بنکەیەکی سەربازی بە ناوی (قەڵای جزیرە) یان (قەڵای ڕەوزە) لە دوورگەی (روضة)ی سەر دەریای (نیل) بۆ کۆیلەکانی خۆی کردبۆوەو کردبوویە بارەگای سەرەکی ئەوان، ئەمەو لە ماوەی دوو ساڵی ٦٣٧و ٦٣٨ کۆچی/١٢٣٩و ١٢٤٠زایینیدا بناغەی قشڵەکەی لێداو تەواویشی کرد، بە خاتری پتەوکردن و فراوانکردنی ژمارەیەکی زۆری خانوبەرەو کۆشك و تەلارو مزگەوتی لە ئاوەدانی پێشدای دورگەکەدا ڕوخاندن و لە چوارچێوەی دروستکردنی ئەم قشڵەو قەڵایەدا خانوبەرەی زۆری دروست کردن، (٥٠) بورج و (منارە)ی بەرزکردنەوە، مزگەوتێکی گەورەی تێدا کردەوە، لەنێو حەوشەکەیدا جۆرەها دارودرەختی چاند، پڕی کرد لە چەك و هەموو جۆرە ئامرازەکانی جەنگ و تەواوی پێویستیەکانی وەك کۆت و زنجیرو ئازوخەو خۆراك، (مەلیك صالح) خودی خۆی سەرپەرشتی بیناکردنی ئەم قەڵاو قشڵە گەورەی کردو، پارەو پوولێکی زۆری لێ خەرج کرد، ئەم کارەی لە پێناوی ئەوەدا بوو بارەگای خۆی لە (قەڵای چیاکان) بۆ (قەڵای ڕەزوە) بگوازێتەوەو لەگەڵ کۆیلەکانی دەریای (المماليك البحريه)ی خۆیدا نیشتەجێ بێ.[١]

ج - ئایا سوڵتان مەلیك صالح نجم الدینی ئەیوبی یەکەم کەس بوو ناوی (بەحری) لەهێزی سەربازی کۆیلەکانی خۆی نابێ؟

زۆربەی مێژوونووسانی کۆن و نوێ هاودەنگن لەسەر ئەوە کە (مەلیك صالح) یەکەمین کەس بووە (مەمالیکی بەحری) ڕێکخستبێ و ناوی (بەحری) بەسەردا بڕیبێ، چونکە دەریای (نیل) لە دورگەی (ڕەوزە)دا دەورەی قشڵەو قەڵا سەربازیەکانی ئەو کۆیلانەی دابوو.

بەڵام لەبەر ئەم چەند هۆیانە ئەم ڕایە بێ بنەمایە:

-مێژوونووسانی هاوچەرخی مەلیك صالحی ئەیوبی سەبارەت بە وشەی (بەحری) هیچ ئاماژەیەکیان بە دەریای (نیل) نەداوە، بەڵکو دواتر هەندێك مێژوونووسی وەکو (المقريزي)و (أبي المحاسن) ناوی (نیل)یان ورووژاندووە.[٢]

-وەکو زانراوە (فاتیمیەکان) پێش ئەمە چەند پۆلە سەربازێکیان هەبوون و بە ناوی (الغز البحرية) ناسرابوون، بە هەمان شێوە (سوڵتان عادلی یەکەم)ی باپیری (مەلیك صالح)یش تیپێکی سەربازی هەبوو و ناوی (البحرية العادلية)ی لێنابوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە (مەلیك صالح) یەکەمین کەس نەبووە ئەم زاراوەی داهێنابێ.

---

١ الملك الصالح وانجازاته السياسية اولعسكرية ص: ١١٤.

٢ في التأريخ الأيوبي والمملوكي، أحمد مختار ص: ٨٥.

-(الخزرجی) دەگێڕێتەوە: سوڵتان نورالدین عمری کوڕی رسولْ ی (یەمەن) کە لە ساڵی (٦٤٧)ك مردووەو هاوچەرخی مەلیك صالحی ئەیوبی (میسر) بووە، (مەمالیکی بەحری) زۆر هەبوون‌و ژمارەیان گەیشتبووە (١٠٠٠) ئەسپ سوارو ئەو ئەسپ سواری‌و تیرهاوێژیەی ئەمان دەیانزانی (مەمالیکی میسر) نەیاندەزانی. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە زاراوەی (بەحری) لە وڵاتی ئیسلامی وادا بەکارهێنراوە کە زۆر لە دەریای (نیل)ەوە دوور بووە.[1]

-مێژوونووسە عەرەبە هاوچەرخەکان ناوی هەندێك فیرقەی سەربازی مەسیحی ــ کە لە ئەورووپاوە بەرەو شام هاتبوون ــ بە (فەرەنگی بەحری خۆرئاوایی) دێنن، (أبو شامە) دەگێڕێتەوە لە ساڵی ٥٩٣کۆچیدا مەلیك عادل (یافا)ی گرت، لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی پێم گەیشتووە: دەڵێن (٤٠) سوارەی (فەرەنگی بەحری) لەنێو قەڵاکەدا مابوونەوە، کاتێك قەڵاکە کونکراو گیرا، ئەوان چوونە نێو کەنیسەکەوەو دەرگاکەیان لەسەر داخستت‌و بە شمشێرەکانیان دەستیان بە لێدانی یەکتر کرد، موسڵمانەکان دەرگاکەیان شکاندو ئەوانەی بە زیندوویی مابوونەوە خۆیان بە دەستەوە نەدەدا، ناچار هەموویان کوشتن‌و سەریان لەم کارەی ئەو (فەرەنگیە بەحریانە) سوڕما.[2] کەواتە کاتێك (مەلیك صالح) فیرقە بەحریەکەی دامەزراند زاراوەی (بەحری) بە لای میسریەکانەوە شتێکی تازە نەبوو بەڵکو زاراوەیەکی گشتی بوو و مەسیحیەکان‌و موسڵمانەکان وەکو یەك بۆ یەکە سەربازیەکانیان بەکاریان دێناو هەروەك چۆن زاراوەکە لە میسرو دەرەوەی میسریش پێش هاتنی سەردەمی (مەلیك صالح) باوبووە، ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە کە پاڵدانی فیرقە بەحریەکە بۆ دەریای (نیل) شتێکی ناڕاست بێت، ڕای بەهێزتر ئەوەیە کە ئەم کۆیلانە لە پشت ڕووبارەوە هاتوون بۆیە بەم ناوەوە ناسراون،[3] (جوانفیل) کە جەنگاوەرێکی مەسیحی بووەو لە هێرشەکەی (لویسی نۆهەم)دا لە بەرامبەر (مەمالیکی بەحری)دا جەنگاوەو پاشانیش لە لایەن ئەوانەوە دیل کراوە، دەربارەی ئەم (کۆیلە دەریایی)یانە قسەی کردووە — کە بێگومان بە حوکمی ئەوە پیاوێکی هاوچەرخی ئەوان بووەو بە چاوی خۆی واقیعی ئەوانی بینیوە — گێڕانەوەکەی بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو دەڵێ: (مەمالیکی بەحری) سەردەمی (ئەیوبیەکان)و (مەمالیك) بریتی بوون لە کۆمەڵە ئاوارەیەکی هێنراو و کڕدراو لە بازاڕەکانی کۆیلەفرۆشی (قەوقان)و (ئاسیای بچووك)و لە (کەنارە ئاوەکانی دەریای ڕەش)دا بەرەو دەریای (قەڕم)

---

١ الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة للصلابي ص: ٣٤١.

٢ في التأريخ الأيوبي والمملوكي ص: ٨٦.

٣ المصدر نفسه ص: ٨٦.

لەوێشەوە بەرەو کەنداوی (قوستەنتینیە)و لەوێشرا بەرەو (دەریای سپی نێوەڕاست) هێنراونو ئینجا لە بەندەری (ئەسکەندەریە) یان (دمیاط) گیرساونەوە، بێگومان: دەستەواژەکەی (جوانفیل) دەبێتە بەڵگەی ئەم ڕایەی دوایە.[١]

## دووەم: سیستەمی پەروەردەو فێرکردنو مەشق پێکردنی (مەمالیك):

(مەلیك صالحی ئەیوبی)و – میرەکانی دوای خۆی – وەکو کۆیلە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ (مەمالیك)دا نەدەکرد، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، وەکو ڕۆڵەکانی خۆیان لە خۆیان نزیك دەکردنەوە، پەیوەندی نێوانیان هەرگیز وەکو پەیوەندی نێوان گەورەو بەندە (سەیدو عەبد) نەبوو، بەڵکو وەکو پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی، یان باوكو کوڕ یان سەرۆك خێزانو ئەندامانی خێزانەکەی بوو... هەروەها، بێگومان هەموو ئەم پەیوەندیانە لەسەر بناغەی خۆشەویستی ڕادەوەستێن نەك تۆبزیو زۆرداری، کار بەوە گەیشتبوو هەر کەسێك لەوان (ئەییوبیان) ئەم کۆیلانەی بکڕیبانایە پێی دەگوترا (ئوستاد= مامۆستا) نەك سەیدو گەورە،[٢] کۆیلە دەبوایە (٣) قۆناغ ببڕێت ئینجا لە فێربوونو پەروەردەو مەشقو ڕاهێنان دەبۆوە:

١- قۆناغی یەکەم: لە منداڵیەوە تا تەمەنی باڵغ بوون بە جۆرێك لەسەر ویستو خواستی مەلیكو سوڵتانەکان دەبوایە کۆیلەی منداڵ بکڕدرێنو بهێنرێن، ئینجا بەپێی ڕەگەزەکانیان بەسەر چینەکانی قەلادا دابەش دەکرانو دەخرانە ژێر چاودێری دەزگایەکی ئیداری بەهێزو پتەوی تایبەت بە پەروەردەو فێرکردنو ئامادەسازی سەربازی، ئەم دەزگایە پێکهاتبوو لە کۆمەڵە کارمەندێکی شارەزای تایبەت بە کاروباری سوپاو نەتەوەکانی خۆیانو ئاینی ئیسلامی پیرۆز،[٣] پێشەکیو لە قۆناغی یەکەمدا کۆیلەکان فێری خوێندنی قورئانی پیرۆز دەکران، هەر تاقمەیەك لەم کۆیلانە ڕۆژانە مەلایەك دەهاتە لایانو فێری قورئانو خۆشنووسیو ئادابی ئیسلامیو نوێژو زیکرەکانی دەکردن،[٤] هەروەها هەر لە چوارچێوەی پەیڕەو و پرۆگرامی تایبەت بەم قۆناغە ماوەیەك بۆ یاریو گەمە تەرخان کرابوو و ئەم لایەنەش گرنگی پێدرابوو، بە سەرپەرشتی مامۆستاکانیان دەبوایە نوێژەکان لە کاتەکانی خۆیانداو بە ڕاستو دروستیو بێ کەموکوڕی ئەنجام بدەن، تا لە منداڵیەوە باری پێوە بگرنو لە لایەن ببێتە (مەلەکە)یەكو هەرگیز دەستبەرداری نەبن، زیکرە تایبەتەکانیان پێ

---

١ المصدر نفسه ص: ٨٧.

٢ قصة التتار من البداية الى عين جالوت ص: ٢١٤.

٣ الحملات الصليبية، للصلابي ص: ٣٣٨.

٤ المصدر نفسه ص: ٣٤٠.

لەبەردەکردن تا لە کاتەکانی خۆیاندا بیانخوێننو خۆیان لەسەر ڕێنماییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕابێنن، کە گەورەش بوون بە نرخترینو خۆشەویستترین شتێك بە لایانەوە ئاینو ڕەوشتە جوانەکان بێ.[1]

ئەو مامۆستایانەی سەرپەرشتی پەروەردەو فێرکردنی کۆیلەکانیان دەکرد بەپێی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) قورئانیان ڕاڤە دەکردو لە ژێر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا فێری عەقیدەو ئیمانی ساغو سەلیمیان دەکردنو ئاراستەیان دەکردن تا بەبیروبۆچوونو تێڕوانینێکی گونجاو بۆ خودای بالادەست بڕوانن.

ئەو لایەنە گرنگانەی پەروەردەی ئاینی گرنگی پێدابوو:

–خودا جل جلالە: لە هەموو کەموکوڕیەك بەرییەو خاوەنی سیفەتە تەواوە بێ سنوورەکانەو تاكو تەنهاو بێ هاوەڵەو بێ هاوسەرو بێ ڕۆڵەیە؟

–خودا سبحانە وتعالی دروستکەرو خاوەنی هەموو شتێکەو هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانیەتی: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ﴾ (الاعراف: ٢٤).

–سەخاوەتی خودای تەعالا سەرچاوەی هەموو نازونیعمەتە وردو درشتو دیارو نادیارەکانی ئەم بوونەوەرەیە: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ (النحل: ٥٣).

–زانستی خودا دەورەی هەموو شتێکی داوە، هیچ شتێك لە زەمینو ئاسمانەکاندا لای ئەو پەنهان نیە: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ﴾ (الطلاق: ١٢).

–خودای پاكو بێگەرد بە هۆی فریشتەکانیەوە گوفتارو ڕەفتارەکانی مرۆڤ لە کتێبێکدا تۆمار دەکاتو بچووكو گەورە دەژمێردرێتو جێ ناهێڵرێت، ئەم کتێبە لە کاتو شوێنی خۆیدا دەدرێتەوە دەست خاوەنەکەیو پێی دەگوترێ بیخوێنەوە: ﴿مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ۚ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا﴾ (الکهف: ٤٩).

–خودا جل جلالە بەندەکانی خۆی بە ناخۆشی تاقی دەکاتەوەو هەیانە بە قەزاو قەدەری خودا ڕازی دەبێتو بەڕواڵەتو لە ناخەوە تەسلیم دەبێتو دەرەنجام شایستەی خیلافەتو ئیمامەتو سەروەرایەتی دەبێت، هەشە تورە دەبێتو دەرەنجام چ حیسابێکی بۆ ناکرێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (الملك: ٢).

---

١ أباطيل يجب ان تمحى ص: ٣٣٩، خطط المقريزي ٣/ ٣٤٦.

—خودای گەورە: هەر کەسێك پەنای بۆ بەرێت و لەوەی بەسەری هاتووەو بەسەری دێت بە حوکمی ئەو بەڕێوە بچێت پشتیوانی لێ دەکات و سەری دەخات: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾ (الاعراف: ١٩٦).

—خودای پاك و بێگەرد نێوەڕۆکی ئەم خودا بە یەکگرتن و جۆرە بەندایەتیەی لە قورئانی پیرۆزدا دارشتووە، بێگومان پەروەردەکردن و ڕاهێنانی تاکەکانی ئوممەت لەسەر واتا ئیمانیەکان و تێڕوانینە ڕاست و دروستەکان بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت لە هۆشیارکردنەوەو ڕاپەڕاندنی ئوممەتدا، بۆیە هەر تاکێکی ئەم ئوممەتە پێویستە زوو زوو ئەم واتا پیرۆزو بەرچاو ڕوونیانەی بەبیربخرێنەوەو فێریان بێتەوەو خۆی لەسەریان پەروەردە بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی ئەم لایەنانەی دوپات دەکردنەوەو بە مەبەستی گەردنکەچ بوونی دڵیان و ساغ و سەلامەت بوونی ڕۆحیان و خاوێن بوونی دەروونیان لەڕێی هەردووك کتێبی خوێنراوە (قورئان) و کتێبی بینراو (بوونەوەر)ەوە چاو و دڵ و مێشکی دەکردنەوەو بەمە تێڕوانینێکی ساف و ڕوونیان لە بەرامبەر نێوەڕۆکی بە هەق ناسین و جوان پەرستی خودا (ألوهية)دا بۆ دروست دەبوو.[1]

پێغەمبەر (ﷺ) بایەخی بە چاندنی درەختی چارەنووس و هەڵکردنی مەشخەڵی ڕێگەی ڕزگاری لە دڵ و دەروونی هاوەڵانیدا، چونکە هەر کەسێك ئامانج بناسێت و ڕێگە بزانێت هەموو هێزی خۆی و کەرەستەی پێویست بەکاردەخات، پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەیە ڕۆشنایی لەسەر ئەم لایەنانە چڕدەکردەوە:

—ئەم دونیایە هەرچەندە درێژخایەن بێت هەر بەرەو لەنێوچوون دەچێت، نازونیعمەتەکانی هەرچەند گەورە بن، هەر کەم و هیچ و پوچن: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَـٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَـٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَـٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَـٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ (یونس: ٢٤)، ﴿قُلْ مَتَـٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ﴾ (النساء: ٧٧).

---

١ منهج الرسول في غرس الروح الجهادية، د. سيد نوح ص: ١٠ـ١٦.

–هەموو خەڵك بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، لەسەر کردەوەکانیان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، پاشان لە بەهەشت یان لە دۆزەخ جێگیر دەکرێن: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى﴾ (القيامة: ٣٦).

–نازونیعمەتو خۆشیەکانی بەهەشت هەموو ناڕەحەتیو تاڵو تفتیەکانی دونیا لەبیر بەهەشتیان دەبەنەوە، سزای ئاگریش هەموو خۆشیو شیرناتیەکانی دونیا لەبیر دۆزەخیان دەبەنەوە: ﴿أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ٢٠٥ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ٢٠٦ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ٢٠٧﴾ (الشعراء: ٢٠٥ــ٢٠٧)، ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ﴾ (الحاقة: ٢٤).

–خەڵك دوای لەنێوچوونی دونیا بەچەند قۆناغێکی دوورودرێژو سەختو دژواردا تێدەپەڕن، ئینجا بە بەهەشت یان بە دۆزەخ دەگەن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢﴾ (الحج: ١ــ٢)، ﴿فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ١٧ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦۚ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَفۡعُولًا ١٨﴾ (المزمل: ١٧ــ١٨).

–دەربازبوون لە قۆناغە سەختەکانی قیامەتو ئاگری دۆزەخو گەیشتن بە بەهەشت،[1] بەهۆی ئیمانو ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانو مسۆگەرکردنی ڕەزامەندی خودایە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ١١﴾ (البروج:١١).

–پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام بەبیر هاوەڵەکانی دێنیایەوە کە ڕۆڵی ئەوان لەسەر ئەم زەویەدا چەند بایەخدارەو پەیامەکەیان چەندە ڕێزدارەو پلەو پایەی ئەوانیش لە لای خودای بەرز چەند شکۆدارە، بەم شێوازە پەروەردەیەکی هێند ڕێکوپێکی کردن، بەوپەڕی گەرموگوڕیو چوستو چالاکیو دڵی قایمەوە هاتنە نێو گۆڕەپانی خەباتەوەو شەو و ڕۆژ هەدایان نەداو بەسەر هەموو کۆسپەکانی تەمبەڵیو دڵەڕاوکێو ترسو تەماعدا زاڵ بوونو بەوپەڕی تواناو ئازایەتیانەوەو لەپێناوی بەدەستهێنانی بەختەوەری دونیاو سەرفرازی

---

[1] منهج الرسول صلى الله عليه وسلم ص: ١٩ــ٣٤.

قیامەت چاکی مەردایەتیان لێ کرد بەلاداو ڕۆڵی خۆیان لە گەیاندنو پەخشکردنی پەیامی پیرۆزی ئیسلام بە جیهاندا گێڕا.[1]

بێگومان لە دوا سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیدا، مامۆستایانی کۆیلەکان بایەخێکی گەورەیان بە پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامی دەدا، قۆناغ بە قۆناغ فێری خوێندنی قورئانی پیرۆزو فەرموودەو چۆنیەتی پاکو خاوێن ڕاگرتنی دڵو دەروونیان دەکردنو تا دەرەنجام کەسانێکی کاملو تەواویان لە ڕووی ئیمانو ئەقڵەوە لێ دەردەچوو و دەیانتوانی تەواوی ئەرکەکانی جیهادو پاراستنی سنوورەکانی ئیسلامو پەلاماردانی دوژمنان بەخۆبگرن، ئەم پەروەردە ئیسلامیە ڕەوشتگەلێکی جوانی لە دڵو دەرووندا شەتڵ کردن، وەکو: (دڵسۆزیوئارامیو پشت بە خودا بەستنو زۆر پاڕانەوە لە خوداو خۆڕاگریو ترسان لە خوداو ....هتد)، بەم شێوەیە مندالانو لاوانی (مەمالیك) لەسەر ئەم پەروەردە ئیسلامیە نایابە گۆشکرانوشارەزاییەکی باشیشیان لە فیقهی ئیسلامیدا پەیدا کرد، هەر لەبەر ئەمەش بوو (مەمالیك) لە درێژایی سەردەمی حوکمڕانی خۆیاندا ئایینی ئیسلامیان لە هەموو شتێك بە پیرۆزترو گەورەتر دادەنا، جێگەو پێگەی زانایانیش لە لای ئەوان بەرزترین مەقامی هەبوو، ئەمەی گوتمان بوو بە یەکێك لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی ڕاپەڕینی ڕۆشنبیریو زانستی شارستانیانەی پێشکەوتووی سەردەمەکەیان.

٢ـ قۆناغی دووەم: لە تەمەنی باڵغ بووندا دەستی پێ دەکرد، هونەرەکانی جەنگیان لە: (تیراندازیو شەڕەنێزەو شیربازیو ئەسپ سواری)یان فێردەکران، لەم قۆناغەدا توندوتیژی بەکاردەهێنراو هەڵەو پەڵە قبوڵ نەدەکران، هەر کۆیلەیەك تاوانێکی بێ دینی یان بێ ڕەوشتی لێ دەرکەوتبایە سزایەکی توندی دەدرا، ئینجا بەسەر چەند (پۆل)ێکدا پۆلێن دەکران، هەر پۆلە ڕاهێنەرێکی تایبەتی وەرزشیو سەربازی سەرپەرشتی دەکردن، لە بواری وەرزشدا لەسەر مەلەوانیو ڕاکردنی ماوەدرێژو زۆرانبازیو تۆپ تۆپێنەی بە پێوەو بەسواری ڕاهێنانیان پێ دەکرا، لە کاتی پشوو و دەست بەتاڵیدا هەر یەکێك لەمانە خۆی بە هیوایەتی تایبەتی خۆی زانستی یان ئەدەبی یان ئایینی خەریك دەکرد، لێرەدا ئەو ڕازە دەرك دەکەینو وەڵامی ئەو پرسیارە وەردەگرین کە بۆچی ژمارەیەکی زۆری (مەمالیك) لە ڕیزی زانایانو شاعیرانو نووسەرانی گەورەدا دەبینین،[2] چەند کەسێك بۆ خزمەتکردنیان تەرخان

---

[1] المصدر نفسه ص: ٣٧.

[2] أباطيل يجب ان تمحى من التأريخ ص: ٣٤٠.

کرابوون، چەند گەورەیەکیشیان بە سەرەوە دانرابوون و ئەرکی پشکنین و لێکۆڵینەوەیان پێ سپێردرابوو، لەسەر وردو درشتی ڕەفتارو گوفتارەکانیان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکردن، ئەگەر مامۆستا یان ڕاهێنەر دیبای یەك لە کۆیلەکان تاوانێکی کردووە یان بەسەر یەکێك لە ئادابەکانی دین یان دنیایدا بازدابێ، ئەوا بە گوێرەی تاوانەکەی سزای دەدا، بەم شێوەیە لەنێو خودی مەمالیکدا خەڵکانێك دروست بوون، بوونە (سید)و بە (مامۆستا) ناسرابوون و سەرپەرشتی کاروباری (مەمالیك)یان دەکرد، ژمارەیەك سەرکردەی قارەمانیش لە ڕێی خودادا دەجەنگان، سیاسەتمەدارانێکیش هەبوون خولق و خوی جوانیان لە بەرامبەر جەماوەردا دەنواندو سام و هەیبەتیشیان لە بەرامبەر ستەمکارو سنوور بەزێنان نیشان دەدا.[١]

٣ـ قۆناغی سێهەم: قۆناغی زانینی بەهرە سەربازیەکان و ئاشکرابوونی ئاراستەو توانا سیاسیەکان بوو، بە خاتری زانینی ئەندازەی شارەزایی هونەری سەربازی نێو ڕیزەکانیان زۆرانبازییان لەنێوان خۆیانیاندا پێ دەکرا، ئینجا بۆ تاقی کردنەوەی یەکجاری بەرەو گۆڕەپانەکانی جەنگ دەنێردران و هەرە سەرکەوتووەکانیان لە کۆیلایەتی ڕزگاریان دەبوو ئازادییان بە خەڵات پێ دەبەخشرا، هەشیان بوو لەگەڵ ئەوەدا خاوەن پۆست و پایەش بوو بەڵام هەر بە کۆیلەیی دەمانەوە، وێنەی ئەو کۆیلانەی سوڵتانی زانایان (عزالدینی کوڕی عبدالسلام) فرۆشتنی و پاشان ئازادی کردن و بەهاکەشیانی خستە نێو بەیتولمالەوە، پێشدا هەندێك ئەرکی بچووك و سووکی سەربازیان پێ دەسپێردرا، بەرەبەرە کۆیلە پلەی سەربازی وەردەگرتن تا دەگەیشتە پۆستی (ئەمیر)ی و لە لایەن سوڵتانەوە ئەم ناسناوەی بەسەردا دەبڕا، لە پلەوپایەش بەرەو ژوور دەڕۆیشت تا دەرەنجام دەگەیشەت پۆستە باڵاکانی دەوڵەت، زۆرجار (کۆیلە) بە هۆی بەهرەو هەڵکەوتوویی و شایستەیی خۆی دەگەیشتە پۆستەی سەڵتەنەت و سەرۆکایەتی دەوڵەت.[٢] بە فەزڵی خودای باڵادەست و ئەم پەروەردە نایابە کەسانێکی وا مەزنیان تێدا دروست بوون کە مێژوو پاڵەوانێتی و ئازایەتی ئەوانەی بە زیندوویی هێشتۆتەوەو هەموو کارە شکۆدارو پڕ بەرەکەتەکانی لە لاپەڕەکانی خۆیدا تۆمار کردوون کە خۆیان لە بەگژداچوونەوەو پوچەڵکردنەوەی پرۆسەی مەغۆل و ڕیشەکێش کردنی قەوارەی خاچپەرستان لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەبیننەوە، (بروکلمان) سەبارەت بە (مەمالیك)

١ الخطط ٢/٢١٣ـ٢١٤، في التأريخ الأيوبي والمملوكي ص: ٨٤.

٢ مصر في عهد بناة القاهرة، ص: ١٦٩ ومابعدها، ابراهيم شعوط.

دەنوسێ: چۆن دوو سەردەمی (ڕەشید)و (صلاح الدین) بە سەردەمانی زێڕین دەژمێردرێن، بە هەمان شێوەش سەردەمی (بیبرس)یش بە سەردەمی زێڕین دێتە هەژمار.[1]

٤ـ بەرنامەی خواردنو پۆشاكو پشوو: پەروەردەو فێركردنی كۆیلەكان بە گوێرەی بەرنامەیەكی ڕێكوپێك بەڕێوەدەچوو، ئەوان بە هیچ كلۆجێك بۆیان نەبوو لە بارەگاكانیان دەرچن، بە تایبەتی لە شەواندا، دەبوایە هەفتانە ڕۆژێك گەرماویان كردبایە، خواردنیان بریتی بوو لە: گۆشتو چێشتو میوەو حەڵواو پاقلەی كوڵاو و خواردەمەنی تریش، پۆشاكی پەشمینو بە نرخیان پێ دەدرا، مانگانە موچەیەكی كەمیان بۆ بڕابۆوە كە خۆی لە (٣) یان (١٠) دینار دەدا،[2] خودی سوڵتان سەردانی دەكردنو لە جۆری خواردەمەنیو شتەكانی تریانی دەكۆڵیەوە، لە سەردەمی سوڵتان (بەرقوق)ەوە ڕێگە بە (مەمالیك)ەكانی قاهیرە دەدرا لە قەلا بێنە دەرەوەو لە دەرەوە شەو بەسەر بەرن، كار بەوە گەیشت (قەلا) تەنها وەكو شوێنی خوێندنو پەروەردە سەیر بكەن، (مەقریزی) ئەمەی بە خاڵێكی لاواز لەسەر (مەمالیك) تێبینی كردووەو دەڵێ: ئەم چوونە دەرەوەیان وای لێكردن كلتوری پەروەردەو فێربوونی قەلایان لەبیر بچێتەوەو تووشی دەست بەتاڵیو بێ كاری بنو دەستیان بە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری كرد، دەرەنجام (مەمالیك) بە خراپترینو پەسترینی خەڵك دەرچوون.[3]

٥ـ سیستەمی دەرچوونو كۆتایی خوێندن:

ماوەی خوێندن لە قەلادا (١٤) تا (١٥) مانگی دەخایاند، هەندێك جار چەند ساڵی دەخایاند، هەركات كۆیلە لە خوێندن دەبۆوە، بە تەواوەتی ئازاد دەكراو بە ئامادەبوونی سوڵتانو میرەكان ئاهەنگێكی تایبەتی بۆ ساز دەكراو بڕوانامەیەكی بە ناوی (بڕوانامەی ئازاد بوون)ی پێ دەدرا،[4] چەكێكو ئەسپێكو پۆشاكێكی تایبەتو پارچە زەویەكی پێشكەش دەكرا، لەو كاتەدا بە كۆیلە دەگوترا (ئازاد)و بە ئازادكەرەكەی دەگوترا (ئوستاد= مامۆستا)و بە تەواوی ئەو و هاوەڵە ئازادەكانیشی دەگوترا (خەشداشیە).[5]

---

١ تأريخ الشعوب الاسلامية، نقلا عن أباطيل يجب ان تمحى ص: ٣٤١.
٢ الخطط ٣/٣٤٨، دولة المماليك سمير فراج ص: ٣٢.
٣ دولة المماليك سمير فراج ص: ٣٢.
٤ المصدر نفسه ص: ٣٢.
٥ خشداش: بە واتای هاوەڵی خزمەتكردن دێت، شاگرد.

کۆیلە دەرچووەکان پۆل پۆل دەکران، هەر پۆلە سەرپەرشتکارێکی بە ناوی (باش) یان (نەقیب)ەوە بە سەرەوە دادەنرا، هەندێکیشیان خۆیان دەگەیاندە پۆستی (میرایەتی)، میرایەتی: بریتی بوو لەو پۆستەی ڕێکخستن‌و ئامادەسازی ئەرکە مەزنەکانی حوکمڕانی نێو فەرمانڕەوایەتی یان سوپای لە ئەستۆی خۆی دەگرت، دەبوایە کۆیلە هەموو پلەکان ببڕێ ئینجا پلەی میرایەتی بەدەست دەهێنا، تا خۆی بە ڕەوشتە ڕەندو جوانەکان‌و تەواوی ئادابەکان نەڕازاندبایەو خۆی بە ڕەنگ‌و ڕووی موسڵمانەتی نیشان نەدابایەو لە کاروباری سەربازیدا شارەزایی تەواوی پەیدا نەکردبایە نەدەبوو بە (میر)، هەیانبوو پلەی زۆری دەبڕین‌و بەهۆی زۆری زانستیەوە دەگەیشتە پلەی زاناو شەرعزان یان ئەدیب یان شورتەو زابت، بەم شێوەیە خەڵکانێکی هێندە پایە بەرزیان لێ دروست بوون: کە دوایە هەر ئەمانەو بە پلەکانی خۆیان چەند گەورەیەکیان تێدا دروست بوون‌و سەرپەرشتی (مەمالیك)یان دەکردو چەند سەرکردەیەکی سەربازیان تێدا هەڵکەوتن سەرکردایەتی جیهادیان دەکردو ژمارەیەك سیاسەتمەداریان لێ دروست بوون کاروباری حوکمڕانیان گرتە دەست.

٦ـ زمانی (مەمالیك): تورکی بوو: هێندەی وشەی عەرەبی‌و فارسی تێکەڵ کرابوون کە بە تورکی نەدەچوو، ژمارەیەکی زۆری کۆیلەکان بەبێ ئەوەی شارەزاییان لە زمانی عەرەبیدا پەیداکردبێت گەیشتنە پلەو پۆستی سەڵتەنەت‌و حوکمڕانی،[١] لەگەڵ ئەمەشدا زۆرینەیان فێری عەرەبی ببوون‌و دەیانتوانی بە زاراوەی پاراو (فصیح)ی عەرەبی بدوێن، هەندێك لە زاناکانیان چەند بابەتێکی فیقهی قورسیان توێژیونەوە کە زانایان وەکو سەرچاوە بۆیان دەگەڕێنەوە.[٢]

٧ـ پەیوەندی مامۆستایەتی لەنێو (مەمالیك)دا:

بەهێزترین پەیوەندی نێو (کۆیلەکان) بریتی بوو لە: پەیوەندی مامۆستایەتی نێوان مامۆستاو ئەو کۆیلانەی دەیکڕین‌و سەرپەرشتی پەروەردەو خوێندن‌و ڕاهێنانی دەکردن‌و بایەخی تەواوی پێدەدان، بەڵکو لە پێناوی توندو تۆڵکردنی پەیوەندی خۆی بەوانەوەو دەستەبەرکردنی پشتیوانی زیاتری ئەوان بۆ خۆی (مامۆستا) سوور بوو لەسەر ئەوە لەگەڵ ئەوان دانیشێت‌و لەسەر سفرەی خواردن لەگەڵیان کۆببێتەوە، زۆرکات مەلیك مەنسوڕ (قلاون) لە کاتی ئامادەکردن‌و پێدانی بەشە خواردنی بە (مەمالیك) هۆڵی نانخواردنی بەسەر دەکردەوەو چێشت‌و گۆشتەکەی دەپشکنین‌و لە جۆری چاکی‌و خراپیەکەی دەکۆڵیەوە،

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٣.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٣.

ئەگەر عەیبێکی تێدا بەدی بکردبایە لە سەرپەرشتیکارو ئوستادی توند دەکردو بەسەریدا دەشیڕاندن و چ خراپ بوایە ئەوەی بەسەر دێنان و[1] دەیگوت: (بزانن کۆیلەکان لە ماڵ و خانوبەرە جودان، ئێستا من چەند قەڵاو شورەیەکم دروست کردوون، خۆم و ماڵ و منداڵ و موسڵمانانیان پێ دەپارێزم، ئەو قەڵاو شورانە بریتین لە (مەمالیك)، (مەمالیك) لەنێو قەڵاو بارەگای سەربازیدا نیشتەجێ ببوون و لێیان دەرنەدەچوون،[2] ئەم دەقە یەکێك لە پایەکانی دامەزراوەی کۆیلەداریی و پەیوەندی نێوخۆیمان بۆ دەردەخات، دەبینین سوڵتان -بە ڕەسەن کۆیلە بووە- و دەزانێ (مەمالیك) بۆ پاسکردن و پاراستنی کورسی دەسەڵات و بنەماڵەکەی چەندە بایەخدارن و بە قەڵاو شورەیان دەچوێنێ، ئەو بەم ڕەفتارەی ناوی خۆی لەنێو ڕیزی پاشاو حوکمگێڕاندا بە زیندوویی هێشتەوە، لە لایەکی ترەوە، ئەم دەقە هۆکارەکانی هێزی پەیوەندی (مامۆستایەتی) دەردەخات کە پەیوەندی لە نێوان (سەیدو کۆلەکانی)دا پێکەوە بەستۆتەوە، سەیید یان مامۆستا پێویست بووە لەسەری بایەخی تەواویان پێ بدات و خواردن و خواردنەوەو پۆشاك و پارەیان پێ بدات، کۆیلەکانیش پێویست بووە لەسەریان پاسەوانی لێ بکەن و کورسی دەسەڵاتی بپارێزن و بەرگری لە ماڵ و خێزانەکەی بکەن.[3]

٨ـ پەیوەندی (خەشداشیە)= (شاگردی):

بە بەهێزترین پەیوەندی وابەستەیی شەخسی نێو دەوڵەت دادەنرا، لێکدانەوەی ئەمە بەم شێوەیەیە: ئەم کۆیلانە لە تەمەنی منداڵیڕا هێنرابوون و پاشان لە کۆمەڵگا تەریك کرابوون و خرابوونە نێو سەربازگەی نیزامیەوە، تەمەنی منداڵی و هەرزەکارییان بە یەك ئاست بەڕێ دەکرد، بەبێ مامۆستاکانیان نەدەسرەوتن و لەگەڵ کەس - تا خۆبەخۆی یەکتریش- نەدەسازان، لەبەر ئەمە ئەم تاقمە کۆیلانە بە وابەستەیی شەخسی ناسرابوون و هەر تاقمە پاڵ دەدرایە لای ئەو سوڵتانەی کڕیبوونی و پەروەردەی کردبوون، بۆ وێنە (مەمالیکی زاهیری) پاڵ دەدرێنە لای (زاهیر بیبرس)و (مەمالیکی موعیززی) پاڵ دەدرێنە لای (موعیز ئابەك)و (مەمالیکی ناسڕی) پاڵ دەدرێنە لای (ناسرِ محمدی کوڕی قلاون)و هەروەها، لە لایەکی ترەوە، ئەم تاقم تاقمێنەی نێو (مەمالیك) کاریگەری خراپی لێکەوتەوەو لە پێناوی گرتنی جڵەوی حوکمدا ململانێی خوێناوی لەنێودا دروست کردن.[4]

---

١ السلطان المظفر سيف الدين قطز ص: ٤٧، د. قاسم عبده.

٢ الخطط ٢/٢١٣، السلطان المظفر ص: ٤٧.

٣ السلطان المظفر سيف الدين قطز ص: ٤٨.

٤ المصدر نفسه ص: ٥٢.

بێگومان ئەو سوڵتانانەی (مەمالیك)یان لەسەر هەردووك پەروەردەی ئایینیو مەشقی سەربازی پێگەیاندن کارێکی چاكو ڕێکوپێکیان ئەنجامدا، هەر لەبەر ئەمەشە کاتێك لەسەردەمی یەکەمی (مەمالیك)دا ئەم سەربازانە لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا دەبینین، دەبینین کە زۆر گەرمو گوڕو مەردانەو دڵسۆزانە بەرگری لە وڵاتو موقەدەساتی ئیسلامی دەکەن، ئەمە سیمایەکی درەوشاوەی ئەوان بوو،[١] جیاناسا بەریان بە پرۆسەی داگیرکاری مەغۆلی گرتو بوونی خاچپەرستانیان لە جیهانی ئیسلامیدا لە ڕەگو ڕیشە دەرهێنا.

٩ـ ئایا – هەر هەموو کۆیلەکان – هێنرابوونو – کڕدرابوون ـ ؟

ناکرێ واتای زاراوەی (مەمالیك) – کە بە واتای کۆیلەی هێنراوی نێو بازاڕەکانی کۆیلە فرۆشی دێ – بەسەر هەر هەموو (مەمالیك)دا دابڕین، چونکە ئێمە چاك دەزانین چەند تاقمە تورکێك لە بەرامبەر مەغۆلەکاندا بەزینو بەرەو خۆرهەڵاتی نزیك کشانو لە خزمەت سوڵتانەکانی (میسر) گیرسانەوە، هێندەی نەخایاندا وەچەیەکی نوێی حوکمڕان لەنێو ئەم تورکە پەنابەرانە پەیدابوونو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر (میسر)و (سوریا)دا کێشاو تا سەردەمی عوسمانیەکان بەردەوام بوون، هەروەکو دەبینین یەکێکی وەکو سوڵتان (قوتتەن) بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر زنجیرەی بنەماڵەی پاشایەتی مەلیك (خوارەزمشا)و پاڵەوانی جەنگی (عەین جالووت)ی لێ دەرچوو.

ئەم جۆرە خوێندنو پەروەردەو مەشقە نیزامیەی (مەمالیك)ی لێ پێگەیشتن – کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، خوێندنگاو کولێژە سەربازیەکان پێی نەگەیشتوون – پایەگایەکی بەرزی ئەدەبیو ئەخلاقی پێ بەخشینو هەلی بۆ ڕەخساندن تا لە تەواوی بوارەکاندا ئەسپی خۆیان تاوبدەنو خۆیان دەربخەن، دەرەنجام دەرکەوتنیانو سەرکەوتنیان بەخێرو بەرەکەتو هەرزانیو فەرحانی بۆ شکایەوەو زانستو فیکرو هونەر گەشەی کردو بەرهەمی هەرسێك بوارەکە لە جیهانی ئیسلامیدا ڕەنگی دایەوە.[٢]

١٠ کۆلێژە سەربازیە تازەکان:

پێویستە دەوڵەتە عەرەبیو ئیسلامیەکانی ئیمڕۆ چاوێك بە بیروباوەڕی سوپاکانیاندا بخشێننەوەو بەپێی بەرنامەیەکی تۆکمەو تەواو لەسەر:

---

١ المصدر نفسه ص: ٥١.

٢ أباطيل يجب ان تصحح ص: ٣٤١.

بیروباوەڕی ڕاست و دروست و بەندایەتی پاك و پوخت و ڕەوشتی چاك و ڕەندو ئەزموونی جەنگە مێژووییەکانی ئوممەت و فێرکردنی سوننەتە سابتەکانی خودا لەسەر خستن و خستنی گەلاندا گۆشیان بکەن.

لە پێناوی ئەمەدا پێویستە چاوخشاندنەوە بە پەیڕەوو پرۆگرامی خوێندنداو دانەرانی خودی پەیڕەوەکەدا بکرێتەوەو هەرگیزاوهەرگیز تەکنەلۆژیای هاوچەرخ و جەنگی سارد (دەروونی) و گەشەپێدانی چەك و تەقەمەنی و ناسینی نهێنیەکانی فەرامۆش نەکەین و کار بەم ئایەتە پیرۆزە بکەین:

﴿ وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ (الانفال: ٦٠).

١١ـ شێخ (عزالدین عبدالسلام)ی فرۆشیاری میرانی (مەمالیك):

(شێخ عزالدین عبدالسلام) تەماشای کرد: ئەو کۆیلانەی (نجم الدین أیوب) بە پارەی (بەیتولمال) کڕیبوونی و لە دەوڵەتەکەی خۆیدا خستبوونیە نێو خزمەتی سەربازی و کاروبارەکانی تری دەوڵەت، ئێستا ئازادانە مامەڵەی کڕین و فرۆشتن و بازرگانی ئەنجام دەدەن، کە بێگومان ئەوانە بە حوکمی کۆیلەتییان مامەڵەکانیان نادروستە، لەبەر ئەمە سوڵتانی زانایان فتوای دا کە هەر مامەڵەیەك لە لایەن کۆیلەکانەوە ئەنجام دەدرێت پووچەڵە و دانامەزرێ، ئەم فتوایە تەنگی پێ هەڵچنین و نارەحەت بوون، گفتوگۆیەکی توند لەنێو ئەوو کۆیلەکان سەبارەت بەم مەسەلەیە ڕوویدا، شێخ پێی گوتن: ( ئێستا ئێوە کۆیلەن و ناتوانن سەربەخۆ مامەڵە بکەن، ئێوە موڵکی بەیتولماڵەن و دەبێ خێرو بێرتان بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە، من – وەکو قازی وڵات – بڕیارم داوە بتانفرۆشم)، کێشە توند بوو، بەڵام شێخ لەسەر بڕیاری خۆی سوور بوو هەر هەموو مامەڵە و گرێبەستێکی لێ بەهەڵوەشاوە و نادروست دانان، چ کڕین و فرۆشتن بێ چ گرێبەستی هاوسەرگیری (عقد الزواج) بێ، بەم شێوەیە بەرژەوەندیەکانیان پەکیان خراو مەترسی ڕووی تێکردن، (جێگری سوڵتان)یش – کە کۆیلە بوو – لە تووڕەییان هەڵچوو و سوور هەڵگەڕابوو، بەخۆی و هاوشێوەکانی کۆبوونەوەو لە دوای (شێخی قازی)یان نارد، شێخ گوتی: (کۆڕو کۆبوونەوەیەکی گەورەتان بۆ دەبەستین) بە سوودی بەیتولماڵەی موسڵمانان دەتانفرۆشم و ئەوکات بە ڕێبازێکی شەرعی ئازاد دەبن)، کێشەکەیان بۆ لای (سوڵتان) بەرزکردەوە،ئەویش لە دوای شێخی نارد،

بەڵام لە فتواو بڕیارەکەی پاشگەز نەبۆوە، (سوڵتان) وشەیەکی ڕەق و ناشیاو بە مەقامی شێخی لە زار دەرچوو، کە ئەم کارە پەیوەندی بە ئەوەوە نیەو مافی دەستووردان و خۆتێهەڵقورتاندنی نیە،[١] لێرەدا شێخ بۆی دەرکەوت کە ئەهلی ناهەق گەلەکۆمەیان لێکردووەو لە دژی هەق و چەسپاندنی شەریعەت — و جێبەجێکردنی حوکمەکان — کە فەرقی نێوان گەورەو بچووک و حاکم و مەحکوم و سەرۆک و هاووڵاتی ناکەن — ڕاوەستاون: بۆیە لێرەدا پەنای بۆ چەکە بەحیساب لاوازەکەی برد — کە لە نێوەڕۆکدا زۆر بەهێزە —، ئەمەو خۆی لە پۆستی (قەزاوەت= دادوەری) کێشایەوەو بڕیاری بەجێهێشتنی ئەو شارەی دا کە دانیشتوانەکەی سەرپێچی کارو ستەمکارن و ڕاپەڕاندنی شەرعی خودا ڕەت دەکەنەوە، شێخ بە پەلە بڕیارەکەی خۆی ڕاپەڕاندو ماڵەکەی و کەلوپەلەکەی لە پشتی گوێدرێژێك ناو خێزانەکەی لێ سوارکردو خۆیشی سواری گوێدرێژێکی تر بوو و لە (قاهیرە) دەرچوو، هەرکە ئەم هەواڵە لەنێو شاردا بڵاوبۆوە، دانیشتوان بە گەورەو بچووکەوەو ژن و پیاوەوە بە دوای کەوتن، زانایان و صالحان و بازرگانان لەپێش خەڵکەوە بوون و زمانحاڵی ئەوان دەیگوت: (میسر) هیچ خێرو بەرەکەتێکی تێدا نیە ئەگەر شێخ (عزالدین)و هاوڕێنەکانی و ڕاپەڕێنەرانی قورئان و سوننەت و فەرمانکەرانی چاکەو پێشگریکارانی خراپەو خەباتکارانی ڕێبازی خودای تێدا نەبن، ئەمانە لۆمەی لۆمەکاران و جنێوی جنێوفرۆشان خاویان ناکەنەوە، ئەمەو ڕاپۆرتگەلێك سەبارەت بەم مەسەلەیە بۆ سوڵتانی قاهیرە بەرز کرانەوە، کورتەی ڕاپۆرت و وەسیەتەکان ئاوا بوو: (هەر کاتێك — شێخ — ڕۆیشت و بۆی دەرچوو، دەسەڵات و موڵکایەتیت لەنێو دەچێ)، لەبەر ئەمە سوڵتان بە خودی خۆی لێی سوار بوو و خۆی گەیاندە شێخ و داوای لێبوردنی لێکردو دڵو دەروونی دامرکاندەوە، شێخ بەو مەرجە گەڕایەوە ئەگەر هاتەوە دەبێ لە دوای سوڵتان و میرەکانی (میسر) بنێرێت و بیانفرۆشێت، پاش گەڕانەوەی، جێگری سوڵتان جارێکی تر — بەڵام بە نەرم و نیانیەوە — داوای لە شێخ کرد ئەم کارە نەکات، بەڵام (شێخ) ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەهات و گوتی کە دەبێ حوکمی خودایان بەسەردا بچەسپێنێ، لەو کاتەدا جێگری سوڵتان تووڕە بوو و بڕیاری دەرکرد شێخ شەللاق بکات و گوتی: چۆن دەبێ شێخێکی ئاوا بڕیاری فرۆشتنی ئێمەی پاشای سەر زەوی دەرکات، وەڵڵاهی دەبێ لەنێو تاقمەکەی خۆیدا بەم شمشێرەی خۆم لێی بدەم)، بەرەو ماڵی شێخ بەڕێکەوت و شمشێرە سواوەکەشی بەڕووتی بەدەستەوە بوو، لە دەرگایدا، کوڕەکەی شێخ

---

١ صفحات مطوية من حياة سلطان العلماء.

هاتە بەردەرگا، ڕەوانی کار لە کار ترازاوە، بۆ لای باوکی گەڕایەوەو باروودۆخەکەی بۆ باس کرد، شێخ بە دڵی پڕ لە ئیمان و متمانەی تەواوی لەسەر پەروەردگاری بە کوڕەکەی گوت: (ئەی کوڕی خۆم، باوکت زۆر لەوە کەمترە لە ڕێی خودادا بکوژرێ)، کاتێك (جێگری سوڵتان) چاوی بە شێخ کەوت، سام و هەیبەت گرتی و دەستی لەرزین و لینگەفرتەی پێکەوت و کەوتە سەر خاك، گریا، داوای لە شێخ کرد بۆی بپاڕێتەوە، ئینجا گوتی: (ئەی سەروەرم، کام کارت پێ چاکە ئەوە بکە)، شێخ گوتی بانگەوازی خەڵك دەکەم و بە بەرچاوی خەڵکەوە دەتانفرۆشم، جێگری سوڵتان گوتی: نرخەکەمان لە چی سەرف دەکەی؟ شێخ گوتی: لە بەرژەوەندی موسڵماناندا، جێگری سوڵتان گوتی: کێ بەم کارە هەڵدەستێ؟ شێخ گوتی: من ڕایدەپەڕێنم و حوکمی خودا دەچەسپێنم، ئەمەو خودا حوکمی خۆی لەسەر دەستی شێخ ڕاپەڕاندو یەك لە دوای یەك بە ئامادەبوونی خەڵك ناوی دەخوێندنەوەو نرخێکی زۆری لەسەر دانان و فرۆشتنی و پارەکەی بە دەستی خۆی وەرگرت و خستیە نێو پرۆژە خێرخوازیەکانی وڵاتەوە.[1]

لێرەوە شێخ بە (بائع الملوك= فرۆشیاری کۆیلەکان) ناوی دەرکردو ئەم کارەی لەم سەرەوسەری دونیا دەنگی دایەوەو مێژوو هەڵوێستێکی دەگمەن و تاقانەی بۆ تۆمارکرد کە ئێستاشی لەگەڵدابێ جیهان هەڵوێستێکی لەم جۆرەی بەخۆوە نەبینیووە، بەڵێ دەنگی هەق بەرز بۆوەو زانایان عیززەت و دەسەڵاتیان پەیدابوو و شەرعی خودا چەسپێنراو باتڵ (ناهەق) شکستی خواردو تیرو شیری سوڵتەو تەواوی هێزەکانی ماددی لە بەرامبەر سەڵتەنەتی خودای باڵادەست و حوکمەکانی دانەواندن و ئەم فەرموودە پیرۆزەش بەسەر هەقانیەتی سوڵتانی زانایاندا چەسپا: ((أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر))،[2] چاکترین جیهاد: گوتنی وشەیەکی هەق و ڕەقە لە بەرامبەر سوڵتانێکی ستەمکار.

بەم شێوەیە بە پشتیوانی و چاودێری خودای باڵادەست عیززەت و دەسەڵات گەڕایەوە بێشەی خۆی، خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ٣٨﴾ (الحج: ٣٨)، ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (يوسف: ٢١).

---

١ المصدر نفسه.

٢ العز بن عبدالسلام ص: ١٨٢ للزحيلي.

١٢ـ سەردەمی تاقانەکان (عصر الأفذاذ):

(شێخ محمد محمد حسن سرّاب) بە پێودانێکی زانستیانە ناوی (تاقانەکان)ی بەسەردا بڕیون، ئەو دەڵێ: نازانم کێ وشەی (مەمالیك)ی داوەتە پاڵ ئەم سەردەمەو نازانم یەکەمین کەس کێ بووە ئەم ناسناوەی بەسەردا بڕیون، ئەگەر (عەرەب) ئەم ئاوەڵناوەی بەسەردا بڕیبن، ئەوا بە خوا ئەوان سپڵەییان بەرامبەر کەسانێك نواندووە کە خزمەتی ئەوانو وڵاتەکەیانی کردووە، خۆ ئەگەر کاری خۆرئاواییە ئەوروپیەکان بێت، ئەوا با چاك بزانین: کە ئەو دوژمنانە لە کاتی باسکردنی سەردەمە مێژووییەکانماندا بە باشترینو جوانترین شێوە وەسفی خۆیان دەکەنو هەوڵ دەدەن بە ناشیرینترین شێوەش باسی ئێمە بکەن، بۆیە نابێو ناکرێ لاساییان بکەینەوە، خۆرئاواییەکان ڕکیان لە سەردەمی (صلاح الدین)و سەردەمی (تاقانەکان) دەبێتەوە، ناسناوی (مەمالیك= کۆیلەکان) زەمبەو لە ڕکەوە بەکاری دەهێنن، ئەوان بۆیە ڕکیان لەم (تاقانانە) دەبێتەوە، چونکە ئەوان نەیانهێشت خاچپەرستان بە ئامانجەکانیان بگەنو بۆ (قودس) بگەڕێنەوە، چونکە دوای ڕزگارکرانی لە لایەن (صلاح الدین)ەوە خاچپەرستان هەدایان نەداو دوو جاری تر هاتنەوە نێو (قودس)، بەڵام ئەوانەی بە ناوی (مەمالیك) ناسراون بۆیان لەبۆسەدا مانەوەو تەواوی وڵاتیان لێ پاکسازی کردنو دوای تێپەڕینی (١٠٠) ساڵ بەسەر ڕزگارکردنی قودس – لە لایەن صلاح الدینی ئەییوبیەوە – و لە ساڵی ٦٩٠ك/١٢٩١ز یدا دواهەمین مەملەکەتی خاچپەرستانیان لە جیهانی ئیسلامیدا لەنێو برد، بەڵێ هەر ئەوانەی پێیان دەڵێن (کۆیلەکان)، دوابەدوای جەنگی خاچپەرستان گەورەترین هێرشو پەلاماری دڕندانەی مەغۆلەکانیان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لە جەنگی (عەین جالووت) تێکشکاندەوەوجەنگی عەین جالووت بوو بە سونبولی هێزو پێزی ئیسلام..... هەروەها سەردەمی ئەم (تاقانانە) بە یەکێك لە سەردەمەکانی زانستو ڕۆشنبیری دادەنرێت، شوێنەوارە زانستیەکانیانو ئاسەوارە ئەندازەییو هونەریەکانیان شایەدی مێژووی شکۆداری ئەوانن، تەنها لە شاری (قودس)دا (٣٥) خوێندنگاو زانستگایان بۆ تێداخوێندنی زانستە بەسوودەکان کردبوونەوە، ئەمە جگە لەوەی دەیان مزگەوتو کۆشكو تەلارو خانوبەرەی وەقفی خێریان تێدا دروست کردبوون،[١] ئەگەر ئەمانە (کۆیلەکان) بووبن، ئەوا بە ڕای من ئەوانە (کۆیلەکانی) ڕێگای چاکسازی بوون، وەکو شاعیر دەڵێ:

---

١ بیت المقدس والمسجد الأقصى ص: ٤٢٤ـ٤٢٥.

أحسن الى الناس تستعبد قلوبهم فطالما إستعبد الإنسان إحسان

واتە: چاکە لە بەرامبەر خەڵك بکە دڵیان بە لای خۆتدا ڕادەکێشی، چاکەی بەردەوام چاکە لەگەڵ کراو دەکاتە کۆیلە.

جا ئەمانە دڵو دەروونی خۆیان چاکو پاك کردو خوداش چاکەی لەگەڵ ئەنجامدانو کردنی بە موسڵمانو فەرمانڕەوا، کە منەتو چاکەی خودایان بەسەر خۆیانەوە بینی، شانازیان بە ڕەچەڵەكو نەتەوەی خۆیانەوە نەکرد، بەڵکو شانازیان بەو کارانەوە کرد کە ئەنجامیان دانو خوداش ناوی ئەوانی لە مێژوودا بەی زیندوویی هێشتەوە، مافی ئەوان بەسەر ئێمەوە ئەمەیە: بەو ناسناوانەوە ناویان بێنینو بنووسین کە ئەوان لە حاڵی حەیاتیاندا پێیان خۆش بووە پێیەوە بانگ بکرێن، هەقە بەوپەڕی وەفاداریو ئەمەکناسیەوەو لە بەرامبەر ئەو هەموو چاکانەیان دەرهەق بە عەرەبو موسڵمانان ئەنجامیان داون بەو شێوەیە ناویانو ناسناویان لەمێژوودا تۆمار بکەین کە شایستەی پڕ بە پێستی چاکەکانیانەو سەردەمە زێڕینەکەیان بە (سەردەمی تاقانەکان) ناو ببەین.[1]

## سێیەم: هەوڵەکانی (مەمالیك) لە پێناو تێکشکاندنی پەلاماری حەوتەمی خاچپەرستان:

کاتێك خاچپەرستەکان بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر (قاهیرە) (مەلیك صالح أیوب) کۆچی دوایی کردو بەمە موسڵمانان تووشی مەینەتیەکی سەخت بوون،[2] کە مرد تەمەنی (٤٤) ساڵ بوو، (مەلیك موعەززەم تورانشا) لە (میسر) نەبوو، (شجرة الدر)ی هاوسەری بەناوبانگی لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دەرکەوت، زانی هەواڵی مردنی (نجم الدی أیوب)ی هاوسەری کاریگەری خراپی لەسەر سوپاو سەربازەکانی دادەنێ، لەبەر ئەمە هەواڵی مردنەکەی شاردەوەو جگە لە خەڵکانێکی تایبەت نەیهێشت کەس بەم هەواڵە بزانێ، بەڵگەنامەیەکی بە ئیمزای سوڵتانی کۆچکردوو خستەڕوو: کە تێیدا (تورانشا)ی کوڕی کردووە بە سەرۆکی گشتی سوپاو جێگری سوڵتان لە کاتی نەخۆش بوونیدا، لەم ماوەیەدا خاچپەرستەکان لە باشوورەوە کەوتنە جموجۆڵ، ئەمەو لە ١٢ی دیسەمبەری ١٢٤٩ی زاینیدا گەیشتنە شاری (فارسکور) لەوێشەوە بەرەو (شارمساح)و دوای ئەوێش بەرەو (برامون) پێشڕەویان کردو دەریای (ئەشمون) بوو بە سنووری نێوان موسڵمانانو خاچپەرستان، هێزی خاچپەرستان

---

١ المصدر نفسه ص: ٤٢٦.

٢ الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة ص: ٣٥٣.

لەم قۆناغەدا گیرسایەوەو چەند سەربازگەیەکی لەسەر کەنارە ئاوەکانی باکوور دروست کردن و بۆ خۆپاراستن ژمارەیەک خەندەکیان لێدان و هەندێک شوورەو مەتەرێزیشیان بەرزکردنەوە، ماوەی مانگو نیوێك کپ بوون، ئینجا بە ئامانجی پەڕینەوەیان بەرەو کەنارە ئاوەکانی باشووری دەریای (ئەشمون) دەستیان بە دروستکردن و دامەزراندنی پردێك کرد، بەڵام ئەمە کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، بەڵکو موسڵمانان بە خەستی تیربارانیان کردن و نەیانتوانی ئیشەکە بکەن، لە کۆتاییدا خاچپەرستەکان بە دەلالی (عەرەب)ێك بەپێی ڕیوایەتێکی تر بە دەلالی قیبتیەك لە بەرامبەر پێدانی بەرتیلێك تەنکە ئاوێکیان دۆزیەوەو[1] پێیدا پەڕینەوەو خۆیان گەیاندە بەری سەربازگەی سوپای ئیسلام، نەخشەکەی (مەلیك لویس) بەم شێوەیە بوو: خۆی و براکانی و بەشێکی زۆری سوپاکەی بوار (تەنکاو)ەکە دەبڕن و بەرەو باری باشووری دەریاکە دەپەڕنەوە، ئەو بەشە سوپایەی ماوەتەوە پاسەوانی سەربازگەکەیان دەکات، دوابەدوای پەڕینەوەی سوپاکە دەبێ تیپە پاسەوانەکە دەست بە دامەزراندنی پردەکە بکات، هەرکاتێك بەسەر سوپا ئیسلامیەکەی (مەنسورە)دا سەرکەوتن خاچپەرستان بەرەو (قاهیرە) پێشڕەوی دەکەن، ئەمەو لە ٨/فبرایەر/١٢٥٠ز یدا هێزی خاچپەرستان لەگەڵ ئەوەدا بوارەکە قوڵ بوو و بەنێوداچوونی سەخت بوو بەڵام هەرچۆنێك بێ توانی بپەڕێتەوە، (ئەلکونت ئارتۆ) یەکێك بوو لە سەرکردەی هێزی خاچپەرست، لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ سوپای ئیسلام، توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ، کاتێك (ئەمیر فخرالدین) ئەم هەواڵەی پێگەیشت، خێرا بە خۆی و چەند هێزێکی سوپای ئیسلامەوە خۆی گەیاندە شوێنی ڕووداوەکە، جەنگێکی توندو تیژ لەنێوان موسڵمانان و خاچپەرستاندا ڕوویدا، (ئەمیر فخرالدین) شەهید بوو، بەم کارەی عەیب و عاری کشانەوەکەی خۆی لە دوورگەی (دمیاط) پەردەپۆش کرد، (ئەلکونت ئارتۆ) بەم سەرکەوتنە کاتیەی چاوی سوور بوون و گوێی بە فەرمانەکانی (لویسی نۆهەم)و ئامۆژگاری سەرکردە خاچپەرستەکان نەداو ڕانەوەستا، تا هێزەکانیان بە تەواوەتی ئامادەباش دەبن، بەڵکو ئەو بەم کارەی دەیەویست سەرکەوتن تەنها بە ناوی ئەوەوە تۆمار بکرێت.[2]

**١ـ جەنگی (المنصورە):**

وەك گوتمان: (ئارتۆ) چاوەڕێی گەیشتنی مەلیك و سوپای سەرەکی نەکردو گوێی بۆ فەرمان و ئامۆژگاریەکانی شل نەکرد، بەڵکو سەرکەوتن سەری گەرم کردو هێزەکەی

---

١ تأريخ الايوبيين ص: ٨٥.

٢ تأريخ الحروب الصليبية، محمود سعيد ص: ٣١٢.

تەفرەیداو دەستخەڕۆی کرد، هەدای نەداو بەرەو گەمارۆدانی (مەنسورە)و لەنێوبردنی سوپای (ئەیوبی) بەڕێکەوت،[١] کۆڵان و ڕێگاو بانەکانی (منصورە) بوونە گۆڕەپانی شەڕو پێکدادان، (ئەمیر بیبرس بندقداری) سەرکردایەتی هێزە موسڵمانەکانی دەکرد، سەربازەکانی خۆی لە چەند پەناو پەسیوێکی قایمی شاردا خستنە بۆسەوە، چاوەڕێیان کرد تا بە تەواوەتی خاچپەرستەکان هاتنە نێو شارەوە، کاتێك هەستیان کرد خەریکە دەگەنە قەڵاو شورەکانی شار — کە بارەگای سەرکردایەتی میسریەکان بوو —، (مەمالیك) بۆیان دابەزینە نێو شەقام و کۆڵانەکان و سەرو گەردنیان داپاچین و کوشتارێکی بێ شوماریان لێ کردن، ئەوەی کوژرا کوژرا، ئەوەی هەڵات خۆی فڕێدایە نێو دەریای (نیل)ەوەو خنکا، ئەوەی بە ساغیش مابۆوە لە دەورەی شار دەجەنگا،[٢]... (منصورە)ش بوو بە گۆڕستانی خاچپەرستان و[٣] یەکەمین سەرەتای سەرکەوتن بەسەر (فەرەنگ)دا تۆمار کرا، (مەلیك لویسی نۆهەم) بەم کارەساتە شڵەژا، بەڵام دانی بەخۆداگرت، هەوڵیدا هێڵێکی بەرگری لە بەرەکانی پێشەوە — بە ئامانجی بەرگرتن بە هەر هێرشێکی چاوەڕوانکراو لە لایەن (مەمالیك)ەوە — دابمەزرێنێ، هەروەها پردێکی بە دار سنۆبەری لەسەر دەریای بچووك ڕاهێشت تا خۆی و سەربازەکانی بەسەریدا بپەڕنەوەو ژمارەیەك تیرهاوێژێشی لە دوور پردەکەوە دانان، تا لە حاڵەتی پەڕینەوەدا پاسەوانیان لێ بکەن، بەڵام (مەمالیك) نەیانهێشت ئەم کارانە ئەنجام بدات، بەڵکو هێرشێکی توندیان کردە سەر خاچپەرستەکان، (مەلیك لویس) بە خودی خۆی سەرکردایەتی هێزی خاچپەرستی کردو موسڵمانەکانی ناچارکردن بەرەو (منصورة) پاشەکشە بکەن، هەرچەندە خاچپەرستان لەم جەنگەدا سەرکەوتن، بەڵام بەهۆی کەمبوونەوەی خوردو خۆراك و ئامرازەکانی جەنگ و کوژرانی ژمارەیەکی زۆریان لە جەنگی (مەنسورە)داو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەنێو سەربازگەکانیاندا بە شێوەیەکی خێرا تووشی بەزین و تێکشکان هاتن، (مەلیکی فەرەنسی) بە هیوای ئەوە کودەتایەك لە میسر ڕوو بدا، یان میسریەکان شۆڕش لە ئەیوبیەکان بکەن ماوەی (٨) هەفتەی تەواو لە سەربازگەکەی خۆیداو لە بەرامبەر (منصورە)دا مایەوە.[٤]

---

١ الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة للصلابي ص: ٣٥٦.
٢ الشرق الادنى في العصر الوسطى الايوبيون ص: ١٥٠.
٣ السلوك ٤٤٨/١، تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٦.
٤ الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة للصلابي ص: ٣٥٦.

## ٢ـ (تورانشا) سەرکردایەتی جەنگەکە دەکات:

دوابەدوای ئاشکراکردنی مردنی (نجم الدین أیوب)و ڕاگەیاندنی پۆستی سەڵتەنەت بۆ (تورانشا)ی کوڕی لە لایەن (شجرة الدر)ی هاوسەری (نجم الدین)ەوە، (تورانشا) ئەو کاتە لە (دیمەشق) بوو و بەرەو (میسر) گەڕایەوەو لە ١٧ی ذو القعدة/٦٤٧ك بەرامبەر ٢١/شوباتی/١٢٥٠ زاینی گەیشتە (مەنسوڕە)، نەخشەو پیلانێکی سەربازی وای دارشت کە سەرکەوتنی کۆتایی بەسەر خاچپەرستاندا مسۆگەر بکات،[1] هەر کە گەیشتەوە (میسر) لایەنی مەعنەوی‌و باری دەروونی دانیشتوانی (مصر)و ڕیزەکانی (مەمالیك) بەرزبۆوەو بە دەرکەوتنی گەشبینی سەرکەوتنی خۆیان ڕاگەیاند.[2] فەرمانیدا چەند بەلەمێکی بچووك دروست بکرێن‌و لە کەنارە ئاوەکانی خوارووی دەریای نیل لەنگەریان پێ بگیرێت‌و ڕێگە بەو کەشتیانە بگرن کە لە دمیاتەوە خۆراك‌و کەلوپەلی پێویست بۆ (فەرەنگ)ەکان دەگوازنەوە، بەم شێوە ڕێگەی (دمیاط)ی لێ گرتن‌و پەیوەندیان بە بنکەی سەرەکیانەوە پچڕا،[3] فەرەنگەکان ژمارەیەکی زۆریان کەشتی لە دەستدان ـ کە بە پێی سەرچاوەکان خۆیان لە (٥٨) داندەداوە ـ، بەرەبەرە خواردنیان لەبەر بڕا، گرانی‌و قات‌و قڕی ڕووی تێکردن، لەم بارنەی گەمارۆیەدا گێژاویان خواردبوو و نەیاندەتوانی بۆی دەربچن، موسڵمانەکان سەرەتاتکەیان لێ دەکردن‌و دەیانەویست هەڵمەتیان بۆ بەرن، (لویسی نۆیەم) بۆی دەرکەوت تازە مەحاڵە لەم بارودۆخەدا بتوانێ هێرش بکاتە سەر (قاهیرە)، بیری دەکردەوە چۆن بەرەو (دمیاط) بگەڕێتەوە، لەم ساتەوەختەدا فەرمانی پاشەکشەی داو هەر دارو بارێکی هەیانبوو سوتاندیان‌و ولاخەکانیان لەنێو بردن، لە لایەکی ترەوە (لویس) بۆی دەرکەوت کشانەوە کارێکی ئاسان نیەو لەمەولا (مەمالیك) سوپاکەی دەردەکەن، لەبەر ئەوە پێش ئەوەی پاشەکشە بە سوپاکەی بکات پەنای بۆ کردنەوەی دەروازەی گفت‌و گۆو سازش بردو داوای لە (تورانشا) کرد لە بەرامبەر گرتنی (بیت المقدس)دا واز لە (دمیاط) دێنن،[4] بەڵام تەبیعی (تورانشا) ئەمەی ڕەت کردەوە، چونکە کات بەسەر چووبوو و دەشیزانی (مەلیك لویس) کەوتۆتە تەنگانەوە، ئەمەو لە بەرەبەیانی موحەڕەمی ٦٤٨ك/ نیسانی ١٢٥ــ ز ئەندازیارە خاچپەرستەکان دەستیان بە تێکدانی پردەکەی سەر دەریای بچووك کرد، بەڵام

---

١ السلوك ١/٤٤٩، تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٧.

٢ النجوم الزاهرة ٦/٣٦٤.

٣ المصدر نفسه ٦/٣٦٤.

٤ تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٨.

(مەماليك) يەكسەر بە دوايان كەوتنو بەسەر پردەكەدا پەڕینەوەو لە هەموو لایەكەوە پەلاماریان دانو بەدەرێیان نان،[1] بەهۆی زیرەكیو شارەزایی چاكی (لویس) لە ئیدارەی پاشەكشەكردن خاچپەرستەكان خۆیان گەیاندە شاری (شرمساح)ی نێوان (منصورە)و (دمیاط)، بەڵام (مەلیك) نەخۆش كەوتبوو، (مەمالیك)یش لە هەموو لاوە دەورەی سوپاكەی تەنیبوو، دوورو نزیك چاودێریان دەكردن، ئەمەو كە گەیشتنە (فارسكور) هێرشێكی بەربڵاویان كردنە سەرو (مەلیك لویس) بڕستی بەرەنگاری نەمابوو، سوپاكەی بە تەواوەتی تەنگی پێ هەڵچنراو دەرەنجام بە خراپی تێكشكێنرا، زۆرینەی سەربازانی سوپاكەی كوژرانو برینداربوونو بەدیل گیرانو خودی (مەلیك لویس) كەلەپچە كراو بەرەو (منصورە)یان ڕەپێچەكداو لە نێو خانووی (فخرالدین إبراهیمی كوڕی لوقمان)دا بەند كراو پاسەوانی كردنی خرایە ئەستۆی (طواش صبیح)و كەسێكیش بۆ خزمەتكردنی تەرخانكرا، بەم شێوەیە جەنگی گەورەو یەكلاكەرەوە لە (فارسكور) ڕوویدا، ژمارەی كوژراوەكان — بە قسەی ئەوانەی كەمیان گوتووە — خۆی لە (١٠) هەزار كەس داوە، بە قسەی ئەوانەش زۆریان حیساب كردووە — خۆی لە (٣٠) هەزار كەس داوە، هەروەها دەیان هەزار (فەرەنگ) لە لایەن موسڵمانەكانەوە بە دیل گیران — كە لە نێوانیاندا پیشەوەرو ئەهلی بەرو بازاڕیان تێدا دەبینران، هەروەها سەروەتو سامانێكی زۆرو زەوەندو بێ شوماریان لە ئەسپو ئێسترو ماڵ دەستكەوت، بەم شێوەیە تایەفەی (مەمالیكی بەحری) بە سەركردایەتی(بیبرسی بندقداری )بوونە لایەنی براوەی ئەم جەنگەو ڕووداوێكی جوانیان لە مێژوودا بۆ تۆماركرا.[2]

### ٣ـ چەند وێنەیەك لە ئازایەتی (مەمالیك)؛

مێژوو چەند وێنەیەكی پڕشنگداری لەسەر ئازایەتیو قارەمانێتی (مەمالیك) نیشان داون كە لە بەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا ئەنجامیان داون، مێژوو شایەدی پاڵەوانێتی (مەمالیك)و ڕۆڵی ئەوانی لە بەگژداچوونەوەی خاچپەرستاندا لەسەر ڕووپەڕی لاپەڕەكانی خۆی بە جوانی نەخشاندووە.

(جوانقیل) باس دەكات: كە هەندێك سەركردەی سوپای (فەرەنگ) بە تایبەتی (ئەلكۆنت بواتیە)و (ئەلكۆنت فلاندەر) تكایان لە (مەلیك لویس) دەكرد: چاوپۆشی لەو تاوانو كەمو

---

١ النجوم الزاهرة ٣٦٤/٦، تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٨.

٢ نهاية الارب في فنون الادب ٣٥٦/٢٩.

کوڕیانه بکات که له نێو سوپادا ئەنجام دەدرێن: چونکه ئەوان بە هۆی فشاری توندی (مەمالیك) ناتوانن بەدواداچوونی پێویست ئەنجام بدەن،[١] هەروەها دەڵێ:

سەربازێك که گۆچانێکی به دەستەوە بووە بە هەڵەداوان هاتەلای (کۆنت—ئابل)و لە ترسان دەلەرزیو هەواڵی دایە کە: تورکەکان گەمارۆی (مەلیك)یان داوەو ڕووبەڕووی مەترسیەکی گەورەبۆتەوەو ئێمە گەڕاینەوەو تەماشامان کرد (١٠٠٠) کۆیلە لە نێوان ئێمەو ئەودا هەیە، (مەلیك) لە ڕووبار نزیکە، (مەمالیك) بە شمشێرو گۆپاڵ بەهێزەکانی ڕادەکێشن و ڕایان دەماڵن، هێزەکانی تریش پاشەوپاش هەلاتن،[٢] مێژوونووسێك بەم جۆرە قارەمانێتی (مەمالیك) لەم جەنگەدا وێنا دەکات: بە خوا لەم جەنگەدا گوێم لە زیقەی تورکەکان بوو دەتگوت دەنگی هەورەتریشقەیەو چاوم لە بریسکەی شیرەکانیان بوو هەر بە تیشکی بریسو دەچوو، ئەم شێرانە بە دڵی ئاسنینیان ئیسلامیان جارێکی تر بوژاندەوە، چاکمان بینین کە لەو ساتە وەختەدا چۆن فەرەنگەکان بەراز ئاسا بەسەر پاشوانیاندا تێك دەشکان و تورکەکانیش شێرئاساو چەنگ لەسەرشان ڕێیان دەکەوتن،[٣] دوای ئەوەی (مەمالیك) چەند کەشتیەکیان خستنە نێو دەریاوە بە دووری فەرسەخێك لە باکووری سەربازگەکەیان لەنگەریان پێگرتن، توانیان دەست بەسەر (٨٠) کەشتی خاچپەرستاندا بگرن و تێکڕای دەریاوانەکانیان بکوژن و (٣٢) ولاخی تریشیان لێ بگرن، دەرەنجام ئەوانەی چووبوونە (دمیاط)و بە تەمای هێنانی خۆراك و کەلوپەل بوون بۆ هێزەکانیان زانیان ناتوانن بگەڕێنەوە: بۆیە بە ناچاری داوای سوڵح و سازشیان کرد.[٤]

### ٤ـ لویسی نۆهەم لە بەندیدا، مەرجەکانی سوڵح:

دوابەدوای ئەم سەرکەوتنەیان، موسڵمانەکان زۆر بایەخیان بە مەسەلەی (دمیاط) نەدا، بەڵکو دوورتریان دەڕوانی و بیریان لە گێڕانەوەی تەواوی ئەو شوێنانە دەکرد کە لە خاکی وڵاتی شام لە لایەن خاچپەرستانەوە داگیرکراون، بەدیلگرتنی مەلیکی فەرەنسیان کردە وەرەقەیەکی فشارو بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەیان بەکارهێنا، بەڵام (لویسی نۆهەم) لە وەڵامدا گوتی: کە ئەو وڵاتە سەر بە مەملەکەتی ئەو نیەو تایبەتە بە موڵکی (کونرادی کوڕی

---

١ السلوك ١/٤٥٠، الحملات الصليبية، للصلابي ص: ٣٥٨.
٢ الجواري والغلمان في مصر، نجوى كمال ص: ٤٠٣.
٣ الجواري والغلمان في مصر، نجوى كمال ص: ٤٠٤، كنز الدرر ٣٧٦/٧.
٤ الجواري والغلمان في مصر، نجوى كمال ص: ٤٠٥-٤٠٦.

فریدریکی دووەمـی ئیمپراتـۆر).[١] (تورانـشا) هەوڵیـدا بـە زۆری دان بـەوەدابێنیّ کـە سـەر بـە موڵکی ئەوە، بەڵام (لویس) لەسەر قسەی خـۆی سـوور بـوو و گـوتی: کـە ئـەو ئێستا دیلـی ئەوانەو چیشیان بویّ بەرامبەری ئەنجام دەدەن،[٢] (تورانشا) بە پەلە ئەم بابەتەی پێچایەوە، بەڵام بڕیاریدا وڵاتی شام ڕزگار بکات، ئینجا هاتنە سەر مێزی گفـتو گـۆی ئاشـتیو تورانـشا مەرجەکانی ئاشتی لەسەر (مەلیك لویس) توندکردن، پێویستە لەسەر مەلیکی فەڕەنسی:

- خۆی بەیەك ملیۆن (بیزنتە) بکڕێتەوە، کە پارەیەکی یەکجار زۆرە.
- بڕیار بدا ژمارەیەکی زۆری دیلی موسڵمان ئازاد بکرێن.
- (دمیاط) دەدرێتە دەست موسڵمانان.
- ئەم ئاشتیە تا (١٠) ساڵ بەردەوام دەبیّ.[٣]

ئەمەو مەلیکی فەڕەنسی بەم مەرجانە قایل بوو، هـەردووکلا سـوێندیان خـوارد کـە ڕێـزی ڕێککەوتنەکە بگرن،[٤] (لویس) بە خاتری ئەوەی هاوسەرەکەی ژانی زانی دەهاتن تا ماوەیـەك چاوەڕێی کرد، پاشان هەندێك لـە پیـاوانی خـۆی بـەرەو (دمیـاط) نـاردنو داوای کـرد چـۆڵی بکەنو تەسلیمی سوپای ئیسلامی بکەنەوە، ئەمەو دوای ئەوەی ئەم شارە ماوەی سـاڵێك بـە دەست سوپای (لویس)ەوە بوو، لە (٧)ی مایۆدا چـۆڵیان کـردو سـوپای ئیـسلام چـووە نێـو شارەوە، (لویس)یش نیوەی ئـەو پارەیـەی دا کـە بڕیـار بـوو خـۆی پـیّ ئـازاد بکـات، ئینجـا خاچپەرستەکانی خۆرهەڵات لە وشکانیەوە تا دوورگەی (دمیاط) ئـازادکرانو پـاش ئـەوانیش تەواوی دیلەکانیان بەرەڵاکران، ڕۆژی یـەك شـەممە ٤/صـفری سـاڵی ٦٤٨ی کۆچـی ڕێکـەوت لەگـەڵ ٨ـ مایۆـ١٢٥٠ زایینـی کەشـتیەکانی فـەڕەنگ (دمیـاط)یـان بـەجیّ هێـشتو هێـزە تێکشکاوەکانیان بەرەو (عەککا) گواستنەوە.[٥]

### ٥ـ لە هۆکارەکانی تێکشکانی خاچپەرستان لە هێرشی حەوتەمیاندا:

هۆکارگەلێك لە پشت تێکشکانی هێرشی حەوتەمدا بوون گرنگترینیان:

أ- پەرەسەندنی لایەنی سەربازی لە سوپای ئەیوبیدا.

ب- یەکێتی ڕیزەکانی سوپای ئیسلام.

---

١ مذكرات جوانفيل ص: ١٥٧، ١٥٩ـ١٦١.
٢ تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٩، حملة لويس التاسع ص: ٢٠٦.
٣ تأريخ الأيوبيين ص: ٣٨٩.
٤ المصدر نفسه ص: ٣٨٩.
٥ تأريخ الحروب الصليبية، محمود سعيد ص: ٣١٥.

ج- سامو سه‌نگی سه‌ركردایه‌تی ئیسلامی.

ح- به‌شداربوونی زانایان‌و شه‌رعزانان له جیهاددا.

خ- نه‌شاره‌زایی فه‌ره‌نگ سه‌باره‌ت به جوغرافیای جیهانی ئیسلام.

د- هه‌ڵه‌ی گه‌وره سه‌باره‌ت به ئه‌ندازه‌گرتنی هۆكاری زه‌مه‌نی.

ذ- سه‌رپێچی‌و گوێڕایه‌ڵی نه‌كردنی خاچپه‌رسته‌كان بۆ سه‌روی خۆیان.

ر- لێكهه‌ڵوه‌شانی هێرشی حه‌وته‌م له بواری ڕه‌وشته‌وه.

ز- كزبوونی گیانی ئایینی له لای خاچپه‌رسته‌كان.

س ـ هه‌ڵه‌شه‌یی‌و كورتبینی.

سه‌باره‌ت به‌م هۆكارانه‌ی باسكران به دوورو درێژی له كتێبی (الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة) له‌سه‌ریان ڕۆیشتووم.[١]

## ٦ـ له ئه‌نجامه‌كانی هێرشی حه‌وته‌می خاچپه‌رستان:

شكان‌و گیرانی (لویسی نۆهه‌م) له ساڵی ١٢٥٠ز/٦٤٨ك له لایه‌ن موسڵمانه‌كانه‌وه چه‌ند ئه‌نجامێكی لێكه‌وته‌وه، گرنگترینیان:

أـ به‌رزتربوونه‌وه‌ی جێگه‌و پێگه‌ی مه‌مالیك:

ده‌ركه‌وت كه (مه‌مالیك) به گێڕانی ڕۆڵی پاڵه‌وانانه‌یان له جه‌نگی (فارسكور)دا چ جیهادێكیان كردو چۆن دوژمنی ئیسلامیان تێكشكاندو چ سه‌ركه‌وتنێكیشیان بۆ ئیسلام‌و موسڵمانان ده‌سته‌به‌ركرد، له ڕاستیدا ئه‌مه‌بوو به مایه‌ی به‌رزبوونه‌وه‌ی پله‌و مه‌قامیان‌و وه‌كو سه‌نه‌دێكی مێژوویی پێی چوونه سه‌ر ته‌ختی حوكمڕانی، هیچ جێی سه‌رسوڕمان نیه هه‌مان ساڵ ١٢٥٠ز/٦٤٨ك كه به‌سه‌ر داگیركه‌راندا سه‌ركه‌وتن، هه‌ر له‌وساڵه‌شدا (تورانشا) بسوتێت‌و بخنكێت‌و كۆتایی به ده‌وڵه‌تی (ئه‌یوبی) بێت‌و به ته‌واوه‌تی ڕێگا ئاوه‌ڵا بێت‌و ئه‌وان ده‌وڵه‌تی مه‌مالیكی تاقانه دابمه‌زرێنن‌و به‌رگری پێ له ئیسلام بكه‌ن[٢] و به‌وپه‌ڕی هێزو گوڕی تینی جیهادی‌و عه‌زم‌و ئیراده‌وه بێنه سه‌ر شانۆی ڕووداوه‌كان.

ب ـ ده‌سته‌وستان بوونی فه‌ره‌نسا له به‌رامبه‌ر پێكانی ئامانجه‌كانی:

وه‌كو تێبینی ده‌كرێ هه‌ر هه‌موو هه‌وڵ‌و ته‌قه‌لاكانی فه‌ره‌نسا له پشتیوانی كردنی بزوتنه‌وه خاچپه‌رسته‌كان‌و ئاراسته‌كردنیان به‌ره‌و كیشوه‌ری ئه‌فریقیا به هه‌واداچوون، وێڕای

---

١ الحملات الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة للصلابي ص: ٣٦٠.

٢ الحروب الصليبية بين الشرق والغرب ص: ٣٧١.

ئەمەش لە بەرامبەر دروست کردنی واقیعێکی جەنگی و سیاسی لەسەر حیسابی ئەیوبیەکان لە ناوچەکەدا دەستەپاچە بوو، بەم شێوەیە بۆ لێکۆڵەران و تەواوی دونیا ڕوون بۆوە کە چۆناوچۆن لە هەردووك سەدەی (١٢و ١٣)ز (٦و ٧ك)هەوڵ و تەقەلای خاچپەرستان بۆ دەست بەسەرداگرتنی میسر تۆزقاڵێك سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بێگومان پێگەی بنەماڵەی (ئال کایبە)ی حوکمڕانی فەڕەنسا بەهۆی شکستە تاڵەکەی سوپای (لویسی نۆهەم)و بەدیلگیرانی خودی (لویس) لە لایەن سوپای ئیسلامەوە لەنێو بنەماڵە حوکمگێڕەکانی ئەوروپا هاتە خوارەوە،[1] لە کتێبی (الحملات الصليبية)دا باسی ئەمانە بە زیادەوە کراوە.

## ٧ـ کوژرانی (تورانشا)و لەنێوچوونی دەوڵەتی ئەییوبی):

مێژوونووسان دەربارەی کەسایەتی (تورانشا) ڕای جیاوازیان هەن و سەبارەت بە کوژرانیشی هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆی چەند هۆکارێکی باسکردووە، بەڵام هەموویان لەوەدا یەکدەنگن کە لە لایەن (مەمالیکی دەریایی)یەوە کوژراوە،[2] (دکتۆر قاسم عەبدە قاسم)ی مێژوونووسی میسری دەڵێ: (تورانشا)ی سوڵتانی ئەییوبی دوا سوڵتانی سەڵتەنەتی ئەییوبی بوو لەگەڵ ئەوەدا سەرکەوتنێکی جوانی بەسەر خاچپەرستاندا، ڕێگای بەردەم کۆتایی هاتنی دەوڵەتی ئەییوبی و هاتنە پێشەوەی دەوڵەتی (مەمالیك)ی خۆشکرد، لە بەرامبەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکان و جێبەجێکردنی داخوازیەکانی سەردەمی مێژوویی خۆیدا شکستی خوارد، لە جیاتی تەرخانکردنی هەوڵەکانی بۆ یەکخستنی ڕیزی موسڵمانان بە خاتری ڕیشەکێشکردنی یەکجاری مەترسی خاچپەرستان، دەیەویست پاشقول لە (شجرة الدر)و میرە گەورەکانی (مەمالیك) بگرێت و پیلانی لە دژ دادەنان،[3] مێژوونووسان ژمارەیەك هۆکاریان باسکردوون کە سەریان کێشاوە بۆ کوژرانی (تورانشا)، لەو هۆکارانە:

— ئەم (مەمالیك)انە بە تەواوەتی خزمەتی ئەویان کرد، چاوەڕێ بوون پاداشتیان بداتەوە، پێیان وابوو بۆشایی باوکی پڕدەکاتەوە، بەڵام میرەکانی خۆی هێنانە پێشەوە، ئەو (مەمالیك)انەی کە باوکی وەکو ڕۆڵەی خۆی پەروەردەی کردبوون، هەڕەشەی لێ کردن و نانی بڕین و ماڵ و سامانی لێ تاڵان کردن و لە بەرامبەر ئەواندا کاری بە وەسێتەکەی بابی نەکرد.[4]

---

١ المصدر نفسه ص: ٣١٠.

٢ الخطط ٢/٢٣٦، النجوم الزاهرة ٦/٣٦٤

٣ في تأريخ الأيوبيين والمماليك ص: ١٤٨.

٤ الجواري والغلمان في مصر، نجوى كمال ص: ٤٠٨.

-یەکێکی تر لەو هۆکارانەی سەبارەت بە کوژرانی گوتراوە دەڵێن: بە حوکمی ئەوەی (شجرة الدر)و (مەمالیك)ەکانی باوکی ناحەزی بوونو دەسەڵاتی تەواویشیان بەسەر حوکومەتدا هەبوو، هەرکە مەلیکی (فەرەنگ) دیلکرا، (مەمالیك)ەکانی خۆی پێشنیارێکیان خستە پێش (تورانشا)و گوتیان: ئەگەر بێتو سوڵح لەگەڵ (فەرەنگ) بکات، ئەوا دەبێتە خاوەنی ماڵو سامانو زێڕو زەبەرێکی زۆرو (دمیاط)یشی بکەوێتە دەست، ئەوا لەمەولا چی تر پێویستی بە (شجرة الدر)و (مەمالیك)ەکانی باوکی نابێ، کاتێك سوڵحەکەی کرد (مەمالیك)ەکانی بابی واتێگەیشتن کە (تورانشا) بەم کارەی رێزو حورمەتی شکاندوونو هیچ حیسابێکی بۆ ئەو سەرکەوتنە مەزنە نەکردووە کە بەهێزو بازووی ئەوان هاتۆتەدی، لەبەر ئەمە نەخشەیان بۆ دانا بیکوژن.[1]

-دەگوترێ کاتێ (تورانشا) چوو بۆ قەڵای (کیفا) بەڵێنی بە (فارس ئۆکتای)دا بیکا بە (میر) بەڵام بەڵێنەکەی نەبردە سەرو (ئۆکتای)یش رکی لێ داگرت،[2] کاتێك ئەم بەڵێنەی لەسەر زمانی یەکێك لە نزیکانی خۆی بەبیرهێنرایەوە گوتی: جوببەیەکی فەرەحو نەرمینی شایستەی دەدەمێ.[3]

-لە لایەکی ترەوە دەڵێن بۆیە (مەمالیك) کوشتیان، چونکە تورانشا توخنی کەنیزەکەکانی بابی دەبۆوە،[4] دەبێ بۆ شتی وای کردبێ کە لە کاتێکداو لەو سەردەمەدا ئەو دەستی دەڕۆیشت ژمارەیەکی زۆر غوڵامو کەنیزەك پەیدا بکا، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە هەر سوڵتانێك ژمارەیەك کەنیزەکی تایبەت بە خۆی هەبوونو کەنیزەکیش هێندە گران نەبوون نەتوانێ وێنەی کەنیزەکەکانی بابی بکڕێت.[5]

-گوتراوە گەورەترین هۆکاری کوژرانی ئەوە بووە: کە داوای لە (شجرة الدر)ی هاوسەری باوکی کردووە سەروەتو سامانو زێڕو زەبەری بابی بداتەوە،[6] هەڕەشەشی لێکردووە، ئەمیش لێی ترساوەو دەرەنجام مەترسی ئەمو مەترسی (مەمالیك)و تووڕەییان لە بەرامبەر موچەبڕینیان لە دژی سوڵتانی تازەی ئەیوبی یەکانگیربووەو هەردووك لایەن بە پێویستیان زانی خۆیان لە دەست دواهەمین سوڵتانی ئەییوبیان لە میسر دەربازبکەن.[7]

---

١ المصدر نفسه ص: ٤٠٩.
٢ نهاية الارب ٢٩/٣٦٠. الجواري والغلمان ص: ٤٠٩.
٣ كنز الدرر ٧/٣٨١-٣٨٢، الجواري والغلمان ص: ٤٠٩.
٤ شفاء القلوب، نقلا عن الجواري والغلمان ص: ٤٠٩.
٥ الجواري والغلمان ص: ٤٠٩.
٦ المصدر نفسه ص: ٤١٠.
٧ في تأريخ الأيوبيين والمماليك، قاسم عبده ص: ١٤٨.

– حەزکردن بە مەیو مەی خواردنەوە یەکێك بووە لە هەڵسوکەوتەکانی (تورانشا)، (مەمالیك)ی بەحری لەبەر ئەمە ڕقیان لێ دەبۆوەو بەم هۆیەشەوە خەفەتی خۆیان پێ ڕشت، گەورە مێژوونووسانی ئەو سەردەمە نووسیویانە: هێندەی دەخواردەوە تا سەرخۆش دەبوو، مۆمی دەهێناو ڕیزی دەکردن و دەیگوت ئەمانە (مەمالیك)ی باوکمن، ئینجا بە شمشێرەکەی سەری دەپەڕاندن، باوکی وەسیێتی بۆ کردبوو واز لە مەی بێنێ، بەڵام گوێی بە وەسیێتەکە نەدابوو، لە وەسیێتنامەکەی باوکیدا هاتووە: ڕۆڵەگیان کاروباری موسڵمانانم دایە دەست تۆ، خواو پێغەمبەر چ فەرمانێکیان پێ کردووی جێبەجێی بکە، ڕۆڵەگیان واز لە مەی خواردنەوە بێنە، چونکە زۆربەی بەڵاو ئاشوبگەلێك کە بەسەر پاشاکاندا هاتوون لە ئەنجامی مەی خواردنەوەیاندا بووە.[1]

– (ابن العبري) دەڵێ: کاتێك (تورانشا) زانی هاوسەری (مەلیك لویسی نۆهەم) لە دمیاط کوڕی بووە، یەکسەر (١٠) هەزار دیناری زێڕو لانکەیەکی لە زێڕ دروستکراو و خشڵو پۆشاکێکی گرانبەهای بۆ شاژنی فەڕەنسا بە دیاری نارد، (مەمالیکی بەحری) بەم ڕەفتارەی (تورانشا) قەڵس بوونو دەرەنجام جامی ڕقی خۆیان بەسەردا ڕشت.[2]

هەروەها چەند هۆکارێکی تریش باسکراون، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە ئەم حەقیقەتە حاشا هەڵنەگرە بزانین کە:

(مەمالیك) هەستیان بەوە کرد کە هەڵوێستو ڕەفتاری سوڵتان (صالح)و (تورانشا)ی کوڕی جیاوازیان نێوانەکەی ئەرزو ئاسمانە، (مەلیك صالح) (مەمالیك)ی خۆش دەویستنو زۆری بایەخ پێدەدانو ماڵو سامانی زۆری بەسەردا دەڕشتن، تا ڕادەیەك زیاد لە پێویست گرنگی پێدابوون، لەنێو ئەو وەسیێتنامەدا کە بۆ (تورانشا)ی کوڕی بەجێی دێڵێ ناویان دێنێو دەڵێ دەبێ ئاگات لێ بن، ئاگات لە تەواوی خزمەتکارەکان بێ، ئاگات لە (موحسینو ڕەشیدو خزمەتکارە پێشکەوتووەکان بێ)، نەچی کەسی تریان لەجێ دابنێی، یان کەسی تر بخەیتە پێش ئەوانو (مەمالیك)ەکانەوە، مەگەر بزانی دڵسۆزترو بەڕێزترن، ئاگات لە (ئوستاد دارو ئەمیرجاندارو حیسام) بێ لە پۆستی خۆیان لایان نەبەیو بە کەسی تریان نەگۆڕیەوە، چونکە من لە هەموو کاروبارێکم پشتم پێ بەستوونو جێگەی متمانەی منن،[3] لە کاغەزێکی ترمدا کە لە لای (فخرالدین)ی برام داناوە: (٢٠) کەسم لە (مەمالیك)دامەزراندوونو

---

١ نهاية الارب ٢٩/٣٤٨، الجواري والغلمان ص: ٤١٠.
٢ الجواري والغلمان ص: ٤١٠.
٣ المصدر نفسه ص: ٤١١.

پۆستی باڵایان پێ دەدەی، هەر یەکێك لەمانە سەرو کاسەیەکو[١] ئاڵایەکی دەدەیتیّو چاکەی لە بەرامبەردا ئەنجام دەدەی، دەبێ لەگەڵ (مەمالیکی بەحری)دا زۆر چاك بی، ئەوان لەو جۆرە پیاوانە بوون متمانەم لەسەریان بووو پشتم پێ دەبەستن‌و هێزو بازوی من بوون، دەبێ لەگەڵیان گەش‌و گوشادو بەسۆزو بەزەیی بی، دڵیان خۆش کەیت‌و مزگێنی خۆشیان بەگوێ دابدەی‌و بەڵێنی باشیان پێ بدەی، سەرپێچی وەسیّتەکەم نەکەی، ئەگەر (مەمالیك) نەبوونایە، نەمدەتوانی سواری وڵاخەکەم ببم‌و نەمدەتوانی بگەمە دیمەشق‌و شوێنەکانی تر، جا کەواتە دەبێ ڕێزیان لێبگری‌و لە ئامێزی پارێزگاری خۆتیان وەرێنی،[٢] هەر لەو وەسیّتەدا هاتووە: وەسیّت بێ لەگەڵ هەموو میرەکان چاك بی، ڕێزیان بگرەو پلەی بەرزیان پێ بدە چونکە ئەمانە باڵی تۆن‌و پێیان دەفڕی، پشتن‌و پاڵیان پێوە دەدەی، دڵیان ڕاگرەو خۆشحاڵیان بکە، موچەیان بۆ زیاد بکە، هەر یەکێك لەو میرانە (٢٠) سواری تری بخە بەردەست، ماڵ ببەخشە، دڵی پیاوەکانت خۆش بکە، بەمە زیاتریان خۆش دەوێی‌و لە بەرامبەر دوژمنتدا سەرت دەخەن‌و بە ئامانجت دەگەیەنن.[٣]

ڕاستیەکەی (مەمالیك) پاش ئەم سەرکەوتنانەی بەسەر خاچپەرستاندا تۆماریان کردو دوای ئەو هەموو نارەحەتی‌و شپرزەییەی لە ڕێی ڕزگارکردن‌و دەربازکردنی وڵات لە چەنگی ئەم داگیرکەرانەدا چەشتیان‌و وێڕای ئەمەش پاش هێنانەوەو پشتیوانی کردنی بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت، وایان لە (تورانشا) چاوەڕوان دەکرد بەرامبەر بەم کارە جوانانەیان وەفادار بێت‌و چەشنی باوکی پاداشتیان بداتێ،[٤] بەڵام وەکو دەردەکەوێ شتەکە تەواو بە پێچەوانەوە دەرچوو، دوای ئەوەی (مەمالیك) پرس‌و ڕاوێژو حوکمیان بەدەست بوو، ئێستا (تورانشا) (مەمالیك)ی خۆی بەسەردا هەڵبژاردوون‌و ئەمانیش بەر هەڕەشەو ترس‌و تۆقاندن دەدات، لەبەر ئەوە ئەمەیان پێ قبوڵ نەکراو کوشتیان،[٥] گەورەترین هەڵەی سوڵتانی تازە ئەوە بوو: ئەو لە جیاتی ئەوە جێگرایەتی سەڵتەنەت بە (ئەمیر حیسانەدین ئابی عەلی) بسپێرێ ـــ کە ئەو لەسەردەمی (مەلیك صالح)ی باوکیدا سام‌و هەیبەتی خۆی هەبوو، هەر ئەویش فەرمانیدا وتاربێژی مزگەوتەکان بانگەشەی سەڵتەنەت بۆ (تورانشا) بکەن‌و ناوی بە

---

١ کوس یان کاسە: بریتی بوو لە تاجێکی لە مس دروست کراو کە نیشانەو سونبولێکی سەڵتەنەتی بە سەرەوە هەڵکەنرابوو.

٢ نهایة الارب ٣٥١/٢٩. الجواري والغلمان ص: ٤١١.

٣ الجواري والغلمان ص: ٤١١.

٤ مراة الزمان، نقلا عن الجواري والغلمان ص: ٤١٣.

٥ الجواري والغلمان ص: ٤١٤.

(سولّتان) بێنن‌و دوای مردنی باوکی داوای لێکرد بە پەلە بگەڕێتەوەو پێش ئەوەی ئەمیر (فخرالدین)ی مامی بەسەر ولآتدا زالّ بێت، بێتەوە قاهیرەو بچێتە سەر تەختی سەلّتەنەت، بەلّی ئەو لە جیاتی (ئەمیر حیسانەدین) جێگرایەتی سەلّتەنەتی دایەدەست (ئەمیر جمال الدین ئاقوش ی نەجیبی)،[1] ئەو ئەگەر ئەم پۆستەی دابایە دەست (ئەمیر حیسانەدین) دەیتوانی خۆی پێ بەهێز بکات‌و بیکاتە پشت‌و پەنایەکی باش بۆ خۆی.[2]

## ٨ـ چۆنیەتی کوژرانی (تورانشا):

لە ئەنجامی ئەوەدا (تورانشا) چەند هەڵسوکەوتێکی نەشیاوو نامەسئولانەی لێ دەرکەوتن‌و هیچ قەلّغانێکی بۆ پاراستنی خۆی دانەنابوو، (مەمالیکی بەحری) بە سەرکردایەتی ژمارەیەك (ئەمیری بەحری) کە لە نێوانیاندا: (فارس الدین ئۆکتای‌و بیبرس بندقداری‌و قلاونی صالّحی‌و ئایبەك تورکمانی) دەبینران بڕیاریاندا (تورانشا) لە کۆڵ بکەنەوەو خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، پیلانەکە لە بەرەبەیانی ٢٨/محرم/٦٤٨/ ٢ ئایار ١٢٥٠ز ئەنجامدرا، کاتێك سولّتان لە (فارسکور) ئاهەنگی سەرکەوتنی دەگێڕاو خۆی بۆ گێڕانەوەی (دمیاط) ئامادە دەکرد،[3] وەکو نەریتی ڕۆژانی تری بۆ نانخواردن لەسەر بەرەیەك دانیشتبوو، (بیبرس بندقداری) نەخافلّ لێی وەژوور کەوت شمشێرەکەی ئاڕاستە کرد، ئەویش توند بە دەستی گرتی‌و هەندێك پەنجەی لێبوونەوە، (تورانشا) بە تالّوکە بەرەو بورجە دارینەکەی سەر دەریای نیل هەلآت، لە سەروەریدا بانگی دەکرد کێ بوو بریندار کردم؟ گوتیان: تاقمەی (حەشیشیە) بوون، گوتی: نە بە خوا تاقمەی (بەحری) بوون! بەو خودایە دەبێ یەکیان لێ نەهێڵم، ئینجا دەستیان بۆ دەرمان کردو برینەکەیان بۆ دووریەوە، میرە (مەمالیك)ەکان کۆبوونەوە، بڕیارياندا بیکوژن، گوتیان: مار کە بریندار کرا دەبێ هەر بکوژرێ، رکن الدین بیبرس‌و فارس ئۆکتای‌و چەند میرێکی تری (بەحری) شیریان لە کالان دەرکێشاو خۆیان گەیاندە نێو بورجەکە، (تورانشا) خۆی هەڵدایە سەر هەورەبانی بورجەکەو دەرگای لەسەر خۆی داخست‌و خوێنیش لە دەستی دەچۆڕایەوە، لە ژێرەوەڕا ئاگریان لە بورج بەرداو دەستیان بە تیرباران کردنی کرد، لەسەرێڕا خۆی هەڵدایە خوارەوەو هاواری دەکرد: موسڵمانینە دەسەلآتم ناوێ لێم گەڕێن با بۆ قەلآ بگەڕێمەوە، کێ لە ئێوە پەنام

---

١ المصدر نفسه ص: ٤١٤.
٢ المصدر نفسه ص: ٤١٤.
٣ تأريخ الأيوبيين ص: ٣٩٠.

دەدا، کێ دەیەوێ چاکەم لەگەڵ بکات؟!،[1] کەس وەڵامی نەدایەوە، هەر بەرەو (نیل) ڕایدەکردو لە هەموو لایەکیشەوە تیری بۆ دەهاوێژران، بە ناچاریی‌و بە ئومێدی ئەوەی بە مەلە خۆی بگەیەنێتە یەکێك لە کەشتیە لەنگەرگرتووەکان‌و خۆی تێدا مەلاس بدا خۆی هەڵدایە نێو (نیل)ەوە، بەڵام (فارس ئۆکتای) بە پەلە خۆی گەیاندە سەری کوشتی، ماوەی (٣) ڕۆژ تەرمەکەی لە قەراغ (نیل) مایەوەو کەس نەیدەوێرا بچێت بینێژێ، پاشان نێردراوی خەلیفەی عەبباسی هات‌و لەسەر تکای ئەو لەم قەراغەوە بۆ قەراغێکی تری دەریاکە گوازرایەوەو لەوێ نێژرا، ماوەی (٦١) ڕۆژ حوکمی گێڕا.[2]

گوتراوە ماوەی دەسەڵاتگێڕانی لە (مەنسوڕە) دەورەی (٤٠) ڕۆژ بووەو لەو ماوەیەدا نەچۆتە نێو (قاهیرە)وەو بەسەر قەڵای چیایدا نەڕوانیوەو نەچۆتە سەر کورسی پاشایەتی،[3] ئەمەو (دەوڵەتی ئەییوبی) دوای تێپەڕینی (٨١) ساڵ‌و (١٧) ڕۆژ بەسەر تەمەنیدا بە کوژرانی (تورانشا)ی دوا سوڵتانی کۆتایی پێهات،[4] بەڵام هەندێك مێژوونووس دەڵێن بەدەست لەکارکێشانەوەی (شجرة الدر) لە پۆستی سەڵتەنەت کۆتایی بە دەوڵەتی ئەییوبی هاتووە،[5] کۆمەڵە مێژوونووسێکی تریش دەڵێن: حوکمڕانی (شجرة الدر) لە (میسر)دا درێژە پێدەری حوکومەتی (ئەییوبی) بووە، بەڵام لە وڵاتی (شام)دا حوکومەتی ئەییوبی چەند ساڵێکی تر دوای حوکومەتەکەی میسریان درێژەی کێشاوە.[6]

## چوارەم: هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی ئەییوبی:

هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی (ئەییوبی) زۆرن، بەڵام دەتوانین هەموانیان لە هۆکاری پەراوێزکردنی شەریعەت لە حوکمڕانیدا کۆبکەینەوە، ستەمکردن لە خەڵکی ڕەش‌و ڕووت‌و ڕۆچوونی چەند سوڵتانێکیان لە دەوڵەمەندیی‌و خۆشگوزەرانیداو بەرپابوونی کێشەی نێوخۆیی لەنێو خودی بنەماڵەی ئەییوبیی‌و خۆخۆریی‌و خوێنڕێژی نێوانیان، هەموو ئەمانە سەریان کێشا بۆ لەنێوچوونی یەکجارەکی دەوڵەتەکەیان، لە هەر ئان‌و زەمانێکدا شەرعی خودا لە کاروبارەکانی حوکم‌و سیاسەتدا پەکی دەخرێ — وەکو لە سەردەمی دوای وەفاتی

---

١ النجوم الزاهرة ٦/٣٧١.

٢ كتاب الروضتين، نقلا عن الدولة الايوبية د. عكور ص: ٢٦٢.

٣ بدائع الزهور، نقلا عن الجواري والغلمان ص: ٤١٦.

٤ المصدر نفسه ص: ٤١٦.

٥ عجائب الآثار ١/٥١، الجواري ص: ٤١٦.

٦ الدولة الايوبية د. عكور ص: ٢٦٦.

(صلاح الدين)دا پەکی خرا – تاکو کۆمەڵ و دەوڵەت لە دونیا تووشی تەمبەڵی و تەنگژەکانی ژیان دەبن و لە هەموو لایەنەکانی دینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریدا تووشی شەپڵە لێدان دەبن و گەندەڵی و فیتنە و ئاژاوە تیراوەئاسا هەموو وڵات دەتەنێتەوە و هەموو خەڵك دەگرێتەوە و ژیانیان لێ تفت و تاڵ دەبێت،[1] خودای بەرز و مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ (النور: ٦٣).

بێگومان دوای وەفاتی (صلاح الدين)، سوڵتانەکانی دەوڵەتی ئەییوبی بۆ چارەسەری کێشمەکێش و ناکۆکیە نێوخۆییەکانیان خۆیان لە حاکمیەتی شەرع دەبوارد، ئەمە شوێنەوارێکی خراپی لەسەر یەکەیەکەی ئەندامانی بنەماڵەی ئەیوبی داناو دەرەنجام تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و تۆقین و هەڵپەهەڵپ و دووبەرەکی بوون و کەوتبوونە نێو گێژاوی ژینەوە، بێگومان لەنێوچوونی هیچ ئوممەتێك و ڕوخانی هیچ دەوڵەتێك و ئاواکرانی هیچ شارستانیەتێك لە ڕەوڕەوەی مێژوودا لەخۆڕا ڕووی نەداوە، بەڵکو دەبینین دوای ئەوەی ئەو گەلە یان ئەو دەوڵەتە یان ئەو شارستانیەتە ماوەیەکی لە باری پێدراوە، بەڵام لەو ماوەیەدا لە جیاتی دادپەروەری ستەمی ئەنجامداوە، لە جیاتی چاکسازی گەندەڵی ڕەچاو کردووە، لە جیاتی پەیڕەوکردنی ڕاستە شەقام خۆی لە گێلی داوە و لایداوە، دەرەنجام سزای خودایان لەسەر واجب بووە و باجی کردەوە و هەڵوێستە ناپەسەند و نادروستەکانیان لێ سەنراوە، چونکە خودا نیعمەتی خۆی لە هیچ دەوڵەت و کەسێك ناسێنێتەوە تا سپڵەیی لە بەرامبەردا نەکەن،[2] ئایەتە پیرۆزەکان سەبارەت بەم بابەتە ڕاشکاوانە دەدوێن: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الانفال: ٥٣). واتە: (چونکە خودا دەروازەکانی نازونیعمەتی بەسەر هەر نەتەوەیەکدا ئاوەڵا کردبن هەتا خۆیان لە خۆیان نەگۆڕیبێ، خودا لێی نەگۆڕیون و بەسەریدا دانەخستوون).

ئایەتە پیرۆزەکان لەم بارەوە زۆرن، بەڵکو قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت هەندێك لەو نازونیعمەتانەی خودا بەسەر هەندێك تاك یان هەندێك کۆمەڵگای دادەڕێژێ لە بابەتی پەت بۆ شلکردن و مۆڵەتدانە، هێندە بەو نازونیعمەتانەوە سەرگەرم دەبن تا کار بەوە دەگات ئەو ئەرکانە لەبیرخۆیان دەبەنەوە کە خودا ڕایسپاردوون جێبەجێیان بکەن، بەڵکو خودای

---

١ الدولة العثمانية للصلابي ص: ٥٢٠، الدولة الأموية ٥٦٨/٢.

٢ في تفسير الاسلامي للتأريخ نعمان السامرائي ص: ٨٨.

خاوەن نازونیعمەتیش لەبیر خۆیان دەبەنەوە، پێیان وایە ئەوەی دەستیان کەوتووە بەهۆی هەوڵو تەقەلاو زیرەکیو بیرتیژی خۆیانەوە بووە، یان فەلسەفە لێدەدەنو دەڵێن: ئەگەر شایان نەبوینایە ئەم نازونیعمەتانەمان پێ نەدەدرا، خودای بالادەست سەبارەت بەم جۆرە کەسانە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ (الانعام: ٤٤ـ٤٥). ئەوانە ئەوەیان لەبیرنەبوو کە هەر کەسێك خێروبێری دونیا داوا بکات خودا دەیداتێ: ﴿ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا ﴾ (ال عمران: ١٤٥). هەیە بەڕاستی بۆ دواڕۆژ تێدەکۆشێو سەرکەوتووە: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰؤُلَاءِ وَهَٰؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾ (الإسراء: ١٨ـ٢٠). هەروەها خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ (النحل: ١١٢ـ١١٣). با گوێبیستی ئەم بانگەشە پیرۆزە بین: ﴿ وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ (هود: ٥٢). لێرەدا چەند ئایەتێکی پیرۆز بەرپەرچی هەندێك فەلسەفەلێدەری ئەهلی کیتاب دەدەنەوە: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ الرُّسُلِ أَن تَقُولُوا مَا جَاءَنَا مِن بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ فَقَدْ جَاءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ﴾ (المائدة: ١٩). هەر مرۆڤێكو هەر کۆمەڵگایەكو هەر ئوممەتێك بەرپرسیاری ڕەفتارەکانی خۆیەتیو کەسی تر لێی بەرپرسیار نیە: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ (البقرة: ١٣٤). گرنگ ئەوەیە خودا خێروبێری خۆی لە کەس ناگرێتەوەو بەسەر ئیماندارو کافریدا دابەش دەکات، پاشان

چاودێری ڕەفتارو هەڵسوکەوتیان دەکات، هەر کەسێك سەرکەش بێت و ستەم بکات و سپڵە بێت و بە خراپی و لە خراپەدا بەکاری بێنێ، ئەوا لە کاتی گونجاودا سزای دادپەروەرانەی خودای بۆ نازڵ دەبێت، تا سزاکە دەگاتە جێ خودا ماوەیەکی درێژخایەن مۆڵەتی دەداتێ و پێشمەکەی بۆ شل دەکات، کە سەعاتی سفر هاتە پێشەوەو ئەجەل هات ئەو کاتە خودا دەیگرێت و هەرگیز بەری نادات، دەنا بیّ لەمە: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ (البقرة: ٢٨٦). خودای گەورە مرۆڤی دروست کردووەو ڕێگای خێرو شەڕی بۆ ڕوون کردوونەوە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ (الشمس: ٧ــ١٠). ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾ (البلد: ١٠). وەکو تێبینی دەکرێت دەوڵەت و شارستانیەکان بەتاکە هۆیەك ناڕوخێن، بەڵکو کۆمەڵە هۆکارێك پاڵپشتی دروست بوونیان دەکەن و کۆمەڵە هۆکارێکی تریش بەشداری ڕوخاندنیان دەکەن، هەندێك لەو هۆکارانە کاریگەریان کەمەو هەندێکیشیان کاریگەریان زۆرە، بەڵێ دەوڵەتەکان و شارستانیەتەکان بە یەك گورز ناکەون، بەڵکو چەند گورزێك وێکڕا دایان دەتەپێنن،[١] ئەمەی گوتمان لە ساڵی ٦٤٨کۆچیداو لە وڵاتی (میسر) بەسەر دەوڵەتی ئەییوبیدا هات.

## گرنگترین هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی ئەییوبی لە بۆچوونی مندا:

### ١ــ وەستانی بەرنامەی تازەگەری و چاکسازی:

(صلاح الدینی ئەیوبی) ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت پیاوی قۆناغی خۆی بووو ژمارەیەك سیفاتی بەرزو مەزنی تێدا درەوشابوونەوە، بە حوکمی ئەوەی (نور الدین زەنگی) حەزی بە جیهادو زانست و لەخۆ نزیك کردنەوەی زانایان و بڵاوکردنەوەی دادپەروەری دەهات و میرو وەزیرەکانیشی هەمان ڕێبازی ئەویان گرتبۆبەر، (صلاح الدین) کەش و هەوایەکی سافی بۆ سازاو توانی لە گۆڕەپانی سیاسی و سەربازیدا ئەسپی خۆی تاوبدات و سیفەتە بەرزەکانی لە مەیدانی کرداردا دەربخات، بەڵام دەردی سەرەکی لەنێو دەوڵەتەکەی لەو قۆڵەوە سەری دەرهێنا کە نوێ بوونەوەو خۆ ڕێکخستنەوە ئاراستەیەکی گشتی وەرنەگرت و هەموو بوارەکانی دەوڵەتی نەگرتەوە، بەڵکو بە وەفاتی سەرکردە یان دامەزرێنەر کۆتایی پێهات،[٢] لەبەر ژمارەیەك هۆکار، لەو هۆکارانە:

---

١ أيعيد التأريخ نفسه؟ ص: ١٣٥.

٢ هكذا ظهر جيل صلاح الدين ص: ٣٢٢.

**أ ـ کەموکوڕی (قوتابخانە چاکسازیەکان) لە بواری چالاکی (فیقهی حەرەکی)یدا:**

(قوتابخانە چاکسازیەکان)ی ئەو سەردە چالاکیەکانی خۆیان لە بەرهەمهێنانی ڕەگەزی (ئیخلاس‌و دڵسۆزی لە کاردا)و بواری (پەروەردە)دا چڕکردبۆوەو کەمتر وابوو گرنگی بە ستراتیژیەت بدەن، فیقهی حیکمەت لە ئارادا نەبوو، تا بەو پێودانە دامەزراوە سیاسی‌و ئیداری‌و ئابووریەکان‌و دابەشکردنی بەرپرسیارێتی‌و کارمەندەکانیان‌و بەرهەمهێنانی داهاتە مرۆیی‌و مادیەکانی پێ ڕێك بخەن بە جۆرێك لەگەڵ پێداویستی کات‌و شوێنەکان بێتەوە، لەم بوارەدا زیاتر بە پێڕەوی (فیقهی باوکان) بەڕێوە دەچوون کە جەختی لەسەر (ڕواڵەتی ئاینی) سەرکردایەتی دەکردەوەو کەمتر گوێی بە ڕواڵەتی (کۆمەڵایەتی) دەدات، مەلاو مامۆستاکانیان تەریقەتی (زوهد)یان دەگرتە بەرو هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا خۆیان دەدایە پاڵ یەکێك لە مەزهەبە فیقهیە تەقلیدیەکان، بۆ وێنە بە یەکێکیان دەگوترا ئەمە لەسەر (تەریقەتی قادری)و (مەزهەبی شافیعی)یە، بە هەمان شێوە ئەم قوتابخانانە نەدەهاتن لایەتی حیکمەت‌و فەلسەفەی عیبادەت تاوتوێ بکەن، کە بێگومان لەم ڕێگایەوە پەی بە پەرەسەندنی زانستەکانی سروشت‌و بوونەوەر دەبردرێت‌و لە تەواوی مەیدانەکانی ژیارو شارستانیەتدا سودێکی بەرچاویان لێ دەبینرێت، ئەم ناتەواوی‌و کەموکوڕیەی نێو فیقهی سیاسی‌و ئیداری وایکرد مانەوەی هەموو ئەو دەستکەوتانەی جیلی (صلاح الدین) بەرهەمی هێنابوون بەندبن بە کەسایەتیەکان نەك دامەزراوەکان، کاتێکیش کەسە سەرکردەکان، لەسەر شانۆی ژیان بزربوون، کاریگەری دووەم خۆی هێنایە پێشەوە کە خۆی لە بنەماڵەو گۆشت‌و خوێنی خزم خزمێنەدا دەنواند، لێرەدا بنەماڵە یان تیرەو تایەفە جڵەوی دامەزراوەکانی حکومەت‌و ئیدارەو خودی (قوتابخانەکانی چاکسازی)یشی گرتە دەست، ئەم بەرەو پێش چوونە ناسازە چەند دیاریەکی نادروستی لێ هاتەدی لەوانە:

— کاتێك سەردەمی ڕۆڵەکانی هاتە پێشەوە بە حوکمی ئەوە فیقهێکی سیاسی لە ئارادا نەبوو تا کاروبارەکانی دەوڵەتی پێ ڕێك بخرێت‌و لە دامەزراندنی حوکمڕانی ئایندەدا نەقشی هەبێت، ڕۆڵەکان لایان بە لای کلتوری بنەماڵەیی‌و تایەفەگەری کردەوە کە پێی وایە حکومەت‌و سەرکردایەتی کردنی دامەزراوە پەروەردەیی‌و زانستەکان میراتەو ڕۆڵەکان لە باب‌و باپیرانیانەوە بۆیان بەجێ ماوە، ئەمە سەری کێشا بۆ لێکهەڵوەشانی دەوڵەت‌و بەش بەش بوونی، بەم شێوەیە ئەوەی باب‌و باپیران گردیان کردبۆوە ڕۆڵەکان بەسەر خۆیاندا دابەشکردو بەپێی داب‌و نەریتی عەشیرەتگەری کاروباری خۆیان تێدا هەڵدەسوڕاند، کە بە

پێی ئەم کلتورە خاكو خەڵكی نیشتمان تاپۆی ئەوانە، حوکمڕانەکان دەتوانن مامەڵەی کڕینو فرۆشتنی پێوە بکەنو لە کاتی جەنگو صوڵحدا بەکاری بێنن.

— کەموکوڕی فیقهی سیاسیو ئیداری (دەوڵەتی ئەیوبی) سەری کێشا بۆ تەقینەوەی بورکانی شەڕو ئاژاوەی نێوان سوڵتانو میرانی سوپا، وەکو ڕووداوەکەی نێوان (مەلیك کامیل)و (عیماد الدین أحمدی کوڕی مەشتوبی کوردی هەکاری)، (ابن خلکان) دەربارەی دەڵێ: (عماد الدین) گەنج بوو، لەبەر ڕێزی (سیف الدین ئەبو هەیجای مەشتوبی هەکاری)ی باوکی، ـ کە یەکێك بوو لە گەورە سەرکردەکانی سوپای (صلاحی) ـ، (صلاح الدین) ڕێزی لێ دەنێتو هەرێمی (نابلوس)ی دەخاتە بەردەست، پاشان (عماد الدین) گەلەکۆمە بە خزمە هەکاریەکانی دەکاتو بریار دەدات مەلیك (کامیل) لێ بخاتو (فایز)ی برای لە جێگە دابنێ، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرتو هاوکات لەگەڵ ئەوەدا سوپا خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشو پەلاماری خاچپەرستان سازکردبوو ئاڵۆزیو بگرەوبەردەی تێدا پەیدابوو، (عماد الدین) بەرەو قەڵای (حران) کشایەوە، تا لە ساڵی (٦١٠)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد خۆی لەوێ مەڵاسدا.[1]

بە کورتی: نەبوونی فیقهێکی سیاسیو ئیداری لە نێو دەوڵەتی ئەیوبی: دوای سەردەمی سوڵتان (صلاح الدین) سەری کێشا بۆ هاتنە پێشەوەی چەند سەرکردەو حکومەتێکی تاکڕەو: لە جیاتی ئەوە بە شەریعەتو ڕاوێژو نەخشەدانان حوکمی ئوممەت بکەن هێزو زەبرو زەنگو تاکڕەویو سەرپێچیو حوکمی سەرپێییان ڕەچاو کردبوو.[2]

— (دەوڵەتی ئەیوبی) لەسەر بنەمای فیکرەی جیهادو ڕزگارکردنی نیشتمانی ئیسلامی لە چنگ هێرشی خاچپەرستان دامەزرا، ڕەسەنایەتی فیکرەی جیهادی ئیسلامی لە ناخی خەڵکی شامو میسردا زیندوو کردەوە، کارنامەی جیهادەکەی (صلاح الدین) کە مێژوو لەسەر ڕستەی لاپەڕە پڕشنگدارەکانیدا بۆی تۆمار کردوین لە گۆڕەپانی کرداردا شەقڵی بە دەریای دەروونی موسڵماناندا، بەڵام دوابەدوای وەفاتی (صلاح الدین) فیکرەی جیهاد لە شێوێکدا مایەوەو دەوڵەتی ئەیوبیش چووە شێوێکی ترەوەو بە کورتی ئەو قۆناغەی بەزاند، خۆ ئەگەر ئەم دەوڵەتە بەم شێوەیە درێژەی کێشابایەو بمابایەوە ئەوا بۆی هەبوو فیکرەی جیهادی ئیسلامی کۆتایی پێ هاتباو مەیدان بۆ خاچپەرستان چۆڵ ببایەو بە ویستو

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٢٢.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٢٢.

خواستی خۆیان ئایندەو چارەنووسی ئیسلامیان ڕەسم کێشابایە، کەواتە ئاوابوونی دەوڵەتی ئەیوبیو هاتنە پێشەوەی دەوڵەتی مەمالیك لە جێگایدا دەربڕینێکی بەهێزوپێز بوو بۆ ڕەتکردنەوەی لەنێوچوونی فیکرەی جیهاد، لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامە: ئاوابوونی ئەستێرەی سەڵتەنەتی ئەیوبیو هەلاتنی ئەستێرەی دەوڵەتی مەمالیك لە جێگەیدا بە کردەوە ڕەتی کردەوە کە فیکرەی جیهادو بەرەنگاری ئیسلامی هەرگیز کۆتایی پێ نایەت، بەڵکو دەبێت بەردەوام بەهێزتر بکرێتو درێژەی پێ بدرێت تا بە تەواوەتی ئامانجەکانی خۆی دەپێکێ، پێویستە لەسەر نەوە یەك لە دوای یەکەکان درێژە بە فیکرەی جیهاد بدەن، ئەگەر لەسەر حیسابی ڕووخانی دەوڵەتەکانیانو پیاوە خۆشەویستەکانیشیان بێت دەستبەرداری نەبن، چونکە مانەوەی فیکرەکە بە زیندوویی لە حکومەتێك باشترە کە هیچ هێزو دەسەلاتێکی نیە.[١]

ب ـ دەمارگیری بنەماڵەیی:

یەکێکی تر لەو دیاردە خراپانەی بەشداری وەستانی بزووتنەوەی تازەگەریو چاکسازی کرد بریتی بوو لەو دەمارگیریە بنەماڵەییەی خۆی بە نێو خودی ناوەندی قوتابخانە چاکسازیەکانیاندا کردبوو، لەم بارەوە دەتوانین سوود لە نووسراوی مێژوونووسانی ئەو سەردەمەی وەکو (ابن الوردی)و (ابن المستوفی) بکەین، ئەوان دەڵێن: دوابەدوای وەفاتی شێخو مەلای قوتابخانەکان ڕێك ڕۆڵەو نەوەکانیان بەبێ ئەوەی ئامادەباشی زانستیو ئایینیو ڕەوشتیان تێدابێت جێگەی ئەوانیان دەگرتەوە، بەم شێوەیە دەمارگیری ئایینیو مەزەبیو بنەماڵەیی بەسەر (قوتابخانە چاکسازی)یەکاندا زاڵ بوو، لە لایەن نەوەکانەوە پاوان کران، زانایانو ڕۆشنبیران دەستیان لە کارەکانیان کێشایەوە، تەریقەتو سۆفیگەری — کە لە بری پەروەردەو زانستو کردار بایەخیان بە توقوساتو ڕواڵەت دەدا — باڵی بەسەردا کێشان، لەمەولا (قوتابخانەکان) بە ناوی دامەزرێنەرەکانیانەوە کە هەر یەکەیان نیسبەتی تەریقەتێکی دەدرایە پاڵ وەکو تەریقەتی قادری یان بەیانی یان ڕوفاعی دەناسێنران.[٢]

**٢ـ زوڵمو ستەم:**

ستەم بە نیسبەت لاشەی دەوڵەت وەکو نەخۆشی وایە بە نیسبەت لاشەی مرۆڤەوەو پەلە لە مردنی دەکات، پاش ئەوەی بابای نەخۆش ماوەیەك بە دەردەکەیەوە دەناڵێنێ، بە هاتنی

---

١ الجبهة الاسلامية في مواجهة المخططات ص: ٣٩٥.

٢ هكذا ظهر جيل صلاح الدين ص: ٣٢٣.

(ئەجەل) کۆتایی بە ژیانی دێت و دەمرێت، زوڵم و ستەمیش دەردێکی کوشندەیەو بەربێتە لاشەی هەر دەوڵەتێك خۆر کە ئاسا بەرەبەرە دایدەڕزێنێ و پاش بەسەربردنی ئەو ماوە دیاریکراوەی خودا بەپێی سوننەتی گشتی خۆی بە هۆی ئەو کەمە دادپەروەریەی تێیدا ماوە دەیهێڵێتەوەو لەگەڵ نەمانی ئەوەندەش ئەجەل دەگاتە سەری و داڕوخانی حەتمی بەسەردا دێنێ،[1] خودا (جل جلاله) دەفەرمووێت:

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ (الاعراف: ٣٤).،

(ئالوسی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾ واتە: هەر ئومەتێك – ی نێو ئوممەتە ستەمکارەکان – ئەجەلێکی بۆ دیاری کراوە، بەو واتایەی کاتێك و سەعاتێکی سفری بۆ لەنێوبردن و لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنانیان دیاری کراوە، بەڵام هەرچەندە لەنێوچوونی گەلان شتێکی حەتمی و چاوەڕوانکراوە، بەڵام ئێمە نازانین کەی ڕوو دەدات، واتە: ئێمە دڵنیاین کە گەلی ستەمکار بە هۆکاری زوڵم و ستەمەکەیەوەو بەپێی سوننەتی خودا دەبێ هەر لەنێو بچێ، کەسیش جگە لە خوا ناتوانێ ساڵ و ڕۆژو سەعاتی ئەو لەنێوچوونە دیاری بکات و بزانێ.[2]

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْقُرَىٰ نَقُصُّهُ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ (هود: ١٠٠-١-٢). ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەخا کە سزای خودا تەنها لەسەر ئوممەتە ستەمکارەکانی پێشدا کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو هەر گەل و ئومەتێکی تریش هەمان زوڵم و ستەمی ئەوان ئەنجام بدات ئەوا بەپێی سوننەتی گشتی خودا سەبارەت بە مانەوەو لەنێچوونی گەلان، دەبێ ئەویش هەمان سزا بچێژێت و لەنێوبچێت، چونکە کاتێك خودای باڵادەست بەسەرهاتی ئەوان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ (هود: ١٠٢). خودا ڕوونی دەکاتەوە هەر کەس و ئومەتێك بەشداری ئەو ئوممەتە لەنێوچوانە بکات لەو کارو کردەوانەیاندا کە سەری

---

١ السنن الالهية، د. عبدالكريم زيدان ص: ١٢١.

٢ المصدر نفسه ص: ١٢١.

کێشا بۆ لەنێوچوونیان، ئەوا دەبێ بەشداری ئەو ئەنجامە تاڵەشیان بکات کە تووشی هاتن، ئایەتەکە دەفەرموێت ستەم بفەیەو،[١] لە بەرامبەر مەترسیەکانیدا وریامان دەکاتەوە، دەگونجێ دەوڵەتێکی کافر دادپەروە بێ، بەو واتایەی حوکمڕانەکانی ستەم لە خەڵك ناکەن، خەڵکەکەشی لە نێو خۆیاندا ستەم لە یەکتری ناکەن، ئەم دەوڵەتە هەرچەندە کافریش بێت دەمێنێتەوە، چونکە لە سوننەتی خودادا نیە دەوڵەت بە هۆی کافر بوونیەوە لەنێوبچێ، بەڵام هەر کاتێك ستەمی حوکمڕانەکانی دەرهەق بە خەڵکەکەیو ستەمی خەڵك دەرهەق بە یەکتری هاتە سەر کوفرەکەی ئەو کاتە دەبێ لەنێو بچێ،[٢] خودای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾ (هود: ١١٧). ئیمامی (ڕازی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (الظلم) لەو ئایەتەدا بە واتای (شیركو كوفر) بێت، بە واتای ئەمە: خودای باڵادەست خەڵکی شارێك تەنها لەبەر ئەوەی موشریکن لەناو نابات، ئەگەر لەگەڵ یەك گونجاوو چاك بنو مامەڵەیان ڕێکوپێك بێتو لەسەر بنەمای چاکەکاری ڕەفتار لەگەڵ یەکتردا بکەن).[٣]

لە تەفسیری قورتوبیشدا هاتووە: (بظلم) واتا بەهۆی شیركو كورفرەوە، (واهلها مصلحون) واتە سەبارەت بە مافەکانی یەکتری چاكنو سنووری یەکتر ناشکێنن، واتای ئایەتەکە: خودای باڵادەست تەنها بەهۆی کافربوونیانەوە لەنێویان نابا، تا گەندەڵیو زوڵمو ستەمی خۆیانەوە نەچێتە سەر، وەکو چۆن خودا گەلی شوعەیبی بە هۆی (تەرازووبازی)و گەلی (لوط)یشی بە هۆی (نێربازی) لەنێو برد.[٤] (ابن تیمیة) بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێ سەبارەت بە لەنێوچوونی دەوڵەتی ستەمکار – ئەگەرچی موسڵمانیش بێ – دەڵێ: کاروباری خەڵك بە هۆی عەدالەتو دادپەروەری بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچێ ئەگەر هەندێ تاوانو گوناهی بە دەر لە ستەمی لەگەڵ ئەنجام بدرێن، ستەمێك کە سەردەکێشێ بۆ پێشێلکردنی مافەکانی خەڵك، بۆیە دەگوترێت: خودا دەوڵەتی دادپەروەر ڕاوەستاو دەکات ئەگەرچی کافریش بێت، بەڵام دەوڵەتی ستەمکار ڕاوەستاو ناکات با موسڵمانیش بێت، دەشگوترێ: دونیاداری لەگەڵ دادپەروەریو بێ باوەڕی بەڕێوەدەچێو درێژە دەکێشێ، بەڵام لەگەڵ ستەمو ئیسلام بەڕێوە ناچێو درێژە ناکێشێ، چونکە دادپەروەری سیستەمی هەموو

---

١ الدولة الاموية للصلابي ٢/٥٧١.
٢ السنن الالهية، ص: ١٢١.
٣ تفسير الرازي ١٨/١٦.
٤ تفسير القرطبي ٩/١١٤.

شتێکە، ئەگەر کاروباری دونیا بە دادپەروەری بەڕێوە بچێ ڕاوەستاو دەبێت ئەگەر بە ستەم بەڕێوە بچێت ڕاوەستاو نابێت، ئەگەرچی خاوەنەکەشی هێندەی ئیمان هەبێ بەشی قیامەتی بکات.[1]

لە سەردەمی ئەیوبیەکاندا زوڵم و ستەمی گەورە ئەنجام دران، خۆبەخۆ خوێنی یەکتریان ڕشت، لە پێناوی گرتنی جڵەوی دەسەڵات و زاڵبوون بەسەر خەڵکدا برا برای بە ناهەق دەکوشت، مام خوێنی برازای بە خۆڕایی دەڕشت، (دیمەشق) گەمارۆ دراو دانیشتوانەکەی تووشی برسێتی کرا، هەندێك سوڵتانیان زیادەڕۆییان لە سەروەت و سامانی گشتی موسڵماناندا دەکرد، جاروبار بەبێ پاساو دەست درێژیان دەکردە سەر موڵك و ماڵی ڕەعیەت، لە کتێبی (الایوبیین بعد الصلاح الدین)و (الحملة الصليبية الرابعة والخامسة والسادسة والسابعة)دا بە درێژی لەسەر ئەم بابەتە ڕۆیشتووم.

**٣ـ خۆشگوزەرانی و ڕۆچوون لە هەواو هەوەسبازیدا:**

خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾﴾ (هود: ١١٦). ﴿وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ﴾ واتە: ستەمکارەکانیشیان بە دوای ئەو خۆشگوزەرانیە کەوتن کە بۆیان سازابوو، لێرەدا مەبەست لەو ستەمکارانە: ئەو کەسانەن ڕێگریان لەو خراپانە نەدەکرد کە ئەنجام دەدران، واتە بایەخیان بە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە نەدەدا کە یەکێکە لە پایە گەورەکانی ئاین، بەڵکو بایەخیان بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و هەواو هەوەسبازی و کەڵکەڵەی کوێخایەتی دەدا،[2] خوداش بە پێی سوننەتی خۆی هەر دەوڵەتێك بەم شێوەیەی لێ بێت و لە شەرعی خودا دوورکەوێتەوە سزای بۆ نازل دەکات: خودا دەفەرمووێت: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾﴾ (الأنبياء: ١١ـ١٣).بە پێی سوننەتی خودا ئوممەت بە هۆی گەندەڵ بوونی دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانەکانی لەنێو دەچێ، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا

---

١ رسالة الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر ص: ٤٠.

٢ السنن الالهية في الامم والجماعات والأفراد ص: ١٨٦.

أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ (الإسراء:١٦).

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هاتووە: کە کاتی لەنێوچوونیان نزیك بۆوە، فەرمان بەسەر خۆشگوزەرانەکانیاندا دەدەین گوێڕایەڵیو فەرمانبەردار بن، مەبەست لە (مترفیها): خۆشگوزەرانو دەسەڵاتدارو پاشاکانیانن، بەڵام کە بە گوێیان نەکردینو لەسەر گەندەڵکاریەکانیان بەردەوام بوون، ئەوا سزای لەنێوچوونیان بەسەردا واجب بوو و ئێمەش تەفرو توناما ن کردن، لێرەدا خودا (جل جلاله) بە تایبەت ناوی خۆشگوزەرانەکانیانی هێناوە بەڵام فەرمانەکە گشتیەو ڕووی لە هەموو ئوممەتەکەیە، چونکە ئەوان گەلێکی گەندەڵنو سەر بە کۆمەڵە سەرۆکێکی گومڕان، ئەوان شوێن ئەو سەرکردە خراپانە کەوتنو گەندەڵیش تیراوە ئاسا هەموو لایەکی گرتەوە، بۆیە بێگومان فەرمانەکە ڕووی لە هەموو لایەکیانە.[١]

کاروباری سەڵتەنەتی ئەیوبیان لە سەردەمی (صلاح الدین) بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچوو، بەڵام لەگەڵ هاتنە پێشەوەی سەردەمی ڕۆڵەکانی کاروبار لە گرێژە نەچوو بارودۆخ بەرەو خراپی ڕۆیشت، ژمارەیەکیان خۆشگوزەرانیو هەواو هەوەسبازیان هەڵبژاردو خۆیان لە نازونیعمەتەکاندا قوم کردو بە گوناهو تاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوداوە سەرقاڵ بوون، بەڵگە لەسەر ئەم بەزمو ڕەزمەیان زۆرنو ئەمەی بە نموونەی دێنینەوە لە دوو سەردەمی مەلیك (ئەفزەل)و مەلیك (صالح)دا ڕوویداوە، (ئوستاد دار) سەرۆکی ئەمیندارەکانی مەلیك بوو، لە لایەکەوە وەزیر بوو و لە لایەکی تریشەوە لە کاتی جەنگەکاندا سەرکردایەتی سوپای فەتحکردنی (دیمەشق)ی دەکرد، فەرقی بە حەڵاڵو حەرام نەدەکرد هێزو پۆستی دەسەڵاتی لە کاری خراپدا بەکار دەهێنا، کار بەوە گەیشت تاوانێکی گەورەی ئەنجامداو بە پێچەوانەی حوکمەکانی ئایین ڕەفتاری نواندو هەستو نەستی موسڵمانانی بریندار کرد، ئەمەو لەسەر بانی یەکێك لە مزگەوتەکانی (قاهیرە) ژوورێکی بە ناوی (تەپڵخانە) دروست کردو گۆرانیو مۆسیقای تێدا لێ دەدرا، سوڵتانی زانایان (عیزی کوڕی عبدالسلام) بەرەنگاری ئەم تاوانە بۆوە، هەروەها لەو سەردەمەدا گرنگی زۆر بە سفرە ڕازاندنەوە دەدراو سازکردنی خواردنو خواردنەوەی هەمەڕەنگو بەسەر یەکنانی سەروەتو سامانو ڕاگرتنو زۆرکردنی ئەسپو وڵاخی سواریو خانوبەرەو کۆشكو تەلارو جلوبەرگو فرەژنی بە لای هەندێك لە میرو سوڵتانەکانی بنەماڵەی ئەیوبیەوە بایەخی بێ ئەندازەی پێ دەدرا، کە هەموو ئەم کلتورانە سەر بۆ لەنێوچوونی دەکێشن.

---

١ تفسير الالوسي ١٥/٤٢.

## ٤ـ پەکخستنی شورا:

ئەیوبیەکان سیستەمی ڕاوێژیان هەڵدایە ئەودیو دیواری حوکمڕانیەوە، لە کاتێکدا ڕاوێژ ئەو سیستەمەیە لەسەر بنەماکانی هەڵبژاردنی ئازادی ڕکەبەری وەستاوەو سەرکردە ڕاشیدەکان بە ئاماژەی قورئان و سوننەت پەیڕەویان لێکردووە، بازدان بەسەر ڕاوێژدا پەرچەکداری سامناکی لەنێو دەوڵەتی ئەیوبیدا لێکەوتەوە، خۆزاڵکردن و دەست بەسەرداگرتن بوو بە تاکە ڕێبازی بە دەستەوەگرتنی پۆستی سەڵتەنەت، ئەمە مەلیك (عادل)ە و کاتێك بەسەر برازاکانیدا زاڵ دەبێ ڕووبەڕووی وەزیرەکانی دەڵێ: ئێستا لەگەڵ ئەوەدا پیر بووم و بەساڵدا چووم شتێکی ناشیرینە بۆ من میرایەتی (ئەتابەکی) بەسەر ئێوەدا بکەم، هەرچەندە سەڵتەنەت ماڵەمیرات نیە بەڵکو هی ئەو کەسەیە زاڵە و دەسەڵاتی هەیە، دەبوایە یەکسەر دوای سوڵتان مەلیك ناسری برام (خوا ڕەحمی پێ بکات) ئەم پۆستە بۆ من بوایە، بەڵام من بە خاتری ڕێزو حورمەتی برایەتی خۆم تێ نەگەیاند، کاتێکیش ناکۆکی و ئاژاوە هاتە ئاراوە ترسام سەڵتەنەت لە دەست من و لە دەست برازاکانم دەربچێت، ئێستاش کاروبار گەیشتۆتە دواخاڵی،[1] پاش ئەمە (مەلیك عادل) شەڕێکی زۆری لەگەڵ کردن و بەرەو سیستەمی مەلیکایەتی بایدایەوە و کوڕەکانی خۆی کردنە میراتگری سەڵتەنەتەکەی، ئەم سیستەمە بەشداریەکی کاریگەری هەبوو لەسەر ڕوخانی دەوڵەتی ئەیوبی چونکە: سۆزی باوکایەتی و خزم خزمێنە و هێزی دەمارگیری تێدا بەسەر کاری دەوڵەتداریدا بە شێوەیەکی گشتی زاڵ ببوو، ئەمەش سەری کێشا بۆ ئەم چەند خاڵەی خوارەوە:

- تەسککردنەوەی بازنەی هەڵبژاردنی سوڵتان لە بنەماڵەیەکی دیاریکراودا.
- کورتهەڵێنانی بنەمای ڕاوێژ لە بنەماڵەی بەهێزی حوکمڕاندا.
- پۆستی سەڵتەنەتی ڕادەستی کەسێك دەکرد کە لە هەمان کاتدا کەسی باشتر هەبوو، بەڵکو دەیدایە کەسێك مەرجەکانی ئەو پۆستەی تێدا نەبوون و کەسانێکیش هەبوون هەموو مەرجەکانی تێدا کۆببوونەوە و فەرامۆش دەکران.
- دانانی حوکمڕانانێك کە جێگای تۆمەت و گومان بوون.
- ئەمە وای لە هەندێك خەڵك کرد گومانیان بەسەر شەرعیەتی بەیعەتدان بۆ سوڵتان و وەلی عەهد بۆ دروست ببێ.

---

١ في التفضيل الاسلامي للتأريخ ص: ٦٠.

- سەری کێشا بۆ دروست بوونی دوژنایەتی لەنێو بنەماڵەی ئەیوبیداو پاشانیش بۆ نەمانو لەدەستچوونی هێزو دەسەڵاتیان.[١]

**٥ـ ناکۆکی نێوخۆی نێو بنەماڵەی ئەیوبی:**

سوننەتی خودای کاربزان لە بەرامبەر نەتەوەکاندا جێگیرەو تۆزقاڵێك گۆڕانی بەسەردا نایەت، خودای باڵادەستو لێزان ناکۆکی نێوخۆیی کردووە بە یەکێك لە هۆکارە هەرە گەورەکانی لەنێوچوونی گەلانو ڕووخانی دەوڵەتەکانیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((فإن مَن كان قبلكم إختلفوا فهلكوا))، واتە: کەسانێك یان گەلانێك لەپێش ئێوەدا هاتنو ناکۆکیان تێکەوتو لەنێوچوون، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((فأهلكوا)) واتە: جا لەنێوبران، (ابن حبان) لە (ابن مسعود)ەوە خوای لێ ڕازی بێت ڕیوایەت دەکات: ((فإنّما أهلك من كان قبلكم الاختلاف))،[٢] واتە: بە تەنها ناکۆکیو ئاژاوەی نێوخۆ گەلانی پێش ئێوەی لە بەین برد.

دەتوانین لە ماوەی ئەم لێکۆڵینەوە مێژووییەدا وانەیەکی گرنگ فێر ببین: کە بە هەموو شێوەیەك خۆ لە ناکۆکیو کێبەرکێی ناشەریفانە بپارێزین چونکە ئەمە سەر بۆ لەنێوچوون دەکێشێ، ئەمەی گوتمان بووە مایەی لەنێوچوونو پێچانەوەی یەکجارەکی تۆماری دەسەڵاتی ئەیوبی، ناکۆکیو ئاژاوەکانیان چەند هۆکارێکیان لە پشتەوە بوون، وەکو: (لاوازی هاندەری ئاینی لای هەندێك لە سوڵتانەکانیان، خۆپەرستیو خۆویستی، ئاژاوەگێڕان لەسەر بەرژەوەندیە دنیاییەکانو خۆبەکوشتدان لەسەری، داکۆکی کردن لەسەر کورسی دەسەڵاتو پۆستە بەرزەکانی حکومەت، بەڕێوەبردنی حوکومەت بە گوێرەی هەواو هەوەس لە لایەن هەندێك تاکی خانەوادەی ئەیوبیەوە).

ئەم هۆکارانە بوونە دەستەچیلەی ئاگری ناکۆکیەکانی نێو ئەندامانی بنەماڵەی ئەیوبیو بوونە کێوی ڕووخێنەری بینای دەوڵەتەکەیان، (ابن خلدون) بەدواداچوونێکی باشی ئەم ڕاستیەی کردووەو دەڵێ: یەکێك لە شوێنەوارەکانی پیربوونی دەوڵەت دابەش بوونیەتی، کێشمەکێشمی نێوخۆی بنەماڵە سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتەکە تەسك دەکاتەوە، پاشان کار بەوە دەگا کوت کوت بکرێتو بپوکێتەوە.[٣]

---

١ نظام الحكم في الاسلام ص: ٣٠٧.

٢ صحيح البخاري بشرح العسقلاني ٩/١٠١ـ١٠٢.

٣ الضعف المعنوي وأثره في سقوط الأمم ص: ١١٨.

بێگومان دوابەدوای وەفاتی (سوڵتان صلاح الدین) ئاژاوەیەکی توند بەرۆکی ئەندامانی بنەماڵەی ئەیوبی گرت و، هەموویان لە دژی یەك ڕاست بوونەوەو برا ڕێزو حورمەتی برای نەدەگرت و مام بەزەیی بە برازاکانیدا نەدەهاتەوە، (مەلیك عادل) نەزانی و کەودەنی ڕۆڵەکانی (صلاح الدین)ی کردە بیانوو و پەیوەندیە کۆنەکانی و پلەوپایە پێشینەکانی بەکارخستن و هەوڵیدا پێش ئەوە (مەلیك عەزیز)و سەربازەکانی شمشێر لە کالان دەرکێشن، تێکشکانێکی گورچوبڕی سەربازی و سیاسی بەسەردا تۆماربکرێت، ئەمە لە حاڵەتێکدا کێبەرکێی نێوان میرەکانی (صلاحی) – واتە میرەکانی صلاح الدین – و میرەکانی (ئەسەدی) – واتە میرەکانی أسد الدین شێرکۆ کە صلاح الدین لە نێو ئەواندا پێگەی و بە مەقامی سەڵتەنەت گەیشت – لە گۆڕێدا بوو، (مەلیك عادل) ئەم دوو لایەنەی لێك توند کردن و هەوڵەکەشی سەری گرت.[1]

قازی (خلاّف) بەم شێوەیە وەسفی بنەماڵەی ئەیوبی دەکات:

لەم بنەماڵەیەدا باوکەکان ڕێککەوتن و مەلیکایەتیان کرد، ڕۆڵەکانیان ناکۆك بوون و لێکەوتن و لەنێوچوون، ئەگەر ئەستێرەیەك ئاوابێ چ فێڵێ هەن دەرکەوێتەوە؟، ئەگەر پۆشاکێك کون بوو هەر بەرەو دڕان دەڕوات و دوورە وەکو خۆی لێ بێتەوە، ڕێڕەوی خۆی بگرێتەوە، ئەگەر خودا لەگەڵ یەکێك لە دوو دوژمن بوو کێ دەرفەتی ئەوەیان دێ خودای لەگەڵ بێت.[2]

دوابەدوای مردنی (مەلیك عادل)یش ئاژاوەو دووبەرەکی نێوانیان بەردەوام بوو، بە جۆرێك شەڕی نێوان (مەلیك معظم)و (مەلیك کامل)ی کوڕانی خانەوادەی ئەیوبی بەرەو خراپتر ڕۆیشت.

**٦ـ دۆستایەتی کردنی مەسیحیان:**

دۆستایەتی و دەستبەرداری (الولاء والبراء) یەکێکە لە پێداویستیەکانی ئیمانی ڕاست و دروست، دەوڵەت لە سەردەمی (صلاح الدین)دا کاری بەم ئایەتە پیرۆزە دەکرد: ﴿لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾﴾ (ال عمران: ٢٨).

---

١ في تأريخ الأيوبيين والمماليك، قاسم عبده ص: ٨٢ـ٨٣.

٢ دور الفقهاء ص: ١٧٤.

واتە: نابێ ئیمانداران جگە لە ئیمانداران کەسانی کافر بکەنە دۆستو یارو یاوەری خۆیان، هەر کەسو گەلێك ئەمە بکات، مافی بەسەر خوداوە نامێنێ، جگە لە حاڵەتێك ترستان لێیان بێ، خودا لە سزای خۆی دەتانترسێنێ – تا شتی وا نەکەن – چونکە گەڕانەوە بۆ لای خودایە – و لەمە لێتان دەپرسێتەوە.

هەروەها خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ (المائدة: ٥١).

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە جوولەکەو دیانەکان مەکەنە دۆستی خۆتان – لە کاتێکدا – ئەوان – لە دژی ئێوە – دۆستایەتی یەکتر دەکەن، هەرکەس لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوا دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە، خودا هیدایەتی گەلی ستەمکار نادات

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((أوثق عرى الايمان: الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله))،[١] واتە: پتەوترین ڕەگی ئیمان: دۆستایەتی کردنە لەبەر خاتری خودا، دوژمنایەتی کردنە لەبەر خاتری خودا، خۆشویستنە لەبەر خودا، ڕق لێبوونەوەیە لەبەر خودا.

دۆستایەتیو دوژمنایەتی لەبەر خودا لە سەردەمی (مەلیك كامیل)دا لاواز ببوو، کاتێك قودس بەبێ بەرەنگاریو ڕژانی خوێن درایە دەست (ئیمپراتۆر فریدریکی دووەم) ئەم مەسەلەیە چاکتر ڕۆشن بۆوە، موسڵمانان ئەمەیان بە تاوانێکی گەورە داناو خەمو پەژارە بە جۆرێك دایگرتن کە وەسف ناکرێت، (مەلیك كامیل) ئامادەیی تەواوی تێدابوو لە دژی (مەلیك معظم)ی برای – کە لەگەڵ خوارەزمیەکان هاوپەیمانێتی بەستبوو – هاوپەیمانی لەگەڵ (خاچپەرستان) ببەستێ، لە لایەکی ترەوە (مەلیك صالح نجم الدین إسماعیل) هاوپەیمانێتی لەگەڵ خاچپەرستان گرێداو قەڵایەکی تەسلیم کردن، (شێخ عزالدین کوڕی عبدالسلامو ابن الحاجب) لە دژی ئەم ڕەفتارەی وەستانەوە، ئەویش ماوەیەك بەندی کردنو پاشان بەریدانو لە ماڵەکانی خۆیاندا دەست بەسەری کردن، بەم شێوەیە (صالح نجم الدین اسماعیل)ی مەلیکی (دیمەشق) لە دژی (مەلیك صالح نجم الدین أیوب)ی مەلیکی (مصر) هاوپەیمانێتی لەگەڵ خاچپەرستەکان سازداو بەڵێنی پێدان ئەگەر پشتیوانی لێ بکەن ئەوا مەملەکەتی (بیت المقدس)ی دێرینیان بە خاکی (أردن)یشەوە ڕادەست دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بۆیان بسەلمێنێ

---

[١] صحیح الجامع.

نیازی ساغە لەگەڵیاندا بە پەلە بەڵێنەکەی جێبەجێ کردو (قودس و تەبەرپیە و عەسقەلان و قەڵای (شەقیف)و (ئەرنون)و (صفد)ی بە خاك و ئاوەدانی و مەزراکانیانی تەسلیم کردن و نیوەی خاکی (صیداو طبرية)و شاخی (ئامول)و تەواوی سەرکەنار دەریای دانەدەست، ڕای گشتی ئیسلامی لە (مصرو شام) لە بەرامبەر ئەم دلاواییە سەرسورهێنەرەی (صالح اسماعیل) خرۆشاو کار بەوە گەیشت پاسەوانی چەند قەڵایەك فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ نەکرد، لەم کاتەدا خاچپەرستان بە پەلە (بیت المقدس)یان وەرگرت و قەڵای (طبرية)و (عەسقەلان)یان نۆژەن کردنەوەو لە نێوان (یافا)و (عەسقەلان)دا خۆیان پڕچەك کردو بۆ هەنگاوی دووەم خۆیان ئامادەباش کرد، لێرەدا (صالح اسماعیل) بەڵێنی دانێ ئەگەر (مصر)ی گرت ئەوا بەشێکی ئەوێشیان دەداتێ، لە ناو ئەمە لیکیان لە لا لغاودا هاتە خوارو بە مەبەستی داگیرکردنی (مصر) بەرەو (غەززە) بەڕێکەوتن،[1] ئەمەو (صالح اسماعیل)ی حوکمڕانی (دیمەشق)و (مەلیك منصور ابراهیم ئەیوبی)ی حکومڕانی (مصر) بە جووتەو بە خۆیان و سوپاکانیانەوە بە نیازی داگیرکردنی (مصر) پێشڕەویان کرد،[2] بەڵام سەرکردەکانی سوپای شام بڕیاریاندا شەڕ لەگەڵ برا (مصر)یەکانیان نەکەن و هەر کە لە (غەززە) لە سوپاکەی (مەلیك صالح ایوب) نزیك بوونەوە پشتی (صالح اسماعیل)و (منصور ابراهیم)یان بەرداو پەیوەندیان بە بەرەی ئەوبەرەوە کردو بەم شێوەیە سوپای (شام) پاڵی بە سەربازگەی سوپای (مصر)ەوە داو لەگەڵ ئەواندا هێرشیان کردە سەر سوپای (فەرەنگ)و تێکوپێکیان شکاندو ژمارەیەکی بێ شوماریان لێ بەدیل گرتن.[3]

بەم شێوەیە بینیمان چۆن (مەلیك صالح اسماعیل) لەگەڵ خاچپەرستان بووە هاوپەیمان و لە پێناوی گرتنی جڵەوی حکومەت و سەڵتەنەتدا تەنازولی بۆ کردن و شارو خاکی موسڵمانانی ڕادەست کردن، وەك دەرکەوت هەندێك مەلیکی سەڵتەنەتی ئەیوبی دەستی دۆستایەتیان لەگەڵ دیانە خاچپەرستەکان تێکەڵ کردو خۆشەویستی خۆیان نیشان دان و لە جیاتی ئیمانداران کردیانن بە پشتیوان و پەناگەی خۆیان و هەوڵیان دا عەقیدەی (دۆستایەتی و دەستبەرداری) لەنێو ئوممەتدا لاواز بکەن، بەم شێوەیە خۆیان تووشی ئەم دەردە کوشندەیە کردو خۆیان و دەوڵەتەکەیان بەرەو لەنێوچوون و داڕمان برد.

---

١ النجوم الزاهرة ٦/٣٢٢، الدولة الايوبية د عكور ص: ٢٣٣.
٢ النجوم الزاهرة ١/٣٠٥، الدولة الايوبية ص: ٢٣٣.
٣ السلوك ١/٣٠٥، الدولة الايوبية ص: ٢٣٣.

**٧ـ شکستی ئەیوبیەکان لە ڕاست بەدیهێنانی تەوژمێکی شارستانی:**

(صلاح الدین ی ئەیوبی) بەوپەڕی ئیمانی ڕاستو دروستەوەو زیرەکی بێ وێنەیەوە هەوڵیدا ئالای ئەو پرۆسە ئیسلامیە هەڵبگرێت کە لە لایەن (نور الدین محمد زەنگی)یەوە پێشەوایەتی دەکرا، بە دەستێك بانگەوازی دەگەیاندو بە دەستێکیش سەرکەوتنی سەربازی تۆمار دەکردن، بە جۆرێك نەیدەهێشت نە دەوڵەت لە بانگەواز هەڵگەڕێتەوە نە خاکیش لە شارستانیەت یاخی بێت، هەموو پێوانە سیاسیەکانیشی بە ئاینەوە دەبەستەوەو سیاسەتی شەرعی لە جوڵانەوەکانیدا پێڕەو دەکرد، هەموو هەوڵو تەقەلاکانی خستنەگەڕ تا تەوژمێکی شارستانیانەی ژیرانە بێنێتەدیو بنەماکانی ژیانو گوزەران ڕاست کاتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ دەوڵەتی ئەیوبی لە دوای وەفاتی (صلاح الدین) نەیتوانی درێژە بە درێژکردنەوەی قانونی شارستانی بدات، دەبوایە دوای بەڕێکردنی ئەم کاروانی شارستانیەتەو سەرکەوتنە مەزنانە (ی صلاح الدین هێنانیە ئاراوە) کاروچالاکی بانگەوازو گەشەپێدانی قوتابخانە ئیصلاحیەکان درێژەیان پێ بدرایەو پێداویستیە زانستیو ڕۆشنبیریو شارستانیەکانی ئەو سەردەمەیان پێ جێبەجێ بکرابایە، بەڵام (مخابن) جێنشینەکانی (صلاح الدین) نەیانتوانی پرۆژەیەکی شارستانی پێشکەش بکەنو ڕەگەزەکانی ژیانەوەو بوژانەوە بۆ دەوڵەتەکەیان بەدی بێننو نەخشەی کارو ئامانجەکانی بۆ بکێشنو بەو هێزو دەسەڵاتەی هەیانە بەرەو لوتکەی سەرکەوتن پێشڕەوی بکەن، بەڵکو خۆیان بە تونێلە تاریکەکاندا کردو بە لەنێوچوونی دەوڵەتەکەیان کۆتاییان پێهات، بەڵێ، مەلیکەکانی سەڵتەنەتی ئەیوبی ی دوای صلاح الدین – لە هێنانەدی تەوژمێکی شارستانیدا دەستەپاچە بوونو نەیانتوانی هاوسەنگی لە نێوان دەوڵەتو بانگەوازداو خاكو عەقیدەداو سیاسەتو فیکردا بێننەدی، ئەیوبیەکان دەرهەق بەم پەیامە بەرزە کەمتەرخەمیان کردو خۆیان خستە بەر تەوژمی بارودۆخەکانو لە بەرامبەر قانونی مێژووی شارستانیەتدا – کە بەرامبەر هیچ کەسو نەتەوەیەك سۆزو بەزەیی نانوێنێ – خۆیان ڕانواند، یان دەبێ بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵێنن، یان دەبێ بەرەو نەمان بچن، چونکە لە ڕێڕەوی مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕاوەستان نیە.

**٨ـ لاوازبوونی حوکومەتی ناوەندی:**

(صلاح الدین) دەوڵەتەکەی بۆ چەند هەرێمێکی ئیداری دابەشکردبوو، هەریەك لەو هەرێمانە وەکو (مصر، شام، باکووری عێراق، نەوبە، مەغریب، یەمەن، حیجاز) خاوەنی دەسەڵاتو پێڕەوی تایبەتی خۆیان بوون، (صلاح الدین) زۆربەی سالانی سەڵتەنەتەکەی لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا بەسەر برد، بە سیاسەتی نەخشەدانانو ڕاپەڕاندنو سەرپەرشتیو

ئاراستەکردنی کاروبارە باڵاکانی دەوڵەتەوە سەرقاڵ بوو، ئازادی ڕاپەڕاندنی کاروباری هەرێمەکانی لە خۆئامادەکردنو بەرگریکردن لە خۆی بە گوێرەی ئیمکانیاتی بەر دەستیانو بارودۆخی هەرێمەکە بە والیەکان سپاردبوو، ئەم جۆرە بەڕێوەبردنە لە زاراوی ئەم سەردەمەدا پێی دەگوترێت (لامەرکەزی ئیداری)،[1] وەکو دەبینین (صلاح الدین) لەگەڵ ئەوەدا بە خودی خۆی حکومەتی ناوەندی هەڵدەسوڕاند، بەڵام هەموو دەسەڵاتەکانی بۆ خۆی قۆرغ نەکردبوون، لە ڕاستیدا ئەو دەرکی بەو ڕاستیە کردبوو کە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان بەم شێوازە پەسندەو هەریەکەیان بە چاوی جاسوس تەماشای بەرامبەرەکەی دەکاتو هاوسەنگی لە نێوان خستنەگەڕی تایبەتمەندیو پسپۆڕیەکاندا دروست دەبێت، هەروەکو چۆن دابەشکردنی کار لە نێوان ژمارەیەك کەسی هەڵکەوتوو و شایستەدا بەرهەمی چاکی لێ دەکەوێتەوە بە جۆرێك کارەکان بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەبرێنو بە خێرایش بە ئەنجام دەگەیەنرێن،[2] بێگومان دەوڵەتی ئەیوبی بەند بوو بە سیفەتە بەرزەکانی کەسایەتی خودی دامەزرێنەرەکەیەوە کە (صلاح الدين ی ئەیوبی) بوو، کاتێك ئەستێرەی ئەم کەسایەتیە ئاوا بوو و لەسەر شانۆی مێژووی ناوچەکە ون بوو بۆشاییەکی گەورە دروست بوو و زیانی گەورە بەر جیهانی ئیسلامی کەوتو باری قازانجەکەش بە لای خاچپەرستەکاندا شکایەوە، چونکە کەسایەتیو بەهرەکانیو ڕۆڵە سیاسیو سەربازیەکانی ئەم پاڵەوانە دەوڵەتەکەی لە لەنێوچوونو لێکهەڵوەشان پاراست، لە لایەکی ترەوە لە سۆنگەی ئەوەوە هیچ دامەزراوەی سەربەخۆ لەو کاتەدا دروست نەکرابوون تا بتوانرێ بە هۆیانەوە درێژە بە بەرقەراربوونو مانی ئەو دەوڵەتە گەورەو بەرفراوانە بدرێ، هەروەك دەبینین (صلاح الدين) دەوڵەتەکەی خۆی بە شێوەی دابەشی ماڵە میرات بە گوێرەی باوی ئەو سەردەمە بەسەر کوڕەکانیو براکانیو برازاکانیدا دابەش کردبوو، لەبەر ئەمە شتێکی ئاساییو سروشتی بوو جارێکی تر ناوچەکە بە هۆی کێشەو ئاژاوەی بگرەوبەردەی سیاسی نێوان میراتگرانی (صلاح الدين) بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، کاتێك (صلاح الدين) وەفاتی کرد (أبوالفتوح عثمان)ی کوڕی لە (مصر)دا جێنشینی ئەو بوو و لە قاهیرە نیشتەجێ بوو، زۆربەی سوپا سەربازو میرەکانی (ئەسەد)ی (صلاحیو کوردی) لە لابوون،[3] (نور الدين)ی براشی بوو بە حوکمڕانی (دیمەشق)، (مەلیك عادل)یش (کەڕەكو شەوبەك)ی کەوتە ژێر دەست، (زاهیر

١ تاريخ الايوبيين طقوس ص: ٢١٠.

٢ المصدر نفسه ص: ٢١١.

٣ السلوك ١/١١٤، في تاريخ الايوبيين والمماليك ص: ٨٠.

غازی)یش بوو به حوکمڕانی وڵاتی باکووری شام‌و (حەلەب) پایتەختی بوو، تەواوی هەرێمە ناسەرەکیەکانی تریش له لایەن برازاکانیەوە حوکمیان تێدا دەگێڕدرا، له (حمص) چەند کەسێکی خێزانی (تقي الدين عمر کوڕی شاهەنشا) حوکمڕانیان دەکرد،[1] بەم شێوازە ئەم دەوڵەتە هەرێمیە گەورەی بە هەوڵ‌و تەقەللای (٣) جیلی (عماد الدين زەنگی‌و نور الدين محمودو صلاح الدين)ەوە له ناوچەکانی عێراق‌و شام‌و مصردا دامەزرێنرا ڕەگ‌و ڕیشاڵەکانی لێك هەڵتەکێنران، ئەم شێوە دابەشکردنەی کاروباری دەوڵەت – بە وێنەی دابەشی ماڵە میراتی تایبەت – بووە هۆکارێکی سەرەکی داڕوخانی یەکێتی سیاسی لە لایەك‌و لە لایەکی تریشەوە بووە مایەی تەمەن درێژی قەوارەی خاچپەرستان له ناوچەکەدا،[2] بەم جۆرە دەوڵەتەکەی (صلاح الدين) بە مردنی خۆی کوت کوت کراو حکومەتی ناوەندی لاواز بوو، بە خاتری گرتنی پۆستی باڵای سەڵتەنەت‌و فراوانخوازی ئاگری جەنگ‌و هەرا لەنێو میرو مەلیکەکانی ئەیوبیدا هەڵایسا.

**٩ـ لاوازی سیستەمی هەواڵگیری:**

لە سەردەمی (صلاح الدين)دا دامەزراوەی پۆستەو هەواڵگری سەبارەت بە جموجۆڵی خاچپەرستەکان زۆر بەهێزبوو و بە ڕاست‌و دروستی هەواڵەکانی دەنگی دابۆوە، ئەوپەڕی وردەکاری‌و خێرایی ڕەچاودەکردو سات بۆسات‌و بەردەوام هەواڵی جموجۆڵی دوژمنانی دەگەیاند، ئەمەی گوتمان لە کاتی گەمارۆدانی (عەکا)دا ڕەنگی دابۆوە، دەزگا هەواڵگیریەکەی (صلاح الدين) ژمارەیەك خاچپەرستیشی لەخۆگرتبوون، ئەمانە ئەو کەسانە بوون (سوڵتان) لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا چەپاڵەیدا بوون، گرنگیی ئەمانە لەوەدا بوو زمانی دوژمنیان ڕەوان بوو و بەهۆی بیچم‌و ڕەنگ‌و ڕوویانەوە گومانیان لێ نەدەکرا کە پیاوی (صلاح الدين) بن، لەبەر ئەمە ئەو هەواڵانەی هەواڵگیرە موسڵمانەکان نەیاندەتوانی وەری بگرن، ئەوان بە ئاسانی‌و بێ گرفت وەریان دەگرت‌و سوپای ئەیوبیان لێ ئاگادار دەکردەوە، جارێکیان هەواڵیان بە (صلاح الدين) دا دوژمن بە نیازە شەو بەسەر سەربازگەی ئیسلامیدا بدات،[3] هەواڵیان پێدا دوژنی خاچپەرست مەنجەنیقێکی بێ ڕەزایان دروست کردووەو (١٥٠٠) دیناریان لێ خەرج کردووەو بە نیازن بۆ هێرشی سەر (عەکا) بەکاری بێنن، هەروەها هەواڵی هێرشی ئەڵمانییان بە (صلاح الدين) ڕاگەیاند، بەڵام پاش (صلاح الدين) دەزگای هەواڵگری

---

١ تاریخ مصر الاسلامية ٢/٩٦ جمال الشيال.

٢ في تاریخ الايوبيين والمماليك، د. قاسم عبده ص: ٨٠.

٣ صلاح الدين الايوبي للصلابي ص: ٣٨١ـ٣٨٢.

بێ هێز کەوتە گۆڕێ، بەڵکو دەبینین هێرشی پێنجەمی خاچپەرستان بەرێ دەکەوێ و دەگاتە (دمیاط) ئینجا (مەلیك عادل) ئاگادار دەبێتەوە، بەڵێ دەزگای هەواڵگیری دەوڵەتی ئەیوبی وەکو سەردەمی (صلاح الدین) بە پتەوی و بەهێزی نەمایەوەو ئەمەش بووە هۆکارێکی کاریگەر لەسەر ڕوخانی دەوڵەتی ئەیوبی.

**١٠ـ دیارنەبوونی زانایانی دڵسۆزی ئایینی لە گۆڕەپانی دەرکردنی بڕیاری سیاسیدا:**

لەگەڵ هاتنی (مەلیك ئەفزەل) بۆ سەر کورسی سەڵتەنەت: هەندێك لەو هۆکارە ستراتیژی و گرنگانەی (صلاح الدین) بۆ بەڕێوەبردنی حوکومەتەکەی و سەرخستنی چالاکیە جیهادیەکانی دوای خودای بالادەست پشتی پێ دەبەستن گۆڕانیان بەسەرداهات، (صلاح الدین) پشتی بە زانا دڵسۆزەکانی ئایینی دەبەست، بەلام (مەلیك ئەفزەل) هاتو لە ژێر کاریگەری (ضیاء الدین إبن الأثیر)ی وەزیریدا کە دەکاتە برای (إبن الأثیر)ی مێژوونووس (قازی فازڵ)و میرو ڕاوێژکارەکانی باوکی لە ئیدارەی دەوڵەتەکەی دوورخستنەوە، لەم کارەیدا نەك هەر سەرکەوتوو نەبوو بەڵکو لە بەرامبەر ئەمەدا ڕك و توڕەیی و بێزاریەکی زۆری جەماوەری بۆ خۆی دروست کرد، (قازی فازڵ) یەکێك بوو لەوانەی لە پێگەی بڕیاردانی سیاسی دوور خرایەوە، (صلاح الدین) دەربارەی (قازی) گوتبووی: من هیچ شارێکم بە شمشێرەکەم ڕزگار نەکردووە، بەڵکو بە قەڵەمی (قازی فازڵ) بوو، ئەو جێگەو پێگە بەرزەی زانایانی دڵسۆزی شەرعزان لە سەردەمەکانی نورالدین و صلاح الدین دا بۆیان دانرابوو لەو سەردەمەدا لێی دابەزێنرابوون، ئەیوبیەکان بە دوورخستنەوەی (قازی فازڵ)و هاوێنەکانی لە بازنەی بڕیاری سیاسی دەوڵەتدا زیانێکی گەورەو گورچوبڕیان بەرکەوت، (أبو شامة) سەبارەت بە (قازی فازڵ) دەڵێ: خاوەن ڕای ڕێکوپێك و ئەقڵی تەواو بوو، بەلای سوڵتان (صلاح الدین)ەوە بەرزو مەزن بوو، تەگبیرو ڕای لێ وەردەگرت و لە کاتی کارەساتەکاندا ڕاوێژی پێ دەکرد، سوڵتان فەرمانبەرداری ئەوی دەکردو هەموو هەرێمەکانیشی بە کلیلەی ڕایەکانی ئەو فەتح کردن، ڕاستیەکەی کتێبەکانی کەتیبەی سەرکەوتن بوون.[١]

**١١ـ کۆچی دوایی (مەلیك صالح نجم الدین)و لێ نەوەشاوەیی میراتگرەکەی:**

(مەلیك صالح نجم الدین) توانی چەند ڕێکخراوێکی سەربازی تازە بخاتە نێو سوپای سەربازی ئەیوبیەوەو بەشداریەکی بەرچاویان پێ بکا لە بەهێزکردن و تۆکمەکردنیدا، ئەم

---

١ کتاب الروضتین ٢/٢٤١.

کارەی بە قازانجی دەوڵەتەکەی شکایەوە، (مەلیك صالح نجم الدین) بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پرۆژەیەی ئەم هەنگاوانەی هەڵێنان:

بایەخێکی گەورەی بە کڕینی کۆیلە تورکە مێردمنداڵەکاندا کە لە مێژووی سەڵتەنەتی ئەیوبیدا وێنەی ئەمە ڕووی نەدابوو، جارێکیان لە ماوەی حوکمی خۆیدا زیاتر لە هەزار کۆیلەی تورکی کڕین، سوپایەکی وا بەهێزی لێ دروست کردن کە پاشان لە سەپاندنی ویستو خواستەکانی بەسەر هەرێمەکانداو سەرکوتکردنو لەنێوبردنی بزوتنەوە هەڵگەڕاوە نێوخۆییەکاندا پشتیوانی چاکیان لێ کرد، کۆیلەکان بە ڕەهایی پشتگیرییان لێ دەکردو لە نواندنی ڕێزو خۆشەویستیدا درێغیان نەدەکرد، (مەلیك صالح نجم الدین) بەهۆی ئەمانەوە توانی سەرلەنوێ سامو هەیبەت بۆ دەوڵەتی ئەیوبی بگێڕێتەوەو بە ئەندازەیەکی باش سەرکەوتنی بەدەست هێناو حوکومەتو دەسەڵاتی سەربازی هێنایەوە جێگای خۆی، بەڵام ئەو لە کاتی هێرشی حەوتەمی خاچپەرستەکانو لە تەمەنی (٤٤)ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، پێش ئەوەی بمرێ (مەلیك موعەززەم تورانشا)ی کردە جێنشینی خۆی، ئینجا (شجرة الدر)ی هاوسەری سوڵتان (مەلیك صالح نجم الدین) بە خۆیو بە وەزیرو میرەکانی دەوڵەتەوە کۆبوونەوەو پۆستی سەڵتەنەتیان بۆ (تورانشا) سەلماند، بەڵام (تورانشا) پیاوی قۆناغەکە نەبوو و لە ئاست بەرەنگاربوونەوەی کارەساتەکانو داخوازیە مێژووییەکاندا دەستەپاچە بوو، لە باتی چڕکردنەوەی هەوڵو تەقەلاکانی لە پێناوی یەکخستنی ڕیزی موسڵمانانو بنبڕکردنی خەتەری خاچپەرستان یەکسەر لە دژی (شجرة الدر)و گەورە میرەکانی (مەمالیك) دەستی بە گێڕانی پیلان کرد، ناحەزەکانی بە چاوی سوك تەماشا دەکردنو دۆستەکانی لە خۆی دەتەکاندنەوەو بە ڕا تاکڕەویەکانی خۆسەپێنی دەکرد، بۆ فەوتاندنی ناحەزەکانی پەنای بۆ چەکی سیاسەتو ماڵ نەبرد، درزی بێڕەزا لە نێوان خۆیو کاربەدەستە نزیکەکانیدا دروست بوون، نەیتوانی سەرکردەکانی سوپا بکاتە دۆستی خۆی، لەبەر ئەمە — لە لایەن ئەوانەوە بێزراو — کوژرا، بە کوژرانی ئەویش دەوڵەتی ئەیوبیش لەنێوچوو، ئەمانەی گوتمان گرنگترین هۆکاری پشت ڕووخانی دەوڵەتی (ئەیوبی) بوون.

## باسی دووەم: سەڵتەنەتی (مەمالیك) لە نێوان (شجرە الدر)و (عزالدین ئاییەك)دا:

### یەكەم: (شجرة الدر):

#### ١ـ (شجرة الدر) ئەیوبی بوو یان مەملوكی بوو؟

زۆربەی مێژوونووسان لەسەرووی هەمووشیانەوە (مەقریزی)ی خاوەنی (السلوك لمعرفة دول الملوك) پێیان وایە (شجرة الدر) یەكەمین سوڵتانی دەوڵەتی مەمالیكی بەحریە لە (مصر)دا كە لە بەرامبەر دەوڵەتی مەمالیكی دووەمی بەحریدا (دەوڵەتی مەمالیكی یەكەم)ی پێ دەگوترێت، ئەوان بەو پێودانەی (شجرة الدر) لە ڕەگەزی مەمالیكی بەحری بووە بە یەكەمین سوڵتانی (مەمالیك)ی ناو دەبەن، دەڵێن ئەو لە ڕستەی كۆیلەو كەنیزەكاندا بووەو كڕدراوە، پاشان بۆتە كەنیزەكی (مەلیك صالح ئەیوب)، بەڵام ڕای پەسند ئەوەیە كە لە ڕەگەزی مەمالیكی بەحری نەبوبێت، ئەمەی گوتمان ڕای (عصام شبارو)یە لە كتێبەكەی خۆیدا بە ناوی (السلاطين في المشرق والعربي)دا دەڵێ: (شجرة الدر) بە ڕەچەڵەك (ئەرمەنی)یەو (توركی) نیە، ئەو بە حوكمی نزیكایەتی لە مەمالیك لە ڕووی پێگەیشتنی گەورەبوونیەوە ناكرێ زاراوی (مەملوك)ی بەسەردا ببڕین: چونكە ئەو بە واتای (كۆیلە) كۆیلە نەبوو، هەرچەندە (مەمالیكی بەحری صالحی) پرسو ڕایان بە ئەو بوو و كردبوویانە گەورەی خۆیانو گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریان بۆ دەكرد، بەڵام ئەمە تەنها لەبەر ئەوە بوو كە ئەو هاوسەری (مەلیك صالح ئەیوب) بوو و دایكی (خلیل)ی كوڕە بچووكەكەی (مەلیك) بوو كە بە منداڵی وەفاتی كرد،[1] (ابن ایاس)ی خاوەنی (صاحب بدائع الزهور)یش پێی وایە (شجرة الدر) بە حوكمی ئەوە هاوسەری (مەلیك صالح ئەیوب)ی بابی تورانشاو دایكی (خەلیل)ی كوڕی (مەلیك) بوو – كە لە ژیانی بابیدا مردووە – بە دواهەمین سوڵتانی مەملەكەتی (ئەیوبی) دادەنرێت.[2]

#### ٢ـ (شجرة الدر)ی سوڵتانی میسر:

ڕۆڵی جوامێرانی (شجرة الدر) لە دوای مردنی (نجم الدین ایوبی)ی هاوسەریو ڕەفتاری قارەمانانەی ئەو لە بەرامبەر خاچپەرستەكانو بەدیلكردنی (لویسی نۆهەم)دا كاریگەری گەورەی لەسەر (مەمالیك) دانا، ئەوان ئەویان لەو كاتە سەختەدا بینی جەنگ لە (دمیاط)

---

١ السلاطين في المشرق العربي ص: ٩٠.

٢ بدائع الزهور ١/٨٩.

گەرم بووەو دوژمن تینی زۆری هێناوە ئەگەر هەر حوکمڕانێکی تر بوایە ئەژنۆی دەشکان بەڵام (شجرة الدر) بەوپەڕی گەرموگوڕیو حەماسەتی سیاسیانەیو زیرەکیو لێوەشاوەیی زرنگانەی لە هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا قۆڵی لێ هەڵماڵیوەو دارای سیفاتی سەرکردایەتی کردنە پێی سەرسام بوون،[1] کاتێك (شجرة الدر) مەرگی (نجم الدین ایوب)ی لە سوپای (میسر) پەنهان کرد — بەم ڕەفتارەی ڕزگارکردنی شاری (دمیاط)ی لە چنگی خاچپەرستان مسۆگەر کرد، ئەگەر لەو ساتەوەختەدا کە سوپای (مصر) لەگەڵ سوپای (خاچپەرستان) لە گەرمەی جەنگدا بوو هەواڵی مەرگی (مەلیك صالح ئەیوب)یان پێ گەیشتبایە لەوانە بوو سەرکەوتن لە کیس سەرکردەکانی (مەمالیك) چووبایەو دۆڕانو لاوازیو پاڵدانەوەو ڕۆکەوتن ڕووی تێکردبانایە، بەڵام بە فەزڵی خوداو ئینجا بەهۆی زیرەکی (شجرة الدر) پێش بەم کارەساتە گیرا، کاتێك (مەلیك صالح ئەیوب) وەفاتی کرد (شجرة الدر)ی هاوسەری بەری بەبڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە گرت، فەرمانیدا ژمارەیەك کۆیلە بەبێ ئەوەی پێ بزانن مردووە لە کەژاوەیەکی نهێنیدا تەرمەکە هەڵبگرنو بە بەلەمێك بەرەو قەڵای (ڕەوزە)ی بگوازنەوەو تا سەرکەوتن نەیەتەدی هەواڵەکە ڕانەگەیەنێ، بەردەوامیش لە پێناوی ستاندنەوەی (دمیاط) لە خاچپەرستەکان ئەمیر (فخرالدین)ی سەرکردەی سوپاکەی هان دەداو گیانی دان بەخۆداگرتنو عەزیمەتو جیهادی بەبەردا دەکرد، لە لایەکی تریشەوە لە پێناوی ئەوەدا بگوترێ سوڵتان لە ژیاندا ماوە دوکتۆرو کارمەندە گەورەکانی بانگهێشتی هۆڵی دانیشتنی مەلیك دەکردنو دەهاتنو دەڕۆیشتن، بەڵکو فەرمانو بڕیارەکانی بە ناوی سوڵتانەوە لەسەر شێوە خەتو ئیمزای خودی سوڵتان مۆردەکردن، دەشڵێن: (سوهەیل) ناوێك کە نۆکەری (شجرة الدر) بوو ئەم کارەی وەکو خۆی دەردەهێناو لەم بارەوە گوێ لە مستو فەرمانبەرداری (شجرة الدر)ی سەروەری بووە.[2]

بەڵێ (شجرة الدر) بەم تەگبیرە بە جێوڕێیەیو بەم شێوازە ناوازەیەیو بەم زیرەکیە دەگمەنەی توانی یەکێتیو یەکپارچەیی سوپا بپارێزێتو نەیەڵێ کەلێنی لەنێو ڕیزەکانی تێکەوێتو ئەڵقەی پێوەندی نێو پۆلەکانی سوپا هەڵوەشێتو لێك بترازێت، بەڵکو توانی گیانی جیهادو قوربانیدان لە لاشەی تاکەتاکەی سەربازەکاندا بخرۆشێنێتو نەیەڵێ تۆزقاڵێك لاوازیو نیازی خۆبەدەستەوەدانیان تێدا دروست ببێ.[3]

---

[1] شجرة الدر قاهرة الملوك، نور الدين جليل ص: ٧٥.
[2] موسوعة تأريخ مصر ٦٧١/٢ لأحمد حسين.
[3] شجرة الدر، د. يحيى الشامي ص: ٥٢.

جیهادو گیانبازی وەکو چەکەیەك (شجرة الدر)ی پایەبەرز کردو ئامادەی کرد دوای کوژرانی (تورانشا) یەکسەر بچێتە سەر کورسی سەڵتەنەت، لێرەدا مێژوونووسان سەبارەت بەوە (مەمالیك) بۆچی (شجرة الدر)یان کردە سوڵتانی خۆیان و ئەم کارەیان بە چ هۆیەك و پاڵنەرێك ئەنجامداوە تووشی سەر لێ تێکچوون کردووە، ئایا دەبێ لەبەر ئەوەبێ کە هاوسەری سوڵتان (نجم الدین ایوب)ی کۆچکردوو دایکی (خلیل)ی جوانەمەرگی کوڕی (نجم الدین) بووبێ؟ یان دەبێ لەبەر ئەوە بووبێ کە سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی سیاسی و سەربازی گەرمەی کێشەو کارەساتەکان بووبێ؟ یان دەبێ لەبەر ئەوە بووبێ (مەمالیك) بە خاتری هەبوونی پەیوەندی نێوان ئەیوبییەکان و بوونی خۆیان وەکو ئاڵقەیەکی پەیوەست بەشێوەیەکی قانونی پێویستیان بە کەسێکی وەکو (شجرة الدر) هەبووبێ؟

هەرچۆنێك بێت بەرزیان کردەوەو لەسەر تەختی دەسەڵاتی میسریان دانیشاندو ناسناوی (أم خلیل)یان بەسەردا دا،[1] بەم شێوازە ئەو کەنیزەکەی (سوڵتان صالح نجم الدین) دوای ئازادکرانی لە لایەن سوڵتانەوە بووە هاوسەری سوڵتان و ئینجا بووە شای موسڵمانانی میسر، سوڵتانی (مەمالیکی بەحری) لەسەر مینبەری مزگەوتەکان وتاری بۆ دەخوێنرایەوەو پاش پاڕانەوە بۆ خەلیفەی (عەباسی) بۆ ئەو دەپاڕانەوە.[2]

**٣- پاڕانەوە بۆ (شجرة الدر):**

نوێژخوێنان بەم شێوازە بۆی دەپاڕانەوە: خودایە ئەم صاڵیحە خاوەن ڕێزەو خۆپارێزە کە پاشای موسڵمانانەو قەڵای دین و دونیامانە دایکی (خلیل)ی کوڕی ئەمیری ئیمانداران و خاوەن شکۆو پاکدامێنەو هاوسەری (سوڵتان مەلیك صالح)ە بیپارێزەو چەپاڵیدە.[3]

وتاربێژی مزگەوتەکانی (مصر)یش کە وتارەکانیان بە ناوی ئەوەوە دەخوێندنەوە، پاش پاڕانەوەیان بۆ خەلیفەی عەباسی بەم شێوازە لەسەر مینبەرەکانەوە بۆی لە خودا دەپاڕانەوە:

خودایە ئەم خاوەن شکۆ (صلاحیە) کە پاشای موسڵمانانەو بۆ دین و دونیامان قەڵغانەو خاوەن حیجابی بەشکۆو پەردەی جوانەو دایکی خەلیلی جوانەمەرگی مەرحومە بپارێزە، بۆیە ناوی (خلیل)یان دێنا چونکە کوڕی (مەلیك صالح نجم الدین) بوو و لە ماوەی ژیانی باوکیداو لە تەمەنی تازەلاویدا کۆچی دوایی کردبوو.[4]

---

١ شجرة الدر قاهرة الملوك، نور الدین جلیل ص: ٧٥.
٢ شجرة الدر، د. یحیی الشامي ص: ٥٤.
٣ النجوم الزاهرة ١/٣٧٤.
٤ بدائع الزهور ١/٢٨٦.

بەپێی گێڕانەوەیەکی تر کاتێك بەیعەتی سەڵتەنەت درا بە (شجرة الدر)، وتارەکانی هەینی بە ناوی ئەوەوە دەخوێنرانەوەو پاش نزاکردن بۆ خەلیفەی عەباسی بەم شێوەیەش نزا بۆ ئەو دەکرا: خودایە، پاشای موسڵمانان قەڵای دینو دونیامان، ئەم شاژنە پاك دامێنو خۆپارێزە دایکی خەلیلی ڕەحمەتیو هاوسەری مەلیك صالح لە بەڵاو موسیبەتی دونیاو قیامەت بپارێزە.[1]

**٤ـ نەخشی مۆرەکەی:**

هەرچۆنێك بێت (شجرة الدر) ئەو کەسایەتیە بەهێزە بوو وتار بە ناوی ئەوەوە دەخوێنرایەوەو لە لایەن وتاربێژەکانو خەڵکەوە دوعاو نزای بۆ دەکرا، بە هەمان شێوەش ناوی لەسەر پارچە سکەکانی ئەو سەردەمە هەڵکەنرابوو، نەخشی مۆرەکەی بەم شێوەیە لەسەر هەڵکەنرابوو:

((المستعصمة الصالحية، ملكة المسلمين، والدة المنصور خليل)).[2]

**٥ـ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی دامەزراندنیەوە:**

هەر کە هەواڵ بڵاوبۆوە (شجرة الدر) بووە حوکمڕانی میسر، سەرکردە پلە باڵاکانو میرە مەزنەکان پۆل پۆل سەردانی مەلیکەخانیان دەکردو پیرۆزباییان لێ دەکرد، مەلیکە لەنێو هۆڵی سەڵتەنەتداو — کە مەلیك صالح بە نەخشو نیگاری زێڕینیو کۆڵەکەی بەرزی داپۆشراو بە (ئابنوس)[3] و (مەڕمەڕ) دروستی کردبووو فەرشی ڕازاوەی تێدا ڕاخستبوونو کورسیو قەنەفەو پاڵپشتی تێدا دانابوون — لەسەر کورسی حوکم پاڵی دابۆوە، حەوشە گەورەکەی کۆشك پڕ ببوو لە خەڵك، بەم هەواڵە سەرسام ببوون، پێیان سەیر بوو ژنێکی وەکو (شجرة الدر) ببێتە پاشای وڵاتی میصر بەقایان بە ڕاستو دروستی هەواڵەکە نەدەکرد هەموویان هاتبوون تا بزانن ئەم هەواڵە ڕاستە یان درۆیە، لەو نێوەدا تاقمی پیشەوەرانو بازرگانانو جوتیارانو سەربازانو سەماکەرانو گۆرانیبێژانو خزمەتچیو بەردەستەکانو تەواوی چینەکانی تری کۆمەڵ دەبینران.[4] بە هەرحاڵ (شجرة الدر) بە دەستێکی ئاسنین جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتو هەموو هەوڵەکانی لە پێناوی بنبڕکردنی پاشماوەی

---

١ موسوعة تأريخ مصر ٢/٦٧١.

٢ المصدر نفسه ٢/٦٧١.

٣ ئابنوس: درەختێکی ڕەشە، تەختەی لێ دروست دەکرێت لە زنجو حەبەشە هەیە — القانون في الطب لابن سينا وەرگێڕ.

٤ شجرة الدر، د. يحيى الشامي ص: ٥٦.

هێرشی حەوتەمی خاچپەرستەکاندا خستنەگەڕو پاشان خۆی لە خەڵکی عەوام و تایبەتی ڕەعێتەکەی نزیك دەکردەوە.[١]

**٦- ڕەتکردنەوەی سەڵتەنەتی (شجرة الدر) لە لایەن خەلیفەو زانایان و زۆربەی خەڵك:**

هەرچەندە (شجرة الدر) بەوپەڕی توانا هەوڵیدا شێوەی سەڵتەنەتەکەی ڕازاوە بکات و خۆی لە زانایان و خەڵکی عەوام نزیك کردەوە، بەلام هەوڵەکانی بە هەواداچوون و چەند شۆڕشێکی تووڕەئامێز لە جیهانی ئیسلامیدا هەلایسان و چەند خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەری لە هەموو کوچەو کۆلان و شەقامەکانی (قاهیرە)دا ئەنجام دران، وتاربێژەکان لەسەر مینبەرەکانەوەو زانایان لە کاتی کۆڕو کۆبوونەوە گشتیەکان و وانەگوتنەوەیاندا ڕەخنەی توندیان ئاڕاستەی ئەم پرۆسەیە دەکردن، زانای پایە بەرز (عزی کوڕی عبدالسلام) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لە هەموو زانایان زیاتر ڕقی لەمە هەستابوو،[٢] خەلیفەی عەباسی لە (بەغدا)ڕا نوێنەری خۆی بۆ لای میرەکانی (مصر) ناردو گوتبووی: پێمانی ڕاگەیەنن ئەگەر ئێوە لە مصر پیاوێکی شایستەی پۆستی سەڵتەنەتتان دەست ناکەوێ، ئەوا ئێمە پیاوێکی شیاوتان بۆ دەنێرین، ئەوە نەتانبیستووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يفلح قوم ولّوا أمرهم إمرأة))[٣] واتە نەتەوەیەك ژن سەرۆکایەتیان بکات سەرفراز نابن. شاعیرانیش بە دەوری خۆیان ڕەخنەیان لە سەڵتەنەتی (شجرة الدر) دەگرت، یەکێکیان دەڵێ:

| | |
|---|---|
| النساء ناقصات عقل ودين | ما رأين لهنّ رأيا سنيّا |
| ولأجل الكمال لم يجعل الله | تعالى من النساء نبيا[٤] |

**٧- (شجرة الدر) خۆی لێدەخا:**

کاروبارەکان لەسەر ئاستی گشتی جەماوەر لە گرێژەنە چوون و بارودۆخ شێوا، زانایان و فێرخوازان بە توندی لە دژی ئەوە ڕاوەستان کە ژنێکی وەکو (شجرة الدر) لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشتووە، سوڵتانەخان و سەرانی مەمالیك بۆیان دەرکەوت کە ئەوان بە پێچەوانەی ئاراستەی شەپۆلە توندەکانی دەریای جەماوەر کەوتوونەتە مەلەوە، لەبەر ئەمە ئەگەر ئاراستەی خۆیان نەگۆڕن خنکانیان مسۆگەر دەبێ،[٥] ئەمەو (شجرة الدر) پاش هەشتا

---

١ السلطان مظفر سيف الدين قطز ص: ٧٦.
٢ قصة التتار ص: ٢٢٩.
٣ بدائع الزهور ١/٢٨٧.
٤ المصدر نفسه ١/٢٨٧.
٥ السلطان مظفر سيف الدين قطز ص: ٧٧.

ڕۆژ حوکمڕانی لەسەر کورسی سەڵتەنەت دابەزیو بە پرسو ڕای میرانی مەمالیك (عزالدین ئەیبەکی تورکمانی صالحی) بۆ پۆستی حوکمڕانی هەڵبژارد، (عزالدین) پیاوێك بوو تا ئەو کاتە خۆی لە ململانێ پاراستبوو، پێیان وابوو لاوازو بێ دەسەلاتە، لەبەر ئەمە میرەکانی مەمالیك هەموویان ڕازی بوون (شجرة الدر) شوی پێ بکاتو لەسەر کورسی دەسەلاتیشی دابنێ، هەندێکیان دەیانگوت: چونکە بێ هێزوپێزە هەر کات بمانەوێ لایبەرین دەتوانین لایبەرین،[1] بەڵێ (شجرة الدر) لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی جەمادی دووەمی ساڵی ٦٤٨ی کۆچیدا پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ (عزالدین ئەیبەك) ئەنجامداو کورسی سەڵتەنەتەکەشی بۆ چۆڵ کرد.

بەم شێوەیەو لە ماوەی تاکە ساڵێکدا (٤) سوڵتان لەسەر کورسی سەڵتەنەتی (مصر) ڕۆیشتن: (مەلیك صالح ایوب) ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئینجا مردو (تورانشا) کوڕی هات، ئەویش کوژراو (شجرة الدر) بەدوایداهات، ئەویش لەسەر کورسی هاتەخوارو (عزالدین ئەیبەکی تورکمانی صالحی) جێی گرتەوە.[2]

**٨ـ حومکی شەرعی لە بەرامبەر سەرۆکایەتی گشتی لە لایەن (ژن)ەوە:**

زانایانی ئیسلام – ی سەر بە هەموو مەزهەبەکان – ڕێکن لەسەر دروست نەبوونی پۆستی سەرۆکایەتی گشتی بۆ ژنو نێرایەتی مەرجێکی سەرەکییە بۆ هەر کەسێك ئەم پۆستە وەربگرێت،[3] تا زۆرینەی ئەو زانایانەش کە بانگەشەی مافە سیاسیەکانی ژن دەکەنو پشتگیری ژن دەکەن دەست لە کاروباری سیاسی وەربدات، بە دروستی نازانن ژن ئەم پۆستە وەربگرێتو پۆستی سەرۆکایەتی گشتیو سەرۆکایەتی وەزیران لە پیاودا کورت هەڵدێنن،[4] بێگومان خاوەنانی ئەم ڕایە پێیان وایە سەرۆکایەتی وەزیران لە سیستەمی پارلەمانیدا وەکو سەرۆکایەتی گشتی وایە لە سیستەمی ئیسلامیدا،[5] زانایان بە بەڵگەی قورئانو سوننەتو ئیجماعو عەقڵ ڕاستی ئەم بیروبۆچوونەیان دەسەلمێنن:

**أـ قورئانی پیرۆز:**

– فەرموودەی خودای بەرزو مەزن: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ (النساء: ٣٤)، ڕووی بەڵگە: خودای بەرز لەم

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٧٧.

٢ قصة التتار ص: ٣٣١.

٣ ولاية المرأة في الفقه الاسلامي ص: ٨٣.

٤ المصدر نفسه ص: ٨٤.

٥ المصدر نفسه ص: ٨٤.

ئایەتـەدا وای داناوە پیـاوان باڵادەست بن بەسـەر ژنانـدا، چـونکە ئـەوان سەرپەرشـتیکارو موشورخۆریانن، لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان‌و داراییەکانیاندا، (القيِّم): واتە مشورخۆر، ئـەو کەسەیە کاروبـار ڕادەپـەڕێنێ، (القـوّام): یـش دەربڕینـی تێپەڕاندنـەو واتـە ئـەو مـشورخۆرو سەرپەرشتیکارەیە کە کاروبارەکان بە جوانی‌و ڕێکوپێکی ڕادەپەڕێنێ.[١] کاتێك خودای بـەرزو کاربەجێ باڵادەستی‌و موشورخۆری وەکو ئەرکێك بەسەر پیاودا دەداو ژنی لێ دەبوێرێ ئەمـە بەو واتایەیە کە: ڕێکخستن‌و سەرپەرشـتیکردن‌و ڕاپەڕانـدنی کاروبارەکـان لـە پیاوانـدا کـورت هـەڵێنران، ئەمـەش بـە شـێوەیەکی گشتی خـۆ لـە سەرپەرشـتی کردنـی کاروبـاری گشتی‌و کاروباری سیاسیدا دەبینێتەوە کە (ئیمارەت‌و وەزارەت‌و خیلافـەتیش) لـەخۆدەگرێت، چـۆن سەرپەرشتی کردنی کاروبـاری خێـزان‌و چـاودێری ماڵـەوە لـەخۆ دەگرێـت، کەواتـە ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ پیـاوان بەسـەر سـەری ژنانـەوە ڕاوەسـتاون، واتـە ڕاوەسـتاون تـا کاروبارەکانیان ڕێکخەن‌و ئەرکی بژێویان بکێشن‌و پارێزگاریـان لێ بکـەن، کەواتـە ئـەوان لـە لایەکـەوە بەرپرسـیاریانن‌و لـە لایـەکی تریـشەوە فـەرمان بەدەسـتیانن، پیـاوان حـوکمڕان‌و ئەمیرن‌و ژنانیش دەبێ گوێڕایەڵ‌و فەرمانبـەرداریان بن مـادام فەرمانـەکانیان ناچنە بازنـەی سەرپێچی کردنی بەرزو مەزنەوە.[٢]

لـە لایـەکی تـرەوە قورئـانی پـیرۆز باڵادەسـتی پیـاوانی بەسـەر ژنانـدا بـەنێو ماڵـەوە نەبەستۆتەوەو وشـەی (في البيـوت)ی نـەهێناوە تـا ئـەم حوکمـە شـەرعیە لـە بازنـەی ژیانی خێزاندا کورت هەڵێنێ،[٣] خودا باڵادەستی ماڵەوەی نەداوە بە ژن بەڵکو داویەتی بە پیـاو، جـا چۆن باڵادەستی‌و سەرۆکایەتی کۆمەڵگایـەکی دەداتـێ کـە لـە چـەندین ملیـۆن مـاڵ‌و خێـزان پێکهاتووە؟!.[٤]

— خـودای بـەرز دەفـەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ (البقـرة: ٢٢٨)، ڕووی بەڵگـەی ئایەتەکـە: خـودای باڵادەسـت لـەم ئایەتـەدا ئـەو کلتـورەی سـەردەمی نـەفامی زەربـی سـفر دەکـات کـە گـوێ بـە ژن نـەدەداو مافـەکانی‌و کەسـایەتیە ئینسانیەکەی نەدەسەلماند، خودا ڕۆشنایی خستەسەر ئـەو حەقیقەتـەی کـە ژنـانیش وەکـو پیاوان لە ئینسانی بوون لەگەڵ پیاوان یەکسانن‌و خاوەنی مافەکانی خۆیـانن‌و دەبـێ پیـاوان

١ تفسير الطبري ٨/٢٩٠.
٢ ولاية المرأة في الفقه الاسلامي ص: ٨٥.
٣ تدوين الدستور الاسلامي ص: ٧١.
٤ ولاية المرأة في الفقه الاسلامي ص: ٩١.

بە جوانترین شێواز هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن و مافی خۆیانە کە بە ئاسوودەیی بژین، لە بەرامبەر ڕاپەڕاندنی واجبی سەرشانیاندا دەبێ مافەکانی خۆیان پێ بدرێ، بەڵام سەبارەت بە یەکسانی و وێکچوواندنی هەردووک ڕەگەز لێرەدا مەبەست پێی وێکچوواندن و یەکسانکردنی واجبی هەردوک لایانە نەك ئەوە کە هەندێك دەیڵێن و دەیڵێنەوە ژن و پیاو لە هەموو کاروبارەکانیاندا یەکسانن، چونکە خودای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ واتە پیاوان پلەیەك لە ژنان لە ژوورترن، ئەم پلەیە بریتیە لە سەرپەرشتیاری و بەرپرسیای (القوامة)، وەکو لە ئایەتەکەی پێشدا باسکراو خۆی لە فەرمان و فەرمانبەرداری نێوان ژن و پیاو نیشان دەدا.[1]

— خودای بەرزو مەزن فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةً فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِ﴾ (البقرة: ٢٤٧). ڕووی بەڵگە: خودای باڵادەست لەم ئایەتە پیرۆزەدا سیفەتەکانی ئەو کەسە باس دەکات کە هەقی خۆیەتی پۆستی دەسەڵاتی پێ بدرێت، چونکە کاتێك جوولەکەکان گوتیان (طالوت) موستەهەقی پاشایەتی نیە چونکە پاشازادە نیەو هەژارو نەدارە، خودا وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ئەو لەبەر دوو سیفەت شایستەی ئەو پۆستەیە: یەکیان لەبەر ئەوەی زانیاری زۆری هەیە دووەمیان لەبەر ئەوە خاوەن بەدەنێکی پتەوو بەهێزە، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوە کە دەبێ سەرکردایەتی ئوممەت بدرێ بە کەسێك زانستێکی بەرفراوان و لاشەیەکی بەهێزو دامەزراوی هەبێ تا بتوانێ باری گرانی ئەم پۆستە هەڵبگرێت،[2] وەکو زانراویشە ژن لە ڕووی بونیادی بەدەنیەوە بێهێزو لاوازەو وەکو پیاو بڕستی هەڵگرتنی بارەقورس و گرانەکانی نیە، بێگومان ئەمە شتێکی فیترەتەو هەر لەبەر ئەمەشە سەرکردایەتی وڵاتی پێ ناسپێردرێت.[3]

**ب ـ سوننەت:**

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لن يفلح قو ولّوا أمرهم إمرأة))،[4] واتە هەرگیز گەلێك ژن کاروباری بەڕێوە بەرێ سەرکەوتوو نابێ:

بە یەکدەنگی زانایان (نێرایەتی) یەکێکە لە مەرجەکانی شیاوی سەرۆکایەتی گشتی، هەروەها ئوممەتی ئیسلام — ی سەردەمی یەکەم لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و

---

١ جامع البيان ٢/٤٥٤.

٢ تفسير الرازي ٦/١٧٤، مدارك التنزيل ١/١٦٣.

٣ ولاية المرأة في الفقه الاسلامي ص: ٩٣.

٤ البخاري، كتاب المغازي، رقم: ٤٤٢٥.

شوێنکەوتووی شوێنکەوتووانو پێشەوایانو شەرعزانانو تەفسیرکەرانی قورئانو حەدیس گێڕەرەوان، هەر هەموویان بە جیاوازی مەزهەبەکانیانەوە یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوە کە: سەرۆکایەتی گشتیو ئیمامەتی عوزما بۆ ئافرەت ناگونجێو دروست نیە سەرۆکایەتی وڵات بکات، بە هەمان شێوەش دروست نیە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بکات لە سیستەمی پارلەمانیدا، چونکە ئەم پۆستەش وەکو پۆستی سەرۆکایەتی گشتی هەموو دەسەڵاتەکانی لەبەر دەستدان.

لەژێر ڕۆشنایی بەڵگە ڕاستو دروستەکانی قورئانو سوننەتدا کە ئاماژەکانیان ڕوونو ئاشکراو ڕاشکاون، عەقڵو قیاسو حیکمەتیش بە خوێندنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی ژنو پێکهاتە جەستەییو دەروونیەکەی قبوڵیان دەکەنو ئەم حەقیقەتە دەسەلمێنن، هەموو ئەو ڕەخنەو نارەزاییانەش ئاراستەی حەدیسە صەحیحەکەی صەحیحی بوخاری کراون، بێ ناوەڕۆکنو هیچ هێزوپێزێکیان تێدا نیە، هەر لەبەر ئەمەشە ئوممەتی ئیسلام حەدیسەکەی قبووڵ کردووەو دانی بەم حەقیقەتەدا داناوە، نارەزایانیش تەنها دەیانەوێ گومان لەسەر حەدیسەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دروست بکەن، بەڵام سەبارەت بەو ڕەخنە تازەی لەم سەردەمانەی دوایەدا پەیدابووە هیچ بەڵگەیەکی ڕاشکاوو صەحیحی قورئانو سوننەتی بە دەستەوە نیە، بەڵکو گومانێکەو لە ئەنجامی ئیجتیهادی چەند تاکێکی ئوممەت سەری هەڵداوە کە نە قسەیانو نە کردەوەیان بە بەڵگە ناشێنو وەرناگیرێنو تەماشا ناکرێن.[1]

## دووەم: سەڵتەنەتی (عزالدين ئايبەك):

سوڵتان ئایبەکی تورکمانی لەسەر تەختی سەڵتەنەتی (مصر) دانیشتو ناسناوی (الملك المعزّ)ی پێ بەخشرا، واقیعەن (ئايبەك) چ لە تەمەندا چ لە خزمەتدا چ لە پۆستو پایەی دەسەڵاتدا لە هەموو میرەکانی مەمالیك گەورەتر نەبوو، بەڵکو (فارس الدين ئۆكتاى)و (زاهیر بیبرس) هەردووکیان لە ئەو گەورەترو لەپێشترو دەست ڕۆیشتووترو پایەدارتر بوون، ئەم حاڵەتە شازەی سیستەمی پلەپلەیی نێو (مەمالیك) وای لە هەندێك مێژوونووسی وەکو (أبو المحاسن) کردووە لە کتێبی (النجوم الزاهرة)دا (ئایبەك) بە بێ دەسەڵاتو کەم قودرەتی تۆمەتبار بکاتو بڵێ: میرەکان تەنها لەبەر ئەوە هەڵیان بژارد، هەر کاتێك حەزیان لێ بێ دەتوانن لە پۆستەکەی دابەزێنن.[2] بەڵام ڕووداوەکان نیشانیاندا (ئایبەك) نەك هەر خاوەن

---

١ ولاية المرأة في الفقه الاسلامي ص: ١٦١.

٢ قيام الدولة المماليك الأولى، للعبادي ص: ١٢٤.

کەسایەتیەکی لاواز نیە – وەك هەندێك مێژوونووس دەڵێن – بەڵکو پیاوێکە دارای سیفەتی سیاسیو ئازایەتیو هەنگاوهەڵێنانە، وەك دەردەکەوێ (أبوالمحاسن) هەستی بە هەڵەی خۆی کردووە لە کتێبێکی تریدا بە ناوی (المنهل الصافي)دا پەشیمان بۆتەوەو بە چاکە وەسفی (ئایبەك) دەکاتو دەڵێ: کەسێکی دیندارو خۆپارێزو ژیرو سیاسی بووەو دەوڵەتی (مەمالیك)ی لە تەنگژەی لەنێوچوون ڕزگارکردووە، ئەگەر بێتو لە گیروگرفتو ئاستەنگو کێشەکانی سەردەمی (ئایبەك) بڕوانین دەبینین خۆ لە چەند هەڕەشەیەکی توندی دەرەکیو ناوەکیدا دەنوێنن: (ئەیوبیەکان)و (خاچپەرستەکان) لە دەرەوەڕا هەڕەشەیان لێ دەکرد، شۆڕشو ئاشوبی عەرەبەکانیش لەنێوخۆدا تینیان بۆ دەهێنا، وێڕای ئەمانەش هاوڕێ (مەمالیك)ەکانی نێوخۆو دەرەوەی جێگای مەترسی بوون بۆ سەری.[1]

**١ـ مەترسی ئەیوبیەکانو خاچپەرستەکان:**

میرەکانی بنەماڵەی ئەیوبی دانیان بە حکومەتە تازەکەی (مصر) دانەهێناو خۆیان کۆکردەوەو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر هەرێمەکانی (دیمەشقو کەرکو شەوبەكو سەبییە)و ناوچەکانی تری وڵاتی شام دا گرتو لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستی جیهانی ئیسلامیدا دوو حکومەتی دژ بەیەكو ناکۆك ڕاست بوونەوە، ئەیوبیەکان دەستیان بەسەر (شام) داگرتو (مەمالیك)یش دەستیان بەسەر (مصر)دا گرت، ئەیوبیەکان وایان دانا ئەوان خاوەن دەسەڵاتی شەرعینو (مەمالیك) خۆیان لە کاروباری ئەواندا هەڵقورتاندووە، لەبەر ئەوە پێویستە جۆگەلەکان بکرێنەوە نێو ڕووبارەکەیانەوە،[2] لەم پێناوەدا هێرشێکی توندی ڕاگەیاندنیان کردە سەر (مەمالیك)و دەیانگوت: ئەوان بە خاتری تەماعو چاوچنۆکیان لە بەرامبەر پارەی فیدیەدا ڕێگایان بە پاشای (فەڕەنسا)دا بە زیندوویی لە (مصر) دەرچێ، ئەگەر چاوچنۆکی ئەوان لەگۆڕێ نەبوایە ئاوا بە ئاسانی لە چنگی موسڵمانان دەرباز نەدەبوو،[3] ئەو کاتێك بەرەو ئیمارەتە لاتینیەکانی شام هات دەستی بە هەڵایساندنی فیتنەو پەرەپێدانی ناکۆکی کرد لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا.

بەڵام (مەمالیکی بەحری) وا خۆیان نیشان دەدا کە ئەوان لە کاتی سەرکەوتن بەسەر (لویسی نۆهەم)و دەستوەشاندن لە سوپاکەی لەسەر کەنارە ئاوی (نیل)دا خاوەن پشکی گەورە بوون، ئەگەر هەوڵو تەقەلاو خەباتی ئەوان لە (منصورە)و (فارسکور) لە گۆڕێدا

---

١ المصدر نفسه ص: ١٢٤.

٢ العدوان الصليبي على بلاد الشام، د. حوزيف ص: ١٤٤.

٣ المصدر نفسه ص: ١٤٥.

نەبوایە هەرگیز سەرکەوتن بۆ موسڵمانان مسۆگەر نەدەبوو.[١] تا ئەو ئاستەی (ابن واصل) بە سارێژکەرانی ئیسلام (داوية الاسلام)[٢] وەسفیان دەکاتو دەڵێ ئەوان سەبارەت بە تۆمەتی ئەیوبییەکانیش بەرگریان لە خۆیان دەکردو بەم شێوەیە وەڵامیان دانەوە: کە ئەوان لەبەر پارەی فیدیە (لویس)یان ئازاد نەکردووە، بەڵکو دەترسان ئەگەر بیکوژن یان بەردەوام لە بەندیدا بیهێڵنەوە شۆڕشێکی سەرتاسەری لە جیهانی مەسیحیدا دروست ببێتو هێرشێکی هێندە گەورەو بەرفراوان بکەنە سەر جیهانی ئیسلامی کە توانای پێشگیریکردنی نەبێ،[٣] بە تایبەتیش (لویس) هێندە پیاوێکی خۆشەویست نەبوو نە بە لای فەڕەنسیەکانەوەو نە بە لای تەواوی نەتەوەکانی خۆرئاوای ئەوروپاو خۆرهەڵاتی لاتینیشەوە، پاش ئەمە (مەمالیك) هەموو ئەو پیلانو ناهەقیانەیان لەبیر نەچووبوونەوە کە لە لایەن (تورانشا)ی کوڕی (مەلیك صالح ایوب)ی سەییدیانەوە دەرهەق بە خۆیانو (شجرة الدر) ئەنجام درابوون، بۆیە پێش ئەوەی جڵەوی کاروباریان لەدەست دەرچێت، گورزیان لێ بوەشێنێ، بە پێویستیان زانی سنوورێك بۆ ئەم ڕەفتارانەی دابنرێت،[٤] ئەوان بە لە کۆڵکردنەوەی (تورانشا) وڵاتی مصریان لە گەندەڵکاریەکانی ئەو ڕزگار کرد، لەبەر ئەمە (مەمالیك) خۆیان بۆ گرتنی جڵەوی حوکمڕانی لە هەموو کەس بە شیاوتر دادەنا.[٥]

### أـ لویسی نۆهەمو قۆستنەوەی هەلی دووبەرەکی نێوان موسڵمانان:

لەم کاتەدا کە خۆرهەڵاتی ئیسلامی لەنێوخۆداو بەسەر خۆیدا دابەش کرابوو، پاشای (فەڕەنسا) لە (عەکا) هەوڵی دەدا هێرشێکی تازە ساز بکاتو زەوتکردنی (بيت المقدس) بە ئامانج بگرێت، شیاوی باسە مەسیحیە قەڵا نشینەکانی لاتینی لە سوریا لەسەرو هەمووشیانەوە (لویس) لە کاتی ئەم دەستاودەستو ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتەی ناوچەکەدا بە تەواوەتی لە بارودۆخی (مصرو شام)یان دەزانیو بە وردی چاودێری بارودۆخو گۆڕانکاریەکانی جیهانی ئیسلامیان دەکرد، (لویس) لە نامەیەکیدا کە بۆ گەلی (فەرەنسا)ی نوسیووە ئەم ناکۆکیەی تۆمارکردووەو بە مایەی بووژانەوەی ئاواتەکانی داناوە،[٦] بە

١ المصدر نفسه ص: ١٤٥.
٢ المصدر نفسه ص: ١٤٥.
٣ المصدر نفسه ص: ١٤٦.
٤ المصدر نفسه ص: ١٤٦.
٥ المصدر نفسه ص: ١٤٦.
٦ المصدر نفسه ص: ١٤٦.

دەرفەتێکی لەباریشی وەسف کردووە تا قەرەبووی شکستەکەی مصری پێ بکاتەوە،[١] بەڵگەیەکی ترمان لەسەر ئەوە کە خۆرئاوای مەسیحی بە چاوی بایەخەوە تەماشای ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی کردووە لەو سەردەمەدا، کە ئەمەیە:

مێژوونووسە هاوچەرخە خۆرئاواییەکانی ئەو کاتەی وەکو (جوانفیل، ڕوتلان، ولیم دی ناجی، ولیم دی چارتەر، مەتێ ئەلبارزیو، کەسانی تریش) بەدواداچوونێکی وردی قۆناغەکانی دووبەرەکی (مصرو شام)یان کردووە، ڕووداوگەلێکی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەیان تۆمار کردووە، کە بایەخیان چی وا کەمتر نیە لەوەی سەرچاوە ئیسلامیەکان دەربارەی ئەمە بۆیان بەجێ هێشتووین، زیاد لەمەش ئەم نووسینانە بەڕوونو ئاشکرایی بیروبۆچوونو دیدی مەسیحیەکانی ئەو سەردەمەمان بە گشتیو (لویسی نۆهەم)مان بە تایبەتی دەخەنە بەردەست کە سەبارەت بەم ناکۆکیو دووبەرەکییە هەیانبووە.[٢]

لێرەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئەرکی گرنگی (لویسی نۆهەم) لەم ماوەیەدا ئەمە بووە: ناکۆکیەکانی نێوان شامو مصر بە هەل وەربگرێتو لە نزیکەوە چاودێری بارودۆخەکە بکاتو نەخشەو پیلانێکی سیاسیانەو تەڵەکەبازانەی بۆ ڕەچاو بکاتو بەڵکو لەم ڕێگایەوە بتوانێ قەرەبووی هەموو ئەو زیانو شکستەی بکاتەوە کە لە هێرشەکەی سەر (مصر)دا بەری کەوتبوو.[٣]

**ب ـ هاتوچۆی نوێنەران لە نێوان پاشایانی مصرو شامو (لویسی نۆهەم):**

بەم شێوەیە هاموشۆی نوێنەرو نێردراوانی نێوان هەریەك لە میرانی شامو مصرو نێوان پاشای فەڕەنسا لە عەکاو تەواوی ناوچە داگیرکراوەکاندا بەردەوام بوو، حوکومەتی شامو حوکمەتی مصر هەریەکەیان لە ڕاستی خۆیەوە دەیەویست (لویس) بە لای خۆیدا ڕاکێشێو لە بەڵێنو تەماع وەبەرنانیش درێغی یان نەدەکرد، بەڵام (لویس) پێش ئەوەی هیچ بڕیارێکی یەکلاکەرەوە دەربکات بەرژەوەندی مەسیحایەتی دەخستە پێشەوەو لەم پێناوەدا سیاسەتی خۆبواردنو خۆچڕداگرتنی دەگرتەبەر، ئەو دەیتوانی بەڕەسمی لەگەڵ لایەکیان ڕێك کەوێتو پاڵی پێوەدا، یان هەڵوێستی بێ لایەنی بگرێتەبەر یان بە هومێدی سەرشکاندنەوەی یەك لە دوو لایەنە — ناکۆکەکان — بە گوێرەی توانا، هەر لەسەر سیاسەتی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٤٦.

٢ المصدر نفسه ص: ١٤٧.

٣ المصدر نفسه ص: ١٤٧.

ژێربەژێری و بانێك و دوو هەوا بەردەوام بێت،[١] بە هەر حاڵ هێشتا (لویس) لە (عەكا) ئارامی نەگرتبوو، (مەلیك ناصر یوسفی)ی حوكمڕانی (دیمەشق و حەلەب) دوو نوێنەری خۆی بۆ لا ناردن و داوای لێكرد لە دژی (مەمالیكی بەحری) — ی ئەوانەی (سوڵتانی موعەززەم تورانشا)ی هاوشانی ئەویان كوشتووە — هاوپەیمانی یان لەگەڵ ببەستێ، ئەمەو (مەلیك ناصر) بەڵێنێ بە (لویس)دا ئەگەر ببێتە هاوپەیمانی ئەوا لە بەرامبەردا (بیت المقدس) دەداتەوە بە مەسیحیەكان،[٢] (سوڵتان عزالدین ئایبەك)یش لە نزیكەوە چاودێری ڕووداو گۆڕانكایەكانی دەكرد، بڕیاریدا سەرەتا بە ڕێگەی ئاشتی ڕووبەڕووی ئەیوبیەكان ببێتەوە، ڕق و بیری تۆڵەیان بنیشێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ گەورە میرانی مەمالیك ڕێكەوت (ئەشرەف) موسای كوڕی مەسعودی كوڕی كامیل محمد)ی ئەیوبی — كە مێردمنداڵێكی (١٠) ساڵان بوو — بكاتە برابەشی سەڵتەنەت و جێگری خۆی، هەر بڵاوكراوەیەك و بڕیارنامەیەك دەردەچوو بە ناو و ئیمزای هەردووكیان دەردەچوو، وتارەكانی سەر مینبەری مزگەوتەكانی مصر بە ناوی هەردووكیانەوە دەخوێنرانەوە، ناویان بە جووتە لەسەر دینارو درهەم دەنوسرا،[٣] وەك دەردەكەوێ (ئایبەك) هەواڵی سازشی نێوان (مەلیك ناصر)و (لویسی نۆهەم)ی پێگەیشتووە، لەبەر ئەمە ترسا ئەم سازشە سەر بۆ لێك نزیك بوونەوەیەكی حەتمی بكێشێ، بۆیە (لویس)ی لە پێكهێنانی ئەم كەین و بەینە ئاگاداركردەوەو بەگوێی دادا: ئەگەر بێتو هەر هەنگاوێكی دوژمنكارانەی لە دژ هەڵێنێ ئەوا ناچار دەبێ هەموو ئەو دیلە مەسیحیانە بكوژێت كە لە ماوەی هێرشی حەوتەمیاندا بۆ سەر (دمیاط) لێیان قۆڵبەست كراون و هێشتا بە تەمان بە پارە ئازاد بكرێن، هاوكات لەگەڵ ئەمەدا ئامادەیی خۆشی بۆ هەمواركردنی پەیمانەكەی (دمیاط)و خۆشبوون لە نیوەی فیدیە بڕیار لەسەر دراوەكە بۆ دەربڕی ئەگەر بێتو لە دژی (مەلیك ناصر یوسف) هاوپەیمانێتی لەگەڵ ببەستێ، بەڵام (مەلیك لویس) لەگەڵ ئەوەدا بە خاتری ستراتیژی سیاسی و عەسكەری (دیمەشق) زیاتر حەزی لە ئەنجامدانی هاوپەیمانێتیەكەی گەڵ (مەلیك ناصر) بوو، بەڵام بیری لە ساغ و سەلامەتی دیلە خاچپەرستەكانی مصر كردەوە لەبەر ئەمە لە بەرامبەر داوەتی هاوپەیمانێتی هەردوكلا بێ وەڵام مایەوەو خۆی بە لای هیچ لایەكیاندا نەخست،[٤] كاتێك (مەلیك ناصر) لە

---

١ المصدر نفسه ص: ١٤٨.

٢ المصدر نفسه ص: ١٤٩.

٣ تأريخ الايوبيين في مصر والشام واقليم الجزيرة ص: ٣٩٦.

٤ مذكرات جوانفيل ص: ٢٠٨، ٢٠٠.

(مەلیك لویس) ئومێدبڕاو بوو، بە خۆیو سوپاکەیەوە بەرەو مصر بەڕێکەوت، میرانی (مەمالیکی بەحری) – کە بەم هێرشەیان زانی – ناکۆکیە نێوخۆییەکانیان لەبیر خۆیان بردنەوەو لە پێناوی شکاندنەوەی هێرشی ئەیوبیدا کە هەڕەشە لە ئایندەی هەدوو لایەکیان دەکات گرد بوونەوەو پشتی (ئایبەك)یان گرت، ئەمەو (ئایبەك) بە سەرکردایەتی سوپای مەمالیك لە قاهیرە دەرچووو بەرەو ڕووی هێرشی ئەیوبییەکان بەڕێکەوت، بەڵام ترسا خاچپەرستان هەلی چۆڵبوونی مصر لە سوپا بقۆزنەوەو جارێکی تر هێرش بێننەوە سەر (دمیاط)، لەبەر ئەمە فەرمانیدا تەواوی پەناو پەسیوەکانی بڕوخێنیٚ، کار بەوە گەیشت هەموو شار ڕووخێنرا جگە لە مزگەوتی گەورەی شارەکەو کەپرو کۆختەکانی قەراغ دەریا کە ڕاوچیەکانو خەڵکانی هەژار تێیاندا نیشتەجیٚ ببوون هیچ پەناگەیەكو خانوبەرەیەك لەو شارەدا نەما، ناویان نا ((المنشیة)).[1]

## ٢ـ جەنگو پێکدادانێکی نێوان (مەمالیك)و (ئەیوبییەکان):

سوپای ئەییوبیانو مەمالیك لە (١٠)ی نێو جەژنانی (ذوالقعدة) ٦٤٨/ ٣ شوباتی ١٢٥١ز، لە (عباسیە)ی نێوان دوو شاری (بلبیس)و (صالحیە) پێك هەڵشاخان، هەرچەندە مەمالیك) لە سەرەتای جەنگەکەدا ئازایەتیەکی باشیان نیشاندا، بەڵام (مەلیك ناصر) سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەم کاتەداو لە گەرمەی جەنگەکەدا پۆلێك لە سوپای (مەلیك ناصر) کە مەمالیکی (عەزیزیە) بوون دەماری هاوڕەگەزییان جوڵاو خوێنی خزمایەتیان خرۆشاو سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵکردو پەیوەندیان بە سوپای (مەمالیك)ەوە کرد،[2] لەبەر ئەمە لاتەرازووی بردنەوەکە پێچەوانە بۆوەو (مەلیك ناصر) هیچی بە دەستەوە نەماو بە ناچاری بەرەو شام گەڕایەوە، مەمالیکیش بە خۆو بە ژمارەیەك دیلەوە بە سەرکەوتوویی بەرەو قاهیرە گەڕانەوە.[3]

ئەم ڕووداوە بە قازانجی (مەمالیك) شکایەوەو بووە مایەی پتەوتربوونی پایەکانی دەوڵەتە تازە سەرپێکەوتووەکەیان، (ئایبەك) نەیهێشت بەرهەمی سەرکەوتنەکەی بەفیڕۆبچێتو پاش مانگێك سوپایەکی بە سەرکردایەتی (فارس ئۆکتای) بەڕێکردو سەرەنجام دەستی بەسەر هەرێمی (غەززە)دا گرت،[4] ئینجا بڕیاریدا سوپا بەرەو تەواوی

---

١ السلوك ١/٤٦٦، في تاريخ الايوبيين ص: ٣٩٨.
٢ تأريخ الايوبيين في مصر والشام ص: ٣٩٨.
٣ المصدر نفسه ص: ٣٩٨.
٤ المصدر نفسه ص: ٣٩٨.

وڵاتی شام پرکێش بکات، لە پێناوی مسۆگەرکردنی سەرکەوتن هەوڵە دبلۆماسیەکانی خۆی خستنە گەڕ تا (لویسی نۆهەم) بەلای خۆیدا کەمەندکێش بکات، بەڵێنی پێدا هەر کە دەستی بەسەر (بیت المقدس)دا گرت یەکسەر پێشکەشی ئەوی دەکات.[١] (ناصر یوسف)یش بەش بە حاڵی خۆیو لە پێناوی ڕاوەستانو نەبەزینی لە گۆڕەپانی زۆرانبازێی گەڵ (مەمالیك) پێویستی بە هاوپەیمانێکی بەهێز هەبوو، لەبەر ئەمە خێرا نوێنەری خۆی بەرەو عەکا ناردو بە لویسی ڕاگەیاند ئەگەر پشتیوانی لێ بکات (بیت المقدس)ی ڕادەست دەکات.[٢]

**٣ـ هاوپەیمانی دووقۆڵی نێوان مەمالیكو خاچپەرستان:**

(لویسی نۆهەم) دەرفەتی ململانێ ئیسلامیەکەی قۆستەوەو بە باری بەرژەوەندی خاچپەرستانیدا شکاندەوە، ئەمەو توانی فشار لەسەر (ئایبەك) دانێتو تەواوی دیلەکانی پێ ئازاد بکات، پاشان هەردوکلا لە ساڵی ٦٥٠ك/١٢٥٢ز بە ئامانجی دژایەتی کردنی (ناصر یوسف) پەیمانێکی دوو قۆڵیان گرێدا، تێیدا هاتووە:

- (ئایبەك) بەڵێنیدا تێکڕای دیلە مەسیحیەکان ئازاد بکات.
- چاوپۆشی کردن لەو برە فیدیەی لەسەر (لویس) ماوە.
- (ئایبەك) بەڵێن بە مەلیکی فەرەنسا دەدا مەملەکەتی (بیت المقدس) لە خۆرهەڵاتەوە تا ڕووباری ئەردەن بۆ خاچپەرستان دەگێڕێتەوە.[٣]

بەڵام ئەم هاوپەیمانێتیە هیچ بەرهەمێکی بە دەستەوە نەدا، چونکە پاش واژووکردنی پەیمانەکە (ئایبەك)و (لویس) ڕێکەوتن هێرشێکی دووقۆڵیو بەرفراوان بکەنە سەر وڵاتی شامو (مەلیك ناصر)ی لێ بەدەرنێن، بەپێی ڕێکەوتنەکە دەبوایە لویس دەست بەسەر (یافا)دا بگرێتو (ئایبەك)یش لە ڕاست خۆیەوە (غەززە) داگیر بکات، پاش ئەمە هەردووکلا بەیەك دەگەنو هەردووك سوپا پێکەوە هێرشێکی بەرفراوان دەکەنە سەر هەرێمەکانی دەوڵەتی ئەیوبی،[٤] بە خاتری ڕاپەڕاندنی نەخشەکە (لویس) بە سەرکردایەتی (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد جەنگاوەر بەرەو (یافا) ملی لێناو بەبێ هیچ پەرچەهێرشێك لە لایەن ئەیوبیەکانەوە دەستی بەسەردا گرت،[٥] لەو کاتەشدا سوپای مەمالیك بە سەرکردایەتی

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٩٨.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٩٨.

٣ المصدر نفسه ص: ٣٩٩.

٤ المصدر نفسه ص: ٣٩٩.

٥ المصدر نفسه ص: ٣٩٩.

(فارس الدين ئۆکتای) بەرەو غەززە بەڕێکەوت و کە گەیشتە (صالحیە) بارگەی خست، (ناصر یوسف) بەم کەین و بەینەو هاوپەیمانیەی زانی، بۆیە خێراو بەبێ دواکەوتن و لە پێناوی بەرگرتن لە بەیەك گەیشتنی دوو هێزە هاوپەیمانەکە سوپایەکی چوارهەزاری سازکردو بەرەو غەززە بەڕێکەوت و لەسەر گردی (عجول)ی نزیك غەززە بارگەی خست، پاش دەست بەسەرداگرتنی ئەم شارە بە خاتری ستاندنەوەی لە (لویسی نۆهەم) بەرەو یافا بایدایەوە،[١] ئەیوبیەکان دەستیان بەسەر کەرتی غەززەدا گرت و سوپای مەمالیکیش لە (صالحیە) جێگیر ببوو و نەدەڕۆی، دەرکەوت لە بەرامبەر یەکتریدا خۆ ڕادەنوێنن، سەنگەریان لێك دەگرتن، ڕووبەڕووبوونەوەو پێکداداان نزیك بۆوە، بەڵام هێندەی نەخایاند لە سەرەتای ٦٥١ك/١٢٥٣ز هەردووکلای ناتەبا صوڵحیان کرد، دوای ئەمە چ گۆڕانکاریەك لە گۆڕەپانی سیاسیدا نەهاتە ئاراوە.[٢]

**ک- هەوڵەکانی خەلیفەی عەباسی بۆ ئەم صوڵحە:**

واقیعەن بەهۆی دەرکەوتنی خەتەرێکی تازە کە هەڕەشەی لە هەموو موسڵمانانی خۆرهەڵاتی نزیك دەکرد، مەمالیك و ئەیوبیان نەیانتوانی چی دیکە لە سەنگەری دوژمنکارانەی یەکتردا بمێننەوە، پەلامارە بەرفراوانەکەی مەغۆل کە زۆربەی عیراقی ڕامالیبوو و پێشەنگی سوپاکەیان سەرەتاتکەی بەغدای پایتەختی دەکرد، کاریگەری گەورەی خستە سەر هێزە ئیسلامیەکان تا بە پەلە یەکگرنەوە لە لایەکی ترەوە جگە لە هێزەکانی شام و مصر هێزێکی تر لە جیهانی ئیسلامیدا نەمابوو پشتیوانی خەلیفە بکات، خەلیفە بە مەبەستی چەسپاندنی ئاشتی نێوان مەمالیك و ئەیوبیان (نجم الدين بادرائی) نوێنەری بەرەو لای (ناصر یوسف)و (معز ئایبەك) نارد،[٣] نێردراوی خەلیفە توانی صوڵحیان لەنێواندا بکات و ئەم بڕیارانەی تێدا دران:

- (مەلیك ناصر یوسف) دان بە حکومەتی (ئایبەك) دادەنێ، دان بە سەروەری و باڵادەستی مەمالیك دا دێنێ بەسەر ولاتی مصرو ولاتی شام تا ڕوباری ئەردەن، بە جۆرێك شارەکانی غەززەو بیت المقدس و تێکڕای کەناراوەکانی فەلەستین دەکەونە ژێر قەڵەمڕەوی ئەوەوە.

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٩٩.
٢ المصدر نفسه ص: ٣٩٩.
٣ العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية ١/٤٠٠.

– (مەمالیك) دان بە سەروەرایەتی ئەیوبیان دا دێنن بەسەر تەواوی ناوچەکانی تری وڵاتی شامدا، وەك دەردەکەوێت بەهۆی گەیشتنی هەواڵی دڕندانەی مەغۆلەکان لە کاتی هاتنی لافاوی هێرشەکانیان لەنێوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو جیهانی ئیسلامیو باڵکێشانی ترسو تۆقان بەسەر ناوچەکاندا هەردووکلای وادارکرد بە ئاسانی وەلامی بانگەشەی خەلیفە بە ئەرێ بدەنەوە، (معز ئایبەك) لە ڕاستی خۆیەوە ئەو سەرکەوتنەی بەسەر (ناصر یوسف)دا تۆماری کردبوو، لەگەڵ خەتەری مەغۆلو هێرشەکانی ئەوان بۆ سەر شامو مصر بە هەل وەرگرتو خۆی لە داوی (أشرف موسا)ی ئەیوبی شەریکە حکومەتی دەرباز کردو ناوی لە وتاری هەینیدا لابردو لە ساڵی ٦٥٠ك/١٢٥٢ز قۆڵبەستی کردو لە قەلای (الجبل)دا زیندانی کردو خۆی لە مصر بە تاکە سوڵتان مایەوە.[1]

لویسی پاشای (فەرەنساو لاتینی ساحیلی شام) بۆی دەرکەوت ئەگەر (شامو مصر) یەکبگرنو هەوڵو کۆششەکانیان یەك بخەنو لە بڕیارەکانیاندا یەك دەنگ بن ئەوا لەمەولا موسڵمانان دەتوانن بەرپەرچی تاقمە خاچپەرستەکان بدەنەوەو بە هەر جۆرێك بیانەوێ تەنگیان پێ هەڵدەچنن، بێگومان ئاشتینامەکەی نێوان (ناصر)و (ئایبەك) کە لە مانگی صفری ٦٥١ك/ئەپریلی ١٢٥٣ز دا ئەنجام درا وەکو گورزێکی کاریگەر بەر نێوجەرگەی سوپای مەسیحی بە تایبەتیش لویسی نۆهەم کەوت، چونکە دوای ئەمە مەلیك ناصر یوسف دەستی بەتاڵ بوو و خۆی بۆ تۆڵە سەندنەوە لە لویسو سوپاکەی ساغ کردەوەو بڕیاریدا دەرسێکی کاریگەریان دابدا،[2] بێگومان شتێکی ئاساییو چاوەڕوانکراو بوو شەڕو پێکدادان لە نێوان هەردوك سوپای مەلیك ناصرو لویسی نۆهەم دا ڕووبدا، چونکە دەرکەوت لویس نێتی گۆڕاوەو ژێربەژێر لەگەڵ میرانی مصر لە دژی ناصر بۆتە هاوپەیمان، ئەوەی زیاتر یارمەتی هەلایساندنی ئەم جەنگەی دا ئەمە بوو کە هێزەکانی حکومڕانی حەلەب لە بەرامبەر غەززەو لە نزیك سەربازگەی خاچپەرستان لە (یافا) هەڵیدابوو، هەرچەندە ئەمەی گوتمان جەنگێکی یەکلاکەرەوە نەبوو بەلام بوو بە پێشەکیی ئەو زنجیرە هێرشە توندانەی هێزەکانی ناصری بڕیار بوو دوای ئاشتی گەڵ مەمالیك بیانکاتە سەر خاچپەرستانو هەرێمەکانیان،[3] دەرەنجام لویسی نۆهەم خێری لە ناتەباییەکەی نێوان شامو مصر نەبینیو بە ناچاریو دوای تێکشکانەی مصریو مایە پوچبوونەکەی (شام)ی لە ڕەبیعی یەکەم ٦٥٢ك/٢٤نیسان ١٢٥٤ز

---

١ تأريخ الايوبيين في مصر والشام ص: ٤٠٠.
٢ العدوان الصليبي على بلاد الشام ص: ١٩٢.
٣ المصدر نفسه ص: ٢٠٠.

بە سەری شۆڕو سومعەشکاوی‌و داماوی بەرەو فەرەنسا گەڕایەوە، فەوتانو دەرچوونی ڕووحی عەسکەرتاری فەرەنگ لە دەمی دەمپێکدادانو گیانەلایدا لە ناوچەکەدا.[1]

**٥ـ هەڵگەڕانەوەی هۆزە عەرەبەکان لە دژی (مەمالیك) لە (مصر):**

یەکێکی تر لەو کێشانەی ڕووبەڕووی (سوڵتان ئایبەك) بۆوە بریتی بوو لە شۆڕشی هەندێك هۆزی عەرەب کە لە ساڵی ١٢٥٣ز هەلایساو بە (شۆڕشی العربان) ناوی دەرکرد، وەکو زانراوە هۆزە عەرەبەکان دوابەدوای فەتحی ئیسلامی لە مصردا نیشتەجێ بوونو بە ژینگەی کشتوکاڵی مصر کاریگەربوونو بەرەبەرە گۆڕانیان بەسەرداهاتو بوونە نەتەوەیەکی کشتوکاڵی‌و لە ناوچەکانی ئەو وڵاتەداو بە تایبەتیش لە هەرێمەکانی (صعید و شرقیة) جێگیربوونو ناوی (العرب المزارعه)= کشتیارە عەرەبەکانیان لێنرا، لە نزیك دێهاتە کۆنە جوتیارنشینەکانی ئەو وڵاتە دەستیان بە جوتێری‌و کشتیاری کرد، بەلام وەکو تێبینی دەکرێ ئەم عەرەبانە لە پلەوپایەی کۆمەلایەتیداو بە هۆی کۆمەکی کردنی دەوڵەت لە کاتی جەنگی خاچپەرستاندا لە جوتیارە ڕەسەنەکان بەرزتر بوونو خاوەنی پێگەیەکی بالای کۆمەلایەتی بوون، پیاوماقوڵە عەرەبەکان لە کاتی جەنگدا پاراستنی دەوڵەتو ڕاگرتنی هێمنایەتی دێهاتەکانیان خستبووە ئەستۆی خۆیانو لە پێشکەشکردنی بەروبومو خەلەی کشتوکاڵی‌و بەخشینی دەرامەتو خەراج بە دەوڵەت درێغیان نەدەکرد، عەرەبەکان لە ماوەی سەردەمی مەمالیکدا چەند شۆڕشێکیان ئەنجامدانو کتێبە هاوچەرخەکان ناوی (فساد العربان= گێرەشێوێنی عەرەبان)یان لێناون، هۆکاری ئەم شۆڕشانە دەگەڕێتەوە بۆ ستەمی میرانی مەمالیك کە خۆی لە پاشقولدانو پەزمەندەکردنی بەرهەمە کشتوکاڵیەکانو دانانی نرخ لەسەر ئەو بەرهەمانەو هەڵبەز دابەزپێکردنی نرخەکاندا خۆیان نیشان دەدا، عادەتەن دەرەنجامی شۆڕشەکان بەهۆی لێزانینی هونەرەکانی جەنگ بە سەرکەوتنی مەمالیكو سەرکوتکرانی عەرەبەکان کۆتایی پێدەهات،[2] لە لایەکی تریشەوە عەرەبەکان چەکوچۆڵو ئامرازی جەنگی پێویستیان بە دەستەوە نەبوو، بلاوکراوەیەك کە لە سەردەمی مەمالیکدا دەرچووە ئەمەی تێدا نووسراوە: ... کەس لە عەرەبو جوتێرەکان بۆی نیە سواری ئەسپ ببێ، نابێ ڕاشی بگرێت، چونکە هەلی بۆ هەڵکەوێ خیانەتی پێ دەکات، چاودێریان بکەو بەرەنگاریان ببەوە، هەر کەسێك سواری ئەسپ بوو یان ڕای دەگرت بە پێی بڕیاری دەرچووی دەوڵەت سزای بدە، ڕێگا نەدەی دەستیان بە چەك بگاتو هەڵی بگرن، نابێ کەس

---

١ معاهدات للصلح والسلام بين المسلمين والفرنج.

٢ قيام دولة المماليك الأولى ص: ١٢٩.

چەکیان پێ بفرۆشێ یان بە ئەمانەت لە لایان دانێ، کاڵا بازرگانیو پیشەسازیەکانی هەرێمەکان بەسەرکەوەو ئەوەی لای بازرگانەکان هەیە بە پارە لێیان بستێنە، بەم کارەت دڵو دەروونی تاوانباران بسوتێنەو سەرکوتیان بکە، ئاگری سزا لەو کەسانە بەردە کە خۆیان بۆ کارانێك تەرخان کردووە ئەم ئاگرە دەیانگرێتەوە.[1]

لە بڵاوکراوەیەکی تردا ئەمە هاتووە: .. نابێ کەس لەو (عربان)ە خێڵەکیانە سواری ئەسپ ببێ، نابێ فێری ئەسپ سواری ببێ، هەر کەسیان ئەمە بکات دەست درێژی کردووەو تۆڵەی لێ دەستێنرێت، بەرژەوەندیەکان داخوازی نەهێڵانی ئەم کارەیان لێ دەکەن...

هەر عەرەبێك پێچەوانەی (مەرسومی شەریف) بجوڵێتەوەو سواری ئەسپ ببێ ئەوا ئەو کەسە هەر کەسێك بێ لە گەردنی دەدرێتو گورزی کوشندەی لێ دەوەشێنرێت، بەم سزایە هاووێنەکانی تەمبێ دەبنو کەس لە خۆرهەڵاتدا دەرفەتی ئەم کارە بۆ خۆی نارەخسێنێ.[2]

هۆکارەکانی ململانێی نێوان عەرەبو مەمالیك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە: مەمالیك ئەوانەی جڵەوی حوکمڕانی مصریان بە دەستەوە گرتووە – خەڵکی ئەو وڵاتە نەبوون، بەڵکو تەنها بۆ مەبەستی کاری سەربازیو جەنگی هێنرابوونە نێو خاکی مصرەوە، پاش ئەمەش ئەمانە کە لە رەچەڵەکدا مصری نەبوون، لە رێی ژنو ژنخوازیشەوە تێکەڵی دانیشتوانە رەسەنەکەی ئەو وڵاتەیان نەکرد، بەڵکو خۆیان دوورەپەرێز کرد، وێڕای ئەمەش ئەگەر مەمالیك رۆڵێکی کاریگەرو بەرچاویان لە پاسەوانیکردنو بەرگری لێکردنی مصر هەبووبێ لە بەرامبەر دوژمنەکانیدا، ئەوا بە هەمان شێوە مصریەکانو عەرەبەکانیش بە ئەندازەی مەمالیك هەمان رۆڵیان نواندووەو بەرگریان لە مصر کردووە، لەبەر ئەمە عەرەبەکان پێیان وابوو ئەوان لەو مەمالیکە غەریبانە شایانترن بۆ حکومڕانی مصر،[3] چەند شۆڕشێکیان لە دژکران، ئەوانیش بەوپەڕی دڵڕەقیو بێ بەزەییانە بە لێدانو کوشتن – کە لەو سەردەمەدا باو بوو – دایان دەمرکاندنەوەو سەریان دەشکاندنەوە، لە کاردانەوەی ئەم سیاسەتەداو بە مەبەستی بەشداری کردنی کێشمەکێشمو گێرەشێوێنیە نێوخۆییەکانی نێوان میرانی مەمالیك، جوتیارەکان گوندەکانیان چۆڵ دەکردنو بەرەو شارەکان کۆچیان دەکرد، پاڵنەری سیاسیو ئابووری لە پشت جوڵانی ئەم شۆڕشانەوە بوو، بێگومان پاڵنەری سیاسیو هەوڵدانی هەندێك هۆزی عەرەبی بۆ سەرەوژێرکردنی حوکمەتی مەمالیك، پەرچەکردارێکی

---

١ صبح الأعشى، نقلا عن تأريخ القبائل العربية، محمود السيد ص: ١٢٤.

٢ المصدر نفسه ص: ١٢٥.

٣ تأريخ القبائل العربية، محمود السيد ص: ١٢٥ـ١٢٦.

توندوتیژی لەلا دروست کردن، مەمالیك لە ترسی کۆتاکردنی دەسەڵاتیان سیاسەتی دڵڕەقانەو توندوتیژانەیان بۆ خامۆشکردنەوەی ئەم شۆڕشانە بەکارهێنا، شۆڕشەکەی ساڵی ٦٥١ك/١٢٥٣ز یەکەمین‌و ترسناکترین شۆڕش بوو کە عەرەبەکان لە سەردەمی سوڵتان ئایبەکی تورکمانیدا ئەنجامیاندا، وەکو گوتمان ئەم شۆڕشە پاڵنەری سیاسی‌و ئابووری لە پشتەوە بوون.

هەر لەو کاتەوە مەمالیك لە جەنگی (عباسیە)دا بەسەر ئەیوبیەکاندا زاڵ بوون‌و خەلیفە بە باری بەرژەوەندی ئەوان هاتە نێو نێوبژیوانیەوە، ئەوان بیروباوەڕێکیان لە لا گەڵاڵەبوو، کە هەرچی وڵات هەیەو ئەوەی تێشی دایە بەبێ کێشە هی ئەوانەو بەشی کەسی تری پێوە نیە، لەبەر ئەمە شولی خراپەکاری‌و گەندەڵیان لێ هەڵکێشاو باج‌و خەراجی سەر ئومەتیان زیاد کرد، تا ڕادەیەك کە هەندێك مێژوونووسی وەکو (مەقریزی‌و أبو المحاسن) واڵێ بکات خاچپەرستان لە ئەوان بە چاکتر وەسف بکەن، ئەو مێژوونووسانە دەڵێن: ئەگەر فەرەنگ حوکمی مصریان کردبایە ئەم جۆرە تاوانانەیان نەدەکرد،[1] بێگومان ئەم قسەیە لەگەڵ واقیع نایەتەوە، چونکە کاتێك (فەرەنگ) لە هێرشی حەوتەمیاندا دەستیان بەسەر بەندەری (دمیاط)دا گرت، کاری وا نەشیاوو دڕندانەیان ئەنجامدان، مرۆڤ بە بیستنیان جەستەی دادەچڵەکێ‌و سەریشی سپی دەبێت، لە کتێبەکانی پێشومدا بە دوورو درێژی ئەم تاوانانەم باس کردوون، ژمارەیەك مێژوونووس هەوڵیانداوە لاپەڕەکانی مێژووی مەمالیك بە ڕەشهەڵگەڕاوی‌و بێزراوی نیشان بدەن، ئێمە لەگەڵ ئەوەدا دان بەو حەقیقەتە دادێنین کە لە سەردەمی ئەواندا پەرتەوازەیی‌و کێشمەکێشم لەنێوان هۆزو تایەفەکانی‌کۆمەڵگاداو ناتەباییش لەنێو خودی میرانی مەمالیکدا هەبووە، بەڵام کاتێك باسی سەرکردەکانیان دێتە پێشەوە دەبینین خۆری ئیمانەکەیان دونیای ئێمە ڕووناك دەکاتەوە، کاتێکیش تیشکی ئیمان بەر پەردەی دڵیان دەکەوێت‌و قورئانیش گیانی فیداکاری‌و شەهادەتخوازانەیان دەبزوێنێت بۆ ئێمە تاوانەو سپڵەییە ڕۆڵی پاڵەوانانەو دانستەی (زاهیر بیبرس‌و موزەفەر قوتتەز) فەرامۆش بکەین لە سەرکردایەتی کردنی ئەو سوپا ئیسلامیەدا کە وەکو شاخی سەرکەش لە ڕووی پەلامارە دڕندانەکەی تەتەر وەستایەوە، پەلامارێك بیروباوەڕو وڵاتو ئوممەتی بە ئامانج گرتبووین‌و دەیەویست لە ڕەگو ڕیشەوە هەڵمانتەکێنێ، بەڵام دەرەنجام بەهۆی یەکێتی ڕیزەکان‌و پاڵنەری ئیمانی ڕاست‌و دامەزراوی ئەوان داگیرکەران‌و

---

[1] السلوك ١/٢٨٠، النجوم الزاهرة ٧/٩، قيام المماليك ١٣٠.

پەلاماردەران تێکشکێنرانو تەفروتونا کران،[١] بێگومان جەنگی (عەین جالوت) بۆتە منارەیەکی تیشك بەخش کە لە شەوە ئەنگوستە چاوەکاندا ڕێبازی سەربەرزیو سەرکەوتنی پێ دەدۆزینەوە، جگە لەم منارەیە، مەمالیك چەند منارەیەکی تریشیان بۆ بەرزکردووینەوە، وەکو منارەکانی: (دەربازکردنی وڵاتی شام لە پرۆژەی داگیرکاری مەسیحی لە سەردەمی (منصوری کوڕی قلاون)، بیناکردنو دامەزراندنی خوێندنگاو قوتابخانەکان، دامەزراندنی کتێبخانە وەقفیەکان، دروستکردنی مزگەوتەکان بەشێوەی ئەندازیاری، دامەزراندنی خانوبەرەی خێرخوازیو چاکەخوازی، بزوتنەوەیەکی زانستی هەمەلایەنە (الحركة العلمية الموسوعية) لە لایەن زانایانی سەردەمی مەمالیك بە پێشەنگایەتی ئیمامە گەورەکانی وەکو (نەوەوی، ابن تيمية، ابن القيم، ذهبي، ابن كثير، المزي، سبكی، مقريزي، ابن خلدون، سيوطيو ژمارەیەکی تریش) دامەزرێنرا)، لەمەولا لە بابەتەکانی تری ئەم کتێبەدا بە ئیزنی خودای باڵادەست باس لەمە دەکەین، لە ڕاستیدا لە سەردەمی مەمالیکدا لادان هەبووەو دەستدرێژی ناڕەواو توندو تیژو بێ پاساو کراوەتە سەر خەڵکانی نەیارو ڕکەبەر، کاردانەوەی بەرامبەریشی لێکەوتۆتەوە، (أبو المحاسن) دەڵێ: دانیشتوان — ی ڕەسەنی — مصر بە سوڵتانێك قایل نەبوون کۆیلایەتی بەسەردا هاتبێ، هەتا ئەو ڕۆژەش سوڵتان (ئایبەك)ی تێدا مرد ئەوان قسەیەکی وا خۆشیان بە گوێدا نەدا یان ڕوویەکی وا خۆشیان نیشان نەدا کەیفی بەخۆی بێ، کاتێك سواری وڵاخەکەی دەبوو و بە ڕێگاو بانەکاندا تێدەپەڕی، دەیانگوت: ئێمە تەنها سوڵتانو سەرۆکێکمان دەوێ کە لەسەر ئیسلامەتی لە دایك بووبێت،[٢] پیاوماقوڵێکی عەلەوی بە ناوی (حصن الدين کوڕی ثعلب) ڕێبەرایەتی ئەم شۆڕشە جەماوەریەی دەکرد، ئەو چاوی بڕیبووە کورسی سەڵتەنەتو بە ڕاشکاوی دەیگوت: پێویستە دەسەڵاتی (مصر) بە دەست عەرەبەوە بێ نەك کۆیلەکانەوە،[٣] ئەمەو لە مصری ناوەڕاستو هەرێمی خۆرهەڵات بەڕووکاری دەریاوە دەوڵەتێکی عەرەبی سەربەخۆی دروست کرد، شارۆچکەیەك لە دەوروبەری (فيوم) کە (ذروة سريام)ی پێ دەگوتراو دوایە بە (ذروة الشريف) ناوی دەرکردو لە نێوان (نيل)و (ترعه المنتهى)دا بوو کە ئێستا (دەریای یوسف)ی پێ دەگوترێت بوو بە بنکەی سەرۆکی دەوڵەتەکە،[٤] (شريف حصن الدين) پەیوەندی بە

---

١ تأريخنا بين تزوير الأعداء وعقلة الابناء ص: ١٨٠.

٢ النجوم الزاهرة ١٣/٧.

٣ القبائل العربية ص: ١٣١.

٤ التعريف بالمصطلح الشريف ص: ١٨٨.

مەلیك ناصر یوسف ئەیوبیەوە کردو داوای لێکرد لە دژی ئاییەك یارمەتی بدا، بەڵام شانسی ئەو لەو کاتەدا نوێنەری خەلیفە (المستعصم) هاتبوو نێوبژیوانی (مەلیك ناصر)و (معز ئاییەك)ی دەکرد، عەرەبەکانی ئەو کاتە لە ڕووی هێزی مرۆییو سەروەتو سامانو ئەسپو وڵاخەوە دەوڵەمەند بوون، سوپایەکی گەورەیان دامەزراندو سوێندیان بۆ (حصن الدین)ی سەرۆکیان خوارد، (سوڵتان ئاییەك) ناچار بوو هێرشێك بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکە ساز بکات، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لێرەدا (ئاییەك) سەرکردایەتی سوپا هێرشبەرەکە بە (فارس الدین ئۆکتای) گەورە مونافیسی خۆی کە پسپۆڕی گۆڕەپانی جەنگە دەسپێرێت، ئۆکتای بە خۆی پێنج هەزار ئەسپ سواری بە ئەزموونی مەمالیك لە قاهیرە دەرچوونو بەرەو (الشرقیە) بەڕێکەوتن، هەرچەندە ژمارەی مەمالیك لەچاو ژمارەی عەرەبەکان زۆر کەمتر بوو، بەڵام لە ساڵی ١٢٥٣ز یدا و بە هۆکاری شارەزایی یان لە جەنگداو لێهاتوویی (ئۆکتای) سەرکردەیان مەمالیك سەرکەوتنو شۆڕشە عەرەبیەکەش لە (بلبیس) ڕوخا،[1] بەڵام لە ناوچەی (الوسطی- ناوەند)ی مصردا وەکو خۆی مایەوە، (حصن الدین) لەوێ حوکومەتێکی سەربەخۆی دامەزراند، (ئاییەك)و سوڵتانەکانی دوای ئەویش تا سەردەمی سوڵتان (بیبرس) هیچیان پێ لەگەڵ نەکرا، ئینجا (سوڵتان بیبرس بندقداری) داوی بۆ نایەوەو قۆڵبەستی کردو لە (ئەسکەندەریە) هەڵیواسیو خنکاندی،[2] (میر حصن الدین) هەر چۆنێك بێت، گرنگ لەوەدایە ئاییەك توانی زاڵ بێت بەسەر یەکێك لەو ڕەگەزانە هەڕەشەی لە بەرپابوونی دەوڵەتی مەمالیكو ئارامبوونی دەکرد لە مصردا.[3]

(مقریزی) لە کتێبی (السلوك)دا دەڵێ: لە دەرەنجامی شۆڕشەکانی عەرەب لە دژی مەمالیکدا عەرەبەکانی مصر پەرتەوازە کرانو کڵپەی شۆڕشەکەیان خامۆش کرایەوە.[4]

**٦ـ (ئاییەك)و مەترسی هاوڕێکانی، کوژرانی (فارس ئۆکتای):**

تایەفەی (مەمالیکی بەحری) بە سورکردایەتی (فارس الدین ئۆکتای) کۆسپێکی تر بوون لەو کۆسپە سەرەکیانەی لەبەردەم دەوڵەتە تازە سەرپێکەوتووەکەی (ئاییەك)دا قیت ببوونەوەو هەڕەشەی لەنێوبردنیان لێ دەکرد، (ئاییەك) دەرکی بە هێزوپێزی کردبوونو لە پێناوی ڕەواندنەوەی سامو هەیبەتی ئەم تایەفەیە لە دڵو هەناوی خۆیدا کاری بۆ

---

١ السلوك ١/٣٨٧.

٢ التعریف بالمصطلح الشریف ص: ١٨٨، قیام دولة الممالیك ص: ١٣٢.

٣ قیام دولة الممالیك ص: ١٣٢.

٤ تاریخ القبائل العربیة ص: ١٣٣.

بەهێزکردنی خۆی دەکرد، هێزێکی تایبەت بە خۆی لە مەمالیك دروست کردو ناسناوی (المعزية)یان بەسەردابڕا، جێگرایەتی پۆستی سەڵتەنەتی مصری دایە (قطزی معزي)ی کە یەکێك بوو لە کۆیلە تایبەتەکانی خۆی، هێندەی نەخایاند مەمالیکی بەحری لە قەلاسەربازیەکانی دورگەی (روضة) بەدەرێ نان، (مەلیك ئەشرەف موسای ئەیوبی)ی شەریکەبەشی سەڵتەنەتی — کە مێردمندالێ بوو — لێخستو بە تەنها خۆی لەم پۆستەدا مایەوە،[1] ئەم هەموو کارانەی ئەنجامیدان ڕواڵەتی بوونو هیچ کاریگەریەکیان لەسەر کەمکردنەوەی ترسناکی (ئۆکتای)و هاوڕێ دەریاییەکانی دانەنا، مێژوونووسان یەکدەنگن لەسەر بەرزبوونەوەی (ئۆکتای) بۆ سەر لوتکەی دەسەلات بە تایبەتی پاش سەرکەوتنی بەسەر شۆڕشی عەرەبەکانی مصردا، لە هەر شوێنێك دەرکەوتبایە دەتگوت شای تاج لەسەرەو ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوانە تایبەتیەکانی دەورەیان دەدا، لە دڵی خۆیدا حیسابی بۆ مەلیکی مصر نەدەکردو لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیدا ناوی (مەلیك معز)ی بە کەمی دەهێنا، ئەگەر باسیشی کردبایە زەمبی دەکردو تەنها بە (ئایبەك) ناوی دەبرد، قسەکانی ئۆکتای بە مەلیك معز دەگەیشتنەوە، بەلام لە ترسی هێزە سەربازیە بەحریەکەی بە ناچاری ڕقی قوت دەدایەوە،[2] سەرچاوەکانی مێژوو زیاتر تیشك دەخەنە سەر ئەو هێزە زۆرەی لەبەر دەستی ئۆکتای دا بووە، (مقريزی) دەڵێ: هەموو خەڵك لەبەر دەرگای (میر فارس الدين ئۆکتای)دا کۆدەبوونەوە، دەستی بەسەر هەموو کاروبارەکاندا گرتبوو، هەر نامەیەك لە لای مەلیك ناصرو خەڵکانی تر بهاتایە جگە لە ئەو کەس نەیدەتوانی هەڵیپچڕێتو ورتەی لێوە نەدەهات، هیچ بڕیارێك لەبەر زۆری سەربازانی بەبێ ئۆکتای دەرنەدەچوو.[3]

(ابن تغري بردي) دەڵێ: ئۆکتای بوو بە خاوەنی دەسەلاتێکی مەزنو ئەستوور، مەمالیکی بەحری دەورەیان لێدابوو، بە خودی خۆی ناوی (مەلیك شاويش)ی لە خۆی نابوو، هاوڕێکانی بە (مەلیك جواد) ناویان دێنا،[4] هەموویان کاریان بۆ ئەوە کرد پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ کیژی (مەلیك مظفر تقي الدين محمود)ی ئەیوبی مەلیکی (حەما) جێبەجێ بکات، بەڵکو هەموویان بە خاتری سازانی کەشو هەوایەکی ساف بۆ پێکهاتن لەسەر داڕشتنی پیلانێك بۆ کوشتنی ئایبەكو لە کۆڵکردنەوەی یەك دەنگ بوون.[5]

---

١ قيام دولة المماليك الأولى ص: ١٣٣.
٢ المصدر نفسه ص: ١٣٣.
٣ الجبهة الاسلامية في مواجهة المخططات الصليبية ص: ٤١٢.
٤ النجوم الزاهرة ٧/١١، ١٠.
٥ قيام دولة المماليك الأولى ص: ١٣٣.

(ذهبي) دەڵێ: ئۆکتای گەورە بوو و بوو بە جێگری مەلیك موعین، ئەو پاڵەوان و ئازاو دلاوا بوو، قەدو قیافەیەکی بەرزو قەشەنگی هەبوو، ئارامگرو بارقۆڵ بوو، بە نرخی هەزار دینار فرۆشرابوو، (ئەسکەندەریە) یەکێك بوو لەو هەرێمانەی ئەو حوکمی تێدا دەگێڕان و بەسەر خۆیدا دابڕیبوو، سەرەڕۆو ستەمکارانە دەورەی سەڵتەنەتی دەداو بە تەنها دەمایەوەو لەسەر کورسی سەڵتەنەت دادەنیشت و ئاوڕی لە (معز) نەدەدایەوە، بە ئارەزووی خۆی لە خەزێنەکانی هەڵدەگرت، بە جۆرێك گوتبووی: قەڵاکەم بۆ چۆڵ بکەن، بوکەکەم – کچی مەلیکی (حماة) – بۆ ئەوێ دەگوازمەوە.[1]

مەلیك معز لە ئۆکتای گەیشت کە بە نیازە لەسەر تەختی حوکمی لابەرێ و لە نێوی ببا، بۆیە بڕیاریدا خۆی لێ دەرباز بکات، مەمالیکەکانی خۆی بۆ ئەو مەبەستە کۆکردەوەو لەگەڵیان ڕێککەوت، بەفێڵ لە دوای (ئۆکتای) نارد کە گوایە بۆ هەندێك کاری گرنگ دەیەوێ ڕاوێژی پێ بکات، بۆسەیەکی لە پۆلە سەربازێکی خۆی لە پشت دەرگای هۆڵی ستونەکانی قەڵا بۆ دانا، پێی گوتن هەرکە گەیشتە دالانی قەڵا بە پەلە خۆی دەگەیەننێ، کاتێك نامەکەی (معز)ی پێ گەیشت، بە خۆو بە چەند کەسێکەوە سوار بوو و بەبێ ئەوەی کەس لە سەرکردە سەربازیەکانی (خەشداش) بزانێ بە دڵنیایی و متمانەی تەواوەوە بەڕێکەوت،[2] بە هێمنی بەرەو قەڵا ڕۆیشت، کاتێك گەیشتە بەر دەرگا پاسەوانان نەیانهێشت نەفەرەکانی گەڵی لەگەڵیدا بچنە ژوورەوە، هەرکە گەیشتە نێو دالان (مەمالیکی معزی) پەلاماریان داو شەربەتی مەرگیان بە گەروودا کرد،[3] ئەمە لە ٢١ی شەعبان و ڕۆژی دووشەممەدا ڕوویدا، (معز) فەرمانی کرد دەرگای قەڵا دابخرێت، هەواڵ بڵاوبۆوە (ئۆکتای) قۆڵبەست کراوە، بۆیە دەست و پێوەندەکانی و مەمالیکەکانی کە ژمارەیان (٧٠٠) سوار دەبوو پۆلێکی بەحریشیان لەگەڵ بوون گەمارۆی قەڵایاندا، کاتێك هەموویان چاوەڕێ بوون و ڕاوەستابوون، لەسەر شورەی قەڵاڕا کەللە سەری (ئۆکتای) یان بەسەردا بەردانەوە، تەماشایەکی یەکتریان کردو لە یەکتر ڕامان و گوتیان: شەڕ لەسەر کێ دەکەن و لەسەر کێ خۆ بە کوشت دەدەن؟! ئیدی بڵاوەکێنەیان لێکرد، کاتێك هەواڵی کوشتنی بڵاوبۆوە، مەمالیکی بەحری بە یەکدەنگ بڕیان دا بەرەو شام کۆچ بکەن، کەسە دیارەکانی ئەو کاتەیان ئەمانە بوون: (رکن الدین بیبرس بندقداری، قلاونی ئەلفی، سنقری أشقر، بیسری، سیکر، برامق)،[4] بەشین و واوەیلا خۆیان

---

١ سیر أعلام النبلاء ٢٣/١٩٧.

٢ خشداشیة: هاوڕێی خزمەتچی.

٣ نزهة الأنام في تأریخ الاسلام ص: ٢٢٠.

٤ المصدر نفسه ص: ٢٢٠.

پێچاپەوە، بە شەو بەرێکەوتن، کە گەیشتنەبەر دەروازەی شار تەماشایان کرد داخراوە، ئاگریان تێبەردا، ئەم دەرگایە کە بە دەرگای (قارطین) بەناوبانگ بوو سوتێنرا، لەو ڕۆژەوە ناوی (باب المحروق- دەرگای سوتاو)ی لێ نرا، ئینجا لەوێڕا بەرەو شام بەرێکەوتن،[1] چوونە لای (مەلیك ناصر) کە بەیان داهات هەواڵ بۆ معز هات کە تایەفەی بەحری هەڵاتوون، فەرمانی دا دەست بەسەر موڵك‌و ماڵ‌و ژن‌و خاوخێزان‌و خزمەتکارەکانیاندا بگیرێت، هەرچی هەیانبوو —لە دارو نەداری دونیایان— زەوت کرا، کەسانێکیان بەجێ مابوون خۆیان حەشاردا، سەروەت‌و سامانی (میر ئۆکتای) ئەوەی جوان‌و ڕەختە بوو هەڵیان گرت، لە بازاڕو جادەو کۆڵانەکاندا های‌و هۆی لە مەمالیکی بەحری دەکرا، ئینجا مەلیك معز چوارمەشقی‌و بە ئارامی لەسەر کورسی سەڵتەنەت پاڵی دایەوە، بەندەری ئەسکەندەریە گەڕایەوە ژێر دەسەڵاتی تایبەتی خۆی، ئەو باج‌و خەراجەی لە لایەن ئۆکتای لەسەریان دانرابوو لەسەری لابردن، میللەت زەوتکردنی سامان‌و بێکاریان لە کۆڵ بۆوە، لە لایەکی ترەوە مەمالیکی بەحری چوونە لای مەلیك ناصر بە سەرو ڕووی خۆشەوە پێشوازی لێکردن، هەر کەسەیان بە گوێرەی خۆی موچەیەکی لە لایەن مەلیك ناصرەوە پێشکەش کرا، ئینجا مەلیك ناصر بڕیاریدا پەلاماری وڵاتی مصر بدات، سوپایەکی سازداو بەحریەکانیشی لەگەڵ کەوتن، بەرێکەوتن تا گەیشتنە لاپاڵی شاخێك‌و لە ئەشکەوتدا جێگیر بوون، هەواڵی هاتنی سوپاکە بە (معز) گەیشت، بە خۆی‌و سوپا سەربازی‌و کۆمەڵێك مەمالیکی (عزیزیە) بۆیان هاتە دەر، لە ناوچەی (باردة)ی نزیك (عباسیة) ڕەشماڵی هەڵدان، ئەو ساڵەی لە ئەوێ بەسەر برد،[2] هەر لەم ساڵەدا (شەریف مرتضی) لە ڕۆم ڕا هات‌و کیژی سوڵتان علاءالدین کەیقوبادی کوڕی خوسرەوی مەلیکی ڕۆمی لەگەڵ هاتبوو، مەلیك ناصر خوازبێنی ئەم کیژەی بۆ خۆی کرد، لە دیمەشق بۆی کرایە بووك‌و گواستیەوە، ئاهەنگێکی گەورەی شایی بەم بۆنەیەوە گێڕدرا.[3]

سەرلەنوێ خەلیفەی عەباسی هاتەوە نێو نێوبژیوانیەوەو (نجم الدین بادرائی) نوێنەری گەیشتەوە لایان‌و پەیمانە ئاشتیەکەی بەم شێوەیە بۆ چاکردنەوە:

- دەبێ (معز ئایبەك) تەواوی ناوچە کەنارەئاوەکانی شام بگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی ئەیوبی.
- نابێ (ناصر یوسف) کەس لە مەمالیکی بەحری پەنا بدا.

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٢٠، دراسات في تأريخ مصر سحر عبدالعزيز ص: ٢٣٩.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٢١.

٣ التحفة المملوكة في الدولة التركية، بيبرس المنصوري ص: ٣٦٠.

**٧ـ کوژرانی (سوڵتان ئایبەك)و (شجرة الدر):**

(ئایبەك) هەستی بەو کەینو بەینو نامەو نامەکاریو ڕێکەوتنانە کرد کە لە نێوان (شجرة الدر)ی هاوسەریو مەمالیکی بەحری (کەرەك) ئەنجام دەدرێن: لەبەر ئەمە بڕیاری دا ژنی بەسەر بێنێ، ئەمەو لە ساڵی ١٢٥٦ز نامەیەکی بۆ (بدر الدین لؤلؤ)ی ئەتابەکی (موصل) نارد، داوای ئەنجامدانی پەیماننامەیەکی هاوسەرگیری لێ کردبوو، جگە لەو هەواڵەی کە لە لایەن مێژوونووسو سەرچاوەکانەوە دەستاودەستی پێکراوە، کەس نەیزانیوە بە چ شێوەیەك خوازبێنی کیژەکەی (بدرالدین) لە لایەن (ئایبەك)ەوە کراوە، ناچێتە ئەقڵەوە ئەم خوازبێنیە لە بازنەی حەز بە ژنهێنان کورت هەڵاتبێت، بەڵکو مەبەستی (ئایبەك) لەمە بەستنی پەیمانێکی ستراتیژی بووە، حەزی لێ بووە لە ڕێی حوکمڕانی (موصل)ەوە لە جموجۆڵی هێرشەکانی مەغۆل ئاگاد بکرێتەوە، هەرچۆنێك بێت ئەم هەوڵانەی (ئایبەك) بوونە سەرەتای کۆتایی هاتنی سەردەمەکەی، چونکە کاتێك (شجرة الدر) زانی (ئایبەك)ی مێردی پیلانی لە دژ ڕێك دەخا، ئەویش چووە گۆڕەپانەوەو بوو بە سەرکردەی هێزە ڕکەبەرەکانی نێوخۆو دەرەوەی سەڵتەنەتەکەی، ژمارەیەك لە خەڵکانی تایەفەی بەحری کە لە مصردا مابوونەوە دژایەتی خۆیان بۆ پرۆسەی هاوسەرگیریەکە ڕاگەیاند، (ئایبەك) خەڵکێکی زۆری لێ دەستگیرکردن لە نێوانیاندا: (ئەیدکین ی صالحی) بەدی دەکرا، بە مەبەستی زیندانی کردنیان لە چاڵێکی قوڵدا بەرەو قەڵای (الجبل)ی بەڕێکردن، کاتێك گەشتنە ڕاست پەنجەرەکەی کۆشکی سوڵتان — کە (شجرة الدر)ی تێدا نیشتەجێ بوو — (میر ئەیدکین) وەکو ڕێزێك دەستی بە سنگەوەناو سەری دانەواندو بە تورکی گوتی: (ئەی خانمی گەورەو بەڕێز: قەسەم بە خوا گوناهێکمان نەکردووە موستەحەقی ئەمە بین، تەنها ئەوە نەبێ ئێمە لەسەر تۆ سوکایەتیمان پێ دەکرێت، چونکە دژی ئەوە وەستاوین کچی حوکمڕانی مصر بەسەر تۆ بێ، ئێمە دەست پەروەردەی ماڵە خانەوادەکەی بەڕێزتانو شەهیدی مەرحوم (صالح ایوب)ین، هەر کە لۆمەمان کرد لێمان هەڵگەڕایەوە، وەکو بۆ خۆت دەبینی چی بەسەر هێناوین، ئەویش بە دەسرۆکەی دەستی ئاماژەی دایە کە (گوێم لە قسەکەت بوو)، کاتێك دایانبەزاندنە نێو چاڵەکەوە، میر ئەیدکین گوتی: (ئەو ئێمەی زیندانی کرد، بەڵام ئێمە ئەومان کوشت)[1] بەو واتایەی (شجرة الدر) پیلانی لە دژ دەگێڕێتو سزای پڕاوپڕی لێ دەستێنێت، ئێستا کە ئایبەك ئەوانی گرتووە تەنها لەبەر ئەوە نەبووە دژایەتی

---

١ السلوك ١/٤٠١ـ٤٠٢.

هاوسەرگیریەکەی ئەویان کربێت، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە ئایبەك بە پیلانەکەی ئەوانی زانیبوو، بۆیە ویستی بە لێکهەڵاواردنی میرانی مەمالیکی بەحری لە (شجرة الدر)ی سەرۆکیان کۆتایی بەم بزوتنەوە ڕکەبەرە بێنێ.

بەڵام (شجرة الدر) تەگبیرێکی وای کرد کە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات، یەکێك لە مەمالیکی عزیزیە بە دیاریەكو نامەیەکەوە بۆ لای مەلیك ناصر ئەیوبی دەنێرێت، پێی دەڵێت کە ئەو بە نیازە ئایبەك بکوژێتو شوو بە ئەو بکاتو کورسی دەسەڵاتی مصریشی تەسلیم دەکات، بەڵام مەلیك ناصر لە ترسی ئەوەی نەبادا فێڵ بێت وەڵامی نەدایەوە، (بدرالدین لۆلۆ) هەواڵی ئەم کەینو بەینە نهێنەی پێدەگات، ئەویش هەواڵەکە بۆ ئایبەك دەنێرێتو ئامۆژگاری دەکاتو پێی دەڵێ وریای خۆت بە، ئایبەك لە ترسی ژیانو گیانی قەڵای بەجێ هێشتو لە (مناظر اللوتي) جێگیر بوو، بڕیاریدا پێش ئەوەی (شجرة الدر)ی هاوسەری بیکوژێت، ئەو ئەو بکوژێت، ئەمەو پاش دەستگیرکرانی مەمالیکی بەحری لە قاهیرە، هەردوك هاوسەر پێشبڕکەی داڕشتنی نەخشەو پیلانیان لە دژی یەکتر دەکرد، پێشبڕکەکە بە سەرکەوتنی ژن بەسەر مێرددا کۆتایی هات، ئەمەو (شجرة الدر) نامەیەکی ناسکی بۆ ئایبەك ناردو بە قسەی خۆش داوای لێ کردبوو لە قەڵادا سەردانی بکا، ئەویش بە قسەی کردو بەرەو قەڵا سەرکەوتو چووە نێو کۆشکی سوڵتانیەوە، (شجرة الدر) پێنج خزمەتکاری بەهێزی بۆ کوشتنی ئامادە کردبوون، لەنێویاندا (محسن الجوجري و نصر العزیزي و سنجر) بەدی دەکران، (سنجر) یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی تۆکتای،[1] ئەم گەنجانە بە پێی نەخشەی داڕێژراو لە ساڵی ٦٥٥ك/ ئەپریلی ١٢٥٧ز لەنێو حەمامدا کوشتیان.[2]

(ذهبي) دەڵێ: سوڵتان (معز) پیاوێکی دیندارو ژیرو بەخشندە بوو، مەیخۆر نەبوو.[3]

(شجرة الدر) هەوڵی دا ڕووداوی کوشتنەکە شوێنە ون بکات، فەرمانی دا پۆشاکێکی شیاو بەبەر تەرمەکەدا بکەنو لەسەر ڕایەخەکەی پاڵیخەنو ڕایگەیەنن کە لە کاتی ڕمبازێندا لەسەر وڵاخەکەی گلاوەو چەند شوێنێکی جەستەی کاریان تێکراوەو وەفاتی کردووە، بە پەلە هەواڵی وەفاتی سوڵتان بڵاو بۆوە، میرانی مەمالیك پۆل پۆل دەهاتنە نێو کۆشکەوە، (شجرة الدر) لێکدا لێکدا هەواڵی بەربوونەوەکەی لەسەر وڵاخەکەی دەگێڕایەوە، بەڵام بەوپەڕی شكو گومانەوە گوێیان بۆ شل کردبوو، چونکە ئایبەك لە زۆر جەنگدا بەشداری کردبوو و ئەسپ

---

١ قيام دولة المماليك الأولى للعباديص: ١٣٩.
٢ المصدر نفسه ص: ١٣٩.
٣ سير أعلام النبلاء ١٩٨/٢٣.

سوارێکی باشیش بوو قەتیش لەسەر وڵاخ بەر نەبێووە، بەڵام ئەو هەموو جارێك حیکایەتە ناڕاستەکەی دووپات دەکردەوە،[1] میرانی مەمالیك ڕووبەڕووی (شجرة الدر) بوونەوەو گەمارۆیاندا، ناچار دانی بە کوشتنەکەدا هێناو گوتی ویستوویەتی تۆڵەی خۆی لێ بسێنێ، بەڵام ئەو ئەمەی بە خەیاڵدا نەهاتووە کە ئەم تۆڵە سەر بۆ کوشتن دەکێشێ.

ئینجا میرانی مەمالیك لەنێو خۆیاندا سەبارەت بەوە لەمەولا چی بکەن دەستیان بە ڕاوێژ کرد، سەرەتای کاریان قسەیان لەسەر (شجرة الدر) کرد، گوتیان کە ئەوان بە چاوی سوڵتانەو مەلیکە تەماشایان کردووەو ڕەفتاریان لە بەرامبەردا نواندووە، لە ژێر چاودێری پاسەوانی خۆیانداو لە کاتە هەرە سەختەکاندا بە دەورەیدا خولاونەوە، یارمەتیاندا تا ببێتە هاوسەری سوڵتان ئایبەك، کاتێکیش شووی پێکرد ئەوان پیرۆزباییان لێکردووە، باشە ئێستا ئەو چۆن ئەم کارە قێزەونەی ئەنجام داوە،؟ سەبارەت بەم تاوانبار کردنە بوونە دوو بەرە، هەندێك میر بوونە لایەنگری (شجرة الدر)و هەموو ئەم زوڵمو زۆرو دڵڕەقیو ناهەقیانەیان گێڕایەوە کە ئایبەك ئەنجامی دابوون ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە بوونی (شجرة الدر) وەکو ڕەمزی شەرعیەت بە شتێکی زەرووری دادەنرێت، چونکە ئەو بێوەژنی (نجم الدين ايوب)ەو دایکی (خليل)ی کوڕیەتی، دەستی بەسەر (مصر)و خودی مەمالیك ڕادەگاتو هەموو لایەك گوێڕایەڵو فەرمانبەرداریەتی، بەرەکەی تریش پێیان وابوو: (شجرة الدر) تاوانێکی گەورەو تۆقێنەرو ترسناکی ئەنجامداوە، خەریك بوو مشتومڕ سەر بۆ شەڕی نێوان هەردوو بەرە بکێشێ، بەڵام کۆتایی کۆبوونەوەکە بە سەرکەوتنی بەرەی دوژمنانی (شجرة الدر) بە ئەنجام گەیشت، ئەویش لە یەکێك لە بورجەکانی قەڵادا زیندانی کرا، ئینجا بانگی (عەلی کوڕی عزالدین ئایبەکیان) کردو لە جێی باوکی لەسەر تەختی سەڵتەنەتی مصریان دانا.

مێژوونووسێك باس دەکا: (شجرة الدر) چۆن لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی سامناکی شەوەزەنگەکاندا ئازاو بەهێز بوو ئاوەهاش لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگدا ئازاو بەهێز بوو، هەر کە زانی مەرگی نزیك بۆتەوە بە پەلە بەرەو لای خەزێنەکەی ڕۆیشتو هەرچی خشڵو زێڕو زەبەری هەبوو بە نیێتی ئەوە هەوێیەکەی – کە دەکاتە ژنی یەکەمی سوڵتانو دایکی عەلی – لە دوای ئەو بەخۆیدا نەکاتو خۆی پێوە بانەدات، هات وردوخاشی کرد، ئەم ڕیوایەتە گومانایە، چونکە کە (شجرة الدر) لە بورجی قەڵادا بەند بووبێ چۆن بەو خێراییە

---

١ شجرة الدر قاهرة الملوك ومنقذة ص: ٨٥.

توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە خەزێنەکەی و خشڵەکەی دەربهێنێ و ئینجا بە کەیفی خۆی بیهاڕێ و نەهێڵێ بە میرات بۆ داکی عەلی بەجێ بمێنێ؟ - وەکو ئەو مێژوونووسە دەڵێ.[١]

بارودۆخی دەرەوەی کۆشك ئارام بۆوەو هەموو لایەك — پاش دابەش بوونیان بۆ دوو بەرە، یەك لایەنگری (شجرة الدر)و ئەوی تریش دژی بوو — یەکیان گرتەوەو ڕەزامەندی خۆیان لەسەر سوڵتانی تازە دەربڕی، خێرا میرانی مەمالیك تارمایی ئەو فیتنەیەیان ڕەواندەوە کە هەڕەشەی لێ دەکردن و ئاڵۆزی و گرژیەکانی نێو قاهیرە کۆتاییان پێ هێنرا، (شجرة الدر) بەرەو کۆشکی سوڵتانی نوێ و بۆ لای هەوێیەکەی ڕەپێچەك درا، هەوێیەکەی یەکەمین ژنی سوڵتان و دایکی (عەلی)ی سوڵتانی نوێ، زۆر دڵخۆش بوو، لەو کاتەوە (شجرة الدر)ی بەسەر هاتبوو (سوڵتان ئایبەك)) ئەوو عەلی بەدەر نابوو و وازی لێ هێنابوو، حەوت ساڵە چاوەڕێی ئەم ڕۆژە دەکات، ڕۆژی تۆڵە سەندنەوە، فەرمانی بە کارەکەرەکانی کۆشك کرد پەلاماری (شجرة الدر) بدەن ئەوانیش بەر لینگە لەعلەی لە تەختە دروستکراویان داو کوشتیان،[٢] (مقریزی) دەڵێ: قەرەواشەکان هێندەیان لەعلە پێ کێشان گیانی دەرچوو، لە شورەی قەلاوە هەڵیان دایە نێو چاڵێکەوە، جگە لە کراس و دەرپێیەك هیچی تری لەبەر نەبوو، ماوەی چەند ڕۆژێك لەوێدا مایەوە، خەڵکانی خوێڕی و بەڕەلا بەنە خوێنەکەیان ڕادەکێشا، ئینجا پاش بۆگەنبوونی بە خاکەناز بە خاکوخۆڵەوە هەڵیان گرت و ناشتیان.[٣]

(ذهبي) دەڵێ: بە خاك و خۆڵەوە لە نزیك گۆڕی (سەییدە نەفیسە) نێژرا، دەشڵێن: ماڵێکی زۆروزەوەندی لە پاش خۆی بەجێ هێشت و مرد، ژیاننامەیەکی چاك و پاکی هەیە، بە هۆکاری (غیرە) لەنێو چوو.[٤]

(ابن العماد) دەڵێ: زۆر شۆخ و شەنگ بوو، زیرەك و ژیرو فێڵزان بوو... بە بەرزترین پلەی کامەرانی گەیشت، بە جۆرێك وتاری لەسەر مینبەرەکانەوە بۆ خوێنرانەوە، ماوەی چەند ڕۆژێك کردیانە سوڵتانی خۆیان، پاشان مەلیك معز بووە سوڵتان و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، نەك بوو بە هاوسەری بەڵکو ئەو حوکمی بەسەر معزدا دەکرد، تورکیەکی خاوەن شەهامەت و ئازایەتی و جورئەت بوو، کار بەوە گەیشت بە کوشتن سەری نایەوە،[٥] بەلام هەوێیەکەی —

---

١ شجرة الدر قاهرة الملوك ومنقذة ص: ٨٧.
٢ سير أعلام النبلاء ٢٣/١٩٩.
٣ السلوك ١/٤٩٤.
٤ سير أعلام النبلاء ٢٣/٢٠٠.
٥ شذرات الذهب ٧/٤٦٤.

واتە دایکی سوڵتانی تازە — نەزری کردبوو ئەگەر هەوێیەکەی لە کۆڵ بێتەوە ئەوا لە هەمان ڕۆژدا حەلوایەك دروست دەکاتو هەموو دانیشتوانیقاهیرەی بۆ داوەت دەکات، فەرمانی بە ئاشپەزانی کۆشك کرد وەجبە حەلواکە دروست بکەن، بەڵام لەو ڕۆژەدا تەواو نەدەبوو، بۆیە خێرا چێشتێکی سادەیان هێنا لەگەڵ نانێکی زۆری سوورەوە بوو کە بە کەرەو هەنگوین چەور کرابوو و لەسەر ئەویشەوە پارچەیەکی ئەستووری گوجمەی مێوژو چوالەو (صنوبر)ی لەسەر دانرابوو، وێڕای ئەمەش وەجبەیەکی حەلوای شیرینو بە لەزەت پێشکەش دەکرا، لە شێوەی ئەو جۆرە شیرینیانەی لە چێشتخانەکانی ئیمڕۆدا ئامادە دەکرێن —ئەم شیرینیە— ناوی لێ نرا شیرینی یان حەلوای (دایکی عەلی)ی ئەو کەسەی بۆ یەکەم جار دروستی کرد.[1]

**٨ـ سەڵتەنەتی (عەلی کوڕی معز)، پاش ئەویش سەڵتەنەتی (سیف الدین قطز):**

میرانی مەمالیکی معزی لە سەروی هەمووشیانەوە (سیف الدین قطز) ڕژدبوون لەسەر دانانی (نور الدین علی)ی کوڕی (معز ئایبەك)ی تەمەن (١٥) ساڵە لەسەر کورسیە بەجێماو و چۆڵەکەی باوکی، لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز لەسەر تەختی سەڵتەنەتیان داناو ناویان نا (مەلیك منصور علی)، مەمالیك ــ وەکانی تر — دانیان بە سولتانی منداڵکاردا نەهێنا، لە ژمارەیەك خۆپیشاندانو پێکداداني توندا نارەزایی خۆیان بەرجەستە کرد، چەند تاقمێکی ڕکەبەر هانایان بۆ مەلیکەکانی ئەیوبی وڵاتی شام برد، (مغیث عمر)ی مەلیکی کەڕك — ئەردەنی ئێستا — دووجار هەوڵیدا مصر داگیر بکات، بەڵام هەردووجار بە تێکشکاوی گەڕایەوە،[2] بەڵام ئەم گرژیو ئاڵۆزیانە هەلێکی تازەبوون ئەستێرەی (میر سیف الدین قطز)ی تێدا هەڵبێ، (ئەتابەك سنجری حەلەبی) لە لایەن (قطز)ەوە قۆڵبەست کراو لە زیندانی (جب)ی قەڵای چیا (جبل) زیندانی کرا، چونکە دوابەدوای کوژرانی (معز ئایبەك) تەماعی لە گرتنی کورسیەکەی کردبوو بەردەوامیش خۆی لە بۆسە مەڵاس دابوو دەرفەت وەربگرێتو دەست بەسەر سەڵتەنەتدا بگرێت، بەمە ئاڵۆزیو پشێویەکان زیاتر بوون، ژمارەیەك لە مەمالیکی بەحری بەرەو شام هەڵاتن، مەمالیکی موعیززی ڕێیان کەوتنو ژمارەیەکیان لێ گرتنو لە زیندانەکانی قەڵادا قایمیان کردن، بارودۆخەکە بە بەرژەوەندی (قطز) شکایەوەو بوو بە جێگری سوڵتانو تەگبیرکەرو گەورە ڕاوێژکاری سەڵتەنەتەکەی (مەلیك منصور علی).[3]

---

١ شجرة الدر قاهرة الملوك ومنقذة ص: ٨٧.

٢ السلطان مظفر سيف الدين قطز ص: ٨٠.

٣ المصدر نفسه ص: ٨١، السلوك ١/٤٠٥.

ئەوانەی ئەو مێردمنداڵەیان لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشاندو کردیان بە سوڵتان، تەنها لەبەر ئەوە بوو سوود لە کات وەربگرن‌و پاشان یەکێك لە میرانی مەمالیك — ئەوانەی چاویان بڕیوەتە کورسی سەڵتەنەت — ململانێیەکە بەباری بەرژەوەندی خۆیدا بخات، ئەم شانۆیە زۆرجار لە سەردەمی سوڵتانەکانی مەمالیکدا دووبارەبوونەتەوە، زێدەڕۆیی ناکەین لەوەدا کە بڵێین ئەمە بە درێژایی ئەو سەردەمە سیاسەتێکی باو بووەو هەموو لایەکیش دانیان پێدا هێناوە، گرنگ ئەوەیە ئاماژە بەوە بکەین کە مەمالیك باوەڕیان بە سیستەمی میراتگری سەڵتەنەت نەبووە، بەڵکو ئەوان لە لایەکەوە سەربازی بوون‌و خاوەنی تەبیانی عەسکەتاری بوون، لە لایەکی تریشەوە میرە گەورەکانیان پێیان وابوو هەر هەموویان یەکسانن‌و شایانن بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەو کورسیە کە هەرە بەهێزەکەیان دەتوانێ تەواوی مونافیسەکانی بڕەتێنێ‌و پاشان بۆ خۆی بەپێی (الحکم لمن غلب= حوکم بۆ ئەو کەسەیە زاڵە) بچێتە سەری، کەواتە شتێکی ئاسایی‌و سروشتی بوو کە بەردەوام میرانی مەمالیك لەسەر کورسی سەڵتەنەت لە کێشەو کێبەرکێدا بووبن، بە تایبەتیش لەو کاتانەدا کە کورسی دەسەڵات بە هۆی مردنی سوڵتان چۆل دەبوو، حاڵ‌و وەزعی دوای مەرگی (معز ئایبەك) بەم شێوەیە بوو: (سیف الدین قطز) بە پەلەو پێش ئەوەی خۆی باوێتە ناو گۆڕەپانی کێبەڕکێکەرانەوە بە فیعلی جڵەوی سەڵتەنەتی بە دەستەوە گرت‌و ناو و ناسناو و دروشمەکانی سەڵتەنەتی بۆ مێردمنداڵ بەجێ هێشتن، زیاتر لە نێوانی ئەوو کورسی دەسەڵات هەر بە قەد نێوانی دوو کەوانی یان کەمتری مابوو، بەرەبەرە دەرفەتی زیاتری دەقۆستەوەو بە خاتری گەیشن بە بەرژەوەندیەکانی خۆی دەستی بە ڕێکوپێك کردن‌و ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی نێو خۆ کربوو،[1] لەم کاتەدا پڕوپاگەندە ئاسمانی قاهیرەی داگرتبوو کە گوایە سوڵتانی منداڵ دەیەوێ (قطز)ی کۆیلەی باوکی‌و خاوەنی دەستی سپی لە جێگیرکردنی کورسی دەسەڵاتی وڵات لەسەر پۆستەکەی دابگرێت، میرەکان لە کاڵی گەورە یەکیان کۆبوونەوە، دەستیان بە وتووێژ کرد ئەوە نێوانی (مەلیك منصور علی)و (میر قطز)یان خۆش کردەوەو، بەم شێوەیە (قطز) چاکتر لە جاران دەست‌و لاقی خۆی لە کۆشکی سەڵتەنەتدا گیرکردن،[2] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا بارودۆخ زۆر شڵەژاو و نائاسایی بوو، لە لایەکەوە بە هۆی هەڵایساندنی ئاگری فیتنەو ئاژاوە لە لایەن تیرەو تایەفە جۆراوجۆرەکانی مەمالیکەکانی نێو خۆوە، لە لایەکی تریشەوە

---

١ المصدر نفسه ص: ٨١.

٢ النجوم الزاهرة ٧/٤٣.

بە هۆکاری مەترسیەکانی دەرەوە کە لە لایەن (مغیث عمر)ی میری (کەرك)ی هاوپەیمانی مەمالیکی بەحریەوە، بە توندی هەڕەشەیان لە وڵات دەکرد، دووجار هێرشی سەربازی کرد بەڵام تێکشکایەوە، یەکەمیان لە مانگی نێوجەژنانی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز و دووەمیان لە مانگی مەولودی ٦٥٦ك/١٢٥٨ دا ئەنجام دران، هەردووك جار (سیف الدین قطز) بە خۆیو بە سوپاکەیەوە بەرەنگاری ئەم هێرشانەی مەمالیکی بەحریو هاوپەیمانە ئەیوبیەکان بووەوەو توانی تێکیان بشکێنێتو بەسەر ئەم مەترسیەشدا زاڵ بێت، ئەمەو پاش نەمانی مەترسی دەرەکی دەبوایە دەستی بە ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی نێوخۆ کردبایە، لە هەمان کاتدا ژمارەیەك میری بە هۆی لایەنگیریان لە (مەلیك مغیث عمر) قۆڵبەستکردن، کە ئەمانە بوون: (میر عزالدین ئایبەکی ڕۆمی صالحی)، میر (سیف الدین بلباسی کافوری صالحی ئەشرەفی)، میر (بدارالدین بکتوتی ئەشرەفی)، میر (بدرالدین بلغانی ئەشرەفی) و چەند میرێکی تریش)، لە ٢٦ی مەولود دا لە گەردنی دانو هەموو موڵكوماڵو سامانیشی لێ زەوت کردن،[1] بەم جۆرە بەژنو باڵای سیاسی (سیف الدین قطز) بەرز بۆوە، بەڵام ئەو دەوڵەتەی سوڵتانە بچکۆلەکە حوکمی دەگێڕا زەردو زەبوونو لاواز بوو، ئەو هەموو پیلانانەی لە دژی دەگێڕدران بە منداڵێکی ئاوا – کە وەك دەستگەمەی منداڵان یاری بە چارەنووسی وڵاتو میللەت دەکرد – هەڵنەدەوەشێنرانەوە، ئینجا تەپڵی جەنگ لە لایەن تەتارەکانەوە لەسەر سنووری دەوڵەتی تازە لە دایك بوو و پێگرتوو لێدرا، لە تواناو تاقەتی سوڵتانی (نور الدین علی)ی مێردمنداڵ دا نەبوو لە بەرامبەر ئەم پەلامارە ترسناكو بەسامە هیچی پێ بکرێت، ئەو لەنێو قەڵادا کاتی خۆی بە سواربوونی جاشکە کەرو خۆ ڕازاندنەوەو کۆتربازی لەگەڵ نۆکەرەکاندا سەرف دەکرد،[2] هەر هەواڵێکی تازە سەبارەت بە ڕەفتاری دڕندانەی تەتارەکان دەگەیشتە مصر، بارودۆخ زیاتر دەشڵەژاو دڵەڕاوکە دەروونی خەڵکی ڕاو دەکرد،[3] میر (سیف الدین قطز)ی جێگری پۆستی سەڵتەنەت بڕیاری دا دوا هەنگاوی خۆی بەرەو سەر کورسی دەسەڵات بهاوێو لە لایەکی تریشەوە سیاسەتی نێوخۆی بە دروست کردنی پشتیوانانی تازە پشت ئەستور بکاتو لە لایەنی سێهەمیشەوە خۆیو سوپاکەی بۆ بەرپەرچدانەوەی تەتارەکان ئامادەباش بکات.[4]

---

١ السلوك ١/٤١١، السلطان مظفر سیف الدین قطز ص: ٨٣.

٢ السلطان مظفر سیف الدین قطز ص: ٨٣.

٣ المصدر نفسه ص: ٨٣.

٤ نفس المصدر السابق ص: ٨٤.

لەگەڵ نزیك بوونەوەی ڕەشە سوپای (تەتار) لە شام، (مەلیك ناصر) (کمال کوڕی عدیم)ی شەرعزان و مێژوونووسی بە نوێنەر ناردە مصرو هانای بە هاوارەوە چوونی سوپای مصری کردبوو، بەم شێوەیە دەنگوباسی جەنگو هەرا هێندەی تر پەردەی ترس و شەوەزەنگی خۆی بەسەر دەموچاوی بارودۆخی سیاسی مصردا کێشا، ئەستێرەی هەڵاتووی ئاسمانی ئەم بارودۆخە تاریکەی گۆڕەپانی سیاسی مصر میر (سیف الدین قطز) بوو، هەرکە (ابن العدیم) گەیشتە قاهیرە کۆبوونەوەیەك لە قەڵادا بە ئامادەبوونی (مەلیك منصور علی) و میر (سیف الدین قطز) ڕێکخرا، لەم کۆبوونەوەیەدا گەورە ڕاوێژکاران و شەرعزانان و قازیانی وەك: قازی قوزات: (بدرالدین حسن سنجاری)و شێخ (عزالدین کوڕی عبدالسلام) ئامادەبوون، ئامادەبووان سەبارەت بە وەرگرتنی پارەو ماڵ لە خەڵکی و سەرفکردنی لە سوپا پرسیاریان کرد، (شێخ عز الدین) فتوا بەناوبانگەکەیدا – کە بە ئیزنی خودا لە باسی جەنگی (عین جالوت)دا بە درێژی باسی لێوە دەکرێت، (سیف الدین قطز) توانی ئەم کۆبوونەوەیە حەکیمانە وەکو پەیژەیەکی سیاسی بەکاربێنێت و بەوێدا خۆی بگەیەنێتە دوا ئامانجی و سەرکەوێتە سەر کورسی دەسەڵاتی مصرو بەرەنگاری تەتار ببێتەوە، ئەم کۆبوونەوەیە کە بە ئامادەبوونی سوڵتانی مێردمنداڵ بەڕێوە چوو دواهەمین هەنگاوی (قطز) بوو بۆ گەیشتن بە کورسی سەڵتەنەتی مصر و بەرەنگاربوونەوەی تەتار.[١]

لە کاتێکدا (هۆلاکۆ) هێرشی دەکردە سەر هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامی و داگیری دەکردن، لە بەرامبەردا ئەستێرەی (سیف الدین قطز) زیاتر دەدرەوشایەوەو قەدو قیافەی سیاسی کەڵەگەتتر دەبوو، هەر دەتگوت لەگەڵ مێژوودا مەوعیدی هەیەو بە تەمایە کارە گرنگە مێژووییەکەی پێی سپێردراوە – کە لە تێکشکاندنی ڕەشەسوپای ستەمکاری تەتاردا خۆی دەبینیەوە – هاتووەو دەیەوێ ڕایپەڕێنێ، ئەو کۆبوونەوەکەی قەڵای قۆستەوەو بۆ لێخستنی سوڵتانی منداڵی بەکارهێنا، دەستی بە قسەکردو باسی خراپەکانی (مەلیك منصور)ی هێنایەگۆڕێ و گوتی: مەلیکی منداڵ بچووکەو نازانێ کاروباری سەڵتەنەت هەڵسوڕێنێ، پێویستە سوڵتانێکی ئازاو زاڵ هەبێ و بەگژ ئەو دوژمنەدا بچێتەوە،[٢] خودی کارە خراپەکانی (مەلیك منصور علی) کە خۆیان لە گاڵتەو گەمەی زۆرو دەستێوەردانی دایکی لە حکومەتداو تەکینەوەی خەڵك لە دەورەی و شڵەژانی بارودۆخدا نیشان دەدا

---

١ المصدر نفسه ص: ٨٨.

٢ المصدر نفسه ص: ٨٩، النجوم الزاهرة ٧/٥٥.

یارمەتی (سیف الدین قطز)یان دا بە ئاسانی بە ئامانجی خۆی بگات، ڕۆژێكیان میرانی مەمالیكی موعیززیو بەحری كە لە نێویاندا (سیف الدین بەهادور و علم الدین سنجر غەتمی) دەبینران، بۆ ڕاووشكار دەچنە ناوچەی (عباسیەی شرقیە)و (غەززە)، (قطز) ئەم هەلەی وەرگرتو لە ڕۆژی شەممە ٢٤ی نێوجەژنانی ٦٥٧ك/١٢٥٩ز یدا (مەلیك منصور علی)و (قاقان)ی برای مەلیكو دایكیانی قۆڵبەست كردنو لە یەكێك لە بورجەكانی قەڵادا زیندانی كردن، ماوەی حكومڕانی منصور (٢)ساڵو (٨) مانگو (٣) ڕۆژی خایاند.[١]

بەم شێوەیە (قطز)ی كۆیلە گەشتەكەی خۆی تەواو كردو گەیشتە كۆتا مەنزڵیو لە هەمان ڕۆژدا لەسەر كورسی سەڵتەنەت ڕۆنیشت، هەر هەموو ئامادەبووان بە حوكمی ئەوە (قطز) تاكو ئێستا گەورەی نێو ماڵی مەلیكو جێگری خودی مەلیك بووەو سەرۆكی سوپای مصریشەو بە سوارچاكیو ئازایەتیش ناوی دەركردووە پێی قایل بوون، میرەگەورەكانو خەشداشییە لەسەر كورسی حكومەتی مصریان دانیشاندو ناسناوی (مظفر)یان پێوە لكاند.[٢]

**٩ـ (سیف الدین قطز)و ڕێكخستنەوەی كاروبارەكانی نێوخۆی وڵات:**

(قطز) بە گەیشتنی بۆ سەر كورسی حوكم گەشتەكەی تەواو نەبوو، بەڵكو لەسەر سوڵتانی تازە پێویست بوو بنەماكانی حكومەتەكەی زیاتر بەنێو خاكی مصردا بەرێتە خوارەوەو دامەزراو و پتەوتریان بكات، ئینجا بەرەورووی دوژمنی دەرەكی ببێتەوە، پێشدا (كوڕی كچی ئەعەزز)ی وەزیری لابردو (زین الدین یعقوب عبدالرفیع كوڕی یزید كوڕی زوبێر)ی لە جێگا دانایەوە، ئینجا دەبوایە بەرەورووی ئەو میرە گەورانەی مەمالیك ببوایەوەكە لە بەرامبەر قەڵای (جبل)دا ناڕەزایی خۆیان سەبارەت بە دەستگیركردنی (مەلیك منصور علی)و زەوتكردنی كورسی دەسەڵات لە لایەن (قطز)ەوە دەربڕیبوو، بەڵام (قطز) لێیان ترساو بە بەڵگەی جموجۆڵی تەتار بەرەو مصرو شام عوزری بۆ هێنانەوەو داوای لێبوردنی لێ كردن،[٣] سەبارەت بەوەی ڕوویدا گوتی:

من هیچ نیازێكم نەبووە جگە لەوە هەموومان بۆ جەنگی چاوەڕوانكراوی تەتار كۆ ببینەوە، ئەمەش بە دەسەڵاتدار نەبێ ناكرێت، كاتێك بۆیان چووینە دەرەوەو تێكمان شكاندنو گەڕاینەوە با ئەو كاتە كاروبار بە دەست ئێوە بێت، حەزتان لە كێیە لەسەر

---

١ السلوك ١/٤١٧، النجوم ٧/٥٥.

٢ السلطان مظفر سیف الدین قطز ص: ٩٠.

٣ السلوك ١/٤١٧، ٤١٨، السلطان مظفر سیف الدین قطز ص: ٩٢.

کورسی سەڵتەنەتی دانیشێنن،[1] بەردەوام خەریکی ڕازیکردنیان بوو تاوەکو ئەوەی (مقریزی) دەڵێ: جێ پێی خۆی قایم کرد، هەر کە هەستی کرد دەسەڵاتەکەی دامەزراوە هەستا بە خۆقوتارکردن لە هەموو ئەوانەی هەڕەشە لە کورسیەکەی ژێری دەکەن، (منصور علی و براکەی و دایکی) بۆ (دمیاط) بەڕێکردن و لە بورجی (سلسلة)دا کە خۆی دروستی کردبوو بەندی کردن، پاش ئەمە هەموویانی بۆ قوستەنتینیە دوورخستەوە، دوایە ئەم میرانەشی قۆڵبەست کردن: (علم الدین سنجر غەتمی و عزالدین ئەیدەمری نەجیبی بچووك، شرف الدین قەیرانی موعیززی، سیف الدین بەهادور، شمس الدین قراسنقر، عزالدین ئایبەکی نەجمی بچووك، سیف الدین دودی خاڵی منصور، طواش شبل الدولە کافور لالای مەلیك منصور، حسام الدین بلالی ی مغیثی جمدار)، هەموو ئەوانەی بەندکردن و بەمە خۆی لە دەستی ترسناکی سەرانی هێزی موعارەزە دەرباز کرد، لە لایەکی تریشەوە (سوڵتان مظفر قطن دەستی بە دیاریکردنی وەزیران و ڕاوێژکارانی دەوڵەتەکەی کردو پایەی سەڵتەنەتەکەی قایم کردن، تەواوی میرەکانی و سەرسوپاکانی سوێندیان بۆ خوارد گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری بن، (صاحب زین الدین یعقوب کوڕی رفیع)ی کردە وەزیر، (میر فارس الدین ئۆکتای بچووکی صالحی)ی ناسراو بە (موستەعرەب)ی بە (ئەتابەك) دامەزراندو هەڵسوڕاندن و مشورخواردنی سوپاو کاروباری سەربازان و جەنگ و جیهادو ئامادەباشیەکانی سوپای بۆ بەرپەرچدانەوەی تەتار بە (ئۆکتای)و (زین الدین) سپارد، (سیف الدین قطن) ئاسایشی بارودۆخی نێوخۆی وڵاتی مصری ڕادەیەکی باش مسۆگەر کرد، بەڵام ترسی زۆری لە بەرامبەر مەلیکەکانی ئەیوبی بە تایبەتی (مەلیك ناصر یوسف صلاح الدین)ی حوکمڕانی دیمەشق هەبوو، ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە لەو سەردەمەدا زیادی کرد کە (قطن) بە هەواڵی گەیشتنی هێزێکی فریادڕەسی هۆلاکۆی زانی بۆ لای (مەلیك ناصر) لە دیمەشق، لە پاشەڕۆژی ئەمە ترسا، لەبەر ئەمە نامەیەکی نەرم و ناسکی بۆ ناردو تێیدا هەوڵیدابوو خۆ لە ڕووبەڕووبوونەوە بپارێزێت و سوێندی بۆ خواردبوو کە ئەو بە هیچ کلۆجێك کێشەی مەلیکایەتی لەگەڵ مەلیك ناصر ناکات و لە بەرامبەریدا ڕاناوەستێ، بۆی دووپات کردبۆوە کە ئەو تەنها جێگر یان نوێنەرێکی ئەوە لە مصر و هەر کاتێك هاتە ئەوێ کورسیەکەی بۆ چۆڵ دەکات و ئەوی لەسەر دادەنیشێنێ، هەروەها (قطن) لە درێژەی نامەکەیدا گوتبووی: ئەگەر منت هەڵبژارد ئەوا لە خزمەتت دام، ئەگەر هەڵتبژاردم بە خۆم و هەرچی سوپای سەربازیمەوەیە بە پێیان و

---

١ السلوك ٤١٨/١، السلطان مظفر سیف الدین قطز ص: ٩٢.

بە پەلە بە هاوارتەوە دێین، ئەگەر باوەڕ بە من ناکەیتو لێم دڵنیا نیت ئەوا کێت پێ خۆشە دیاری بکەو بە خۆیو بە سوپاوە بۆ خزمەت جەنابتی دەنێرم،[1] بەم شێوازە تەواوی واتاکانی قوربانیدانو خۆبە کەم دانانو ڕژدبوون لەسەر بەیەکرپزی ئوممەت لە کەسایەتی (سوڵتان قطز)دا دەرکەوتنو هەر ئەم نیازە پاكو بێگەردەش بوو یارمەتیدا بەرەنگاری پرۆسەی مەغۆلی ببێتەوەو لە (عین جالوت)دا تێکی بشکێنێ، بە ئیزنی خوا لەو فەسڵەی دادێ بە درێژی باسی دەکەین.

---

١ السلطان مظفر سيف الدين قطز ص: ٩٢، ٩٣، ٩٤.

# فەسڵی چوارەم

## جەنگی ( عەین جالوت )ی زیندوو، تێکشکانی مەغۆل

### باسی یەکەم: مەغۆل و داگیرکردنی شام و جزیرە:

**یەکەم: خۆڕاگری ( میافارقین ):**

تەتەرەکان کۆتاییان بە هێرشە سیخوڕیو هەواڵگیریەکانی خۆیان لەسەر خاك و گەلو مەلیکەکانی وڵاتی (جزیرە) هێنا، لە داگیرکردن و لەنێوبردنی (بەغدا) بوونەوەو قورسایی هێرشی سوپاکەیان بە سەرکردایەتی (هۆلاکۆخان) بەرەو (جزیرە) بەڕێکەوت، ئەمەو دوای ڕوخانی بەغدا لە ٦٥٦ك/١٢٥٨ز یدا تەتەرەکان کاتی خۆیان بەفیڕۆ نەداو، هۆلاکۆ ڕاستەوخۆ بەرەو جزیرە بەڕێکەوت و دەست بەسەرگرتنی (دینسمرو نەسیبین و حران)ی بە ئامانج گرت، سوپایەکی تری بە سەرکردایەتی (یەشموت)ی کوڕی بە هاریکاری دوو سەرکردەی تر (ئیلکانۆیان)و (سۆتای نۆیان) بەرەو (میافارقین) بەڕێکرد، هێزێکی تریشی بە سەرکردایەتی صالحی کوڕی بدرالدین لۆلوئی حوکمڕانی موصڵ بەرەو (ئامەد) بەڕێکرد.[1]

**١ـ ئامەد لە ڕووبەڕووبوونەوەی تەتاردا:**

لە ساڵی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز (مەلیك کامیل ناصرالدین محمد کوڕی مظفر شهاب الدین)ی حوکمڕانی (میافارقین) پاش پێدانی بەڵێنی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بە (مەنکۆخان)ی ئیمپراتۆری گەورەی تەتار لە سەردانەکەی خۆیدا بۆ پایتەختی وڵاتی مەغۆل گەڕایەوە، هەواڵی پێگەیشت (بدرالدین لۆلۆی) حوکمڕانی موصڵ نامەی بۆ دانیشتوانی ئامەد نوسیوەو داوای خۆی بە دەستەوەدانی خۆیان و شارەکەیانی لێدەکا، داوای لە مەلیك سەعیدی سەرۆکی حکومەتی ماردین کرد بە فریای بکەوێ، هێزی سەربازیان ناردە سەرو سەربازانی سلجوقیان لێ بەدەرنان و (ئامەد)یان داگیر کرد،[2] لە ساڵی ٦٥٧ك یداو لەو کاتەدا تەتارەکان گەمارۆی (میافارقین)یان دابوو، (هۆلاکۆ) گەیشتە ئامەد و بانگهێشتی (سیف الدین کوڕی محلی) کرد کە بە وەکالەتی (مەلیك کامیل) حوکمی شاری دەگێڕا، ئەویش هاتە لایو (هۆلاکۆ) داوای لێکردن شار بە دەستەوە بدەن، ئەوانیش ڕێکریان نەکرد، ئینجا (هۆلاکۆ) حوکمی هەرێمی

١ العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية ٢/٤٧.
٢ المصدر نفسه ٢/٤٨.

(ئامەد)ی خستە دەست (ركن الدين)و (عزالدين)ی جوتەكوڕی (كەیخوسرەو)ی سوڵتانی كۆچكردووی سلجوقیە ڕۆمیەكان، كاتێك هەرێمەكەیان دابەشكرد، (ئامەد) كەوتە بەردەستی (ركن الدين قليج ئەرسەلان)، كاربەدەستانی ئەوو كاربەدەستانی تەتار وێكڕا حوكمیان تێدا دەگێڕا، ئینجا دوابەدوای كوژرانی (غياث الدين)ی كوڕی جێگەی گرتەوە.[1]

**٢- (میافارقین)و بەرەنگاربوونەوەی تەتار:**

پاش گەڕانەوەی لە سەردانەكەیدا بۆ لای (خانی تەتار)، (مەمليك كامیل) یاخی بوونی خۆی لە دژی تەتار ئاشكراكردو كاربەدەستەكانی لێ بەندكردنو بە مەبەستی وتووێژكردن لەگەڵ (مەليك ناصر)دا بەرەو دیمەشق بەڕێكەوت، كە گەیشتە لای بە جەنابی سوڵتانی گوت: ئەم تەتارانە موداراتیان لەگەڵ ناكرێتو خزمەتكردنیان هیچ سوودێكی نیە، ئەوان جگە لە كوشتنی خەڵكو زەوتكردنی وڵاتان چ ئامانجێكی تریان نیە، جەنابی سوڵتانی گەورەو سەروەرمان لە ساڵی ٦٤٢ی كۆچیەوە هەتا ئیمڕۆ ٦٥٦ك سەروەتو سامانی وەبەركردوون، دەپرسم ئەم هەموو دڵسۆزیو دوستایەتیە چ كاریگەریەكی لەسەر داناون؟ با سەروەرمان بە بە قسەی بدرالدين ی حوكمڕانی موصڵو - زين الحافظي - ی نوێنەری تەفرە نەخوا، ئەم دووانە جەنابتیان لەبەر خاتری نانو ژیان دەوێ، زۆر بە چاكی لەم نوێنەرەت وریابە، ئەو دڵسۆزیی جەنابت نیەو جەنابت بەسەر ئەوان - تەتەراندا - هەڵنابژێرێت، ئەو ئامانجی ئەوەیە دەسەڵاتت لە دەست دەرچێ، من لێم ڕوونە لەگەڵیان بم یان لە دژیان بم هەر كوژراوم، بەڵام بڕیارم داوە گیانی خۆم لە ڕێی خوادادا بەخت بكەم، ئێستا لە دەورەی بەغدا دابەزیون، پاش ئەمە چاوەڕێ كردن بۆچی چاكە، بەرژەوەندی وا دەخوازێ جەنابی سوڵتان - ناصر - بە خۆیو سوپاكەی بە فریای موسڵمانانەوە بچێتو دەربچێت، وا من لە خزمەتیدام، ئەگەر توانیمان پێی بگەینو ڕزگاری بكەین ئەمە باشترین شتە بۆ ئێمەو لە لای خەلیفەش دەبینە خێوی دەستی سپی، ئەگەر پێشی نەگەیشتین تۆڵەی بۆ دەستێنینەوە.[2]

**٣- پرۆژەی (كامیل) بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی تەتار:**

(كامیل) بۆچوونێكی ڕوونو ئاشكرای هەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەتار، ئەو پرۆژەیەی كە لە كاتی دیداری (مەليك ناصری ئەیوبی) لە دیمەشق خستیەڕوو بریتی بوو لە پرۆژەیو پەلامار نەك پرۆژەی بەرگری:

---

١ المصدر نفسه ٢/٤٨.

٢ العلاقات الدولية ٢/٥٠.

أ- (ناصر) دەیزانی دابەزینی هۆلاکۆ لە دەورەی بەغداو گەمارۆدانی گەورەترین ئامانجی تەتارەکانەو دوای ئەوەی دەستیان بەسەرداگرت ڕوو لە جزیرەو شام دەکەن.

ب- کامیل دوپاتی دەکردەوە کە بە ڕووخانی بەغدا کۆتایی بە دەوڵەتی ئیسلامی دێت بە هەموو نیشانەو واتاو مەملەکەتو ئیمارەتەکانیەوە.

ج- لەبەر ئەمە دەیەویست لە (بەغدا) دەست بە جێبەجێکردنی پرۆژەکەی بکات، داوای لە (سوڵتان ناصر) کرد بەخۆیو بە سوپایەکەیەوە کە (کامیل)و سوپاکەشی لەگەڵدا دەبێت بەرەو بەغد بەڕێ بکەوێت لە زاری عەزیای نەجاتدا، چونکە ململانێی گەڵ تەتار لە بەغدا یەکلا دەکرێتەوە.

د- لە قسەکانی (کامیل)ەوە باوەڕبوون بە سەرکەوتن لە لوتکەدایە، ئەگەر بە فریای خەلیفەش نەکەونو پێیان دەربازنەبێ، ئەوا دەتوانن تۆڵەی بسێننەوە.

س- کامیل (سوڵتان ناصر)ی لە سەر لێ تێکدانی بدرالدین لۆلوئی حوکمڕانی موصڵو خیانەتی (زین الدین الحافظي)ی وەزیری ئاگادارکردەوەو تێیگەیاند: کە بدرالدین زیاد لە پێویست دەستی لەگەڵ تەتارەکان تێکەڵ کردووەو (زین الحافظي) نوێنەریشی بە هەمان شێوەو پێی گوت کە ئەمانە تۆیان کردووە بە ئامانجی نانو بژێوی.[1]

بێگومان مەلیك کامیل یەکێك بوو لەو مەلیکە دانستانەی بەهۆی بۆچوونو پێشبینی ڕاستو دروستیان لە بەرامبەر هەڵوێستەکانی دوژمندا ئازایانە بیریان لە بەرەنگاربوونەوە کردەوە، قسەی کامیل ڕاست دەرچوو و تەتارەکان یەك بە یەك دەستیان بە کوشتنی مەلیکەکان کردو جیاوازیان نەخستە نێوان بەرگریکارانو خۆبەدەستەوە دەرانیانەوە، ئەمە ئەو حەقیقەتە بوو ڕۆژگار سەلماندی.[2]

**ـ وەڵامی (سوڵتان ناصر) لە بەرامبەر پرۆژەکەی مەلیك کامیل:**

پاش ئەوە (سوڵتان ناصر) بە تەواوەتی گوێبیستی گوفتارەکانی (مەلیك کامیل) بوو و لە هەڵوێستەکانی حاڵی بوو یەکسەر کاربەدەستانی دەوڵەتەکەی کۆکردەوەو سەبارەت بەم مەسەلەیە ڕاوێژی پێکردن، ڕای زۆرینە پێشوازی لە پرۆژەکەی کردو پێیان چاك بوو بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام (زین الحافظي و صالح نورالدین ی کوڕی مجاهدو مەلیك ئەشرەفی کوڕی منصوری حوکمڕگێڕی (حمص)) لەبەر ئەوە لەگەڵ تەتار ڕێککەوتبوون لە دژی پرۆژەکە وەستانەوە.

---

١ الاغلاق الخطيرة لابن رشد، نقلا عن العلاقات الدولية ٢/٥١.

٢ العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية ٢/٥٢.

(زين الحافظي) بە (سوڵتان ناصر)ی گوت: هەرکات هەواڵی دەرچوونت بگات (هۆلاکۆ) یەکسەر بەڵگەت پێ دەگرێت و پەلاماری مەملەکەت دەدا، بەرژەوەندی وا دەخوازێ، بە قسەی (کامیل) نەکەیت و عوزری بۆ بێنیتەوە.

لێرەدا سوڵتان بۆی نەبوو لە رای زۆرینە دەرچێ، بەلام لە کۆبوونەوەکە هاتە دەرەوە و دەستی لە قۆڵی کامیل هەڵیناو لە کۆشکی (دار السعادة) داینیشاندو وەلامی بە نەرێ دایەوە،[1] دەرەنجام لە کۆبوونەوەکەی (سوڵتان ناصر)دا دەرکەوت کە پشتیوانانی تەتار هەتا لە نێو دەستوپێوەندەکانی سوڵتانیشدا وەکو حیزبێك بونیان هەبووە، بەلام کە مینە بوون و هەست و نەستی زۆرینەی خەڵك لە دژی تەتار بوو و مەیلی بەلای بەرەنگاربوونەوەدابوو و گوێی لەوە نەبوو دەرەنجام چ دەبێ، (سوڵتان ناصر) گوێی بۆ کامیل شل کرد بەلام پرۆژەکەی پەسند نەکرد، کاتێك (کامیل) پرۆژەکەی خۆی بۆ دەرچوون بەرەو بەغدا خستەڕوو، هەموو ئامادەبووان جگە لە حیزبەکەی سەر بەر تەتار پشتگیری پرۆژەکەیان کرد، ئەو حیزبە زۆر ڕوو هەڵماڵاوانە دژایەتی خۆیان خستەڕوو، هەرچی (مەلیك ناصر)یشە جگە لە وەلامە نەشیاوەکەی و ڕەتکردنەوەی پرۆژە بوێرانەکەی کامیل، داوای لە کامیل کرد کە لە لایەن خۆیەوە نوێنەرێك بنێرێتە لای (هۆلاکۆ) و تکای بۆ بکا ! ، (کامیل)یش ئاوا وەلامی دایەوە: سەبارەت بە کاروباری دینەکەم هاتوومەتە لات، بە کاروباری دونیا قەرەبووم بۆ دەکەیەوە ؟ ناصر گوتی: هەر کات هێرشیان بۆ هێنای سوپات بە هاوارەوە دەنێرم، کامیل گوتی: ئەو کاتە هاوارم پێ ناگاو هیچ سوودم پێ ناگەیەنێت،[2] (مەلیك کامیل) بەوپەڕی جورئەت و شەهامەتەوە ویستی جیهادو بەرەنگاری خۆی بە هەر نرخێك لەسەری بکەوێت بخاتەڕوو و ئامادەیی خۆی بۆ سەرکەوتن یان بۆ شەهادەتی سەربەرزانە دەربڕی، بەلام (مەلیك ناصر) هەڵوێستی بەزیوانەو ترسنۆکانەی دەربڕی و خۆی بەبێ هێزو دەستەپاچەنیشانداو نەیتوانی هەنگاوێکی بوێرانە هەڵێنێ و بڕیارێکی سەرکەوتووانەی وا واژۆ بکات کە پڕ بە پێستی پێویستیەکانی ئەو ساتە وەختە هەستیارە بێ، (مەلیك کامیل) تا ئەو کاتەی هەواڵی ڕووخانی بەغدای پێگەیشت هەر لە دیمەشق مابوو، لە ڕێگای (حەلەب)ەوە بەرەو وڵاتەکەی گەڕایەوە، لە ڕێگا (ابن شداد) تووشی بوو، پێی گوت: سەبارەت بە نیازی هاتنت بۆ لای مەلیك ناصر پێکات – و ڕایەکەت هەق بوو – بەلام

---

١ الاغلاق الخطيرة لابن رشد، نقلا عن العلاقات الدولية ٢/٥٢.
٢ العلاقات الدولية ٢/٥٢.

سەبارەت بە گەڕانەوەت نەتپێکاوە، دەڵێی نیازی مصرت هەیە؟ (مەلیك کامیل) گوتی: لە تێکچوونی دڵی مەلیك ناصر ترساوم، ئینجا (ابن شداد) هانی دەدا کە ژنو منداڵەکانی لە (میافارقین) دەربکاتو چەند جێگرێك لەوێ لەجێی خۆی دابنێتو خۆیشی بە مەبەستی گێڕانەوەی عەزمو ئیرادە بۆ نێو دڵو دەروونی بۆ لای مەلیك ناصر بگەڕێتەوە.

لە ماوەی ئەم چەند قسانەی نێوان کامیلو ابن شداد بۆمان دەردەکەوێ: کامیل وەکو دوا وێستگەی ڕووبەڕووبوونەوە لە بەرامبەر تەتاردا بیری لە چوونە مصر کردۆتەوە، بەڵام لە حاڵێکدا ناصر زۆری پێویست بە ئەوەو نەبادا توڕەش ببێت ئەم کارەی نەکردو نەچوو، وەك دەردەکەوێ (ابن شداد) لە بارودۆخی گشتی ئاگادارە، دەیزانی (هەرێمی جزیرە) بۆی دەرچووەو دەستی لێ شۆراوە بۆیەشە بە کامیل دەڵێ: خاووخێزانت لە (میافارقین) بەدەرنێ، دەشیزانی ناصر بەزیوەو پێویست بەوە دەکات کەسانێکی وەکو کامیل عەزمو ئیرادەی هەستێننەوە.[1]

**٥ـ ڕووخانی (میافارقین)و شەهیدبوونی (کامیل):**

پاش دەست بەسەرداگرتنی (هەولێر)و دەوروبەری لە لایەن مەغۆلەوە، هۆلاکۆ فەرمانی بە هەریەك لە فەرماندەکانی خۆی (یەشموتو ئیلکانۆیانو سۆنتای) کرد بەرەو (میافارقین) پێشڕەوی بکەن، کاتێك گەیشتنە سەر سنوور نوێنەرێکی خۆیان بۆ لای (مەلیك کاملی ئەیوبی)ی حوکمڕانی ناردو داوایان لێکرد بە خۆشی خۆیان خۆبەدەستەوە بدەن.

ئەگەر سەرپێچیش بکەن ئەوا بەر پەلاماری کوشتنو ڕوخاندنو لەنێوچوون دەکەون، (مەلیك کامیل) بە حوکمی ئەوە بە خیانەتو پەیمان شکێنیو بێ بەڵێنی (مەغۆل) ئاشنابوو بۆیە بە توندی داواکەیانی ڕەت کردەوەو بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە:

من بە قسەی هەنگویناوی تەفرە ناخۆم، لە سوپای مەغۆلیش ناترسم، تا بژیم شمشێر دەوەشێنم.[2]

لە ئەنجامی ئەم وەڵامە ڕاشکاوەی (مەلیك کامیل)دا، میرانی مەغۆل بە یەکدەنگی بڕیاریاندا لێکڕا پەلاماری (میافارقین) بدەنو بە زەبرو زەنگ لە ژێر دەستی حوکمڕانەکانی دەربێنن، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا (مەلیك کامیل) خۆیو هێزەکانی ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی پەلامارەکە کرد، پێشەکی چووە نێو دانیشتوانی شارەوەو دڵو دەروونی خۆشکردنو گیانی مەعنەوی لە جەستەدا گەشاندنەوەو بەڵێنی پێدان هەرچی زێڕو زیو و

---

[1] جهاد المماليك ص: ٥٣.

[2] جهاد المماليك، ص:٥٣.

پارەو دەغڵودانو ئازوخەی لەنێو خەزێنەکاندا هەیەو پەسمەندەی کردووە لە پێناوی بەرگریکردنی شارەکەیان بەسەریاندا دابەش دەکا، هەموو دانیشتوانی شار بەڵێنیاندا بە قسەی بکەنو خۆیان بۆ جیهادو بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل ئامادە بکەن کە هەڕەشەی کوشتوبڕو ڕوخاندنی خۆیانو شارەکەیان دەکات، موسڵمانانی (میافارقین) توانیان خۆڕاگرانە بەرەنگاری هێرشەکە ببنەوەو قارەمانێتی خۆیان بسەلمێنن،[1] ئەم شارە تێکۆشەرە خۆی ڕاگرتو بەرەنگاربوونەوەیەکی توندوتیژی تێدا ئەنجام درا، (مەلیك کامیل محمد) ئازایەتیەکی کەم وێنەی نیشانداو بەردەوام دانیشتوانی لەسەر جیهادو خۆڕاگریو سەقامگیری هان دەدا، گەمارۆی سەر (میافارقین) درێژەی کێشا، دەبوایە ئیمارەتە ئیسلامیە هاوسێکانی بە هاواریەوە چووبانایە، بەڵام ئەمە نکرا، نە چەكو چۆڵ، نە خواردەمەنی، نە دەرمان، هیچیان پێ نەگەیشت، ڕاستو دروست سەرانی موسڵمانانی ئیمڕۆ بە هەمان شێوەی میرە کۆنەمانمان چۆن ڕێزیان لە هێزە خۆسەپێنە جیهانگیریەکەی یەکەم – تەتار – گرت، ئەوانیش ڕێزیان لە سیستەمی تازەی نێودەوڵەتی گرتو چاویان لە ڕاست لەنێوچوونو کوشتوبڕو برسێتی خوشكو براو باوكو ڕۆڵەو دایكو خزمو کەسەکانی خۆیان دەقوچێنن، لە واقیعدا من سەرم لە ڕاست پەرچەکرداری نەتەوەکان دەسوڕمێ، نەتەوەکان لە کوێنو چیان بە دەستە؟

– نەتەوەکان ئازاد نینو ویستو بڕیارەکانیان لە دەست حکومەتەکانیان دایەو ئەوان تەنها گەردنکەچی حکومەتن.

– لێرەولەوێی وڵاتان کار لەسەر (شۆرینی مۆخ)ی ڕۆڵەی نەتەوەکان دەکرێت، حوکمڕانو وەزیرو زاناکانیان بەردەوام دەیانەوێت قەناعەت بە خەڵك بکەن کە ئەوان سیاسەتێکی باشو حەکیمانە لە ئیدارەی دەوڵەتەکەیاندا پەیڕەو دەکەن.

هەر کەسێك زانایانو وتارەکانیانو بەڵگەکانیان قەناعەتی پێ نەکەن، ئەوا دەبێ شمشێر قەناعەتی پێ پەیدا بکات، بە ڕاستی نەتەوەکان باریان بە زەبروزەنگو زوڵمو زۆرو خۆسەپێنی حوکمگێڕەکانیان گرتووە.[2]

– مەغۆڵەکان بە بەشداری چەند تیپە سەربازێکی (ئەرمینیو مەسیحی شەرقی) ئابلۆقەی سەر شاری (مییافارقین)یان توند کرد، موسڵمانانی نێو شار مەردانە بەرپەرچیان

---

١ جامع التواريخ، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٧٥.

٢ قصة التتار ص: ١٧٨.

دانەوەو خۆیان ڕاگرت، پاش تێپەڕینی ئەو هەموو ماوە دوورودرێژە مەغۆلەکان نەیانتوانی بچنە نێو شارەوە، لەنێو سوپای ئەیوبیدا دوو شۆڕەسواری ئازاو بە جەربەزە هەبوون و سەری دوژمنیان سوڕماندبوو و داخیان بە جەرگەوە نابوون و لە هەر شوێنێك سەریان دەربێنایە سەرکوتیان دەکردن، ئەو قارەمان و نیشانە شکێنانە بە شیرو تیرەکانیان زیانێکی گورچوبڕیان لە سوپای مەغۆل دا، (هۆلاکۆ) زانی سوپاکەی لە ڕاست چوونە نێو شارەوە دەستەپاچە ڕاوەستاوە بۆیە بە ناچاری لە دوای (میرقەتۆ)ی نارد بە خۆی و بە سوپاکەیەوە بە هانای بێ، ئەویش بە خۆی و بە سوپاکەیەوە خۆی گەیاندنێ، لەو قۆڵەوە گیرسایەوە کە سوپاکەی (ئیلکیانۆیان)ی لێ مۆڵ ببوو، بە حوکمی ئەو ئابلۆقەدرێژخایەنەی لە لایەن مەغۆلەکانەوە لەسەر شار دانرابوو، ڕۆژو ڕۆژی لەنێو شاردا کۆتایی هات، برسێتی باڵی بەسەر هەموو دانیشتواندا کێشا، نەخۆشی بڵاوبۆوە، شورەکان بەهۆی بەردبارانی توندی مەنجەنیقەکان داڕوخان، زۆربەی زۆری دانیشتوان لەنێو چوو.[١]

– بەهۆی ئەو گەمارۆ درێژخایەنە برسێتی لە نێو شاردا ڕوویدا، لە ساڵی ٦٥٨ك/١٢٦٠ز دواهەمین سەنگەری بەرەنگاری (جزیرە) گیرا، سوپای تەتار چووەنێو (میافارقین)ەوە تەماشایان کرد هەر هەموو دانیشتوان جگە لە (٧٠) کەسی نیوەزیندووی نیوە مردوو کەس نەماوەو هەمووی مردووە، (مەلیك کامیلی ئەیوبی)یان دەستگیر کرد، (هۆلاکۆ) بەوپەڕی توندوتیژی ڕەفتاری لەگەڵ دەنواندو فەرمانی کرد پارچەپارچەی بکەن.[٢]

دەستبەجێ دەستیان بە جێبەجێکردنی فەرمانەکە کرد، کوت کوت گۆشتیان لە جەستەی دەبڕی، هەر جارەش کوتە گۆشتێکیان بۆ دەم دەبرد، تا مرد لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوون، پاشان سەریان لە جەستە کردەوەو بەسەر سەرەڕمێکیان داکردو بە وڵاتدا دەیانگێڕا، ئەمە لە ساڵی ٦٥٧ك/١٢٥٩ز یدا ڕوویدا،[٣] زۆریان گێڕا تا گەیاندیانە دیمەشق، ئینجا بەسەر (باب الفرادیس) دەروازەی باخچەکانەوە هەڵیانواسی، دانیشتوانی دیمەشق بە ڕێزەوە دایانبەزاندو ناشتیان، مەغۆلەکان داخ لە دڵانە شاری (میافارقین)یان بە تەواوەتی داڕماندو کەسیشیان بە زیندوویی تێدا نەهێشتەوە، ئەم ڕەفتارە دڕندانەیان بەڵگەی ئەو هەموو ڕق و داخ و مەراقەیانە کە بە هۆی بەرەنگاربوونەوە شێرانەکەی مەلیك (کامیل و دانیشتوانی ئەو شارە) لە دڵ و دەروونیاندا پەنگی خواردبۆوە، موقاوەمەو بەرخودانی مەلیك

---

١ جهاد المماليك ص: ٧٦.
٢ المصدر نفسه ص: ٧٦.
٣ المصدر نفسه ص: ٧٦.

کامیل جگە لەوە زەرەرو زیانێکی زۆرو زەوەندی مادیو مرۆیی پێ گەیاندن، وێڕای ئەمەش حەیای پەلامارە دڕندانەو تۆقێنەرەکانیشی بردن، چونکە بەرخودانی کامیل بوو بە دروشمو مەشخەڵی ئیرادەی بەگژداچوونەوەی تەتەرەکان، خۆیشی بە هۆی شێوازی مەرگیەوە بوو بە پێشەنگو نموونەی قوربانیدانو شەهادەت.[1]

حکومەتەکەی مەلیك کاملی ئەیوبی دەسەلاتی بەسەر باکووری خۆرئاوای عێراقو باکووری خۆرهەلاتی سوریاو خۆرهەلاتی تورکیادا هەبوو، ـ کە هەر هەمووی بەر کوردستانی گەورە دەکەوێ — شاری (میبافارقین) دەکەوێتە خۆرهەلاتی تورکیاو باری خۆرئاوای دەریاچەی (وان)، کەواتە سوپای کاملی ئەیوبی وێڕای ئەوەی دەسەلاتی خۆی بەسەر خۆرهەلاتی تورکیادا کێشابوو، بە هەمان شێوەش حوکمی لە ناوچەی (جزیرە)ش دەگێڕا — کە ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان دوو ڕووباری (دیجلەو فورات).[2]

**٦ـ ماردین:**

هۆلاکۆ پاش بەجێگەیاندنو تەواوکردنی ئەرکەکانی سوپاکەی لە (میبافارقین)، فەرمانی بەهێزەکانی کرد بەرەو شاری ماردین بەڕێ بکەون، ماردین قەلاو شورەی بەرزو دامەزراوی هەبوون، مەغۆلەکان بە بینینی سەرسام ببوون، لەبەر ئەمە سەرکردەکانیان پەنایان بۆ دابونەریتی پێشدایان بردو نوێنەری تایبەتی خۆیان بە کۆمەڵێك هەڕەشەو گوڕەشە بۆ لای (مەلیك سعید)ی حوکمڕانی بەڕێکرد، بەلام (مەلیك سعید نجم الدین ئیلغازی ئورتوقی) گەردنکەچی داواکاریو فەرمانەکانیان نەبوو و گوتی: من بە نیاز بووم بێمە خزمەت مەلیكو فەرمانبەرداری خۆمی پێ ڕابگەیەنم، بەلام تەماشام کرد بەڵێنتان بە خەڵکانی تر داو پاش ئەوەی بە تەواوەتی لە باوەشی پەیمانو بەڵێنەکانتاندا ئارامیان گرت کوشتتانن، کەواتە من ئێستا باوەڕتان پێ ناکەم، لە خودا بەزیاد بێ قەلا پڕە لە ئازوخەو خواردەمەنیو چەكو چۆلو تەقەمەنیو پیاوانی تورکو قارەمانانی کوردیش خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوە ئامادە کردووە.[3]

ئینجا بە توندی ئابلۆقەی (ماردین)یان دا، لەو ماوەیەدا هۆلاکۆ توانی دەست بەسەر (ئامەدو حەڕانو ڕەهاو سروج)و ژمارەیەکی زۆر لە شارو قەلاو شورەکانی (جزیرە)دا بگرێت، لێرەوە هۆلاکۆ بڕیاری دا جارێك لە ماردین گەڕێ تا بە تەواوەتی حیسابی خۆی

---

١ العلاقات الدولية ٢/٥٤.

٢ جامع التواريخ، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٧٧.

٣ الاغلاق الخطيرة ٣/٥٦٦ـ٦٧٨، جهاد المماليك ص: ٨٤.

لەگەڵ شام دەبڕێنێتەوە، بە خۆیو سوپاکەیەوە لە فورات پەڕیەوەو بەرەو (حەلەب) بەڕێکەوتو لە مانگی محرم ی ٦٥٨ک/١٢٥٩ز داگیری کرد، دووبارە بایدایەوە بۆ ماردینو گەمارۆی لەسەر دانایەوە، لە ماوەی گەمارۆکەدا نەخۆشیەکی کوشندە لەنێو شاردا بڵاو بۆوە، لە ئەنجامدا (مەلیک سعید)و خەڵکێکی زۆری دانیشتوان سەریان نایەوەو مردن، (مەلیک مظفر)ی کوڕی (مەلیك سعید) جێگەی بابی گرتەوە، وتووێژی ئاشتی لەنێوان (مەلیك مظفر)و (هۆلاکۆ) دەستی پێکردو دەرەنجام صولحیان کرد، هۆلاکۆ یەکێك لە میرە گەورەکانی مەغۆلی بە ناوی (کۆهدای) بە سیفەتی نوێنەر بۆ ماردین نارد، (کۆهدای) موسڵمان بوونی خۆی لەسەر دەستی (مەلیك مظفر) ڕاگەیاند، (مەلیك مظفر) خوشکێکی خۆی لێ مارە کردو کردی بە زاوای خۆی، پاش ئەمەو لە مانگی ڕەمەزانی هەمان ساڵدا (مەلیك مظفر) بە دەستی دیاریەوە سەردانی هۆلاکۆی کرد، هۆلاکۆ بە گەرمی پێشوازی لێکردو ڕێزی لێناو لەگەڵی کۆبۆوە، هۆلاکۆ ڕووی لە (مەلیك مظفر) کردو گوتی: هەواڵی هەلاتنی حوکمڕانی (موصڵ)م بەرەو مصر پێگەیشتووە، من دەزانم ئەو لە ژێر کاریگەری هاوەڵو کاربەدەستەکانیدا ئەم کارەی کردووە، تۆش لەو هاوەڵو کاربەدەستانەت گەڕێ کە لەگەڵ خۆت هێناون بۆ لای من، چونکە من باوەڕیان پێ ناکەمو دەترسێم لە منت هەڵبفریوێننو لە وڵاتی خۆت بە دەرنێنو بەرەو مصرت بەرن، هەرکات هاتمە ماردین با لەگەڵ من بێنەوە،[1] (مەلیك مظفر) گوێڕایەڵی نواندو ئینجا بەرەو ماردین گەڕایەوە، هێشتا لە ڕێگادا بوو و نەگەیشتبووەجێ، هۆلاکۆ بەدوایدا نارد دووبارە بگەڕێتەوە لای، بە ترسو خۆفەوە هاتەوە، کاتێك پێکەوە دانیشتن، هۆلاکۆ گوتی: هاوڕێکانت پێیان ڕاگەیاندم کە تۆ پەیوەندیەکی ژێربەژێرت لەگەڵ حوکمڕانی مصردا هەیە، چاك وایە کەسێکی منت لەگەڵ بێتو نەیەڵی مەیلت بە لای ئەواندا بجوڵێ، ئینجا میرێکی خۆی بە ناوی (أحمد بەغا) بۆ ئەم کارە دیاری کردو لەگەڵ (مەلیك مظفر) بەرەو ماردینی ناردەوە، ئەمە پاش ئەوەی هۆلاکۆ شارەکانی (نەسیبینو خاپور)و ناوچەیەکی زۆر کە لە فراوانیدا گاڵتەی پێ نەدەکراو لە (دیاربەکر)ەوە بەرەو (ئامەد) ئینجا تا (میافارقین) درێژ بۆوە خستە سەر حوکومەتەکەی (مەلیك مظفر)، هەروەها چەند شارو شوێنێکی تریشی وەکو (قەرقیسا) کە تازە لە ناوچەی جزیرە لە لایەن مەغۆلەکانەوە داگیرکرابوون بە هەمان شێوە خرانە سەر دەوڵەتەکەی (مەلیك مظفر) بە جۆرێك مەغۆلەکان هێزێکیان لە ناوچەکەدا بە مەبەستی پاسەوانیکردنی

---

١ جهاد المماليك ص: ٨٤.

ڕێگاوبانەکان بەجێ هێشتبوو،[١] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هۆلاکۆ فەرمانی بە (مەلیك مظفر) کرد بورجەکانی قەڵای ماردین بڕوخێنێ، هەر کە (مەلیك مظفر)سەربازگەی هۆلاکۆی بەجێ هێشت، هۆلاکۆ لە گەردنی کاربەدەستانی مەلیك سعیدی داو کوشتنی، ئەمانە (٧٠) میری گەورەی شاری ماردین بوون، هیچ تاوانێکی وایان نەبوو شایانی ئەم سزایە بن، بەڵکو هۆلاکۆ ویستی بەم کارەی باڵێکی (مەلیك مظفر) ببڕێت،[٢] بەم شێوەیە ماردین بوو بە بەشێك لە ویلایەتەکانی مەغۆل، حوکمڕانەکانی بە فەرمان و بڕیاری سەرکردەکانی مەغۆل حوکمیان دەگێڕاو بە تەواوەتی پابەندی هێڵە گشتیە سیاسیو سەربازیەکانی ئەوان بوون، سەروەتو سامانو کۆمەکی سەربازیان پێشکەش دەکردنو پارەیان بە ناوی ئەوانەوە دەردەکردو وتاریان بە ناوی ئەوانەوە دەخوێندنەوە، مەغۆلەکان توانیان ئامانجی خۆیان بپێکنو (ئیمارەتی ماردین) بخەنە ژێر ڕکێفی حوکمی خۆیانەوەو لەوێشەوە دەست بەسەر (دیاربەکر)دا بگرنو بیکەنە مەڵبەندێك بۆ ڕێکخستنی هێرشەکانیان بۆ سەر بەشی وڵاتی خۆرئاوای ئیسلامی.[٣]

## دووەم: سوڵتان (ناصر) لە نێوان بەرەنگاربوونەوەو خۆبەدەستەوەداندا:

دوابەدوای ڕووخانی بەغدا (مەلیك ناصر یوسفی ئەیوبی)ی حوکمڕانی حەلەبو دیمەشق — کە بە گەورەترین میری نێو میرانی بنەماڵەی ئەیوبی دادەنرا لە وڵاتی شامدا — فەرمانبەرداری خۆی بۆ هۆلاکۆ ساغ کردەوەو وەڵامی داواکاریەکانی دایەوە، یەکسەر وەفدێکی بە سەرۆکایەتی (مەلیك عبدالعزیز)ی کوڕی بە دەستی پڕ دیاریەوە بۆ لای هۆلاکۆ بەڕێکرد، کاتێك (عەزیز) گەیشتە نێو سەربازگەی هۆلاکۆو دیاریەکانی دەستی — کە نیشانەی دۆستیو گوێڕایەڵی دەگەیەنن — پێشکەش کرد، (عەزیز) بە ناوی باوکیەوە داوای لە هۆلاکۆ کرد لە پێناوی ستاندنەوەی خاکی وڵاتی مصر لە دەست مەمالیك هێزێکی بە هاوارەوە بۆ بەڕێ بکات.[٤]

### ١ـ وەڵامی (هۆلاکۆ) بۆ (مەلیك ناصر):

بەبۆچوونی هۆلاکۆ (مەلیك ناصر) بە کەسێکی سەرپێچیکارو یاخی دێتە هەژمار، چونکە بە دەم بانگەوازەکەی چووەو بە خودی خۆی سەردانی نەکردووە، ئەو وەفدەی ناردوویەتی

---

١ المصدر نفسه ص: ٨٤.

٢ المصدر نفسه ص: ٨٤.

٣ المصدر نفسه ص: ٨٤.

٤ السلوك ، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٦٩.

لەگەڵ پایەی مەزنی ئەو نایەتەوە، لەبەر ئەمە وەڵامی داواکاریەکەی نەدایەوە، ئەمجارە بە ڕەسمی داوای لێکرد بە خۆیو (٢٠) هەزار سوارەوە بێتە بەردەمیو سوێندی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ بخوات، (مەلیك عەزین)و وەفدەکەی بەڕێ کردەوەو نامەیەکی پێدا ناردنو پڕی کردبوو لە هەڕەشەو گوڕەشەو باسی شێوازەکانی سزادانو کوشتنو ڕوخاندنو وێرانکردنی مەغۆلانەی تێدا کردبوو،[١] ئەمە لەو نامەدا هاتووە: ( با (مەلیك ناصر)ی حوکمگێڕی حەڵەب بزانێ، ئێمە بە شمشێری بڕندەی خودای بالادەست بەغدامان گرت، سوارەکانیمان کوشت، کۆشکو تەلارەکانیمان ڕووخاند، دانیشتوانەکەیمان دیل کرد، هەروەکو خودای بالادەست لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۖ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾ (النمل: ٣٤)، خەلیفەکەیمان لەبەر دەمی خۆمان دانیشاند، پرسیاری چەند شتێکمان لێکرد درۆی لەگەڵ کردین، پاشان پەشیمان بۆوە، پەشیمان بوونەوەکەی دادی نەدا، خەزنەی گرانبەهای پەسمەندە کردبوون، خاوەن نەفسێکی نزم بوو، سەروەتو سامانی لەسەر یەك دانابوو، گوێی بە کۆکردنەوەی پیاوان نەدابوو، بە باشی ناوی دەهێنراو ڕێزی زۆری لێ دەگیرا، ئێمە لە بەرامبەر تێرو تەواویدا پەنا بە خودا دەگرین:

إذا تـمَّ أمـرٌ دنـا نـقـصـه | تـوق زوالاً اذا قـيـل تـم
اذا كـنـت في نـعـمـة فـارْعـهـا | فـإن المعـاصي تُـزيـل الـنعـم
وكـم مـن فـتـى بـات في نـعـمـة | فـلـم يـدر بـالـموت حتى هـجـم

هەر چاوت بە نامەکەم کەوت، خێرا بە خۆتو پیاوانتو سامانتو سوارانتەوە دێیە ژێر بەیداخی گوێڕایەڵی شاهەنشای ڕووی زەمین، لە شەڕی چەپاڵە دەدرێی، لە خێروبێری سوودمەند دەبیت، هەروەکو خودای بالادەست دەفەرموێت: ﴿وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ٤٠ ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ ٤١﴾ (النجم: ٣٩-٤١). نوێنەرەکانمان لای خۆت گل مەدەوەو دوایان مەخە، وەکو جاری پێشو مەکەو خێرا بەڕێیان بکەوە، ﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾، هەواڵمان پێگەیشتووە کە بازرگانانی شامو خەڵکانی تریش بە خۆیانو ژنو منداڵیانەوە بەرەو (کاروانسەرای)[٢] هەڵاتوون، ئەگەر بچنە نێو چیاوە بەسەریاندا دەڕوخێنین، ئەگەر بچنە نێو زەویەوە زەویەکەیان بەسەردا ڕۆدەچێنین.[٣]

---

١ جهاد المماليك ص: ٦٩.
٢ تەتار بە مصریان دەگوت کاروانسەرای.
٣ السلوك ١/٥٠٦.

أيـن النجاة ولا مـنـاص لـهـارب ولـى البـسـيطان الثرى والمـاء
ذلـت لـهيبتنا الأسود وأصبحـت في قـبـضـتي الأمـراء والـوزراء[١]

ئەمە بەشێك بوو لەو جەنگە سارده (دەروونی)یەی تەتارەكان له بەرامبەر دوژمنەكانیاندا بەكاریان دەهێنا.

**٢ـ هاواربەستنی (ناصر) له (مەمالیك):**

(مەلیك ناصر) داواكەی هۆلاكۆی ڕەت كردەوەو نامەیەكی پڕ له جنێوی بۆ بەرێكردەوەو سیاسەتی خۆی سەرتاپا لە بەرامبەر مەغۆلدا هەڵگێڕایەوە، كاتێك هەواڵی پەڕینەوەی مەغۆلەكانی له ڕووباری فوراتەوە پێ گەیشت، هەستا نوێنەرێكی خۆی بە ناوی (كمال الدین كوڕی عەدیم) بۆ لای (مەمالیك)ی مصر ناردو له دژی ئەو هێرشەی كە خەریكە خۆ بە شامدا دەكات داوای بە هاوارەوەچوونی لێكردبوون، ئەم هەڵوێستە بوێرانەی (مەلیك ناصر) وای لە (هۆلاكۆ) كرد بیر لە دۆڕانی سیاسەتە توندوتیژەكەی بكاتەوەكە لە بەرامبەر ئەودا نواندوویەتی‌و وای لێ كردووە خۆ باوێتە نێو كۆشی مەمالیكی مصرەوە، بیری كردەوە قەرەبووی هەڵەكەی بكاتەوە، یەكسەر هێزێكی خۆی بە هاواری (مەلیك ناصر) بۆ دیمەشق بەرێكرد، بەڵام ئەم كارەی هیچ سوودێكی هۆلاكۆی لێ نەكەوتەوە، بەڵكو فیكرەی ئاشتەوایی له نێوان (مەمالیك) و (ئەیوبیان)دا بەهێزتر كرد.

(مقریزی) دەڵێ: كاتێك هەواڵی گەیشتنی هێزە مەغۆلەكە بۆ پشتیوانی (مەلیك ناصر) گەیشتە (مەلیك قطز)ی سوڵتانی مەمالیك، خێرا (قطز) نامەیەكی بۆ (ناصر) ناردو نوسیبووی: كە سوێند بە خودا دەخوا كێبەركێی سەڵتەنەتی لەگەڵ ناكات، لە بەرامبەری ڕاناوەستێ، ئەو تەنها جێگرێكی ناصره له مصر و نامەكەی بەم شێوەیە كۆتایی پێ هێنابوو: ئەگەر هەڵتبژاردم — بەسەر هۆلاكۆدا — خزمەتت دەكەم، بە خۆم‌و هەموو سوپاكەمەوە دێمە دەورەت‌و بە هاوارتەوە دێم، ئەگەر لە منیش دڵنیا نیت‌و متمانەم پێ ناكەی هێزە سەربازیەكانمت بە سەركردایەتی كەسێك دەنێرمە لات كە بۆ خۆت دیاری بكەی.[٢]

**٣ـ ڕوخانی (حەڵەب):**

شاری حەلەب یەكەمین شاری وڵاتی شام بوو ڕووبەڕووی گەردەلولی مەغۆلی بۆوە، هۆلاكۆ فەرمانی بە هێزەكانی كرد له ڕووباری فورات بپەڕنەوەو هێرش بكەنە سەر وڵاتی شام، ئەم

---

١ المصدر نفسه ١/٥٠٦.
٢ جهاد المماليك ص: ٧٠.

هەواڵە گەیشتە حەلەب، ئەو کاتە (مەلیك معظم تورانشا) بە جێگرایەتی (مەلیك ناصر) حوکمی دەگێڕا، لە ترسان قەرەباڵغی کەوتە نێو شاری حەلەبو خەڵك بە سەرسامی چاوەڕێی کارەسات بوون، پێش گەیشتنی هێزەکانیان بۆ حەلەب وەکو نەریتی هەمیشەییان، هۆلاکۆ بە نوێنەری خۆیدا حوکمڕانی شاری ئاگادار کردەوە بەڵام (مەلیك معظم ئەیوبی) بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: ئێمە جگە لە شمشێر هیچ شتێکی ترمان نیە بۆ ئێوە،[١] ئینجا دەورەی حەلەبی گرتو بە باشترین شێوازی سەربازی ئەو کاتە بە هۆی شورەو دیوارە بەرزو مەحکەمەکانیەوەو قەڵا دامەزراوەکەیەوەو دانانی دەزگای بەرگری ئەو کاتە خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشەکە ئامادەکرد،[٢] ئەمەو لە ١٠ی قوربانی ٦٥٧ك/ نۆڤەمبەری ١٢٥٩ز مەغۆلەکان بەرەو حەلەب پێشڕەویان کرد، لە گوندێك بە ناوی (سلمية) دابەزین، ئینجا بەرەو دوو گوندی (حیلان)و (حاری) — کە سەر بە حەلەب بوون — داکشان، پاشان فیرقەیەکیان بەرەو حەلەب بەڕێکرد، سوارەی موسڵمانان کە لە ژمارەیەکی زۆری ڕەشەخەڵك پێکهاتبوو بۆیان دەرچوون لەسەر لوتکەکانەوە بەسەر مەغۆلەکانیاندا دەڕوانی، هەر هەموویان سواری وڵاخەکانیان ببوونو چاوەڕێی سوپای حەلەبیان دەکرد، کاتێك موسڵمانەکان بۆیان دەرکەوت سوپاکەیان زۆرە بەرەو شار ڕۆیشتنەوە، ئینجا (مەلیك معظم تورانشا) فەرمانی بەسەر سوپاکەیو هێزەکانی داداخۆیان لە نێو حەلەبدا دابمەزرێننو لە شار نەچنە دەرەوە.[٣] لە ڕۆژی دووەمدا هێزەکانی مەغۆل بەرەو حەلەب بەڕێکەوتن، کاتێك گەیشتنە خوارەوەی چیاکە، هێزێکی سوپای موسڵمانان بۆیان دابەزی، کە مەغۆلەکان بینیانن بە فرتوفێڵ تا لە شاریان دووربخەنەوە بەرەو دواوە گەڕانەوە، ماوەیەکی باشی ئەو ڕۆژە هێزەکەی حەلەب بەدوایان کەوت، ئینجا سوپاکەی مەغۆلو ئەو هێزانەشیان کە خۆیان لە بۆسەدا دامەزراندبوو لێیان گەڕانەوە، موسڵمانەکان پرتاو بەرەو شار گەڕانەوە، دوژمنیش بە دوایان دەکەویو هەڵیان دەنێ، ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانو خەڵکی عەوامی موسڵمان کوژران، مەغۆلەکان تا کۆتایی ئەو ڕۆژە بە دەورەی حەلەبدا هەڵسوڕانو شەڕیان کرد، ئینجا بەجێیان هێشتو پاش ئەمە بە صوڵحی ئەمان چوونە نێوی.[٤]

---

١ المختصر في اخبار البشر ٢٠١/٣، جهاد المماليك ص: ٨٩.

٢ النجوم الزاهرة ٢٠١/٣، جهاد المماليك ص: ٨٩.

٣ جهاد المماليك ص: ٨٩.

٤ النجوم الزاهرة ٧٥/٧_٧٧، جهاد المماليك ص: ٩٠.

### أ- خۆبەدەستەوەدانی ناچاری:

لە ٢ صفر ٦٥٨ك/يناير١٢٦٠ز يدا مەغۆلەكان بۆ جارێكی تر پەلاماری حەلەبیان دایەوە، ئەمجارە ڕێگاو شوێنی ئابلۆقەدانیان بەم شێوەیە گرتەبەر: خەندەكێكی بازنەییان بە بەرزی باڵای پیاوێك و پانایی (٤) باسك بە دەورەدا كێشا، ئینجا (٢٠) مەنجەنیقیان بەرەوڕوو دامەزراندو دەستیان بە بەردبارانكردنی شورەی شارو كونكردنی كرد، لە هەموو لایەكەوە هێرش كرا، ئەمەو لە ژێر ئەم بۆردومانە سەختەو هێرشە بەردەوامانەدا لە ٩ صفر ٦٥٨ك/يناير١٢٦٠ز يدا بە ناچاری خۆیان بە دەستەوەدا، هەر كە دەستیان بەسەردا گرت پەیمانیان شكاندو بە غەدرو خیانەت خەڵكێكی زۆریان لێ كوشتن‌و ژن‌و منداڵێكی زۆریان لێ گرتن‌و ماڵەكانیان لێ تالان‌و بڕۆ كردن، ئینجا بۆ ماوەی (٥) ڕۆژی تەواو بەربوونە وێزەی شارو دانیشتوانەكەی‌و خراپەیەكی زۆرو زەوەندیان ئەنجام داو ڕێگاوبان‌و كوچەو كۆڵانەكان لە تەرمی كوژراوان پڕ ببوون، گوتراوە: زیاتر لە (١٠٠) هەزار ژن‌و منداڵ لە حەلەبدا دیلكراوە، كەسێك لە دانیشتوانی ئەو شارە بە ساغی دەرنەچوو، جگە لەو كەسانەی پەنایان بۆ ئەو ماڵانە بردبێت، (ماڵی شهاب الدین كوڕی بازیاد، ماڵی علم الدین ی قیصر الموصلی، خانەقای زین الدین صوفی، كەنیسەی جولەكان) گوتراوە: بەهۆی ئەم شوێنانەوە زیاتر لە (٥٠) هەزار كەس لە كوژران ڕزگار بووە.[١]

### ب- ڕوخاندنی شورەو قەڵاو مزگەوتەكانی شار:

(مەلیك معظم تورانشا) بە خۆی‌و ژمارەیەكی زۆری دانیشتوانی شار پەنایان بۆ قەڵا برد، ماوەی مانگێك بە بەردەوامی گەمارۆی لەسەر توند كراو تەنگاو كران، بەهۆی خیانەتی خەڵكانێكی نێو سوپاكەی (مەلیك معظم تورانشا)، مەغۆلەكان توانیان كاری گەمارۆدانی قەڵا درێژە پێ بدەن‌و بە خاڵە لاوازەكانی سوپا ئاشنا بن‌و جەنگاوەرانی نێو قەڵا تووشی ڕۆكەوتن بن‌و بالانسی هیممەتیان دابەزێت، بەڵێ خیانەتی نێوخۆ كاری خۆی كردو لەگەڵ ئەوەشدا قەڵا قایم بوو بەڵام مەغۆلەكان بەهۆی ئەمەوە توانیان بە ئاسانی دەستی بەسەردا بگرن، پاش ئەمە هۆلاكۆ چووە نێو قەڵاوە، یەكسەر قەڵاو شورەو مزگەوتەكانی ڕوخاندن‌و باخ‌و بێستانەكانی سوتاندن‌و ئاداری بەسەر پاداری ئەو شارەوە نەهێشت‌و شوێنەكانی كۆركردنەوە، شاری حەلەب پێش هاتنی هۆلاكۆ بە قەشەنگترین شاری ولاتی شام حیساب دەكرا، بەڵام هۆلاكۆ كارەساتێكی بەسەردا هێنا، كە كەس دوای ئەمە بەقای نەدەكرد شار

---

١ السلوك للمقريزي، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٩٠.

بوو‌بێت، (مه‌لیك معظم تورانشا) له قه‌ڵا هاته ده‌ره‌وه — به قسه‌ی (مقریـزی) بێـت — بـه‌هۆی ته‌مه‌نی زۆره‌وه هۆلاکۆ به‌دڕه‌فتاری له‌گه‌ڵ نه‌نواند،[١] به دوور نازانرێت (مه‌لیك معظم تورانشا) له ماوه‌ی گه‌مارۆی قه‌ڵادا به خه‌ستی برینـدار بووبێـت، یـان تووشـی نه‌خۆشـیه‌کی کوشـنده بووبێت، یان به به‌ڵگه‌ی ئه‌وه که خـودی (مقریـزی) ده‌ڵـێ دوای چـه‌ند ڕۆژێـك (مـه‌لیك معظم تورانشا) مردووه، ئه‌وا هۆلاکۆ به نهێنی کوشتبێتی.[٢]

**ج ـ پاداشته‌کانی هۆلاکۆ بۆ هاوپه‌یمانه نه‌سرانیه‌کانی:**

هه‌ر که هۆلاکۆ ده‌ستی به‌سه‌ر حه‌ڵه‌بدا گرت نه‌یویست ئه‌م هه‌لـه‌ی بـه‌بێ پاداشـتدانه‌وه‌ی جوته هاوپه‌یمانه نه‌سرانیه‌کانی (هه‌یسومی مه‌لیکی یه‌که‌می ئه‌رمینیای بـچووك‌و بوهیمه‌نـدی شه‌شـه‌می مـیری ئـه‌نتاکیای خاچپه‌رسـت)ی لـه ده‌سـت ده‌رچـێت، ئـه‌م دوو نه‌سـرانیه بـۆ سه‌رگرتنی هێرش‌وپه‌لاماره‌کانی مه‌غۆل بۆ سه‌ر وڵاتانی ئیـسلام یارمـه‌تی هۆلاکۆیـان دابـوو، به‌شێکی له ماڵی تالانی پێشکه‌ش به (مه‌لیکی ئه‌رمینیا) کـردو هـه‌موو ئـه‌و ناوچـه‌و کۆشـك‌و ته‌لارانه‌شی پێدانه‌وه که پێشدا موسڵمانانی حه‌له‌ب لێیان زه‌وت کردبوون، به هه‌مان شێوه‌ی (هه‌یـسوم) هـه‌موو ئـه‌و خـاك‌و زه‌وی‌و زارانـه‌ی موسـڵمانان لـه ئیمـاره‌تی ئه‌نتاکیـه‌یان زه‌وتکردبوون، هۆلاکۆ ته‌سلیمی (بوهیمه‌ند)ی مه‌لیکی ئه‌و هه‌رێمه‌ی کردنه‌وه، (هه‌یسوم) لـه کـاتی داگیرکردنـی حه‌له‌بـدا شـادومانی خـۆی بـه سـوڵتاندنی (مزگـه‌وتی گـه‌وره‌ی حه‌لـه‌ب) ده‌ربڕی‌و به ده‌ستی خۆی ئاگری تێ به‌ردا.[٣]

بـه‌م جـۆره شـاری حه‌لـه‌ب بـه ده‌سـتی مـه‌غۆل ڕوخـا، ئـه‌وه‌ی میرانـی خاچپه‌رسـت‌و ئه‌باتیره‌ی بێزه‌نتی نه‌یانتوانی جێبه‌جێی بکه‌ن، هۆلاکۆ تـوانی جێبـه‌جێی بکـات، یـه‌کێك لـه قه‌ڵا هه‌ره مه‌زنه ئیسلامیه‌کانی داڕوخاند، ئه‌م شاره که جـوانترین شـاری وڵاتـی شـام بـوو، وێران کرا، هۆلاکۆ حوکمڕانێکی سه‌ر به خۆی له‌سه‌ر دامه‌زراند.[٤]

ڕوخـانی شـاری حه‌لـه‌ب —کـه تـا دوێنـێ مه‌ڵبه‌نـدی جموجۆڵـه جیهادیـه‌کانی دژی خاچپه‌رستان بوو—، کاریگه‌ری له‌سه‌ر دڵ‌و ده‌روونی موسڵمانان داناو تووشی ترس‌و تۆقان‌و دڵه‌ڕاوکێ هـاتن، زۆر لـه مـیره موسـڵمانه‌کان خۆیـان گه‌یانـده حه‌لـه‌ب‌و بـه مه‌به‌سـتی خـۆ به‌ده‌سته‌وه‌دان‌و دانی به‌ڵێنی گوێڕایه‌ڵی سه‌ردانی هۆلاکۆیان کرد، (مه‌لیك ئه‌شـره‌ف موسـای

١ السلوك، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٩١.
٢ السلوك، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٩١.
٣ تأريخ الدولة المغولية في ايران ص: ١٤١، عبدالسلام فهمي.
٤ جهاد المماليك ص: ٩٢.

ئەیوبی)ی حوکمڕانی پێشدای (حمص) – کە لە لایەن (مەلیك ناصر)ەوە لێخرابوو – لەنێو ئەو میرانە دەبینرا، هۆلاکۆ کردیەوە بە حوکڕانی (حمص)و لە لایەن خۆیەوە لەسەری تاپۆ کردو کردی بە ماڵی خۆی و نەوەو نەتیجەکانی.

کاتێك پاسەوانانی شاری (حارم) ڕایانگەیاند کە جگە لە سەرکردەی پاسەوانانی حەلەب تەسلیمی کەسی تر نابن، هۆلاکۆ ئەمەی بە سوکایەتی پێکردنی خۆی و پایەو مەقامی حیساب کردو–پاش داگیرکردنی – فەرمانی کۆکوژکردنی هەموو دانیشتوانەکەی و دیلکردنی ژن و منداڵەکانیانی دەرکردو پاش ئەوانیش دەستی بە کوشتنی هەموو پیاوانی پاسەوانی (حارم) کرد.[1]

**٤ـ دیمەشق:**

دوابەدوای ڕوخانی حەلەب، هۆلاکۆ چەند نوێنەرێکی خۆی بە ئەماننامەیەکەوە بەرەو شاری (دیمەشق) ناردن، نوێنەرەکان لە شەوی دوو شەممەی ١٠ صفر ٦٥٨ك/فبرایر ١٢٦٠ز یدا گەیشتن، ئەماننامەکە ـ کە بانگەشەی خۆبەدەستەوەدانی شاری تێدا کرابوو لە بەرامبەر چەپاڵەدانیان– دوای ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ بەسەر خەڵکی شاردا خوێنرایەوە.[2]

**أـ هەڵوێستی (بیبرسی بندقداری):**

لەم کاتە تەنگە تاویەدا ژمارەیەك لە گەورە پیاوانی دیمەشق، لە سەرووی هەمووشیانەوە (زین الدین الحافظي) بە پاساوی دوورخستنەوەی دیمەشق و دانیشتوانەکەی لەو ڕوخان و کوشتو بڕەی بەسەر حەلەبو دانیشتوانەکەیدا هاتووە ئامادەیان بە خۆبەدەستەوەدان و خۆسازاندن لەگەڵ مەغۆل و گوێڕایەڵی کردنی هۆلاکۆ کرد، بەڵام دانیشتوانی دیمەشق پشتگیری پێویستیان لەم ڕایە نەکردو بەڵکو ژمارەیەك گەورەپیاو[3] لە سەروو هەمووشیانەوە (رکن الدین بیبرس) بەرپەرچیان دایەوەو (رکن الدین) بەسەر (زین الدین)دا شیڕاندی و گوتی: ئێوە بوونە هۆکاری لەنێوچوونی موسڵمانان.

پێ دەچێ (مەلیك ناصر)یش لەسەر ڕاوبۆچوونی (زین الدین الحافظي) بوبێ، بۆیە هەندێك پیاوی بیبرس کە سەر بە تایەفەی (مەمالیکی بەحری) بوون، هەوڵیان دا (مەلیك ناصر) بکوژن و حوکمڕانی تری هیمەت بەرزو قسەڕۆیشتووی لەجێ دانێن و بتوانێ خەڵك بۆ جیهادی ڕێی خودا کۆبکاتەوەو لە گۆڕەپانەکانی جەنگو جیهادو بەرگری کردن لە ئیسلام و

---

١ المصدر نفسه ص: ٩٢.

٢ المصدر نفسه ص: ٩٣.

٣ المصدر نفسه ص: ٩٤.

موسڵمانانو بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمنکاری مەغۆلدا سەرکردایەتیان بکات، بەڵام (بیبرس) (دیمەشق)ی بەجێ هێشتو بە خۆیو تاقمێك لە تایەفەی مەمالیکی بەرەو غەززە بەڕێکەوت، لە لایەن میری غەززەوە بە جوانترین شێواز پێشوازی لێکرا، (بیبرس) نوێنەرێکی خۆی بۆ لای (سوڵتان مظفر قطز) ناردو داوای ئاشتبوونەوەو ئەمانی لێکردبوو، (قطز)یش لە ڕاستی خۆیڕا ئاشتەوایی لەگەڵ کردو چەند بەڵێنێکی پێدا، پاش ئەمە بیبرس بەرەو مصر ڕۆیشتەوەو چووەوە نێو دەستەی سەرکردایەتیەکەی (قطز)، لەمەولا (بیبرس) بوو بە یەکێك لەو گەورە پشتیوانانەی (قطز) کە نەخشەی جەنگی (عین جالوت)یان داڕشتو سەکردایەتی سوپای ئیسلامیان کردو ئەو سەرکەوتنە مەزنەیان تۆمارکرد کە هەرچی خەونو خەیاڵاتی مەغۆل هەبیوو تەفروتونای کرد.[1]

**ب ـ خۆبەدەستەوەدانی (دیمەشق):**

لەو کاتە دژوارەدا کە دیمەشق شینی بۆ دەگێڕدرا (مەلیك ناصر)و تاقمێك لە دەستوپێوەندەکانی (دیمەشق)یان بەجێ هێشتو بەرەو غەززە ڕۆیشتن، کۆمەڵێك گەورەو پیاوماقوڵی دیمەشق بە خۆیانو دەستو دیاری بە نرخو کلیلەی دەروازەکانی شارەوە چوونە خزمەت هۆلاکۆ و گوێڕایەڵیو گەردنکەچی خۆیان بۆ خستەڕوو و شاریان تەسلیم کرد، هۆلاکۆ فەرمانی بە (کیتۆبۆقا)ی سەرکردە کرد بەرەو دیمەشق بچێتو دانیشتوانەکەی تاقی بکاتەوە، دانیشتوان پێشوازیان لێکردو داوایان لێکرد چەپاڵەیان بدات، ئینجا نوێنەرەکانی خۆیان بۆ لای بارەگای هۆلاکۆ ناردن، بەم شێوازە مەغۆلەکان بەبێ گەمارۆدانو کوشتار چوونە نێو دیمەشقەوە، هۆلاکۆ تاقمەیەکی خۆی کردە حوکمڕانی شارو (٣) کەسی ئەوێشی دیاریکردنو کردنی بە چاوساغو یاریدەدەری پیاوەکانی خۆی.[2] بەڵام قەڵای دیمەشق لە مەغۆل یاخی بوو، ئەوانەی لەوێ خۆیان دامەزراندبوو تەسلیم بوونیان ڕەتکردەوە، لەم کاتەدا (مەلیك ئەشرەف)ی حوکمڕانی (حمص) بەخۆیو بە فەرمان نامەیەکی (هۆلاکۆ)وە گەیشتە دیمەشق، بە پێی ئەو فەرمان نامەیە (مەلیك ئەشرەف) پۆستی جێگری سەڵتەنەتی دیمەشقو هەموو وڵاتی شامی پێدراوە، ئاڵقەی ئابلۆقەی سەر قەڵا توند کرا، بۆردومانی مەنجەنیقەکان گەرمی کرد، هەندێك شوێنی قەڵا بە بۆردومانەکە داڕوخان، خەڵکی نێو قەڵا داوای ئەمانیان کرد، مەغۆلەکان چوونە نێویەوەو هەرچی خەزێنەی دیارو حەشاردراو هەبوو تاڵانیان کرد، زۆر شوێنی قەڵاکەیان ڕماندنو ژمارەیەکی

---

١ جهاد المماليك ص: ٩٥.

٢ جامع التواريخ٢/٣٠٧ـ٣٠٨، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٩٦.

زۆر بورجیان لێ ڕوخاندن، هەرچی چەكو ئامرازی جەنگی تێیدا دانرابوو وردو خاشیان كردن.[1]

**ج ـ خۆبەدەستەوەدانی (حەما):**

سەبارەت بە شاری (حەما)، (مەلیك منصوری دووەم)ی حوكمڕانی چووبووە دەرەوەی شار تا لەگەڵ (مەلیك ناصر) خۆی ساز بكات، كاتێك خەڵكی شار داگیركرانی حەلەبیان پێگەیشتو مەلیكیش دیار نەبوو، كۆبوونەوەو نوێنەرێكی خۆیان بۆ لای هۆلاكۆ بەڕێكردو داوای نواندنی سۆزو بەزەییان لێكردو شاریان بە دەستەوەداو ئەویش ئەمانی پێدان، چەند كاربەدەستێكی خۆی بەسەرەوە كردنە حوكمڕان، سەبارەت بە قەڵاكەی (حەما)ش، بە حوكمی بڵاوبوونەوەی ئەو كارەساتەی بەسەر حەلەبو دانیشتوانەكەیو قەڵاكەیدا هێنرابوو، زیاد لەمەش (مەلیك منصور)یش هەڵاتبوو، ئەمانە وایان لە سەرپەرشتیكارەكەی كرد بە پەلە قەڵاكە بە دەستەوە بدات،[2] پاش دەست بەسەرداگیرانی (حەلەبو دیمەشقو حەما)و هەرێمە هاوسێكانیان لە لایەن مەغۆلەكانەوە، دەست بەسەرداگرتنی تەواوی شارەكانی تری شام بوو بە بابەتی ڕۆژ، هەر كاتێك سەركردەی مەغۆلی شارێكی دەستنیشان كردبایە بە ئاسانی داگیر دەكرا،دیارە هەموو ئەمانە لە لایەكەوە بە هۆكاری هەموو ئەو كارەساتە سامناكو تۆقێنەرە دڕندانەی لە لایەن مەغۆلەوە بەسەر شامو دانیشتوانەكەیدا هێنراوە لە لایەكی تریشەوە بە هۆكاری ئەو هەموو دووبەرەكیو ناكۆكیانەی لە نێوان میرانی دەوڵەتی ئەیوبیدا بەرپابوو.

لەو كاتەدا هۆلاكۆ بە خاتری بەشداری كردن لە كۆنگرەی هەڵبژاردنی خانی نوێی مەغۆل لە حەلەب دەرچوو و بەرەو مەراغە گەڕایەوە، پێش ئەوەی بڕوا كاری تەواوكردنی زەوتكردنی وڵاتی شامی بە (كیتوبۆقا)ی سەركردەی سپارد، ئەویش دوای چەند هەفتەیەكی كەم ئەم كارەی تەواو كرد،[3] پێشدا ڕووی پەلامارەكەی لە (نابلوس) كرد، دانیشتوانەكەی هەوڵیاندا بەرپەرچی بدەنەوە بەڵام ژمارەیەكی زۆریان لێ كوژران، ئینجا لافاوی هێرشەكە بەرەو گۆشەو كەنارەكانی تری شام ڕۆی، تا گەیشتە دەوروبەری (غەززە)و (بەیت جبریل)و (صلت)و (بەعلبەگ)و (بانیاس)و شوێنی تریش، هەموو ئەو شوێنانەیان داگیركردن، دانیشتوانەكەیان كوشتن، بە گوێرەی توانا ژنو منداڵیان لەگەڵ خۆیان ڕەپێچەك دان، ئینجا

---

١ دول الاسلام للذهبي، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٩٧.

٢ المختصر ٣/٢٠١، جهاد المماليك ص: ٩٧.

٣ جهاد المماليك ص: ٩٧.

بەرەو دیمەشق گەڕانەوەو بەو تالآن و بڕۆیەی گرتبوویان دەستی دەسەڵاتی خۆیان پێ درێژتر کرد.[1]

**ت ـ هەڵوێستی نەسرانیان لە شام:**

دەت بەسەرداگرتنی شام لە لایەن مەغۆلەکانەوە زۆر بە خراپی بەسەر موسڵماناندا شکایەوەو زیانێکی گەورەی پێگەیاندن، پێش هەموو شتێك بە پەلە دەستیان بە ڕوخاندنی قەڵاو شورەکانی حەلەب و دیمەشق و حمص و حەماو بەعلبەگو بانیاس و تەواوی شارو مەڵبەندەکانی تر کرد، بەم ڕەفتارەیان ئامانجێکیان پێکا کە تا ئەو کاتە خاچپەرستە داگیرکەرەکانی پێش ئەوان نەیانتوانی بوو بیپێکن.[2]

مەغۆلەکان لە سەرەتای هێرش و پەلامارەکانیان بۆ سەر خۆرهەڵاتی نزیك هەواداری خۆیان بۆ ڕەگەزی مەسیحی نەستوری نیشاندا، پێش بەڕێکردنی سوپاکە: (مەنکۆخان) وەسێت بۆ (هۆلاکۆ)ی برای دەکات کە لە بڕیارو کاروبارەکانیاندا ڕاوێژ بە (دوقوزخاتوون)ی هاوسەری بکات، (دوقوزخاتوون) بە ڕەگەز مەسیحی نسطوری بوو، پێ دەچێ ئەمەی گوتمان باشترین بەڵگەی دەستمان بێ بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە، (دوقوزخاتوون) هەمیشە لە کەژاوەکەی هۆلاکۆدا بوو و پێکەوە سواردەبوون و دەڕۆیشتن، ئەو کاری لەسەر مێردەکەی کرد تا مەسیحیە شەرقیەکان لە دەورەی مەغۆل کۆبکاتەوە، وەك زانراوە نسطوریەکان لەنێو مەغۆلەکاندا ژمارەیەکی یەکجار زۆرن، بوو تا کار بەوە گەیشت خۆیان گەیاندە ئاستی سەرکردایەتی کردنی سوپاکەی مەغۆل، (کیتوبوقا)ی سەرسوپای هۆلاکۆ لە ڕەگەزی ئایمانی نسطوری بوو، کەواتە شتێکی ئاسایی و سروشتی بوو کە ئەم نسطوریانە برایەتی لەگەڵ تاقمە ئەرمینیەکان و یەعقوبیەکان و تایەفەکانی تری مەسیحیدا بکەن، کە بە ژمارە بونیان لە گەورە شارەکانی شام یەکجار زۆر بوو.[3] ئەم یەککگرتنە سەری کێشا بۆ ئەوە ڕەگەزی مەسیحی لە ئاستی سەرکردایەتی کردنی سوپا بەشداری خۆ پڕکێشکردنی نێو شارەکان بکات، کاتێك هۆلاکۆ بە خۆی و سوپاکەیەوە خۆی بەنێو شاری حەڵەبدا کرد، هەیسومی یەکەمی مەلیکی ئەرمینیاو بوهیمەندی شەشەمی میری ئەنتاکیەی زاوای هەیسومی هاوڕێ بوون، هەروەك چۆن دیمەشقی پایتەختی خیلافەتی ئەمەوی دوای تێپەڕینی (٦) سەدە بۆ یەکەمجار (٣) سەرکردەی مەسیحی لە خۆدا بینین: (کیتۆبۆقاو

---

١ اخبار البشر ٣/٢٠١، جهاد المماليك ص: ٩٨.

٢ المغول للعريني ص: ٢٤٨.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٨٤.

هەیسومو بوهیمەند) بە کەژاوەی وڵاخەکانیانەوە شەقڵیان بە نێوقەدی شەقامەکانی شاری دیمەشقدا لێدەدا.[١]

لە ڕاستیدا داگیرکردنی وڵاتی شام لە لایەن مەغۆڵەوە سروشتێکی خاچپەرستانەی بەخۆوە نیشان دەدا، دەڵێن کاتێك هۆلاکۆ وڵاتی جزیرەی داگیرکرد (جاشلیقی ئەرمەنی) هاتەلای و بەرەکاتی پێ بەخشی، کاتێك هەیسومی یەکەم بوو بە مەلیکی ئەرمینیای بچووك پەیوەندی لەگەڵ مەغۆلدا هەبوو و بە ناوی ئەوانەوەو بە ناوی بوهیمەندی شەشەمی میری (ئەنتاکیە)ی خاچپەرستی زاوایەوە قسەی دەکردن و بڕیاری دەدان، بۆیە ئا ئەم هێرشەی سەر شام سیفەتی هێرشێکی دووقۆڵی خاچپەرستی ئەرمینی – مەغۆلی خستەڕوو.[٢]

واقیعەن هەرەسی (٣) شارە گەورەکە (بەغداو حەلەب و دیمەشق) بە دەستی مەغۆل کارەساتێکی دڵتەزێن بوو و جیهانی ئیسلامی ئەو کاتی هەژاند، هەرەسی دیمەشق بە دەستی مەغۆل سەری کێشا بۆ ئەوە مەسیحیەکان هەڵگەڕانەوەو لووت بەرزی خۆیان ئاشکرا بکەن و بە بۆنەی ئەو کارەسات و موسیبەتەی بەسەر موسڵماناندا هاتووە شادی بگێڕن، (کیتۆبۆقا)ی سەرکردەی مەغۆلی دۆستایەتی مەسیحیەکانی دەکردو بەردەوام هاموشۆی کەنیسەکانی دەکردن، هەندێك لە مەسیحیەکان چووبوونە لای هۆلاکۆ فەرمانێکیان لە لا هێنابوو و تێیدا فەرمان بە کاربەدەستانی دەکات کە گرنگی بە مەسیحیەکان و کاروبارەکانیان بدەن، دوای ئەمە مەسیحیەکان دەچوونە هەر شارێکەوە فەرمانەکەیان بە دەستەوە دەگرت و خاچەکانیان بەرز دەکردەوەو هوتافیان بۆ بەرزبوونەوەو سەرکەوتنی دینەکەیان و شکستی ئیسلام دەکێشا، مەیان بە بەرگی موسڵمانان و دەرگای مزگەوتەکانیاندا هەڵدەپڕژاند، بە تۆبزی خاچیان بە دوکاندارە موسڵمانەکان هەڵدەواسی، هەر کەسێك بە قسەی نەکردبانایە سوکایەتیان پێ دەکردو بۆ خۆیان بۆیان هەڵدەواسی، لە نێو شەقام و کوچەو کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوەو خاچەکانیان بەرز دەکردنەوەو بە ناقوسەکانیان دەکێشاو زەنگیان بۆ (کەنیسە مریم) لێ دەدا، یەکێك لەوان هەر بە ڕۆیشتنەوە وتاری دەخوێندەوەو دینی مەسیحی بە گەورە دادەناو ڕەخنەی لە (دینی ئیسلام) دەگرت، بەهۆی بەردەوام بوونی ئەم جۆرە مەسیرانەو سوکایەتی کردن بە دینی پیرۆزی ئیسلام موسڵمانان تووڕەبوون و بەخۆو بە قازی و شاهێدحاڵەکانیانەوە بەرەو قەلا سەرکەوتن و سەردانی جێگری

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٤٨.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٤٢.

هۆلاکۆیان کرد، بەڵام وەڵامی سکاڵاکەی نەدانەوەو بە لێدانو سوکایەتی پێکردن لە قەڵایان وەدەرنان، جێگری هۆلاکۆ بایەخی زۆری بە نەسرانیەکان دەداو سەردانی کەنیسەکانی دەکردنو ڕێزی پیاوی هەموو مەزەبە جیاجیاکانی (مەسیحی) بە یەکسانی دەگرتن، لە بەرامبەر ئەمەدا موسڵمانان جۆشانو خرۆشانیان تێکەوت دەستیان بە تۆڵە سەندنەوەی موقەدەساتەکانیان کردەوەو هەستان ئاگریان لە کەنیسەی مریم بەرداو بەشێك لە کەنیسەی یەعقوبیەکانیان ڕوخاند.[١]

دەکرێت بڵێین ئەم یەکگرتنەی نێوان هێزەکانی مەغۆلو هێزەکانی مەسیحی شەرقی — کە زەوتکرانی وڵاتی شامو ڕوخانی قەڵاو شورەکانیو دەست درێژکرانی سەر موسڵمانانو موقەدەساتەکانی ئەو وڵاتەی لێکەوتەوە — یەکێك بوو لەو هۆکارە کاریگەرانەی هانی موسڵمانانی نێو خاکی مصری دا بە خۆیان ڕا بگەنو هەموو هێزو پێزی خۆیان یەك بخەنو پاشان نەفیرعامی جیهادی ئیسلامی موقەددەس لە بەرامبەر مەغۆلو هاوپەیمانەکانی ڕابگەیەننو سەرکەوتنە مەزنو یەکلاکەرەوەکەی جەنگی (عەین جالوت) بە دەست بێنن.[٢]

**٥ـ کۆتایی هاتنی سوڵتانی ناصری ئەیوبی:**

(مەلیك ناصر) واقی وڕمابوو و دەستەپاچە وەستابوو و ڕاوبۆچوونێکی بوێرانەی بەرامبەر ڕووداو و کارەساتەکان دەرنەدەبڕی، کاتێك سەربازو مەمالیکەکانی ئەم حاڵەیان پێوەبینی، بڕیاریاندا بە کوشتن بێ یان بە گرتن بێ لە پۆستی سەڵتەنەتی لابەرنو (مەلیك ظاهر غازي کوڕی عەزیز)ی برای — کە جوامێرێکی بوێر بوو — لەجێی دانێن،[٣] (مەلیك ناصر) هەواڵی پیلانەکەی پێگەیشت، شەو سەربازگەی بەجێ هێشتو بەسەر قەڵای دیمەشقی داداو مەمالیکی ناصریو پشتیوانەکانیان کە (مەلیك ظاهر غازي) یان لەگەڵ بوو بەرەو غەززە هەڵاتن،[٤] ئەم پیلانە سەرنەگرتووە بە هۆی ڕووداوە یەك لەسەر یەکەکانی وڵاتی شام دەنگێکی وای نەدایەوە جێگەی باس بێت، تەتار هەدایان نەدەداو لەسەر پەلامارەکانیان بەردەوام بوون، (مەلیك ئەشرەفی کوڕی موجاهید) بە ئاشکرایی پەیوەندی پێوە کردن، ئەوانیش حوکمڕانی (حمص)و دەوروبەرەکەیان بۆ گێڕایەوە، (مەلیك سعید کوڕی

---

١ جهاد المماليك ص: ١٠٢، البداية والنهاية ١٧/٣٩٨.
٢ جهاد المماليك ص: ١٠٢.
٣ السلوك للمقريزي ١/٥١٢، جهاد المماليك ص: ٧٤.
٤ العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية ٢/٧٤.

عبدالعزیز)یش، پاش ڕزگارکرانی لە زیندانی (بیرە) لە لایەن هۆلاکۆوە، پەیوەندی پێوە کردن، هۆلاکۆش حوکمڕانی هەرێمی (بانیاس)ی بۆ گێڕایەوەو قەڵای (صبیبة)شی دایەوە.[١]

(مەلیك ناصر) بڕیاریدا بەرەو باشور واتە وڵاتی مصر بکشێ، لە ڕێگادا سوپاکەی سەری لێ شێواو پەرتو بڵاو بوو، تەنها خەڵکانێکی کەمی بە دەورەوە مابوون، ڕێزو حورمەتی کەم ببۆوەو هەموو کەسێك بە چاوی تەماعەوە لێی دەگەڕا، ئەو بە حیسابی خۆی کە بە خۆیو ئەو سوپایەی لەگەڵیدا بوو بڕیاریدا بوو لە دیمەشقەوە بەرەو مصر بچێتو لەگەڵ (مەلیك مظفر قطز) یەك بگرێتو بە یەکدەست بەرپەرچی تەتار بدەنەوە، دیمەشقی بەجێ هێشتو سوپای تێدا نەهێشت، دانیشتوان لەسەر شوورەو دیوارەکان ڕاوەستابوونو جنێویان پێ دەدانو توکوو دوعایان لێ دەکردنو دەیانگوت: بۆ تەتارەکانتان بەجێ هێشتین، دەك خوا سەلامەتتان نەکات،[٢] (زین الحافظي)یش بۆ بەری دیمەشق پەڕیەوەو دەرگاکانی ماڵەوەی لەسەرخۆ داخستن، مەلیك ناصر بە دوایدا نارد بێتە لایو لەگەڵی کۆببێتەوە، بەڵام بە قسەی نەکردو نەچوو بۆ لای، پاشان (الحافظي) گەورەپیاوانی دیمەشقی کۆکردنەوەو قەناعەتی پێکردن دیمەشق تەسلیمی جێگرەکانی هۆلاکۆ بکەن،[٣] ناصر ڕۆیشتو (منصور محمد)ی حوکمڕانی (حەما)شی لەگەڵ کەوت، گەیشتە (نابلوس)و هێزێکی پاسەوانی بە دەورەوە دانا، کاتێك گەیشتە غەززە مەمالیکە هەڵاتووەکانی پەیوەندیان پێوە کردەوەو لەگەڵ (مەلیك ظاهر غازي) برای پێك هاتەوە، هەر لە غەززە هەواڵی داگیرکرانی نابلوسی لە لایەن مەغۆلەوە پێگەیشت، بەرەو (عەریش) ڕۆیشت، پەیامێکی بۆ (قطز) ناردو هەواڵی بارودۆخەکەی تێگەیاندبوو و داوای لێکردبوو بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی پەلاماری تەتەرەکان لەگەڵی کۆببێتەوە، بەڵام وەك دەردەکەوێ (قطز) وەڵامێکی شیفا بەخشی بۆ ناصر بەڕێ نەکردبێتەوە، بۆیە ناصر گومانی خراپی لەسەر خەڵکی مصر بۆ دروست بوو،[٤] کاتێك گەیشتە ناوچەی (قطیة)، ترسا بچێتە ناو خاکی مصرەوەو دەستگیر بکرێت)،[٥] بەڵام

---

١ المصدر نفسه ٢/٧٤.

٢ المصدر نفسه ٢/٧٤.

٣ اخبار الایوبیین ابن العمید ص: ٥١، العلاقات الدولیة ٢/٧٤.

٤ العلاقات الدولیة ٢/٧٥. نقلا عن تأریخ ابن خلدون.

٥ عقدة الجمان للعیني ٢/٧٥، العلاقات الدولیة ٢/٧٥.

گوتی کێ لە هاوڕێیانی حەزی لێیە با بچێ، (مەلیك منصوری محمد)و سەربازەکانی چوونە مصر و (قطز) لەگەڵیدا کۆبۆوەو لیوایەکی سەربازی دایەو چوونە نێو قاهیرەوە.[1]

بەڵام (مەلیك ناصر) واقی وڕمابوو و سەری لێ شێوابوو و نەیدەزانی چ بکات؟ ڕوو لە کوێ بکات؟ بیری کردەوە ڕوو لە حیجاز بکات، ئینجا بەرەو لای (کەرك- ئەردەن) بەڕێکەوت، لەوێ خۆی مەلاسدانبەلام جێگیر نەبوو، سوار بوو و بە بیاباندا ڕۆیشت، لە لای هەندێك عەرەبی دەشتەکیو ڕەوەند خۆی پەنادا،[2] یەکێك لە پاسەوانەکانی خۆی بە ناوی (حوسێن تەورداری کوردی) بە پاڵنەری تەماع یان وەرگرتنی پلەی بەرز لە لای تەتار، بەرەو لای یەکێك لە سریەسوپاکانی تەتار ڕۆیشت – کە لە خوارووی ئەردەنو فەلەستین بڵاوببوونەوە – و شوێنی حەوانەوەی (مەلیك ناصر)ی پێ ڕاگەیاندن، تەتار پەلاماری ناوچەکەیان داو هەر شتێکیان دەهاتە بەردەم، تەفروتونایان دەکردو خانوبەرەیان دەڕوخاندنو گەورەو بچووکیان بە یەکەوە دەکوشتنو، هێرشیان کردە سەر عەرەبە ڕەوەندەکانی ناوچەکەو خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتنو ژنو منداڵەکانیان بەتاڵان بردنو (مەلیك ناصر)یشیان قۆڵبەست کردو لەگەڵ (ظاهر غازي) برایو (عزیز محمد کوڕی یوسف)ی کوڕیو (اسماعیلی کوڕی شێرکۆ) بەرەو لای (کیبتۆقا)یان ڕەپێچەك دان، (کیبتۆقانوین)ی (ناصر)ی لە لای خۆی گیرنەکردو بەرەو لای هۆلاکۆی بەڕێکرد، (ناصر) بەخۆیو ئەوانەی لەگەڵیدابوون لە لای هۆلاکۆ جێگیر بوون،هەر کە هەواڵی دەرەنجامەکانی جەنگەکەی (عەین جالوت) بە هۆلاکۆ ڕاگەیەنرا – کە بە سەرکەوتنی موسڵمانانو شکستی یەکجارەکی (تەتار) کۆتایی پێهاتبوو –، هۆلاکۆ ناصری کوشت، ئینجا هاوڕێکانیشیان کوشتن، جگە لە (عزیز محمد کوڕی ناصر یوسف) – کە منداڵ بوو – کەسیان لە داخو تۆڵەی هۆلاکۆ دەرباز نەبوون، (عزیز) تا مرد لە لای تەتار بوو.[3]

---

١ المختصر ٢٠١/٣، العلاقات الدولية ٧٥/٢.

٢ البداية والنهاية ٢٣٣/١٣، العلاقات الدولية ٧٥/٢.

٣ العلاقات الدولية ٧٦/٢، شفاء القلوب ص: ٤٢٠.

## باسی دووەم: پێشەکیەکانی جەنگی (عەین جالوت)و بەڕێکردنی ڕووداوەکان:

لە ئەنجامی زەوتکرانی ولاتی شام لە لایەن مەغۆلو هاوپەیمانەکانی: ترسو تۆقانو دڵەڕاوکێ هەموو کونو قوژبنەکانی ئەو ولاتەی گرتەوە، دانیشتوان بە چاوی خۆیان ڕوخاندنو سوتاندنو کوشتوبڕی بە کۆمەڵی دڕندانەی مەغۆلەکانیان بینیبوو، زۆر ترسابوونو زراویان چووبوو، بە ناچاری بەرەو خاکی (مصر) هەڵاتنو لە سەرکردایەتیەکی لێوەشاوەو کاربەجێو بە جەربەزە دەگەڕان خۆیانو ماڵو منداڵو سەروەتو سامانیان لە چەنگ چەپەڵۆکی هێرشە دڕندەکانی مەغۆل بپارێزێت، سەرکردایەتیەك بەهێربێتو کۆتایی بە ناکۆکیو دووبەرەکیەکانیان بێنێتو لە ژێر یەك تاکە بڕیارو هەڵوێستی بوێرانەدا یەکیان خاتو تاقم تاقمێنە نەهێڵێتو هەموو لایەك لە ژێر یەك ئاڵادا ڕێکخاتەوەو پاشانیش گیانی جیهادو فیداکاری ئیسلامیان لە دەروونـدا ببوژێنێتەوەو چیائاسا بەڕووی ئەو پەلامارە سامناکە هەڵشاخێنو تارمایی وێرانکاریو کوشتو بڕی ئەو دڕندانە لەسەر ئاسمانی جیهانی ئیسلامی بڕەوێننەوە، لە واقیعدا هەموو شتێك لە ولاتی مصردا هەواڵی دەرکەوتنی هێزو دەسەڵاتێکی تازەی ڕادەگەیاند.[١]

## یەکەم: داگیرکردنی (مصر) ئامانجێکی ستراتیژی (مەغۆل) بوو:

هەر کەسێك تەماشایەکی ئاراستەی هێڵی هێرشەکانی تەتار بکات، بە تەواوەتی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە مصر لەبەر ئەم چەند هۆکارانە ئامانجێکی ستراتیژی مەغۆل بووە:

١- سیاسەتە فراوانخوازە ڕوونو ئاشکراکەی تەتار، ئەوان هێشتا لە داگیرکردنی ولاتێك نەدەبوونەوە نەخشەی پەلاماری ولاتەکەی دوای ئەویان دەدا، (مصر)یش ڕاستەوخۆ بەدوای (فەلەستین)دا دەهات.

٢- مانەوەی مصر وەك تاکە ولاتێکی بەهێزی هەڕەشەئامێز بۆ سەر هێمنایەتی تەتار بە تەنها لە جیهانی ئیسلامیدا، جگە لە قەڵا خۆڕاگرەکەی مصرو زۆربەی زۆری مەملەکەتو حکومەتو شارو شورەو قەڵا ئیسلامیەکانی جیهانی ئیسلام لەسەر دەستی ڕووخێنرابوون.

٣- گرنگ بوونی شوێنی جوگرافیو ستراتیژی (مصر): لە ڕاستیدا لە ناوەڕاستی جیهانی کۆندا چەقی بەستبوو و حوکمی بەسەر ڕێگاوبانە بازرگانیەجیهانیەکانی ئەو کاتدا دەکرد.

٤- مصر دەروازەی باکووری ئەفریقیایەو بە داگیرکردنی ئەوێ دەرگا بەرەو ئەفریقیا ئاوەڵا دەبێت، چونکە لەو کاتەدا ولاتی (مەغریب)ی گەورە - دوای ڕووخانی دەوڵەتی

---

١ العلاقات الدولية ٢/٧٦، شفاء القلوب ص: ٤٢٠.

(موحـــدین) — بـۆ چـەند دەوڵەتۆچـکەیەك دابـەش ببــوو و توانــای بەرەنگاربوونــەوەی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی نەبوو.

٥- ئەو هێزە مرۆییەی لە مـصردا پـەنگی خواردبـۆوەو ئـەو وزە شـاراوەی لـەو وڵاتـەدا پەسمەندە کرابـوو، ڕاکێـشانی هـەموو ئـەو موسـڵمانانەی لەبـەر مـەغۆل هـەڵاتبوون، هـەموو ئەمانە وایان لە مەغۆل کرد مصر بە سەرچاوەی ترسو دڵەڕاوکێی خۆی تەماشا بکات.

٦- زۆربوونی پایە ڕاگرەکـانی جموجـۆڵی جیهـادی سـەرکەوتوو: لـە (سـەرکردایەتیەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو، غیرەتی دینی، جەمبوونی هـەموو ئـەو زانـاو شـەرعزانانەی لەبـەر مەغۆل هەڵاتبوون)، مەغۆلەکان دەترسان ئـەم پایـە ڕاگرانـە پرۆژەیـەکی ئیـسلامی دارێـژنو جیهانی ئیسلامی لە ژێر چەپەڵۆکی داگیرکاری مەغۆل ڕزگار بکات.[1]

٧- هێنانــەدی ئــارەزووی داگیرکردنــی جیهــان بەگــشتی داوایــان لێ دەکـات دەوڵـەتی مـەمالیکی مـصر لـەنێو بـەرن، لـە لایـەکی تـرەوە بڕیـاری داگیرکردنـی مـصر، بڕیـارێکی ئیمپراتۆری مەغۆل بوو کـە بـە شـایەدی گـەورە ڕاوێـژکارەکانی لـە (قـەواقورم)ی پایتـەختی مەغۆل دەری کردبوو.

## دووەم: (سیف الدین قطز)و هەنگاوەکانی بۆ یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی ئیسلامی:

(سیف الدین قطز) بە تەواوەتی بۆی دەرکەوت کە مانەوەی دەوڵەتە لاوەکەی پەیوەسـتە بە تێپەڕاندنی ئەو تاقیکردنەوە قورسە کە خۆی لە بەرەنگاربوونـەوەی پرۆسـەی داگیرکـاری مەغۆلیـدا دەنـوێنێ بـۆ سـەر جیهـانی ئیـسلام، ئێـستاش لەسـەر سـنووری وڵاتەکـەی ئـەودا پێکۆڵی پەلامار دەکەن، دەرکی بەوەکرد کە پێویستە بیسەلمێنێ پیـاوی قۆنـاغی خۆیـەتیو پاڵەوانی گۆڕەپانەو شایستەی ئەو متمانەیە کە لە لایەن میرانـی مـەمالیکی مـصرەوە- دوای لێخستنی (مەلیك منصور)- پێی بەخشراوەو بۆ پۆستی مەلیکایەتی هەڵبژێردراوە.[2]

(قطز) لە پێناوی یەکڕیزی هێزەکانی ئیسلام لە بەرامبەر کێشەکەدا ئەم چەند هـەنگاوەی نان:

هـەنگاوی یەکـەم: کۆبوونەوەیـەکی بـە مـیرو سـەرکردەو زانـاو ڕاوێـژکارانی مـصر کـرد، تەوەری باسەکەیان لەسەر سەرکردایەتی کردنی ئەو هێزە سوپایە بوو کە بەر بە هێرشەکەی مەغۆل دەگرێت، دەرەنجام ئامادەبووان یەکدەنگ بوون لەسەر ئـەوە: (مـەلیك منـصور علـی

---

١ جهاد المماليك ص: ١٠٦، ١٠٥.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٠٧.

کوڕی موعیز ئایبەك)ی کەم تەمەن کەسێکی لاوازەو تین و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو مەترسیانەی نیە کە هەڕەشە لە دەوڵەتی مەمالیکی مصر دەکەن، لەبەر ئەمە بڕیاریاندا سوڵتانی منداڵ لە پۆستی سەڵتەنەت لابەرن،[1] (قطز) بە ئامادەبووانی گوت: من تەنها بە مەبەستی کوشتاری تەتار کۆبوونەوەم پێ کردوون، ـ نەك دەست بەسەرداگرتنی حکومەت، ئەمەش بەبێ هەبوونی مەلیکێکی بە دەسەلات نابێ، ئەگەر ڕۆیشتینە دەرەوەو ئەو دوژمنەمان تێکشکاند، ئەو کاتە با هەموو شتێك بە دەست ئێوەبێ و، کێتان پێ چاك بوو ئەو کەسە بکەنە مەلیك،[2] (قطز) توانی خەڵك لەسەر فکرەی جیهادو بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران کۆبکاتەوەو لە سەرووی ئەمەشەوە بە ڕاشکاوی گوتی پاش کۆتایی هاتنی جەنگ و شکاندنی دوژمن کاروبار دەخاتەوە بەردەستی خەڵك و حەزیان بە چارەی کێ هات با هەڵیبژێرن و بیکەنە سوڵتان، قسەکەی بەگشتی کردو دیاری کردنی سوڵتانی ئایندەی بە هیچ تیرەو تایەفەیەکەوە نەبەستەوەو تایبەتیشی نەکرد بە مەمالیکەوە.[3]

مێژووی ژیانی بەڵگەی ڕاست و دروستی ئەو نیازە پاکەی بوو کە گوتی: ئەو ئەوەندەی حەز بە سەرکەوتنی ئەم دینەو کوشتاری تەتار دەکات حەز بە دەستکەوتی سەڵتەنەت ناکات، خودای بالادەست سەرکەوتنی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر دەستی ئەو تۆمار کرد، خودا نەیکردووە بە باو سەرکەوتنی ئوممەت لەسەر دەستی کەسانی دووڕوو و گەندەڵکار تۆمار بکرێت، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ (یونس: ٨١). (قطز) ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم کۆبوونەوەیەدا کە زانایان و سەرکردەکانی کۆکردنەوە بە ڕەچاوکردنی ڕەوشت و بەها بەرزەکان دەستبەرداری ئەو ئیرادەو جۆش و خرۆشەی هەناوی و هۆکارەکانی سەرکەوتن و دیاریکردنی تیمی یاریدەدەرو لابردنی کەسانی نەشیاو نەبوو، (ابن بنت الاعز)ی وەزیر ـی هەواداری (شجرة الدر) ـی لابردو (زین الدین یعقوب کوڕی عبدالرفیع)ی ـ باوەڕپێکراوی خۆی ـی لەجێگە دانا، سپاردەکانی پاراستن و کاروبارەکانی بۆ خەڵکانی شیاو گێڕانەوە ـ، هەرچەندە (فارس الدین ئۆکتای بچووکی صالحی) ـی سەرۆك سوپا لە تەیافەی مەمالیکی بەحری ـ ی نەیاری بوو بە حوکمی ئەوە سەرکردەیەکی لێوەشاوەو بە تواناو ڕاستگۆو ئەمیندار بوو لەسەر پۆستەکەی خۆی هێشتەوەو بایەخی

---

١ المصدر نفسه ص: ١٠٥.

٢ قصة التتار ص: ٢٤٥.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٤٦.

تەواوی پێدا، (قطز) بەم سیاسەتە زیرەکانەی تـوانی مەمالیکە بەحریـەکان – کـە ئـاوارەی شامو تورکیا ببوون – بە لای خۆیدا ڕاکێشێتەوەو دڵنیایـان بکـات کـە هـیچ زیانێکیـان پـێ ناگەیەنێت، بێگومان ئەمەش سەر بۆ جێگیربوونی بـارودۆخی مـصر دەکێشێتو موسـڵمانان سوود لە خێروبێری ئەو هێزە سەربازیە دەگمەنە دەبینن کە خۆی لـە (مـەمالیکی بـەحری)دا دەبینێتەوە، لە لایەکی ترەوە (قطز) ژمارەیەك کەسی قۆڵبەست کردنو بەندی کردن کە کـە دەوری سەرۆکایەتی کردنی ئاژاوەیان دەگێڕاو بە نیاز بوون لە حکومەتەکـەی هەڵگەڕێنـەوە، (قطز) دەیزانی ئەگەر خەڵك بـە جـەنگو جیهـادەوە سـەرگەرم نـەکرێن، ئـەوا بـە خۆیانـەوە خەریك دەبن، لەبەر ئەمە، هەر کە لەسـەر کورسـی سـەڵتەنەتی مـصر دانیـشت فـەرمانی بـە (زین الدین)ی وەزیریو (فارس الدین ئۆکتای)ی سەرۆك سوپای کرد پێکەوە سوپا سـازکەنو ڕیزەکانی ڕێك بخەنو کەرەستەکانی جـەنگ ئامـادە بکـەن، بـەم شـێوەیە خـەڵك خۆیـان بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی دوژمـن ئامـادە کـرد، ئـەم هـەنگاوە بەشـداریەکی چـالاکی بـەهێزکردنی بارودۆخی نێوخۆی مصری کردو، خەڵکی بە جیهادەوە سەرگەرم کرد، سـوڵتان حوکمـەکانی شـەریعەتی ڕاپەڕانـدنو بـەرگری لـە وڵات کـردو مـشوری لـە کاروبـاری ڕەعێـتو پاراسـتنی بەرژەوەندیـەکانی خـەڵك خـواردو بەمـە بـارودۆخی نێوخـۆ جـێگیر بـوو و ڕیزەکـانی نێوخـۆ ڕێکخران، کەواتە ئەمە بە یەکەمین هەنگاوی هێنانەدی سەرکەوتن حیساب دەکرێت.[١]

هەنگاوی دووەم: لێبوردنی ڕاستەقینە:

(سوڵتان قطز) بڕیاری لێبوردنی گشتی – ڕاستەقینە – ی بۆ تێکڕای (مەمالیکی بـەحری) دەرکرد، لـە باسـەکانی پێـشدا چـۆنێتی سـەرهەڵدانی ئـاژاوەی نێـوان (مـەمالیکی بـەحری)و (مەمالیکی مـوعیززی)یمـان زانـی، سـەرەتای ئاژاوەکـە بـە کـوژرانی (فـارس الـدین ئۆکتـای) سـەرۆکی مـەمالیکی بـەحری لـە سـاڵی ٦٥٢ك/ دەسـتی پێکـردو (٦) سـاڵ درێـژەی کێـشا، بەرەبەرە ئاژاوەکە گەورەتر دەبوو و زیـاتر تەشـەنەی دەکـرد، دوابـەدوای کـوژرانی (مـەلیك مـوعیز عزالـدین ئایبـەك)و پـاش ئـەویش (شـجرة الـدر) ئاژاوەکـە گەیـشتە لوتکـەو، کـار بەوەگەیشت زۆرینەی مەمالیکی بەحریو لە سەرووی هەمووشیانەوە (رکن الـدین بیـبرس) – مصر بەجێ بێڵنو بەرەو شام ڕاکەنو لەوێدا بڵاوببنەوە، خەڵکانێکیان هانی میرانـی شـامیان دەدا مــصر داگــیر بکــەن، دوژمنایەتیەکــە تونــد بــوو و گەیــشتە ئەنــدازەی تەقینــەوەو پێکهەڵـشاخان، بـەلام کاتێـك (قطـز) چـووە سـەر کورسـی سـەڵتەنەتی مـصرو هەڵوێـستە

---

١ جهاد المماليك ص: ٢٤٨.

حەکیمانەکەی نواندو بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ مەمالیکی بەحری دەرکردو داوای لێکردن بۆ نێو ئامێزی وڵات و دەوڵەتەکەی خۆیان بگەڕێنەوە بارودۆخەکە ئاسایی بۆوە،[١] (قطز) توانی قنیات بە میرانی مەمالیکی بەحری نەیاری لە سەرووی هەموشیانەوە (بیبرس بندقداری) بکات لە شامەوە بەرەو مصر بگەڕێنەوەو لە ژێر ئاڵاکەیدا کۆببنەوەو هەرچی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوانیان هەبووە لەبیر خۆیانی ببەنەوە، (میرانی مەمالیکی بەحری) هەستیان بە دەستەپاچەیی (میرانی ئەیوبی شام) کرد لە بەرامبەر هێرشی مەغۆل و پاشان بەرەو مصر گەڕانەوە،[٢] (سیف الدین قطز) لەبەر ئەم چەند هۆیانە هەستی بە گرنگی ڕاکێشانی (رکن الدین بیبرس) کرد بۆ نێو ڕیزی سوپایەکەی:

أ- لێوەشاوەییەکی بەرز لە بواری جەنگدا، شارەزاییەکی پێویست لە بواری سەرکردایەتیدا، غیرەتێکی ڕەسەن لە بواری ئیسلامەتی و دینداریدا.

ب- بیرتیژی و زیرەکیەکی فراوان کەسایەتی بیبرس پێ دەناساند، (قطز) هەوڵی دەدا ئەم کەسایەتیە لە جیاتی ئەوە لە جەنگی نێوخۆداو لە دژی (مەمالیکی موعیزی) بەکاربهێنرێت، ئەوا چاک وایە لە بەرژەوەندیە باڵاکانی ئیسلامداو لە جەنگی بەگژداچوونەوەی تەتاردا بەکاربهێنرێت.

ج- هەواداری مەمالیکی بەحری بۆ (رکن الدین بیبرس)، (قطز) دەرکی بەم ڕاستیە کردبوو و دەیزانی کە ئەگەر مەمالیکی بەحری هەر وا بە ئاوارەیی بمێننەوە ڕۆژێك دادێ ڕۆژیان بێتەوەو لە دژی ڕاست ببنەوە، لەبەر ئەمە سیاسەتی حەکیمانە داوای لێ دەکا (بیبرس) بە تەواوی مەمالیکی بەحریەوە کەمەندکێش بکات و لەنێو ڕیزی سوپاکەیدا پلەوپایەیەکی بەرزی بداتێ و ڕێزو قەدری بگرێت و توانایەکانی بەکاربهێنێت، بەم شێوەیە دڵەکان جێگیر دەبنەوەو ترسی دوژمنایەتی نێوخۆ دەرەوێتەوەو ئەو هێزو پێزو وزە زۆرە پەرت و بڵاوە کۆ بکرێتەوەو لە باتی ئەوە لە جەنگی لاوەکی و نێوخۆدا بە هەدەر بدرێت، ئەوا لە جەنگی بەرەنگاربوونەوەی تەتاردا سەرف بکرێت.

لەبەر ئەمە بیرس لەسەر بانگهێشتەکەی (قطز) بەرەو مصر بەڕێکەوت، (قطز) بەڕێزو حورمەتەوە پێشوازی لێکرد، لە وەزارەتخانە دانیشاندو هەرێمی (قەیلوب)و دەوروبەرەکەی

---

١ قصة التتار ص: ٢٤٩.

٢ جهاد المماليك ص: ١٠٦.

لەسەر تاپۆ کردو وەکو میرو سەرکردەیەکی پێشکەوتوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ نواندو دوای ئەمە کردی بە پێشەنگی سوپاکەی.

ئێمە لێرە تێبینی چەند سیفەتێکی سەرکردایەتیانەی (قطز) دەکەین، (لێبوردن لە کاتی دەست ڕۆیشتندا، دانانی خەڵك لە جێگای خۆیاندا، فیقهێکی سیاسی حەکیمانە، بە خەمبوون لە یەکێتیو یەکڕیزی)، (سیف الدین قطز)بەم سیاسەتە حەکیمەی توانی سوود لە وزەو تواناکانی مەمالیکی بەحری ببینێتو سوپاکەی خۆی بەهۆی ئەوانەوە بەهێزتر بکات،[1] ئەو دەروازەکانی وڵاتی مصری لە ڕووی هەموو ئەو ئاوارانەی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی کردنەوە کە لە ئەنجامی هێرشو پەلامارەکانی مەغۆل بەرەو ئەو وڵاتە داکشابوون، لەنێو ڕاکردووەکاندا: چەند کۆمەڵە خەڵکێکی خوارەزم دەبینرانو (سیف الدین قطز) پێشوازی لێکردن، چەند کۆمەڵە خەڵکێکی (شام)یش کە لە نێویاندا (مەلیك منصور)ی حوکمڕانی (حەما) دەبینرا،[2] هەروەها خەڵکانی تریش.

هەنگاوی سێهەم: هەوڵدان بۆ پێکهاتن لەگەڵ دەوڵەتی (ئەیوبیان):

ئەو کاتە پەیوەندی نێوان مەمالیکو ئەیوبیان زۆر گرژ بوو، بەڵکو دوای ڕوخانی بەغدا (سوڵتان ناصر)ی ئەیوبی میری (دیمەشقو حەلەب) داوای لە تەتار کرد بە مەبەستی داگیرکردنی مصر کۆمەکی سەربازی بۆ ڕەوان بکەن، بەڵام (سیف الدین قطز) هەموو هەوڵو تەقەلاکانی لە پێناوی قەلاچۆکردنی ناکۆکیو ناخۆشیەکانی نێوان خۆیو میرانی شام خستەگەڕ، هەوڵی دەدا یەکێتی لەنێوان (شامو مصر)دا دروست بکات، یان لانی کەم میرانی شام بێ لایەن بکاتو نێوانی مەمالیکی مصرو مەغۆل چۆڵ بکەنو لە پشتەوەڕا بەرخەنجەریان نەدەن، (قطز) زۆری هەوڵدا تا لەگەڵ مەلیك ناصر پێك بێت، پێشنیاری کرد کە ئەو با هەر مەلیك بێتو سوڵتانو براگەورە بێتو خۆشی برا بچووکەو شوێنکەوتووی جەنابیان بێت، ئینجا (قطز) بۆی ڕوون بۆوە کە مەلیك ناصر گومانی لەو یەکێتیە تێروتەواوە پێشنیارکراوەو مەسەلەی چوونە مصر هەیە، بۆیە ئەمجارەیان بە شێوازێکی تر بۆی چوو، پێشنیاری بۆ کرد کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەتار دەیەوێت سوپای بە کۆمەك بۆ بنێرێت، چونکە تێکشکانی تەتار بەرژەوەندی هاوبەشی هەردووکلای تێدایەو ئەگەر یەکێتی نێوانیشیان دروست نەبێت ئەم ئامانجەیان بێتەدی هەر شتێکی باشە، (قطز) بەوپەڕی ڕێزو

---

١ قصة التتار ص: ٢٥٣.

٢ جهاد المماليك ص: ١٠٦.

حورمەتەوە گوتی: ئەگەر هەڵتبژاردم لە خزمەتت دام، ئەگەر كەسێكی تریشت بۆ سەركردایەتی سوپای بەرەنگاربوونەوەی تەتار هەڵبژارد ئەوا منیش بەخۆم و سوپاكەمەوە بە هاوارتەوە دێم و دێمە بەردەمت و بە پێوە ڕادەوەستم، ئەگەر متمانەشت بە من نیە و پێت خۆش نیە بێم، سوپاكەمت بۆ دەنێرم و بۆ خۆت بە ئارەزووی خۆت كەسێكیان بە سەرەوە دابنێ.[1]

بەڵام ناصر یوسف وەڵامی هیچ كامێك لەم بانگەوازانەی (قطن)ی نەدایەوە و ماڵماڵۆكێنەی بەسەر یەكماڵی و یەكێتیدا هەڵبژارد، ئەنجامی ئەمە چ بوو؟: (ڕووخانی حەلەب و دیمەشق، بە دیلگیرانی مەلیك ناصر و پاشان كوژرانی دوای جەنگی عەین جالووت)، (قطن) تەنها بە مەلیك ناصر وازی نەهێنا، بەڵكو پەیوەندی دیبلۆماسی بە تەواوی میرانی ئەیوبی وڵاتی شامەوە كرد و نوێنەری خۆی بۆ لا ناردن، میر منصوری میری (حەما) وەڵامی دایەوە و سوپاكەی پەیوەندی بە سوپاكەی (قطن)ەوە كرد، بەڵام (میر موغیس عومەر)ی میری (كەڕەك)ی ئەردەن بێلایەنی هەڵبژارد، پێش ئەمە دووجار هەوڵی داگیركردنی مصری دابوو، بەڵام هەردووك جار (قطن) هێرشەكانی تێكشكاندنەوە، (ئەشرەف ئەیوبی)ی حوكمڕانی (حمص)یش بە هیچ شێوەیەك وەڵامی (قطن)ی نەدایەوە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە تەتارەوە كرد و پشتیوانی لێ كردن، (هۆلاكۆ)ش حوكمڕانی هەموو وڵاتی شامی دایە تا بەناوی تەتارەوە حوكمی بگێڕێت، دواهەمین میری ئەیوبیان (مەلیك سعید حسن كوڕی عبدالعزیز)ی حوكمڕانی (بانیاس) بڕای بەبڕ هاریكاری (قطن)ی نەكرد، بەڵكو بە خۆی و سوپاكەیەوە چووە نێو ڕیزی سوپای (تەتار)ەوە و لە داگیركردنی وڵاتانی ئیسلامیدا پشتگیری لێ دەكردن، بەم شێوەیە (قطن) توانی (مەلیك منصور)ی حوكمڕانی (حەما) بە خۆی و سوپاكەی مەلیك ناصر بە لای خۆیدا ڕاكێشێت و بەرەبەرەش سەربازانی شامی پەیوەندی بە سوپاكەیەوە بكەن، بەڵام (مغیث عمر) حوكمڕانی كەڕەك خۆی لە ڕووداوەكان دوورەپەرێز كرد.[2]

هەنگاوی چوارەم: تاقیكردنەوەی خاچپەرستان:

(مەلیك سیف الدین قطن) دەترسا لە كاتی هەڵایسانی چەخماخەی شەڕ خاچپەرستانی كەناری شام پەیوەندی بە مەغۆلەوە بكەن، بۆیە بڕیاری دا پێش ئەوەی بچێتە گۆڕەپانی جەنگەوە و بەرەنگاری مەغۆل ببێتەوە لە هەڵوێستیان حاڵی بێ، لەسەر ئەم بنەمایە

---

١ قصة التتار ص: ٤٥٥.

٢ قصة التتار ص: ٢٥٨.

نوێنەرایەتی مصر بەرەو عەکا بەڕێکەوتو داوای لە خاچپەرستان کرد ڕێگا بە سوپای ئیسلام بدەن بە وڵاتەکەیاندا تێپەڕێتو چشیان پێویست بوو لە خوردو خۆراك پێیان بفرۆشن، لە ڕاستیدا خاچپەرستەکان پاش ئەوەی بە چاوی خۆیان مەغۆلیان بینی هێرشی کردە سەر شاری (صیدا)و تاڵانی کرد ڕقو کینەو بێزرانی خۆیان لە بەرامبەردا نەدەشاردەوە، ئەمە لە لایەك لە لایەکی تریشەوە کارە قێزەونو دڕندانەکانیانو کوشتارە کۆمەڵکوژەکانیان وای لێکردن دۆستەکانیشیان تا بە خاچپەرستەکان ڕادەگات متمانەیان پێ نەکەن، لایەکی تری مەسەلەکەش ئەوەیە کە خاچپەرستان پەیوەندیەکی لە مێژینەیان بە شارستانیەتی ئیسلامیەوە هەیەو هۆگری موسڵمانان بوون، لە ئەنجامی ئەمانەدا لەسەرەتادا ئامادەیی هاریکاری سەربازیان بۆ (سوڵتان قطز) نیشان دا، بەڵام سوڵتان سوپاسی ئەم هەڵوێستەی لێکردنو پەیمانی لێ ستاندن کە نە کۆمەکی بکەنو نە لە دژیشی بوەستن.[1]

بەم شێوە (سوڵتان قطز) توانی ڕەزامەندی خاچپەرستان وەربگرێت تا سوپاکەی بە خاکی کەناراوی شامدا هاموشۆ بکاتو لە لای ئەوانەوە پارێزراو بێتو لە زۆربەی ئاڕاستەکانەوەو لەم ساتەوەختە تەنگەبەرەدا ئاستەنگەکانی سەر ڕێگای بۆ تەخت بێتو مەترسیەکانی تێکهەڵچوون لە سوپاکەی دوور بخاتەوە.[2]

**هەنگاوی پێنجەم: ئامادەکردنی سامانێکی زۆر:**

خەرجی ئامادەسازی زۆری پێدا دەویست، سازکردنی سوپاو خەرجی کێشانی بە شێوەیەکی پێویست، چاکردنەوەی پردو قەڵاو شورە ڕووخاوەکان، ئامادەکردنی کەرەستەکانی جەنگ بە شێوەیەکی پێویست، پەسمەندەکردنو داکردنی خۆراکی پێویست بۆ گەلی لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئابلۆقەدران لە لایەن دوژمنەوە، وڵات لەنێو تەنگژەی ئابوریدا گێژی خواردبوو، کاتەکەش نە وەختی پێنجیەکی زەکاتە نە وەختی دەیەکەکەیەتی، تەتار گەیشتونەتە غەززەو لەسەر دەروازەی مصر ڕاوەستان، دەوڵەت پێویستی بە سەروەتو سامانە، (سیف الدین قطز) مەجلیسی ڕاوێژکارانی کۆکردەوە، بانگهێشتی میرو سەرکردەو زانایانی ئاینی لەسەرووی هەموشیانەوە سوڵتانی زانایان شێخ عیززەدینی کوڕی عبدالسلام کرد، دەستیان بە وتوێژ کرد، سەرەتا سەبارەت بە سازکردنی کەتیبە سەربازیەکان گفتوگۆیان کرد، (سیف الدین قطز) پێشنیاری کرد کە باج بۆ ئەم مەبەستە سەرانە لەسەر خەڵك دانێین.[3]

---

١ السلوك ١/٤٣٠، جهاد المماليك ص: ١٠٨.

٢ جهاد المماليك ص: ١٠٩.

٣ قصة التتار ص: ٢٨١.

بەڵام شێخ عیززی عبدالسلام خۆی لە پێشنیارەکە بواردو گوتی کە ئەو بە دوو مەرج نەبێت پەسندی ناکات، فتواکەی بەم شێوەیە دەرکرد: هەرکات دوژمن تەقەی لە دەرگای وڵات دا، بەرپەرچدانەوەی‌و شەڕ لەگەڵ کردنی لەسەر هەموو خەڵکی جیهانی ئیسلامی واجب دەبێت، جائیزیشە بۆ هاریکاری کردن‌و چەکدارکردنی جەنگاوەرەکان یارمەتی‌و کۆمەکیان بۆ لە گەل وەربگیرێت، بەڵام بەو مەرجەی: هیچ شتێك لە زێڕو زیوو پارەو چەك‌و زین‌و شمشێرە زێڕ کفتکراوەکان لەنێو بەیتولماڵەدا نەمابن‌و کۆتاییان پێهاتبێت‌و بەکار هاتبن، ئێوەش واتە سوڵتان‌و میرو سەرکردەو وەزیرەکان هەرچی هەتانە لە موڵك‌و ماڵ‌و کەرەستە بۆ ئەو مەبەستەی بفرۆشن‌و هەر یەکێك لە ئێوە با ئەسپەکەی‌و چەکەکە بۆ خۆی بێڵێتەوەو، لەگەڵ خەڵك یەکسان بێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك جائیز نیە پارەو سامان لە خەڵکی وەربگیرێت‌و سەرکردەکانیش ماڵ‌و سامان‌و کەرەستەکانیان مابێت،[1] شێخ عیززی عبدالسلام ئاشکرای کرد دانانی سەرانە لەسەر ڕەعیەت جائز نیە، لەو حاڵەتەدا نەبێت کە وەزیرو میرەکان لەگەڵ خەڵکی گشتی لە پارەو ساماندا یەکسان بووبن، سەرەتا سوپا لەسەر حیسابی سەروەت‌و سامانی میرو وەزیرەکان ساز دەکرێت، ئەگەر بەشی نەکرد ئەوا لێرەدا بە ئەندازەی سازکردنی سوپاکە نەك زیاتر لە ڕووی دابینکردنی خۆراك‌و کەرەستەکانی جەنگەوە جائزە سەرانە لەسەر گەل دابنرێت.[2]

(سیف الدین قطز) فتواکەی شێخی بە ئاسانی وەرگرت‌و لە خۆیڕا دەستی پێکردو هەرچی دارو نەداری هەبوو فرۆشتی‌و ئینجا فەرمانی بە وەزیرو میرو سەرکردەکانیشی کرد ئەم کارە بکەن، هە هەموویان بە سنگێکی فراوانەوە گوێڕایەڵیان کرد، هەرچی هەیان بوو لە ماڵ‌و پارەو خشڵی ژنەکانیان هێنایانە بەردەم (قطز)و یەکە یەکە سوێندیان خوارد کە جگە لەمەندە سامانە هیچی تری نەشاردۆتەوە، کاتێك هەموو ماڵەکە فرۆشراو کرایە پارەو لە دابینکردنی پێداویستیەکانی سوپادا سەرف کرا، زۆر کەم بوو و بەشی نەکرد، لەبەر ئەمە (قطز) بڕیاری دا دەبێت هەر کەسێك لە دانیشتوانی وڵاتی مصرو قاهیرەی پایتەخت، گەورە بێ یان منداڵ بێ پیاو بێ یان ژن دینارێك ببەخشێت، کرێی مانگێکی لە موڵکە بەکرێ دراوەکان وەرگرت، زەکاتی پێشوەختی ساڵانەی لە دەوڵەمەندو بازرگانەکان وەرگرت، سێ یەکی ماڵی لە تورکە نیشتەجێکان وەرگرت، کرێی مانگێکی لە باخەوان‌و شوان‌و گاوانەکان

---

١ بدائع الزهور ١/٣٠٢، جهاد المماليك ص: ١١٠.
٢ قصة التتار ص: ٢٨٣.

وەرگرت، کۆی ماڵی کۆبۆوە خۆی زیاتر لە (٦٠٠) هەزار دینار دا،[١] بەم شێوازە نایابەو بەبێ ستەمو تۆبزیو لێستاندنو ماڵێکی حەڵاڵو زەلاڵ کۆبۆوە.[٢]

ئەم کارە مەزنە بوو بە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنە شکۆدارەکەی عەین جالووت خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ (محمد: ٧)، بێگومان سەرکەوتنی موسڵمانان تەنها بە هۆی جێبەجێکردنی شەریعەتی خوداوە دێتەدی، ئەو سوپا موسڵمانەی خۆی لە جێبەجێکردنی شەرع بەدوور دەگرێت لە سەرکەوتن دووردەکەوێتەوە، کاتێك (سیف الدین قطز) گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری فتوا شەرعیەکەی (شێخ عیززی کوڕی عبدالسلام)ی کرد، هەموو خەڵك بەم کارە سەرسام بوونو مەعنەویاتیان بەرز بۆوەو تیغی هیمەتی جیهادو گیانبازیو ماڵبەخشینیان لە ڕێی خودادا تیژبۆوە، دەکرێت بڵێین ئەم فتوا شەرعیەی شێخ عیززی عبدالسلام لە سەردەمێکدا دەرکرا کە جیهانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی خیلافەتی شەرعی تێدا پێچرابۆوە، بێگومان فتواکە ئەو دەورەی خۆی گێڕا کە ئەگەر خیلافەتی ئیسلامی هەبوایە دەبوایە ئەو بیگێڕابایە، کاتێك (خیلافەت) دەسەڵاتی ڕۆحیو مەعنەوی هەیە، بێگومان فتواکەی شێخیش بە هەمان شێوە دەسەڵاتی ڕۆحیو مەعنەوی خۆی بەسەر (سوڵتان قطز)دا سەپاندو ئەویش بە هۆیەوە توانی ڕەزامەندی دانیشتوان مسۆگەر بکات لەسەر پێدانی ئەو سامانەی کە بە بڕیار لەسەریان دانراوەو پێیان وابوو ئەمە واجبێکی شەرعیەو دینە پاکەکەیان لەسەری فەرزکردون، بۆیە دەبێ بە گەرمو گوڕیو چالاکانە جێبەجێی بکەن.[٣]

شێخ عیززی عبدالسلامو زانایانی مصر جەماوەریان هاندەدا جیهاد بکەنو لە ڕێی خودا بجەنگن، شێخ ئامۆژگاری یەکەیەکەی میرو حوکمڕانەکانی دەکردو دڵو دەروونی دەخرۆشاندنو ئیمانەکەیانی بێدار دەکردنەوە، بۆیە هەرچی هەیان بوو لە پێناوی خودادا بەخشیان، کە خەڵك ئەمەیان بینی کێبڕکێی بەخشینیان دەکرد، ماڵو سامانێکی زۆر کۆبۆوە، خۆیان سازو بازکرد چەكو چۆڵیان کۆکردنەوە، سەربازگەکانی مەشقو ڕاهێنان لە هەموو شوێنێك کرانەوە، شارو شارۆچکەو گوندەکان بە هوتافی (الله اکبر) دەلەرزانەوە، هەموو موسڵمانێك حەزی دەکرد خێرا بگاتە گۆڕەپانی جەنگ.

---

١ بدائع الزهور ١/٣٠٥، جهاد المماليك ص: ١١٠.

٢ الايوبيون بعد الصلاح الدين ص: ٤٣٩، للصلابي.

٣ جهاد المماليك ص: ١١٠.

تەماشا ! زانایانو میرانی مەمالیك لە بەرەنگاربوونەوەی تەتاردا بوونە تەواوكەری یەكتری، كەواتە ئەم كارەی ئەوان بایەخدارەو پەندی گرنگی لێ وەردەگیرێت.[١]

## سێهەم: نامەی (هۆلاكۆ) بۆ (سیف الدین قطز):

هۆلاكۆ نامەیەكی بۆ سوڵتانی مصر نارد، پڕبوو لە هەڕەشەو تۆقاندن، تێیدا دەڵێ: لە (خانی گەورە)ی شاهەنشای خۆرهەڵاتو خۆرئاواوە: بەناوی تۆ ئەی (الله)ی ڕاخەری فەرشی زەمینو بەرزكەرەوەی كۆڵەكەی ئاسمان: با ئەو (مەلیك مظفر قطن)ە بزانێ: كە لە نەژادی ئەو كۆیلانەیە لە ترسی شمشێرەكانی ئێمە هەڵاتونو پەنایان بۆ ئەو هەرێمە بردووەو لە نازو نیعمەتەكانی دەخۆنو بە هۆی دەسەڵاتیانەوە كێیان مەبەست بێت دەیكوژن، پاش ئەمە: با (مەلیك مظفر قطن)و تێكڕای میرانی دەوڵەتەكەیو دانیشتوانی وڵاتی مصرو دەوروبەری بزانن: ئێمە سەربازانی خوداین لەسەر زەمینەكەیدا. لە ڕقی خۆی دروستی كردووین، هەر كەسێك ئەو لێی تورە بێت ئێمەی بەسەردا زاڵ دەكات، جا پێش ئەوەی فرمێسكی چاوتان بسڕنو پەنجەی پەشیمانی بگەزنو هەڵەكانتان بەسەر خۆتاندا بشكێنەوە، خۆتانو كاروبارتان بە دەستەوە بدەن، چونكە ئێمە پەرۆشی كەسێكمان نیە كە دەگریاو بەزەییمان بە كەسێكیشدا نایەتەوە بپاڕێتەوەو بلاڵێتەوە، بیستوتانە ئێمە وڵاتانمان گرتنو پاكسازیمان كردنو زۆرینەی بەندەكانیشمان كوشتن، جا ئێوە هەڵاتننتانت لەسەرەو ئێمەش لەسەرمانە بە دواتان كەوین، كام خاك لە خۆتان دەگرێتو كام ڕێباز دەربازتان دەكاتو كام وڵات پەناتان دەدا؟، كەس لە شمشێری بڕندەمان دەربازی نابێتو لەبەر سامو هەیبەتی ئێمە خۆ ڕاناگرێت، ئەسپەكانمان خۆشڕەونو پێشدەدەنەوە، تیرەكانمان تیژنو هەموو شتێك دەسمن، شمشێرەكانمان دەڵێی بریسون، دڵەكانمان وەكو شاخ ڕەقن، ژمارەمان بە قەد لمو زیخە، قەڵاكان ئێمەیان پێ ناگەڕێتەوە، بەرپەرچی سوپاكان سودیان نیە، توكو دوعاكانتان لە دژی ئێوە قبوڵ نابن، ئێمە حەرامتان خواردو لە قسەكردنیش ڕاناوەستن، خیانەتو لە بەرامبەر بەڵێنو پەیماندا كردووە، سزادانو سەرپێچیتان لەنێودا بڵاوبۆتەوە، كەواتە موژدەی سەرشۆڕیتان لێ بێ ﴿فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾، ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾، هەر كەسێك داوای جەنگمان لێ بكات پەژیوان دەبێتەوە، هەر كەسێك داوای ئەمانمان لێ بكات پارێزراو دەبێت،

---

١ المسلمون في التبعية الى القيادة والتمكين، الدكتور عبدالحليم عويس ص: ١٢٢ـ١٢٥.

جا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری فەرمانو مەرجەکانمان بن ئەوا ئێمە چ مافێکمان هەبێ ئێوەش دەتانبێو ئێمە چ ئەرکێکمان لەسەر بێت ئێوەش لەسەرتان دەبێت، ئەگەر سەرپێچیش بکەن لەنێودەچن، جا بە دەستی خۆتان خۆتان لەنێو مەبەن، هەر کەس ئاگادار کرایەوە بەهانەی نامێنێ، لەلای ئێوە چەسپاوە ئێمە کافرو بێباوەڕین، لەلای ئێمەش چەسپاوە ئێوە لاڕێو تاوانبارن، بێگومان ئەو زاتە ئێمەتان بەسەردا زاڵ دەکات کە خاوەنی فەرمانە ئەندازە بۆ گێراوەکانو حوکمە تەگبیربۆکراوەکانە، بە لانی ئێمەوە زۆرتان بۆدە، دەسەلاتدارتان داماوە، مەلیکەکانتان بەبێ سەری کزەوە ڕێگای هاتنە لای ئێمەیان نیە، جا زۆر مەڵێن، پێش ئەوەی جەنگ ئاگرەکەی هەڵکاتو گڕو گڵپەکەی هێرشتان بۆ بێنێو هیچ حیسابێکی پۆستو پایەو دەسەلاتتان لە لای ئێمە نەمێنێو کارەساتی بتانتاسێنێتو وڵاتتان بە زەبرو زەنگمان کەسی تێدا نەمێنێت خێرا بنو دەستوبرد وەلاممان بدەنەوە، ویژدانمان بەکارهێنا کە ئەم نامەمان بۆ ناردنو ئاگادارمان کردن، تا لە خەوی غەفڵەت بە خەبەر بێن، جگە لە خۆ بەدەستەوەدانی ئێوە هیچ مەبەستێکی ترمان نیە، سڵاو لە ئێمەو ئێوەو ئەوەش شوێن (هودا) دەکەوێتو لە دەرەنجامەکانی گەڕانەوە دەترسێتو گوێڕایەڵی خودای مەلیکی بەرزو مەزن دەکات.

ألا قل لمصر هُلاونٌ[١] قد أتى بحدّ سيوف تُنضى وبواتر
يصير أعز القوم منا أذلة ويُلحق أطفالاً لهم بالأكابر[٢]

**١ـ ئەنجومەنێکی ڕاوێژگاری جەنگی:**

نامەکە لە جێی دواهەمین بەربەرەکانێ بوو بۆ دواهەمین سەرکردەی ئیسلامی چارەنووسی جیهانی ئیسلامیو شارستانیەتەکەی کە بەرو ڕەنجی سەدە دووروودرێژەکان بوو، هەر هەمووی خۆی خستبووە ژێر ڕۆشنایی ئەو هەڵوێستەی کە بڕیاربوو لە لایەن ئەو سەرکردایەتیەوە بڕیاری لەسەر بدرێت، هەموو بۆچوونەکان بە خاتری سەختی ڕووبەڕووبوونەوەو ناچاری سەردەم ئاماژەیان بۆ خۆبەدەستەوەدانو چۆکداران دەکرد....

بەلام سەرکردە هەڵکەوتووەکان بە جوڵانەوەیەکی کەمی نەخشە بۆ داڕێژراو و تێڕوانینێکی ئامانج هەنگێو ڕووبەڕووی بەربەرەکانێکەرەکانی مێژوو دەبنەوەو بەسەر مەینەتی وەیشومەکانیدا تێدەپەڕنو سەرکەوتووانە بەسەریدا زاڵ دەبن، بەم وەلامدانەوە

١ السلوك ١/٥١٥، ٥١٤، هلاون: ناسناوێکی هۆلاکۆ بوو.
٢ المصدر نفسه ١/٥١٥، أبطال ومواقف ص: ٤٤١.

ڕاستو دروستەیان بازی گەورە لە مەیدانی کرداروو بە ئەنجام گەیشتن دەدەن،[١] (سیف الدین قطز) نامەکەی خوێندەوە، بانگهێشتی میرو سەرکردەکانی کردو مەسەلەکەی بۆ خستنەڕوو و ئەم گفتوگۆیە ڕوویدا:

(قطز): ڕاتان چیە؟

(ناصر الدین قمیری): هۆلاکۆ زیاد لەوە کە نەوەی (جەنگیزخان)ە، ناوبانگیو سامو هەیبەتی خۆشی حەوجێی بە ڕوون کردنەوە نیە، ئەو وڵاتەی لە سنووری چینەوە تا سەر سنووری مصر درێژ بۆتەوە هەمووی لە ژێر چەپۆکی ئەودایە، خۆ ئەگەر بچینە لایو داوای ئەمانی لێ بکەین نە ئەنگیەو نە شورەییە، بەڵام ژەهر خواردن بە ڕێگای خۆتەفرەدانو پێشوازی کردنی مەرگ دوو شتن عەقل حوکمیان لەسەر نادات، ئەو مرۆڤێکە جێگەی متمانە نیە، هەرگیز دەستی لەسەر سەربڕینی خەڵك ناپارێزێت، پەیمانو بەڵێنەکانی ناباتە سەرو خیانەتکارە، ئەو پاش پێدانی ئەمان کتوپڕ خەلیفەو ژمارەیەکی زۆری سەرانو زانایانی بەغدای کوشتن، ئەگەر بچینە لای هەمان چارەنووس چاوەڕێمان دەکات.

(قطز): بارودۆخەکە ئاوایە، تەواوی هەرێمەکان دیاربەکرو ربیعەو شام پڕن لەو کارەساتانە، وڵات لە بەغداوە تا ڕۆم ڕوخاوو وێرانەیە، هەرچی تێدابوو لە مرۆڤ و کشتوکاڵ لەنێو برا، ئەگەر ئێمە بۆیان بچینو جەنگیان لەگەڵ بکەینو بەرپەرچیان بدەینەوە، ئەوا لەمەولا مصریش وەکو تەواوی وڵاتەکانی تر وێران دەبێت، پێویستە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی کە وڵاتەکەمانی دەوێ یەکێك لەم (٣) ڕێگاچارە هەڵبژێری:

(ئاشتی، جەنگ، کۆچڕەوی)، هەرچی کۆچڕەویو دەرچوون لە نیشتیمانە مەحاڵەو ناکرێت، چونکە جگە لە مەغریب هیچ پەناگەیەکی تر نیە، نێوانی مصرو مەغریبیش ماوەی زۆرە.[٢]

قمیری: هەروەها هیچ بەرژەوەندیش لە ئاشتەوایی کردنو سازشکردنیاندا نیە، چونکە متمانە بە پەیمانەکانیان ناکرێت.[٣]

چەند میرێك: ئێمە تواناو برستی بەرەنگاربوونەوەی ئەوانمان نیە، بەڵام ڕات لەسەر چیە ئەوە دەکەین.

---

١ دراسات تأريخية، عماد خليل ص: ٨٤.

٢ سيف الدين قطز قاهر المغول، نورالدين خليل ص: ١١٢.

٣ المصدر نفسه ص: ١١٤.

(قطز): ڕام وایە هەر هەموومان بەرەو ڕووی جەنگ بچین، ئەگەر سەرکەوتین ئەوە بە ئاوات و مەبەستی خۆمان دەگەین، ئەگەر شکاشین ئەوا خەڵك سەرزەنشتمان ناکات.

ظاهر بیبرس: بە ڕای من نوێنەرەکان دەکوژین، دەڕۆین و نەخشەی کوشتنی (کتبغا)ی سەرکردەیان دادەڕێژین، ئەگەر سەرکەوین یان ژێر کەوین ئەوا لە هەردووك حاڵەتدا بەهانەمان بڕیوە.

میرانی ئامادەبوو بەکۆی دەنگ پشتگیری ئەم ڕایەیان کرد، ئینجا لەسەر (قطز) بوو بڕیاری کۆتایی دەر بکات، ئەویش بە فیعلی دەری کرد.[1]

**٢ـ نەفیر عام:** لەم ساتەوەختەدا (قطز) ویستی هەرچی دوودڵی و دڵەڕاوکێ هەیە سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل ڕیشەکەنی بکات، فەرمانەکانی خۆی بەسەر والی هەرێمەکانی (مصر) داداان سوپا ڕێکخەن و خەڵك بۆ جیهادی ڕێی خوداو سەرخستنی دینی محمد رسول الله (ﷺ) هان بدەن، داواشی لێ کردبوون هەر سەربازێك خۆی لە جیهاد دزیەوە بە تۆبزی بینێرن و ئەگەر خۆشی حەشاردا بەر شوڕکەداری بدەن، بە خودی خۆی بەنێو هەرێمەکاندا گەڕا تا گەیشتە (صالحیة)و لەوێ هەموو سوپاکە بە تەواوەتی کۆبۆوە، لێرەدا سەربازگەلی شام کوردو عەرەب و تورکمان و نەتەوەی تریش پەیوەندیان پێوە کردن، ئەم یەکانگیریەی سوپای ئیسلام لە ١٥ی شەعبانی ٦٥٨ك/ یولیو ١٢٦٠ ز یدا بوو،[2] هەر لێرە (صالحیة)دا (قطز) بانگهێشتی میرەکانی کردو سەبارەت بە چۆنیەتی بەڕێکردنی سوپا بەرەو جەنگی مەغۆل کۆبوونەوەی پێکردن، پێ دەچێ لەم ساتە سەختەدا ترس و دڵەڕاوکێ بەسەر هەندێك میردا زاڵ بووبێت لە ڕۆیشتنە دەری پەشیمان کردبنەوە، ئەمە وای لە (قطز) کرد بەوپەڕی گەرموگوڕی و حەماسەتەوە پێیان بڵێ: هۆ میرانی موسڵمانان ئێوە سەردەمانێکی دووردودرێژ سامانی بەیتولماڵتان دەخوارد، ئێستاش غەزاتان پێ ناخۆشە، ئەوا من بەڕێ دەکەوم، کێ جیهاد هەڵدەبژێرێت با لەگەڵم بێت، کێش هەڵی نابژێرێت با بەرەو ماڵی خۆی بگەڕێتەوەو خودا پێی ئاگادارە، هەموو ئەو تاوانانەی دەرهەق بە خاك و ناموسی موسڵمانان ئەنجام دەدرێن لە ئەستۆی ئەوانەدایە کە خۆیان دوا دەخەن.[3]

لە بەرامبەر ئەو هەموو عەزم و ئیرادە بەهێزو پتەوەی (قطز) بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل نیشانیداو پاش ئەمەش سوێند دانی ئەو میرانەی کە لەگەڵیدا هاوهەڵوێست و

---

١ دراسات تأريخية ص: ٨٥.

٢ السلوك، نقلا عن جهاد المماليك ص: ٨٥.

٣ المصدر نفسه ص: ١٢٠.

هاوڕابوون و دەرکردنی فەرمانی بەڕێخستنی سوپاکان بەبێ گوێدانە چۆنیەتی بارودۆخەکە و دەربڕینی دوا قسەی سەبارەت بە دەرچوون: من بە خودی خۆم هێرشیان دەکەمە سەر و خۆ دەکەم بە نێویاندا، بەڵێ لە بەرامبەر نواندنی مەردایەتیەکەی (قطز)دا، هێندەی نەخایاند میرە نەیارەکانیش هەڵوێستی ئەویان نواند، هەر هەموو بڕیاریان دا بە یەکڕیزی دەربچن و موسڵمانان لە وەیشومەکانی داگیرکاری مەغۆل ڕزگاربکەن.[1]

**٣ـ کوشتنی نوێنەرەکانی هۆلاکۆ:**

یەکەم کاری (قطز) لە دژی مەغۆل ئەنجامی داو تەپڵی جەنگی پێ لێدا ئەمە بوو: بانگی نوێنەرەکانی هۆلاکۆی کردن و بە ڕەقی و توندوتیژی پێشوازی لێکردن، ئینجا قۆڵبەستی کردن و هەر یەکێك لەوانی لەبەر یەکێك لە دەروازەکانی (قاهیرە) ڕاوەستاند و لە گەردنیدا، بەڵام نوێنەرێکیان منداڵ بوو و نەیکوشت و خستیە ڕیزی کۆیلەکانی خۆیەوە، ئینجا کەللەسەرەکانی بەسەر دەرگای (زوەیلە)وە هەڵواسین، ئەم کەللە سەرانەی مەغۆل بۆ یەکەمجار بوو بەسەر دەرگای (زوەیلە)دا هەڵواسران.[2]

دیارە (قطز) نوێنەرەکانی بە جەنگاوەر حیساب کردون و پێی وابووە هیچ پاساوێك لە گۆڕێدا نیە ڕێگای کوشتنیان لێ بگرێت، چونکە مەغۆلەکان لە شارەکانی سەمەرقەند و بوخاراو بەغداو حەڵەب و دیمەشق و تەواوی شوێنە داگیرکراوەکانی تری جیهانی ئیسلامدا خەڵکانێکی زۆری بێ چەك و لاشەڕیان لە ژن و منداڵ و پیرو... هتد کوشت کە لە ژماردن نەدەهاتن، لە لایەکی تریشەوە ئەم نوێنەرانە قسەی ڕەقیان کردن و بێ ئەدەبیان نواند و فیزیان بەسەر (قطز)و دەوروبەرەکەیەوە لێدەدا، ئامانجی هەڵواسینی کەللە سەرەکانیشیان بەسەر دەرگای سەرەکی قاهیرەوە، بەرزکردنەوەی مەعنەویاتی خەڵك و ئاشکراکردنی جەنگ لە دژی تەتارو ئاگادارکردنەوەیان کە ئێستا ئەوان ڕووبەڕووی نەتەوەیەك دەبنەوە کە زۆر جیاوازن لەو نەتەوانەی تا ئێستا پەلاماریان داون، بێگومان ئەمە کاریگەریەکی خراپ ئەگەر کەمیش بێ لەسەر دڵ و دەروونی تەتاردا دەنێت و ترس و بیمێکیان بۆ دروست دەکات، دەمێنێتەوە بڵێین: ئامانجی سەرەکی کوشتنی نوێنەرەکانی هۆلاکۆ لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە بە هیچ شێوازێك لەمەولا بیر لە چارەسەری ئاشتی کێشەکە ناکرێتەوە و خۆیان بەوپەڕی تێروتەواوی بۆ جیهاد ئامادە دەکەن، خۆ دوای کوژرانی نوێنەرەکان ئەگەر موسڵمانانیش

---

١ المصدر نفسه ص: ١٢٠.

٢ تاريخ الدولة المغولية في ايران ص: ١٤٤، جهاد المماليك ص: ١٢٠.

بیانەوێ بە ئاشتی مصر تەسلیمی تەتار بکەن، ئەوا تەتار ئەمەی قبوڵ نیە، ئەمە ئیجتیهادی (قطز)و میرەکانی بوو سەبارەت بە کوشتنی نوێنەرەکانی هۆلاکۆ، بەڵام ئەمە پێچەوانەی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامە، چونکە نوێنەران ناکوژرێن، نە هی موسڵمانان نەهی بێباوەڕان، نە هی مورتەدو هەڵگەڕاوەکانیش ناکوژرێن.[1]

پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەم بابەتەی بۆ ڕوون کردوینەوە، (عبدالله ی کوڕی مسعود دەڵێ: (ابن النواحة)و (ابن أثال) نوێنەری (مسیلمە) بوونو هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، ڕووی تێکردنو پێی فەرموون: شایەدی دەدەن کە من پێغەمبەری خودام؟ گوتیان شایەدی دەدەین (مسیلمە) پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئیمانم بە خوداو پێغەمبەرەکەی هێنا، ئەگەر نوێنەرم بکوشتایە ئەوا ئێوەم دەکوشت،[2] عبدالله ی کوڕی مەسعود قسە لەسەر فەرموودەکە دەکاتو دەڵێ: سوننەت ئاوا هاتووە نوێنەران ناکوژرێن.[3]

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر حەرام بوونی کوشتنی نوێنەرانی بێباوەڕان، ئەگەر قسەی کوفریشیان لەبەر دەم ئیمامو تێکڕای موسڵمانان کرد هەر ناکوژرێن،[4] ئەمەی (سیف الدین قطز) ئەنجامی دا پێچەوانەی حوکمەکانی شەریعەت بوو و تێروتەواویش بەس هی خودای باڵادەستە.

## چوارەم: ڕۆژی لێکهەڵاواردن:

### ١ـ سەرەتاکانی پێکهەڵشاخان:

دوای تەواوکردنی ئەم ئامادەسازیانە، سەرە هاتە سەر ئەوە (سوڵتان قطز) کاتو شوێنی ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆل هەڵبژێرێت لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ (قطز) بە خاتری ئەنجامدانی ئەم جەنگە یەکلاکەرەوە ڕێو شوێنێکی ستراتیژی تازەی گرتۆتەبەر، چونکە ئەگەر حوکمڕانانی وڵاتانی جیهانی ئیسلام هەر لە دەوڵەتی خوارەزمیەوە تا دەگاتە خاکی فەلەستین بە نەخشەو فیکرەی خۆ مەڵاسدانو خۆ دامەزراندنی نێو قەڵاکانیانو شارەکانیانەوە پابەندبوونو چاوەڕێیان دەکرد داخوا کەی مەغۆلەکان دەگەنەجێو بەرپەرچی بدەنەوە، ئەوا ئێستا (سوڵتان قطز) پەندی وەرگرتووەو دەرکی ئەو ڕاستیە کردووە کە شێوازی بەرگری سوودی نیەو بە ڕای ئەو چاکترین شێواز ئەوەیە دەبێت سوپای

---

١ قصة التتار ص: ٢٧٨.
٢ مسند احمد، وسنن ابي داود، نقلا عن قصة التتار ص: ٢٧٩.
٣ قصة التتار ص: ٢٧٩.
٤ نيل الاوطار للشوكاني نقلا عن قصة التتار ص: ٢٧٩.

ئیسلام بۆیان بچێته دەرەوەو پێش ئەوەی قاچ بنێنە نێو خاکی مصرەوە بە گژیاندا بچنەوە، بۆ ئەم مەسەتە ناوچەیەکی لەبارو گونجاوی لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی دیاری کرد ئەویش ناوچەی (عەین جالووت)ی نێو خاکی فەلەستین بوو، شوێنی (عەین جالووت) گۆڕەپانێکی تەخت بوو چیا بەسەریدا دەنۆڕیّو لەو ناوچە کەناریانەوە نزیك بوو کە خاچپەرستان حوکمیان تێدا دەگێڕا،[١] کەواتە هەڵکەوتنی ناوچەکە بەم شێوەیە لە هەموو بارودۆخێکداو لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا هاریکاری هێزەکانی دەکات، لە حاڵەتی پێکهەڵپڕژانی ڕاستەوخۆدا جەنگ لەنێو گۆڕەپانە تەختەکەدا دەبێت، لە حاڵەتی ناڕاستەوخۆشدا چیاکە پەناگەیەکی باشە بۆ تیرهاوێژەکان تا بە ڕێکوپێکترین شێوە ئەرکی خۆیان ڕابپەڕێنن، هەروەها هەڵبژاردنی ئەم ناوچەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل هاندەرێکی کاریگەری دەبێت بۆ ئەو تاقمە شامیانەی ئاوارەی مصر ببوون‌و ئێستاش لەگەڵ سوپاکەی مەمالیك گەڕاونەتەوەو هانیان دەدا لە پێناوی گەڕانەوە بۆ خاك‌و زێدی نیشتیمانی خۆیان بەوپەڕی قارەمانانە خۆیان لەنێو جەنگەکەدا بتوێننەوە، بە تایبەتیش لێرەداو لەنێو ڕیزی سوپاکەدا چەند سەرو میرێکی ئەیوبی بەدی دەکران، (مەلیك قطز) بەڵێنی پێدابوون هەر کە مەغۆلیان لە خاکی شام بەدەرنا، ئەوا ئیمارات‌و حوکمڕانیەکانی خۆیان بۆ دەگێڕێتەوە، هەروەها (قطز) مانگی ئۆغستۆس (ئابی) بۆ جەنگەکە دیاری کرد کە کاتێکی زۆر گەرمەو بە نیسبەت تاقمە مەغۆلیەکان کە لە بیابانی مەنغۆلیای ساردو وشك‌و برینگەوە هاتوون تا ڕادەیەکی زۆر دژوارە،[٢] و تا ئێستا باریان بەو کەش‌و هەوا گەرمەی فەلەستینەوە نەگرتووە کە لەو وەرزەدا تین دێنێت‌و کاریان تێ دەکات‌و لە ئاستی جموجۆڵە سەربازیەکانیان دادەبەزێنێ.[٣]

**٢ــ بەڕێکەوتنی سوپای موسڵمانان:**

(سیف الدین قطز) بە پەلە کۆبوونەوەیەکی بە میرەکان کرد، هانیدان جەنگ‌و جیهاد بکەن‌و کارەساتی هەرێمە داگیرکراوەکانی ئیسلامی بەبیر هێنانەوە،[٤] پێی گوتن: ئەی موسڵمانان: بیستوتانە چ کارەساتێکی سامناك لە کوشتن‌و سوتاندن‌و ڕوخاندن‌و تاڵان‌و بڕۆ گرتن‌و بردنی ژن‌و منداڵ بەسەر دانیشتوانی وڵاتاندا هاتووە، هەر یەکێك لە ئێوەش ماڵ‌و

---

١ الروض الزاهد لابن عبدالظاهر ص: ٦٤، جهاد المماليك ص: ١١٦.
٢ تاريخ الدولة المغولية في ايران ص: ١٢، جهاد المماليك ص: ١١٦.
٣ جهاد المماليك ص: ١١٦.
٤ المصدر نفسه ص: ١٢١.

منداڵو خێزانو شەرەفو ناموسی هەیە، زانیویشتانە تەتار دەسەڵاتی ڕەشی خۆی بەسەر شامدا کێشاوەو ئاینی ئیسلامی زەبوون کردووە، جوامێرانو غیرەتمەندان پەیوەندیان بەم کاروانە جیهادیەوە کردووەو دەیانەوێت ئیسلام سەرخەن، ئەی بەندەکانی خودا: پێویستە بە باشترین شێوە جیهاد بکەنو بەڕووی دوژمنانی خودادا هەڵشاخێن، ئەی نەتەوەکەم: بە نیازێکی پاکو خاوێنەوە جیهاد لەڕێی خودادا بکەن، بازرگانیەکی بە قازانجە، منیش یەکێکم لە ئێوە، ئەوەتا ئێستا منو ئێوە لە نێوان دوو دەستی ئەو پەروەردگارەداین کە هەرگیز ناخەوێتو هیچ شتێکی لێ بزر نابێتو کێش ڕادەکات لە دەستی دەرناچێت، لەو کاتەدا ژاوەژاوی میرەکان بە گریانەوە بەرز بۆوەو هەر هەموویان سوێندیان خوارد کە یان دەبێت ئەم تارماییە بڕەوێتەوە یان نابێت کەسیان بمێنێت، لەو کاتەدا سوڵتان (میر رکن الدین بیبرس)ی بە خۆیو تاقمە سەربازێکەوە بە خێرایی وەکو پێشەنگی سوپا گەورەکە بەڕێکرد.[1]

**٢ـ جەنگی (غەززە):**

پێشەنگی سوپای مەمالیك بە سەرکردایەتی (میر رکن الدین بیبرس بندقداری) بەرەو فەلەستین بەڕێکەوت، لە شەعبانی ٦٥٨ك/ یولیو١٢٦٠ز گەیشتە (غەززە)، ڕاستو چەپ لە هێزە مۆڵخواردووەکەی مەغۆلیان داو شکستێکی تاڵیان دەرخوارد دان، لێرەدا مەغۆلەکان بۆیان دەرکەوت کە ئێستا خەڵکانێك لە نێو موسڵماناندا ماون دەتوانن بە پێی نەخشەی سەربازیو بوعدی ستراتیژی بجوڵێنەوەو لە پێناوی پاسەوانیکردنو بەرگری کردنی دینو خاكو شەرەفو ناموسیاندا چەكو شمشێر هەڵبگرن، ئەم جەنگە بە نیسبەت موسڵمانانەوە گرنگترین جەنگ بوو، موسڵمانەکان بە چاوی خۆیان دەیانبینی تەتارەکان چۆن ڕادەکەن، ئەو دەنگۆیەی لەو سەردەمەدا بڵاوببۆوەو دەیگوت: (کێ پێی گوتی تەتار شکاون باوەڕی پێ مەکە) ماوەی بەسەرچوو، جەنگی غەززە کاریگەریەکی ئیجابیو باشی لەسەر سوپای ئیسلام داناو کاریگەریەکی سلبیو خراپیشی لەسەر سوپای تەتار دانا،[2] بەم سەرکەوتنە غەززە بوو بە موڵکی موسڵمانان، بەم شێوەیە جەنگی غەززە بە یەکەمین جەنگی موسڵمانان دادەنرێت کە تێیدا بەسەر مەغۆلدا سەرکەوتن، دەکرێت بڵێین: ئەم سەرکەوتنەی بە نسیب موسڵمانەکان بوو، هانیدان بەرەو باکوور هەڵکشێنو لە ناوچەیەکی لەبارتر بگیرسێنەوەو لەوێدا واتە (عەین جالووت) چالاکانەتر ڕووبەڕووی مەغۆلەکان ببنەوە، لە لایەکی ترەوە ئەو

---

١ نزهة الانام في تأريخ الاسلام ص: ٢٦٣.

٢ قصة التتار ص: ٣٠١.

شکستەی بەسەر هێزە تەتارەکەی غەززەدا هاتو میر (بایدار)ی مەغۆلی سەرکردایەتی دەکرد، لە لایەن (کتبغا)ی سەرکردەی مەغۆلیەوە — کە تا گەیشتنی سوپاکەی مەمالیك بۆ (عەین جالوت) ڕۆکەوتبوو — بە چاوی بایەخ پێدانو حیساب لەسەر کردن تەماشا نەکرا، هەروەها ئەم سەرکەوتنە بوو بە یەکێك لەو هۆکارانەی خاچپەرستەکان وادار بکەن داکۆکی لەسەر دۆستایەتی کردنی موسڵمانان بکەنەوەو لە ڕێی یارمەتیدانو ئاچوخ کردنی ڕێگاوبانی ناوچەکەیانەوە بۆ پێدا تێپەڕینی سوپای مەمالیك بەرەو فەلەستین ئەمە بسەلمێنن،[1] کاتێك (سیف الدين قطن) لە غەززەوە بەڕێکەوتو ڕێگای کەناری گرتەبەرو بە شاری (عەکا)دا تێپەڕی — کە لەو ڕۆژەدا بە دەست فەرەنگەوە بوو — کاتێك لە دوورەوە بینیان بە خۆیانو دەستو دیاریانەوە بە پیریەوە چوونو میوانداریان لێکردو لەگەڵ پاشاکەیان بە یەك گەیشت، پێشنیاریان کرد کە بە هێزێکی سەربازیەوە پشتگیری بکەن، بەڵام سوڵتان بە نەرمو نیانی ڕەفتاری لەگەڵ نواندنو گوتی کە پێویستی بە کۆمەکی سەربازی ئەوان نیە، بەڵام پەیمانی لێ وەرگرتن کە نە لە دژی بنو نە کۆمەکیشی بکەن، پێی گوتن: (بە خودای گەورە هەر سوارێك یان هەر پیادەیەکتان شوێن سەربازەکانمان بکەوێو بیەوێت زیانیان پێ بگەیەنێت ئەوا پێش ئەوەی لە تەتار بدەن ئێوە دەکوژم، ئەوا پێم گوتنو بیزانن)، لەو کاتەدا پاشاکانیان چیان لە سوڵتان بیست بۆ شوێنکەوتووەکانیان نووسیو ئاگاداریان کردنەوە.[2]

(سوڵتان قطن) داکۆکی دەکرد ئەو جەنگانەی لە دژی مەغۆلەکانو خاچپەرستەکان دەیانکات دەبێت مۆرکی ئیسلامیان پێوەبێت، لەبەر ئەمە کۆمەکە پێشنیارکراوەکەی خاچپەرستانی ڕەتکردەوەو بە هیچ شێوەیەك لێی قبوڵ نەکردنو نەیەویست چاکەو منەتی ئەوانی بەسەرەوە بێت، خۆی لە خۆیدا ئەم هەڵوێستە ئاماژە بە ئارەزوویەکی تری (قطن) دەکات: ئەویش ئەوەیە کە ئەو لە ماوەی جێبەجێکردنی پرۆژە جیهادیەکەیدا دەیەوێت وێڕای بە ئامانج گرتنی تێکشکانی مەغۆل، شکست دەرخواردی خاچپەرستە داگیرکەرەکانیش بدات، دوای سەرکەوتنی بەسەر مەغۆلدا بەرەو کەناری شامی باداتەوەو لە پیسی خاچپەرستە داگیرکەرەکانی پاك بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا ویستی کاتێك هێرشی کردنە سەر منەتی ئەوانی بە سەرەوە نەبووبێتو[3] نەکگیریان نەبێت.

---

١ جهاد المماليك ص: ١٢١.

٢ نزهة الانام في تأريخ الاسلام ص: ٢٦٣.

٣ جهاد المماليك ص: ١٢٢.

**٤ـ چەند زانیاریەکی گرنگی هەواڵگیری:**

(سوڵتان قطز) پێش سوپاکەی کەوتو لە (عەین جالوت) نزیک بۆوە، هێشتا هەر لە ڕێگادا بوو یەکێك لە پیاوانی شامی هاتە لای و چەند زانیاریەکی گرنگی هەواڵگیری پێشکەش کرد، ئەم پیاوە: لە لایەن (میر صارم الدین ئایبەك)ەوە نێردرابوو — (میر صارم الدین) لە کاتی داگیرکردنی شامدا لە لایەن هۆلاکۆوە دیلکرابوو و پاشان قبوڵی کرد لەنێو ڕیزەکانی سوپای تەتاردا خزمەت بکات و لە زۆر جەنگدا بەشداری لەگەڵ کردبوون و ئەمجارەش لەگەڵیان هاتبووە (عەین جالوت)... ئێمە نازانین بە حەزو ئارەزووی دەروونی خۆی هاوکاری سەربازی تەتاری کردووە یان لە ڕووی ناچاریەوە، هەر چۆنێك بێت ئەمە لە نێوان خۆی خودادایە، بەڵام لە جەنگی (عەین جالوت)دا بڕیاری داوە بە پێی توانا یارمەتی سوپای موسڵمانان بدات، نوێنەرەکە ئەم زانیاریانەی خستنە بەردەم (سوڵتان قطز):

أ– سوپای تەتار وەکو پێویست بەهێز نیە، چونکە هۆلاکۆ زۆرێك لە سەرکردەو سەربازەکانی سوپای لەگەڵ خۆدا بردونەوەو، ئەو سوپایەی هاتبووە شامو داگیری کرد لە ڕووی چەندێتیو چونایەتیەوە وەکو پێشدا نەماوە، کەواتە ترستان لێیان نەبێت.

ب– تەتارەکان قۆڵی لای ڕاستی سوپاکەیان لە قۆڵی چەپیان بەهێزترە، کەواتە پێویستە موسڵمانەکان قۆڵی چەپی سوپاکەیان کە بەرەنگاری قۆڵی ڕاستی سوپای تەتار دەبێتەوە بەهێزبکەن.

ج– (ئەشرەف ئەیوبی)ی میری (حمص) بەخۆیو سوپاکەیەوەو لەگەڵ (صارم الدین ئایبەك) لەنێو سوپاکەی تەتاردان، بەڵام ئەوان کە شەڕ دەستی پێکرد بە قەستی شکست دەخۆن، واتە دەڵێ: (ئەشرەف ئەیوبی) چاوی بە هەڵەکانی خۆیدا خشاندۆتەوەو دەیەویست لەگەڵ سوپاکەی (قطز) بوایە، بەڵام بە فێڵو بە مەبەستی هەڵوەشاندنو لێکترازاندنی ڕیزەکانی سوپای تەتار لەگەڵ ئەواندا هاتووە،[1] لەگەڵ ئەمەشدا موسڵمانەکان تەواو وریاو لەسەر هەست ڕاوەستانو بەبێ کەمتەرخەمی کردن لە ئامادەباشیو ئیحتیاتکردن سوودیان لەم زانیاریانە وەرگرت، بەم شێوازە ڕۆژی ٢٤ ڕەمەزانی ٦٥٨ تەواو بوو و موسڵمانەکان شەوی (٢٥)یان بە شەونوێژو پاڕانەوەو تکاو نزا بەڕێکرد.[2]

**٥ـ پێکهەڵشاخان لەگەڵ مەغۆلدا:**

پێشوەخت (سیف الدین قطز) هێزێکی سەربازی بە سەرۆکایەتی (میر رکن الدین بیبرس) بەرەو فەلەستین بەڕێکردبوو تا لە بارودۆخی ناوچەکەو هەواڵی جموجۆڵی دوژمن

١ قصة التتار ص: ٣١٣.
٢ المصدر نفسه ص: ٣١٣.

ئاگاداربێتو جێگەکانیشان دەست نیشان بکات، لەگەڵ گەیشتنی، (بیبرس)و هێزەکەی لەگەڵ دوژمن تێکهەڵچوونو بەردەوام دوور و نزیك گورزی لێدەوەشاندن تا ئەو کاتەی (سوڵتان قطن) بەخۆیو سوپای سەرەکیەوە لە ناوچەی (عەین جالوت) لە ٢٥ ڕەمەزانی ٦٥٨ك/ سبتەمبەر ١٢٦٠ز پێیان گەیشت، ئەمەو لە دەمی چێشتەنگاوی (٢٥) ی ڕەمەزاندا هێزی ئیسلامو هێزی تەتار بەیەك گەیشتن، شیوەکە پڕ بوو لە خەڵك، غەڵبەغەڵبی گوندنشینانو جوتیاران دەنگی دەدایەوە، لێکدا لێکدا تەپڵی سوڵتانو میرەکان دەکوتران‌و ئینزاری دەست پێکردنی هێرشیان لێدەدا.[1]

(کتبغا) سەرکردایەتی سوپای مەغۆلی دەکرد، (قطن) دەیزانی لە ڕووی ژمارەوە لە ژوور ژمارەی دوژمنەوەیە: بۆیە هێزە سەرەکیەکانی لەسەر گردو تەپۆلکەکان حەشاردابوون‌و تەنها هێزی پێشەنگی هێنا بۆ مەیدان کە لە لایەن (بیبرس)ەوە سەرکردایەتی دەکرا، هێندەی نەخایاند (کتبغا) کەوتە نێو داوەکەوە، بە هەموو پیاوانی سوپاکەیەوە هێرشی کردە سەر ئەو هێزە ئیسلامیانەی بەبەر چاویەوە لە بەرامبەری ڕاوەستابوون، پاش ئەوە (کتبغا) تینی بۆ هێنان (بیبرس) بە پەلە پاشەوپاش بەرەو گردو تەپۆلکەکان کشایەوە، هێندەی نەبرد هەر هەموو سوپای مەغۆل کتوپڕ گەمارۆ درا، جەنگو پێکدادانێکی گەورە ڕوویداو کوشتارێکی زۆریان لە یەکتر کرد، هێزەکانی مەمالیك ماوەیەکی کەم شڵەژابوون‌و[2] سەرەتای پێکدادانەکە قۆڵی چەپەی سوپاکەیان بە خراپی شکا، (مەلیك مظفر) بە خۆیو هێزێکی سوپاکەیەوە بە هاواریانەوە چوو و زەبوونیەکەی بۆ قەرەبوو کردنەوە، (قطن) خۆی خستە نێوجەرگەی جەنگەکەوەو، لەو ڕۆژەدا بەلایەکی باشی بەسەر دوژمندا هێناو هانی هاوەڵانی دەداو مەرگی ڕێی خودای لەبەر چاوو دڵیان جوانو شیرین دەکردو جار لە دوای جار هەڵمەتی پێ دەبردنەوە سەر دوژمن،[3] کڵاو خودەکەی بە زەوی داداو یەك بەخۆی هاواری کرد: (وا اسلاماه= هاوار بۆ ئیسلام)و بە خۆیو تاقمە تایبەتیەکەی خۆیەوە بە نێتی پاكو چاکیەوە هەڵمەتێکی بوێرانەی کردو خوداش سەری خست، دوای چەند ساتەوەختێك موسڵمانەکان بەرەبەرە سەردەکەوتن، هەڵبژاردەی هێزەکانی مەغۆل لەنێوان دوو بەرداشی شەڕەکەدا هاڕدران، موسڵمانەکان هەڵیان نان، تا گەیاندیاننە نزیکی (بیسان)، بۆ جاری دووەم تەتار خۆیان ڕێکخستەوەو بۆ موسڵمانەکان گەڕانەوەو شەڕ لە جاری یەکەم گەرمتر

---

١ جهاد المماليك ص: ١٢٢.
٢ دراسات تأريخية ص: ٨٧.
٣ جهاد المماليك ص: ١٢٣.

بوو، موسڵمانەکان لینگەلەرزەیەکی توند دایگرتن، (سوڵتان) دەنگێکی گەورەی لێ بەرزبۆوەو هەموو سوپا گوێی لێ بوو کە (٣) جار لەسەر یەك گوتی: (وا اسلاماه= هاوار بۆ ئیسلام) خودایە (قطز)ی بەندەی خۆت بەسەر تەتاردا سەرخە)، ئینجا خودای گەورە شکستی بە سەر تەتاردا هێناو ژمارەیەکی زۆریان لە سەرکردەی گەورەو سەرباز لێ کوژران، هەرکە تەتار بۆ جاری دووەم شکان، سوڵتان لەسەر ئەسپەکەی دابەزیو سەری خستە سەرخاكو ماچی کرد، ئینجا دووڕکات نوێژی بۆ خودای باڵادەست بەڕپاکردنو سواری ئەسپەکەی بۆوە، بەرەوڕووی سوپاکەی ڕۆیشت بینی دەستکەوتی زۆریان گرتووە،[1] (رکن الدین بیبرس) بە خۆیو بە سوپاکەیەوە بە دوای هێزەکانی مەغۆل کەوتن تا (أفامیە)، تەماشایان کرد دیسان بۆ جاری سێهەم ڕیزەکانی خۆیان ڕێك خستۆتەوە، شێرانە هێرشیان کردە سەریانو بە خراپی تێکیان شکاندنو ڕەوە ئەسپوماڵێکی زۆریان پێ بەجێ هێشتن.[2]

**٦ـ ئازایەتی (کتبغا)ی سەرکردەی مەغۆل:**

لەگەڵ ئەو شکستە تاڵانەی لەم جەنگەدا بە گەرووی مەغۆلەکاندا کرا، ئەوا مێژوونووسێکی موسڵمان کە ناوی (رشید الدین فضل الله هەمەدانی)یە حاشای لە ئازایەتی (کتبغا)ی سەرکردەی مەغۆلی نەکردووەو هەڵوێستە پاڵەوانێتیەکانی کە لەم جەنگەدا نواندوونی گێڕاونەتەوە: دەڵێ: لەو دەمەدا یەکێك لە یاریدەدەرەکانی پێشنیاری کشانەوەی بۆ دەخاتە ڕوو، لە وەڵامدا دەڵێ: پێویستە لەسەرمان لێرە بمرین، بۆ ئەوەی (خان) بە خۆشیو کامەرانی بژیا ئەمە قسەی کۆتاییمە؟ بەپێی گێڕانەوەیەکی تر دەڵێ: لێرە هەڵاتن لەبەر مەرگ ناکرێت، مەرگی سەربەرزانە لە هەڵاتنی سەرشۆڕانە باشترە، یەکێك لە ئەندامانی سوپاکەم گەورە بێ یان بچووك بێت دەگاتەوە بە (خان)و ئەم قسەی منی بۆ دەگێڕێتەوە، لە ڕێی ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا خۆی کردە قوربانی، پێویست ناکات لەنێوچوونی سوپاکەی مەغۆل بە بیرو زەینی موبارەکی مەلیك دابێتو خەفەتی پێوە بخوا، با جەنابی مەلیك وا حیساب بکات کە ژنی سەربازەکانی ساڵێك منداڵیان بە سك نەکەوتووەو ماینەکانیش ساڵێك نەزاونو جوانو ماینیان لێ نەبووە، هەر بژی (خان) بەخۆشی، مادام گیانو جەستەی پیرۆزی ساغو سەلامەتە ئەمە قەرەبووی هەموو لەدەست چوویەکە، چونکە بوونو نەبوونی ئێمەی بەندەو مسکێن شتێکی سووكو ئاسانە.[3]

---

١ دراسات تأريخية ص: ٨٨.

٢ جهاد المماليك ص: ١٢٤.

٣ جامع التواريخ ٢/٣١٤، جهاد المماليك ص: ١٢٤.

بەڵام خودی (رشید الدین) لە لایەکی ترەوە ڕایەکی پێچەوانە سەبارەت بە چۆنێتی کوشتنی (کتبغا)ی سەرسوپای مەغۆلی باس دەکات، ئاماژە بەوە دەکات کە (کتبغا) لەسەرەتای شکستەکەیاندا بە دیل گیرا، (قطز) بە کەلەپچەکراوی هێنای لە بەرامبەر خۆی داینیشاند، گفتوگۆو دەمەقاڵە بەم شێوەیە لە نێوانیاندا دروست بوو، (قطز) ڕووی لە (کتبغا) کردو گوتی: هەی پیاوی بەدنمەکو پەیمانشکێن، ئەوە تۆی دوای ئەوە خوێنی خەڵکانێکی زۆری بێ گوناهو پاکو بێگەردت ڕشت پاڵەوانو گەورە پیاوانێکی زۆرت بەفێڵو بەڵێنی درۆزن لەنێو برد، خانوبەرەو ماڵانێکی زۆرتان بە درۆودەلەسەو قسەی بریقەدار داگیر کردو ڕوخاند، ئەوە ئێستا کەوتویتە تەڵەی بەندو ئەسارەتەوە، هەرکە (کتبغا) گوێبیستی ئەم قسانە بوو بە قۆڵبەستکراوی دەتگوت فیلی تورەکراوە وەڵامی دایەوەو گوتی: هەی خۆپێشایی مەغرور، زۆر شانازی بەم سەرکەوتنەت مەکە، ئەگەر من بە دەستی تۆ کوژرام، چاك دەزانم ئەمە لە خوداوەیە نەك لە تۆ، نە بەم ڕێکەوتە لە نکاوە نە بەم چاو سووربوونە کاتیو فەوتاوە فریومەخۆ، هەر کات هەواڵی مەرگم گەیشت بە هۆلاکۆ، یەکسەر دەریای تووڕەبوونی هەڵدەچێو بە سمی ئەسپەکانی مەغۆل وڵاتی ئازەربایجان تا دەگات بە مصر گێرە دەکاتو هەرچی لمو لیتەی مصر هەیە ڕایدەماڵێ، هۆلاکۆ (٣٠٠) هەزار سواری هاوشێوەی (کتبغا)ی هەیە، گریمان یەکێکیان نەما، (قطز) پێی گوت: بەم ئەندازە بە سوارانی (توران) مەنازە، چونکە ئەمانە کارەکانیان بە مەکرو فرتو فێڵ دەبەنە سەر نەك بە پیاوەتیو شەهامەت،[1] (کتبغا) وەڵامی دایەوەو گوتی: من تا لە ژیاندام تەنها بەندەیەکی بەر دەرگای (خان)مو وەکو تۆ تەڵەکەبازو پەیمان شکێن نیم، خێرا بمکوژەو خەلاسم بکە با هیچکە گوێم لەو قسە ڕەقو ناخۆشانەت نەبێت، (قطز) فەرمانی کرد بیکوژن، سەریان لە جەستە کردەوە، هەرکە هۆلاکۆ هەواڵی مەرگی (کتبغا)ی پێگەیشت، قسەکانیو هەڵوێستەکانی سەرەمەرگیان بۆ گێڕایەوەو، خەفەتی زۆری خواردو ئاگری تورەبوونی داگیرساو گوتی: نۆکەرێکی تری وەکو ئەو لە کوێ پەیدا بکەم خاوەنی ئەم نیێتو نیازە خاوێنەو کۆیلایەتیە پاکو پوختەبێت لە کاتی سەرەمەرگیدا،[2] لەگەڵ ئەوەدا (رشید الدین) بەوە ناسراوە مەغۆلی خۆش ویستبێو — ئەمەی بۆ ڕێکخستبێ — بەڵام ناکرێت حاشا لەو جێگەو پێگە بەرزە بکەین کە (کتبغا) لە لای مەغۆلەکان هەیبووە، ئەوان بە بیروڕاو

---

١ جامع التواريخ ٢/٣١٥، ٣١٦، جهاد المماليك ص: ١٢٤.

٢ جامع التواريخ ٢/٣١٥، ٣١٦، جهاد المماليك ص: ١٢٥.

تەگبیرەکانی‌و ئازایەتیەکەی پشت ئەستوور بوون، ئەو پاڵەوانێکی ئازاو لەسەرپێ بوو، شارەزای بوارەکانی جەنگو گرتنی قەڵاکان بوو، هۆلاکۆ متمانەی پێ بوو لە ڕاکانی دەرنەدەچوو، دەرهەق بە ئیسلامو موسڵمانان خراپترین‌و شەڕەنگێزترین کەس بوو، بۆیە بە مەرگی ئەو ئیسلامو موسڵمانان حەسانەوە.[١]

(نورالدین خلیل) قسەی لەسەر ئازایەتی (کتبغا)ی سەرکردەی مەغۆل‌و ئەو چیرۆكو بەسەرهاتانە کردووە کە دەرهەق بە ئەو گێڕدراونەتەوەو دەڵێ: بەوپەڕی گومانەوەبەڵکو نکۆڵی کردنەوە تەماشای ئەم چیرۆکانە دەکەین، دەڵێن (هەمەدانی) چۆن توانی ئەو نامە دەمیەی کە لە لایەن کەسێکی نادیارەوە بە زمانی مەغۆلی گوازراوەتەوە بەم شێوەیە بەدەست بخات، بە تەبیعەتی حاڵ ئەمە ئەگەر لە ئەسڵدا نامەش بووبێت پەیوەندی بە هەموو ئەو ڕیوایەتانەوە هەیە کە تێکەڵو پێکەڵو دژ بە یەکن‌و دەتوانین بڵێین واقیعی نین‌و زیاتر خەیاڵین، هەرچەندە مێژوونووسە عەرەبەکان‌و بیانیەکانیش یەك لە دوای یەك گێڕابیاننەوە هەر جێی شكو گومانن.[٢]

**٧ـ ڕزگارکردنی دیمەشق‌و وڵاتی شام:**

مادام تەتار لە دیمەشق‌و حەلەب‌و حمص‌و شارەکانی تری شامدا ماون، کەواتە ئێستا (قطز) لە پرۆژە جیهادیەکەی نەبۆتەوەو تا لێی نەبێتەوە نابێت پشوو بدات، دیمەشق یەکەم وێستگەی ئیسلامی بوو کە دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی تەتارەوە، دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی (عەین جالوت)و ماوەی نێوانیان خۆ لە (١٥٠) کیلۆمەتر دەدات، (قطز) پێش ئەوەی بگاتە دیمەشق نامەیەکی موژدەئامێزی سەرکەوتنی مەزنی بۆ دانیشتوانەکەی نارد، لە نامەکەدا هاتووە: (سەبارەت بە سەرکەوتن، بە شێوازێکی تەندروستانە گورز وەشێنراو دڵسۆزانەش ئامانج پێکرا، تەتاریش خودا سەری پێ شۆڕ کردن‌و شکاندنی، دەست درێژیان کردە سەر ڕۆژگارو وڵاتی شامیان گەردنکەچی خۆیان کرد، بەهۆی هۆزەکانیانەوە گەلەکۆمەکیان لە دژی ئیسلام کرد، ئەمە سوپاکانی ئیسلامن‌و لە جێگەکانی خۆیان جێگیر بوون، هەر ئیماندارێك لاقی بلەرزێت لاقی ئیمانی فریای دەکەوێت‌و چەسپاوو ڕاوەستاوی دەکات، حەجی خاچپەرستان بۆ (بیت المقدس) جومعەی موسڵمانان هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەرکات زەنگی ناقوسی کلێسەکان لێدرا یەکسەر بانگی ئیسلام جێگەی دەگرێتەوە، هەر کتێبێك بێتە قسە قورئان دێت‌و لاڵی دەکات).

---

١ النجوم الزاهرة ٩١/٧، المغول للعريني.

٢ سيف الدين قطز، قاهر المغول ص: ١٤١.

بەردەوام هەواڵی موسڵمانان بۆ بێباوەڕان دەگوازرایەوەو هەواڵی بێباوەڕانیش بە موسڵمانەکان دەگەیشت، تا ئەو کاتەی بەیانی سپێدەی زیوینی خۆی لەگەڵ زەردەپەڕی زێڕینی ڕۆژ تێکەڵ کردو سورەتی (الشمس= ڕۆژ)ئ ئایەتی (الليل)ی هەڵوەشاندەوەو کار بەوە گەیشت هەردووك بەرەی جەنگ لەبەر ڕۆشنایی چاویان بە چاوی یەکتر کەوتەوەو دەستەویەخەی یەکتر بوونەوەو ئاگری شەڕ هەڵایسایەوە، هەر تیرو شیرێك دەوەشێنرا خۆی بەنێو سكو هەناوی کافراندا دەکردو ڕوحی لێ دەستاندنو کەلەشەی پێ بەجێ دەهێشتن، هەموو زۆردارو کەللە ڕەقی کافرەکان بەهۆی تاوانە قێزەونەکانی پێشدایان لە کوژرانو لە گۆڕەپانی جەنگدا بەجێمان ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلۡعَبِيدِ﴾،[1] ئەم هەواڵەش گەیشتە دیمەشق، (ابن كثير) دەڵێ: (ركن الدين بيبرس)و کۆمەڵە جەنگاوەرێکی ئازا هەدایان نەداو بە دوای تەتارەکان دەکەوتنو لە هەموو شوێنێك هەڵیان دەکوتایە سەر سەریانو دەیانکوشتن، ئەوەبوو لە دیمەشق هەڵاتنو تا پشتەوە تا حەلەب ڕێیان کەوتن، لە ڕۆژی یەك شەممە ٢٧ ڕەمەزانداو لەگەڵ گەیشتنی موژدەی سەرکەوتنەکەی (عەین جالوت) تەتارەکان لە دیمەشق هەڵاتن، موسڵمانانی دیمەشق ڕاویان دەنانو لێیان دەکوشتنو دەگرتنو ماڵەکەیان پێ بەجێ دەهێشتنو بە زەبرو زەنگ دیلە موسڵمانەکانیان لێ دەستاندنەوە، سوپاسو ستایش بۆ خودا لە بەرامبەر ئەم لوتفو مەرحەمەتەی نیشانی دانو شکستەکانی پێشدای بەم سەرکەوتنە مەزنە بۆ قەرەبووکردنەوە، سەبارەت بەمە مزگێنی بڵاوکرایەوە، لە قەڵای مەنصورەڕا وەڵامی مزگێنیو موژدەکان درایەوە، ئەو ڕۆژ موسڵمانان بەم سەرکەوتنە مەزنە کە خوا بە نسیبی کردن زۆر دڵخۆشو شادومان بوون، بەم شێوەیە خودای باڵادەست پشتگیریەکی چاکی خەڵکی خۆی کرد، هەر هەموو دوژمنانی خودا جوولەکەو دیانو دووڕوو سوكو ڕیسواو سەر شۆڕبوون، دینی خودا سەرکەوتو خەفەت دایگرتن، بەڵام خودا پشتگیری دینی خۆی دەکات هەرچەندە کافرەکان پێشیان ناخۆش بێت، لەو کاتەدا موسڵمانەکان پەلاماری ئەو کەنیسەیان دا کە خاچی لێوە هاتبووە دەرەوە، چونە ناویەوەو تاڵانیان کردو پاشان سوتاندیانو ئاگریان لە چواردەورەی کردەوە، خانوبەرەیەکی زۆری دیانەکان سوتان، خودا ماڵو گۆڕی بۆ پڕکردن لە ئاگر، هەندێك لە کەنیسەی یەعقوبیەکانیش سوتا، تاقمە خەڵکێك خەریك بوون جوولەکەکان تاڵان بکەن، پێیان گوترا: کاتێك وەیشومەی تەتارەکان هات جوولەکەکان وەکو خاچپەرستەکان نەچوون گەڵیانو لە

---

[1] قصة التتار ص: ٣٨٨، صبح الاعشى ٧/٢٦٠-٢٦٢.

دژمان نەوەستاونەتەوە، ئاپۆڕای جەماوەر لە نێوەڕاستی مزگەوتی گەورەی شاردا مەلایەکی ڕافیزی (شیعە)یان کوشت، ئەو مەلایە ناوی (فخر محمد کوڕی یوسفی کنجی) بوو و لەسەر حیسابی ماڵی خەڵك خۆی لەگەڵ تەتار سازاندبوو، دڵو دەروونێکی پیسو گڵاوی هەبوو و خۆرهەڵاتی بوو و لەسەر حیسابی ماڵو سامانی خەڵك هاریکاری تەتاری دەکرد، بە هەمان شێوە کۆمەڵێك مونافیقی وەکو ئەویان قۆڵبەست کردنو بە تاوانی بەکرێگیراوی کوشتیان: ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ (الانعام: ٤٥).[١]

**٨ـ گەیشتنی (سیف الدین قطز) بۆ دیمەشق:**

٣٠ ڕەمەزانی ٦٥٨ پاڵەوان (سیف الدین قطز) گەیشتە دیمەشق، وەکو سەرۆکێکی براوە لە لایەن خەڵکەوە پێشوازی لێکرا، شار ڕازێنرایەوە، پیاوانو ژنانو منداڵان هاتنە دەرەوەو پیرۆزباییان لە قارەمانی سەرکەوتوو کرد، بە ڕاستی ئەمە خۆشیو شادی ڕاستەقینەیە، خودای بەرز دەفەرمووێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾﴾ (یونس: ٥٨). شادیو خۆشی بە بۆنەی سەرکەوتنی دینی خوداو بەرزبوونەوەی ئیسلامو شکۆمەندبوونی موسڵمانان لەگەڵ شادیو خۆشی بە بۆنەی خواردنو خواردنەوەو ماڵو پلەو پایەو سەڵتەنەت بەرامبەر ناکرێت، سوپای مەمالیك هاتە نێو دیمەشقەوە، بە خێرایی بارودۆخ جێگیر بوو و ئاسایش چەسپا، ئەو جۆرە کارەساتانەی کە لە کاتی داخڵ بوونی هێزە داگیرکەرەکان ڕوو دەدەن، ڕوویان نەدا، سەروەتو سامانو موڵكو ماڵو شەرەفو ناموسو گیانی جوولەکەو دیانە نیشتەجێکانی شار پارێزگاریان لێکرا.

(قطز) (ابن الزكي)ی قازی دیمەشقی لەپۆستی قەزاوەت لابردو (نجم الدين أبابكر كوڕی صدرالدين كوڕی سني الدولة)ی لە جێ دانا، (ابن الزكي) سەر بە تەتار بوو و لە لایەن ئەوانەوە کرابووە قازی دیمەشق، ئینجا (قازی نجم الدين) دەستی بە چارەسەرکردنی کێشەکان بە تایبەتی کێشەی نێوان موسڵمانەکانو نەسرانیەکان کرد، هەرچەندە نەسرانیەکان لە کاتی هێرشی تەتاردا هەڵوێستی زۆر نەشیاو و قێزەونیان دەرهەق بە موسڵمانان ئەنجام دان، بەڵام قازی (نجم الدين) بە خاتری ئەوەی ستەم لە نەسرانیەکانی نێو وڵاتی ئیسلام نەکرێت سەرەتای کاری قەزاوەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشە سەرهەڵداوەکانی نێوان موسڵمانانو نەسرانیەکان کرد، ڕۆژی دووەمی هاتنی (قطز) بۆ

---

١ البداية والنهاية ١٧/٤٠٢.

دیمەشق ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو خواردەمەنی ڕەنگاوڕەنگو نایابو تایبەت بە هەردووك بۆنەکەوە دروست کرابوون، بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز، جەژنی سەرکەوتن بەسەر هەواو هەوەسدا هەروەها بە بۆنەی جەژنی سەرکەوتن بەسەر داگیرکەرانی کافرو جێگیربوونی پایەکانی حوکومەتی ئیسلام لە زەویدا، خودای بەرز دەفەرموویێت: ﴿وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ٤٠).

(قطز) کاتی بەفیرۆنەدا، بەڵکو پێشەنگی سوپاکەی خۆی بە سەرکردایەتی (بیبرس) بەرێکرد تا ڕاوەدووی تەتارە هەڵاتووەکان بنێتو شارەکانی تری شام لە بەرماوەی سوپاکەیان پاکسازی بکات،[1] ئەمەو مەغۆلەکانی لە بەرزاییەکانی شام بەدەرنانو لە (حمص) خرپی هەڵدان، لەوێوە بە خۆیانو ڕوحەکانیانەوە هەڵاتن، هەرچ کەلوپەلو پێداویستیو پارەو سامانێکیان هەبوو فرێیاندا، دیلە موسڵمانەکانیان ئازاد کردن، بەرەو ڕێگای کەنار (ساحل) پێچیان کردەوە، موسڵمانەکان لەو ڕێگایە خۆیان بۆ حەشاردان، لێیان دەرپەڕینو خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتنو زیاتریشیان لێ بەدیل کردن، کاتێك هۆلاکۆ هەواڵی تێکشکانی سوپاکەیو کوژرانی (کتبغا)ی جێگری پێگەیشت داخو مەراق دایگرت، چونکە تا ئێستا ڕۆژێکی ئاوا ڕەشیان لە شکانو کوژرانو هەڵاتنیان بە خۆیانەوە نەدیبوو.[2]

موسڵمانان توانیان لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا وڵاتی شام بە تەواوەتی لە مەغۆلەکان پاك بکەنەوە، (قطز) یەکگرتنی (مصرو شام)ی لە ژێر سایەی یەك دەوڵەتداو بە سەرۆکایەتی خۆی ڕاگەیاند، ئەمەو دوای وەفاتی (مەلیك صالح نجم الدین ئەیوب)ی ڕەحمەتی لە ساڵی ٦٤٨کۆچیو تێپەڕینی (١٠) ساڵ بەسەر ناکۆکیو دووبەرەکی ئەیوبیەکانی شام لەسەر هەموو مینبەرەکانی مصرو فەلەستینو شامو تا بە سەرووی شامو شارەکانی دەوروبەری ڕووباری (فورات) ڕادەگات وتار بە ناوی (سوڵتان قطز) خوێنرایەوەو موسڵمانان ڕۆژانێکیان بەخۆشترین شێوە لە ژیانی خۆیاندا گوزەراند.[3]

**٩ـ ڕێکخستنی کاروباری هەرێمەکانی شام:**

(سوڵتان سیف الدین قطز) بە خاتری ئەوەی بتوانێ بە زوویی بەرەو مصر بگەڕێتەوە، دەستو بردی لە ئاسایی کردنەوەی بارودۆخو ڕێکخستنی کاروباری هەرێمەکانی شام کرد،

---

١ قصة التتار ص: ٣٤٠.

٢ السلوك ١/٥١٨.

٣ قصة التتار ص: ٣٤١.

ژمارەیەك میری صالحیو موعیززی بەسەر کاروباری ئەو هەرێمانەدا دابەشکردن، (میر علم الدین سنجاری حەلەبی) بە جێگری خۆی بەسەر دیمەشقەوە داناو وەکو هاریکار (میر ئەبو هەیجای کوڕی عیسای کوڕی حشتری ئەزکشی کوردی) لەگەڵ دانا،[1] ئەیوبیەکانی بە سیفەتی ئەوە کە سەر بە دەوڵەتەکەی مصرن لەسەر پۆستو پلەو پایەکانی خۆیانەوە بەسەر هەرێمەکانەوە دانانەوە، (ئەشرەف موسا)ی حوکمڕانی (حمص) — کە هۆلاکۆ وەکو جێگری خۆی لەسەر ولاتی شامی دانابوو — داوای (ئەمان)ی کرد، (قطز) وەلامی دایەوەو ئەمانیداو لەسەر کورسی دەسەلاتەکەی خۆی دانایەوە، هەروەها بانگهێشتی (مەلیك مظفر علاءالدین علي کوڕی بدرالدین لوئلوئی)ی حوکمڕانی (سنجار)ی کرد تا وەکو جێگری خۆی بەسەر شاری حەلەبەوە دانێت، هەندێك پارچە زەوی کشتوکاڵیشی لە ناوچە دێهاتیەکانی دەورەی حەلەب بەسەر میرەکانی خۆیدا دابەشکردن، (مەلیك منصور)ی لەسەر (حەما)و (بارین) دانایەوەو (معرة)شی بۆ گێڕاوە کە لە ساڵی (٦٣٥ك)یەوە لە ژێر دەستی حوکمڕانی حەلەبدا بوو، لە لایەکی ترەوە (سلمیە)ی لێ وەرگرتەوەو بەخشی بە (میر شرف الدین عیسای کوڕی مهنای کوڕی مانع)ی میری عەرەب، (میر شمس الدین ئاقوس ی برلی عەزیزی) کردە حوکمڕانی (ساحل)و (غەززە)و ژمارەیەك میری عەزیزیشی لەگەڵدا بوون، ئەم میرە کاتی خۆی لە (ناصر یوسف)ی حوکمڕانی دیمەشقو حەلەب جودا ببۆوەو چووبووە قاهیرەو پەیوەندی بە سوپاکەی (قطز)ەوە کردبوو، ئینجا لەگەڵ سوپاکەی سوڵتاندا هاتەوەو بەشداری جەنگەکەی (عەین جالوت)ی کرد، هەروەها (قطز) فەرمانی کرد (حوسێن کوردی تەبرداری) بخنکێنرێت ئەمەو بە تاوانی ئەوە دەستی مەغۆلەکانی گرتووەو جێگەی مەلیك ناصری نیشان داون، گوریسی لە مل کراو خنکێنرا.[2]

بەم شێوەیە (سوڵتان قطز) کاروبارەکانی حکومەتی شامی ڕێکخستنەوە، هەموو ئەو هێمنیو بەرقەراریەی بۆ گێڕایەوە کە بەداگیرکرانی لە لایەن مەغۆلەکانەوە لە دەستی دابوو، لە ڕۆژی ٢٦ی شەواڵی ٦٥٨ك بە خۆیو سوپا براوەکەیەوە بەرەو مصر بەڕێکەوت، لەو کاتەدا کە قاهیرە خۆی بۆ پێشوازی کردنی سەرکردە سەرکەوتووەکەی ڕادەزاندەوە[3] هێشتا هەر بەڕێوە بوو ئەجەل گەیشتە سەری خواحافیزی یەکجاری لەم دنیا فانیە کرد، لەمەولا بە ئیزنی خودای بالادەست بە درێژی قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکرێت.

---

١ السلوك ١/٥١٨.

٢ السلوك ١/٥١٨، مملكة حماة الايوبية، عدنان سعد الدين ص: ١٠٠.

٣ السلطان المظفر سيف الدين قطز، قاسم عبده ص: ١٤١.

**١٠ـ هەڵوێستی هۆلاکۆ لە بەرامبەر شکستەکەدا:**

هەرچەندە شکستەکە بەسەر خودی هۆلاکۆدا نەهاتبوو، بەڵام بە حوکمی ئەوە سوپاکە هی ئەو بوو و قەبارەو بارستایی شکستەکە گەورەو قورس بوو و (کتبغا)ی سەرسوپای تێدا کوژرابوو، ئەوا بە نیسبەت هۆلاکۆوە سەدمەیەکی توند بوو و سەرتاپا تەزاندیو لەرزاندی، لەگەڵ ئەمەدا لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دوور بوو، بەڵام کاری تێکراو نائومێدانە هەوڵیدا بە ناردنی هێرشێکی تازە بەرەو شام پەڵەی نەنگی سەر سوپا شکاوەکەی بسڕێتەوە، بەڵام بارودۆخەکانی ئەوکات ڕێی ئەمەیان پێنەدا،[١] چونکە لەگەڵ مونافیسەکانی بنەماڵەکەی لە سەرووی هەموویانەوە سەرۆکی قەبیلەی زەهەبی ئامۆزای مشەوەشی جەنگو هەراو گوریس کێشێنە بوو نەیتوانی بەرەو خۆرئاوا پێشڕەوی بکاتو یارمەتی سوپا شکستخواردووەکەی بدات، ناچار بە ناردنی نامەیەك بۆ (خانی گەورە) لە (قەراقورم) وازی هێنا، تێیدا هەواڵی شکستەکەی سوپای مەغۆلی ولاتی شامی لەسەر دەستی سوڵتانی مصر ڕاگەیاندبوو. (خانی گەورە) جگە لە دەرکردنی بڕیارێك بۆ بەرژەوەندی هۆلاکۆ هیچ هەڵوێستێکی تری نەنواند، بە پێی بڕیارەکە: ولاتانی هەڵکەوتووی نێوان دەریای جەیحونو ولاتی شام پێشکەشی هۆلاکۆ دەکرێن، دیارە (خان) ویستوویەتی بەم بڕیارە گیانی ئازایەتی بە بەر هۆلاکۆدا بکاتەوەو هانی بدا جارێکی تر جەنگ لەگەڵ مەمالیك بەرپا بکاتەوە، هۆلاکۆ خەریکی خۆسازدانەوەی ئەم کارە بوو، بەڵام مەرگ پێشی دایەوەو لە ساڵی ٦٦٣ك/١٢٦٥ز یدا مردو، خەونو خەیاڵی لکاندنی (مصرو شام)یشی بۆ سەر قەڵەمڕەوی حوکومەتەکەی لەگەڵ خۆیدا بردە نێو گۆڕەوە.[٢]

**١١ـ لەو هۆنراوانەی بەسەر (عەین جالوت)دا گوتراوە:**

بە بۆنەی سەرکەوتنە مەزنەکەی موسڵمان لە (عەین جالوت)دا، (شهاب الدین محمود) قەصیدە شیعرێکی مەدح ئامێزی بەسەر (میر ظاهر بیبرس)دا گوتووەو دەڵێ:

سر حيث شئت لك المهيمن جار ... واحكم فطوع مرادك الأقدار
لم يبق للدين الذي أظهرته ... يا رُكنه عند الاعادي ثارُ
لما تراقصت الرؤوس وحركت ... من مطربات قسّيك الأوتار
حملتك امواج الفرات ومن رأى ... بحراً سواك تقله الانهار
وتقطعت فرقا ولم يك ... طودها اذ ذاك الا جيشك الجرار

---

١ جهاد المماليك ص: ١٣١.

٢ جهاد المماليك ص: ١٣٢، جامع التواريخ ٢/٢٣٦.

رشّت دماؤهم الصعيد فلم يطر | منهم على الجيش السعيد غبار
شكرت مساعيك المعاقل والورى | والترب والآساد والاطيار
هذي منعت وهؤلاء حميتهم | وسقيت تلك وعمّ ذا الإيسارُ
فلأملأن الدهر فيك مدائحاً | تبقى بقيت وتذهب الأعصارُ[١]

(شرف الدين أنصاری)یش لە قەسیدەیەکیدا بەسەر (مەلیك منصوری دووەم)ی حوکمڕانی (حەما)دا هەڵدەڵێ کە بە خۆیو سوپاکەیەوە بە هاوشانی (قطن) بەشداری جەنگی (عەین جالوت)ی کردبوو:

رُعت العدى فضمنت شل عروشها | ولقيتها فأخذت فلّ جيوشها
نازلت أملاك التتار فانزلت | عن فحلها قسرا وعن إكديشها
فغدا لسيفك في رقاب كُماتها | حصد المناجل في يبيس حشيشها
رويت أكباد القنا بدمائهم | لما أطال سواك في تعطيشها
أقدمت مقتحما على نُشابها | تكسو الجياد رياشها من ريشها
دارت رحى الحرب الزَّبون عليهم | فغدت رؤوسُهُم حطام جريشها
وطويت عن مصر فسيح مراحل | مابين بركتها وبين عريشها
حتى حفظت على العباد بلادها | من رومها الأقصى الى أُحبوشها
فرشت حماة لِوَطء نعلك خدّها | فوطئت عين الشمس من مفروشها
وكذا المعرّة اذ ملكت قيادها | دَهِشتَ سروراً سار في مدهوشها
لازلت تُنعش بالنّوال فقيرها | وتنال أقصى الأجر من منعوشها[٢]

شاعیرێکی تریش ئاوا بە (عەین جالوت) هەڵدەڵێ:

هلك الكفر في الشام جميعاً | واستجد الاسلام بعد دحوضه
بالمليك المظفر الملك الأروع | سيف الاسلام عند نهوضه
ملك جاء بعزم وحزم | فاعتززنا بسمره وبيضه
أوجب الله شكر ذاك علينا | دائما مثل واجبات فروضه[٣]

---

١ الادب العربي من الانحدار الى الازدهار ص: ١٦٦.
٢ الادب العربي من الانحدار الى الازدهار ص: ١٥٧.
٣ الملك المظفر قطز بن عبدالله المعزي، رحاب عكاوي ص: ١١٤.

## پێنجەم: کوژرانی (سیف الدین قطز):

لە ئەنجامی سەرکەوتنی (قطز) لە (عەین جالوت) جیهانی ئیسلامی بە گشتیو وڵاتی مصر بە تایبەتی جوانترین ڕەنگدانەوەی شادی بەخۆوە بینی، مصر خۆی بۆ پێشوازیو بەخێراتنەوەو پیرۆزبایی لێکردنی (قطز) سازکردبوو، تەپڵی موژدە لە قەڵا کوترا، قاهیرە ڕازێنرایەوە، جەماوەر چاوەڕێ بوو کەی (مظفر قطز) دەگاتەجێ[1] کاتێك سوڵتان گەیشتە شارۆچکەی (قصیر)،[2] بە خۆیو چەند کەسێکی تایبەت بە خۆی بەجێماو، تەواوی سوپاکەی بەرەو (صالحیة)ی هەرێمی (شرقیة) بەڕێکەوت. لە (قصیر) خێوەتی سوڵتان هەڵدرا، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا نێوانی (سیف الدین قطز)و (رکن الدین بیبرس) تێکچوو، ناکۆکیە کۆنینەکانی نێوانیان سەریان هەڵدایەوە، ئیدی لەمەولا هەریەکەیان لە بەرامبەر ئەوی تریاندا لەسەر هەست بوو و وریایی خۆی وەردەگرتو چاوەڕێی هەلێکی دەکرد لە کۆڵ خۆی بکاتەوەو لەنێوی بەرێت، لەو نێوانەدا (بیبرس بندقداری) بە هۆی ئەو جەسارەتو فێڵبازیەی پێیەوە ناسرابوو دەستی خۆی پێشخستو[3] لەگەڵ ئەم میرانە ڕێکەوت نەخشەی کوشتنی داڕێژن: (میر سیف الدین بلبان رشیدی، میر سیف الدین بهادر موعیزی، میر بدرالدین بکتوت جوکنداری موعیززی، میر سیف الدین بیدغان روکنی، میر سیف الدین بلبان هارونی، میر بدرالدین أنس ئەسفەهانی)، کاتێك سوڵتان (قطز) لە (قصیر)ی نێوان (غرابي)و (صالحية) نزیك بۆوە بە مەبەستی ڕاو لەڕێ لایدا، کاتێك لە ئیشەکەی بۆوە بەرەو (خێوەتی سوڵتان) گەڕایەوە، لە ڕێگادا میر (رکن الدین بیبرس)و میرە هاوپەیمانەکانی لەگەڵ بوو، (رکن الدین) داوای لێکرد ژنە دیلێکی تەتاری بداتێ هەر کە گوتی بەڵێ باشە یەکسەر دەستی گرت ماچی بکات، ـ ئەم ماچە جفرەی نێوان ئەو و میرەکانی گەلی بوو – کە بینیان دەستی گرت (بدرالدین) شمشێری لەسەر ملی داناو ئینجا (میر بدرالدین أنس) گرتیو لە ئەسپەکەی هێنایە خوارەوە، دوای ئەویش (میر بەهادوری موعیززی) تیرێکی لێداو ڕوحی لێ ستاند، دەگوترێت (رکن الدین بیبرس) یەکەم کەس بوو بەر شیری دا، ئەم قسەیە ڕاستە، ئەم ڕووداوە لە ڕۆژی شەممە ١٦ی ذي القعدة دابوو، ئینجا میرەکان چوونە نێو خێوەتی سوڵتانیەوە، سەبارەت بە دیاری کردنو هەڵبژاردنی (سوڵتان) دەمەتەقەیان کرد، لە کۆتاییدا لەسەر (رکن الدين بيبرس) ڕێکەوتن، لە پێش هەموویاندا (میر فارس الدین ئۆکتای

---

١ مصر والشام في عصر الايوبيين، سعيد عاشور ص: ١٨٦.

٢ القصير: گوندی الجفافرقيەو سەر بە پارێزگای شرقيتيە.

٣ في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٣.

موستەعرەب) ناسراوە بە (ئەتابەك) بەیعەتی پێداو سوێندی بۆ خوارد،[١] دوای ئەویش (بلبان رشیدی) هاتو ئینجا هەموویان بەڕیز بەیعەتیان دایەو ناسناوی (مەلیك ظاهر)یان بەسەردا بڕی، لەم ساتەوەختە ناسکەدا (میر فارس الدین ئۆکتای ئەتابەك) ڕووی لە (مەلیك ظاهر) کردو گوتی:

تا نەچیتە نێو قەڵای (جەبەل) مەلیکایەتیت بۆ ناچەسپێ، ئینجا (بیبرس) بە هاوەڵایەتی (میر فارس الدینو میر بدر الدین بێسەریو بلبان رشیدیو قلاون ئەلفیو بیلیك خەزنەدارو ژمارەیەکی تر لە میرە تایبەتەکانی) لێی سوار بوو و بەرەو (قەڵا) بەڕێکەوت، لە ڕێگا توشی (میر عزالدین ئەیدمری حەلەبی)ی جێگری (سوڵتان مظفر قطز) بوون کە دەیەویست بچێتە دیداری (قطز)ی ئوستادی، چ ڕوویدابوو بۆیان باس کرد، سوێندیان پێ خواردو پەیمانیان لێ ستاند، ئەویش بە پەلە بەرەو قەڵا ڕۆیشت، بەردەوام لەبەر دەرگا چاوەڕێ بوو هەتا گەیشت، ئینجا (بیبرس) چووە نێویەوەو دەستی بەسەردا گرت، ماوەیەك بوو قاهیرە خۆی بۆ پێشوازیو بەخێراتنەوەو پیرۆزبایی سەرکەوتنی (سوڵتان قطز) ڕازاندبۆوە، هەموو خەڵك بە گەڕانەوەیو سەرکەوتنەکەی دڵخۆشو شادمان بوون، کاتێك شەو بەسەرچوو و بەیانی لێ بۆوە ڕۆژهەڵات، بانگکەرێك بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: هۆ کۆمەڵانی خەڵك، ڕەحمەت بۆ (مەلیك مظفر) بنێرنو دوعا بۆ سوڵتانەکەتان (مەلیك ظاهر رکن الدین بیبرس) بکەن.[٢]

**١ـ هۆکارەکانی کوژرانی (قطز):**

سەبارەت بەو هۆکارانەی سەریان بۆ کوشتنی (قطز) کێشاوە، مێژوونووسە هاوچەرخەکان بەسەرهاتی جۆراوجۆر باس دەکەن، لێرەدا دەمانەوێ قسە لەسەر ئەم هۆکارانە بکەینو هەرە بەهێزەکەشیان هەڵبژێرین:

أ- (ابن أیبك الدواداري) دەڵێ: بابم کە نۆکەری (میر سیف الدین بلبان دەواداری ڕۆمی) بووە لە ئەوەوە دەگێڕێتەوە: ڕۆژی ڕیزبوونی سوپاکان تاقمە میرێك لە خەشداشەکانی (میر رکن الدین بیبرس بندقداری) هەڵاتن، کاتێك ئیسلام سەرکەوت، (سوڵتان مظفر) مۆڕەی لێکردنو سەرزەنشتی کردنو جنێوی پێدانو بەر هەڕەشەی دان، ئەوانیش لەو ڕۆژەوە داخو خەفەتیان لێخوارد، بوغزو غەرەزو ڕكو کینەی نێوان سوڵتان بیبرسو تاقمەکەی زیادی دەکردو لەسەر ڕووپەڕی دەمو چاویان ڕەنگی دەدایەوەو هەر کامێکیان چاوەڕێی هەلێکی دەکرد کاسەی ڕکی خۆی بەسەر سەری بەرامبەرەکەیدا بڕێژێت.[٣]

---

١ نزهة الانام في تأريخ الاسلام ص: ٢٦٧.

٢ المصدر نفسه ص: ١٦٨.

٣ كنز الدر ٨/٦٠، في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٤.

ب- (تقي الدين المقريزي)ی مێژوونووس دەڵێ: هۆكاری كوشتنی (قطز) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە (میر ركن الدين بيبرس) داوای لە (سوڵتان مظفر) كرد بەسەر هەرێمی حەلەبیەوە دانێ، ئەویش نەیدایە، (ركن الدين) ڕقی قوتدایەوەو لە بەرامبەریدا غەزری، ﴿لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ (الانفال: ٤٤).[١]

ج- (بيبرس الدواداری)ی نزیكترین كەسی ڕووداوەكە، دەڵێ: كاتێك (قطز) دیمەشقی بەجێهێشتو بەرەو وڵاتی مصر گەڕایەوە ئەمە ڕوویدا: تایەفەی (مەمالیكی بەحری) بە حوكمی ئەوە (قطز)و (عزالدين ئایبەك)ی ئوستادی (فارس ئۆكتا)یان لێ كوشتبوونو تەختی سەڵتەنەتیان لێ زەوت كردبوونو سوكایەتیو دەربەدەریو ئاوارەییان بەسەردا هێنابوون، بەڵێ بەم هۆكارانەوەدڵو دەروونیان پڕ ببوو لە ڕكو كینەو چاوەڕێی هەلێكیان دەكرد تۆڵەی خۆیان بسێننەوە، كاتێكیش لە شامڕا گەڕانەوە مصرو پاڵیان بە (قطز)ەوە دا، لەبەر ئەوە نەبوو (قطز)یان خۆش دەویێتو پشتیوانی لە خودی ئەو دەكەن یان بە دەسەڵاتەكەی ڕازی بووبن، بەڵكو پێیان قبووڵ نەبوو بەسەری كزەوە لە شام بمێننەوە، لە لایەكی تریشەوە حەزیان لێ بوو لەگەڵ (قطز) یەك بگرنەوەو پرۆژەی سەركەوتنی ئیسلام بەسەر تەتاردا ببەنە سەر.

وقد بنيت المرعى على دمن الثرى وتبقى حزازات النفوس كما هي[٢]

(دكتۆر قاسم عبده قاسم) ئەم هۆكارەی دوایەی پەسند كردووە، كە (بیبرس دواداری)ی مێژوونووس نوسیویەتی، پێشی وایە ئەمە هۆكاری سەرەكی ڕووداوەكە بووە، لەنێو كۆیلەكانی (سوڵتان عزالدين ئایبەك)دا (قطز) لە هەموانیان گەورەترو لەپێشتر بووە، لە كاتی كوشتنی (فارس الدين ئۆكتای)و ڕاوەدوونانو دەركردنی خەشداشەكانی مەمالیكی بەحریدا گرنگترین ڕۆڵی خۆی گێڕاوە، (قطز) ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ بەشداری بەرچاوی لە لێدانو زیندانی كردنو دەركردنیاندا كردووە، هەروەكو دەزانین (تایەفەی بەحری) ماوەی چەند ساڵێك لە شام بە دەركراویو ئاوارەییو چەرمەسەری گوزەراندیان، ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت ئەوەیە دەتوانین بڵێین پەیوەندی خەشداشیە كە كاروباری نێوخۆی مەمالیكو نێوان ئوستادو شاگردی ڕێك دەخست تا بڵێی پتەوو بەهێز بوو، لەبەر ئەوە (بیبرس)و هاوەڵەكانی لە (مەمالیكی بەحری) حەزیان بە تۆڵە سەندنەوەی (ئۆكتای) هاوەڵیانو هەموو

---

١ السلوك ٥١٩/١، في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٤، الظاهر بيبرس، ص: ٨٨..
٢ زبدة الفكرة في تأريخ الهجرة ٧٣/٩، في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٥.

ئەو هاوەڵانەیان دەكرد كە لە لایەكەوە لە لایەن (قطز)ەوەو لە لایەكی تریشەوە بەهۆی ئەوەوە كوژرابوون‌و لە لای سێهەمیشەوە تۆڵەی ئەو هەموو سەرشۆڕی‌و زەبوونی‌و ژیانە تفت‌و تاڵ‌و پڕ چەرمەسەریانەیان بكەنەوە كە لە ئاوارەیی‌و دوورخرانەوەیاندا بەریان كەوتووە.[1]

دكتۆر (أحمد مختار العبادی)یش دەڵێ: بێگومان ڕەگ‌و ڕیشەی هۆكارەكانی كوشتنی (قطز) لە لایەن (بیبرس)ەوە زۆر زۆر لە ڕەگ‌و ڕیشەی هۆكاری بەسەرهاتەكەی پێڕەوانەو نەدیتنی (حەڵەب)و قووڵتر بوون، هەرگیز پێنەدانی حەلەب نابێتە هۆكاری ڕاستەوخۆی كوشتنی (قطز) لە شوێنێكی وەكو سەر سنووری مصردا، لە ڕاستیدا هۆكارەكان دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆژگاری (سوڵتان ئایبەك)، كاتێك زۆربەی مەمالیكی بەحری صالحی دەربەدەر كردو (ئۆكتای)ی سەرۆكی لێ كوشتن، لەو دەمەوە (مەمالیكی (ئایبەك) كە پێیان دەگوترا (موعیززی)و (قطز)یش كەسێكی دیاری نێو ئەوان بوو جڵەوی سەڵتەنەتی مصریان بە دەستەوە گرتبوو، تا ئەو سەردەمەی مەغۆلەكان هێرشیان هێنایەسەر تخوبی (مصر) دوژمنایەتی لە نێوان موعیززیەكان‌و بەحریەكاندا بەردەوام بوو، لەو كاتەدا هەموو مەمالیك لە بەرامبەر ئەمم خەتەرەدا یەكیان گرتەوە، هەروەكو (عيني) دەڵێ: (مەمالیكی بەحری لایەنگیری (قطز)ی موعیززیان كرد، لە ڕووی دڵسۆزیانەوە بۆ (قطز) ئەمەیان نەكرد، بەڵكو لەبەر دوو هۆی سەرەكی:

یەكەم: بڕوبیانووی مانەوەیان‌و جێگیربوونیان لە شام كۆتایی پێهاتبوو.

دووەم: زەرورەتی یەكگرتن‌و سەرخستنی یەكتر لە پێناوی پاراستنی ئیسلام.[2]

كاتێكیش مەمالیك لە (عەین جالوت) بەسەر مەغۆلدا سەركەوت، زەرورەتی یەكگرتن كۆتایی پێهات، دوژمنایەتیە كۆنەكەی نێوانیان لەنوێ سەری هەڵدایەوە، لە ئەنجامدا: (قطزی موعیززی) لەسەر دەستی (بیبرسی بەحری صالحی) كوژرا، ئەمە ئەو واتا تەواوەی قسەكانی (إبن أبي الفضائل)ن كە لەسەر بابەتی كوژرانی (قطز) كردوونی، ئەو دەڵێ: كاتێك بەحریەكان گەڕانەوە، ترسێكی گەورە باڵی بەسەر خەڵكدا كێشا، ترسان لەسەر ئەو گەندەڵیە تێهەڵچنەوە كە پێشدا لەسەری بوون.[3]

---

١ في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٦.
٢ عقدة الجمان، نقلا عن في تأريخ الايوبي والمملوكي للعبادي ص: ١٦٢.
٣ السلوك ١/٥٢١.

هەر سەبارەت بەم بابەتە (ابن ایاس) دەگێڕێتەوە: کاتێك کاروباری سەڵتەنەت بە تەواوەتی بۆ (بیبرس) جێگیر بوو، فەرمانی بە ئامادەبوونی هەموو ئەو مەمالیکە بەحریانە کرد کە ئاوارەی وڵات ببوون، هەروەها (ابن ایاس)و (مقریزی) دەگێڕنەوە: بیبربس دوابەدوای گەڕانەوەی بۆ قاهیرە، مەمالیکی موعیززی هەوڵیان دا ڕەشەکوژی بکەن، هەندێکی لێ کوشتن و ژمارەیەکیشی لێ بەند کردن و هەندێکی تریشی نەفی کردن.[1]

ئەم دەقانە هەر هەموویان دەبنە بەڵگە بۆ ئەوە کە: کوژرانی (قطز) دەرەنجامی دوژمنایەتیەکی پتەوی کۆنی نێوان (مەمالیکی بەحری صالحی)و (مەمالیکی موعیززی) بوو.[2]

**٢ـ ڕێبازی چوونەسەر عەرشی مەمالیك:**

ڕێبازی چوونە سەر کورسی دەسەڵاتی مەمالیك هەر لە سەرەتاوە کوشتن و خوێنڕێژی بوو، دوابەدوای کوژرانی (تورانشا)ی دوا سوڵتانی ئەیوبی لە شام، (شجرة الدر)و (عزالدین ئایبەك)ی مێردی بەهۆی ململانێی دەسەڵات تێداچوون، کەواتە بەهۆی ئەوە دەوڵەتی مەمالیك لەسەر بنەمای (کێ ئازاو زاڵە حکومەت بۆ ئەوە) دامەزرابوو و لایەنی سەربازی بەسەریدا زاڵ ببوو، شتێکی سروشتی و ئاسایی بوو (رکن الدین بیبرس بندقداری) بیر لە ڕاماڵینی سوڵتان (سیف الدین قطز) بکاتەوە و لە ڕێی کوشتنی ئەوەوە خۆی بگەیەنێتە سەر عەرشی سەڵتەنەتی مەمالیك.

دکتۆر (قاسم عبده قاسم) ئەم ڕایەی پەسند کردووە کە دەڵێت: بیبرس بە بیروبۆچوونی خۆی لە (قطز) شیاوترو لەپێشترە بۆ چوونە سەر عەرشی دەسەڵات، بە تایبەتی کە ئەو دە ساڵ لەمەوبەر لە تێکشکاندنی هێرشی حەوتەمی خاچپەرستاندا بۆ سەر مصر بەسەرکردایەتی لویسی نۆهەم، خاوەنی ڕۆڵی هەرە گەورەی ئەم تێکشکانە بوو، هەروەها ئەو لە (عەین جالوت)دا دەورێکی گەورەو حاشاهەڵنەگری گێڕا لە شکاندنی مەغۆلەکان، هەروەکو پێشدا ئەمەش یەکەمین کەس بوو گورزی گورچوبڕ لە پێشەنگی سوپاکەی مەغۆل بدا، ئینجا هەر ئەو بوو ڕاوەدووی مەغۆلە هەڵاتووەکانی نا تا سنووری ئەوسەری وڵاتی شامی ڕەتاندن، بیبرس کوڕی سەردەمی خۆیەتی، ئەمانە چەند بۆچوون و پروپاگەندەیەکی سیاسی بوون و لەو سەردەمەدا ڕەواجیان پێ دەدرا.[3]

---

١ بدائع الزهور ١/٩٩ـ١٠٠، في تأريخ الايوبي ص: ١٦٣.
٢ في تأريخ الايوبي والمملوكي ص: ١٦٣.
٣ في تأريخ الايوبيين والمماليك، قاسم عبده ص: ٢٠٦.

وەکو دەبینین دامو دەزگایەکی ڕاوێژکاری بەهێزو فیقهێکی سیاسی ئیسلامی پەیوەست بە هەڵبژاردنو دیاری کردنی سوڵتان یان مەلیك یان حاکم لە ئارادا نەبوون، (سوڵتان قطز) هەوڵی دا هەموو کاروبارەکان لە جێگای خۆیان دانێتەوە، بەڵام پێش بەدیهێنانی ئەم ئامانجەیو دوای تێکشاندنی مەغۆلو ڕزگارکردنی شام کوژرا.

**٣ـ ئەنجامەکانی کوژرانی (قطز):**

پێش وشکبوونەوەی خوێنی کوژراوو بێ ئەوەی ورتەیەکی ناڕەزایی لە میرانی مەمالیك ببیسرێ، پۆستی سەڵتەنەت بۆ بکوژ گوازرایەوە، (ئەتابەك) واتە سەرۆکی سوپا پرسیاری کرد بکوژ کێیە؟

کاتێك زانی (بیبرس)ە، پێی گوت: ((ئەی گەورەم بۆ خۆت لەسەر پۆستی سەڵتەنەت دانیشە))، ئەمە وەکو ئەوە وایە: کێ سوڵتانی کوشتووە، کورسیەکەی دەبێتە خەڵاتو کرێی کوشتنەکەی، بەم شێوەیەو جارێکی تر یاسای (الحکم لمن غلب= حوکم بۆ ئەو کەسەیە زاڵ دەبێت) چەسپایەوە،[1] وەکو دەبینرێت مەمالیکی بەحری بە کۆی دەنگ لەسەر سەرۆکایەتی (رکن الدین بیبرس) ڕێکەوتوون، بەڵام ئەنجامەکانی ئەم کارەساتە ئەمانە بوون:

**أـ یاسای هێزو خوێن لە بواری سیاسیدا:**

ڕێبازێك بوو بۆ گەیشتن بە سوڵتەو عەرشی سەڵتەنەت، ئیدی ئەمە بوو بە کلتوری مەمالیك لە دەستاودەستکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەکەیانداو لە ماوەی (٢٧٠) ساڵی تەمەنیدا گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، چەمکە سیاسیەکانیشی بەرهەمی ئەو بارودۆخە مێژووییە بوون، کە تێیدا لە دایك بوو و چاوی بە بوون هەڵهێنان، تەواوی چەمکە سیاسیەکانیان قیاس دەکرێنە سەر ئەم بیروباوەڕەیان کە دەڵێ: میرانی مەمالیك لە سەرەتای کاریانەوە پێیان وابوو کورسی دەسەڵاتی وڵات مافی هەموویانە، کامەیان بەهێزبێتو بتوانێت ئەوانی تر بڕەتێنێتو لە زەویان بدات، ئەوا بۆ ئەو دەبێت، ئەمە لە سەرەتای پەیدابوونی دەوڵەتەکەیانەوە فەرقی نیە بە کوژرانی (تورانشا) بێ یان (عزالدین ئایبەك) بێت یان (شجرة الدر) بێ لە واقیعدا ڕەنگی دایەوە، ئینجا (بیبرس) هاتو بە کوشتنی (قطز) بیروباوەڕەکەی تۆختر کرد، هەر ئەمە لە زنجیرەیەك کودەتای نێو کۆشكو پیلانو پاشقول لێکگرتنی سیاسی لەسەر دەسەڵات لە ماوەی درێژایی حوکمی سوڵتانەکانیاندا چەندبارە پات بۆتەوە.[2]

---

١ المصدر نفسە ص: ٢٠٨.

٢ المصدر نفسە ص: ٢٠٩.

**ب ـ قۆناغێکی نوێ لە مێژووی (مەمالیك)دا:**

دووەمین ئەنجام: خۆ لەو ڕاستیە مێژووییەدا دەنوێنێ کە دەیگوت: بە سەرکەوتنی (بیبرس) بۆ سەر عەرشی سەڵتەنەتی مەمالیك قۆناغێکی تازەی گرنگ لە مێژووی دەوڵەتە لاوەکەی مەمالیك دەستی پێکرد، وای لە (بیبرس) کرد، بەو سیفەتانەی پێیانەوە ناسرابوو لە سام و هەیبەت و دڵڕەقی و زۆرداری و فێڵی سیاسی و شارەزایی سەربازی ببێتە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەم دەوڵەتە، پاش ئەمەش بە هۆی دەستکەوتە سیاسی و ئیداری و عەسکەریەکانی زیاتر خۆی بردە پێشەوە، لە ڕاستیدا (١٠) ساڵەکەی پێشدای حوکمی مەمالیك قۆناغی ڕەوانی سیاسی بوو و لەو ماوە کەمەدا (٥) سوڵتان دەستاودەستی حوکمیان کرد، سێ دانەیان لێ کوژران و دوانیشیان بەهۆی ئەوە منداڵ بوون و جێگەی مەترسیش نەبوون لە کوشتن دەربازیان بوو، بەڵام (بیبرس) بە تەنیاو ماوە (١٧) ساڵ بە بەردەوامی لەسەر سەڵتەنەت مایەوە، لە لایەکی ترەوە دەوڵەتەکەی مەمالیك لە (١٠) ساڵی یەکەمیدا موحتاجی ئەوە بوو شەرعیەت وەربگرێت و لەم ڕووەوە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی دانی پێدا بنرێت، لەبەر ئەمە هاتن بە شێوەیەکی ڕەمزی و لە پێناوی چارەسەری کێشەی شەرعیەت خیلافەتی عەباسیان لە قاهیرە ژیاندەوە، لە ڕووی ئەمنیشەوە هەڕەشەی ئەیوبیەکان کێشەی زۆری بۆ دروست دەکردن، بەڵام جەنگی (عەین جالوت) وەکو دەرمانێکی شیفابەخش چارەسەری کێشەی ئەمنی کردو کۆتایی بە هەڕەشەی ئەیوبیان هێنا.[1]

**ج ـ پشتبەستنی زیاد لە پێویست بە کۆیلەکان:**

دوابەدوای کارەساتی کوژرانی (قطز) میرانی مەمالیك زیاد لە پێویست گرنگیان بە کۆیلەکانیان دەدان و پشتیان پێ دەبەستن، بە جۆرێك بە چەك و کەرەستەی سەربازیەوە ئامادەیان دەکردن و لە پوچەڵکردنەوەی هەر پیلانێکی چاوەڕوانکراوی ململانێی نێوخۆییدا بەکاریان دێنان.

**ح ـ پشتبەستنی لە ڕادە بەدەر بە کۆیلەکان:**

سێهەم ئەنجامی کوژرانی (قطز) ئەوە بوو کە دوای ئەوە میرانی مەمالیك زیاد لە پێویست پشتیان بە کۆیلەکان دەبەست و چەکداریان دەکردن و لە هەر ڕووداوێکی چاوەڕوانکراوی دەرهاویشتەی ململانێی نێوخۆدا لە هەر کاتێکدا بووایە بەکاریان دێنان، هەریەك لە میرە

١ في تأريخ الايوبيين والمماليك ص: ٢٠٩.

گەورەکانو والی هەرێمەکان خاوەنی سوپایەکی بچکۆلەی خۆی بوو و ژمارەیان لە نێوان (٣٠٠) تا (٦٠٠) کۆیلەدا دەهاتو دەچوو، لەوانە بوو لەم ژمارەیەش تێپەڕی کردبایەو خۆی لە (٨٠٠) کەس دابایە، هەرچی سوڵتانەکانیشیان بوون تا لە توانایان دابووایە بایەخیان بە کڕینی کۆیلەی زۆر دەدا، لە دوای سەردەمی (بیبرس)ەوە هەریەك لە سوڵتانەکانیان بە خودی خۆی (٨٠٠) کۆیلەیەکی دەکڕی، ئەمە جگە لەو کۆیلە زۆرانەی کە لە سوڵتانی کۆچکردووەوە یان لە میرە گەورەکانەوە وەکو میرات بۆی بەجێ دەمان.[١]

بەم شێوەیە تایەفەگەری نێوان ڕەگەزەکانی مەمالیك بە شێوەیەك پەرەی سەندو خۆی سەپاند کە بە درێژایی مێژووی دەوڵەتەکەیان کاریگەری سلبیو خراپی لەسەر بینای سیاسی دەوڵەتەکەیان دابنێ، تۆوی ئەم تایەفەگەریە عەسکەرتاریە سامناکە لەو کاتەوە بەنێو خاكو زەمینی دەوڵەتی مەمالیکدا چێنرا کە بە ئەنجامدانی یەکەم کوشتنو خوێنڕێژی دەستبەکاربوو و بە کوژرانی (سیف الدین قطز)یش هێندەی دیکە زۆر بوون.[٢]

**٤ـ گۆڕی (سیف الدین قطز) و مەوحکرانی لە لایەن (عیززی کوڕی عبدالسلام)ەوە:**

(ابو المحاسن) دەگێڕێتەوە: (قطز) پاش کوژرانی بە ڕووتو ڕەجاڵی فڕێ درابوو، یەکێك لەو خزمەتکارانەی لە (قصیر) لە لای بوو ناشتی، بەردەوام خەڵك دەچوونە سەر گۆڕەکەیو... دوعای ڕەحمەتیان بۆ دەکردو توكو دوعاشیان لە بکوژی دەکرد، کاتێك (بیبرس) ئەم هەواڵەی پێگەیشت، فەرمانی کرد تەرمەکەی بێننە دەرەوەو بۆ شوێنێکی تری گواستەوەو شوێنەواری گۆڕەکەی کوێرکردەوە، بەڵام هەواڵو مێژووەکەی وەکو خۆی مایەوە.[٣]

(مقریزی) دەڵێ: لە (قصیر) نێژرا، ماوەی سەڵتەنەتەکەی ١١ مانگو ١٧ ڕۆژ بوو، دوای ئەمە هێنایانەوە قاهیرەو لە مەرقەدی شێخ تقي الدین نێژرایەوە، پاش ئەمەش (حاجی قطز ظاهري) بۆ (قارفة)ی گواستەوەو لە نزیك مەرقەدی (ابن عبود)ی شاردەوە، دەڵێن (قطز) ناوی محمودی کوڕی ممدوح بووەو دایکی خوشکی سوڵتان جلال الدین خوارەزمشا بووەو باوکیشی ئامۆزای سوڵتان جلال الدین بووە، لەگەڵ هێرشی تەتار بە منداڵی بە دیل گیراوە، لە دیمەشق کڕدراوەو پاشانیش بە کۆیلەیی بەرەو قاهیرەیان هێناوە.[٤]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٠٩.
٢ المصدر نفسه ص: ٢١٠.
٣ النجوم الزاهرة ٧/٨٦ـ٨٧.
٤ السلوك ١/٥٢٠.

بێگومان بەهاو مەزنایەتی پیاوان بە تەمەن درێژیو سەرمایەداریو دەسەلاتداری پێوانە ناکرێت، بەڵکو بەو کردارە زیندوانەیان دەپێورێت کە گۆڕان بەسەر واقیعی مێژوودا دێنن، (قطز) کێ بوو ئەگەر دەستی بە ئیسلام نەگرتبایەو بەرگری لێ نەکردبایە؟ کێ دەیناسی؟ بێگومان ئەگەر خاوەنی ئەم کردارە نەمرە نەبووایە مێژوو ناوی ئەویشی وەکو ناوی خەلکانێکی زۆر فەرامۆش دەکرد، کە لە بێ سەنگیو زۆرو بۆریاندا وەکو کەفی سەر دەریا بوون، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ماوەیەکی دووروردرێژی تەمەنیان بەرێکردو جڵەوی حوکمیان بە دەستەوە گرت بەلام جگە لەوە کە بارێکی قورسو بەلایەکی شووم بوون بەسەر شانی گەلو نیشتمانیانەوە، هیچ شتێکی تریان نەکردو ناویانو ناسنامەیان لەگەڵ قانگەلۆشکەکانی پایز بە هەوادا چوون، بێگومان پیاوانی مەزن دەتوانن ناوی خۆیان لەسەر ڕووپەڕی لەوحەکانی مێژوو هەڵکەنن، لێرەدا کاتی دووروودرێژ بە زەرور دانانرێت.[1]

گۆڕان پشت بە جۆری ئەو پیاوانە دەبەستێ کە لەگەڵ ئەوەدا دەیانەوێ گۆڕانکاری ئەنجام بدەن حیساب بۆ پێرەوەکانی ژینو فیقهی دەستنیشانکردنی چاکەکانو خراپەکانو سیاسەتی شەرعیو فیقهی بەرپابوونی دەوڵەتانو ڕووخانیانو ناسینی ڕێرەوە پانو باریکەکانی بزوتنەوەی مێژوو دەکەن. (شێخ عیززی کوڕی عبدالسلام) دەترسا بە مەرگی (قطز)سەرکەوتنە مەزنەکە زایە بێتو ئوممەتو کیانە سیاسیەکە سەرلەنوێ بڕوخێتەوە، بۆیە لە دوای مردنی (قطز) یەك بەخۆ دەگریاو دەیگوت: خودا بەزەیی بە جوانەمەرگیەکەی بکات، ئەگەر ماوەیەکی دووروودرێژتر بژیایە بە گەنجایەتیەکەی ئیسلامی گەنج دەکردەوە،[2] هەروەها گوتی: لە دوای (عمری کوڕی عبدالعزیز)ەوە هیچ حوکمڕانێکی موسڵمانان لە ڕووی چاکەخوازیو دادپەروەریەوە خۆی لە شانی (قطز)ی ڕەحمەتی نەداوە.[3]

بەلام من لەگەڵ ئەوەدا (قطز)م زۆر خۆش دەوێتو دان بەوەدا دەنێم کە جیهادو تێکۆشانێکی گەورەو شکۆداری ئەنجام داوەو خزمەتێکی دیارو بەرچاوی ئیسلامی کردووەو چۆتە نێو ڕیزی پیاوە مەزنەکانی ئوممەت، ئەوا لێرەدا ڕام لەگەڵ شێخی گەورەمان جیاوازە، بەڕای من سەرکردەی شەهید (نورالدین محمود زەنگی) لە هەموو بوارەکانی خۆپارێزیو چاکەخوازیو دادپەروەریو جیهادو تێکۆشاندا لە پێش (قطز)ەوەیە، کێ دەیەوێت سەبارەت بەم بابەتە زانیاری زیاتری دەستکەوێ با تەماشای کتێبی (عن عصر الدولة

---

١ قصة التتار ص: ٣٦٦.
٢ المصدر نفسه ص: ٣٦٧.
٣ المصدر نفسه ص: ٣٦٧.

الزنكية) بكات، بە ڕاستی (سيف الدين قطز) لە مەلیکە هەرە چاکەکانی تورك بوو، بە دەستی سپیو مەشخەڵداریەوە ڕاپەڕیو تارمایی ڕەشی دوژمنانی لە ئاسمانی وڵاتانی ئیسلام – شامو مصر – ڕەواندەوە.[1]

**٥ـ هەڵوێستی مەغۆل لە بەرامبەر کوژرانی (قطز)دا:**

کاتێك هەواڵی کوژرانی (قطز) بەم شێوە بە مەغۆل گەیشت، پێیان وابوو دەوڵەتی مەمالیك دابەش دەبێتو لێك هەڵدەوەشێت، لەبەر ئەمە بڕیاریاندا ئەم هەلە لە کیس نەدەنو جارێکی تر هەوڵەکانیان بۆ داگیرکردنەوەی شام بخەنەوە گەڕ، مەغۆلەکانی (حەڕان)و تەواوی شارەکانی تری هەرێمی (جزیرە) کۆبوونەوەو هەموو ئەو مەغۆلانەش کە لە جەنگی (عەین جالوت) بە ڕووح ڕزگاریان ببوو و هەڵاتبوون پەیوەندیان پێوە کردن، خۆیان سازداو بەڕێکەوتن تا لە (بیرە) نزیك بوونەوە، چونکە لە پەلامارەکەی پێشوتریاندا شورەو بورجی قەڵاکانی ئەم شارەیان لەگەڵ زەوی تەخت کردبوون خانوبەرەکانی لە دووڕا دیار بوون، (مەلیك سعيد کوڕی بدرالدين لؤلؤ)ی والی حەلەب هەستی بە سامناکی هەڵوێستەکە کرد، هێزێکی سەربازی بە هاواری شاری بیرەوە بەڕێکرد، بەڵام لەبەر ئەوە توانای نەبوو لە بەرامبەر ئەم گەلەکۆمە گەورەی مەغۆل خۆڕابگرێت، بەرەو شار گەڕایەوەو سامناکی هێرشەکەی مەغۆلیان بە مەلیك سعيد ڕاگەیاندو گوتیان کە ئێستا بەرەو (منبج) بەڕێکەوتووە، وەکو دیارە مەغۆلەکان نەیانویستووە کات بە فیڕۆ بدەنو خۆیان بە هێرشی سەر شارە بچووکەکانەوە دەستخەڕۆ بکەن، لەبەر ئەمە بڕیاریاندا هێرش بۆ سەر حەلەب بەرن.

لە ڕۆژی پێنج شەممە ٢٦ی ذي الحجة ٦٥٨ك/نوفمبر ١٢٦٠ز گەیشتنە سەری، بە سەرکردایەتی میر (بایدەر)ی مەغۆلی دەستیان بە هێرش کردو توانیان خۆ بەنێو شاردا بکەنو دانیشتوانەکەی لێ بەدەربنێن، ئەوانیش بەرەو گوندی (قرنبیا)ی خۆرهەڵاتی حەلەب هەڵاتن، لێرەدا موسڵمانەکان هەوڵیاندا جارێکی تر ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخەنەوەو لە بەرامبەر مەغۆلەکاندا ڕاوەستنەوەو بەر بە هێرشەکەیان بگرنەوە، بەڵام ئەم کۆبوونەوەیان لە بەرامبەر چڕوپڕی هێرشەکەی مەغۆل سودی نەگەیاند، بە ناچاری موسڵمانەکان بە سەرکردایەتی (حسام الدين جوکندار) – کە (مەلیك سعيد) لە جێگەی خۆی بەسەر (حەلەب)یەوە بەجێ هێشتبوو – بڕیاریاندا بەرەو پشتەوە پاشەکشە بکەنو مەغۆلەکان

---

١ جواهر السلوك في أمر الخلفاء والملوك لابن اياس ص: ١١٥.

بەرەو شوێنێکی وا پەلکێش بکەن کە بتوانن لەوێدا بە شێوەیەکی چاکتر بەرەنگاریان ببنەوە، بەرەو (حەما) ڕۆیشتن، (مەلیك منصور)ی حوکمڕانی لەوێ بوو، ویستیان گۆڕەپانی جەنگەکە فراوانتر بکەنو گۆمی شەڕەکە قوڵتر بکەنو خۆیان بە بەرچاوی دوژمنەوە لاواز نیشان دەنو دەرفەتێکی پێویستیش بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆرتری سوپای ئیسلام وەربگرن، لەبەر ئەم هۆیانە بەرەو (حمص) گەڕانەوە، ئەلێرەدا (مەلیك منصور)ی حوکمگێڕی (حەما)و (مەلیك أفضل علي)ی برای بەخۆیانو سوپای (حەما)وە گەیشتنە لایان، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا (مەلیك ئەشرەف)ی حوکمگێڕی (حمص)یش پەیوەندی پێوەکردن، ئیتر (حسام الدين جوكندار) سەرلەنوێ سوپاکەی لە ڕووی ئامادەسازیو چەكو کەرەستەی جەنگیەوە ڕێکخستەوەو بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکانی ئامادە کردەوە.

لە مانگی محرم ٦٥٩ك/دیسەمبەر ١٢٦٠ز یدا مەغۆلەکان گەیشتنە (حمص)، لە نزیك (رستن)و دەوروبەری گۆڕی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) جەنگێکی گەرموگوڕو دەستەویەخە لە نێوان مەغۆلەکانو موسڵمانەکاندا ڕوویدا،[1]

هەرچەندە موسڵمانەکان ژمارەیان لە لەچاو مەغۆلەکان بە ڕێژەیەکی بەرچاو کەمتر بوو، بەڵام دەستی چاکیان وەشاندو خودا بەسەر دوژمنیدا سەرخستن، (بایدر)ی سەر سوپای مەغۆل بەخۆیو سەبازە ساغەکانی هەڵاتن، موسڵمانەکان بەدوایان دەکەوتنو لێیان دەکوشتنو دەگرتن، پاش ئەمە (مەلیك منصور) بە ئاراستەی (سلمية) ڕۆیشت، چەند تاقمەیەکی مەغۆلی خۆیان گەیاندبووە ئەوێ، دەیانویست جارێکی تر هێرش بەرنەوە سەر (حەما)، ڕۆژێك مانەوە، ئینجا بەرەو (أفامية) ڕۆیشتن، هێزێکی موسڵمانان پێش ئەمانیان دابۆوەو چووبوونە نێو قەڵای شارەکەوەو لەوێڕا هێرشی پارتیزانیان دەکردنە نێو شارو دەستیان لە مەغۆلەکان دەوەشاند، مەغۆلەکان تینیان بۆهاتو بە ناچاری (أفامية)یان چۆڵکردو بەرەو حەلەب بەڕێکەوتن، ماوەیەکی زۆر گەمارۆیاندا، هەر کە (مەلیك ظاهر بیبرس) بە تەواوەتی قاچی خۆی لەسەر کورسی دەسەڵاتی مصرو شام چەسپاندن، بە پەلەو بێ دواکەوتن سوپایەکی گەورەی — بە مەبەستی دەرکردنی مەغۆل لە وڵاتی شام— بەرەو ئەو وڵاتە بەڕێکرد، کاتێك مەغۆلەکان هەواڵی بەڕێکەوتنی ئەو سوپایەیان بیست ترسو لەرز دایگرتنو بە ئاراستەی خۆرهەڵات هەڵاتن، بەم شێوەیە جارێکی تر وڵاتی شام لە ژێر نیری داگیرکاری مەغۆل ڕزگاری بوو.[2]

---

١ جهاد المماليك ص: ١٢٩.

٢ النجوم الزاهرة ٧/١٠٤ـ١٠٦.

موسڵمانان توانیان ئەو مەینەتو وەیشومە گەورانە تێپەڕێننو بەسەر تەواوی ئاستەنگەکاندا زاڵ بن، مێژوو بە هۆی ڕووداوەکانیەوە سەلماندوویەتی: هەر کاتێك ئوممەتی ئیسلامی شەڕو ئاژاوە بەردەرگای پێگرتو بەڵاو موسیبەت چواردەورەی تەنیو هەوری ڕەشی دوژمنکارانە ئاسمانی لێ داگیرکرد، بەوپەڕی هیمەتی بەرزەوەو بیروباوەڕی پتەوەوە هێزوپێزی کۆدەکاتەوەو وزە شاراوەکانی بەگەڕ دەخاتەوەو چیائاسا لە بەرامبەر هێرشی داگیرکارانەدا دەوەستێتەوە، ئینجا خۆڕاگرانە پشت بە خودای باڵادەست دەبەستێتو بە ئیمانی پۆڵاینیەوەو مشتەکۆڵەی ئاسنینەوە زەبری گورچوبڕ دەوەشێنێتو — تا کاتێك خودا دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو لە تەنگانەوە بەرەو فەرحانیو ئاسوودەیی دەباتو شەوە زەنگی ئەنگوستەچاوی بۆ دەکاتە ڕۆژی ڕووناك هەدا ناداتو بە جوانی ئارام دەگرێت، بەم شێوەیە ئوممەتی ئیسلام ڕەسەنایەتی خۆی سەلماندو نیشانیدا کە توانای قوتدانەوەی شکستەکانو تێپەڕاندنی مەینەتیەکانی هەیەو لە کۆتاییدا بەوپەڕی ساغو سەلامەتی خۆی دەگەیەنێتە کەنارەکانی ئەمان.[1]

## شەشەم: هۆکارەکانی سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی (عەین جالوت)دا:

### ١ـ سەرکردایەتیەکی حەکیمو لێزان:

خودی بەخشندە — لەم ماوە مێژوویە پڕکێشەیەدا — بەهۆی سوڵتان (سیف الدین قطز) ڕێزی لە (ئوممەت) گرتو ئاوڕی بەخێری لێدایەوە، (قطز) مرۆڤێکی صالح بوو، زۆربەی نوێژەکانی بە جەماعەت دەکردن، وەکو مەلیکانی تر نەبوو و توخنی مەی نەدەکەوت،[2] بوێرو پاڵەوانو دەست بەخێر بوو، دڵسۆزی ئیسلامو موسڵمانان بوو، ئەویش بە لای ئەوانەوە خۆشەویست بوو،[3] پێشەنگو گورجو گۆڵو تەگبیرکەرو کارهەڵسوڕێنەرێکی نایاب بوو، ئوممەت لەو سەردەمەدا زۆر پێویستی بە سەرکردایەتیەکی حەکیمو بە جورئەتو هەڵکەوتووی وەکو ئەو هەبوو، واقیعەن سیفەتە دەگمەنو نایابەکانی ئەم سەرکردەیە پڕاوپڕی پێداویستیەکانی ئەو سەردەمەی ئوممەت بوون.[4]

بە حوکمی ئەوە لە ڕیزی سوپای ئەیوبیاندا بەشداری زۆر جەنگی کردبوو، شارەزاییەکی تەواوی لە هونەرەکانی جەنگدا پەیداکردبوو، لەگەڵ تیژبوونی نینۆکەکانیدا بە خاتری ئەوە

---

١ تأريخنا المفترى عليه، للقرضاوي ص: ٢١٠.

٢ البداية والنهاية ١٧/٤٠٥.

٣ المصدر نفسه ١٧/٤١١.

٤ سيف الدين قطز، قاسم عبده ص: ١٦٤.

سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی لێ پەیدا ببێت لایەنی ڕووحیو ڕەوانی گەشەی سەند، ئەمە لە تەختی نێوچەوانیدا دەخوێنرایەوەو لەنێو هاوەڵانیدا پێی جودا دەکرایەوە، لە تەواوی ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی مصرو شامدا ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاوی دەگێڕا، سەربەرزی خۆی بەهۆی ئیسلامو عەقیدەکەیەوە نیشان دەداو شانازی زۆری پێوە دەکرد، لە بەرامبەر مەغۆلەکاندا — ئەوانەی تالآوی شکستیان بە گەرووی خوارەزمشاو شوێنکەوتووانیدا کردبوو و وڵاتەکەیان لێ زەوت کردبوو — دڵو دەروونی بە داخو ڕکو تۆڵە پەنگی خواردبۆوە، چۆن لە لایەنی ڕوحیو ڕەوانیەوە سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی لێ دروست ببوو، بە هەمان شێوە لە لایەنی جەستەشیەوە سیفەتەکانی سەرکردەی سەرکەوتووی تێدا دەدرەوشانەوە: جەستەی تۆکمەو تێکسرماو و کەڵەگەتو دامەزراو و بەهێز بوو، دەموچاوێکی خڕو پانی هەبوو، ڕەنگی سوورو سپی بوو، ئەگەر دوژمن لە پشتەوەڕا پارێزی لێ هێنابایەو ڕمبەکەی تێگرتبایەو نزیك نێوشانی هاتبایە خۆی لێ هەڵدەسوڕاندو بە دەستی دەیگرتەوەو لە سنگی دوژمنەکەی هەڵدەچەقاندەوە.[1]

کاتێك ترسو سامو دڵەڕاوکێ دەورەی شامو مصری داگرتو مەغۆلەکان — بە مەبەستی لەنێوبردنی مەمالیك بەخۆکەوتنو خۆیان سازدا، لەو کاتەدا (قطز) ژمارەیەك کاری گرنگی لەپێناوی شکاندنەوەی مەغۆلو بەرگری کردن لەخۆ ئەنجامدان، لەو کارانە: ڕاکێشانەوەی مەمالیکە هەڵاتووەکانی شامو فەرامۆشکردنی هەموو ئەو ڕکو کینو دوژمنایەتیانەی لەنێوان هەردووك لایەنی ناکۆکدا هەیە، لەسەر کارلابردنی (مەلیك منصور علی) لە پۆستی سەڵتەنەت، بە خاتری ئەوە منداڵ بوو و نەیدەتوانی بارودۆخ بە ئاسایی ڕاگرێتو کاروباری دەوڵەت وەکو پێویست بەڕێوە بەرێتو لە لایەکی تریشەوەپێویستە سەرکردەیەکی بەهێزو دەسەڵات بێتە پێشەوەو بتوانێ بەرەنگاری مەغۆل ببێتەوە، ئەمە لە ساڵی ٦٥٧ك/١٢٥٩ز یدا بوو، کۆکردنەوەو ڕێکخستنو ئاراستەکردنی وزەو توانا مرۆییو ئابووریەکانو هەوڵدان بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانیەتیەکی دووقۆڵی لەگەڵ (مەلیك ناصری ئەیوبی)ی حوکمڕانی شامو یەکگرتنی هەردووك هێز بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن.[2]

لایەنی سیاسیو ئیداریو پلاندانانی لە لایەنی عەسکەری بەهێزتر بوو، لە ماوەیەکی کەمو کورتدا توانی سیاسەتی وڵاتی شام بکاتو چاکە لەگەڵ دانیشتوانەکەی بکاتو ئاشتیو

---

١ معركة عين جالوت ص: ١٢٤.
٢ المصدر نفسه ص: ١٢٤.

ئاسایش‌و ئۆقرەیی بۆ بگێڕێتەوەو ژیانێکی سەربەرزانەی بۆ بسازێنێ‌و لایەنی ئیدارەی ڕێك بخات‌و حوکمڕانی ئیداری بەسەر هەموو ئەو شارانەوە دانێ کە تا ئەو کاتە تەتار داگیری کردبوون.[1]

## ئەم سوڵتانە بەم سیفەتانە جودا دەکرێتەوە:

ئیمانێکی پاك‌و بێ شك‌و گومان بە خودای بەرزو مەزن، فیترەتێکی ساغ‌و سەلیم کە لە ژێر سایەیدا پەروەردە ببوو، ژیانێکی تەنگ دەستی: کە ئامادەیی تەواوی تێدا پەیداکرد تا لە بەرامبەر نارەحەتی‌و ناگوزریەکاندا خۆڕاگرانە ڕاوەستێ، ئاوارەبوونی لە وڵاتی خۆی، بەشمەینەتی قۆناغی منداڵی، پەروەردەو ڕاهێنرانی قۆناغی منداڵی‌و مێردمنداڵی — لە لایەن ئوستادانی مەمالیکەوە — بەم شێوازە: عەقیدەی کامل بوو، ئیمانی لە دڵدا چەسپابوو، دەروونی پاك ڕاگرت، خۆی ئاسوودەو خاترجەم کرد، عەزم‌و ئیرادەی بەهێزکردو پشتی بە خودای بەرزو مەزن بەست‌و نێتی سەرکەوتنی لێ هێناو حیسابی بۆ مەرگ نەکردو هەنگاوی هاوێشت‌و بەرەو گۆڕەپانی جیهادو بەگژداچوونەوەی (مەغۆل) بەڕێکەوت،[2] جەنگەکانی (قطز) لە بەرامبەر ئەیوبیەکانی (کەرك)و میرە هەڵاتووەکانی مەمالیك بۆ ئەو هەرێمەو هەموو ئەوانەش دەیانەویست عەرشی سەڵتەنەتی مصر داگیر بکەن، وێڕای جەنگە پیرۆزو سەرکەوتووەکەی (عەین جالوت)، هەموو ئەمانە دەبنە بەڵگەی بەهێز، کە (قطز) سەرکردەیەکی سەربازی پلاندارێژی پلە یەکەم بوو، ئەو بە ئەسپایی لەسەر وڵاخەکەی دەجوڵایەوە، لە هەموو چەکە باوەکانی ئەو سەردەمەی دەزانی‌و بە هەمووان شەڕی دەکرد، بڕیاری ڕۆشن‌و پڕ وردەکاری دەردەکردن، وردبین‌و دووربین بوو، ئامانجەکانی دیار بوون، ڕاستیەکانی جەنگی دەخستنەڕوو، هەموو ئەم سیفەتانە لە جەنگی (عەین جالوت)دا لە (قطز)دا بەرجەستە ببوون، لە کاتی تەنگەتاویدا چوست‌و چالاك‌و وریا بوو، هەرچەندە ئاستەنگەکانی بەردەمی ئەستەم بوونایە بەڵام عەزمی لەسەر سەرکەوتن جەزم بوو، لە توانا‌و بڕستی دوژمن دەگەیشت‌و ڕێزی هێزی دۆستی دەگرت، هەر شتە حیسابی خۆی بۆ دەکرد، زانیاریەکانی خورد دەکردنەوە، پارێزگاری میرەکانی خۆی دەکردو بە شێوازە سەرنج ڕاکێشەکەی بەلای خۆیدا کەمەندکێشی دەکردن‌و هاریکاری دەکردن‌و یارمەتی مادی دەدانێ‌و دیاری پێشکەش دەکردن‌و متمانەی تەواوی پێ دەبەخشین، لە جەنگی (عەین

---

١ فوات الوفيات ٢/٢٨٦، معركة عين جالوت ص: ١٢٦.

٢ شذرات الذهب، نقلا عن معركة عين جالوت ص: ١٢٧.

جالۆت)دا سەرکردایەتی بەشە سەرەکیەکەی سوپا بەدەست خۆیەوە بوو و هەرسێك قۆڵی ڕاستەوچەپەو ناوەڕاستی سوپاکەی ڕێکخستو، بۆ هەر یەکێك لەم قۆڵانە سەرکردەیەکی ئازای داناو، سوپای بەسەر چەند ڕیزێکدا دابەشکرد، لە ڕێگا سوپاکەی بەم شێوەیە بەڕێکرد: قۆڵی ڕاست بە قەوسی پێشڕەوی دەکرد، قۆڵی چەپ لولپێچ دەڕۆی، نێوەڕاست بەڕێکی سەبروکە دەڕۆیشت، ژمارەیەك پاسەوان چاودێری دەوروبەرو پاشو پێشی ڕێگاوبانیان پێ سپێردرابوو، لە تەنیشتەکانەوەو بەسەر گردو تەپۆلکەی واوە بۆسەی دادەنا کە دوژمن فکری بۆ نەدەچوو، بەرەبەرە پەلکێشیان دەکردنە ئەو چاڵە مەرگانەوەو لێیان دەردەپەڕینو ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوشتن.

(قطز) کاروبارەکانی ئیدارەی سوپای مەمالیکی لەسەر چەند بنەمایەکی پتەوی دیاریکراو دامەزراند، بە جۆرێك توانی ڕێکی بخاتەوەو هێڵە گشتیەکانی بۆ بکێشێت، بە تایبەتیش ئەو پلانەی پەیوەندی بە جموجۆڵو خۆشاردانی سوپاکەی (عەین جالۆت)ەوە هەبوو، کاتێك چۆنێتیو جۆری هیمداد بۆ حوکمڕانی (حەما) دیاری دەکات، داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێت سەرباز باری سووك بێتو بتوانێ بە ئەسپاییو چالاکانە جموجۆڵ بکاتو خۆراکی زۆرو هەمەجۆر کۆڵی قورس نەکات، بۆیە فەرمان – بە سەرباز – دەکات تەنها پارچە گۆشتێك بخاتە نێو توربێنەکەیەوەو بەس.[١]

پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە: (قطز) دیندارو پاك داوێنو بە تەقواو خۆپارێز بووە، بە هۆی ئەم سیفەتەوە ئازایەتیو پێشەنگایەتی جەنگو جیهادی وەرگرت، وای لێکرد، پاڵەوانانە بچێتە گۆڕەپانی جیهادەوەو گیانی خۆی هەرزان بکاتو حیساب بۆ مەرگ نەکات، ئەو کاتێك ولاخەکەی لە ژێردا کوژرا، کەوتە پێیانو بەردەوام بەبێ ولاخو لە هێڵی پێشەوەی تەماسو لە پێناوی بیروباوەڕو پارێزگاری خاكو ناموسدا شەڕی دەستەویەخەی دەکرد،[٢] گەلێك هەڵوێستی ئیمانی بەرزو نایابی هەبوون، لەو هەڵوێستانە:

### أـ تێڕوانینی ڕۆشنو پاکیزەیی پێناس:

ئیمانی وابوو کە سەرکەوتن تەنها بەدەست خودای بەرزو بالادەستە، لەبەر ئەوە گرنگی زۆری بە لایەنی ئیمانی – سوپاو ئوممەت دەداو ڕۆڵی زانایانی ئاینی بە گەورە دادەناو هانی سوپاکەی دەدا بە پاڵنەری ئیسلامیەوە – نەك نەتەوەچیێتیو ڕەگەزپەرستی – بچنە نێو

١ عين جالوت ص: ١٢٨.

٢ المصدر نفسه ص: ١٢٨.

گۆڕەپانی جەنگی (تەتار)ەوە، لە جەنگی (عەین جالوت)دا بەم وشە مەزنە (وا اسلاماه- هاوار بۆ ئیسلام) تێڕوانینی خۆی کورت کردەوە، ئەو نەیگوت: (وا مصراه) یان (واملکاه) یان (واعروبتاه).

(قطز) مەبەستو ئامانجی ڕۆشن بوو، بە واتای پڕ بە پێستی وشە ناسنامەی ئیسلامی بە تەواوەتی هەڵگرتبوو، بێگومان تێڕوانینی ڕۆشنو پاکژی پێناس یەکێك بوو لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی سەرکەوتنەکەی.[1]

**ب ـ نزا چەکێکی کوشندەیە:**

پێش دەست پێکردنی جەنگ سیف الدین (قطز) دەیەویست شەڕەکە بخاتە درەنگایی ڕۆژەوە، گوتی: با درەنگ بێت، تا ئەو کاتە ڕۆژ خڕ دەبێتو سێبەر بچووك دەبێتەوەو بای شەماڵ هەڵدەکاتو وتارخوێنو خەڵك لە نوێژەکانیاندا دوعامان بۆ دەکەن.[2]

لەم کارەیدا شوێن پێی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی هەڵگرتووە، چونکە ئەوان حەزیان دەکرد جەنگ لە دوای نیوەڕۆوە دەست پێ بکات، جەنگو پێکدادان دەستی پێکرد، تۆقی شەڕ لەسەر موسڵمانان توند بوو، تا ئەوەی خەریك بوو دوژمن لە شوێنەکانی خۆیان دەریانپەڕێنن، سوڵتان (قطز) بە دەوروبەریاندا هەڵدەسوڕاو گیانی ئازایەتیو خۆڕاگری وەبەر دەنان، هەر کە هەستی بە لاوازبوونی لایەکی سوپاکەی دەکرد، خۆی دەگەیاندنێو عەزمو ئیرادەی تیژدەکردنەوە، لە کاتی جەنگەکەدا ژمارەیەك هەڵوێستی پاڵەوانانەو ئازایانەی تۆمارکردن.[3]

**ج ـ ئاواتی شەهیدی:**

لە جەنگی (عەین جالوت)دا ئەسپەکەی کوژرا، لەو کاتەدا مەیتەرێکی لێ نەبوو ئەسپێکی ڕەسەنو خۆشڕەوی بۆ بێنێت، جەنگ لە گەرمیدا بوو، ناچار لەسەرپێ ڕاوەستاو کۆڵی لە شەڕکردن نەدا، یەکێك لە سەرکردەکانی چاوی پێکەوت لەسەر ئەسپەکەی دابەزیو سوێندی خوارد دەبێت سوڵتان سواربێت، بە قسەی نەکردو گوتی: نامەوێ موسڵمانان لە سوودی تۆ بێبەش بکەم، هەر بەم شێوەیە بوو تا مەیتەر ئەسپی بۆ هێناو سواری بوو، یەك لە میرەکان لۆمەی کردو گوتی: جەناب! بۆ سواری ئەسپەکەی فلانەکەس نەبووی؟ ئەگەر دوژمنێك بینیبای دەهاتو دەیکوشتی، ئەو کاتە بەهۆی کوژرانی تۆوە ئیسلامیش لەنێو دەچوو،

---

١ قصة التتار ص: ٣٥٣.

٢ الفتوح الاسلامية عبر العصور ص: ٣٤٧.

٣ المصدر نفسه ص: ٣٤٧، الطريق للقدس، محسن محمد ص: ١٧٥.

وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەو کاتە من بەرەو بەهەشت دەڕۆیشتمو ئیسلامیش خاوەنی خۆی هەیە دەیپاراست، فلانو فلانو فلان — هەر هەموویان کوژران، ـ ناوی ژمارەیەك مەلیکی هێنان — خەڵکانێکی تری ڕاستکردەوەو کردنی بە پاسەوانو پارێزەریو نەیهێشت ئیسلام لەنێوبچێت،[1] ئەم هەڵوێستە مەزنەی (قطن)ی پاڵەوان، بەڵگەیە لەسەر خۆ بە کەم دانانو گرنگی نەدان بە پاراستنی خۆی لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی موسڵماناندا، هەروەها بەڵگەیە بۆ گەورەیی ئیسلامو ئەو ئامانجە بەرزەی بۆتە ئاواتی هەموو ئیمانداریك، ئەویش ڕەزامەندی خوداو چوونە بەهەشتە.[2]

**س ـ خەونێکی ڕاستو دروست:**

یەکێك لەو هۆکارە گرنگانەی زەوقو شەوقی بەبەر (قطن) نابوو بە پەلە هەنگاو هەڵێنیّو تەتار لە جەنگدا ببەزێنێت، خەونێکی سەردەمی منداڵی بوو کە پێغەمبەر (ﷺ)ی بینیبوو زۆرجار بۆ هاوەڵەکانی دەگێڕایەوەو دەیگوت: لە خەودا خەونم بە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە بینی، پێی فەرمووم: (تۆ دەبی بە سوڵتانی مصرو تەتاریش دەشکێنی)، فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ) ڕاستو دروستو بێگومانە،[3] لە کاتێکدا زۆربەی میرانی مەمالیكو جەنگاوەرەکانیان ترس دایگرتبوون، بەڵام ئەم خەونە ڕاستە بوو بە هاندەرێکی گەورە تا (قطن) بەوپەڕی عەزمو ئیرادەی بەهێزەوە یەکلایەنە بڕیاری خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل ڕاگەیەنێتو — غیرەتو شەهامەتیش بەبەر میرە هاوەڵەکانیدا بکاتەوە ـ، چۆن هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و (رضي الله عنهم) لەسەر بەڵێنو موژدەیەك کە لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێیان دەدرا، بەوپەڕی یەقینەوە خۆیان بەنێو گۆڕەپانی جەنگدا دەکرد، (سیف الدین قطن)یش وەکو ئەوان چووە نێو جەنگەوەو متمانەی تەواوی هەبوو خودا ئەوو سەربازانی سەردەخات، خەونەکە بەنێو میرە هاوەڵەکانیدا بڵاوبۆوە، بۆیە ئەوانیش بەوپەڕی هیمەتی بەرزو متمانەی پتەوەوە چاکی مەردایەتیان لێ هەڵماڵیو بەرەنگاری تەتار بوونەوە، ئەلحەقی ئەم خەونە پاڵنەرێکی بەهێزی (قطن)و هاوەڵانی بوو تا هەموو هێزو وزەی خۆیان لە ڕێی خودادا ببەخشنو[4] بوو بە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

---

١ الفتوح الاسلامية عبر التأريخ ص: ٣٤٨.
٢ التأريخ الاسلامي ١٦/٣٨٨.
٣ المصدر نفسه ١٦/٣٩٦.
٤ المصدر نفسه ١٦/٣٩٢.

### ش- پێشەنگی:

(سیف الدین قطز) خۆبەکەمزان بوو، بە کردار ئەمەی سەلماندو جوانترین نموونەی بۆ سەربازەکانی و تەواوی ئوممەت خستەڕوو، لە ئەنجامدانی ئیشەکاندا لە باری پێشەوەبوو، بێگومان کەسێك بیەوێت خەڵك پەروەردە بکاتو پەروەردەش بە کردەوە لە خودی خۆیدا ڕەنگی دابێتەوە پێی دەگوترێت پێشەنگ، ئەم جۆرە پەروەردەیە هەزار هێندەی وتارو نوسین لە بواری پەروەردەدا کاریگەری زیاترە.

(سیف الدین قطز) لە هەموو بوارەکاندا پێشەنگ بوو: (ڕەوشت بەرزی، دەست پاکی، جیهاد، ئیمان، لێبوردن)، هەر کامێك لە سەربازەکانی هەستیان بەوە نەدەکرد بە (قطز) نامۆن و شتێکیان لە ئەو کەمترە، بە خودی خۆی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چووە نێو سەنگەرەوەو بە هاوشانی سەربازەکانی دەجەنگا، ئەمانیش کە ئەویان دەبینی دەبوایە حەتمەن بجەنگن.[1]

### ع ـ دۆستایەتی نەکردن لەگەڵ دوژمنانی ئوممەت:

هەرچەندە تەتار لە سوپاو چەکدا لە موسڵمانان لە پێشتربوون، بەڵام (سیف الدین قطز) حیسابی بۆ ئەمە نەکردو تۆزقاڵێکیش مەیلی دۆستایەتی کردنی ئەوانی نەکرد، لەگەڵ ئەوە پێویستی زۆری بە سەرانی نەسرانیەکانی شام هەبوو بەڵام دۆستایەتی ئەوانیشی نەکرد، پێش (قطز) گەلێك سەرکردەی موسڵمان بە بیانووی دوورخستنەوەی خۆیانو گەلەکانیان لە وەیشومەکانی جەنگ خۆیان هەڵدایە نێو زەلکاوی دۆستایەتی کردنی کافرانەوە، بەمە هەڵەیەکی شەرعی نەشیاویان ئەنجام دا، بەڵکو هەڵەیەکی چەند لایەنەیان ئەنجامدا، لایەکیان خۆ دزینەوە لە جیهاد هەڵەیەو تاوانە، لایەکەی تریشیان ڕاهێنانی نەتەوە لەسەر مل دانەواندن بۆ دوژمنان هەڵەو تاوانێکی ترە، لە لایەکی تریشەوە دۆستایەتی کردنی دوژمنو پێت وابێت هاوڕێتە هەڵەی سێهەمە، بەڵام (قطز) سوپاس بۆ خوا بیروبۆچوونەکانی ڕۆشن بوونو دەستیشی بە شەرعەوە گرتبوو،[2] خودای بەرزو مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾ (المائدة: ٥١).

---

١ قصة التتار ص: ٣٥٥.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٥٦.

(سیف الدین قطن) لە ڕیزی ئەو سەرۆكو سەركردە حەكیمو لێزانانە بوو كە توانیان دەست بە هۆكارە كاریگەرەكانی سەركەوتنەوە بگرنو هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكەن، ئەو بە یەكسانی حیسابی بۆ هۆكارە مادیو مەعنەویەكان كرد، دوای كۆتایی هاتنی جەنگەكە سوپاكانو سەركردەكانی كۆكردنەوەو دابەزیو نێوچاوانی لەسەر زەوی داناو دوو ڕكات نوێژی شوكرانەی سەركەوتنی بۆ خودا ئەنجام دانو بڕیاریدا درێژە بە جیهاد بدات، هەستایە سەرپێو بەم شێوەیە وتاری دا: لەگەڵ خودا ڕاست بوونو جیهادتان لە پێناوی ئەودا كرد، ئەویش كەمی ئێوەی بەسەر زۆری دوژمندا سەرخست، هەرگیز شانازی بەم كارەتانەوە نەكەن، بەڵكو سوپاسی خودا بكەنو گەردنكەچی بڕیارەكانی بنو سەر بۆ ئەو زاتە مەزنە دانەوێنن، چونكە ئەو خاوەنی هێزی نەپساوە، چاك بزانن: ئێوە دەستتان بە جیهاد كردووەو هێشتا لێ نەبوونەتەوە، بێگومان خوداو پێغەمبەرەكەی لێتان ڕازی نابن تا دوژمنەكانیان لە خاكی ئیسلام دەرنەكەن، ئەگەر ئەمەتان كرد ئەوا هەقی ئیسلام دەدەنو لەو ڕۆژەشدا ئیمانداران بە سەركەوتنی خودا دڵخۆش دەبن.[1]

**٢ـ سپاردنی كاروبار بە خەڵكانی شیاو:**

(سیف الدین قطن) گرنگی بە پسپۆڕیو ئەمانەت دەداو كاروبارەكانی دەوڵەتی بە پێوەری ئەم دوو سیفەتەو – كوردگوتەنی نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب – بە خەڵكان دەسپارد، خودای بەرز لەسەر زمانی كچەكەی شوعەیب (علیه السلام) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾ (القصص: ٢٦). واتە: ئەم پیاوە – كە موسا علیه السلام بوو – باشترین كەسە بە كرێی بگریت، چونكە – بەهێزو ئەمیندارە).

ئیمامی (بوخاری) لە (ابو هریرة)وە دەگێڕێتەوە: دەشتەكیەك پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد، كەی دنیا دەڕوخێ؟ فەرمووی: ((اذا ضیعت الامانة فانتظر الساعة))، واتە: هەركات ئەمانەت فەوتێنرا چاوەڕێی ڕووناخی دنیا بكە، گوتی: لەنێوچوونی ئەمانەت چۆناوچۆنە؟ فەرمووی: ((اذا وسِّد الأمر الى غیر أهله فانتظر الساعة))، واتە: هەركات كاروبار خرایە دەست خەڵكی نەشیاو، چاوەڕێی ڕووخانی دنیا بكە.[2]

---

١ من اجل فلسطین، حسني أدهم جرار ص: ١٠٢.

٢ البخاري، كتاب الرقائق، باب رفع الامانة الحدیث: ٦٤٩٦.

جا هەر کاتێك خەڵکانی نەشیاوو نائەمین بە واسیتەو خزم خزمێنەو بەرتیل دەستیان بەسەر کاروبارەکاندا گرت، بێگومان سەرکەوتن – بەسەر دوژمنو ئاستەنگەکاندا – دوور دەبێت.[1]

بەڵام (سیف الدین قطز) کاروبارەکانی دەوڵەتەکەی دانە دەست خەڵکانی لێهاتوو و شیاو، ئەو جۆرە کەسانەی کردنە سەرکردەی سوپاکەی کە دوای خودای باڵادەست ئەوان لەسەر ئاستی تاکتیکیو ستراتیژی سەربازی دەوری بەرچاویان لە شکست پێدانی مەغۆلو سەرکەوتنی موسڵمانان گێڕا،[2] بەناوبانگترینی سەرکردەکانی (عەین جالوت) ئەمانە بوو:

**أ- (الظاهر رکن الدین بیبرس البندقداري):**

(بیبرس) لە جەنگی (عەین جالوت)دا سەرۆکی سوپای مەمالیكو سەرکردەی پێشەنگی سوپاکەبوو، (بایدر)ی سەرکردەی پێشەنگی سوپاکەی مەغۆلی بەرەو خاکی (أفامیە) ڕاونا، هەر لە سەرەتای ژیانیەوەو بە کۆیلەیی زیرەکیو نەجابەتی پێوە دیار بوو، لەبەر ئەمە (مەلیك صالح نجم الدین أیوب) لە خۆی نزیك کردەوەو هێنایە ڕیزی (جمدار)ەکان – کە مەمالیکی تایبەتی خۆی بوونو پاسیان لێ دەکرد–، لە جەنگی (دمیاط)دا بەشداری کردو جەنگێکی دەستەوکەرەوەو قارەمانانەی ئەنجامداو دەری خست کە لە بواری سەربازیدا کەسێکی هەڵکەوتوو و لێهاتوو ئازاو بە جەزربەیە، بە حوکمی ئەوە مەغۆلەکان لە تەمەنی (١٤)ساڵیدا گرتبوویانو سوکایەتیان پێکردبوو، پاشان فرۆشتبوویان، تا ئەوەی گەیشتبووە لای (البندقداری)ی – ئەو کەسەی بۆتە نیسبەت بۆ ناوەکەی – و پاش ئەوەش لە لای مەلیك صالح گیرسابۆوە، هەر دەهاتو داخو ڕكو کینەی لە دژی مەغۆل زۆرتر دەبوو، پاڵەوانێکی مەزنی لێ دروست بوو، یەکێك بوو لەو قارەمانانەی بەشداری جەنگی (المنصورة)ی کرد – کە یەکێك بوو لە جەنگە گەورەو یەکلاکەرەوەکانی نێوان خاچپەرستانو ئەیوبیانو، سوپای ئەیوبی – کە زۆرینەی لە مەمالیك پێکهاتبوو – سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنا، ئەو ئەزموونی پەیدا کردو بە چاوی خۆی دەیبینی کە دەکرێت سەرکەوتن بەسەر ئەم – خاچپەرست–انەو غەیری ئەوانیشدا تۆمار بکرێت، ئەگەر بێتو مەمالیك خۆیان ڕێك بخەنو مەشق بکەن دەتوانن بەسەر تەواوی چاوچنۆکەکانو داگیرکەراندا زاڵ بن، لە لایەنی سەربازیەوە خوێندەوارو ڕۆشنبیر بوو، خۆی بە خوێندنەوەو لێکدانەوەی مێژووی جەنگە کۆنەکانەوە سەرگەرم کردبوو، زۆر هانی سەرکردە

---

١ قصة التتار ص: ٣٥٧.

٢ عين جالوت ص: ١٢٣.

سەربازیەکانی دەدا دەربارەی ئەم بابەتە شارەزایی پەیدا بکەن، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا مامۆستایانو پسپۆڕانی جەنگی خۆش دەویستنو ڕێزی لێ دەنانو لەپێناوی گوتنەوەی وانەکانو بەخشینی زانیاری زیاتری مێژوویی سەربازی کەشو هەوای سافی بۆ ساز دەدان، (بیبرس) دەیگوت: (بیستنی بەسەرهاتەکانی مێژوو، زۆر لە ئەزموون گەورەترە، ئەو مەشقە سەربازیەی فێری بووی بیپارێزەو لەسەری بەردەوام بە، بایەخ بە هەموو شتە بچووكو گەورەکانی سیاسەتو جەنگ بدەم).

سیفەتو خوخدە عەسکەریەکانی تێدا بەرجەستە ببوون وریاو لەسەر هەستو چالاكو بە ئیحتیات بوو، لە بەرامبەر هەر ڕووداوو کارێکی دوژمنکارانەدا هەڵوێستێکی گونجاوو لەباری دەنواند، لە واقیعی جەنگە گەورەکاندا ژیانێکی دووروودرێژو پڕ ئەزموونی بەڕێکرد،[١] یەکێك بوو لەو سەرکردە بە جەزرەبانەی سەرکەوتنەکەی جەنگی (عەین جالوت)یان تۆمار کرد.

**ب ـ میر فارس ئۆکتای موستەعرەب:**

ئەتابەکی سوپا بوو، مشوری بارگەو چەكو کەرەستەی سوپای دەخوارد، سەرپەرشتی تەواوی کاروبارەکانی سوپای دەکرد، سەرەڕای ئەمەش: یەکێك بوو لەو کەڵە مێردانەی لە بواری ڕێکخستنو چەکدارکردنو بارگەسازدانی سوپادا متمانەی تەواو لەسەر دیانەتو ڕەوشتو ئازایەتیو لێوەشاوەییان هەبوو،[٢] ئازاو پێشەنگ بوو، شارەزای هونەرەکانی جەنگ بوو، (قطز) زۆرجار پەنای بۆ ئەو دەبرد، هێدیو لەسەرخۆ بوو خۆی لە حەرامو شتی گوماناوی دەپاراست، حەزی لە خێرو خێرخوازی بوو، یەکێك بوو لە کەسە هەرە نزیکە خۆشەویستەکانی (مەلیك قطز)، بە لای بەردەستەکانیشیەوە خۆشەویست بوو.[٣]

**ج ـ سنجر حەلەبی:** لە ساڵی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز یداو لە سەردەمی (مەلیك منصور علی کوڕی ئایبەك)دا ئەتابەکی سوپا بوو، دوابەدوای جەنگی (عەین جالوت) لە دیمەشق بوو بە والی (مەلیك قطز)، کاتێك هەواڵی کوژرانی (قطز)و بەیعەتدان بە (مەلیك ظاهر بیبرس)ی پێگەیشت بەرەو (بەعلەبەگ) هەڵات، لەوێ تەنگیان پێ هەڵچنیو پاش دەستگیرکردنی خستیانە زیندانەوە، هێندەی نەخایاند ئازادکرا، لە پاڵەوانێتیو ئازایەتیدا پلەیەکی یەکجار بەرزی هەبوو، لە جەنگە یەکلاکەرەوەکەی (عەین جالوت)دا ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی گێڕا.[٤]

---

١ معركة عين جالوت ص: ١٢٨ـ١٣٦.

٢ من اجل فلسطين، حسني أدهم جرار ص: ٩٨.

٣ معركة عين جالوت ص: ١٣٦.

٤ الوافي بالوفيات ١٥/٤٧٣، معركة عين جالوت ص: ١٣٧.

**د ـ ئاقوش الشمس الامیر جمال الدین:**

سەربازێکی بەهێزو میرێکی ئازاو بوێرو پێشەنگی نێو گۆڕەپانی جەنگ بوو، لەلای ئەمیر بدرالدین بێسەری (خەشداش) بوو، لە لای غەیری ئەویش خزمەتی کردبوو، لە دەموچاوی دەخوێنرایەوە کە ئەم پیاوە بەرەو پۆستی باڵا بەرز دەبێتەوە، تا جەنگی (عەین جالوت) هاتە پێشەوە، یەکە سەربازیەکەی خۆی ڕێکخستو بەرەو بارەگای سەرکردایەتی سوپاکەی مەغۆل ڕۆیشت، بە قەد نێوانی ژێی دوو کەوان (قابەقەوسەین) یان نزیکتر لە سەرکردەی گشتی سوپا نزیك بۆوە، زەبرێکی گورچوبڕی لێداو بە زەوی داداو (کتبغا)ی دیلکرد، کاتێك سوپاکەی مەغۆل بینی سەرکردەکەی گیراوە، مەعنەویاتی دابەزیو ئاشبەتاڵی بە جەنگ کرد، بەم شێوەیە (ئاقوش) ئامانجی پێکاو سوپاکەی سەرخستو گۆڕانی بەسەر مێژوودا هێنا، پاشان بوو بە والی (حەلەب)و تا مرد لەوێدا مایەوە.[1]

هـ ـ ئەمانەی ناومان هێنان دیارترینو گرنگترین سەرکردەکانی سوپای مەمالیك بوونو بوونە هۆکاری سەرکەوتن، (سیف الدین قطن) بە بایەخەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەرکردە هەڵکەوتوو و شایستەکان دەکرد، ئەوانیش دەورەیان لێداو بە چاوی ڕێزو خۆشەویستیەوە تەماشایان دەکرد، لەم نێوانەدا متمانە لە دایك بوو، متمانەیەك بوو بە کلیلەی سەرەکی کردنەوەی دەروازەی سەرکەوتنەکەی (عەین جالوت)، (سیف الدین قطن) خێوی ئەو سیفەتە بەرزانە بوو کە بە هۆیانەوە توانی خۆی بکاتە جێ متمانەی میرەکانو زانایەکانو تێکڕای خەڵك، گرنگترین ئەو سیفەتانە:

— سرنج ڕاکێشان: ئەمە بە گرنگیدان بە خەڵکانی ترو چوونە نێویانەوەو بەشداریکردن لە خۆشیو ناخۆشیەکانیانو شەڕو خێرەکانیانو خەمو پەژارەکانیانو مشورلێخواردنیان دێتە ئەنجام، ئەو لە ماوەی ئەنجامدانی ئەم کارەیدا متمانەی سەرکردەکانو زانایەکانو تێکڕای جەماوەری بۆ خۆی پەیدا کرد.

— (ڕاستیو ڕاشکاویو لێوەشاوەیی کاری بە کۆمەڵی ڕێکوپێکی ئیسلامی، بوونو توانای پەیوەندیکردن بە خەڵکانی ترەوە)، هەموو ئەمانە چەند سیفەتێکی درەوشاوەی (قطن) بوون، وایانکرد (قطن) ببێتە جێ متمانەی هەموو لایەك.[2]

---

١ النجوم الزاهرة ٩٧/٧، معرکة عین جالوت ص: ١٣٨.

٢ ادارة الجودة الشاملة للشیخ فیصل بن جاسم بن محمد الثاني ص: ٢١٣.

**٣ـ سوپای بەهێز:** لەو سەردەمەدا سوپای مەمالیك بەهێزترین سوپای ئیسلامی بوو، فەزڵ و چاكەی ئەمە پێشدا بۆ خودای گەورەو ئینجا بۆ (مەلیك صالح نجم الدین ایوب) دەگەڕێتەوە، (مەلیك صالح) چاكسازی سەربازی لەنێو دەوڵەتی ئەیوبیدا ئەنجامداو سیاسەتێكی تازەی لەم پێناوەدا ڕەچاوكرد، بە جۆرێك تورکە كۆیلەكانی خستنە خزمەتی سەربازیەوە كە لە لایەن سوڵتانە ئەیوبیەكانی پێش خۆی كاری لەم شێوەیە نەكرابوو، ئەم سوپا بەهێزو ڕێكوپێكە بوو بە پشتیوانێكی باشی مەلیك صالح لە جەنگە دەرەكیەكانی گەڵ مەملەكەتی (بیت المقدس)و بەگژداچوونەوەی پەلاماری (حەوتەمی خاچپەرستان)،[١] بەهاوشانی ئەم پێشكەوتنە سەربازیە لایەنی ئاینیش لە پەروەردەو فێركردن-ی مەمالیك-دا بایەخێكی گەورەی پێدرا، تا كار بەوە گەیشت كەتیبە سەربازیەكانی مەمالیك بەرگریان لە عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام دەكرد، ئەمەو دەوڵەت-ی ئەیوبی- بوو بە خاوەنی سوپایەكی عەقایدی ڕێكخراو و ڕاهێنراو لەسەر هونەرەكانی جەنگ و كوشتارو هەموو جۆرە چەكەكانی ئەو سەردەمەو، بەوپەڕی پسپۆڕانەو پاڵەوانانە بەرەنگاری هێزەكانی خاچپەرست بۆوە، لە سەرەتادا شكستیان پێوە دیار بوو، بەڵام بە حوكمی شارەزایی باشی سەركردەكانی لە دانانی نەخشەو پیلانی جەنگی تێكەڵ بە فرتوفێڵ و هەڵخەڵەتاندنی جەنگی توانی لە ئەنجامدا سەركەوتن بەدەست بێنێت، كاتێكیش مەمالیك گەیشتنە سەر تەختی سەڵتەنەتی مصر دامەزراوە سەربازیەكەیان لە ئەیوبیەكان وەرگرت و زیاتر گەشەیان پێدا، سوپای مەمالیك بە تەواوی سەركردە سەربازیەكانیەوەو ڕێكخراوە نیزامیەكانیەوەو سوپای ناوەندیەوەو سوپای هەرێمەكانەوەو سوپای یەدەكیەوە - كە عەرەب و كوردو توركمانیشیان تێدابوون - بەشداری جەنگی (عەین جالوت)ی كرد، مێژوونووسان قەبارەی تەواوی سوپای مەمالیكی ئەو سەردەمە بە (٤٠) هەزار جەنگاوەر مەزەندە دەكەن،[٢] ژمارەی ئەسپسوارەكانیان خۆی لە (١٠) هەزار داوە كە زۆرینەیان مەمالیك بوون و ژمارەیەكی كەمیان لە بەشداریكەران بووە، ژمارەی سوپاكەی مەغۆل لە (عەین جالوت) (١٥) هەزار جەنگاوەر بووە، هێزە سەرەكیەكەی ئەم سوپایە لەگەڵ هۆلاكۆ بە ئاراستەی ولاتی (فارس = ئێران) گەڕایەوەو هەندێكی تری هێزەكانی بەسەر ناوچە داگیركراوەكانی نێوان بەغداو شامدا دابەش بوو، بە بیروباوەڕی سەركردەكانی مەغۆل ئەم هێزە (١٥) هەزاریەی سوپاكەیان بە

---

١ الملك الصالح ایوب وانجازاته السیاسیة والعسكریة ص: ١٥١.

٢ النجوم الزاهرة ١٩٧/٧، معركة عین جالوت ص: ١٦٥.

حوكمی شارەزایی تەواوی لە جەنگداو پێشینەی سەركەوتنی لە هەموو شەڕەكانی پێشدادا ئەوا بە سوكو ئاسانی دەتوانێ سوپاكەی مەمالیك تێك بشكێنێت، ژمارەیەك سەرچاوەی مێژوویی جەخت لەسەر ئەم ژمارەیە دەكەنەوە، وەكو: (جامع التواريخ، تأريخ مختصر الدول، تأريخ الشهابي، تأريخ الصليبيين، تأريخ الزمان).[١]

**٤ـ ژیاندنەوەی گیانی جیهاد:**

ئامانج لە باڵا بردنو جۆشدانی لایەنی ڕوحیو ڕەوانی (مەعنەوی)ی سوپای مەمالیك ئەمە بوو: تامەزرۆكردنی فەریزەی جیهادو جوڵاندنی غیرەتی پیاوانە بۆ بەگژداچوونەوەو سەرشكاندنەوەی داگیركەرانو پارێزگاری كردنی حورمەتو ڕێزی ئیسلامو وڵاتو ناموسی موسڵمانان.

بێگومان هەر هەموو سوپایەك پشت بە هێزی مەعنەوی دەبەستێت، هیچ سوپایەكیش بەبێ مەعنەویات سەرناكەوێ، هەر لەبەر ئەمەیە سەركردایەتی سوپا لەگەڵ ئەوەدا هەوڵ دەدا چەكو كەرەستەی جەنگی تازەو چاك بێتو لایەنی ئیداریو خزمەتگوزاری وەكو پۆشاكو خۆراكو تەواوی پێویستیەكانی تر لە حاڵەتێكی باش دابن، بە هەمان شێوەش هەوڵ دەدات لایەنی مەعنەوی سوپا بەهێز بكاتو بەرەو ئاستی باڵای بەرێت، سەركردایەتی سوپای مەمالیك بایەخێكی باشی بە بەهێزكردنی لایەنی ئیداریو خزمەتگوزاری دا، پلەوپایەی میرو سەربازەكانی بەرزدەكردەوە، ڕێزی لێ دەنانو خەڵاتی دەكردن، پارەو ماڵی زۆری دەدانێ، بەڵام تەواوی ئەم هۆكارانە كاتینو كار ناكەنە سەر سەرباز بە زوویی ماندو ومجرۆیی لەبیر بچێتەوەو بگەڕێتەوە سەر دۆخی ئاسایی جارانی، لێرەدا هۆكارێكی زۆر گەورەتر هەیە كە ئەم كارە دەكات، ئەویش عەقیدەو ئیمانە، ئیمان فەرمان بە جیهاد دەكات، ئەنجامی گەڵ موجاهیدان سەركەوتن یان شەهیدبوونە، مامۆستاو زانایانی ئایینی ڕۆڵی كاریگەریان بینی لە هەڵایساندنو گەشكردنەوەی مەشخەڵی ئیمان لە دڵو دەروونی سوپای مەمالیكدا، بڵێسەكەیان گەیاندە ئەو جێگەیەی سەرباز بە هەموو تینو تواناو وزەیەكیەوە بێتە گۆڕەپانی جیهادەوە،[٢] دەتوانین هاندەرەكانی لایەنی مەعنەوی سوپاكەی مەمالیك لە جەنگی (عەین جالوت)دا لەم چەند خاڵەدا كورت بكەینەوە:

- گەورەیی قەبارەی سوپای (مەمالیك) لە بەرامبەر قەبارەی سوپای دوژمندا.
- متمانەی تەواو كە خودا سەریان دەخات.

---

١ معركة عين جالوت ص: ١٦٦.

٢ معركة عين جالوت ص: ١٩١.

— تۆڵە سەندنەوە لەو مەغۆلانەی وڵاتانێکی زۆری ئیسلامیان داگیرکردووەو خەڵکێکی زۆریان بە ناهەق کوشتووەو شەرەفو ناموسی موسڵمانانیان شکاندووەو بێ حورمەتیەکی زۆریان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام کردووە.

— ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی گیانی قوربانیدانو گیانبازی لە دڵو دەروونی جەنگاوەراندا خرۆشاندو هانیدان پێش مەرگ بدەنەوەو مەرگیان لە ژیان بە لاوە خۆشەویستتر بێت.

— خۆ سازدانو ئامادەباشی تەواو بۆ ئەو جەنگەو کۆکردنەوەی هەرچی تواناو وزەی مادیو مەعنەوی هەبوو لە پێناوی بردنەوەیدا.

— تەمبەڵیو کەمتەرخەمی دوژمنو جێبەجێنەکردنی یاساو ڕێساکانی جەنگو لەسەر هەست نەبوونو ئیحتیات نەکردن.[١]

وەکو لە بابەتی لایەنی مەعنەوی سوپای مەمالیکدا تێبینی دەکەین تەنها عەقیدەو بیروباوەڕ حیسابی بۆ کراوە، بە هۆیەوە کۆبوونەوەو یەکیان گرتووەو لەسەر ئاستی یەکسانیو یەك زەمینەدا ئاراستەیان وەرگرتووە، هەرچەندە سەربازانی ئیسلام لەم جەنگەدا چینو ڕەگەزەکانیان هەمەجۆربوون بەڵام عەقیدەو ئیمان هەر هەموویانی بەرەو جیهاد ئاراستە کرد، لایەنی مەعنەوییان کە پێیەوە چوونە نێوجەرگەی گۆڕەپانی جەنگەوە لەگەڵ لایەنی مەعنەوی مەغۆلەکان بەرامبەر نەدەکراو نێوانیان ئاسمانو ڕێسمان بوو.

ئەمە (قطز)ەو بانگی ئیمان لێ دەداو پڕ بە گەرووی هاوار دەکات (وا اسلاماه= هاوار بۆ ئیسلام)، هەر هەموو سوپا بە هەموو ڕەگەزو ڕەنگەکانیانەوە بەوپەڕی مەعنەویاتی بەرزیانەوە لە دەورەی کۆبوونەوە، هەر ئەم بانگە ئیمانیە بوو، دڵو دەروونی سەرکردەکانو سەربازەکانی خرۆشاندو هانیدان بە هەموو وزەو تواناکانیانەوە بە شەوقو زەوقی سەرکەوتن یان شەهید بوون بەرەنگاری دوژمن ببنەوە، سوپای مەمالیك بە هۆکاری ئەم بانگە ئیمانیەوە بە یەکدەست جەنگاو لەو زەمەنە مێژوویی و هەستیارەدا بەسەر گەورەترین زلهێزی جیهاندا سەرکەوت.[٢]

**٥ـ خۆسازادانو سوننەتی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە:**

موسڵمانان لە جەنگی (عەین جالوت)دا چونکە دەیانزانی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ سوننەتی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە بکەن سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەریەك لە

---

١ المصدر نفسه ص: ١٩١.

٢ المصدر نفسه ص: ١٩٣.

سوڵتانەکانی مەمالیك شارەزاییەکی تەواوی بەم سوننەتە هەبوو، کاروکردەوەکانیان دەبنە بەڵگەی ئەم قسەیەمان، خودای بەرزو مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ ....﴾ (الانفال: ٦٠). واتە: هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێزو توانا تا بە ڕێشمەی ئەسپیش دەگات بۆیان سازکەن....، سەرکردەکانی مەمالیك چاك لەوە حاڵی ببوون کە (جێگیرکردنی حوکمی ئاینی ئیسلام) پێویستی بە بەکارهێنانی هەموو جۆرەکانی هێز هەیە، ئەوان بە کردارو لە ماوەی مەشق و ڕاهێنان و نەخشەو پلان و ڕێکخستنندا ئەم ئایەتە پیرۆزەیان تەفسیر کرد.

گرنگیەکی باشیان بە سوارچاکی و ئەسپسواری دەدا، دەیانەویست ئەگەر سوارە چووە نێو گۆڕەپانی جەنگەوە لەگەڵ شیربازیدا ڕمبازێنیش بزانێ، بۆیە زۆربەی مەلیك و سوڵتان و میرەکانی لە سوارچاکە یەکەمینەکان بوون، لەو پاڵەوانە دەستکەرەوانە بوون کە لە تەواوی هونەرەکانی تیراندازی و نیشانە شکێنی و ڕم وەشاندن و شیربازی و جوڵانەوەی سوکی نێو گۆڕەپان و تێکڕای هونەرەکانی تری جەنگدا پێشەنگ بوون و دەیانزانی تەواوی ئەو چەکانە بەکاربێنن کە لەو سەردەمەدا باوبوون، هونەری ئەسپ سواری بەس لەسەر سوڵتان و میرو سەرکردەکان کورت هەڵنەهاتبوو، بەڵکو زۆربەی سەربازەکان یان بڵێ هەر هەموویان ئەسپ سوار بوون و لەسەر سوارچاکی ڕاهێنانیان پێکرابوو، بەلای سوپای مەمالیکەوە هونەری ئەسپ سواری لەپێش هەموو هونەرەکانی تری جەنگەوە دەژمێردرا.[1] سەرکردەکانیان لە کاتی خۆسازدان و مەشق و ڕاهێنان و دەستگرتن بە هۆکارەکان جەختیان لەسەر ئەم سیفەتانە دەکردەوە:

**أـ گشتگیری و هەمەلایەنەیی:**

چۆن مەشق و ڕاهێنان بەشی پێشەنگی سوپای دەگرتەوە بە هەمان شێوەش بەشی پاشکۆکەشی دەگرتەوە، تاقمە سەربازی بچووك و یەکە سوپای گەورەو سەربازو سەرکردەو هێزی دەریایی و هێزی وشکانی – بەبێ هەڵاواردن – بە یەکسانی لە ڕاهێنان بەهرەمەند دەبوون، مەڵبەندەکانی مەشق هەموو جۆرە ڕاهێنانەکانی بە تەواوی شکڵ و شێوازەکانیەوە لەخۆدەگرت، هەرچی چەك و کەرەستەی جەنگی باوی ئەو سەردەمە هەبوو لەوێدا بەکاردەهێنران و ڕاهێنانیان لەسەر دەکرا، ژمارەیەك یاری و گەمەی وەکو پێشبڕکێ و زۆرانبازی تێدا دەکران کە دەبوونە مایەی قایمی و دامەزراوی جەستەی سەربازو

---

[1] المصدر نفسه ص: ٢٥٠.

زیادبوونی وزەو توانای بۆ ڕۆژەکانی جەنگو کوشتار،بە ڕەچاوکردنی گشتگیریو هەمەلایەنی لە بواری مەشقو ڕاهێناندا، سوپای مەمالیك هاوسەنگیەکی ڕێکوپێکی عەسکەری لەنێو ڕیزەکانیداو تایبەتمەندیە هەمەجۆرەکانیدا بۆ دروست ببوو و، چووە قۆناغی یەك — دامەزراوی سوپای جەنگیو لەمەولا دەیتوانی بە قورساییەکی باش فشار بخاتە سەر دوژمنو کەلێنی گەورە لەنێو ڕیزەکانیدا دروست بکات، لە جەنگی (عەین جالوت)دا لەگەڵ پاراستنی هێڵی بەرگریو مانەوە لە سەنگەرەکانیدا، هێڵی تەماسی بەرگری سوپای مەغۆلی بەزاندو توانی لە ڕاستو چەپەوە خۆ بگەیەنێتە پشتەوەی دوژمنو[1] کارێکی لە بەرامبەردا ئەنجامدا کە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات.

**ب ـ پەیوەست بوونی مەشقی ئیمانیو مەشقی سەربازی بە یەکترەوە:**

مەمالیك لە ژێر چاودێری ژمارەیەك ڕاهێنەری تایبەت بە پەروەردەو فێرکردن لەسەر ئیمانو بنەماو حوکمەکانیو تێڕوانینی بۆ جەنگو جیهادی کافران ڕاهێنانیان پێ دەکرا، وێڕای ئەمەش قورئانیان فێردەکراو هەندێك لەوان قورئانیان بە تەواوەتی دەرخ دەکردو دەبوون بە (حافظ القرآن)، لەگەڵ ئەمەشدا تەواوی وانەکانی زانستی شەرعیان لە تەفسیرو حدیثو ڕەوشتو زماندا پێ دەگوترا، پاش تاقیکردنەوەیانو دەرچوونیانو تەواوکردنی ئەم قۆناغەو گەورەبوونیان، ڕادەستی ڕاهێنەرانی تایبەتی کاروباری سەربازی (جەنگو کوشتار) دەکران، لەسەر ئەسپ سواری مەشقیان پێ دەکرا، پلەبەپلە لە سوکەوە بەرەو قورس کاریان لەسەر دەکرا، سەرو چەکیان پێ دەدراو دەبوایە لەسەر پشتی وڵاخەکانیان ڕاهێنانیان کردبایە، تا ئەوەی فێری بەکارهێنانی هەموو چەکەکان دەبوون لە هەموو حاڵەتەکانی ڕۆیشتنو غاردانو وەستاندا مەشقیان دەکرد، ئینجا دەچوونە قۆناغی مەشقی نیشانەشکێنیو شیربازیەوە، لەم قۆناغەدا مەشقیان لەسەر تیرو شیرو ڕمبو گورزو گۆچانی پێدەکرا، لێرەشدا فێری تیراندازیو شیربازیو لێدانی ڕمبو گورز وەشاندنو شەڕەگۆچان دەبوون، لە دوا قۆناغداو لە گۆڕەپانی جەنگدا مەشقی شێوازەکانی جەنگیان بە کردەوە ئەنجام دەدا — کە بێگومان ئەمەیان گرانترین قۆناغی ڕاهێنان بوو — و ئینجا هەر یەکێك لەم سەربازە مەشق پێکراوانە جەنگاوەرێکی بەهێزو دامەزراوی ئیمانیو سەربازی لێ دەردەچوو، دوای تەواوکردنی قۆناغەکانیش لەسەر ڕاهێنانی ئیمانیو جیهادی بەردەوام دەبوو و گەشەی پێدەدا— تا ئەوەی دەگەیشتە بەرزترین ئاستی مەشقو ڕاهێنانی[2] وێکرا.

---

١ معركة عين جالوت ص: ١٥١.

٢ المصدر نفسه ص: ٢٥٢، الخطط للمقريزي ٤٨٩/٢.

**ج ـ ڕاهێنانی بەردەوام:**

سەربازی مەمالیك پاش دەرچوونی لە قۆناغەکانی مەشقو ڕاهێنان هەرگیز لەم کارەی کۆڵی نەدەدا، بەڵکو دەبوایە هەم لەسەر مەشقەکانی پێشووی بەردەوام بووایە، هەم دەبوو فێری شێوازە جەنگیە تازەکانی ڕۆژو چەکە تازە پەیدابووەکان ببوایە، لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە گۆڕەپانی مەشق دەبوو، ئەگەر کەشو هەوا باران یان گەرما یان سەرماش بوایە دەبوایە ئەو هەر ئامادەبوایە،[1] و بەرنامەی ڕاهێنانی بڕیار لەسەر دراوی جێبەجێ کردبایە، خولەکانی عەقیدەییو عەسکەری هەمیشە کراوە بوون، مامۆستایانی ئاینی بە هاوشانی ڕاهێنەرانی سەربازی بوونی بەرچاویان لەو خولانەدا سەلماندبوو، گۆڕەپانەکانی مەشق هەمیشە بە سەربازان جمەیان دەهات.[2]

**س ـ تایبە تمەندی لە ڕاهێناندا:**

تایبەتمەندێتی لەنێو ئەرکەکانی سوپای مەمالیکدا ببووە کلتور، هەر مادەیەك چەند ڕاهێنەری تایبەتمەندی بۆ دیاری کرابوون، بۆ وێنە چەند سەرکردەیەکی سەربازی پسپۆڕ لە بواری تیراندازیدا بۆ ڕاهێنانی ئەسپ سوارە سەرەتاییەکان تەرخانکرابوون، چەند کتێبو کەتەلۆکیان لەسەر ئەم چەکەو پارچەکانیو چۆنیەتی پێکەوە بەستنو لێکهەڵوەشاندنیو بەکارهێنانی لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا دادەنانو وانەیان لەسەر دەگوتنەوە، بەم شێوەیە لەڕووی نەزەریو کردەییەوە ڕاهێنانێکی باشیان پێ دەکردن، تا کاتێك سەربازی تیرانداز شارەزاییەکی زیاد لە پێویستی لەسەر تیروکەوان پەیدا دەکردو بەوپەڕی وردەکاریەوە بەکاری دەهێناو، چالاکانە نیشانەی پێ دەهەنگاوت.[3]

هەر ڕاهێنەرێك بەپێی ئاستی شارەزاییو زانیاری خۆی یەکێك لەم (٣) پلانەی دەدرایە: (مامۆستا، ئوستاد، سەرۆك)، تا لە تاقیکردنەوەو پشکنین دەرنەچوبایە نەیدەتوانی پلەی مامۆستایەتی ببڕێتو خۆی بگەیەنێتە پلەی ئوستادییەت، یان پلەی ئوستادییەت ببڕێتو بچێتە پلەی سەرۆکی دەبوایە بۆ پلەبڕین بەرهەمە نوسینێك یان شارەزاییەکی زانستی سەربازی پێشکەش کردبایە.[4]

---

١ الخطط ٤٨٩/٢، معركة عين جالوت ص: ٢٥٢.

٢ معركة عين جالوت ص: ٢٥٢.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٥٣.

٤ المصدر نفسه ص: ٢٥٤.

مەمالیك دوابەدوای خۆسازدانی جیهادیو دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە سەرکەوتنێکی بێ ڕەزاو مەزنیان بەسەر مەغۆلدا تۆمار کرد، ئەوان بە ئامانجی دانانی فشارێکی قورس لەسەر مەغۆلو وەشاندنی گورزێکی کاریگەری گورچوبڕ لە سوپاکەیان هەستان چەند کارێکی بە پەلەیان ئەنجام دان، گرنگترینیان:

- وەڵامدانەوەی خێرای زەنگی هێرشی مەغۆل:

مەغۆلەکان پێش ئەوە پەلاماری هەر ولاتێکیان دابایە ئاگادارینامەیەکیان ئاڕاستەی سەرۆك یان سەرکردایەتی ئەو ولاتە دەکرد، نامەکەیان بە چەند نێردراوێکی خۆیاندا دەناردو ئەم چەند بابەتانەی لەخۆ دەگرت: (کارو کردەوە باشەکانی مەغۆل، جۆرو شێوازی گورز وەشاندنی سوپای مەغۆل لەو سوپاو ولاتانەی ڕووبەڕوویان بوونەتەوە لە کوشتوبڕی بە کۆمەڵو ڕووخاندنو وێرانکردنو سوتاندن، بانگهێشتی خۆ بەدەستەوەدانو سەردانەواندن بۆ مەغۆل)، جا ئەگەر سەرۆكو سەرکردەکانی ئەو ولاتە خۆیانو ولاتیان بەدەستەوە نەدابایە، شەڕو پێکدادانو پەلامارێکی توند دەستی پێدەکردو هیچ شتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەدەهێشتو هەر هەمووی ڕادەماڵی،[1] هەرچی مەمالیك بوون لە شەڕو پێکدادانی گەڵ مەغۆل دەترسان، دەترسان خراپیان بەسەر بێنن، نوێنەرەکانی هۆلاکۆ لە پێش جەنگی (عەین جالوت)دا بە خۆیانو (ئاگادارینامە)کەیانەوە گەیشتنە لای (قطز)ی سەرۆکی ولات، نامەکە هەڕەشەی زۆری لەخۆ گرتبوون، گرنگترین خاڵەکانی بریتی بوون لە، یان جەنگ یان چۆڵکردنی ولات،[2] بەلام سەرکردایەتی مەمالیك بە کوشتنی نوێنەرەکانیانو لێدانی تەپڵی جەنگو خۆسازدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە وەلامی ئاگادارینامەکەی مەغۆلیان دایەوە.[3]

- ئەنجومەنی جەنگ:

ئەنجومەنی جەنگی سوپای مەمالیك ڕاستەوخۆو دوابەدوای ئاگاداریەکەی مەغۆل کۆبوونەوەی نائاسایی خۆی بە سەرۆکایەتی (قطز)ی سولتانی ولاتو ئەندامێتی هەریەك لە ئەتابەكو میرەکانی سوپاو شێخ الاسلامو قازیو زانایانی ئاینی ئیسلامو سەردەستەی هێزە سەد کەسیەکانو پیوماقولانی ولات گرێدا، گرنگترین کارەکانی کۆبوونەوەکە بریتی بوون لە: (چاوپێدا خشاندنەوەیەکی ڕەوا (شەرعی) بوونی جەنگ، کۆکردنەوەی سەرباز (هێزی بەشەری)، ڕاگەیاندنی نەفیر عامو مەشقکردن، دابینکردنی چەكو خۆراك، ئامادەکردنی

١ المصدر نفسه ص: ٣٠١.
٢ معركة عين جالوت ص: ٣٠٢.
٣ معركة عين جالوت ص: ٣٠٢.

پارەو سامانێکی زیاد لە پێویست، دانان یان دیاری کردنی سەرکردەی گشتی جەنگو میرەکانی گەڵیو هەموو ئەوانەش ئەرکانی سوپاو سەردەستەیی تاقمە سەربازیەکانیان پێکهێنابوو)،[١] گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە دەستی پێکرا، هەر ئەندامێك ڕاوبۆچوونی خۆی بەڕوونو ڕاشکاوی دەخستەڕوو، بە شێوەیەکی بەرپرسانە ڕاکانیان هەڵسەنگاندن، دەرەنجام ئەنجومەنی جەنگ کۆبوونەوەکەی خۆی بە دەرکردنی بڕیارێکی مێژوویی بۆ خۆسازدان بەرەو جەنگی یەکلاکەرەوە کۆتایی پێهێنا.[٢]

- خۆسازدان بۆ جەنگ:

بە خاتری ئەمە ئەم کارانە ئەنجامدران: کۆکردنەوەی خەڵك، بڵاوکردنەوەی ڕێنمایەکانی ئەنجومەنی جەنگ، دابەشکردنی میحوەرەکانی شەڕ، بایەخدان بە دەستەی پێشەنگی سوپا، داکۆکی کردن لەسەر بالابردنی چەندێتیو چۆنێتی، گرنگیدان بە کەمین دانانو چاو بەستەکێکردنی دوژمن، هەڵبژاردنی کاتو شوێنی جەنگ، ناوچەی چەق تێدابەستن، پاشقولگرتن لە دوژمنو ڕاوەدونانی، سەر لێ تێکدانی ستراتیژی، پاراستنی جەنگاوەرو دەرچوون بە زیانی کەمەوە، ڕیزبەندی نێوان هێزەکانی سوپای شەڕکەرو، شەڕکردن بە سەرەو بەڕیز، ئەنجامدانی جەنگی ستراتیژی بە پێکهەڵشاخانی سوپاییو پۆستەی جەنگیو هۆکارەکانی گەیاندن، لەبەرچاوگرتنی هاوسەنگی هێزەکان، بڕیاری گەیشتن بە ئامانج، بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سیاسی کە بە دەوری خۆی دەبێتە پێشەنگ بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سەربازی،[٣] و ئەم هەنگاوانەو چەند هەنگاوێکی تریش کە لە پێناوی بەدەستهێنانی سەرکەوتندا ڕۆڵی کاریگەریان گێڕا.

**٦ـ نەخشەی ڕێکوپێك:**

سەرکردەکانی مەمالیك بە دانانی نەخشەی بەهێزو جێبەجێکردنیو زانینو ناسینی قانونەکانی جەنگو هەموو ئەو بنەمایانەی ڕۆڵی گرنگ لە پێناوی بەدەستهێنانی سەرکەوتندا دەگێڕن بەناوبانگ بوون، ئەگەر بە وردی بڕوانینە جەنگی (عەین جالوت)و هەموو ئەو جەنگانەی مەمالیك ئەنجامیان داون، بە تەواوەتی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سەرکردەکانی مەمالیك هەموو ئەو قانونو بنەمایانەیان سەرتاپا جێبەجێکردوون، بە تایبەتیش سەرکردەیەکی وەکو (ظاهر بیبرس) کە بە خودی خۆی لەم جەنگەو چەند جەنگێکی تری دواتردا بەشداری کرد.

---

١ معركة عين جالوت ص: ٣٠٢.
٢ المصدر نفسه ص: ٣٠٣.
٣ المصدر نفسه ص: ٣٠١ـ٣٠٣.

أ- پاشەکەوتکردنی هێز: (قطن)ی سەرکردەی گشتی هێزە جەنگاوەرەکانی مەمالیك نەیدەویست هەموو هێزەکانی سوپاکەی لە جەنگی (عەین جالوت)دا بەشداری بکەن، خودی خۆی سەرکردایەتی هێزە سەرەکیەکەی دەکرد، (بیبرس)یش سەرکردایەتی هێزی پێشەنگی دەکرد، (بیبرس) - کە گەیشتە نێو خاکی فەلەستین - لەگەڵ مەغۆلە ئێشکچیەکانی دەورەی غەززە شەڕێکی دەستەویەخەی کرد،[1] هەردوك هێزی قۆڵی ڕاست‌و قۆڵی چەپیش بە ژمارەی بەرامبەر لەگەڵ هێزە بەرامبەرەکانی مەغۆل پێکهەڵشاخان،[2] (قطن) جەختی لەسەر هاوسەنگی ژمارەی نێوان تاقمە جەنگاوەرەکانی خۆی‌و تاقمە جەنگاوەرەکانی دوژمن دەکردەوە، لەبەر ئەمە هێزەکانی خۆی بەم شێوەیە دابەش کردن، هێزێکی پێشڕەوی لە باری پێشەوەی سوپاکەی دانا، هێزێکی تری بۆ تێکچڕژانی نزیك‌و یەکێکی تریشی بۆ تێکچڕژانی دوور دانا، هێزی چوارەمی بۆ بۆسەدانان‌و هێزی پێنجەمیشی بە مەبەستی شەڕفرۆشتن‌و بەرپێگرتن‌و جڵەوکێشکردنی دوژمن بۆ ناوچەی نەخشە بۆ دانراوی شەڕ دانا،[3] (بیبرس)ی سەرکردەی هێزی پێشەنگ (پێشڕەو) لە ڕێگای (عەین جالوت)دا بە شێوازی هێرشی پارتیزانی‌و بۆسەدانان جەنگێکی تاکتیکی ڕێکوپێکی لەگەڵ دوژمن کردو بە بەکارهێنانی سەربازانێکی کەم زیانێکی گەورەی لە دوژمندا،[4] پاش بردنەوەی جەنگەکەو شکستی مەغۆلیش چەند تاقمە جەنگاوەرێکی گونجاوی بەسەر ڕێوبانی ئەو ناوچانەدا بڵاوکردنەوە کە مەغۆلەکان پێیاندا هەڵدەهاتن.[5]

ب- کۆکردنەوەی سوپاکان لە خاڵە سەرەکیەکان: کاتێك وادەی بەرەنگاربوونەوەی مەغۆلەکان لە (عەین جالوت) نزیك بۆوە، (سیف الدین قطن) سوپای مصری کۆکردەوەو نامەشی بۆ سوپای شام نارد بە ئیمکاناتی تەواوەوە خۆسازدات‌و نوێنەری بەسەر گوندنشین‌و ڕەوەندەکاندا بڵاوکردنەوە کە هێزە عەشایریەکانی خۆیان بۆ جیهادکردنی ڕێی خودا ئامادە بکەن، هەموو ئەم هێزانەی شام‌و عەشایەر بە هەموو هێزو توانایانەوە لە دەورەی سوپای مەمالیك گردبوونەوەو بەرەو (مرج بن عامر) بەڕێکەوتن‌و، لەوێشەوە یەکپارچە بە ئاراستەی (ساحل)ی مصر ی ڕۆیشتن، سوپایەکی هەمەڕەگەزی لەم شێوەیە

---

١ دائرة المعارف الاسلامية ٤/٣٦٣، معركة عين جالوت ص: ٢٨٣.
٢ معركة عين جالوت ص: ٢٨٣.
٣ ذيل الزمان، اليونيني ١/٣٦١، معركة عين جالوت ص: ٢٨٣.
٤ معركة عين جالوت ص: ٢٨٣.
٥ المصدر نفسه ص: ٢٨٣.

کاتێك یەك دەگرێتو ڕیزەکانی پێکەوە جۆش دەدات سەرکەوتنی حەتمی مسۆگەر دەکات،[١] ئەمە بە فیعلی لە (عەین جالوت)دا هاتەدی.

ج- فشارخستنە سەر دوژمن: کاتێك سەڵتەنەتی مەمالیك بە توندی وەڵامی ئاگادارینامەکەی مەغۆلی دایەوەو لە (عەین جالوت)یش سوپاکەیان چیا ئاسا لە بەرامبەر سوپاکەیان ڕاوەستا پاشان تێکی شکاندو دوای کەوتو تا شمشێری لەسەر گەردنی زۆرینەی هەڵاتووەکانیان دانەنا کۆڵی لێ نەدانو ڕزگاربووەکانیشیانی بەرەو چواردەورەی سنوورەکانی شام پەراگەندەکردن، ئەمانە هەر هەموویان فشاری گەورەی مەمالیك بوون لەسەر مەغۆلەکان،[٢] کە گرنگترینیان خۆی لە ڕەتکردنەوەی ئاگادارینامەکەو کوشتنی نوێنەرەکانیاندا دەبینیەوە،[٣] لە لایەکی ترەوە سەرسوپای مەغۆل لە زۆری ژمارەی سوپای بەرامبەری سەرسام ببوو و ترسو دڵەڕاوکە دایگرتبوو، زۆر داوای لەسەرووی خۆی کرد هێزی بە هاوارەوە بنێرنو هاوسەنگیەك لە نێوان هەردوك هێزە شەڕکەرەکەدا دروست ببێت،[٤] بەڵام سوپای مەغۆل بە ناچاری لە ناوچەیەکی نەگونجاو و نەخوازراودا توشی بە توشی شەڕی پەلامارێکی خێرا بۆوە،[٥] مەغۆلەکان هەر کەلێنێکیان لە سوپای مەمالیك دەکرد، (قطز)ی سەرکردە خێرا کەلێنەکەی پڕ دەکردەوە، خۆڕاگریەکی بێ ڕەزا لە بەرامبەر تاووتینی مەغۆل تۆمارکرا، بە تایبەتی لە ڕاستی قۆڵی چەپدا – کە خەریك بوو شکست بخوات – بەڵام (قطز) توانی بە کۆمەکی هێزەکانی تر قەرەبووی بکاتەوەو هەڵی ستێنێتەوە،[٦] فشارێکی تر هێرشە بریسو ئاساکەی سوپای مەمالیك بۆ سەر سەرکردەی سوپای مەغۆلو کوشتنی بوو،[٧] هەروەها کاتێك مەغۆلەکان شکان، سوپای مەمالیك فشارێکی گەورەیان خستە سەر مەغۆلەکان، وازیان لێ نەدەهێنانو لێرەو لەوێ لە هەموو ڕێگاوبانەکان بۆسەیان بۆ دادەنانو دەیانکوشتنو دەیانگرتنو ڕاویان دەنان تا ئەوەی بە تەواوەتی لە وڵاتی شامیان بەدەرنان.[٨]

---

١ المصدر نفسه ص: ٢٨٣.
٢ تاريخ عجائب الاثار في التراجم والاخبار ٢٩/١، معركة عين جالوت ص: ٢٨٥.
٣ جامع التواريخ ٣١٣/٢، معركة عين جالوت ص: ٢٨٥.
٤ بدائع الزهور في وقائع الدهور ٣٠٥/١، معركة عين جالوت ص: ٢٨٥.
٥ معركة عين جالوت ص: ٢٨٥.
٦ النجوم الزاهرة ٧٩/٧، معركة عين جالوت ص: ٢٨٥.
٧ النجوم الزاهرة ٣١٦/٢، معركة عين جالوت ص: ٢٨٦.
٨ جامع التواريخ ٣١٦/٢، معركة عين جالوت ص: ٢٨٦.

ح- دروستكردنی موفاجەئـە: لـەم جەنگـەدا سـەرەتا مـەماليك ژمارەيـەكی كـەميان لەبەرچاوی مەغۆلدا ڕانواندو زۆرينەی ژمارەی سـوپا سـەرەكيەكان لـە چياو گردەكان‌و بن بەردو نێو درەختـەكانی (مـرج بـن عـامر) خـۆی مـەڵاس دابـوو، بـەم شـێوە خـۆڕاگری‌و پـێ چەسپاوی سـوپای مـەماليك‌و دروسـتكردنەوەی جـەنگێكی تـازەو دانـانی كـەمين‌و بۆسـەو گەڕان‌و سوڕانی تاقمە دەوريەكانی مەماليك لە بەرامبەر هێزەكانی مەغۆل‌و تۆقاندنی تـەواوی هێزەكانيـان‌و خۆڕاگريـەكی سەرسـوڕهێنەرانە لـە بەرامبـەر هێـرش‌و پـەلامارە يـەك لەدوايەكەكانی مەغۆل، هەموو ئەمانە (كتبغا)ی سـەركردەی مـەغۆليان تووشـی سەرسامی‌و دڵەڕاوكێ كردبـوو، دواهـەنگاوی سـەركەوتنی مـەماليك دەركـردن‌و ڕاوەدونـان‌و كوشـت‌و بـڕ كردن‌و تۆڵە سەندنەوە لە مەغۆل بوو كە بوو بـە موفاجەئەيـەك هەرگيزاوهـەرگيز مەغۆلـەكان چاوەڕوانی ئـەوەيان نـەدەكرد، ئـەم موفاجەئەيـە وای لـە سـوپای مـەماليك كـرد ئامـانجی سەركەوتن بپێكێت.[١]

س- ڕوونی ئامانج: هەركە (قطـن)ی سـوڵتانی مـەماليك نوێنـەرەكانی هۆلاكـۆی كوشـتن‌و بڕياری جەنگی لە دژی مەغۆل ڕاگەياند، ئامانجەكەی خۆشی بە ڕوونی ڕاگەياند: كە خۆی لـە لەنێوبردنی سوپای مەغۆل‌و تەفروتوناكردنيدا دەبينيەوە،[٢] پـێش ڕاگەيانـدنی ئـەم ئامانجـە، نەخشەی جەنگ‌و بەكارهێنانی پياوانی پاڵەوان‌و شۆڕەسوارو ئامـادەكردنی تـەواوی ئـامرازو كەرەسـتە جەنگيـەكان‌و مـاڵ‌و سـامانێكی بـاش، كـە لـە ڕێـی بـەديهێنانی ئـەم ئامانجانـەوە ئامانجی كۆتايش واتە لەنێوبردنی سـوپای مـەغۆل بـە ئاسـانی جێبـەجێ دەبێـت،[٣] ڕێكـەوتن لەگەڵ خاچپەرستەكانی (عەكا) تا بە بێ لايەنی خۆيانەوە پابەنـد بـن[٤] يـەكێكی تـر بـوو لـەو ئامانجانەی پێكانی ئامانجی كۆتايی مسۆگەرتر دەكرد.

ش- تاقمە پارتيزانەكان‌و خۆشكردنی ئاگری شەڕ: پێش دەستپێكردنی جـەنگ، (قطـن) تاقمـە پارتيزانـەكانی سـوپاكەی دابەشـكردن، كاتێـك قـۆڵی چـەپی سـوپاكەيان لاوازی لێ دەركەوت، هێزە پارتيزانەكانی بۆ ناردن‌و بەهێزيان كـردەوە، لێـرەدا زانـايی‌و هەڵكـەوتوويی سەركردەی سوپاكەی دەردەكەوێت، كـە چـۆن تـوانی بـەهۆی ئـەم تاقمـە يەدەكانـەوە ئـەو كەلێنانە پڕ بكاتەوە كە بە هۆی پەلاماری مەغۆلەكان لە قـۆڵی چـەپی سـوپاكەی كـەوتوون‌و

١ معركة عين جالوت ص: ٢٨٦.
٢ معركة عين جالوت ص: ٢٨٧.
٣ اعلام النبلاء، بتأريخ حلب الشهباء ٢/٢٩٠ـ٢٩١.
٤ معركة عين جالوت ص: ٢٨٧.

لە هەمان کاتیشدا توانی بەهۆی هێزە تایبەتیەکانی خۆی بەر بە هێرشە بێ ئەمانەکانی مەغۆل بگرێتو لەجێی خۆی ڕایوەستێنێتو نەیەڵێت چیتر بێتە پێشەوە،[1] هەروەها توانی هەندێك کەرتی هێزی پێشەوە بگوازێتەوەو لەگەڵ تاقمەی دوهەمدا ڕێکیان بخاتو دژە هێرشێکیان پێ بکات، بە پەلەو لە چالاکیەکی سەرسوڕهێنەرانەدا توانیان هەموو ئەو کەرتە هێزانەی مەغۆل لەنێو بەرن کە ڕیزەکانی سوپای مەمالیکیان بەزاندبوو خۆیان بەنێوجەرگەی موسڵمانەکاندا کردبوو، وێڕای ئەمەش (قطز) بۆ دواجارو لە مەیدانی جەنگدا توانی زانیاری تەواو لەسەر لایەنە بەهێزو لاوازەکانی سوپای مەغۆل وەربگرێتو سەرلەنوێ لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە سوپاکەی ڕێك بخاتەوەو بەگژ دوژمنیدا بکاتەوە.[2]

ع- خێرایی چالاکیە جیهادیەکان: سەرکردەی باڵای سوپای مەمالیك، تەنها بە بیستنی هەڕەشەکانی مەغۆل هەڵوێستی وەرگرتو خێراو بەبێ دواکەوتن ئامادەباشی سوپای ڕاگەیاندو کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی جەنگی گرێداو چەند کارێکی بە پەلەی بۆ خۆئامادەکردنی جەنگ ئەنجام دان، هێزەکانی سوپاو عەشایەر بە پەلەو بێ دواکەوتن بە دەم بانگەوازە جیهادیەکەیەوەو بەرەنگاربوونەوەی دوژمن هاتن، ئەویش بە پەلەو پێش ئەوەی سوپای مەغۆل پێشڕەوی بکاتو خۆی بەنێو خاکی مصردا بکاتو لەنێو ماڵی خۆیدا لە مەمالیك بدات، بە خۆیو سوپا ئامادەکراوەکەیەوە سنووری مصری بەزاندو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن زەمینەیەکی گونجاوی لەنێو خاکی شامدا ئامادەکرد، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو ڕۆڵە گرنگە بکەین کە (بیبرس)ی سەرکردەی هێزی پێشەنگی سوپای مەمالیك لە غافڵگیرکردنی خێرای هێزە مەغۆلە ئیشکچیەکانی دەورەی غەززە ئەنجامی داو هەموو هەوڵو خەونە خۆشەکانی (بایدر)ی سەرکردەی سوپای مەغۆلی بردنەوە هیچە.[3]

ص- هەواڵگری عەسکەری: (قطز) هەواڵگیرە تایبەتەکانی خۆی بڵاوکردنەوەو بۆ ئەم کارەی پشتی بەو جۆرە خەڵکانەی ناوچەکە بەست کە زۆر ڕقیان لە مەغۆل دەبۆوەو بە دەم خواستو پێویستیەکانی سوپای مەمالیکەوە هاتبوون، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا سوپاکەی مەغۆل زۆر پشتی بەم بابەتە نەبەستبوو، بەڵکو زیاتر پشتی بە هێزو پێزو دامەزراویو توندو تیژی خۆی دەبەستو زۆر گوێی بە دەوروبەر نەدەدا داخوا چی تێدا ڕوودەدات، هەڵوێستیشی لە بەرامبەر هەموو ئەو خەڵکانە وەرنەدەگرت کە هاموشۆی نێو

---

١ النجوم الزاهرة ٧/٧٩، معركة عين جالوت ص: ٢٨٨.

٢ معركة عين جالوت ص: ٢٨٨.

٣ المصدر نفسه ص: ٢٨٨.

سەربازگەکانیان دەکردو ژمارەیەکیان زانیاریە وردو درشتەکانی نێو سەربازگەی مەغۆلیان وەردەگرت و وەکو خۆی بۆ مەمالیکیان دەگواستەوە،[١] وێڕای ئەمەش کاتێك (بیبرس) لەگەڵ هێزە مەغۆلە ئێشکچیەکەی مەغۆل تێکگیرا، توانی چەند هەواڵێکی ڕاست و دروست دەربارەی توانای سوپای مەغۆل و جموجۆڵەکانی و چەك و چۆڵەکانی و سەرکردەکانی وەربگرێت،[٢] پێشداش سەرانی سوپاکەی مەمالیك حیسابی چاودێری کردنی ناوچەکە و زانینی جموجۆڵی سوپای مەغۆلی کردبوو، بۆیە پێش ئەوە سوپاکەیان داخیلی شام بکەن چەند تاقمە چاودێرێکیان بە نهێنی لە پێش خۆیاندا ڕەوانەی ئەوێ کردبوون،[٣] (دەزگای پۆستەی سەربازی مەمالیك) کە بە سەرۆکەکەی دەگوترا (خەبەردار) و لەم بوارەدا تایبەتمەندی پەیدا کردبوو یەکێکی تر بوو لەو سەرچاوە هەواڵگیریانەی سوپای مەمالیك پشتی پێ دەبەستن، کارمەندانی ئەم دەزگایە هەواڵی باروودۆخی دوژمنیان ڕادەگەیاندو لایەنە خەتەرناك و مەترسیدارەکانیان دەستنیشان دەکردن و هەموو ئەو گروپە تێکدەرو سیخوڕانەشیان دەناساندن کە بۆ حیسابی بەرژەوەندی مەغۆل کاریان دەکرد،[٤] بێگومان دەزگای هەواڵگیری لە ڕابردوو و ئێستاو داهاتووشدا ڕۆڵی کاریگەری لەسەر جەنگەکان گێڕاوە و دەگێڕێت، کاتێك سەرانی سوپای مەمالیك ئەم هۆکارەیان خستەگەڕ کارێکی دروستیان ئەنجامداو، بەهۆی ئەم هۆکارە و هۆکارە دروستەکانی ترەوە توانیان بڕیاری ساغ و سەلیم دەرکەن و ئامانج وەکو خۆی بپێکن و سەرکەوتن بەدەست بێنن.[٥]

### ٧ـ دووربینی و سیاسەتی حەکیمانەی (سیف الدین قطز):

(قطز) پێش وەرگرتنی پۆستی سەڵتەنەت، هەستی بە هەموو ئەو مەترسیانە دەکرد کە لە بەرامبەر دەوڵەتی مەمالیکدا ڕاست ببوونەوە، بە تایبەتیش مەترسی مەغۆلەکان کە خۆیان بە نێو جیهانی ئیسلامدا کردبوو، کوشت و کوشتارو وێرانکاریەکی سەرسوڕهێنەریان ئەنجام دابوو، ماوەی چەند ڕۆژ یان چەند مانگێکی تریش لافاوی هێرشەکەیان دەگاتە شام و مصر، بۆیە لە پێناوی بەرگرتنی ئەم لافاوە و کۆتایی پێهێنانی ئەم مەترسیە دەبێت ژمارەیەك کاری سیاسی ئەنجام بدرێن، لەو سەردەمەدا مەمالیك ـ ی تورك ـ عەڕشی

---

١ معركة عين جالوت ص: ٢٨٩، المغول للعريني ص: ٢٥٩.
٢ تأريخ ابن الوردي ٢/٢٩٣، معركة عين جالوت ص: ٢٩٠.
٣ ذيل مراة الزمان ١/٣٦٦، معركة عين جالوت ص: ٢٩٠.
٤ تأريخ الحضارة الاسلامية في العصور الوسطى ص: ٣٨.
٥ معركة عين جالوت ص: ٢٩١.

سەڵتەنەتی مصریان لە ئەیوبییەکان- ی کورد داگیرکرد، ژنێکی وەکو (شجرة الدر) لەسەری دانیشت، کێشەکانی نێوخۆش دروستبوون و پەرتەوازەیی و لێکخوێندن سەری هەڵدا، لە بەغدا خەلیفە بە حوکمڕانی (شجرة الدر) - وەکو ژن - قایل نەبوو، پاشان (شجرة الدر) بۆ شەرعاندنی سەڵتەنەت و قایلکردنی خەلیفە شوی بە میر عزالدین ئایبەك کردو لە باتی خۆیشی کردی بە سوڵتان، هێندەی نەخایاند ململانێ و دووبەرەکی لەنێوان سوڵتان و سوڵتانەخاندا ڕوویداو سەری کێشا بۆ کوژرانی هەردووکیان، ئینجا (علی کوڕی ئایبەك) - کە مێردمنداڵ بوو - چووە سەر عەرش، بەڵام بەهۆی کەم تەمەنیەوە نەیدەتوانی کاروبارەکان وەکو پێویست هەڵسوڕێنێت، (قطز) جێگری سەروەسێتی (سوڵتان علی)ی مێرمنداڵ بوو، دەشیزانی شەڕێکی سامناك و یەکلاکەرەوە لە بەردەم دەوڵەتدا خۆی زەق کردۆتەوە، بۆیە ویستی لە بواری سیاسی و عەسکەریدا زیاتر ئازادو دەست ئاوەڵا بێت، بە خاتری ئەمە لە هەوڵێکی سیاسیانەیدا توانی سوڵتانی مێردمنداڵ لە پۆستەکەی لاداتو پاشان بۆ خۆی جێگەکەی بگرێتەوە، هەرچەندە ئەم هەنگاوەی (قطز) بە نیسبەت جەنگی چاوەڕوانکراوی مەغۆلەوە گرنگ بوو، بەڵام ژمارەیەك لە (میرانی مەمالیکی بەحری) کاتێك دەستەوستانی خۆیان لە بەرامبەر پرۆژە ئامادەکراوەکەی (قطز)دا بینیەوە - کە بۆ چاکسازی و نوێ بوونەوەی وڵاتی ئامادە کردبوو -، بەرەو لای (مەلیك مغیث)ی حوکمڕانی (کرك) هەڵاتن، لە دژی (قطز) لەگەڵ (مەلیك مغیث) ڕێککەوتن، لە ساڵی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز یدا بەرەو (مصر) داگەڕان، بەڵام (قطز) پیلانەکەی پوچەڵ کردنەوەو بەسەریاندا زاڵ بوو، خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن و بەرەو دواوە تێکی شکاندنەوە،[1] ئیدی نەیهێشت ئەمانە چیتر گەمە بە هێمنایەتی دەوڵەت بکەن و لە بەرامبەر بەرەنگاربوونەوەی هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی (مەغۆل)دا ئاستەنگی بۆ دروست بکەن، خۆڕاگرانەو شێلگیرانە لەسەر چالاکیە سیاسی و چاکسازیەکانی وڵات و پاکسازی کردنی لە ئاشوبە نێوخۆییەکانی و یەکڕیزکردنی هێزەکانیدا لەکاردابوو، تا کاتی جەنگی (عەین جالوت) نزیك بۆوەو سام و ترس زیادی کرد، بۆیە بە چاکی زانی لە پێناوی بردنەوەی شەڕەکەدا لەگەڵ میرە ڕاکردووەکاندا ئاشت بێتەوەو لە سەرکردایەتی کردنی سوپاداو شارەزایی هونەرەکانی جەنگدا سودیان لێ وەربگرێت.[2]

ڕای نێوخۆی وڵات لەسەر بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل یەك دەنگ بوو، ئەم یەك دەنگیە کۆبوونەوەی (ئەنجوومەنی جەنگ)ی بەرهەم هێنا، کە تەواوی زانایان و سیاسەتمەداران و عەسکەرتاران و پیاو ماقوڵانی وڵاتی تێدا ئامادەبوون، بەم شێوەیە یەکێتی نێوخۆیی بە

١ النجوم الزاهرة ٤٦/٧، ٤٧، معركة عين جالوت ص: ٣٣٢.
٢ تشريف الايام والعصور في سيرة الملك المنصور ص: ٢٦٤.

ئەنجام گەیشت.[١] ئینجا بایەخی بە بارودۆخی سیاسی دەرەوە داو، پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ خاچپەرستەکانی (ساحل) گرێداو، بەڵێنی لێ ستاندن بەبێ لایەنی بمێننەوەو ڕێگەش بدەن سوپای مەمالیك بە هەرێمەکەیاندا گوزەر بکات، بەم شێوەیە لە دوو بەرەوە شەڕی نەکرد، لە (عەین جالوت)دا دەستەویەخەی مەغۆل بۆوەو بەسەریاندا زاڵ بوو، دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکەو پاکسازیکردنی شام لە مەغۆلەکان لەسەر کارو چالاکیە سیاسی‌و ئیداریەکانی بەردەوام بوو، پەیامنێری بە هەندێك ولاتدا بلاوکردنەوەو هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێ ڕاگەیاندن، یەکێتی نێوان (شام‌و مصر)ی ڕاگەیاند، بەم شێوەیە پایەکانی هێمنایەتی‌و ئارامی سیاسی چەسپاندن، لە بواری ئیدارەشدا ولات — ی شام — ی ڕێکخستەوەو والیەکانی خۆی بەسەر هەرێمەکانیەوە دامەزراندن‌و دەستی بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا گرت کە پێشدا مەغۆلەکان داگیریان کردبوون،[٢] هەموو ئەمانە دەبنە بەڵگە بۆ (سیف الدین قطن) کە پیاوێکی دووربین بووەو لە لایەنی سیاسیشەوە پیاوێکی تەماعەیار بووە.

**٨ـ زۆربوونی سیفەتەکانی (تایەفە سەرکەوتووەکە):**

(سیف الدین قطن) هەروا لە خۆڕا دەرنەکەوت، بەڵکو لەسەر بنەمای پەروەردەیەکی زانستی پێڕەوی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت گەورە بوو، ئەگەر تەماشایەکی خۆی‌و ئەو جیلەی گەڵی بکەین — کە خودا بە سەرکەوتنی (عین جالوت) بەهرەمەندی کردن — سیفەتگەلێکی زۆرو زەوەندی تایەفە سەرکەوتووەکە (الطائفة المنصورة)یان تێدا دەخوێنینەوە، گرنگترینی ئەو سیفەتانە:

أ– لەسەر هەقبوون: تایەفە سەرکەوتووەکە یان سەرخراوەکە بە پێچەوانەی عامەی موسڵمانان هەمیشە پابەندی (هەق)ن‌و بە دوای ئەودا هەنگاو هەڵدەگرێت، کاتێك زۆربەی خەڵك پشتی تێ دەکەن، ئەوان بەوپەڕی دڵسۆزیەوە لە دەوری کۆدەبنەوەو پابەندی دەبن، (هەق) بە چەند شتێکی دیارەوە دەناسرێت، هەر گەلێك دەستیان پێوەبگرێت دەبێتە تایەفەی سەرکەوتوو:

—دڵبەستنی بەردەوام بە عەقیدەو ئیمانی ئیسلامی، پابەندبوون بە سوننەت‌و ڕێوشوێنی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵەکانی، خۆدوورگرتن لە بیدعەو بیدعەچیان، تێگەیشتنی ئەهلی سوننەت.

---

١ معركة عين جالوت ص: ٣٣٢.

٢ تأريخ مصر، أسكندر عمون ص: ١٩٦، معركة عين جالوت ص: ٣٣٣.

-بەردەوام بوون لەسەر ڕەوشتو خوەپەسندە دیارو نادیارەكانو، خۆپاراستن لە هەوەسبازیو هەموو هۆكارەكانی لادانی ڕەوشتی.

-بەردەوام بوون لەسەر جیهادی نەفسو ماڵو فەرمان بە چاكەو بەرگری لە خراپەو بەرپاكردنی هەق.

ب- فەرمانی خودا ڕادەپەڕێنێ: كاتێك پێغەمبەرمان (ﷺ) وەسفی تایەفەی سەركەوتوو دەكات، بە ڕاشكاوی ئەم تایبەتمەندیەیان دەخاتە پاڵو دەفەرموویت بە فەرمانی خوداوە ڕادەپەڕێت، بێگومان (قطز) ناوی خوای لێهێناو بەگوێرەی فەرمانەكانی خودا لە (ئامادەباشیو، نەخشەدانانو، بەرگریكردن لە ئیسلامو موسڵمانان) ڕەفتاری كرد.

ج- جیهاد لە ڕێی خودادا دەكات: فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەیە وەسفیان دەكات: ((یقاتلون علی الحق))،[1] واتە: لەسەر هەق جەنگ دەكەن یان ((یقاتلون علی أمر الله))،[2] واتە: بەگوێرەی فەرمانو بڕیاری خودا دەجەنگن، بێگومان (سیف الدین قطز)و سوپاكەی جیهادی شەرعیان ڕاپەڕاندو لە ڕێی خودادا جەنگانو بەرەنگاری بێباوەڕانو دوژمنانی خودا بوونەوە،[3] لەبەر ئەمە بوو خودای باڵادەست لە (عین جالوت)دا سەركەوتنی پێ بەخشین.

د- پێی چەسپاوو خۆڕاگرە: خودا (جل جلاله) خۆڕاگریو سەقامگیری تایبەت كردووە بە تایەفەی سەركەوتووەوە، بینیمان كە (سیف الدین قطز)و سەربازەكانی لە جەنگو جیهادەكەیاندا چۆن بە سیفەتی پشوو درێژی بەهێزو سەبرو تەحەمولی جوان خۆیان چەكداركردو هێزی زوڵمو ستەم نەیتوانی لەسەر خەت لایاندات‌و تۆزقاڵێك لە ئامانجە پیرۆزەكەیان دووریخاتەوە، لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر (ﷺ) بەم جۆرە وەسفیان دەكات: ((لایضرهم من كذبهم ولا من خالفهم ولا یبالون من خالفهم)).[4] واتە: نە ئەوانە باوەڕیان پێ نینو نە ئەوانەش دژیانن ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن، ئەوانیش گوێ بە دژەكانیان نادەن.

ئەم دەربڕینە پیرۆزانەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بەو تێكۆشەرانە دەدەن ئامانجی خۆیان دەناسنو بە ڕێبازی خۆیاندا دەڕۆنو ئاوڕ لە گێچەڵی دوژمنانو بروبیانوو و ئاستەنگی بەزیوان و درۆو بوختانی دوژمنە دڵڕەشەكانیان نادەنەوەو خۆڕاگرانەو سەقامگیرانەو

---

١ سنن ابي داود، كتاب الجهاد رقم: ٢٤٨٤.

٢ مسلم رقم: ١٧٦، الضربات التي وجهت للإنقضاض على الأمة، الجندي ص: ١١٣.

٣ تبصير المؤمنين بفقه النصر والتمكين ص: ٤٧٣.

٤ رواه سعيد بن منصور، كتاب الجهاد رقم: ٢٣٧٦، وله طرق تقويه.

بەوپەڕی یەقینەوە ڕووبەڕووی ناڕەحەتیەکان دەبنەوە،[١] ئەم وەسفانەی سەبارەت بە تایەفەی سەرکەوتوو لە فەرموودە پیرۆزەکاندا هاتوون، لە سوپاکەی (سیف الدین قطزو مەمالیك)دا بەرجەستە ببوون، بۆیە خودا لە (عین جالوت)دا بە سەرکەوتنی خۆی ڕێزی لێنان، بێگومان خۆدانەپاڵ تایەفەی سەرکەوتوو نە دروشمەو نە بانگەشەیە، بەڵکو خۆ لە پەیڕەوکردنی سیفەتە شەرعیەکانیان و کارکردن و بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا و ڕاپەڕاندنی واجبەکانی سەرشانیاندا دەبینێتەوە، جا هەر کەسێك سیفەتەکانی تایەفەی سەرکەوتوو لە خۆیدا بەرجەستە بکات و واجبەکانی سەر شانی ڕاپەڕێنێت، ئەوا ئەو کەسە ئەگەر بە تەنیاش بێت دەچێتە ڕیزی ئەندامانی ئەو تایەفەوە،[٢] خودای بەرزو مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ﴾(الصف: ٢-٤). واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە: بۆ قسەیەك دەکەن کە کردەوەی پێ ناکەن، — نازانن – قسەیەك بکەن و عەمەلی پێ نەکەن چەند گوناهێکی گەورەیە بە لای خوداوە؟!، خودا ئەوانەی خۆش دەوێن: کە وەکو خشتەی دیوارێك چوونە پاڵ یەکو لە پێناوی خودادا جەنگ دەکەن.

**٩ـ بەرنامەی پلە پلەیی و بە میراتگرتنی پرۆژەی بەرەنگاربوونەوە:**

میرانی سلجوقی هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان لە پێناوی تێکشکاندنی خاچپەرستاندا خەرج کرد، (عماد الدین زەنگی) بە دانانی (پرۆژەیەکی پێشەنگ) بۆ وەستانەوە لە بەرامبەر داگیرکەران بە گشتی و داگیرکەرانی خاچپەرست بە تایبەتی دەستکەوتێکی گەورەی بەدەست هێنا، هەرچەند خەڵکانێکی زۆری ئەو سەردەمە پێیان وابوو پرۆژەکە سادەیەو قەتیش جێبەجێ ناکرێت، بەڵام (نور الدین)ی کوڕی بەشی یەکەمی بە ئەنجام گەیاندو، (صلاح الدین)یش بەشێکی گەورەی بەشی دووەمی بە ئەنجام گەیاند، لەبەر ئەمە پێمان وایە سەرکەوتنەکەی (صلاح الدین) لە (حطین) بەرهەمێکی پرۆژە ڕزگاریخوازیەکەی (عمادالدین) بوو، ئەگەر پشتیوانی خوداو چاودێری (نورالدین)و نەخشەکەی (عمادالدین)ی باوکی بۆ یەکگرتنی شام و پاشانیش یەکگرتنی (شام و مصر) لە ئارادا نەبووایە، قەت ئەم سەرکەوتنە

---
١ صفة الغرباء سلمان العودة ص: ٢٠٥.
٢ الطائفة المنصورة، مجلة البيان ص: ٦٥.

نەدەهاتەدی.[1] سەرکەوتنێك کە پێش هەموو شتێك بە پشتیوانی خوداو ئینجا بە هەوڵو تەقەلای ئەو یەکێتیەی لەسەر بنەماکانی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی دروست ببوو، عەقیدەیەك: کە بانگەشە بۆ یەکێتی ئیسلامی دەکات و جیاوازی ناخاتە نێوان ڕەگەزو ڕەنگو تیرەو تایەفەو نەتەوەکانو، لە بازنەی برایەتی ئیسلامیدا کۆیان دەکاتەوەو، بە یەکسانی حیساب بۆ تورکو کوردو عەرەبو فارسو هەموو ئەو نەتەوانە دەکات کە لە ژێر ئالای ئیسلامدا حەواونەتەوە، شاعیر دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ولست أدري سوى الاسلام لي وطنا | الشام فيه ووادي النيل سيان |
| واينما ذكر اسم الله في بلد | عددت أرجاءه من لب أوطاني |

لە سەردەمی (صلاح الدين)دا هۆکارە هاریکارەکانی سەر یەکێتی لەگەڵ سەردەمدا کارلێکیان کردو بەپێی پێڕەوی پلەپلەیی گەیشتە وەرزی بەردانو لە جەنگی (حطين)دا بەرهەمەکەی خۆی پێشکەش کردو بە فەتحکردنی (بيت المقدس) چووە لوتکە، ئینجا موسڵمانان بە یەکتر خۆشویستنو سۆزو بەزەیی هاتنەوەیان بە یەکتریدا وێنەی لاشەیەکیان لێهاتو ئەگەر ئەندامێکی ئازاری لێ پەیدا ببوایە هەموو ئەندامەکانی تری بۆی دەخرۆشانو شەونخوونیان بۆ دەگرت،[2] لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵو تەقەلا گەورانەی داگیرکەران لە پێناوی پارچەپارچەکردنی جیهانی ئیسلامیدا بەختیان کرد، لە پارچەپارچەکردنی خاکی ئیسلامیدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام نەیانتوانی دڵەکانیان لێك بکەنو بەردەوام موسڵمان برای موسڵمانی خۆش دەوێت،[3] حاڵی زمانی هەر یەکێك لەوان دەڵێ:

| | |
|---|---|
| أبا سليمان قلبي لا يطاوعني | على تجاهل احبابي وإخواني |
| اذا اشتكى مسلم في الهند أرقني | وان بكى مسلم في الصين أبكاني |
| ومصر ريحانتي والشام نرجشتي | وفي الجزيرة تأريخي وعنواني |
| أرى بخارى بلادي وهي نائية | واستريح الى ذكرى خراسان |
| فأينما ذكر اسم الله في بلد | عددت ذاك الحمى من صلب أوطان |
| شريعة الله لمت شملنا وبنت | لنا معالم إحسان وإيمان[4] |

---

١ العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية ٢/٣٧٥.

٢ الوحدة الاسلامية بين الامس واليوم ص: ٢٣.

٣ المصدر نفسه.

٤ الطائفة المنصورة، سلسلة تصدر عن مجلة البيان ص: ٧.

سولتانەکانی مەمالیك بە هەمان ڕێبازو بەرنامەی (عمادالدین)و (نورالدین)و (صلاح الدین)دا ڕۆیشتنو نیێتو نیازیان بۆ خودا یەکلاکردەوەو بانگەشەی جیهادیان نوێ کردەوە،[1] (سیف الدین قطز) ئەم حەقیقەتەی بە گوفتارو ڕەفتارەکانی سەلماند، دوابەدوای جەنگی (عین جالوت) هەستایە سەرپێو وتارێکی داو گوتی: لەگەڵ خودا ڕاست بوونو جیهادتان لە پێناوی ئەودا کرد: لەبەر ئەمە کەمی ئێوەی بەسەر زۆری دوژمندا سەرخست، نەکەن بەمەی کردوتانە لەخۆبایی بنو خۆتا پێ زل بێت، بەڵکو سوپاسی خودا بکەنو سەر بۆ زاتی مەزنیو بڕیارەکانی دانەوێنن، ئەو زاتە خاوەن هێزی دامەزراوە، بزانن: ئێوە دەستتان بە جیهاد کردووە، بەڵام هێشتا لێ نەبوونەوە، تا واجبی سەر شانتان بە تەواوی جێبەجێ نەکەنو دوژمنەکانی خودا لە خاکی ئیسلام دەرنەکەن، خوداو پێغەمبەرەکەی لێتان قایل نابن، لەو ڕۆژەدا ئیمانداران بە سەرکەوتنی خودا شادمان دەبن.[2]

ئەگەر بێتو بەدواداچوونێکی کارو چالاکیەکانی دەوڵەتی مەمالیك بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە جیهاد کردن لە ڕێی خودادا پاڵنەری سەرەکی تەواوی چالاکیەکانیان بووەو، ئامانجی سەرەکیشیان بەرگری کردنو پاراستنی موقەدەساتی ئیسلامو سەروماڵو ناموسی موسڵمانان بووە، کە زانیان ئەمە بە یەکڕیزی موسڵمانان نەبێت نایەتەدی، بۆیە هەموو هەوڵەکانیان لە پێناوی ئەمەدا خستنەگەڕ، بانگەشەی هەموو هێزەکانی ناوچەکەو هێزە هەڵاتووەکانی وڵاتیان کردەوە بێنەوە مصرو لە بەرامبەر مەترسی هێرشی مەغۆل بوەستنەوە، پاش کۆکردنەوەو ڕێکخستنی هێزەکانو چاندنی تۆوی (جیهاد) لە دڵو دەروونی یەکە یەکەی ئەندامەکانیدا، (سولتان قطز) پێشیان کەوتو بەرەو وڵاتی شام بەڕێکەوتو لە ناوچەی (عین جالوت)دا توانی مەغۆل تێك بشکێنێتو ئەم جەنگە بوو بە سەرەتای کۆتایی هاتنی قەوارەی مەغۆلەکان لە وڵاتی شامداو یەکگرتنی شامو مصری بەدوای خۆیدا هێناو، بوو بە ڕێ خۆشکەرێك بۆ سولتانەکانی دوای خۆی تا لە دژی مەغۆلو خاچپەرستان درێژە بە جیهاد بدەن، جیهادێك کە لە ڕوانگەی ئەوانەوە (فەرزی عەین) بوو و چی وای لە ڕووکنەکانی تری ئیسلام کەمتر نەبوو و لەسەر هەموو موسڵمانان واجب بوو ئەنجامی بدەن،[3] پوختەی قسە: سولتانەکانی مەمالیك سوودیان لە هەوڵو تەقەلا کەڵەکبووەکانی پێش خۆیان وەرگرتو لەسەر دیوارەکانی ئەو جیهادە دیواریان هەڵچنیو

---

١ جهاد المماليك ص: ٢٨٩.

٢ من أجل فلسطين ص: ١٠٢.

٣ جهاد المماليك ص: ٢٩٠.

بانگەشەی جیهادو ڕزگارکردنی خاکی موسڵمانانیان لە (مەغۆل و خاچپەرست)ەکاندا نوێکردەوە.

### ١٠ـ پشت بەستن بە زانایان و ڕاوێژ پێکردنیان:

بەها دانان بۆ زانایان و زانستە شەرعیەکان یەکێك بوو لە ئاکارە هەرە جوانەکانی دەوڵەتی مەمالیك، بە درێژایی ڕۆژگاری دەسەڵاتی (ئەیوبیان) لە (مصر)و پاش ئەوەی (صلاح الدین) کۆتایی بە دەوڵەتی (فاطمي)و شیعە هێناو بنەماکانی مەزەبی (سوننە)ی لەو وڵاتەدا دامەزراندن، پلەوپایەی زانایان لەبەرچاوی حوکمگێڕان بە تایبەتی و خەڵك بە گشتی بەرز تەماشا دەکرا، تا ئەوەی (شجرة الدر) چووە سەر تەختی دەسەڵات و زانایان ناڕەزایی خۆیان لە دووتوێی چەند نامەیەکدا بۆ (شجرة الدر)و هاندانی جەماوەری خەڵك بۆ قبوڵ نەکردنی ئەمە دەربڕی، نە (شجرة الدر)و نە دارودەستەکانی نەیانتوانی بەر بەم بزوتنەوە بوێرەی زانایان بگرن و ڕایبگرن،[1] سروشتی زانایانی ئەو سەردەمە ئەوا بوو کە هەر هەموویان دەچوونە نێو گۆڕەپانەکانی جەنگ و جیهادەوەو بەزارو زمانی پاراویشیان خەڵکیان بۆ هان دەدا، زانایان لە بەرەنگاربوونەوەی هێرشی حەوتەمی خاچپەرستاندا کە لە ساڵی ٦٤٨ك یدا ڕوویدا بەشداریەکی بەرچاوو کاریگەریان ئەنجام دا، خودی سوڵتانی زانایان (شێخ عیزی کوڕی عبدالسلام) ئامادەبوو، (شێخ) بە لای (سیف الدین قطن)ەوە بێ ئەندازە خۆشەویست بوو و لە ژێر ڕۆشنایی فتواو ڕێنماییەکانی ئەودا، هەڵوێستەکانی دەنواندن، ـ لە سەروبەندی نزیك بوونەوەی جەنگی (عین جالوت)داـ (سیف الدین قطن) کۆبوونەوەیەکی بە ئامادەبوونی (قازی بدرالدین حسن سنجاری)ی سەرۆکی قازیانی وڵات و (شێخ عزالدین کوڕی عبدالسلام)و چەند زانایەکی تری میرانی دەوڵەتەکەی سازدا، پرسیاری سەرەکی سەبارەت بە وەرگرتنی ماڵ و سامان لە خەڵك و خەرجکردنی لە پێداویستیەکانی سوپادا بوو، (شێخ عزالدین) گوتی: هەر کاتێك پارەو سامان لە بەیتولمالدا نەما، زێڕو زیو و خشڵەکانتان، خەرجکردن و لە پۆشاك و چەکدا لەگەڵ خەڵکدا یەکسان بوون و سەربازیش جگە لە وڵاخەکەی سواری دەبێت هیچی تری نەبوو، ئەوا ئەو کاتەو لە پێناوی بەرپەرچدانەوەی دوژمن دروستە بڕێك پارەو سامان لە خەڵك وەربگیرێت، چونکە هەرکات دوژمن ئابلۆقەیدان و تینی هێنا واجب دەبێت لەسەر هەموو خەڵك گیان و ماڵی خۆیان لە پێناوی بەرپەرچدانەوەیدا بەخت بکەن.[2]

---

١ قصة التتار ص: ٣٦٠.

٢ جهاد الاسلامي ضد الصليبيين والمغول، د. فايد ص: ١٢٠.

بەم شێوەیە فتواکە جێبەجێ کرا، وەکو لەمە دەفامرێتەوە: موسڵمانانی ئەو کاتە ئامادە نەبوون بەبێ هەبوونی فتوایەك لە لایەن زانایانی ئەو سەردەمەوە کارێك بکەن، یان بە خۆتو خۆڕایی ماڵی خۆیان وەکو باج و پیتاك لە دەستی دەسەڵاتداران بکەن و کە زانایانیش فتوای دروست بوونیان دەرکرد یەکسەر گوێڕایەڵ بوون، واتە گوێڕایەڵی شەریعەت بوون، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە خودی سوڵتان پابەندی فتواکە بوو، بەڵکو میرو پیاوانی دەوڵەت چوونە ماڵەوە و هەرچی هەیانبوو لە پارە و سامان و خشڵ و زێڕو زیوی هاوسەرەکانیان، هەر هەموویان دێناو، ئینجا سوێندیان دەخوارد کە یەك شتیان لە ماڵدا بەجێ نەهێشتووە، ئەم گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریە بەبێ هەڕەشەو چاو لێ سوورکردنەوەو تۆبزیکاری ئەنجامدرا، ئەمە وەڵامدانەوەی ڕای شەریعەت بوو، کاتێك ماڵ و سامان و زێڕو زەبەری سوڵتان و میرو سەرکردەکان کۆکرایەوەو بەشی نەکردو ئەوانیش لەگەڵ ڕەعێت یەکسان بوون، ئینجا (سوڵتان قطز) بڕێکی پارە لەسەر هەر تاکێکی وڵاتی مصر دانا بیدا، بەڵکو بتوانن بە هۆیەوە پێداویستیەکانی جەنگی پێ جێبەجێ بکەن، ئەلێرەدا دەردەکەوێت کە ئەو ماڵەی موسڵمانان لە جەنگی (عين جالوت)دا بەخشییان چەند ماڵێکی پاك و حەڵاڵ بووەو بەشداریەکی کاریگەری لەسەر بەدەستهێنانی سەرکەوتن کرد،[١] (سوڵتان سيف الدين قطز) ڕێزی لە زانایان دەناو فتواکانی جێبەجێ دەکردن، پشتی پێ دەبەستن و لە کاتی ڕووداوەکاندا ڕاوێژی پێ دەکردن، زانایانیش ڕۆڵی گەورەو گرنگی خۆیان دەگێڕا، گەلیان لە مەترسیە هاتووەکان ئاگاداردەکردەوە، خەڵکیان بۆ جیهادو شەهادتخوازی هان دەدا، وەك دەبینین (میرانی مەمالیك)و (زانایان) یەکتریان تەواو کردو، ڕیزەکانیان جۆشدان و بە یەك دەست ڕووبەڕووی تەتار بوونەوە، ئەمە بوو بە یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنەکەی جەنگی (عين جالوت)، زانایان حوکمەکانی خودایان سەبارەت بە جیهاد ڕوونکردنەوە، ڕوونیان کردەوە کە چۆن و بە چ شێوەیەك دەبێ هەڵسوکەوت لەگەڵ ماڵ و سامانی خەڵك بکرێت و کارێکی وا بکرێت حەڵاڵ و زەلاڵ بێت و ئینجا لە جیهاددا سەرف بکرێت، لەگەڵ ئامادەباشی لایەنی ڕووحی و ڕەوانی (قطز) کە چەندە پابەندی جێبەجێکردنی حوکمی خوداو خەڵکیش چەندە بەهای عەدالەت و دادپەروەری دەزانن، دادپەروەریەك، گیانێکی تازەی خستە نێو جەستەی گەل و لە ژێر سەرکردایەتی (قطز)دا کۆی کردنەوە.

---

١ المصدر نفسه ص: ١٢١.

**١١ـ دنیا نەویستی:** کاتێك باسی هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی (خوارەزمی)مان کرد، باسی (خۆشویستنی دنیاو ڕق لێبوونەوەی مردن)مان کرد، کە چۆن لەو کاتەدا خۆشویستنی دنیا بەسەر سەرکردایەتیو گەلدا زاڵ ببوو، موسڵمانان لە لایەنی دەروونیەوە ڕووخابوونو بەسەری کزو داماوەوە خۆیان بە دنیاوە هەڵواسیبوو، ڕازی بوون بەبێ خەمی لە شارو گوندەکانیان دانیشتنو چاوەڕێ بن داخوا کەی مەغۆلەکان دەگەنە سەریانو سەریان دەبڕن، بینیمان ئەمانە چۆن کۆتایی بە ژیانیان هات: (محمد کوڕی خوارەزم، جلال الدین کوڕی خوارەزم، الناصر لدین الله، خەلیفە (المستعصم بالله)، بدرالدین لؤلؤ، ناصری ئەیوبی)!، بەڵام (سیف الدین قطن)و نەتەوەکەی خۆیان بەم نەخۆشیەوە گیرۆدە نەکردو، دنیانەویستیان هەڵبژارد، خودی (قطن)ی سوڵتان لەم بوارەدا نموونەیەکی زیندووی نیشان داو بوو بە پێشەنگی خەڵك، هەر هەموو مومتەلەکاتی فرۆشتو لە ئامادەکردنی ئەو سوپایەیدا خەرج کرد کە بەگژ تەتاردا چۆوەو شکاندی، ئەو چاوی نەبڕیبوە کورسی دەسەڵات، بەڵکو پێشنیاری کورسی بۆ (مەلیك ناصر یوسفی ئەیوبی) کرد بە مەرجێك بە یەکگرتنی شامو مصر قایل بێت، ئەو لەم پۆستەدا پێگەیەکی بنەماڵەیی یان کۆمەلایەتی یان هێمنایەتیو پشودانی بۆ خۆی سازنەدا، بەڵکو هەموو ژیانی خۆی بۆ جیهاد تەرخانکرد بەهۆی پۆستەکەیەوە تەماعی تەمەندرێژی نەیگرت، بەڵکو بە خودی خۆی بە سەرۆکایەتی سوپایەك دەرچوو و خۆی بەنێو گۆڕەپانی جەنگێکی بێ ئەماندا کرد، ئەو لەوە دڵنیا بوو یەکەم کەس لە لایەن تەتارەوە کرابێتە نیشانەی کوشتن خودی (قطن)ە، لەوەش دڵنیا بوو ئەگەر بۆ خۆی لەسەر تەختی سەڵتەنەت پاڵی دابایەوەو میرێکی بەسەر سوپاکەوە بکردبایە جێگری خۆی کەس لۆمەی نەدەکرد، بەو پێوەدانەی ئەو سوڵتانەو لەبەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئۆممەت پێویستە خۆی لەو شوێنە مەترسیدارانە بوێرێت، بەڵام ئەو بەوپەڕی حەزو شەوقو زەوقەوەو بە ئاواتی مردنی نێو زرینگەی دەمەشیرو نوکە ڕمبان بەرەو گۆڕەپانی جیهاد بەڕێکەوت، ئەو دنیای نەویستو ژیانو گوزەرانی بەگوێرەی ئەو قسانە بوون کە دەیکردن،[1] ئەو قسانەی گیانی حەرەکەتیان بەبەر سوپای سەربازەکانیو نەتەوەکەیدا کردو بەرەو گەیشتن بە یەکێك لە دوو ئاواتە شیرینەکان بەڕێی کردن، ئەمەو لە (عین جالوت) بە ئاواتی سەرکەوتنی گەورەی گەیاندن.

---

١قصة التتار ص: ٣٥٩.

### ١٢ـ ململانێ نێوخۆییەکانی نێو بنەماڵەی حوکومەتی مەغۆل:

(مەنکۆخان)ی ئیمپراتۆری مەغۆل مردو هەواڵەکەی بە هۆلاکۆ گەیشت، (کوبیلای)و (ئەریکبوکا)ی جوتە برای لەسەر (کورسی ئیمپراتۆر) لێك کەوتنە تەقە، لەبەر ئەمە هۆلاکۆ بە ناچاری‌و بە خاتری ئەوە لە ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکانی نێو (مەنغۆلیا) نزیك بێت‌و ئەگەر پێویستیشی کرد لەوێڕا بە پەلە بۆی بگەڕێتەوە، بەرەو (مەڕاغە)ی بارەگای سەرەکی خۆی گەڕایەوە، لەگەڵ ئەوە هۆلاکۆ کوڕی چوارەمی (تۆلویخان) بوو و هەقی خۆی بوو کێبەڕکێی دوو براکەی بکات‌و خۆی بۆ پۆستی (ئیمپراتۆریەت) بکوتێ، بەڵام ئەو گرنگی بەمە نەدا، پێ دەچێ هۆیەکەی بۆ ئەو سەرکەوتنە بگەڕێتەوە کە لە (ئێران‌و عێراق‌و شام)دا بە دەستی هێنابێت،[1] و وێڕای ئەمەش لەوانەیە لەوە ترسابێت کێشەکە گەورەتربێت‌و کاروبارەکان زیاتر ئاڵۆز بن، لە هەمان کاتیشدا پێی وابوو (کوبیلای) بۆ ئەم پۆستە لە (ئەریك بۆکای) برای شیاوترە، بۆیە لە پێناوی ئەوەدا بە شێوەیەکی یاسایی پشتگیری (کۆبیلای) بکات داکۆکی لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن دەکردەوەو لە لایەکی تریشەوە با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە ڕۆژبەڕۆژ پەیوەندیەکانی نێوان هۆلاکۆو ئامۆزاکانی لە قەبیلەی زەهەبی (قەبجاق)[2] بەرەو خراپی دەچوون‌و ببوونە مایەی هەڕەشە بۆ سەر مەملەکەتەکەی، ئەمە وای لێکرد چاو لەو کۆمەکی‌و هاریکاریانە بنوێنێ، کە پێویست بوو بۆ مەغۆلەکانی وڵاتی شامی بنێرێت، بەم شێوەیە نەیتوانی سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە بکات‌و تۆڵەی جەنگی (عین جالوت) بکاتەوەو سام‌و هەیبەت‌و ئیعتیباری لە دەستچوو بۆ مەغۆل بگێڕێتەوە، لەبەر ئەمە (بەرەکەخان)ی سەرۆکی هۆزی (زەهەبی) دڵی بە موسڵمانانەوە بەستبوو، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا هۆلاکۆ و دەست‌و پێوەندەکانی دەیانەویست ڕەزامەندی مەسیحیەکان بەدەست بێنن‌و بە لای خۆیاندا کەمەند کێشیان بکەن، بەرەبەرە (بەرەکەخان) لە موسڵمانان نزیك بۆوەو چووە سەر ئاینی ئیسلام‌و موسڵمان بوو، ئیدی بوو بە نیشانەی تیرو توانج‌و لۆمەو گازاندەی هۆلاکۆ، (بەرەکەخان)یش هەڕەشەی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی بە ناهەق ڕژاوی هەزاران موسڵمان‌و هەموو ئەو وێرانکاری‌و خراپەکاریانەی بەسەری هێناون لێ کرد، لەسەرو هەمووشیانەوە هەڕەشەی دەکرد کە تۆڵەی (خەلیفە)ی لێ دەکاتەوە، کە چۆن سوکایەتی

---

١ المغول في التأريخ للصياد ص: ١٩٨.

٢ قەبجاق: تیرەیەکی تورکن، نیشتمانی ئەسڵی یان حەوزی ڕووباری ئەرتەشە، لێرەولەوێ گواستیانەوە تا لە حەوزی ڕووباری ئەرتل=الفلجای باشووری ڕووسیای ئێستا گیرسانەوە، ئەم ناوچەیە بە قەبجاق ناسرا، هەروەها قەبجاق بوو بە ناوو شۆرەتی ئەو دەوڵەتە مەغۆلیە کە بە قەبیلەی زەهەبی ناویان دەرکرد.

پێکردووەو پاشانیش وێراویەتی بیکوژێت، لەبەر ئەمە هێزەکانیان زۆرجار لە چیای (قەوقاز) –کە سنووری نێوان حکومەتەکانیان بوو– تێك دەگیران و لێکیان دەدا، بەڵکو لە ئەنجامی سیاسەتە ستەمکاریەکەی هۆلاکۆ کە لە بەرامبەر موسڵماناندا پێڕەوی دەکردو دەیەویست داماویان بکات، (بەرەکەخان) پەرچەکرداری نواندو دەستی بە چەوساندنەوەو ئازاردانی ئەو مەسیحیانە کرد کە لە وڵاتەکەی ئەودا نیشتەجێ بوون، هۆلاکۆ ویستی سنورێك بۆ کاروبارەکانی (بەرەکەخان) دابنێت و هەوڵیدا دەست بەسەر بەشی باکووری چیای (قەوقاز)دا بگرێت، بەڵام (بەرەکەخان) خۆی بۆ بەرەنگاری ئامادەکردو سوپاکەی توانی شکستێکی گەورە بە نسیب سوپاکەی هۆلاکۆ بکات،[1] لێرەدا چەند هۆکارێکی تر بۆ گەڕانەوەی هۆلاکۆ بۆ (مەراغە)ی پایتەختی سەڵتەنەتەکەی باسکراون، بەڵام ئەوەی بە لای ئێمەوە بایەخداربێت ئەو خاڵەیە، کە مەرگی (مەنکۆخان)و دەرکەوتنی ناکۆکی نێوبنەماڵەی ئیمپراتۆر ڕووداوێکی کتوپڕو گۆڕانکاریەکی مەترسیدار بوو بە نیسبەت مەغۆلەوەو، ڕێڕەوی سیاسەتە فراوانخوازیەکەی مەغۆلی تێکدا، ئەمە وای لە هۆلاکۆ کرد خۆی بە تەنها بۆ (فارس= ئێران) نەگەڕێتەوە، بەڵکو بەخۆی‌و ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی سوپاکەیەوە گەڕایەوە،[2] ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی بەشداری بە ئەنجام گەیشتنی سەرکەوتنە مەزنەکەی (عین جالوت)ی کرد.

**١٣ـ سوننەتی گرتنی ستەمکاران لە لایەن خودای باڵادەستەوە:**

خودای باڵادەست دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (ابراهيم: ٤٢). واتە: پێت وانەبێت خودا لە خراپەکاری ستەمکاران بێ ئاگایە، هەروەها خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ﴾ (الفجر: ١٤). واتە: پەروەردگارت لە (کەمین ـ ڕوانگە)دایە، کەواتە خودا مۆڵەتی ستەمکار دەدات، کە گرتی قەت بەری نادات، تەتار خراپەی زۆریان لە زەویدا بڵاوکردەوە، لە زۆربەی جەنگەکانیاندا سەرکەوتن، خۆرهەڵاتیان بە تەواوەتی زەوتکرد، دوای ئەوە شامیان گرت، پێیان وابوو بەس مصر ماوە، کە ئەوێشیان گرت ئیدی بە یەکجاری دەست بە جڵەوی هەموو کاروبارەکان–ی دنیای ئیسلامەوە– دەگرن،[3] وێڕای ئەو هەموو ستەم‌و سەرکەوتنەیان زۆریش لە خۆیان بایی

---

١ جهاد المماليك ص: ١١٣.
٢ المغول للعريني ص: ٢٥٧، جهاد المماليك ص: ١١٤.
٣ الطريق الى بيت المقدس ص: ١٤١.

ببوونو لوتیان بەرز ببوو، تەماشاکە چ لەو نامەیەدا هاتووە کە ئاراستەی (قطز)یان کردبوو: ... ئێمە سکمان بە کەس ناسوتێ بگریاتو بەزەییمان بە کەسێکدا نایە دادو فوغان بکات، زۆربەی عەبدەکان–ی خودا–مان کوشتوبڕ کردووە، ئێوەش ڕاکردنتان لەسەرەو ئێمەش واجبە لەسەرمان بە دواتان بکەوین، جا کام خاك دەتانحەوێنێتەوەو، کام ڕێباز دەربازتان دەکاتو کام وڵاتە پەناتان دەدا؟!، لە شمشێری ئێمە ڕزگارتان نابێتو لە ترسی ئێمە دەرباز نابن، ئەسپەکانمان پێشتان دەدەنەوە، تیرەکانمان دەتانگەنێو شمشێرەکانمان بریسونو دڵەکانمان وەکو چیان، ژمارەمان بە قەد زیخو چەوە، قەڵاکان لە بەرامبەر ئێمەدا خۆڕاناگرنو سوپاکانتان ئێمەیان پێ ناگەڕێتەوەو توكو دوعاکانتان لە دژی ئێمە قبوڵ نابن.[1]

لێرەوە دەردەکەوێ کە مەغۆلەکان لە سەرەڕۆیىو لەخۆبایی بوندا سنوریان بەزاند، ئیدی چیدیکە خودای بیسەرو زانا لێی قبولْ نەکردنو بە قودرەتو توانای خۆی گرتنیو، بەهۆی (سولْتان قطز)ەوە لە وڵاتی شامدا تێکی شکاندنو مەرگی موفاجاتی بۆ ناردنو تۆماری دەسەڵاتی – لەو وڵاتەدا – پێ پێچانەوە.[2]

هۆکارەکانی سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) تێکهەڵکێش بوونو هەموویان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە یەکترەوە هەبوو، هۆکاری سیاسی کاریگەری لەسەر هۆکاری ئابووری هەبوو و، بە پێچەوانەشەوە هۆکاری ئابوریش کاریگەری لەسەر هۆکاری سیاسی هەبوو، ناتوانین بڵێین سەرکەوتنەکە تەنها بەهۆی ئەم هۆکارانەی باسمان کردن بە بەرهەم گەیشت، بەڵکو دەشێ هۆکاری دیکەش هەبنو لێکۆڵەری تر بێنو دەرکیان پێ بکەن، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە کە بە چاکی بیر لەم ڕووداوانەی مێژوو بکەینەوەو، وانەو پەندیان لێ دەربێنینو، لە لایەکەوە هەموو ئەو قانونانە بناسین کە دەبنە مایەی: سەقامگیربوونو ڕووخانی دەوڵەتانو سەرکەوتنو تێکشکانی گەلان، لە لایەکی تریشەوە، سیفەتەکانی سەرکردایەتی سەرکەوتوو و زانایانی شۆڕشو ڕاپەڕینو هۆکارەکانی دروستکردنی مێژوو بناسینو لە سەرخستنی ئاینی خودادا بەکاریان بێنین، خودای بەرزو باڵا دەفەرموێت:

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ (یوسف: ١١١).

---

١ السلوك للمقريزي ٥١٤/١.

٢ الطريق الى بيت المقدس ص: ١٤١.

## حەوتەم: ئەنجام و شوێنەوارەکانی جەنگی (عین جالوت):

بەهۆی سەرکەوتنی (موسڵمانان) بەسەر (مەغۆل) لە جەنگی (عین جالوت)دا ئەنجام و شوێنەوارێکی زۆر هاتنە ئاراوە، لەوانە:

### ١ـ ئازادبوونی (شام) لە چنگی مەغۆل:

لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) بە دیمەشق: دانیشتوانی شار خرۆشا، کاربەدەستانی تەتار هەڵاتن، شار بەبێ حکومەت و ئاسایش مایەوە، بە بەڵگەی ئەوەی سزای شۆڕشی جەماوەری شار هەموو ڕەگەزەکانی بە موسڵمانانیش گرتەوە، ئەوا ناکرێت کوشتنی خیانەتکاران و بەکرێگیراوان و پیلانگێڕانی دژی ئیسلام و موسڵمانانی ماوەی حوکومەتەکەی تەتار لەسە دەستی موسڵمانە خوێن گەرمەکانی ئەو شارە بە کارێکی توندڕەوانە و ڕەگەزپەرستانەی دژ بە نەسرانی و جوولەکەکان ناوبەرین، وەکو (مقریزی) دەڵێ: تاقمە موسڵمانێك پشتگیری تەتاریان کردبوو لەبەر ئەمە خەڵکی شار قۆڵبەستیان کردن و کوشتیانن،[1] ئەم هەواڵە ـ ی مقریزی ـ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە شۆڕشە جەماوەریەکەی شاری دیمەشق لە دژی خیانەتکاران و هاریکارانی دوژمن بووە، بێگومان ئەمە مافێکی خودی موسڵمانانە کە هەر کەسێك ستەم و زۆریان لێ بکات تۆڵەی خۆیانی لێ بسێننەوە، بەم شێوەیە دیمەشق لە مەغۆل و کلکە بەکرێگیراوەکانیان پاکسازی کرا، دوای کۆتایی پێهاتنی جەنگی (عین جالوت) (میر بیبرس بندقداری) بە خۆی و بە هێزەکانیەوە ڕێی تاقمە بەزیوەکانی مەغۆل دەکەوت، ڕاوەدوو پاکسازی درێژەی کێشا تا ئەوەی وڵاتی شام و فەلەستین و خۆرهەڵاتی تورکیا بە تەواوەتی لە مەغۆل پاککرانەوە، پاش ئەمە ئاگری ستەم و چەوساندنەوە لەم وڵاتانەدا خەفۆك کراو خەڵکی لە گیان و ماڵ و خاك و ناموسی خۆیان ئەمین بوون و تا ماوەی دەیان ساڵ گوێیان لە ناوی تەتار نەبۆوە.[2]

### ٢ـ بەدیهاتنی یەکێتی (شام و مصر):

گێڕانەوەی یەکێتی نێوان دوو بەرەی ئیسلامی مصر و شام یەکێك بوو لە ئەنجامە هەرەگرنگەکانی جەنگی (عین جالوت)، ئەو یەکێتیەی کە بە کوژرانی (مەلیك معظم تورانشا) لە موحەڕەمی ٦٤٨کۆچیدا دوو کەرت ببوو، بەپێی زانیاریەکانی مێژوو (مەلیك مظفر قطز)لەوە گەیشتبوو کە سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) بەبێ ئازادکردنی تەواوی شام لە چنگی مەغۆل بەرهەم نادات، ئەلێرەداو لەگەڵ بردنەوەی جەنگەکە، یەکسەر نامەیەکی بۆ

---

١ جهاد الاسلامي ضد الصليبيين والمغول، د. فايد ص: ١٢٣، ١٢٤.

٢ قصة التتار ص: ٣٤٥، التتار والمغول، د. محمود السيد ص: ١٣٢.

دانیشتوانی (دیمەشق) ناردو وێڕای ڕاگەیاندنی سەرکەوتنەکە، دڵنیاشی کردبوون کە هەموو هەوڵو تەقەلاکانی لە پێناوی یەکگرتنەوەی شامو مصر دەخاتەگەڕ.[١]

سەرلەنوێ یەکێتی بۆ شامو مصر گەڕایەوە، یەکێتیەك لەسەر ڕێڕەوی سەرانی جیهادی ئیسلامی وەکو (عمادالدینو نورالدینو صلاح الدین) دامەزرایەوە، (قطز) لەسەر دیواری جیهادەکەی ئەوان دیواری سەرکەوتنە یەکلاکەرەوەکانی خۆی لە دژی خاچپەرستەکان هەڵچنیو (قودس)ی ئازادکردەوە، ئەمە جەنگەکەی (عین جالوت)ە پەتی پەیوەندیەکان گشت دەکاتەوەو جارێکی تر زەمینەی خۆ تێدا سازدانەوە بۆ موسڵمانان خۆش دەکاتەوە، تا لەوێڕا بەرەنگاری دوژمنان ببنەوەو بە کوێدا هاتوون دەبێ بە ئەوێدا بگەڕێنەوە، ماوەیەك بوو ئۆممەتی ئیسلامی بە ڕووخاندنی بەغداو لەنێوچوونی دەوڵەتەکانی وەکو (زەنگی، ئەیوبی، خوارەزمی، سلجوقی) ژانی بەبیری (تۆڵەی زەبر)ەوە گرتبوو، بە لەدایك بوونی ئەمە لە (عین جالوت)دا (شامو مصر) لە ژێر سەرکردایەتی مەمالیکدا بواری یەکگرتنەوەی بۆ ڕەخسا.[٢]

**٣ـ سەرکوتبوونی نەیارانی مەمالیك:**

مەمالیك هەموو ئەو میرو سوڵتانە دەست ڕۆیشتووە ئەیوبیانەی لەنێوبردن کە تا ئەو کاتە لە وڵاتی شامدا حوکمیان دەگێڕا، لە ڕەبیعی دووەمی ٦٥٩ك/ شوباتی ١٢٦٠ز یدا (سوڵتان بیبرس) سوپای بەرەو (شوبك) ناردو داگیری کرد،[٣] پاش چەند مانگێکی تر — بە مەبەستی ڕانواندنی هێزو بازووی — سوپایەکی تری بەرەو (کرك) بەڕێ کرد،[٤] لە ڕەبیعی دووەمی ٦٦١ك/ شوباتی ١٢٦٢ ز یدا بە خودی خۆی بەرەو دیمەشق چوو و توانیبە فرتو فێڵ (مەلیك مغیث)ی مەلیکی (کەرك) بگرێتو لە زیندانی قاهیرەدا بەندی بکاتو پاشانیش بیکوژێت،[٥] ئینجا سوپایەکی پڕ چەكو جبەخانەیەکی هەندەسی بە سەرپەرشتی ژمارەیەك چاکسازی بواری چەكو تەقەمەنی ئەو سەردەمە ئامادە کردو بەرەو (کەرك) بەڕێکەوتو ئابلۆقەی شاری دا، شار بەبێ دەستکردنەوە خۆی بە دەستەوە داو کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی مەمالیکەوە.[٦]

---

١ الجبهة الاسلامية، د. حامد غنيم ص: ٢٤٢، دراسات في تأريخ الايوبيين والمماليك، د. نعمان جبران ص: ٢٧٨.

٢ دراسات تأريخية ص: ٩١.

٣ الروض الزاهر ص: ٤٨، معركة عين جالوت ص: ٣٩٤.

٤ معركة عين جالوت ص: ٣٩٤.

٥ المصدر نفسه ص: ٣٩٤.

٦ المصدر نفسه ص: ٣٩٤.

پاش ئەمە لە (کەرِك) چەند شۆڕش و ڕاپەڕینێك لە دژی مەمالیك بەرپابوون، بەڵام بە زوویی سەرکوت کران، (مەلیك بیبرس) پاکتاوکردن و ڕاوەدونانی لەسەر میرو (سوڵتانە ئەیوبی)یەکان کورت هەڵنەهێنا، بەڵکو ئەم سیاسەتە تەواوی سەربازە ئەیوبیەکانیشی گرتەوەو لەسەر ئاستی زابت و سەربازو خزمەتگوزار لە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی سوپای بەدەرنان.

میر (فخرالدین)ی خانەنشین کردو خۆی لە دەستی میر (سیف الدین ی ئەیوبی) دەرباز کردو، پێی وابوو دەبێ بەگەڕخستنی سوپا تەنها لە زایت و سەربازەکانی خۆیاندا کورت هەڵبێنێت.[1]

لە لایەکی ترەوە تەنگی بە دەوڵەتی بەدری هەڵچنی – کە کەوتبووە خۆرهەڵاتی سوریاو (موسڵ و جزیرەو نسیبین و ماردین)ی لەخۆگرتبوو – (مەلیك صالح کوڕی مەلیك ڕەحیم بدرالدین لؤلؤ) حوکمی موسڵی دەگێڕا، دەرەنجام ئەم دەوڵەتەشی لەنێوبردو مەملەکەتەکەی خستە سەر مەملەکەتی (مەمالیك)، ئینجا بە هەموو هێزی سوپاکەیەوە فشاری بۆ هێزەکانی (ئیسماعیلی) هێنا ــ کە لە چەند هاوینەوارێکی هەرێمی خۆرئاوای (حمص و حەما)دا نیشتەجێ ببوون ــ، ئیسماعیلیەکان لەنێو قەڵاو شورە بەناوبانگەکانی ئەو هەرێمەدا خۆیان مەڵاس دابوو پێش ئەوە ئەوان خۆیان بۆ جەنگ ساز بکەن (بیبرس) لە نکاو بەسەری دادان و دەستی بەسەر هاوینەهەوارەکاندا گرت، ئینجا لەسەر پەلامارەکانی بەردەوام بوو، دەرەنجام تەواوی قەڵاکانیشی لێ داگیرکردن و سەرکەوتنێکی بێڕەزای بەسەردا تۆمارکردن.[2]

**٤ـ سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر بتپەرستیدا:**

هیچ زیادەڕۆیی نیە بڵێین: (عین جالوت) جەنگێکی یەکلاکەرەوەی گشتی لە هەموو بوارەکانی سەربازی و سیاسی و ئیمانی و شارستانی بەخۆوە بینی، سەرکەوتنی موسڵمانان واتە: سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر بتپەرستی و شارستانی بەسەر نەفامی و ڕەوشت بەسەر بەرەلاییدا،[3] لە جەنگی (عین جالوت)دا ئەگەر هەردوك هێزو توانای دەستگرتن بە هۆکارەکان و ئیمان و پشتبەستن بە خودا نە خرابانایەگەڕ سەرکەوتن نەدەهاتەدی، بەڵام پاراستنی هاوسەنگی نێوان ئەم دوو هێزو توانایە بە قازانجی موسڵمانان شکایەوە، مێژووی درێژی ئیسلام سەدان و هەزاران ڕووداوی وەکو ڕووداوەکەی (عین جالوت)مان نیشان دەدات

---

١ المصدر نفسه ص: ٣٩٦.
٢ معركة عين جالوت ص: ٣٩٦.
٣ دراسات تأريخية ص: ٨٩.

بەڵام بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی ناوبراو لە هەندێك لەو ڕووداوانەدا دەبینین شكست یاوەرمان بوو.[١]

(ستیفن رنسیمان)ی مێژوونووسی ئینگلیزی هاوچەرخ لە كتێبی (تأريخ الحروب الصليبية)دا بەم جۆرە شایەدی دەداتو دەڵێت: جەنگی (عين جالوت) بە گرنگترین جەنگە یەكلاكەرەوەكانی مێژوو دادەنرێت، خۆ ئەگەر دوابەدوای ڕووداوەكە مەغۆلەكان بە پەلە سوپایەكی گەورەیان بۆ ناوچەكە ناردبایە ئەوا بە ئاسانی قەرەبووی شكستەكەیان دەكردەوە، بەڵام حوكمدانی مێژوو سنوورێكی گەورەی لە نێوان ئەوانو ئەو بڕیارانە دانا كە لە جەنگی (عين جالوت)دا دەركران.

ئەم سەركەوتنە گەورەی مەمالیك ئیسلامی لە سامناكترین هەڕەشەی لەنێوچوون دەرباز كرد، ئەگەر — خوانەكردە — مەغۆلەكان خۆیان بەنێو مصردا بكردایەو — وەكو وڵاتانی تریان بەسەر هێنابایە، ئەوا موسڵمانان لە جیهاندا دەوڵەتێكی گەورەیان لە بەشی خۆرهەڵاتی وڵاتی مەغریبدا نەدەما، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا هەرچەندە موسڵمانانی ئاسیا بە ژمارە زۆرو زەوەند بوون، بەڵام هیچ شورەیەكیان لە دەورووە نەمابوو تا لە لەنێوچوونی یەكجارەكی بیانپارێزرێتو ڕەگەزەكانی گێڕانەوەی حوكمگێڕیشیان هێندە لەنێو نەمابوون تا بەرەو هەستانەوە تەكانیان پێ بدات، ئەگەر (كتبغا)ی مەسیحی سەركەوتبایە، مەغۆلەكان هێندەی تر مەسیحیان خۆشدەویستو بایەخیان پێدەدانو دەرەنجام مەسیحیەكان لە ئاسیادا بۆ یەكەمجار دەبوونە خاوەن دەسەڵاتی یەكەم.[٢]

بێگومان ڕووداوەكەی (عين جالوت) یەكەمین زەبری گورچوبڕ بوو لە خۆرهەڵاتدا بەر سوپای مەغۆلو خانەكانیان كەوت، كە بە بیروباوەڕی خەڵكانی هاوچەرخی خۆیان بەزینیان بەسەردا نەدەهات.[٣]

**٥ـ ڕووداوێكی یەكلاكەرەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا:**

سەركەوتنی موسڵمانەكان لە جەنگی (عين جالوت)داو پاكسازی كردنی تەواوی وڵاتی شام لە مەغۆلەكان، بە یەكێك لە ڕووداوە یەكلاكەرەوە هەرە گرنگەكانی نەك هەر مێژووی شامو مصرو بەس‌و، نەك هەر مێژووی ئوممەتی ئیسلامی بە تەنها دادەنرێت، بەڵكو بە ڕووداوێكی یەكلاكەرەوەی هەر هەموو مێژووی جیهانو مرۆڤایەتی دادەنرێت، چونكە ئەم

---

١ المصدر نفسه ص: ٩٠.
٢ المصدر نفسه ص: ٤، عين جالوت، فتحي شهاب الدين ص: ٣٤..
٣ نهر التأريخ الاسلامي ص: ٤٥٦.

سەرکەوتنە مەزنە تەنها جیهانی ئیسلامی ڕزگار نەکرد، بەڵکو جیهانو شارستانیەتی ئەوروپاشی لەم پرۆژە داگیرکارە وێرانکاریە ڕزگار کرد، خۆ ئەگەر مەغۆلەکان لەم پەلامارەیاندا خاکی مصریشیان ڕامالّیبایەو خۆیان بەنێو باکووری (ئەفریقیا)دا کردبایە، ئەوان بە سێنایی لە ڕێگای (صقلیەی جبل طارق)ەوە بەرەو خاکی ئەوروپا دەپەڕینەوە، لەبەر ئەمە تەنها دوو کەسیش ناکۆك نین کە ئەم (جەنگە) لە ڕووی گرنگیەکەیەوە لە سەرووی هەموو ئەو جەنگە یەکلاکەرەوانەیە کە لە چاخی تازەدا ڕوویانداوە.[1]

**٦ـ بووژانەوەی گیانێکی تازە لە جەستەی ئۆممەتدا:**

سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) بوو بە یەکێك لە هۆکارە هەرە کاریگەرەکانی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لەو سەردەمەدا، گیانێکی تازەی بەبەر موسڵمانان بە گشتیو موسڵمانانی فارس بە تایبەتی کرد، فارسە موسڵمانەکانی ئێران لەگەڵ مەسیحیەکان لەسەر وەرگرتنی پۆستە باڵاکانی حکومەتە مەغۆلیەکەی ئەو وڵاتە کەوتنە کێبەرکەوە، لێکدا لێکدا بانگەشەی مەغۆلەکانیان بۆ ئیسلام دەکردو ماهیەتی ئاینەکەیان پێ دەناساندن، دەرەنجام مەغۆلەکانی خۆرئاوای ئاسیا، پاش ئەوە بۆیان دەرکەوت کە ئیسلام بۆ هەموو کاتو شوێنێك گونجاوەو بەرنامەی بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان هەیەو وەکو ئاینی مەسیحی نیەو بەدەردی ناکۆکی جەوهەریەوە ئالّودە نەبووە، کۆتایین ئایینی خودایە بۆ مرۆڤایەتیو تا خودا زەوی بە میرات وەردەگرێتەوە دەمێنێتەوە، بەڵێ پاش ئەوەی بە هۆی وەرگرتنی زانیاری لەسەر ئیسلامو ڕوون بوونەوەی واقیعیەتی ئیسلام بەهۆی هەڵسوکەوتی موسڵمانان لەگەڵیاندا هاتنە سەر ئاینی ئیسلامو موسڵمان بوون.[2]

بە ئیزنی خودا لە کتێبێکی ترمدا کە باس لە (مەلیك ظاهر بیبرس) دەکات بە درێژی قسە لەسەر موسڵمان بوونی مەغۆلەکان دەکەین.

**٧ـ پەرشو بڵاوبوونی هێرشەکانی مەغۆل:**

پاش شکستەکەی (عین جالوت)یان، مەغۆلەکان لەپێناوی گێڕانەوەی دەسەڵاتیانو سومعەو ناو و ناوبانگی جەنگیانو خڕکردنەوەی شەرمو شکۆو عەیبو عاری ڕژاویان هارۆژانو چەند پەلامارێکی سەربازیان لە دژی مەمالیك ئەنجامدان، دڵو دەروونیان پڕبوو لە بوغزو غەرزەو تۆڵە، کە تا دوێنێ بەهێزترین سوپای جیهان بوون، بەڵام ئیمڕۆ گیرۆدەی

---

١ جهاد المماليك ص: ٣٥٦، مصر في العصور الوسطى محمود محمد ص: ٢٤٦.

٢ المصدر نفسه ص: ٣٥٧.

لاوازیو زەبوونی بوونو سامو هەیبەتیان نەماوە.[١] موسڵمانان لە جەنگی (عین جالوت)دا توانیان بەسەر ئەو شکانە دەروونیەیاندا زاڵ بن کە پێیەوە گیرۆدە ببوونو لە نائومێدی ڕزگاریان بوو و تێگەیشتن کە هیواو ئومێد هەبوون بە خودا قەت کۆتایی نایەتو، هەرچەند هێزی بێباوەڕان گەورە ببێت، بەڵام کاتێك دێت لەنێو دەچێت،[٢] خودای بالادەست دەفەرمووێت: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَـٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾﴾[٤] (ال عمران: ١٩٦ـ١٩٧). واتە: با گەڕانو سوڕانی بێباوەڕان لە وڵاتدا هەڵت نەخەڵەتێنێت، ڕابواردنێکی کەمە، ئینجا جێگایان دۆزەخەو، خراپترین جێی حەوانەوەیە.

**٨ـ سەرنەگرتنی هاوپەیمانی نێوان خاچپەرستانو تەتار:**

سەرکەوتنی مەمالیك لە (عین جالوت)داو، دەرکەوتنیان وەکو هێزێکی گەورەی ئیسلامی لە ناوچەکەدا، هیواو ئومێدی خاچپەرستەکانی لە بەرامبەر هاوکاری مەغۆلەکان لاوازکرد، کە تەماشایان کرد مەمالیك مەغۆلەکانی بەرەو سنوورەکانی عێراق هەڵناو خەریکە هەوڵدەدەن عێراقیش لە ژێر چنگی تەتار ڕزگار دەکەن هێندەی دیکە لە مەغۆل نائومێدبوون.[٣]

**٩ـ لاوازبوونی قەوارەی خاچپەرستان:**

سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) کاریگەریەکی گەورەی لەسەر لاوازبوونی قەوارەی خاچپەرستان لە کەنار (ساحل)ی وڵاتی (شام)دا دانا، بێ شك خاچپەرستان بەهۆی ئەم سەرکەوتنە مەزنەی موسڵمانان تووشی بێ هیواییەکی بێڕەزا بوون، لەبەر ئەمەو پاش ئەوەی هەستیان بە دیمایی هاتنی حەتمی خۆیان کرد، سەرۆکەکانیان خۆیان لە سوڵتان (بیبرس) نزیك دەکردەوەو، داوایان لێ دەکرد باڵی بەزەییان بەسەردا بکێشێت، ئەویش چەند هاوپەیمانەتیەکی لەگەڵ واژۆکردن کە هەموو مەرجەکان لە لایەن ئەوەوە دادەنران، هاوکات لەگەڵ ئەمەدا زەنجیرەیەك ڕێکەوتنی ئاشتی لەگەڵ وڵاتە دراوسێ بێگانەکان ئەنجام درانو مەرجی لەسەر دانان لە دژی دەوڵەتی ئیسلام هاوکاری خاچپەرستەکانی (ساحل)ی شام نەکەن، بەم شێوەیە پەیڕەوکردنی سیاسەتی بڕینی کۆمەکی دەرەکی لەسەریان سەری کێشا بۆ هەڵکەنرانی یەکجارەکی ڕەگو ڕیشەیان لە (ساحل)ی وڵاتی شامدا.[٤]

---

١ معركة عين جالوت ص: ٣٨١.

٢ قصة التتار ص: ٣٤٤.

٣ جهاد الاسلامي ضد الصليبيين والمغول، د. فايد ص: ١٢٦.

٤ جهاد المماليك ص: ٣٥٧، المظفر قطز، العسيلي ص: ١٢٦.

**١٠ـ شاری قاهیرە:**

(عین جالوت) وێڕای کاری خۆی لە بوارەکانی سیاسیدا ئەنجامدا، لە بوارەکانی شارستانیشدا کاری خۆی کرد، وڵاتی مصری لە واوەیلاو وێرانکاریەکانو شەڕو گێچەڵەکانی مەغۆل پاراست، ئەو وێرانکاریو ڕوخانەی بەسەر شارە گەورەکانی وەکو (بەغدا، دیمەشق)و شارەکانی تری ئێرانو عێراقو شامدا هات، بەسەر شاری قاهیرەدا نەهات، لە کاتێکدا هەموو مەڵبەندە شارستانیەکانی ئەو شارانە پەکیان خراو لەکارکەوتن، شاری قاهیرە وەکو شارێکی هێمنو دوور لە جەنجاڵیەکانی ڕۆژ دەروازەکانی خۆی لە ڕووی زانایانو ئەدیبانو هونەرمەندانو فێرخوازاندا کردنەوە، بەم شێوەیە قاهیرەی پایتەختی مەمالیك جگە لەوە بوو بە مەڵبەندێکی پێگە فراوانو بەهێزو دەسەڵاتی سیاسی، بوو بە مەڵبەندێکی بەرزو فراوانی بواری شارستانیو دەستکەوتە زێڕینەکانی خۆی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد، بەم شێوەیە مەمالیکە موسڵمانەکان سامو هەیبەتو تواناو دەسەڵاتی سیاسیو جەنگیو زانستی خۆیان دەرخست، لە ماوەی پەیوەندیان بە جیهانی دەرەوەو بەڕێوەبردنی دەوڵەتە بەرفراوانەکەیانداو ئەنجامدانی چاکسازیە ئیداریە نێوخۆییەکانیاندا دەستکەوتە شارستانیەکانی خۆیان پێشکەش کرد.[١]

**١١ـ لە دایکبوونی دەوڵەتی مەمالیکی لاو:**

لەو کاتەدا هێزەکانی هێرشی حەوتەمی خاچپەرستان لە قەراغ دەریای نێوەڕاستو لە بەرامبەر (دمیاط)دا بارگەیان خستبوو، ئاپۆڕای تەتاریش بە سەرکردایەتی هۆلاکۆ سەرگەرمی ڕاماڵینی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بوو و، بەرەبەرە لە بەغدای پایتەختی خیلافەتی عەبباسی زراو ڕژاو نزیك دەبۆوە، ئەگەر سەرکەوتنەکانی مەمالیك لە جەنگەکانی (المنصورة)و (فرسکور)ی ساڵی ٦٤٨ك/١٢٥٠ز بە قیژەی لەدایکبوونی دەوڵەتی مەمالیك حیساب بکەین، ئەوا جەنگەکەی (عین جالوت)یش ـ کە ئاشبەتاڵی بە هێرشەکانی مەغۆلی کرد ـ بە گەیشتنی بە تەمەنی باڵغبوونی حیساب دەکەین، دەوڵەتی مەمالیك لەم تەمەنەیدا ڕۆڵی مێژوویی خۆی گێڕا، ڕۆڵی هێزو دەسەڵاتی لێدانو بەرگریکردن لە جیهانی ئیسلامی،[٢] ئەم دەوڵەتە (لاوە) بە سەرکردایەتی (سوڵتان ظاهر بیبرس) توانی لە زۆر لاوە گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخو سەرەنجامی ناوچەکەدا بێنێت، پاشماوەی هێزە بەزیوەکەی مەغۆلی لە

---

١ جهاد المماليك ص: ٣٥٧.

٢ ماهية الحروب الصليبية ص: ١٩٢.

وڵات بەدەرنا، کۆتایی بەپاشماوەی ئەیوبیان هێنا، لە هەموو لایەکەوە، ئابلۆقەی لەسەر خاچپەرستە نیشتەجێکانی (ساحل) دانا.

هەرچەندە مەغۆلەکان ئاژاوەو هۆسەیەکی گەورەیان لە مێژووی ناوچەکەدا بەرپاکرد، بەڵام مەترسیان بە قەد مەترسی خاچپەرستان گەورە نەبوو، ئەو خاچپەرستانەی ململانێیەکی درێژخایەنیان لەگەڵ ئیسلامو ناوچەکەدا هەبوو، ڕاستو دروستی قسەکەمان لە چوارچێوەی گوتنی ئەم حەقیقەتە حاشا هەڵنەگرەدا بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دەڵێ: ئەو مەغۆلانەی خۆرهەڵاتی جیهانی ئیسلامیان داگیرکرد هێندەی نەخایاند موسڵمان بوون، دوابەدوای جەنگی (عین جالوت)و بەسەرچوونی تەنها دوو نەوەو نەتیجە (جیل)یان، لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر بە خەم (ئیسلام)ەوە بوونو چالاکانەتر بەرگریان لێ دەکرد.

### ١٢ـ ڕۆڵی ڕەمزی خیلافەتی عەبباسی:

جەختی لەسەر ڕۆڵی ڕەمزی خیلافەتی عەباسی کردەوە، بوژاندنەوەی خیلافەتی عەباسی لە قاهیرەو لە ساڵی ٦٥٩ك/١٢٦١ز لە لایەن سوڵتان (ظاهر بیبرس)ەوە شەرعیەتی دینی بە دەوڵە سەربازیەکەی مەمالیك بەخشیو ڕۆڵێکی کاریگەریشی لە پاکتاوکردنی بوونی خاچپەرستی لە ناوچەکەدا گێڕا، ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی مەمالیك بە درێژایی سەدەکانی حوکمڕانیان دەیسەلمێنن کە خەلیفەکانی عەبباسی جگە لە ناوی (خیلافەت)و بەس خاوەنی (خیلافەت)ی حەقیقی نەبوون، مانەوەی زۆربەیان لە قاهیرە بەم شێوازە زیاتر لە مانەوەی نێو گرتوخانەو دەستبەسەری دەچوو.[١]

### ١٣ـ گەشە پێدانی (سوپای مەمالیك) و تازەکردنەوەی سیستەمە سەربازیەکەیو نوێکردنەوەی چەكو ئامرازە جەنگیەکانی:

دوابەدوای جەنگی (عین جالوت) سوپای مەمالیك لە ڕووی ژمارەی هێزەکانیەوەو ڕێکخستنە جەنگیەکانیەوە پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینی، ئەمەو پاش جەنگەکەو لە سەردەمی سوڵتان (بیبرس)دا مەمالیك سێ سوپای سەرەکی هەبوون، یەکەمیان لە مصر بوو، دووەمیان لە دیمەشق بوو، سێهەمیان لە حەلەب بوو، بەو سوپایەی سەرکردەی باڵای سوپا سەرکردایەتی دەکرد دەگوترا: سوپای (زحف)، ژمارەکەی دەگەیشتە (٤٠) هەزار جەنگاوەر. پارچەیەك سوپای سەردەمی (مەلیك ناصری ئەیوبی) بە تەنها خۆی لە (١٥٠) هەزار سەرباز دەدا، ئینجا سوپای مەمالیك گەشەی سەند، هێزەکانی ناوەندی مصرو هێزە

---

١ المصدر نفسه ص: ١٩٣.

یەدەك(احتیاط)ەکانی لەخۆ دەگرتن، سوپای هۆزەکانی (عەرەبو تورکمانو کورد) هاتنە نێویەوەو، قەبارەکەی گەیشتە (٣٥٧) هەزار جەنگاوەر، لە بواری چەكو کەرەستەی جەنگیو تایبەتمەندیە هەمەچەشنەکانی سوپاشەوە پێشکەوتنێکی گەورە هاتەدی، پردەربازو گونجیان دروست کردن، لەپێش هەموو چەکەکانەوە چەکی نەوت هاوێژو ئاگر پرژێن پەرەی سەندو، ئەمەو بە شێوەیەکی گشتی هەموو جۆرەکانی چەكو کەرەستە جەنگیەکانی ئەو سەردەمە پەیدا کرانو پەرەیان پێدرا.

ئەوانەی ڕابردن گرنگترین بەرهەمو ئەنجامەکانی جەنگی (عین جالوت) بوون بۆ جیهانی ئیسلامیو مرۆڤایەتی.

# (( پوختە ))

ئەمەی ڕابورد بریتی بوو لەو کارەی خودا بۆی ئاسان کردم، لە کۆکردنەوەو ڕیزکردن‌و شیکردنەوەی نێوەڕۆکی بابەتەکانی ئەم کتێبە کە ناوم لێنا: (دەوڵەتی مەغۆڵو تەتار لە نێوان بڵاوبوونەوەو سەرشکانەوەدا)، کە ئاڵقەیەکی گرنگی (موسوعة الحروب الصليبية=مێژوونامەی جەنگی خاچپەرستان)ە، کە تا ئێستا چەند ئاڵقەیەکی تری بەم ناونیشانانە لێ بەرهەم هاتووە: (السلاجقة=سلجوقیەکان، عصر الدولة الزنكية= سەردەمی دەوڵەتی زەنگی، صلاح الدين، الايوبيون بعد صلاح الدين= ئەیوبیەکان لە دوای صلاح الدين)، کتێبەکە بایەخی زۆری بە هەڵوێستەکردن لە بەرامبەر هۆکاری ڕوخانی دەوڵەتان داوە، وەکو ئەو کارەساتەی بەسەر دەوڵەتی (خوارەزمی)دا هات، هاتووە بە تێرو تەسەلی هۆکارەکانی ڕووخانی ئەو دەوڵەتەی شیکردوونەوە، کە گرنگترینیان: نەهێنانەدی تەوژمێکی شارستانی، بێزرانی ڕژێمی حوکمڕانی لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە، ناکۆکی نێوخۆیی لەنێو ئەندامانی بنەماڵەی حوکمڕان، لاوازی سیستەمی جەنگی، خۆشویستنی دونیاو ڕقبوونەوە لە مردن، وازلە یەکێتی هێنان، ستەمکردن لە بەندەکانی خودا، خۆپەرستی (محمد علاءالدين خوارەزمی)و شکستە دەروونیەکەی، کەسایەتی (جلال الدين منكبرتی)، کورتبینی (الناصر لدين الله)ی خەلیفەی عەباسی، هەروەها لێرەوە هەڵوێستە لەسەر هۆکارەکانی لەنێوچوونی دەوڵەتی عەباسیش کراوەو بەبەشی خۆیان شیکراونەوە، گرنگترینیان دیارنەبوونی سەرکردایەتیەکی حەکیم، فەرامۆشکردنی فەریزەی جیهاد، لەدەستدانی یەکێتی سیاسی، لاوازبوونی سوپای عەباسی، لاوازبوونی ئینتیما بۆ دەوڵەت، دابەزینی بەهای پەیمان‌و بەڵێن، کزبوونی هیمەتی میرو مەلیکەکانی دەوروبەر، ژمارەیەك تەنازولی سیاسی بوونە بەڵگەی لەرزۆك بوونی خیلافەتی عەباسی، زۆربوونی مەڵبەندەکانی هێز، داگیرکرانی هێڵەکانی پێشەوەی بەرگری، ڕۆڵی نەسرانیەکان لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عەباسیدا، ڕۆڵی موسڵمانان لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عەباسیدا، دوورخستنەوەی کەسە شیاوو دەگمەنەکان، کێبەرکەی عەلەویەکان، خۆشگوزەرانی‌و کاریگەریەکانی لەسەر لەنێوچوونی دەوڵەتی عەباسی، گەیشتن بە دوا خاڵی لێکهەڵوەشان‌و هەرەسهێنان، هەرەسی بارودۆخی ئابووری‌و ململانێی خۆبەخۆی نێو (بەغدا)، خیانەت‌و ناپاکیەکانی (شیعە)ی وەکو (ابن العلقمي)ی وەزیر، ڕاهاتنی جەنگی ئەسپ سوارانی مەغۆل، بەهێزی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی، هەروەها کتێبەکە گرنگی بە

جیهادی مەمالیك داوە، لێرەدا هەڵوێستەی لەسەر غیرەتو بوێری مەمالیك کردووە کە چۆن بەڕووی پڕۆسەی مەغۆلیدا هەڵشاخانو خەونەکانی لێ بردنەوە هیچەو تۆڵەی موسڵمانانیان لێ سەندنەوە، بە درێژی باسی (سیف الدین قطز)ی کردووە، و گرنگی بە زانیاریو شارەزایی ئەم پاڵەوانە داوە لە بەڕێوەبردنی ململانێی گەڵ مەغۆلەکانو بەگژداچوونەوەی پڕۆسە داگیرکاریەکەیان، لەسەر هۆکارەکانی سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) هەڵوێستەی کردووەو شیکردوونەتەوەو سوننەتەکانیو وانەو پەندەکانی لێ دەرهێناون، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون: سەرکردایەتیەکی حەکیمو لێزان، ڕوونی بۆچوونو ئامانج، پاکی پێناس، سووربوون لەسەر شەهیدی، دۆستایەتی نەکردنی دوژمنانی ئوممەت، کارسپاردن بە کەسانی شایستە، سوپای بەهێز، بوژاندنەوەی گیانی جیهاد، دەستگرتن بە هۆکارەکانی سەرکەوتنو گرتنەبەری ڕێوشوێنەکانی گەیشتن بە ئامانجی وەکو: پەیوەست بوون بە مەشقو ڕاهێنانی عەقیدەییو سەربازی، مەشقی بەردەوام، لێزانینی نەخشەدانان، دووربینیو سیاسەتی حەکیمانەی (سیف الدین قطز)، بەرجەستەبوونی سیفەتەکانی (الطائفة المنصورة=کۆمەڵە سەرکەوتووەکە) لە سوپای مەمالیکدا، بەرنامەی پلەپلەیی، بە میراتگرتنی پڕۆسەی بەرەنگاربوونەوە، کۆمەك خواستن لە زانایانو پرسو ڕاوێژ پێ کردنیان، دونیا نەویستی، ململانێکانی نێوخۆی بنەماڵەی حوکمڕانی مەغۆلی، خودای باڵادەستو سوننەتی گرتنی یاخیو ستەمکاران، بە ئیزنی خودای بەرزو مەزن لە پێناوی ڕۆشنایی خستنە سەر سەردەمی مەمالیك، بە دوای ئەم کتێبەدا چەند کتێبێکی تر لەسەر مەمالیك بڵاودەکەینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی لەسەر دەکەین، هەرچی لەم کتێبەدا ڕاستو دروست بێت ئەوە لە چاکەی خوداوەیەو خۆم بە منەتباری ئەو زاتە بەرزە دەزانم، هەرچی هەڵەیەو کەمو کورتیشە (أستغفرالله)ی لەسەر دەکەمو بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، دەڵێم خودا پاکەو لێی بەرییە، منیش ئەوەندەم بەسە کە زۆر داکۆکیم لەسەر ئەوە دەکردەوە نەکەومە نێو هەڵەوەو لە پاداشت بێ بەش نەبم، لەبەر ئەوە لە خودای باڵادەست دەپاڕێمەوە: بەهۆی ئەم کتێبەوە سوود بە خوشكو برایانی موسڵمانم بگەیەنێ، هەر کەسێکیش خوێندیەوە فەرامۆشم نەکاتو دوعام بۆ بکات، چونکە پاڕانەوەی پشتەملەی برا بۆ برا بە ویستی خودا وەردەگیرێت، کتێبەکەم بەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (الحشر)و ئەم شیعرەی (ابن الوردي)ی هاوسەردەمی مەمالیك کۆتایی پی دێنم:

ئایەتە پیرۆزەکە: خودای بەرز دەفەرموویت: ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (الحشر: ١٠).

شیعرەکە (ابن الوردي) دەڵێت:

واتق الله فتقوى الله ما — جاورزت قلبَ امريء الا وصل
ليس من يقطع طرقاً بطلاً — انما من يتق الله البطل
واهجر الخمرة ان كنت فتى — كيف يسعى في جنون من عقل
صدّقِ الشرع ولا تكن الى — رجل يرصد بالليل زحل
حارت الافكار في قدرة من — قد هدانا سبلنا عزوجل
كتب الموت على الخلق فكم — فلَّ من جمع وافنى من دول
ايـن نمرود وكنعان ومن — ملك الأمر و ولي وعزل
أين عادٌ أين فرعون ومن — رفع الأهرام من يسمع يخل
أين من سادوا وشادوا وبنوا — هلك الكلّ ولم تغنى القلل
أين أرباب الحجا أهل النّهى — أين أهل العلم والقوم الأول
سيعيد الله كلاً منهم — وسيجزي فاعلا ماقد فعل
أيْ بني اسمع وصايا جمعت — حكما خصَّت بها خير الملل
أطلب العلم ولا تكسل فما — أبعد الخير على أهل الكسل
واحتفل للفقه في الدين ولا — تشتغل عنه بمال أو خَوَل
واهجر النوم وحصِّله فمن — يعرف المطلوب يحقر ما بذل
لاتقل قد ذهبت أربابه — كل من سار على الدرب وصل
في ازدياد العلم إرغام العدى — وجمال العلم ياصاح العمل
انا لا أختار تقبيلَ يدٍ — قطعها أجمل من تلك القبل
واترك الدنيا فمن عادتها — تخفض العالي وتعلي من سفل
قيمة الانسان ما يحسنه — أكثر الانسان منه أو أقل
ان نصف الناس أعداء لمن — ولي الاحكام هذا ان عدل
قصِّرِ الآمال في الدنيا تفز — فدليل العقل تقصير الأمل
غِبْ وزُرْ غبّاً تزد حباً فمن — أكثر الترداد أضناه الملل
حبك الاوطان عجز ظاهر — فاغترب تلْقَ عن الأهل بدل

فـبـمـكـثِ الـمـاء يـبـقى آسـنـا      وسُـرى الـبـدرِ بـه الـبـدر اكـتـمل[1]

((سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الاّ انت أستغفرك وأتوب إليك)).

١ ديوان ابن الوردي ص: ٢٧٧ـ٢٨٠.

## دانەر لە چەند دێڕێکدا:

- ساڵی ١٣٨٣ک/١٩٦٣ز لە شاری (بنغازی)ی وڵاتی (لیبیا) لەدایك بووە.
- ساڵی ١٤١٤ک/١٩٩٣ز لە کۆلێژی (أصول الدین)ی زانکۆی (المدینة المنورة) بە پلـەی (یەکەم)و (نایاب) بڕوانانەی (لیسانس)ی وەرگرتووە.
- ساڵی ١٩٩٦ز لە زانکۆی (ام درمـان)ی ئیـسلامی (سـودان) بڕوانامـەی (ماجـستێر)ی وەرگرتووە.
- نامەی ماجستێرەکەی بە ناوی: (الوسطیة في القرآن)ە.
- نامەی دکتۆراکەی بە ناوی: (فقه التمکین في القران الکریم)ەو، لە سـاڵی ١٩٩٩زدا بـە دەستی هێناوە.
- پۆستەی ئەلیکترۆنی:

Abumohamedr@maktoob.com

# ناوەرۆك

